# تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز

## بەرگی بیست و سێیەم

سوورەتەکانی

(فاطر) و (یس) و (الصافات)

عەلی باپیر

## تەفسیری سوورەتەکانی

# فَاطِر و یس و الصَّافَّات


نووسینی : عەلی باپیر

دیزاینی ناوەوە : زەردەشت کاوانی

چاپی یەکەم ١٤٤٣ک - ٢٠٢١ز

٧٢٥ لاپەڕە

١٧* ٢٤ سم

بابەت : ئایینی

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان

ژمارە سپاردنی ( ٧ ) ی ساڵی ٢٠١٢ پێدراوە

# تەفسیری سوورەتەکانی

# فَاطِر و يس

# الصَّافَّات

نووسینی: عەلی باپیر

# پێشەکی ئەم تەفسیرە بەگشتیی

إنَّ الحَمْدَ للَّـهِ نَحْمَـدُهُ وَنَسْـتَعِينُهُ، وَنَسْـتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِـنَا، وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَـا، مَنْ يَهْدِه اللَّـهُ فَلاَ مُضِـلَّ لَـهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَـادِيَ لَـهُ، وَأَشْـهَدُ أَن لاَ إلَـهَ إلاَّ اللَّـهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَـهُ، وَأَشْـهَدُ أَنَّ مُحَمَّـداً عَبْـدُهُ وَرَسُـولُهُ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ آل عمران.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴿١﴾ ﴾ النساء.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ﴿٧٠﴾ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾ الأحزاب .

أَمَّا بَعْدُ: فَإِنَّ أَصْدَقَ الحَدِيثِ كَلاَمُ اللَّـهِ، وَخَيْرَ الْهَدِي هَدْيُ مُحَمَّدٍ ﷺ وَشَرَّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا، وَكُلَّ مُحْدَثَـةٍ بِدْعَة، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَـلاَلَةٌ، وَكُلَّ ضَـلاَلَةٍ فِي النَّـار[1].

**خوێنەرە بەڕێزو خۆشەویستەكان!**

هیچ گومانی تێدانیـە - بـۆ مرۆڤـی بـڕوادار - كـە ئـەو تەمەنـەی لـە خزمـەت دوایین كتێبـی خـوا (قورئـان)دا بەسـەردەبرێ، جـا بـە هـەر شـێوەیەك لـە شـێوەكانی لە خزمەتدابووندا بـێ؛ خوێندنـەوە، تێفكریـن و ڕامـان، فێركـردن، كارپێكـردن ... هتـد، بـە باشتـرین جێگرتـن جێگا دەگـرێ و، خاوەنەكـەی لـە دنیـاو دوارۆژدا لێـی بەهرەمەنـدە.

---

(١) ئـەوە پێـی دەگـوترێ: (خطبـة الحاجـة) كـە پێغـەمبـەر ﷺ هـاوەڵانی بەڕێزی فێـردەكرد، پێـش هــەر قسـەیەكی گرنگ، بیڵـێن، وەك وتـاری جومعــەو داخـوازییكردن (خِطْبة)و... هتـدو، ئـەم وتـارە، هـەركام لە: التـرمذي: (١١٠٥)، النسـائي: (١١٠٤)، ابن ماجـه: (١٨٩٢) أحمـد: (٣٧٢٠)، الطّبـراني: (٢٤١٤) هێنـاویانەو (مسلم)یش بەشـێكی هێنـاوە.

منیـش - کـە وەك باسـکردنی چاکـەی خـوا (التحدّث بنعمـة اللّـه) دەیخـەمەڕوو- لـەوەتی فامـم کردۆتـەوە، خـوای بەبەزەیـی و بەخشـەر چاکـەی لەگـەڵ کـردووم و، بـە فەرمایشـتی بـەرزو بـێ وێنـەی خۆیـەوە سـەرگەرمی کردوومـو، بـەر لـە تەمـەنی بیســـت سـاڵیی یـەوە هیدایـەتی داوم، کـە قورئـانی بەرێـزو پێـز لەبـەر بکـەم و، سـەرقـاڵی خوێندنـەوەی تەفسـیرەکانی قورئـان و تێوەڕامـانی ئایەتـە پڕ بەرەکەتـەکانی و، لێوردبوونەوەیـان بـم.

هــەر بۆیـەش تێکـڕای کتێـب و ئامیلکـەو وتـارو دەرسـەکانم، کـەم و زۆر لەبـەر ڕۆشـنایی قورئـان دابـوون، کـە دیـارە هــەر ئەمـەش شـتێکی سروشـتییە؛ ئاخـر ئایـا ئیسـلام بێجگـە لـە قورئـان پاشـان سـوننەتی پێغـەمبـەر ﷺ، کـە ئەویـش هــەر ڕوونکردنـەوەی قورئـان و چۆنیـەتی جێبەجێکـردن و کارپێکردنیـەتی، شـتێکی دیکەیـە؟! بێگومـان نەخێـر.

ئنجا لەمێـژ سـاڵیش بـوو، کـە بـراو خوشـکانێکی دڵسـۆزی نزیـك و ئاشـنام، داوایـان لێدەکـردم کـە دەسـت بکـەم بـە دانـانی تەفسـیـرو لێکدانەوەیـەکی قورئـان، هـەتا لـە ڕەمـەزانی سـاڵی (١٤٢٨)دا هاتـە دڵمــەوە، کـە نـاوی خـوای لێبهێنـم و دەسـت بـەو کارە گـەورەو گرنگـە بکـەم، بەڵکـو وردە وردە بەپێـی بـوارو دەرفـەت، هــەرساڵە هــەندێکی لـێ ئەنجـام بـدەم، لەگـەڵ سـەرقاڵیی زۆرو جـۆراو جۆریشـدا، هــەتا دەرفەتێـکی وام بۆ دەڕەخسـێ کـە بتوانـم خێرایـی تێـدا بکـەم و خۆمـی بـۆ یەکلایـی (متفـرّغ) بکەمـەوەو، خـوا پشـتیوان بـێ تـەواوی بکـەم، ئەگـەر تەمـەن بەبەریـــەوە مابێ.

سـەرچاوەی دانـانی ئـەم تەفسـیرو لێکدانەوەیەشـــم، وێـڕای سـەرنجدانی زۆربەی ئەو تەفسیـــرانەی کـە بـاون و، دەسـتم پێیان گەیشـــتوە، بریتیە لـە وردبوونـەوەو تێوەڕامانی خـۆم لە خـــودی قورئان، چونکە بێگومان قورئان: هـــەندێکی هـــەندێکی ڕوون دەکاتەوە: (القرآن يُفَسِّـر بَعْضُهُ بَعْضَـاً)، پاشان سـوننەتی پێغـەمبـەری خوا ﷺ، چونکە پێغـەمبـەری خـــواش ڕوونکەرەوە (مُبَيِّن)ی قورئـــانە، وەك خـــوا ﷻ فەرموویەتی:

﴿ ...وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾ النحل.

واتـە: هەروەهـا زیکرمـان بـۆ لای تـۆ ناردۆتـە خـوار، تاکـو ئـەوەی بـۆ خـەڵکی نێرراوەتـە خـوار، بۆیـان ڕوون بکەیـەوە، وە بەڵـکو خۆشـیان بیـربکەنەوە.

ئومێدیشـم وایـە - بـە یارمـەتی خـوای بەخشـەر ﷻ - شـایسـتەیی ئـەوەم هـەبێ تەفسـیـرو لێکدانەوەیەکی وا بۆ قورئـان پێشـکەش بە مسـوڵمانانی کوردسـتان بکەم، کـە لـە قورئـان بوەشـێتەوەو، مایـەی بەهـرەو سـوودی خوێنـەران بـێ، بەتایبـەتیش کـە زیاتـر لـە سـی (٣٠) ساڵە لەگـەڵ قورئانی بـەرزو مـەزن و تەفسـیـرەکانی و کتێبەکانی سـوننەتدا خـەریکم و، دەیـان کتێـب و بەرهـەمی جۆراوجـۆرم لـە زۆربـەی بـوارەکانی زانسـتەکانی شـەریعەتدا پێشـکەش کردوون.

شـایانی باسیشـە کـە ئەو بیسـت و دوو مانگ زیندانیـی کرانەم لەلایـەن ئەمریکاوە - لـە (٢٠٠٣/٧/١٠ تاکـو: ٢٠٠٥/٤/٢٨) - دەرفەتێـکی گـەورەو گرنـگ بـوو، بـۆ زیاتـر پێدا قووڵـبوونەوەی کتێبـی خـوا (تبـارك و تعالـی) و، بۆ پەیدابوونی تێگەیشـتنی تایبـەت لەبـارەی زۆرێـك لـە ئایەتـەکانی یـەوە، ئـەم ڕاسـتییەش لـە مەوسـووعەی: (الإسـلام كـما يتجـلى فـي كتـاب اللـه تعالـى)دا زۆر چـاك دەرەوشـاوەتەوە[1]، بـەڵام هـەڵبەتە ناڵـێم و هیچکەسیش بـۆی نیـە بڵـێ: کـە ئـەم تەفسـیرەی من تێروتـەواوە، چونکـە وێـڕای سـنوورداربوونی توانـاو بڕسـتم، لـە بەرانبـەر کتێبـی لـە هـەموو ڕوویێکـەوە ڕەهـا (مطلـق)و بێسـنوور (لا محـدود)ی خـوادا، نەشـمویسـتوە کـە زۆر بەمـلاولادا بچـم و بچمـە نێو هـەندێك وردەکارییەوە، کە یان من تێیـدا پسپۆڕو

---

(١) ئەو مەوسـووعەیە کە ئێسـتا چـاپ کراوەو، کەوتۆتـە بەردەسـتی خوێنەران و، سـەرجەم هەشـت بەرگ و دەوری سـێ هـەزارو پێنج سـەد (٣٥٠٠) لاپەڕەیەو، هـەوڵـمداوە بەگشـتی تێیدا باسـی سـەرجەم لایەنـەکانی ئیسـلام بکـەم و، تاکـە سـەرچـاوەشم قورئـان بـووە، وێـڕای دەقـەکانی سـوننەت، کـە لـە هـۆش (ذاكـرة)دا بـووون.

شـایانی باسـە ئەو مەوسـووعەیە لە چاپی دووەمی دا، کراوە بە دوازدە (١٢) کتێبـی سـەربەخۆ، بە مەبەستی ئاسـانتـر سـوود لێ بینـرانی .

شـــارەزا نیم، یـان خوێنـــەر پێویســـتی پێـی نیـە، لـە کاتێکـدا دەیـــەوێ لـە قورئان تێبگات و، بزانێ خوا (تبارك وتعالـی) ڕاستەوخۆ چی پێ فـــەرمووە؟!

ئنجا هــەر لێرەشـەوە بە پێویستی دەزانم پڕ بە دڵ سـوپاسی ئەو بـرا گەنجە ڕووح ســووك و گـورج و گـۆڵ و دڵســۆزە بکـەم (حـەزی نەکـرد نـاوی بهێنـم)، کـە هـەڵسـا بـە نووسـینەوەو هێنـانە سـەر کاغـەزو، پاشـان تایپکـردن و دوایـی پێداچوونـەوەو هەڵەگیـریی، ســەرجــەم ئـەم زنجیــرە دەرسـە، کـە لـە ئەسـڵدا لـە شێوەی وتـار (محـاضرة)دا پێشـکەش کراون، هــەروەها هـەڵسـا بـە (تخريج)ی سـەرجەم دەقەکانی سـوننەت، لـە سـەرچاوە متمانـە پێکراوەکانـەوەو، زەحمـەت و ماندووبوونێـکی زۆری بـە سـەرجەم بەرگـەکانی ئـەم تەفسـیــرەوە کێشـــاوە، خـــوا بـە باشـتـرین شـــێوە پاداشـتی بداتـەوەو، هــەر صـاڵح و سـاغ و سـەلامەت و ســەربەرزبێ[1]، لـە خـوای بـەرزو بێهـاوتاش داواکارم ئـەو جـۆرە گەنـج و لاوانـە لـە کـوڕان و کچـان، لەنێـو گەلەکەمانـدا، زۆر بـکات .

شـایانی باسیشـە کـە تێمـە لـەم تەفسـیــرەماندا، بـاسی بـەش (جـزء)ەکانی قورئـان و دابەشــکردنەکانی دیکـەی وەك: - (حـزب) - ناکەیـن، چونکـە هـــەر ســـوورەتێك بۆخـــۆی شـــتێکی ســەربەخۆیـــەو، ســەرجەم ئایەتـەکانی وەك ئاڵقـەکانی زنجیرێـك پێکـەوە پەیوەسـتن و، ئاشکراشـە کـە دابەشـکرانی سـەرجەم قورئـان بـۆ سـی (٣٠) بـەش (جـزء) و شەســـت (٦٠) (حـزب)، شـتێکە لەلایـەن زانایانـەوە کـراوە، بـۆ ئاسـانکاریی خوێنـدنی قورئـــان، دیـارە تێمـە لـە دابەشـکردنی بەرگـەکانی ئـەم تەفسـیـرەشـدا، دیسـان حیســـاب بـۆ بەشـەکان (أجـزاء)ی ناکەیـن و، بـە گوێـرەی ســوورەتەکان، بەرگــەکانی دیـاریی دەکەیـن.

---

(١) ئـەو بـــرا دڵســۆزە ئێســـتاش پاش تەواوکردنـی زۆربـەی قورئـان، لێبڕاوانـە بەردەوامـە و عەزمیشـــی جــەزم کردوە، کە ئەگەر تەمەنمـــان بەردەوام بێ، هەتـــا کۆتـــایی ئەم تەفسـیـرە سـەرگەرمی کارەکـەی بێ .

دوا قســەشــم ئەوەیــە کە:

ئــەم تەفســیرە - وەك پێشــتــر گوتمــان - لــە ئەســڵدا بەشــێوەی دەرس و وتــار پێشــکەش کــراوە، بــەڵام دواتــر خــۆم دووجــار بــە وردیــی پێیــدا چوومــەوەو، بەپێــی پێویســت دەســتکاریـیم کــردوە، دیــارە هــەموو دەرســێکیش بەنــاوی خــواو ســتایشی خــوا ﷻ دەســتی پێکــردوە، بــەڵام ئێمــە لــە ســەرەتای دەرســەکانەوە، ئەوانەمــان لابــردوە، بــۆ زۆر دووبــارە نەبوونــەوەو، ئــەو (خطبــة الحاجــة)یەی لــە ســەرەتای ئــەم پێشــەکەییەوە هاتــوە، لەجیــاتی ســەرەتای ســەرجەم دەرســەکانە.

سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ،

وَسَلامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ، وَالْحَمْدُ لِلهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ .

دووشەممە ٢٥ رجب ١٤٣٢

٢٠١١/٦/٢٧

هــەولــێر

# بەرچاو ڕوونییەکی گرنگ
# لەبارەی ئەم تەفسیرەوە

**خوێنەری بەڕێز !**

هەرچەندە لە (پێشەکی گشتیی) ئەم تەفسیرەدا باسمان کردوە کە بۆ نووسینی ئەم تەفسیرە، لە هەموو ئەو تەفسیرە باوانەی دەستم پێیان گەیشتوە، بەهرەمەندبووم، هەروەها لە کۆتایی هەر بەرگێکی ئەم تەفسیرەدا، سەرجەم ئەو تەفسیرانەی کەم و زۆر لێیان سوودمەند بووم، ناوەکانیانمان بە ڕیز نووسیون، بەڵام لێرەش وەك جەختکردنەوەی زیاترو بەرچاوڕوونیی باشتر بۆ ئێوەی بەڕێز دەڵێم :

مادام ناوی تەفسیرەکانمان نووسیوە، نە پێویست دەکات و نەدەشگونجێ، بۆ هەر تێگەیشتن و بیرۆکەیەك، کە زۆربەی تەفسیرەکان لەبارەی ئایەتێکەوە، یان ڕستەو بڕگەیەکی ئایەتێکەوە، دەیهێنین، ئێمە هەموو جارێ ناوی ئەو تەفسیرانە بێنین، بەڵام بێگومان هەر کات بیرۆکەو تێگەیشتنێکی تایبەتی یەکێك لە تەفسیرەکان هەبێ و بکەوێتە بەرچاوم، ئنجا چ پەسندی بکەم، چ ڕەفزی بکەم، هەر کات بە پێویستی بزانم، بە تایبەت ئاماژەی پێدەکەم، ئەگەرنا بە ئاماژەی گشتیی و بە نووسینی ناوی تەفسیرەکان لە کۆتایی هەر بەرگێك دا، ئیکتیفا دەکەم و، زۆریش لە ئەمانەتی زانستیی (الأمانـة العلـميـة) دەخەفتێم و مەبەستمە ڕەچاوی بکەم، چونکە ئەمینیی و ئەمانەت پارێزیی، ڕەوشتێکی گەورەو بەرزی مسوڵمانەتییە .

شایانی باسیشە جاری وا هەیە بیرۆکەو تێگەیشتنێکی تایبەتیی خۆمم، دەربارەی کۆمەڵە ئایەتێك یان ئایەتێك یان ڕستەو بڕگەیەکی ئایەتێك، بۆ دروست دەبێ، وەك تێگەیشتن و بۆچوونی خۆم دەینووسم، کەچی ڕەنگە لە تەفسیرەکانی

دیکەش - یەکێکیان یان زیاتر - دا هەبێ، ئەویش بەهۆی ئەوەوەیە کە من ئەو تەفسیرەم نەکەوتۆتە بەر دیدە، یان دیتوومەو لەیادم نەماوە.

# پێشەكی ئەم بەرگە

الحمدلله والصلاة والسلام والبركات على رسول الله محمد وآله المهتدين بهداه، من الصَّحب والأزواج والقرابة والتابعين لهم بإحسان إلى يوم اللقاء.

خوێنەری بەڕێز و خۆەویستم!

ئەمە بەرگی بیست و سێ (٢٣) یەمە لە تەفسیری قورئانی بەرز و بەپێز، سوپاس و ستایشی شایستە بۆ خوا، كە بۆی ئاسانكردین بەهەوڵ و هیممەتی هاوكارانی دڵسۆز و بەمشوور چاپی بكەین و بیخەینە بەردەستت و، هیواداریشم تۆش هەوڵبدەی باشترین بەهرەی لێوەربگری و بەهرەو سوودیش پێ بگەیەنی بە خەڵك.

ئەم بەرگەش وێڕای تەفسیر و ڕوونكردنەوەی چەمك و واتای ئایەتە بەپێزەكانی هەرسێك سووڕەتی : فاطر و یاسین و الصافات، كە پێكهاتەكانی ئەم بەرگەن، ئەم كورتە باسانەشی گرتوونە خۆی:

**یەكەم لە سووڕەتی (فاطر) دا:**

١- كورتەباسێك لەبارەی فریشتانەوە.

٢- كورتەباسێك: چوار ڕوونكردنەوە لەبارەی ئەم ئایەتەوە / ١٠ - فاطر.

٣- كورتەباسێك: سێ سەرنجی گرنگ.

٤- پێنج كورتە سەرنج لەبارەی ڕەنگەكانەوە.

٥- پێنج كورتە سەرنج لەبارەی پۆلینكردنی بەندە هەڵبژاردەكانی خواوە.

٦- كورتەباسێك: لەبارەی داگیركردنی ئاسمان (غزو الفضاء)ەوە.

**دووەم : لە سووڕەتی (یاسین) دا:**

**١- قسەیەك لەبارەی پیتە پچڕپچڕەكان.**

**٢- كورتەباسێك: پێنج سەرنجی گرنگ لەبارەی ئایەتەكانی سەرەتای (یس)ەوە.**

**٣- هەڵسەنگاندنی : بەسەرهاتی سێ نوێنەرەكەی عیسا و شارەكە.**

**٤- كورتەباسێك: هەڵوێستی جوامێرانەی ئەو پیاوە بڕوادارە، لە پازدە بڕگەدا.**

**٥- كورتەباسێك: لەبارەی شیعر نەبوونی قورئان و شاعیر نەبوونی محمدەوە.**

**٦- كورتەباسێك: شەش بەڵگەی بەهێز لەسەر زیندووكرانەوەی مردووان.**

**سێیەم : لە سووڕەتی (الصافات) دا:**

**١- باسێك دەربارەی گوێگرتنی فریشتان و تیربارانكردنیان.**

**٢- كورتەباسێك: چەند نازو نیعمەتێكی بەهەشت.**

**٣- كورتەباسێك: لەبارەی ئەو كوڕەوە، كە ویستراوە سەرببڕێ لەلایەن ئیبراهیمەوە.**

**٤- دە (١٠) دەرس و پەندی گرنگ لەبەسەرهاتی یونوس دا.**

**٥- كورتەباسێك: لەبارەی ڕێك وەستانی فریشتانەوە لە خزمەت خوادا و بەراوردێكی نێوان ئەوان و فریشتان.**

**٦- سێ كورتە سەرنج، لەبارەی سێ ئایەتی كۆتایی (الصافات)ەوە.**

**خوای بەبەزەیی و بەخشەر یارمەتیمان بدات: ١- هەرچی باشترو ڕێكتر قورئانی بەپێز بخوێنین و ٢- هەرچی قووڵتر لێی تێبگەین و ٣- هەرچی چاكتر و جددیتر پێوەی پابەندبین و كارلێكی لەگەڵ دا بكەین.**

**سبحانك رب العزة عما يصفون ، والسلام على المرسلين والحمدلله رب العالمين**

**٢٩ رمضان ١٤٤٢ك**

**٢٠٢١/٥/١١ز**

## دەستپێک

بەڕێـــــزان!

ئەمـڕۆ کـە (١٩)ی (ذي الحجة)ی سـاڵی (١٤٤٠)ی کۆچییە، بەرانبـەر (٢٠١٩/٨/٢٠)ی زاینیـی، دەسـت دەکەیـن بـە تەفسـیرکردنی سـووڕەتی (فاطر).

## پێناسەی سووڕەتی (فاطر)و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سووڕەتە:

ئـەم سـووڕەتە لـە موصحەفـەکانی ڕۆژهـەڵات و ڕۆژئـاوای عالەمـی ئیسـلامییداو، لـە زۆرێـك لـە تەفسـیرەکاندا، هـەر نـاوی سـووڕەتی (**فاطـر**)ە، بـەڵام لـە (**صحيـح البخـاري**) و (**سُـنن الترمـذي**)، هەروەهـا لـە ژمارەیـەك لـە موصحەفـەکان و لـە تەفسیرەکانیشـدا تەنیـا نـاوی: (**سـورةُ الملائكـة**)، بـۆ ئـەم سـووڕەتە بەکارهێـنراوە، (**السـيوطي**)یش لـە کتێبـە ناودارەکـەی خـۆی (**الإتقـان فـي علـوم القـرآن**)دا، هـەردوو ناوەکـەی هێنـاون، بـەڵام ئـەوەی کـە زیاتـر بـاوە، سـووڕەتی (**فاطـر**)ە.

### دووەم: شوێنی دابەزینی:

ئـەم سـووڕەتە بـە یـەك دەنگیـی هەمـوو زانایـان، مەککەییـە، حەسـەنی بەصرایـی (ڕەحمـەتی خـوای لـێ بـێ) دوو ئایـەتی لـێ هـەڵاواردوون، کـە گوایـە ئـەو دوو ئایەتـە لـە مەدینـە دابەزیـون:

١- ئايەتى: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَتْلُونَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُوا۟ مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً يَرْجُونَ تِجَٰرَةً لَّن تَبُورَ ﴿٢٩﴾ ﴾.

٢- ئايەتى: ﴿ ثُمَّ أَوْرَثْنَا ٱلْكِتَٰبَ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا ۖ فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ وَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌۢ بِٱلْخَيْرَٰتِ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْكَبِيرُ ﴿٣٢﴾ ﴾.

لە ڕاستییدا هەڵاواردنی ئەو دوو ئایەتە، کە پاڵدراوەتە لای حەسەنی بەصڕایی، هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە، بۆیە هەر ئەو ڕایە ڕاستەو، ئێمەش هەر ئەوەمان تەبەننیی کردوە، کە ئەم سووڕەتە هەمووی لە سەرەتاوە تاکو کۆتایی لە مەککە دابەزیوەو، هەر کەسێکیش سەرنجی سروشتی ئەم سووڕەتە بداو، لە ئایەتەکانی ڕامێنێ، دەزانێ کە هەمووی پێکەوە پەیوەستەو، هیچ شتێك ناچارمان ناکات بڵێین: فڵان ئایەتە لە مەدینە دابەزیوە، بە زۆرییش وایە سووڕەتە مەککەییەکان هەموویان بەسەر یەکەوە دابەزیون، هەڵبەتە ئەوەش هەڵاواردنی تێکەوتوەو، بەڵام بە زۆریی وەك بنچینەیەك وایە.

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و هاتنە خواردا:

ڕیزبەندیی لە موصحەفدا، ژمارە: (٣٥)ە، واتە: لە (**الفاتحة**)وە کە دێی لە لای ڕاستەوە، ئەمە سی و پێنجەمین سووڕەتە، بەڵام لە ڕیزبەندیی دابەزین (**ترتیب النزول**)دا، ژمارە: (٤٣)یە، هەڵبەتە ڕەنگە هەندێکیش بڵێن: (٤٢)، یان هەندێك بڵێن: (٤٤)ە، بە پێی ئەوە کە ژمارە (٤٣) بێ، لە دوای سووڕەتی (**الفرقان**)و پێش سووڕەتی (**مریم**) دابەزیوە.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

ژمارەی ئایەتەکانی لە ژماردنی ئەهلی مەدینەو ئەهلی شامدا (٤٦) ئایەتە، بەڵام لە هی ئەهلی کووفەدا، ژمارەی ئایەتەکانی (٤٥)ە، بەڵام ژمارەی (٤٥)

زیاتـر تەبەننیـی کـراوە، لـەو موصحەفانـەدا کـە لەبـەر دەسـتمان دان، پێشـتریش باسـمکردوە ئەوانـەی گوتوویانـە: (٤٦)ە، مەبەسـتیان ئـەوە نەبـووە شـتێك زیـاد بکەن لەوانـەی گوتوویانـە: (٤٥)ە، بەڵکـو زۆریـی و کەمیـی ئایەتـەکان، یاخـود جیاوازیـی ژمـارەی ئایەتـەکان، دەگەڕێتـەوە بـۆ کورتیـی و درێژیـی ڕسـتەکان.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی:

ئـەم سـوورەتە هەمـان نێوەڕۆکـی سـوورەتە مەککەییەکانـی دیکـەی هەیـەو، سـێ بنەڕەتـە گـەورەو گرنگەکانـی ئیمانی تێـدا خراونـە ڕوو:

١- خواناسیی و ئیمان بە خوا ﷻ.
٢- ئیمان بە وەحیی و، بە پێغەمبەرایەتیی موحەممەد ﷺو ئیمان بە قوڕئان.
٣- ئیمان بە ڕۆژی دوایی و، سزاو پاداشت و بەهەشت و دۆزەخ.

بـەڵام دەوری دوو لەسـەر سـێی (٣/٢) ئـەم سـوورەتە موبارەکـە، باسی خواناسـیی و ئیـمان بـە خـواو، چاکـەو نیعمەتـەکانی خـواو، سـیفەت و کـردەوە ناوازەکانـی خوایـە ﷻ، بۆیـە دەتوانیـن بڵێیـن: زیاتـر لـە سـی (٣٠) ئایـەت لـە چـل و پێنـج (٤٥) ئایەتـی ئـەم سـوورەتە، بـۆ ئـەو مەبەسـتە تەرخانکـراون، واتـە: بـۆ باسـی یەکتایـی خـوا لـە بەدیهێنەرایەتیـی و پەروەردگارێتیـی و خاوەندارێتیـی و نـاوو سـیفەت و کردەوەکانـی و، لـە پەرسـتراوێتیی و بەندایەتیـی بـۆ کرانیـدا.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

لـە حـەوت خاڵـدا تایبەتمەندییەکانـی ئـەم سـوورەتە موبارەکـە دەخەینـە ڕوو، کـە ئـەم سـوورەتە لـە سـوورەتەکانی دیکـە جیـا دەکەنـەوە:

١- باسی ئەوە کە فریشتەکان دوو باڵ و سێ باڵ و چوار باڵیان هەن، هەروەها ئاماژە بەوە کە دەگونجێ باڵی زیاتریشیان هەبن، ئەمە تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوە: ﴿ٱلْحَمْدُ

لِلَّهِ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ جَاعِلِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا أُو۟لِىٓ أَجْنِحَةٍ مَّثْنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ يَزِيدُ فِى ٱلْخَلْقِ مَا يَشَآءُ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١﴾ ﴾.

٢- باسی ئەوە کە خوا ﷻ وشە چاك و پاکەکان بۆ لای بەرز دەبنەوەو، کردەوەی چاکیش، وشە چاك و پاکەکان بۆ لای خوا بەرز دەکاتەوە، یان خوا بۆ خۆی کردەوەی باش بۆ لای خۆی بڵند دەکات، ئەمیش لە ئایەتی ژمارە (١٠)ی ئەم سوورەتەدا هاتوە: ﴿إِلَيْهِ يَصْعَدُ ٱلْكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ وَٱلْعَمَلُ ٱلصَّٰلِحُ يَرْفَعُهُۥ﴾، کە تەنیا لەم سوورەتە موبارەکەدا، ئەو ڕاستییە بەو شێوەیە خراوەتە ڕوو.

٣- ڕستەی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ أَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِ﴾، واتە: (ئەی خەڵکینە! ئێوە هەژارن و ناتاجن بۆ لای خوا، پێویستییتان بە خوا ﷻ هەیە)، کە لە ئایەتی ژمارە (١٥)دا هاتوە، ئەوەی من بێتە یادم لە هەموو سوورەتەکانی قوڕئاندا، تەنیا لە ئایەتی ژمارە (١٥)ی سوورەتی (فاطر)دا هاتوە.

٤- ڕستەی: ﴿إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُا۟﴾، واتە: (تەنیا بەندە زانایەکان سام و هەیبەتیان بەرانبەر بە خوا ﷻ هەیە)، کە لە ئایەتی ژمارە (٢٨)ی ئەم سوورەتەدا هاتوەو تەنیا لێرەدا هاتوە.

٥- ڕستەی: ﴿ثُمَّ أَوْرَثْنَا ٱلْكِتَٰبَ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ وَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌۢ بِٱلْخَيْرَٰتِ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْكَبِيرُ ﴿٣٢﴾﴾، واتە: (دوایی کتێبی خۆمان کردە میراتی ئەو بەندانەمان کە هەڵمان بژاردوون، ئنجا هەیانە ستەمکارە بەرانبەر بە خۆی و، هەیانە میانجییەو، هەشیانە لە چاکاندا پێشکەوتۆتەوە). ئەمیش تایبەتە بەم سوورەتەوە.

٦- ڕستەی: ﴿أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ﴾، لە ئایەتی ژمارە (٣٧)دا، تەنیا لەم سوورەتە موبارەکەدا هاتوە، خەڵکی کافر کە لە دۆزەخدا پەشێمانی دەردەبڕێ، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَهُمْ نَارُ جَهَنَّمَ لَا يُقْضَىٰ عَلَيْهِمْ فَيَمُوتُوا۟ وَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُم مِّنْ عَذَابِهَا كَذَٰلِكَ نَجْزِى كُلَّ كَفُورٍ ﴿٣٦﴾ وَهُمْ يَصْطَرِخُونَ فِيهَا رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا

نَعۡمَلۡ صَٰلِحًا غَيۡرَ ٱلَّذِي كُنَّا نَعۡمَلُۚ ﴾، لە وەڵامیاندا دەگوترێ: ﴿ أَوَلَمۡ نُعَمِّرۡكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَآءَكُمُ ٱلنَّذِيرُۖ فَذُوقُواْ فَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ ﴿٣٧﴾ ﴾، واتە: (ئایا بایی ئەوەندە تەمەنمان پێ نەدان، کە هەر کەسێك ویستبای بیری بکەوێتەوە، بیری دەکەوتەوە؟!) واتە: هەر کەسێك ویستبای ئەو ڕاستییانەی بیربکەوێتەوە، کە مایەی بەختەوەربوون و سەرفرازبوونی لە دنیاو دواڕۆژدا، بە تایبەت ڕاستییەکانی: تاکە بە دیهێنەر بوون و پەروەردگار بوون و خاوەن بوون و پەرستراو بوونی، خوا ﷻ و، بەندە بوونی مرۆڤ بۆ خواو، هەبوونی ڕۆژێك کە سزاو پاداشتی تێدا هەیە، ئەو ڕاستییانە، هەر کەسێك ویستبای خوا ﷻ تەمەنی ئەوەندە پێداوە، کە بیەوێ ئەو ڕاستییانە بیرخۆی بخاتەوە، ئەوە تەنیا لەو سوورەتەدا هاتوە بەم تەعبیرە.

٧- ڕستەی: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُمۡسِكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ أَن تَزُولَاۚ وَلَئِن زَالَتَآ إِنۡ أَمۡسَكَهُمَا مِنۡ أَحَدٖ مِّنۢ بَعۡدِهِۦٓۚ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورٗا ﴿٤١﴾ ﴾، واتە: (بێگومان خوا ئاسمانەکان و زەوی دەگرێ کە لا بچن، [لێرەدا کە دەفەرموێ: لابچن، واتە: لە مەساری خۆیان دەربچن، لەو سیستمە کە خوا بۆی داناون لا بدەن، یاخود لا بچن، واتە: نەمێنن]، وە ئەگەر لاشبچن یاخود نەمێنن، جگە لە خوا ﷻ هیچ کەس چاودێرییان ناکات و نایانگرێ و نایانپارێزێ)، ئەویش تەنیا لەم سوورەتە موبارەکەدا هاتوە.

## حەوتەم: دابەشکردنی بۆ چەند دەرسێك:

هەرچەندە ئایەتەکانی ئەم سوورەتە، وەك هەموو سوورەتە مەککەییەکان، وەك شەپۆلەکانی دەریایەك وان، بەبێ پسانەوەو بەبێ کەلێندان بە دوای یەکدا دێن، بۆیە ئاسان نیە ئایەتەکان بڕگە بڕگە بکرێن و، دابەش بکرێن بۆ چەند دەرسێك، بەڵام ئێمە ئەو چل و پێنج (٤٥) ئایەتەمان بۆ پێنج دەرس دابەش کردوون:

دەرسی یەکەم: ئایەتەکانی: (١ - ٨)، واتە: لە هەشت ئایەت پێك دێ، باسی هەر سێ بنەڕەتەکەی ئیمان بە تێکهەڵکێشیی:١- باسی خواناسیی و، ئیمان بە

خـواو، چاکـەو نیعمەتەکانـی خـوا.٢- باسـی ئیـمان بـە وەحیـی و بـە پێغەمبەرایەتیـی موحەممـەد ﷺو قورئـان.٣- باسـی ئیـمان بـە ڕۆژی دوایـی و سـزاو پاداشـت و بەهەشـت و دۆزەخ.

دەرسی دووەم: ئایەتەکانـی: (٩ - ١٤)، واتـە: لـە شـەش ئایـەت پێـك دێ، تـەوەری سـەرەکیی ئـەم دەرسـە بریتیـە لـە باسـی خواناسـیی و خـوا پەرسـتیی و، نیشـانەو چاکەکانـی خـوا ﷻ لـە ژیانـی مرۆڤـدا.

دەرسـی سـێیەم: ئایەتەکانـی: (١٥ - ٢٦)، واتـە: لـە دوازدە ئایـەت پێـك دێ، باسـی ئیـمان بـە خـواو، ئیـمان بـە ڕۆژی دوایـی و، ئیـمان بـە وەحیـی و پەیامـی خـواو، بـەراوردی نێـوان بـڕواداران و بێبڕوایـان و، سـەرەنجامی چـاك و پەسـندی بـڕواداران و، شـووم و بێخێـری بێبڕوایـان.

دەرسـی چـوارەم: ئایەتـەکانی: (٢٧ - ٣٧)، واتـە: لـە یـازدە ئایـەت پێـك دێ، باسـی زانایانـی خـاوەن سـام و بیـم بەرانبـەر بـە خـواو، ئەوانـەی کتێبـی خـوا ﷻ دەخوێننـەوەو، لـەوەی خـوا ﷻ پێیـداون دەبەخشـن، پاشـان سـەرەنجامی بـڕواداران و بێبڕوایـان، لـەم یـازدە ئایەتـە موبارەکـەدا، بـە وردەکارییـەوە، کـە هـەم بـڕواداران چ سـەرەنجامێکی پـڕ خێـرو بەرەکەتیـان هەیـەو، هـەم بێبڕوایـان چ سـەرەنجامێکی شـووم و نەگبەتیـان هەیـە؟!

دەرسـی پێنجـەم و کۆتایـی: ئایەتـەکانی: (٣٨ - ٤٥)، واتـە: لـە هەشـت ئایـەت پێـك دێ، دیسـان بـاسی خـوا ﷻو، سـیفەت و کـردەوەو نیعمەتەکانـی و، باسـی پێغەمبەرایەتیـی و وەحیـی، هەروەهـا سـەرنجدانی مێـژوو و یاساکانی خـوا لـە ژیانـی بەشـەرداو، باسـی قیامـەت و ڕۆژی دوایـی، لـە کۆتاییشـدا خـوا ﷻ ئـەو ڕاسـتییەی خسـتۆتە ڕوو، کـە پەلـە نـاکات لـە سـزادانی مرۆڤـە تاوانبـارو لادەرو خراپـەکارەکان، ئەگەرنـا نـەك هـەر ئـەوان، بەڵکـو ژیانـداری لەسـەر زەوی نەدەهێشـت.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە هەشـت (٨) ئایـەتی سـەرەتای سـوورەتی (فاطـر) پێـك دێ، ئایەتـەكانی: (١ - ٨)، كـە بـە شـێوەیەكی گشـتیی بـاس لـەم بابەتانـە دەكات:

١- سێ ئایەتی یەكەمی ئەم هەشت ئایەتە، بۆ باسی خواناسیی و، هەندێك لە سیفەتەكانی خواو، خستنە ڕووی ژمارەیەك لە چاكەكانی خوا ﷻ تەرخانكراون.

٢- لە ئایەتی چوارەمیشدا، ئاماژەیەك بە باسی پێغەمبەرایەتیی موحەممەد ﷺ كراوە.

٣- چوار ئایەتی دووەمیش تەرخانكراون، بۆ باسی ڕۆژی دوایی و، دوژمنایەتیی شەیتان بۆ مرۆڤ و، سەرەنجامی شوومی كافران و، ئاكام خێریی بڕواداران و، ڕازێنرانەوەی كردەوەی خراپی كافران بۆیان و، ئامۆژگاریی كردنی خوا ﷻ بۆ پێغەمبەرەكەی ﷺ، كە لە خەفەتی بێبڕوایەكان خۆی نەفەوتێنێ و، خۆی لە بەین نەبات لە زێدە پەرێشانیی و خەفەتباریی بۆیان، خوا ﷻ ئامۆژگاریی پێغەمبەر ﷺ دەكات كە بەو شێوەیە نەكات، ئنجا كە خوا ﷻ ئاوا ئامۆژگاریی پێغەمبەر ﷺ دەكات، ئەوە خاڵێكی زۆر بەهێزی پێغەمبەری خوایە ﷺ، كە ئەوەندە بە تەنگ ئەو خەڵكەوە بووە، هەم لەم سوورەتەو، هەم لە چەند شوێنێكی دیكەی قورئاندا، خوا ﷻ بە پێویستیی زانیوە، ئامۆژگاریی پێغەمبەرەكەی بكات، كە زۆر خۆی نارەحەت نەكات.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ جَاعِلِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا أُو۟لِىٓ أَجْنِحَةٍ مَّثْنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ ۚ يَزِيدُ فِى ٱلْخَلْقِ مَا يَشَآءُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١﴾ مَّا يَفْتَحِ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ مِن رَّحْمَةٍ فَلَا مُمْسِكَ لَهَا ۖ وَمَا يُمْسِكْ فَلَا مُرْسِلَ لَهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ ۚ

هَلْ مِنْ خَٰلِقٍ غَيْرُ ٱللَّهِ يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ﴿٣﴾ وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ ۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ﴿٤﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ۖ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ ﴿٥﴾ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّا ۚ إِنَّمَا يَدْعُوا۟ حِزْبَهُۥ لِيَكُونُوا۟ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٦﴾ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ ۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ ﴿٧﴾ أَفَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ فَرَءَاهُ حَسَنًا ۖ فَإِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ ۖ فَلَا تَذْهَبْ نَفْسُكَ عَلَيْهِمْ حَسَرَٰتٍ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٨﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە . ستایش بۆ خوا داهێنەری ئاسمانەکان و زەوی، گێڕەری فریشتەکان بە نوێنەرو خاوەنی باڵان: دوو دوو و، سێ سێ و، چوار چوار، خوا ئەوەی بیەوێ لە دروستکراوەکانیدا زیادی دەکات، بێگومان خوا لەسەر هەموو شتێك بە توانایە ﴿١﴾ (دەرگای) هەر بەزەییەك خوا بۆ خەڵکی بیکاتەوە (هیچ کەس و هیچ شتێك) (داخەرو) گێڕەوەی نیەو، هەرچی ئەویش بیگرێتەوە، دوای وی هیچ نێرەرێکی نیەو، ئەو زاڵی کارزانە ﴿٢﴾ ئەی خەڵکینە! یادی چاکەی خوا بکەنەوە بەسەر خۆتانەوە، ئایا جگە لە خوا هیچ بەدیهێنەرێك هەیە لە ئاسمان و زەوییەوە بژیوتان بداتێ؟! کەواتە: جگە لەو هیچ پەرستراوێك نیە، بەرەو کوێ لادەدرێن؟! ﴿٣﴾ (ئەی موحەممەد!) ئەگەر (ئەو خەڵکە) بە درۆشت دابنێن، بە دڵنیایی پێش تۆ پێغەمبەرانێك (کە زۆر پایە بەرز بوون) بەدرۆ دانراون و، کارو بارەکانیش تەنیا بۆ لای خوا دەگێڕدرێنەوە ﴿٤﴾ ئەی خەڵکینە! مسۆگەر بەڵێنی خوا (کە ڕۆژی دوایی دێ) ڕاست و چەسپاوە، ئنجا با ژیانی دنیا فریوتان نەدات و، (شەیتانی) فریودەریش لە بارەی خواوە فریوتان نەدات ﴿٥﴾ بە دڵنیایی شەیتان دوژمنێکی تایبەتتانە، ئنجا ئێوەش بە

دوژمنی بگرن، (بیکەنە دوژمنی خۆتان)، ئەو (شەیتان) کۆمەڵەکەی خۆی تەنیا بۆ ئەوە بانگ دەکات، تاکو ببنە هاوەڵی بڵێسە (ی دۆزەخ) ﴿٦﴾ ئەوانەی بێبڕوا بوون ئازارێکی توندیان هەیە (لە ڕۆژی دوایی دا)و، کەسانێکیش کە بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکانیان کردوون، لێبوردن و پاداشتێکی گەورەیان هەیە ﴿٧﴾ ئایا کەسێك کە کردەوە خراپەکەی خۆی بۆ ڕازێنراوەتەوەو بە چاکی بینیوە (وەك کەسێکە، کە چاکەو خراپە لە یەك جیا دەکاتەوە؟! ئەویش بە هۆی ئەوەوەیە) چونکە بێگومان خوا هەر کەسێکی بوێ، گومڕای دەکات و، هەر کەسێکیشی بوێ، ڕاستە ڕێی دەکات، (کەواتە:) {ئەی موحەممەد!} لە خەفەتان خۆتیان لەسەر مەفەوتێنە، بێگومان خوا بەوەی کارامانە دەیکەن زانایە ﴿٨﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(فَاطِرِ): (أَصْلُ الفَطْرِ: الشَّقُّ طُولًا، فَطْرُ اللهِ الخَلْقَ: هُوَ إِيْجَادُهُ الشَّيءَ وَإِبْدَاعُهُ عَلَى هَيْئَةٍ مُتَرَشِّحَةٍ لِفِعْلٍ مِنَ الأَفْعَالِ)، وشەی (فَاطِر) لە (فَطْر)ەوە هاتوە، (فَطْر): بریتیە لەوە کە شتێك بە باری درێژییدا لەت بکرێ، (فَطْرُ اللّٰهِ الخَلْقَ): بریتیە لە پەیداکردنی خواو داهێنانی بۆ هەر شتێك، کە ئامادەی بکات بۆ ئەنجامدانی کارێك.

(فَأَنَّى): (أَنَّى) (لِلبَحْثِ عَنِ الحَالِ وَالمَكَانِ، بِمَعْنَى: كَيْفَ وَأَيْنَ)، وشەی (أَنَّى) بەکاردەهێنرێ بۆ لێکۆڵینەوە لە بارەی حاڵ و شوێن، کەواتە: (أَنَّى) بە مانای (كَيْفَ) دێ، واتە: چۆن، بە مانای (أَيْنَ)ش دێ، واتە: لە کوێ.

(تُؤْفَكُونَ): واتە: لادەدرێن، (الإِفْكُ: كُلُّ مَصْرُوفٍ عَنْ وَجْهِهِ الَّذِي يَحِقُّ أَنْ يَكُونَ عَلَيْهِ)، والإفك: الكذب وشەی (إِفْك): بریتیە لە هەر شتێك لەو ڕووەی کە پێویست بووە لەسەری بێ، لابدرێ، هەروەها وشەی (إِفْك)، بە مانای درۆ (كَذِب)یش دێ.

(ٱلْغَرُورُ): (الغُـرُورُ وَالتَّغرِيـرُ: إِيهَـامُ النَّفْـعِ وَالصَّـلَاحِ فِيـمَا هُـوَ ضُرٌّ وَفَسَـاد)، (غُـرُور) و (تَغرِيـر): بریتیـە لـەوەی کەسـێك وا ئیخفـاڵ بکـەی کـە سـوودو چاکـەی لـەو شتەدایە، لـە حاڵێکـدا کـە ئـەو شـتە زیـان و خراپـەی بـۆ ئـەو تێدابـێ، بـەڵام (غَـرُور) واتـە: فریـودەر، (غُرُور)یـش چاوگـە: فریـودان.

(حَسَرَٰتٍ): (جمـع) (الحَسْرَةُ: الغَـمُّ عَلَى مَا فَاتَـهُ وَالنَّـدَم)، (حَسْرَة) کـە بـە (حَسَرات) کۆدەکرێتـەوە، بریتیـە لـە خەفـەت خـواردن بـۆ شـتێك کـە لـە دەسـت چـووەو، بـۆ پەشـێمان بوونـەوەو ژیـوان بوونـەوەی.

(يَصۡنَعُونَ): واتـە: بـە کارامەیـی ئەنجامـی دەدەن، بـە وردەکاریـی دەیکـەن، (الصُّنـعُ: إِجَـادَةُ الفِعْـلِ، فَكُلُّ صُنـعٍ فِعْـلٌ، وَلَيْـسَ كُلُّ فِعْـلٍ صُنْعَـاً)، (صُنـع): بریتیـە لـەوە کـە شـتێك بـە چاکیـی و بـە کارامەیـی و بـە لێزانیـی بکـرێ، بۆیـە هەمـوو (صُنع)ێـك (فِعْل)یشـە، بـەڵام مـەرج نیـە هەمـوو (فِعْل)ێـك (صُنـع) بـێ، چونکـە هـەر شـتێك بـە کارامەیـی بکـرێ، مانـای وایـە ئەنجامـدراوە، بـەڵام مـەرج نیـە هـەر شـتێك کـرا، بـە کارامەیـی و وردەکاریـی و لێزانیـی ئەنجامدرابـێ.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، واتە:

دەستپێکردنم بە ناوی خوایە، ئنجا پێویستە لە کاتی گوتنی ئەم ڕستە موبارەکەدا، بەلای کەمەوە چوار واتا لەدڵ بگیرێن:

١ - ئەم کارە تەنها بۆ خوا دەکەم.

٢ - ئەم کارە بە پێی شەرعی خوا دەیکەم.

٣ - ئەم کارە بە تواناو یارمەتیی خوای پەروەردگار دەیکەم.

٤ - ئەم کارە بۆ هێنانەدی ڕەزامەندیی خوا ئەنجام دەدەم.

وەك کاتی خۆی لە تەفسیری سوورەتی (سبأ)یش دا، گوتمان: پێنج سوورەت لە قورئاندا بە (الحمدلله) دەست پێ دەکەن، بە پێی ڕیزبەندیی موصحەف، بەم شێوەیە:

١- سوورەتی (**الفاتحة**): ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢﴾ ﴾.

٢- سوورەتی (**الأنعام**): ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَجَعَلَ ٱلظُّلُمَٰتِ وَٱلنُّورَ ثُمَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ ﴿١﴾ ﴾.

٣- سوورەتی (**الکهف**): ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبْدِهِ ٱلْكِتَٰبَ وَلَمْ يَجْعَل لَّهُۥ عِوَجَا ﴿١﴾ ﴾.

٤- سوورەتی (سبأ): ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَهُ ٱلْحَمْدُ فِى ٱلْءَاخِرَةِ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١﴾ ﴾.

٥- سووورەتی (فاطر): ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ جَاعِلِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا أُو۟لِىٓ أَجْنِحَةٍ مَّثْنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ ۚ يَزِيدُ فِى ٱلْخَلْقِ مَا يَشَآءُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١﴾﴾.

لە تەفسیری سوورەتی (سبأ)دا، باسمان کرد، کە هەر کام لەم پێنج دەستپێکە بە ستایشی خوا ﷻ، لایەنێك لە ژیانی مرۆڤ دەگرنەوە، کە ژیانی مرۆڤ بەبێ ئەوە بەڕێوەناچێ، لەوێدا بە درێژیی باسمان کردووە، پێویست ناکات لێرەدا دووبارەی بکەینەوە.

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾، ستایش بۆ خوای بەدیهێنەرو پەیداکەری ئاسمانەکان و زەوی، وشەی (فاطر) و (خالق) جیاوازییەکەیان ئەوەیە: (خالق) لە زمانی کوردییدا واتە: پەیداکەر، بەڵام (فاطر) واتە: داهێنەر، هەرچەندە زمانی کوردیی لە چاو زمانی عەرەبیی زمانێکی هەژارەو، زمانەکانی دیکەش لە چاو زمانی عەرەبیی هەر هەژارن، بە تایبەت ئەو زمانەی خوا ﷻ بۆ فەرمایشتەکەی خۆی، بۆ قورئان بەکاری هێناوە، بێگومان هەر وشەیەك، چەمك و واتای تایبەتیی خۆی هەیە، وشەی هاوواتا (مترادف) لە قورئاندا نین، من ئەو ڕایەی زانایانم پێ پەسندە کە دەڵێن: وشەی هاوواتا (مُتَرَادِف) کە بێژەکەیان جیا بێ و واتایان یەك بێ، لە قورئاندا نین، بەڵێ دەگونجێ لە یەك نیزیك بن، بەڵام هەر وشەیەك کە لە قورئاندا بەکارهێنراوە، بە تەئکید تایبەتمەندییەکی خۆی هەیە، لەو سیاقەدا کە تێیدا بەکارهاتوە.

لێرەدا خوا ﷻ دەفەرموێ: ستایش بۆ ئەو خوایەی داهێنەرو پەیداکەری ئاسمانەکان و زەوییە، ﴿جَاعِلِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا﴾، گێڕەری فریشتەکانە بە نوێنەرو نێردراو، خوا ﷻ کە دەفەرموێ: فریشتەکانی کردۆتە نوێنەرو ڕەوانەکراوی خۆی، وا پێدەچێ مەبەست پێی ئەوەبێ، کە خوا ﷻ هەندێ لە فریشتەکان دەنێرێ، وەك نوێنەرو پەیامداری خۆی بۆ لای پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) کە وەحییان پێدا دەنێرێ، ئنجا ئەو فریشتانە: ﴿أُو۟لِىٓ أَجْنِحَةٍ مَّثْنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ﴾، خاوەنی

باڵەکانن، (أولِي) واتە: (أَصْحَاب) کۆی (صاحب)ە، یانی: خاوەن و هاوەڵ (أَجْنِحَة) ش کۆی (جَنَاح)ە، واتە: باڵ، ئنجا ﴿مَّثْنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ﴾، (مَثْنَى) واتە: (اثْنَيْن اثْنَيْن)، (ثُلَاث) واتە: (ثَلَاثاً ثَلَاث)، (رُبَاع) واتە: (أَرْبَعَةً أَرْبَعَة)، واتە: فریشتەکان دوو دوو باڵیان هەن، سێ سێ باڵیان هەن، چوار چوار باڵیان هەن، ﴿يَزِيدُ فِي ٱلْخَلْقِ مَا يَشَآءُ﴾، ئەوەی کە بیەوێ لە دروستکراوی خۆی زیادی دەکات، واتە: مەرجیش نیە هەر ئەو سێ جۆرە بن، دوو دوو باڵیان هەبن، یان سێ سێ، یان چوار چوار، بەڵکو دەگونجێ زیاترش بن، وەك لە فەرموودەیەکدا هاتوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ جیبریلی بینیوە، شەشسەد (٦٠٠) باڵی هەبووە[1]، ﴿يَزِيدُ فِي ٱلْخَلْقِ مَا يَشَآءُ﴾، ئەوەش دەگرێتەوە کە ئەگەر کەسێك بڵێ: ئنجا ئێمە هەر باڵندەمان بینیوە دوو باڵی هەبوون، یانی: چی فریشتە دوو باڵیان هەن، یان سێ باڵیان هەن؟! خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەوەی کە بیەوێ لە دروستکراوی خۆی دا زیادی دەکات، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾، بە دڵنیایی خوا لەسەر هەموو شتێك بە توانایە.

خوا ﷻ دوای ئەو پێناسەیەی خۆی و، ستاییش کردنی خۆی، هەروەها کە فریشتەکانی کردوون بە نوێنەری خۆی کە خاوەنی باڵەکانن، ئنجا دەفەرموێ:

﴿مَّا يَفْتَحِ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ مِن رَّحْمَةٍ فَلَا مُمْسِكَ لَهَا﴾، خوا ئەوەی کە لە بەزەیی خۆی بۆ خەڵکی دەیکاتەوەو، دەرگای لێ دەکاتەوەو، ڕێگای لێ دەکاتەوە بۆ لای خەڵك، ﴿فَلَا مُمْسِكَ لَهَا﴾، واتە: هیچ گیرەرەوەی نیە، (مُمْسِك) واتە: گیرەرەوە، کەسێك کە شتێك بگرێتەوە، ﴿وَمَا يُمْسِكْ فَلَا مُرْسِلَ لَهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ﴾، ئەوەش کە خوا ﷻ بیگرێتەوە لە بەزەیی خۆی و، بەخششی خۆی، ﴿فَلَا مُرْسِلَ لَهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ﴾، لە دوای خوا هیچ نێرەرێکی نیەو، هیچ کەسێك و هیچ شتێك نیە، بتوانێ دەرگای ئەو ڕەحمەت و بەزەییەی خوا ﷻ کە گرتوویەتەوە، لێی بکاتەوەو بینێرێ، ﴿وَهُوَ

---

(١) [عَنْ زِرٍّ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: (مَا كَذَبَ الْفُؤَادُ مَا رَأَى) قَالَ: رَأَى جِبْرِيلَ - عَلَيْهِ السَّلَامُ - لَهُ سِتُّمِائَةِ جَنَاحٍ] أخرجه مسلم: ٤١٥.

ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾، ئـەو (خـوا ﷻ) باڵادەسـتی کاربەجێیـە، باڵادەسـتە بـۆ هـەر کەسـێك لـە هـەر شـوێنێك بێـت، دەتوانـێ بەزەیـی و بەخششـی پێـی بگەیەنـێ، هەروەهـا کاربەجـێ و کارزانـە، دەزانـێ کـە بـۆ هـەر کەسـە چەنـدو چـۆن و چـی بـۆ دەنێـرێ؟ هەروەهـا کاربەجـێ و کارزانـەو باڵادەسـتە، بـۆ هـەر کەسـێك کـە بەزەیـی خـۆی لـێ بگرێتـەوە، دەزانـێ بۆچـی لێـی دەگرێتـەوەو، چەنـدی لـێ دەگرێتـەوەو، چـی لـێ دەگرێتـەوە؟ خـوا ﷻ ئەوپـەڕی حیکمـەت و لێزانیـی و کارزانیـی هەیـە لـەو بـارەوە.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱذْكُرُواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ ﴾، خـوا ﷻ بانگـی مرۆڤایەتیـی دەکات، ئـەی خەڵکینـە! یـادی چاکـەی خـوا بکەنـەوە بەسـەر خۆتانـەوە، ﴿ هَلْ مِنْ خَٰلِقٍ غَيْرُ ٱللَّهِ يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، ئایـا جگـە لـە خـوا بەدیهێنەرێـکی دیکـە هەیـە لـە ئاسـمان و زەویـەوە، {لـە سـەرو خـوارەوە} بژیوتـان پـێ بـدات، هـەر جـۆرە بژیوێـك، بژیـوی ماددیـی، یـان مەعنەویـی بـە هەمـوو جۆرەکانیانـەوە؟ ﴿ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾، جگـە لـەو هیـچ پەرسـتراوێك نیـە، ﴿ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ﴾، بـۆ کـوێ لادەدرێـن؟! یـان چـۆن لادەدرێـن؟! واتـە: مـادام تەنیـا خـوا ﷻ ئـەو بەدیهێنەرەیـە کـە هەمـوو شـتێکی هێناوەتـە دی، بژیودەرێکـە بـەس ئـەو بژیوتـان دەدات لـە ئاسـمان و زەوییـەوە، کەواتـە: هـەر ئەویـش شایسـتەی پەرسـترانەو، جگـە لـەو هیـچ پەرسـتراوێك نیـە، کەواتـە: بـۆ کـوێ لادەدرێـن؟! چـۆن لادەدرێـن بەمـلاو لادا؟! کـە جگـە لـە خـوا بپەرسـتن، هەندێـك لـە دروسـتکراوەکان بەشـێك لـە بەندایەتیـی و پەرسـتنیان بـۆ دابنێـن و، لـە پەرسـتراندا لەگـەڵ خـوادا ﷻ بیانکـەن بـە هاوبـەش؟!

ئـەم سـێ ئایەتـە کـە تێپەریـن، هەموویـان باسـی خـوا ﷻو، ناسـاندنی خـواو، خواناسـیی و ئیمـان بـە خـواو، باسـی هەنـدێ لە کـردەوەو سـیفەتە بـەرزو ناوەزەکانی خـوا، بـوون.

ئنجـا دێتـە سـەر باسـی پێغەمبەرایەتیـی موحەممـەد ﷺ، دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ ﴾، ئەگـەر کافـرەکانی ڕۆژگاری خـۆت، یاخـود

کافـرەکانی ڕۆژگارەکانی دی، بـە درۆت دابنێـن، چونکـە تـۆ بـۆ هەمـوو مرۆڤایەتیـی ڕەوانـە کـراوی، ﴿فَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ﴾، لـە پێـش تۆشـدا پێغەمبەرانێـکی پایـە بـەرز بـە درۆ دانـراون، ﴿وَإِلَى اللَّهِ تُرْجَعُ الْأُمُورُ﴾، کاروبارەکانیـش تەنیـا بـۆ لای خـوا دەگێڕدرێنـەوە، واتـە: ئـەی موحەممـەد ﷺ! تـۆ دڵـت لـە خـۆت دا نەمێنـێ، چونکـە تـۆ تاکـە پێغەمبەرێـك نەبـووی، بـە درۆ دانـراوی، بەڵکـو ئـەوە عـادەتی لەمێژینـەی ئەهـلی کوفـرە، کـە هەیانـە پەیـام و بەرنامـەی خـوا لـە عەقڵییـەوە ناچـێ، چونکـە عەقڵـی تەسـکەو دڵـی بچووکـە، هەشـیانە دەزانـێ پەیـام و بەرنامـەی خـوا چۆنـە؟ دەزانـێ کـە هەقـە، بـەڵام لەگـەڵ ئـەو شـێوە ژیانـە ناهەقـەدا کـە لەسـەریەتی، ناگونجـێ، بـە تایبـەت دەسـتەڵاتدارانیان کـە دەسـتەڵات و سـامانیان بـۆ خۆیـان قۆرخ کـردووە، دەسـتیان بەسـەر هەمـوو شـتێکدا گرتـوە، ئـەو ئاییـن و پەیامـە هەقـەی خـواش ﷻ دەفەرمـوێ: دەبـێ مرۆڤـەکان پێکـەوە بـراو تەبابـن، نـازو نیعمەتـەکانی خوا بـۆ هەموویانـن بـە یەکسـانیی، ئـەو پەیـام و بەرنامەیـە لەگـەڵ ئـەو بارودۆخـە سیاسـیی و، ئابووریـی و، کۆمەڵایەتیـی و، ئـەو بـەزم و بـازاڕە ناشـەرعییەدا ناگونجـێ، کـە ئـەوان بـۆ خۆیانیـان سـاز کـردوە، چونکـە ئەگـەر ئـەو بەرنامەیـەی خـوا بچەسـپێ، ئـەو بـەزم و بـازاڕە ناشـەرعییەی ئـەوان تێکدەچـێ، بۆیـە حوکمڕانـەکان دژایەتیـی دەکـەن و بـە درۆی دادەنێـن، چونکـە ئەگـەر بڵێـن ڕاسـتەو تـۆ پێغەمبـەری خـوای، دەبـێ پێیـەوە پابەندبـن، ئـەو کاتـە خەڵکەکـەش لێیـان هەڵدەگەڕێتـەوە، بـەڵام نەخێـر بـۆ چەواشـەکردنی خەڵکەکـە، پێغەمبەرانیـان بـە درۆ دانـاوەو، دەڵێـن نەخێـر تـۆ ڕاسـت ناکـەی و، پێغەمبـەری خـوا نـی و، خـوا ﷻ ڕەوانـی نەکـردووی، ئـەوەش کـە تـۆ دەڵێـی ئاییـن و بەرنامـەی خوایـە، ڕاسـت نیـە! بـۆ ئـەوەی ئاگربـڕ بکـەن لـەوە کـە خەڵکەکـە بـڕوا بـە پێغەمبـەران بێنـێ و، سـەرەنجام ئـەو سـۆغرەو بێـگارو، نۆکەرایەتییـەی بـۆ ئـەو خۆبەزلگرانـە دەیکـەن، چیدیکـە نەیکـەن و، ئـەو بـارەی ئـەوان لەسـەر پشـتی خۆیـان لابـەرن، زلەزلـەکان بـۆ ئـەوەی ئاگربـڕی ئـەوە بکـەن و ڕێ لـەوە بگـرن، هـەر لـە ڕێـوە گوتوویانـە: پێغەمبـەران ڕاسـت ناکـەن و

پەیامەکەیان بە درۆ داناون، ﴿ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ﴾، کاروبارەکانیش تەنیا بۆ لای خوا دەگێڕدرێنەوە، کەواتە: تۆ دەربەست مەبە، سزای ئەو خەڵکەی بە ناهەق تۆ بە درۆ دادەنێن، خوا بەس بۆ خۆی دەزانێ چۆنیان سزا دەدات!

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر باسی بنەڕەتی سێیەمی دینداریی و مسوڵمانەتیی، کە بریتیە لە بڕوا بە ڕۆژی دوایی و، بە سزاو پاداشتی خوا، دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ﴾، ئەی خەڵکینە! بە دڵنیایی بەڵێنی خوا ڕاستە، واتە: بەڵێنی خوا کە لە ڕۆژی دوایی دا دێ، هەقەو چەسپاوە، ﴿ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا ﴾، ئنجا با ژیانی دنیا فریوتان نەدات، ﴿ وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ ﴾، هەروەها با فریودەر لە بەرانبەر خوادا فریوتان نەدات، بڵێ: خوا لێبوردەیەو بەزەیی و بەخششی زۆرە، ئایا خوا ﷻ چ پێویستی بەوە هەیە، ئێوە سزا بدات؟ با بەو جۆرە قسانە کڵاوتان لەسەر نەنێ، کێیە ئەو فریودەرە؟ ئەو فریودەرە زیاتر وا پێدەچێ مەبەست پێی شەیتان (إِبْلِيس) بێ، هەروەها هەموو ئەوانەی کە دارو دەستەی ئیبلیسن، بەڵام مادام خوا ﷻ نەیفەرموە: (وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِاللهِ إِبْلِيس) یان (وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِاللهِ الشَّيْطَان)، (غَرُوُر): واتە: فریودەر بە پلەی یەکەم، شەیتان دەگرێتەوە، بەڵام هەر شتێکی دیکەو هەر کەسێکی دیکەش دەگرێتەوە کە هەمان ڕۆڵی شەیتان ببینێ، لە فریودانی خەڵکیدا بە تایبەت بەرانبەر بە خوا ﷻ.

دوایی دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّا ﴾، واتە: بە دڵنیایی شەیتان دوژمنە بۆ ئێوە، ئێوەش بە دوژمنی بگرن، واتە: بە دوژمنی خۆتانی بزانن و دوژمنایەتیی بکەن، ﴿ إِنَّمَا يَدْعُواْ حِزْبَهُۥ لِيَكُونُواْ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴾، بە دڵنیایی شەیتان کۆمەڵەکەی خۆی تەنیا بۆ ئەوە بانگ دەکات، تاکو ببنە هاوەڵی کڵپەی دۆزەخ، (السَّعِيْر): بریتیە لەو کڵپەیەی ئاگر کە بەرزدەبێتەوەو شین دەنوێنێ، واتە: شەیتان ئەوانەی کە دەیەوێ بیانکاتە کۆمەڵی خۆی، تەنیا بۆ ئەوە بانگیان دەکات، بیانکاتە هاوەڵی کڵپەی دۆزەخ، کەواتە: ئێوە مەبنە هاوەڵی شەیتان و

شوێنی مەکەون و، پەیڕەویی لێ مەکەن، ئەگەرنا دەوری خۆی بە ئێوە فەڕەباڵغ دەکات، لە دنیادا وەك فریودان و هەڵخەڵەتان، لە دوارۆژیشدا وەك سزادران.

ئنجا خوا ﷻ باسی سەرەنجامی بێبڕوایان و پاشان بڕواداران دەکات، دەفەرمویّ: ﴿ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدٞ ﴾، ئەوانەی بێبڕوان بە هەر شتێك کە پێویست بووە بڕوایان پێ بهێنن، بەهەرکامیان: بێبڕوان بە خوا، یان بە فریشتەکانی خوا، یان بە کتێبەکانی خوا، یان بە پێغەمبەرانی، یان بە ڕۆژی دوایی هتد...، ئەوانەی بێبڕوا بوون: ﴿ لَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدٞ ﴾، سزایەکی توندیان هەیە کە بریتیە لە دۆزەخ، ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾، بەڵام ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکانیان ئەنجامداون، بڕوایان هێناوە واتە: بڕوایان هێناوە بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە بڕوایان پێ بهێنن، بڕوایان هێناوە بە خوا ﷻو بە فریشتەکانی خواو بە کتێبەکانی خواو بە پێغەمبەرانی خواو بە ڕۆژی دوایی، هەروەها بە نەخشەو ئەندازەگیریی خوا بۆ گەردوون و، بۆ هەموو دروستکراوەکان (قەزاو قەدەر)، تا بۆ ئەو بڕوادارانە: ﴿ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٞ كَبِيرٌ ﴾، لێبوردنێکی ناوازەو پاداشتێکی گەورەیان هەیە.

لە کۆتاییدا خوا ﷻ دەفەرمویّ: ﴿ أَفَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ فَرَءَاهُ حَسَنٗا ﴾، ئایا کەسێك کە کردەوە خراپەکەی خۆی بۆ ڕازێنراوەتەوە، کەچی چاك و جوانی بینیوە، واتە: کردەوە خراپەکە کە لە خودی خۆیدا خراپەو ناپەسندو قێزەونە، بەڵام ئەو بۆی ڕازێنراوەتەوەو جوانکراوەو، بە جوان و چاك هاتۆتە بەرچاوی، هەرچەندە لێرەدا بەرانبەرەکەی باس نەکراوە، بەڵام واتە: کەسێك کە کردەوە خراپەکەی بۆ ڕازێنراوەتەوە، ئایا کەسێك کە ئاوایە، وەك ئەو کەسەیە کە چاك بە چاك و، خراپ بە خراپ دەبینێ؟! بە دڵنیایی نەخێر! ئەم پرسیارکردنە پرسیارکردنی نکووڵییلێکەرانەیە، واتە: ئەوکەسەی کردەوەی خراپی بۆ ڕازێنراوەتەوەو، بە چاکی بینیوە، وەك کەسێك نیە کە کردەوەی چاکی خۆی بە چاك دەبینێ و، هی خراپیش بە خراپ، ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُ ﴾، بە دڵنیایی خوا هەر کەسێکی بیەوێ گومڕای

دەكات و، لـە ڕێ لای دەداو سـەری لـێ دەشـێوێنێ، هـەر كەسێكیشـی بیـەوێ دەیخاتـە سـەر ڕێ، لێـرەدا هیدایـەت بـە مانـای ڕێنمایـی و ڕێ پیشـاندان نیـە، چونكـە خـوا ﷻ ویسـتوویەتی ڕێ بـە هەموو كەس نیشـان بـدات، وەك دەفەرمـوێ: ﴿وَهُدًى لِّلْعَٰلَمِينَ﴾، یـان دەفەرمـوێ: ﴿ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ ۝٥٢﴾القلـم، بەڵكـو لێـرەدا مەبەسـت لە هیدایـەت، واتە: خسـتنە سـەر ڕێـی ڕاسـت، كـە دەفەرمـوێ: بێگومـان خـوا ﷻ هـەر كەسـێ بیـەوێ گومـڕای دەكات و، هـەر كەسـێ بیـەوێ دەیخاتـە سـەر ڕاسـتە ڕێ، ئەمـە لێـرەدا بـە كورتیـی فەرموویـەتی، بـەڵام لـە شـوێنی دیكـەدا، خـوا ﷻ بۆمـان بـاس دەكات كـە گومڕا كـردن و، سـەر لـێ شـێواندنی خـوا، بـۆ هەندێـك لـە مرۆڤـەكان و، خسـتنە سـەر ڕێـی ڕاستیی هەندێكیـان، لـە گۆتـرە نیـە، بەڵكـو ئەویـش بـە پێـی سیسـتمێكەو، بە پێـی ئەو یاسـایانەیە كـە خـوا دایناون، بـە شـێوەیەكی دادگەرانەیـە، چونكـە غەیـری دادگەریـی و ڕاسـتیی، شایسـتەی خـوا نیـە، بۆ وێنـە لە سـوورەتی (إبراهیـم)دا دەفەرمـوێ: ﴿وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾، واتـە: خـوا ﷻ سـتەمكاران گومـڕا دەكات، نـەدی كـێ هیدایـەت دەدات یـانی: ڕاسـتە ڕێ دەكات؟ ﴿وَيَهْدِيٓ إِلَيْهِ مَنْ أَنَابَ ۝٢٧﴾الرعـد، واتـە: ئەوانـەی كـە بـۆ لای خـوا دەگەڕێنـەوە، خـوا ڕاسـتە ڕێیـان دەكات، بـەڵام ئەوانـەی چاویـان لـە سـتەم و خراپەیـە، خـوا ﷻ گومڕایـان دەكات.

ئنجـا خـوا ﷻ دێتـە سـەر ئامۆژگاریـی پێغەمبـەر ﷺ: ﴿فَلَا تَذْهَبْ نَفْسُكَ عَلَيْهِمْ حَسَرَٰتٍ﴾، ئـەی موحەممـەد ﷺ! بـا نەفسـت بـە هـۆی خەفـەت خواردنـەوە لـەوان، لەبەیـن نەچێـت، خـۆت مەفەوتێنـە بەهـۆی خـەم و خەفـەت خواردنـەوە لـەوان، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِمَا يَصْنَعُونَ﴾، بـە دڵنیایـی خـوا زانایـە بـەوەی كـە كارامانـەو وردەكارانە ئەنجامی دەدەن و، بـە هەمـوو شـتێكیان ئـاگادارەو، سـزای پـڕ بـە پێستیشـیان دەدات، كەواتـە: تـۆ لەبـەر ئـەوەی هیدایـەتی خـوا وەرناگـرن و ڕاسـتە ڕێ نابـن، خەفەتیـان لـێ مەخـۆو بۆیـان دڵتەنـگ مەبـە، بـە شـێوەیەك كـە ببێتـە هـۆی فەوتـان و لەبەیـن چـوونی خـۆت.

ئنجـا وەك پێشـتر ئاماژەمـان پێـدا، ئەمـە ئەوپـەڕی مەدحـی خوایـە ﷻ بـۆ پێغەمبـەری خاتـەم موحەممـەد ﷺ، هـەم لـەم سـوورەتەدا، هـەم لـە سـوورەتی

(الكهـف)داو، هـەم لـە سـەرەتای سـووڕەتی (الشـعراء)داو، لـە چەنـد شـوێنێكدا خـوا ﷻ لـە پێغەمبەرەكـەی قەدەغـە دەكات، كـە زیندەڕۆیـی بـكات لـە خەفـەت لێخـواردن و دڵ ناڕەحـەت بـوون بـۆ كافـرەكان، كـە بۆچـی هیدایـەتی خـوا وەرناگـرن و ڕاسـتە ڕێ نابـن؟ ئـەوەش مەدحێـكی گەورەیـە بـۆ پێغەمبـەری خـوا ﷺ، مانـای وایـە پێویسـتی بـەوە كـردوە، خـوای پـەروەردگار پێـی بفەرمـوێ: زۆر تێمەپەڕێنـەو سەركێشـیی مەكـە لـە دڵسـۆزیی نوانـدن و، خەفـەت خـواردن و خۆ ناڕەحـەت كردنت دا، لەبـەر ئـەوەی ئەوانـە هیدایـەتی خـوا وەرناگـرن و، نایەنـە سـەر ڕاسـتە شـەقامی خـوا ﷻ! ئنجـا ئـەوە لـە كـوێ و ئـەوە لـە كـوێ كـە كەسـانێ پێویسـتییان بـەوە بێـت نقورچكەیـان لـێ بـدرێ و، هـان بدرێـن و ئامۆژگاریـی بكرێـن كـە تـۆزێ هەسـت بـە بەرپرسـیاریەتیی بكـەن، تـۆزێ خەفـەت بـۆ خەڵـك بخـۆن، تـۆزێ بـە تەنگیانـەوە بـن، كەچـی پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ پێویسـتیی بـەوە بـووە، خـوا ﷻ ئامۆژگاریـی بـكات و بیگێڕێتـەوەو، بـە جۆرێـك لـە گلەیـی لێكـردن و سەرزەنشـتكردن بیدوێنـێ، كـە ئەوەنـدە خـۆت ناڕەحـەت مەكـە، ئنجـا پێغەمبـەری خـوا ﷺ زۆر خـۆی ناڕەحـەت كـردوەو، زۆر خەفـەتی بـۆ خـواردوون، دیـارە ئەوانـەش كـە بـە ڕێـی پێغەمبـەری خاتەمـدا ﷺ دەڕۆن، لـە زانایـان و، هـەر كەسـێك چـاوی لـەوە بـێ، پێغەمبـەری خـوا ﷺ سـەر مەشـقی بـێ، دەبـێ هـەر بـەو شـێوەیە بێـت، واتـە: وابـێ كـە ئەوپـەڕی دڵسـۆزیی و پەرۆشـیی هەبێـت، بـۆ خەڵـك و كۆمەڵـگای خـۆی، چونكـە پێغەمبـەر ﷺ بـەو شـێوەیە بـووە، دەبـێ شـوێنكەوتووانی ڕەسـەنیشی چـاو لـە پێغەمبەرەكەیـان بكـەن، لـە هەمـوو ئـەو سـیفەتە بـەرزو نـاوازەو ئـاكارە جـوان و پەسـندانەیدا، كـە خـوای پـەروەردگار ئـەوی پێیـان ڕازاندۆتـەوەو، وەك بـۆ خـۆی دەفەرمـوێ: {إِنَّمَـا بُعِثْـتُ لِأُتَمِّـمَ مَكَارِمَ الأَخْلَاقِ} (أخرجـه الحاكـم: ٤٢٢١، وقـال: صحيـح علـى شرط مسـلم، الديلمـي: ٢٠٩٨)، واتـە: تەنیـا بـۆ ئـەوە ڕەوانكـراوم كـە ڕەوشـتە بـەرزو جوانـەكان تـەواو بكـەم، لـە خۆمیانـدا بەرجەسـتە بكـەم.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**ڕاگەیەنرانی ستایشکرانی خوای داهێنەری ئاسمانەکان و زەوی و، گێڕەری فریشتە خاوەن دوو و سێ و چوار باڵەکان بە نوێنەرو، خستنە ڕووی ئەوە کە هەر بەزەیی و بەخششێك خوا بۆ خەڵکی بڕەخسێنێ، گێرەرەوەی نیەو، ئەوەی بیشیگرێتەوە، نێرەری نیەو، ئەو زاڵی کارزانە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ جَاعِلِ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا أُوْلِيٓ أَجۡنِحَةٖ مَّثۡنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَۚ يَزِيدُ فِي ٱلۡخَلۡقِ مَا يَشَآءُۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ١ مَّا يَفۡتَحِ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ مِن رَّحۡمَةٖ فَلَا مُمۡسِكَ لَهَاۖ وَمَا يُمۡسِكۡ فَلَا مُرۡسِلَ لَهُۥ مِنۢ بَعۡدِهِۦۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ٢﴾.
**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە هەشت بڕگەدا:**

**١)- ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾، ستایش بۆ خوای پەیداکەرو داهێنەری ئاسمانەکان و زەوی، پێشتریش گوتمان: (فَاطِر) لە (فَطْر)ەوە هاتوە، (فَطْر)یش (هُوَ الشَّقُّ طُولًا)، شتێك کە بە باری درێژییدا لەت بکرێ، وشەی: (فَطَرَ) واتە: شتێکی هێنایە دی، کە پێشینەی نەبووەو، بە خێراییش ئەنجامی بدات، ئەوە پێی دەگوترێ: (فَطَر)، وەك چۆن (فِطْر) واتە: کارگ، لەبەر ئەوەی لە دوای هەورە تریشقەو دوای بارانێك هەڵدەتۆقێ، کەواتە: (فَاطِر) واتە: داهێنەری شتێك بە خێرایی کە پێشینەی نەبووبێ.**

**پێشتریش ئاماژەمان پێدا وشەی (الحمد لِلّه) واتە: ستایش بۆ خوا، لە هەموو قورئاندا سی و هەشت (٣٨) جاران هاتووەو، لە سەرەتای پێنج لە سوورەتەکانی قورئاندا، کە هەر پێنجیان سوورەتە مەککەییەکانن، وشەی (الحمد لِلّه) هاتوە، کە بەپێی ڕیزبەندیی موصحەف بریتین لە سوورەتەکانی: (الفاتحة، الأنعام، الكهف، سبأ، فاطر)، ئەگەر تەماشای سەرەتای هەر کام لەو پێنج سوورەتە موبارەکە بکەین،**

دەبینین سەرجەم ئەو شتانەی کە ڕاگری ژیانی مرۆڤن، خوا ﷻ لە سەرەتای ئەم سوورەتانەوە باسیکردوون، کە بە (الحمدُ لِلّه) دەست پێدەکەن:

**١- پەیدابوون:** هاتنە دی لە نەبوونەوە بۆ بوون، لە یەکەم ئایەتی سوورەتی (الأنعام)دا، دەفەرموێ: ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَجَعَلَ ٱلظُّلُمَـٰتِ وَٱلنُّورَ ﴾، ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ئاسمانەکان و زەوی هێناونە دی و، تاریکیی و ڕووناکیی ڕەخساندوون.

هەنگاوی یەکەم و ڕاگری یەکەم بۆ ژیانی مرۆڤ، بریتیە لەوە کە لە دەریای نەبوون بێتە دەر بۆ جیهانی بوون.

**٢- داهێنان و ناردنی فریشتەکان:** لە سەرەتای سوورەتی (فاطر)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ فَاطِرِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ جَاعِلِ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ رُسُلًا أُو۟لِىٓ أَجْنِحَةٍ مَّثْنَىٰ وَثُلَـٰثَ وَرُبَـٰعَ ﴾، دوای پەیدابوون، ئەوەی ژیانی مرۆڤ لەسەری بەندەو ڕاگری ژیانی مرۆڤە، ئەوەیە کە خوا ﷻ ئەو مرۆڤە بە شێوەیەك دروست بکات و دابێنێ کە پێشینەی نەبووە، بە شێوەیەکی ناوازەو بێ پێشینە، پاشان کاروباری ژیانی ئەو مرۆڤە بە فریشتان بسپێرێ، فریشتەکان سەرپەرشتیی بکەن، نەك تەنیا بۆ خۆی بێ، هەڵبەتە بەس خوا ﷻ سەرپەرشتیاری هەموو شتێکە، بەڵام خوا ﷻ لە ڕێی فریشتەکانەوە کە دروستکراوانێکی پاك و چاکن و، بێ فەرمانیی خوا ناکەن، هەموو کاروبارەکانی گەردوون، بە تایبەتی ئەوانەی پەیوەندییان بە ژیانی مرۆڤەوە هەیە، دەسووڕێنێ.

**٣- خاوەنداریێتیی:** مرۆڤ پێویستی بە خاوەنێك هەیە، پێویستی بە پەروەردگارو مشوورخۆرێك هەیە، لە سەرەتای سوورەتی (سبأ)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَهُ ٱلْحَمْدُ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ ۚ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١﴾ ﴾، ستایش بۆ ئەو خوایەی هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، هی ئەوە، ستایش بۆوی لە دواڕۆژداو ئەو کاربەجێی شارەزایە.

**٤- پەروەردگاریێتیی:** بەو واتایە کە زاتێك هەبێ پەروەردەی بکات و مشووری لێ بخوات و، پێبگەیەنێ و بژیوی بدات، بژیوی ماددیی و مەعنەویی، خوا ﷻ لە سەرەتای

سووڕەتی (الفاتحة)دا دەفەرموێ: ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٢﴾، واتە: ستایش بۆ خوای پەروەردگارو مشوور خۆری جیهانییان.

٥- ڕێنمایی و بەرنامە: ڕاگرێکی دیکەی مرۆڤ ئەوەیە کە هیدایەت و بەرنامەی بۆ بێت، خوا ﷻ لە سەرەتای سورەتی (الكهف)دا، دەفەرموێ: ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبۡدِهِ ٱلۡكِتَٰبَ وَلَمۡ يَجۡعَل لَّهُۥ عِوَجَاۜ ١﴾، ستایش بۆ ئەو خوایەی کە کتێبی دابەزاندۆتە سەر بەندەکەی خۆی، هیچ جۆرە لاریی و خوارییەکی {بێژەیی و مانایی} تێدا دانەناوە، بەڵکو هەم لە ڕووی بێژەوەو هەم لە ڕووی واتاوە، ڕێك و ڕاست و تێرو تەواوە.

٢)- ﴿جَاعِلِ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا﴾، گێڕەری فریشتەکانە بە نوێنەرو نێردراو، (جَاعِل)، (أي: مُكَوِّن أو مُصَيِّر) یانی: بکەر یان گێڕەر، (رُسُلًا) ، یان دەبێتە حاڵ، لە حاڵێکدا کە فریشتەکان نێردراون، یاخود دەبێتە بەرکاری دووەم، ﴿جَاعِلِ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ﴾، واتە: گێڕەری فریشتەکان، (مَلَائِكَة)، دەبێتە بەرکاری یەکەم، (رُسُلًا)، دەبێتە بەرکاری دووەم، یاخود بە پێچەوانەوە، ئەگەر: (مَلَائِكَة)، ببێتە بەرکاری دووەم، (رُسُلًا)، بەرکاری یەکەمە، فریشتەکانی کردوون بە نوێنەری خۆی، ئایا ئەو فریشتانە چۆنن؟

٣)- ﴿أُوْلِيٓ أَجۡنِحَةٖ مَّثۡنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَۚ﴾، واتە: خاوەنی باڵەکانن، دوو دوو و سێ سێ و چوار چوار. (أُوْلِي)، واتە: (أصْحَاب)، وشەی: (أُوْلِي)، لە بێژەی خۆی تاکی نیەو کۆیە، خاوەنانی باڵن، باڵەکان چۆنن؟ (مَثْنَى)، دوو دوو، (وَثُلَاثَ)، سێ سێ، (وَرُبَاع)، چوار چوار، واتە: فریشتەکان جۆرێکیان دوو دوو باڵیان هەن، جۆرێکیان سێ سێ و، جۆرێکیان چوار چوار.

وشەی: (أَجْنِحَة) کۆی (جَنَاح)ە، (جَنَاح)یش یانی: باڵ، باڵندەکانیش باڵیان هەیە کە لە شوێنی هەردوو دەستی مرۆڤانن، خوای پەروەردگار وشەی (جَنَاح)ی بۆ مرۆڤیش بەکارهێناوە، وەك خوا ﷻ لە سووڕەتی (الشعراء)دا، دەفەرموێ: ﴿وَٱخۡفِضۡ جَنَاحَكَ لِمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٢١٥﴾ باڵت بۆ بڕوادارانی شوێنکەوتووت شۆڕ بکە. (جَنَاح) بە مانای باڵ دێ، بەڵام هەندێك جار بۆ دەستی مرۆڤیش بەکارهێنراوە.

٤)- ﴿يَزِيدُ فِي ٱلۡخَلۡقِ مَا يَشَآءُ﴾، واتە: خوا ﷻ ئەوەی بیەوێ لە دروستکراوی خۆی زیادی دەکات، ئەمە دوو ئەگەری هەن:

أ- وەڵامی پرسیارێکە پەیدادەبێ، مرۆڤەکان بۆیان هەیە بڵێن: ئێمە تا ئێستا تەنیا باڵندەی دوو باڵمان بینیون، یانی: چی سێ باڵ و چوار باڵ؟ خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەوەی بیەوێ لە دروستکراوی خۆیدا زیادی دەکات، هیچ بەربەستێ لە بەردەم ویستی ڕەهاو ئازادی خوادا ﷻ نیە.

ب- دەشگونجێ ئاماژە بێت بەوە کە باڵی فریشتەکان، هەر ئەو دوو دوو و سێ سێ و چوار چوارە نین، بەڵکو دەگونجێ زیاتریش بن، وەك پێشتریش گوتم: لە شوێنەوارێکدا هاتوە، کە پێغەمبەر ﷺ جیبریلی بینیوە، شەشسەد (٦٠٠) باڵی هەبووە، بەڵکو لە گێڕدراوەی دیکەدا، باسی زیاتریش کراوە.

٥)- ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾، واتە: بە دڵنیایی خوا لەسەر هەموو شتێك بە توانایە، چ زیادکردنی باڵی فریشتەکان بێ، چ هەر شتێکی دیکە کە بیەوێ.

٦)- ﴿مَّا يَفۡتَحِ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ مِن رَّحۡمَةٖ فَلَا مُمۡسِكَ لَهَاۖ﴾، واتە: ئەوەی خوا ﷻ بیکاتەوە لە دەروازەی بەزەیی خۆی بۆ خەڵك، هیچ گیرەرەوەی نیە، هیچ کەسێك و هیچ شتێك ناتوانێ ئەو دەرگای بەزەییەی خوا دەیکاتەوە بۆ بەندەکانی، بیگرێتەوە، (**الْفَتْحُ تَمْثِيلٌ لإعطَاءِ الرَّحْمَةِ، إِذْ هِيَ مِنَ النَّفَائِسِ الَّتِي تُشْبِهُ الْمُدَّخَرَاتِ فَإِعطَاؤُهَا شَبِيهَةٌ بِحَالَةِ فَتْحِ الخَزَائِنِ**)، کە دەفەرموێ: ﴿مَّا يَفۡتَحِ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ مِن رَّحۡمَةٖ﴾، وشەی (**فَتْح**) لێرەدا پێشاندانی بەزەیی خوایە، لە قاڵبێکی وێنا کراودا، یانی: بەزەیی خوا ﷻ لەو شتە بە نرخ و بەهادارانەیە، کە هەڵدەگیرێن (لە شوێنێکی مەحکەم دا) ئنجا بەخشرانیان وەك کردنەوەی خەزێنانە (بۆلێ دەرهێنانی شتانی نایاب و بەهادار).

٧)- ﴿وَمَا يُمۡسِكۡ فَلَا مُرۡسِلَ لَهُۥ مِنۢ بَعۡدِهِۦۚ﴾، ئەوەش کە خوا ﷻ بیگرێتەوە لە بەزەیی خۆی، بە دڵنیایی هیچ نێرەرێکی بۆ نیە لە دوای وی، کە دەفەرموێ: ﴿فَلَا مُرۡسِلَ لَهُۥ﴾، (**لَهُ**) بۆیە بە ڕاناوی نێر هێناویەتی، چونکە دەگەڕێتەوە بۆ (ما)ی (**موصولة**) یانی: (**الَّذِي**

يُمْسِكُهُ اللهُ فَلاَ مُرْسِلَ لَهُ)، بەڵام ئەوەی پێشێ بۆیە دەفەرمویێ: ﴿ فَلَا مُمْسِكَ لَهَا ﴾ لەبەر ئەوەی دەگەڕێتەوە بۆ ڕەحمەت.

کە دەفەرمویێ: ﴿ مِنۢ بَعۡدِهِۦ ﴾، واتە: (مِنْ دُونِهِ)، یانی: جگە لە خوا کەسێکی دیکە نیە، وەختێك خوا ﷻ بەزەیی و بەخششی خۆی بگرێتەوە، کەس ناتوانێ بینێرێ، هەروەها ئەگەر بیشینێرێ، کەس ناتوانێ ڕێی لێ بگرێ.

وشەی (إمْسَاك) (الإِمْسَاكُ: أَخْذُ الشَّيءِ بَاليَدِ مَعَ الشدِّ عَلَيهِ بِهَا لِئلاَ يَسْقُطَ)، (إمْسَاك) بریتیە لەوە کە شتێك بە دەست بگیرێ و، لێی توندو قایم بکرێ، بۆ ئەوەی نەکەوێتە خوار، لێرەدا فەرمایشتی خوا ﷻ خواستوویەتەوە بۆ حاڵەتی نەهێشتنی گەیشتنی بەزەیی خۆی بە کەسانێك کە بیەوێ، لەو بەزەیی و بەخششەی خۆی بەهرەمەندیان نەکات.

٨)- ﴿ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴾، خوا باڵادەستی کاربەجێیە، باڵادەستەو دەزانێ بەزەیی خۆی بۆ کێ و بۆ کوێ بنێرێ، جێی خۆی دەگرێ، یاخود باڵادەستەو دەزانێ بەزەیی خۆی نەدا بە کوێ و بەکێ، هیچ کەسێك ناتوانێ خوا ناچار بکات، بەزەیی بنوێنێ لەگەڵ کەسێك یان کۆمەڵێکدا، کە نەیەوێ.

﴿ ٱلۡحَكِيمُ ﴾، خوا لێزان و کاربەجێیە، چ بەزەیی بنوێنێ، چ نەینوێنێ، چ بەخششی خۆی بدات، چ نەیدات، هەمووی بە حیکمەت و کارزانییە، هیچی بە گۆترە نیە، هیچی بەبێ سیستم و یاسا نیە.

لە بارەی وشەی (فاطر)، ئەم دەقە دێنین:

{عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كُنْتُ لَا أَدْرِي مَا فَاطِرُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ، حَتَّى أَتَانِي أَعْرَابِيَّانِ يَخْتَصِمَانِ فِي بِئْرٍ، فَقَالَ أَحَدُهُمَا لِصَاحِبِهِ: أَنَا فَطَرْتُهَا، يَقُولُ: أَنَا بَدَأْتُهَا}[1].

---

(١) فتح القدير: ج٤، ص(٤١٠ - ٤١١).

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عەبباس (خـوا لێیـان ڕازی بـێ)، دەڵـێ: نەمدەزانـی مانـای: ﴿فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ چییـە؟ تاکـو دوو عەرەبـی خێڵەکیـی هاتنـە لام، لـە بـارەی بیرێکـەوە دەمەقاڵێیـان بـوو، یەکێکیـان گوتـی: (أَنَا فَطَرْتُهَا)، واتـە: مـن یەکەمجـار ئـەو بیـرەم لێـداوەو پەیـدام کـردوەو، دامهێنـاوە، ئنجـا زانیـم: ﴿فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾، واتـە: داهێنـەرو پەیداکـەری ئاسـمانەکان و زەوی، بەبـێ ئـەوەی پێشـینەیەکیان هەبـوو بـێ.

## کورتە باسێک لە بارەی فریشتانەوە

لە پێنج برگەی کورت دا باسی فریشتان دەکەین:

### برگەی یەکەم: پێناسەی فریشتان:

(المَلَائِكَة: أَجْسَامٌ لَطِيفَةٌ نُورَانِيَّةٌ أَخْيَارٌ ذَوُو قُوَّةٍ عَظِيمَةٍ، وَمِنْ خَصَائِصِهِمْ:

أَوَّلاً: القُدْرَةُ عَلَى التَّشَكُّلِ بِأَشْكَالٍ مُخْتَلِفَةٍ، وثانياً: وَالعِلْمُ بِمَا تَتَوَقَّفُ عَلَيْهِ أَعْمَالُهُمْ، وَمَقَرُّهُمُ السَّمَاوَاتُ مَا لَمْ يُرْسَلُوا إِلَى جِهَةٍ مِنَ الأَرْضِ)[1].

واتە: فریشتەکان چەند جەستەیەکی پەنهانی لە ڕووناکیی دروستکراون، زۆر چاکەکارن و خاوەن هێزێکی مەزنن، لە تایبەتمەندییەکانیان:

یەکەم: تواناییان هەیە لەسەر شێوەی جیا جیادا خۆیان پێشانبدەن.

دووەم: زانیارییان هەیە بە هەر شتێك کە کردەوەکانیان پەکیان لەسەری بکەوێ، نشینگەیان ئاسمانەکانن، مادام ڕەوان نەکرابن بۆ لای زەوی.

ئەمە پێناسەیەکی کورتی فریشتەکان بوو، کە تاکو ڕاددەیەکی زۆر پێناسەیەکی کورت و پوخت و چاکە.

لە فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺدا، هاتوە کە فریشتەکان لە ڕووناکیی دروستکراون: {عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «خُلِقَتِ المَلَائِكَةُ مِنْ نُورٍ، وَخُلِقَ الجَانُّ مِنْ مَارِجٍ مِنْ نَارٍ، وَخُلِقَ آدَمُ مِمَّا وُصِفَ لَكُمْ»} (أخرجه أحمد: ٢٥٢٣٥، ومسلم: ٢٩٩٦)، واتە: فریشتە لە ڕووناکیی دروستکراون و، جند لە بڵێسەی ئاگرو، ئادەمیش

---

(١) المقاصد لسعدالدين التفتازاني، عن (محمد الطاهر بن عاشور)، التحرير والتنوير: ج٢٢، ص٢٥٠.

لەوەی بۆتان باسکراوە. دیارە دەبێ ڕووناکییەکی تایبەت بێ، چونکە ئەگەر ڕووناکیی ئاسایی بووایە، دەبوو ببینین، هەرچەندە هەندێك جۆری ڕووناکیی وەك تیشکی ژێر سوورو، تیشکی سەروو وەنەوشەیی و، تیشکی گاماو، تیشکی سینیی و، تیشکی گەردوونیی ... ئەوانە هیچیان ئێمە نایانبینین، بەهەرحاڵ وا پێدەچێ جەستەی فریشتەکان لە جۆرە ماددەیەکی جیاواز لەو جۆرە ماددەیەی بۆ ئێمە زانراوە، دروستکرابێ، هەروەك جینییش بە هەمان شێوە لە ئاگر دروستکراون، ئنجا ئەگەر ئاگری ئاسایی بووایە، دەبوو بیانبینین، بەڵام ئەوانیش لە جۆرە تیشکێك، یان ئاگرێك دروستکراون، کە بۆ ئێمە زانراو نیە.

## بڕگەی دووەم : فریشتەکان یەکجار پاك و چاکن و زۆر زۆریشن:

دووەم: باسکرانی فریشتان پاش: ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾، بەڵگەی مەزنترین و زۆرترین بوون و، پاك و چاکترین بوونی فریشتەکانە، خوا ﷻ لەم سوورەتەدا دوای ئەوەی دەفەرمویّ: ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾، ستایش بۆ خوای داهێنەری ئاسمانەکان و زەوی، یەکسەر دەفەرمویّ: ﴿جَاعِلِ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا أُوْلِيٓ أَجۡنِحَةٖ مَّثۡنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَۚ﴾، کەواتە: بە دوای ئەوەدا کە خوا ﷻ دەفەرمویّ: ئاسمانەکان و زەوی داهێناون و پەیدای کردوون، یەکسەر باسی فریشتەکان دەکات، ئەمە دەگونجێ لێی هەڵبهێنجرێ کە فریشتەکان لە هەموو دروستکراوەکانی خوا مەزنترن و، زۆرترن، پاك و چاکترن، ئنجا ئەمە وێڕای ئەوەی کە ئەم ئایەتە دەیگەیەنێ، لە ئایەتەکانی دیکەو، لە دەقەکانی سوونەتیشدا ئاماژە بەوە کراوە، بۆ وێنە:

أ- خوا ﷻ لە سوورەتی (المدثر)دا، دەفەرمویّ: ﴿وَمَا يَعۡلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَۚ ٣١﴾، واتە: سەربازەکانی خوا تەنها خۆی دەزانێ چەندن و چۆنن.

ب- هەروەها پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەکدا دەفەرمویّ: (أَطَّتْ السَّمَاءُ وَحَقَّ لَهَا أَنْ تَئِطَّ، مَا فِيهَا مَوْضِعُ أَرْبَعِ أَصَابِعَ إِلَّا عَلَيْهِ مَلَكٌ سَاجِدًا) (أخرجه ابن أبي حاتم كما في تفسير ابن كثير ٣٩٧/٢، وابن أبي عاصم في الآحاد والمثاني: ٥٩٧، والطبراني: ٣١٢ ، وأبو نعيم في الحلية: ج٢، ص٢١٧).

واتە: ئاسمان جیڕەی لێهاتووەو، هەقیشیەتی جیڕەی لێ بێ {وەك چۆن كە بارێكی قورس لە وڵاخێك دەنرێ، جیڕەی لێ دێ، ئاسمانیش ئاوا جیڕەی لێ دێ} چونكە هیچ شوێن پێیەك نیە لە ئاسماندا، مەگەر فریشتەیەك كڕنووشی لەسەر بردوە، {یاخود لێی وەستاوەو، بەندایەتیی بۆ خوا دەكات}.

**بڕگەی سێیەم : سپاردنی سەرجەم كارەكانی دنیا و دواڕۆژ بە فریشتان:**

ئەوەی لە قورئاندا بە ڕوونیی دەردەكەوێ لە بارەی فریشتانەوە، ئەوەیە: خوای زاناو توانا سەرجەم كارەكانی دنیاو دواڕۆژی بە فریشتان سپاردوون، ئێمە دەتوانین لەو بارەوە دە (١٠) بەڵگە بێنینەوە، هەڵبەتە زیاتریش هەن، بەڵام وەك نموونە، دە (١٠) لە ئەركەكانی فریشتەكان باس دەكەین:

**١- فریشتەكان فەرمانبەری ڕەهای خوان:**

وەك لە سووڕەتی (الأنبياء)دا، لە چوار ئایەتدا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَقَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحْمَٰنُ وَلَدًا ۗ سُبْحَٰنَهُۥ ۚ بَلْ عِبَادٌ مُّكْرَمُونَ ﴿٢٦﴾ لَا يَسْبِقُونَهُۥ بِٱلْقَوْلِ وَهُم بِأَمْرِهِۦ يَعْمَلُونَ ﴿٢٧﴾ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرْتَضَىٰ وَهُم مِّنْ خَشْيَتِهِۦ مُشْفِقُونَ ﴿٢٨﴾ ۞ وَمَن يَقُلْ مِنْهُمْ إِنِّىٓ إِلَٰهٌ مِّن دُونِهِۦ فَذَٰلِكَ نَجْزِيهِ جَهَنَّمَ ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾.

كاتی خۆی ئێمە لە تەفسیری سووڕەتی (الأنبياء)دا، قسەمان لە بارەی ئەو ئایەتانەوە كردوە.

**٢- فریشتەكان هەڵگری عەرشی خوان:**

وەك خوا ﷻ لە سوورەتی (غافر)دا، دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَحْمِلُونَ ٱلْعَرْشَ وَمَنْ حَوْلَهُۥ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيُؤْمِنُونَ بِهِۦ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ رَبَّنَا وَسِعْتَ كُلَّ شَىْءٍ رَّحْمَةً وَعِلْمًا فَٱغْفِرْ لِلَّذِينَ تَابُوا۟ وَٱتَّبَعُوا۟ سَبِيلَكَ وَقِهِمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ ﴿٧﴾ ﴾، بە دڵنیاییی

لێرەدا مەبەست لە هەڵگرانی عەرشی خوا، کە ستایش بۆ خوا دەردەبڕن و، بە پاکیی دەگرن و، بڕوای پێ دێنن و، داوای لێبوردن بۆ بڕواداران دەکەن، هەر فریشتەکانن، هەروەها لە سوورەتی (**الحاقة**)، ئایەتەکانی: (١٦ و ١٧)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَهِيَ يَوۡمَئِذٖ وَاهِيَةٞ ﴿١٦﴾ وَٱلۡمَلَكُ عَلَىٰٓ أَرۡجَآئِهَاۚ وَيَحۡمِلُ عَرۡشَ رَبِّكَ فَوۡقَهُمۡ يَوۡمَئِذٖ ثَمَٰنِيَةٞ ﴿١٧﴾﴾، واتە: ئاسمان لەو ڕۆژەدا شەق و پەق و بێهێز بوو، لەو ڕۆژەدا بارەگای پەروەردگارت هەشت هەڵیدەگرن لەسەرووی خۆیانەوە.

خوا ﷻ باسی نەکردوە ئەو هەشتە چین و کین، بەڵام وا پێدەچێ وەك لە ئایەتی ژمارە (٧)ی سوورەتی (**غافر**)یشدا هاتوە، ئەمەش هەر مەبەست پێی هەشت فریشتە بن.

**٣- گیانی مرۆڤەکان دەکێشن:**

وەك خوا ﷻ لە سوورەتی (**الأعراف**)، ئایەتی ژمارە: (٣٧)دا، دەفەرموێ: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُنَا يَتَوَفَّوۡنَهُمۡ﴾، واتە: هەتا کاتێك ڕەوانە کراوانی ئێمە چوونە لایان، گیانیان دەکێشان، هەروەها لە سوورەتی (**الأنعام**)، ئایەتی ژمارە: (٦١)دا، دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ ٱلۡقَاهِرُ فَوۡقَ عِبَادِهِۦۖ وَيُرۡسِلُ عَلَيۡكُمۡ حَفَظَةً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَكُمُ ٱلۡمَوۡتُ تَوَفَّتۡهُ رُسُلُنَا وَهُمۡ لَا يُفَرِّطُونَ ﴿٦١﴾﴾، واتە: خوا ﷻ ئەو زاتەیە کە باڵادەستە بەسەر بەندەکانیەوەو، پارێزەرانێکتان دەنێرێتە سەر، هەتا کاتێك یەکێکتان مردنی بۆ هات، ڕەوانەکراوەکانمان گیانەکەی وەردەگرن، بێ ئەوەی کە کەمتەرخەمیی بکەن.

**٤- تۆمارکردن و پاراستنی کردەوەکانی مرۆڤ:**

لە سوورەتی (**الإنفطار**)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ عَلَيۡكُمۡ لَحَٰفِظِينَ ﴿١٠﴾ كِرَامٗا كَٰتِبِينَ ﴿١١﴾ يَعۡلَمُونَ مَا تَفۡعَلُونَ ﴿١٢﴾﴾، واتە: ئێوە چەند پارێزەرێکتان بەسەرەوەن، زۆر بەڕێزن و، نووسەرن (تۆمارکەرن)، دەزانن ئێوە چی ئەنجام دەدەن، {چ بەدڵتان و، چ زمانتان و، چ بە ئەندامەکانتان}.

**٥- هێنانی وەحیی و پەیامی خوا بۆ پێغەمبەران (عَلَيْهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم):**

ئەویش کاری فریشتەکانە، وەك لە سووڕەتی (النحل)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ يُنَزِّلُ الْمَلَائِكَةَ بِالرُّوحِ مِنْ أَمْرِهِ عَلَىٰ مَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ أَنْ أَنْذِرُوا أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا أَنَا فَاتَّقُونِ ﴿٢﴾ ﴾، واتە: فریشتەکان بە ڕووحێك لە لایەن خۆیەوە (کە مەبەست پێی وەحییە) دادەبەزێنێتە سەر هەر یەکێك لە بەندەکانی، {پێیان دەفەرموێ:} خەڵك بترسێنن و هۆشیاریان بکەنەوە، کە جگە لە من هیچ پەرستراوێك نیە، دەجا پارێز لە من بکەن.

**٦- پاراستنی مرۆڤ لە بەڵاو پێشهاتەکان:**

وەك لە سووڕەتی (الرعد)، ئایەتی ژمارە: (١١)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ لَهُ مُعَقِّبَاتٌ مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ يَحْفَظُونَهُ مِنْ أَمْرِ اللَّهِ ﴾، واتە: چەند فریشتەیەکی نۆرەکەری هەن {نۆرە لەگەڵ یەکدی دەکەن، یان جێگۆڕکێ بە یەکدی دەکەن} لە پێشییەوەو لە دوایەوە دەیپارێزن بە فەرمانی خوا، واتە: مرۆڤ دەپارێزن، وەك لە تەفسیری سووڕەتی (الرعد)دا، بە درێژیی باسمان کردوە.

**٧- یاریدەدانی بڕواداران و تێکشکاندنی بێبڕوایان:**

ئەمەش یەکێکە لە ئەرکەکانی فریشتەکان، وەك لە سووڕەتی (الأنفال)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى الْمَلَائِكَةِ أَنِّي مَعَكُمْ فَثَبِّتُوا الَّذِينَ آمَنُوا سَأُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُوا الرُّعْبَ فَاضْرِبُوا فَوْقَ الْأَعْنَاقِ وَاضْرِبُوا مِنْهُمْ كُلَّ بَنَانٍ ﴿١٢﴾ ﴾، واتە: یاد بکەوە کاتێك پەروەردگارت سروشی کرد بۆ فریشتەکان، کە من لەگەڵتانم، ئێوە بڕواداران چەسپاو بکەن، بە دڵنیایی ترس و لەرز دەخەمە دڵی ئەوانەوە کە بێبڕوان، ئێوەش لەوە بدەن کە لە سەرووی ملیانەوەیە، {لە سەریان بدەن}و، لەهەر سەرە پەنجەیەکیان بدەن، (واتە: لە نووکی پەنجەیانەوە تاکو تەپڵی سەریان لێیان بدەن).

کەواتـە: فریشـتەکان هـەم لـە سەرخسـتنی بـڕواداران و، هـەم لـە تێکشـکاندنی بێبڕوایانـدا، لـە کاتـی ڕووبـەڕوو بوونەوەیانـدا، ڕۆڵیـان هەیـەو ئـەوەش ئەرکێـکی دیکـەی ئـەو پـاك و چاکانەیـە.

**٨- بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی گەردوون بە گشتیی:**

وەك لـە سـەرەتای سـووڕەتی (النازعـات)دا، خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱلنَّٰزِعَٰتِ غَرۡقٗا ١ وَٱلنَّٰشِطَٰتِ نَشۡطٗا ٢ وَٱلسَّٰبِحَٰتِ سَبۡحٗا ٣ فَٱلسَّٰبِقَٰتِ سَبۡقٗا ٤ فَٱلۡمُدَبِّرَٰتِ أَمۡرٗا ٥ ﴾، واتـە: سـوێند بـەو فریشـتانەی کـە بـە توندیـی گیانـەکان وەردەگـرن و، بەوانـەی کـە بـە سـووکیی وەریـان دەگـرن، {بـە توندیـی گیانـی تاوانبـاران دەکێشـن و، بـە نەرمیـی گیانـی ئیمانـداران دەکێشـن} هەروەهـا ئەوانـەی پێشـبڕکێ دەکـەن لـە ئەنجامدانـی کارەکانـدا، مەلـە دەکـەن و بـە فـەزادا دەڕۆن، پێشـبڕکێ دەکـەن و، کاروبـارەکان بەڕێـوە دەبـەن.

**٩- هـەر کامێـك لـە فریشـتەکان پایـەو پلەیەکـی تایبەتیـی هەیـەو، هەمیشـە سـەرگەرمی بـە پاکگرتنـی خوان:**

وەك لـە سـووڕەتی (الصافـات)دا، لەسـەر زمانـی فریشـتەکان خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَا مِنَّآ إِلَّا لَهُۥ مَقَامٞ مَّعۡلُومٞ ١٦٤ وَإِنَّا لَنَحۡنُ ٱلصَّآفُّونَ ١٦٥ وَإِنَّا لَنَحۡنُ ٱلۡمُسَبِّحُونَ ١٦٦ ﴾، واتـە: (فریشـتەکان دەڵێـن:) هـەر کام لـە ئێمـە پێگەیەکـی تایبـەت و زانـراوی هەیـە، ئێمەیـن کـە ڕیـز دەبیـن بـۆ بەندایەتیـی بـۆ خـواو، هـەر ئێمەیـن کـە چـاك بـە پاکگریـن بـۆ خـوا ﷻ.

**١٠- بـەردەوام سـەرگەرم بـوونی فریشـتان بـە خـوا بـە پاکگرتن و ستایشـکردن و، داوای لێبـوردن کـردن بـۆ بڕواداڕانی سـەر زەوی:**

وەك لـە سـووڕەتی (الشـوری)دا، خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرۡنَ مِن فَوۡقِهِنَّۚ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يُسَبِّحُونَ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡ وَيَسۡتَغۡفِرُونَ لِمَن فِي ٱلۡأَرۡضِۗ أَلَآ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ

ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥﴾، واتە: ئاسمانەکان خەریکە لە لای سەرەوەیانەوە شەق ببەن و، فریشتەکان بە ستایشکردنەوە پەروەردگاریان بە پاك دەگرن و داوای لێبوردن دەکەن بۆ خەڵکی سەر زەوی، (بۆ مرۆڤەکان و بۆ جیننی بڕواداریش)، ئاگاداربن کە خوا ﷻ زۆر لێبوردەی بەبەزەییە.

هەڵبەتە ئەو دە (١٠) ئەرکەی فریشتەکانمان وەك نموونە هێناونەوەو، ئەوەی لە قورئاندا بە ڕوونیی دەردەکەوێ لە بارەی فریشتەکانەوە، ئەوەیە کە خوای زاناو توانا سەرجەم کارەکانی دنیاو دوارۆژی بە فریشتان سپاردوون.

## بڕگەی چوارەم : ئەو فریشتانەی ناویان لە قورئان دا هاتووە:

سەرجەم ئەو فریشتانەی ناویان لە قورئاندا هاتوە، شەشن:

١- (جبريل)، کە بە (الروح)و بە (روح القدس)و بە (الروح الأمين)یش ناوی هاتوە:

أ- بە (جبريل) لە سوورەتی (البقرة)دا: ﴿ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّلَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَجِبْرِيلَ وَمِيكَىٰلَ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَدُوٌّ لِّلْكَٰفِرِينَ ﴿٩٨﴾ ﴾.

ب- بە (الروح) لە سوورەتی (القدر)دا: ﴿ تَنَزَّلُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمْرٍ ﴿٤﴾ ﴾.

ج- بە (روح القدس) لە سوورەتی (النحل)دا: ﴿ قُلْ نَزَّلَهُۥ رُوحُ ٱلْقُدُسِ مِن رَّبِّكَ بِٱلْحَقِّ لِيُثَبِّتَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ ﴿١٠٢﴾ ﴾.

د- بە (الروح الأمين) لە سوورەتی (الشعراء)دا: ﴿ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ ﴾.

٢- (میکائیل)، تەنیا بە (میکال) ناوی هاتوە، دیارە (میکائیل)یشی پێ دەگوترێ، لە سوورەتی (البقرة)دا، ناوی هاتوە: ﴿ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّلَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَجِبْرِيلَ وَمِيكَىٰلَ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَدُوٌّ لِّلْكَٰفِرِينَ ﴿٩٨﴾ ﴾.

٣- (مَالِك)، واتە: دۆزەخەوان، ئەو فریشتەیەی سەرپەرشتیی دۆزەخ دەكات، لە سوورەتی (الزخرف)دا، خوا ﷻ دەفەرمویّ: ﴿ وَنَادَوْا يَا مَالِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ قَالَ إِنَّكُم مَّاكِثُونَ ﴿٧٧﴾ ﴾، واتە: گوتیان ئەی مالیك! با پەروەردگارت كۆتاییمان پێ بێنێ و بمانمرێنێ، گوتی: بێگومان ئێوە دەمێننەوە.

٤- (ملك الموت)، كە لە هەندێك كتێباندا (عِزرائیل)ی پێ دەڵێن، بەڵام لە قورئاندا بە (ملك الموت) هاتوە، لە سوورەتی (السجدة)، لە ئایەتی ژمارە: (١١)دا، خوا ﷻ دەفەرمویّ: ﴿ قُلْ يَتَوَفَّاكُم مَّلَكُ الْمَوْتِ الَّذِي وُكِّلَ بِكُمْ ﴾، واتە: بڵێ فریشتەی مەرگ كە پێتان سپێردراوە، گیانەكانتان دەكێشێ.

٥و٦- (هاروت)و (ماروت)، كە لە سوورەتی (البقرة)، لە ئایەتی ژمارە: (١٠٢)دا، ناویان هاتوە: ﴿ وَاتَّبَعُوا مَا تَتْلُوا الشَّيَاطِينُ عَلَىٰ مُلْكِ سُلَيْمَانَ وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَانُ وَلَٰكِنَّ الشَّيَاطِينَ كَفَرُوا يُعَلِّمُونَ النَّاسَ السِّحْرَ وَمَا أُنزِلَ عَلَى الْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَارُوتَ وَمَارُوتَ ﴾.

## بڕگەی پێنجەم : زۆریی ژمارەی فریشتان:

ژمارەی فریشتەكان یەكجار زۆرە، تەنیا خوا ﷻ ژمارەكەیان دەزانێ، وەك لە سوورەتی (المدثر)دا، لە ئایەتی ژمارە: (٣١)دا، خوا ﷻ دەفەرمویّ: ﴿ وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ وَمَا هِيَ إِلَّا ذِكْرَىٰ لِلْبَشَرِ ﴿٣١﴾ ﴾، واتە: تەنیا پەروەردگارت ژمارەی سەربازەكانی دەزانێ.

هەروەها ئەوەش كە خوا ﷻ لە سوورەتی (المدثر)دا خستوویەتە ڕوو، لەو بارەوە كە دۆزەخ نۆزدە فریشتە بەسەری ڕادەگەن و سەرپەرشتیی دەكەن، ئەوە تەنیا بیرخستنەوەیەكە بۆ مرۆڤان[1].

---

(١) شایانی باسە لە (الكتاب الرابع)ی مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله)، لە چاپی دووەم، ساڵی: (٢٠١٨)ی زایینی دا، زۆر بە درێژیی لە بارەی فریشتانەوە دواوین، ئەو كتێبی چوارەمەمان تەرخانكردوە بە ئیمان بە فریشتەكان، هەروەها لە كتێبی پێنجەمی مەوسووعەی: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی)یشدا دیسان لەو بارەوە دواوین.

**مەسەلەی دووەم:**

**بانگکردنی خوا بۆ مرۆڤایەتیی کە چاکەکانی خوا بەسەر خۆیانەوە یاد بکەنەوەو، بزانن کە جگە لە خوا هیچ بەدیهێنەرێک نیە، لە ئاسمانەکان و زەوییەوە بژیویان بدات، بۆیە پێویستە جگە لەویش نەپەرستن:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ ۚ هَلْ مِنْ خَٰلِقٍ غَيْرُ ٱللَّهِ يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ﴿٣﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

**١)- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ ﴾، ئەی خەڵکینە! یادی چاکەی خوا بکەنەوە بەسەرخۆتانەوە.**

**لێرەدا چاکەی خوا: ﴿ نِعْمَتَ ٱللَّهِ ﴾، بە تاك هاتووە، بە مەبەستی هەموو چاکەکانی خوا، ئنجا چاکەکان چ مەعنەویی بن، وەك وەحیی و پەیامی خواو، ئەو هەموو بەخششانەی دیکەی خوا، چ ماددیی بن، چ لە ئاسمانەوە بێنە خوار، یان لە زەوی بێنە دەر.**

**٢)- ﴿ هَلْ مِنْ خَٰلِقٍ غَيْرُ ٱللَّهِ ﴾، واتە: ئایا هیچ بەدیهێنەرێك هەیە جگە لە خوا، وشەی (هَلْ) لە ﴿ هَلْ مِنْ خَٰلِقٍ ﴾دا، بۆ پرسیار کردنە، بەڵام پرسیاری نکووڵیلێکردنەو مانای لابردن (نفي) دەگەیەنێ، کە دەفەرموێ: ﴿ هَلْ مِنْ خَٰلِقٍ غَيْرُ ٱللَّهِ ﴾، مانایەکەی ئاوایە: (مَا مِن خَالِقٍ غیر الله)، چونکە پرسیار لێکردنی نکووڵیلێکەرانە پێویستیی بە وەڵام نیە، وەڵامەکەی لە نێو خۆیدایە، (يَتَضَمَّن جَوَابه فِي طَيَّاته)، ئەگەر تۆ بە کەسێك بڵێی: ئەدی ئەمە دەفتەر نیە؟! کە دەفتەریشەو لەبەر چاویەتی، واتە: ئەوە دەفتەرە، بۆیە چاوەڕێی وەڵام ناکەی، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: ئایا جگە لە خوا بەدیهێنەرێکی دیکە هەیە، لە ئاسمان و زەوییەوە بژیوتان بدات؟! بە دڵنیایی نەخێر!**

٣)- ﴿يَرۡزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾، كە لە ئاسمان و زەوییەوە بژیوتان بدات؟! بە دڵنیایی نەخێر! بێجگە لە خوا ﷻ هیچ کەس لە ئاسمان و زەوییەوە بژیوی مرۆڤەکان نادات، پێشتریش باسمان کردوە: بژیوی ئاسمان، جگە لە باران و بەفرو تەرزە، ئەو ئاوە موبارەکەی دێتە خوار، جگە لەوەش، هەموو جۆرەکانی تیشکیش کە لە خۆرو ئەستێرەو، هکەشانەکانەوە دێن، دەگرێتەوە، هەروەها بەرگە هەواش بە هەموو توخم و پێکهاتەکانیەوە، کە بەرەو زەوی دێن و، ژیانی مرۆڤ پێویستیی پێیانە، ئەوە وەك لایەنە ماددییەکەی و، وەك لانەیە مەعنەوییەکەش: ئەو وەحیی و پەیامەی خواو، صەڵات و پاڕانەوەی فریشتەکان و، ئیلهامی فریشتان و ...هتد هەموویان دەگرێتەوە.

بژیـوی زەویـش، بریتیـە لـەو هەمـوو ئـەو دانەوێڵـەو تـەرەکارو میوەجـات و، هەمـوو ئـەو شـتانەی زەوی دەیانڕوێنـێ و، هەمـوو ئـەو ژیاندارانـەی لەسـەر زەوی دەژیـن، چ لـە نێـو ئـاوداو، چ لـە هـەواداو، چ لەسـەر زەوی، هەروەهـا هەمـوو ئـەو مـاددەو کانزایانـەی کـە خـوا ﷻ بـۆی خسـتووینە نێـو زەوییـەوە، کـە ژیانـی بەشـەر پێویسـتی پێیانـە، وەك نـەوت و گازو زێـڕو زیـوو ئەڵـماس و... هتـد هەمـوو ئەوانـە دەگرێتـەوە.

٤)- ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾، جگە لەو هیچ پەرستراوێك نیە، ئەمە دەرەنجامێکە ڕاستەوخۆ وەردەگیرێ لەوەی پێشێ: مادام بەس خوا خاوەن چاکە بێ بەسەر مرۆڤەوەو، تەنیا خوا بەدیهێنەر بێ و، هەر خوا بژیودەر بێ لە ئاسمانەکان و زەوییەوە، کەواتە: جێی خۆیەتی بەس ئەویش بپەرسترێ و جگە لەو هیچ پەرستراو نین.

٥)- ﴿فَأَنَّىٰ تُؤۡفَكُونَ﴾، بۆ کوێ لا دەدرێن؟!، لێرەدا: (فَأَنَّى) ناوە بۆ پرسیار کردن (اسم للإستفهام)، ئەوەی کە لە دوایەوە دێ، پرسیار کردنە لە بارەی حاڵەوە، یان لە بارەی کاتەوە، یان لە بارەی شوێنەوە، کەواتە: (فَأَنَّى) یان بە مانای (چۆن)، یان بە مانای (لە کوێ)، یان بە مانای (کەی) دێ، بەڵام یەکێك لە واتایەکان، سیاقەکە دیاریی دەکات، کە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿فَأَنَّىٰ تُؤۡفَكُونَ﴾، یانی: بۆچی لادەدرێن؟! یانی:

چۆن لادەدرێن؟! دەشگونجێ بڵێین: بەرەو کوێ لادەدرێن، لە خواپەرستیی؟! وشەی: (**تُؤْفَكُون**) (**أَفَكَهُ: أَيْ صَرَفَهُ مِنَ الأَفْك**)، (**أَفك**)، یانی: (**صَرْف**) واتە: لادان، (**أَفْك**) بە مانای (**قَلب**)یش دێ، واتە: هەڵگێڕانەوە، یاخود لە (**إِفْك**)ەوە هاتوە، (**إِفْك**) درۆ، یانی: بۆ کوێ بە درۆ لادەدرێن؟! کە دەفەرموێ: ﴿فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ﴾، بەرەو کوێ لادەدرێن؟! یان چۆن لادەدرێن؟! بە بکەر نادیار (**مَجهُول الفاعل**) هاتوە، یانی: ئەوانە ویست و ئیرادەی ئازادی خۆیان لە دەست داوەو، بەرەو ئەو شوێنە دەبردرێن کە بۆیان دەویسترێ، نەك خۆیان دەیانەوێ.

**مەسەلەی سێیەم:**

**دڵدانەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ، کە پێغەمبەرانی پێشووش هەروا بە درۆ دانراون و، کاروبارەکانیش تەنیا دەگێڕدرێنەوە بۆ لای خوا، هەروەها خوا ﷻ لێپرسینەوەو سزاو پاداشت بۆ مرۆڤەکان دێنێتە گۆڕێ:**

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ﴿٤﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ وَإِن يُكَذِّبُوكَ ﴾، واتە: ئەگەر تۆ بە درۆ دابنێن، واتە: ئەگەر بێبڕوایەکانی ڕۆژگاری خۆت، یان دوای ڕۆژگاری تۆ، تۆ بە درۆ دابنێن، بە هۆی بە درۆدانانی ئەوانەوە، دڵتەنگ و نارەحەت مەبە، بۆچی؟.

٢)- ﴿ فَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ ﴾، پێغەمبەرانێکی دیکەش لە پێش تۆدا بە درۆ دانراون، وشەی (رُسُل) کە بە نەناسراو (نَكِرَة) هاتوە:

أ- مەبەست پێی مەزنیی پێگەو پایەی ئەو پێغەمبەرانەیە، واتە: پێغەمبەرانێکی زۆر پایە بەرز.

ب- یاخود: مەبەست پێی زۆرییانە، واتە: پێغەمبەرانێکی زۆر بە درۆ دانراون لە پێش تۆدا، تۆ یەکەم پێغەمبەرێ گەلە کافرەکەی خۆت و خەڵکەکەت بە درۆت دابنێن.

٣)- ﴿ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ﴾، کاروبارەکانیش تەنیا بۆ لای خوا ﷻ دەگێڕدرێنەوە، (الأُمُور: جَمعُ أَمرٍ، وهُوَ الشَأنُ وَالحَال)، کارو بارەکان، حاڵ و باڵەکان هەمووی بۆ لای خوا دەگێڕدرێنەوە، ئەم ڕستەیە دڵدانەوەیە بۆ پێغەمبەر ﷺ هاوکات هەڕەشەو ترساندن و وریا کردنەوەشە بۆ بێبڕوایان، مادام کاروبارەکان بۆ لای خوا بچنەوە، دەبێ وردبنەوە: بە چ چاو ڕووێکەوەو چۆن دەچنەوە بۆ خزمەت خوا!.

**مەسەلەی چوارەم:**

**بانگکردنی خوا بۆ خەڵک، کە دڵنیابن لە ڕاستیی بەڵێنی خواو، هاتنی ڕۆژی دوایی و، وریا بوون لە فریو خواردن بە ژیانی دنیا و دنەدانی شەیتان، چونکە شەیتان دوژمنێکی سەرسەختیانەو، بانگی شوێنکەوتووانی دەکات بەرەو دۆزەخ و، سەرەنجامیش بێبڕوایان سزای توندو، بڕوادارانیش لێبوردن و پاداشتی گەورە چاوەڕێیانە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ۖ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ ﴿٥﴾ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّا ۚ إِنَّمَا يَدْعُوا۟ حِزْبَهُۥ لِيَكُونُوا۟ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٦﴾ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ ۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ ﴿٧﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم سێ ئایەتە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ﴾، ئەی خەڵکینە! بە دڵنیایی بەڵێنی خوا ﷻ ڕاستە، بەڵێنی خوا بە هاتنی ڕۆژی دوایی، ڕاست و چەسپاوە، (**الوَعْدُ: مَصْدَرٌ وَهُوَ الإِخْبَارُ عَنْ فِعْلِ المُخْبِرِ شَيْئاً فِي المُسْتَقْبَلِ**)، وشەی (وَعد): چاوگەو بریتیە لە هەواڵدان بە بابای هەواڵ پێدراو، کە لە داهاتوودا شتێك ڕوودەدات، بەڵێنی خوا ﷻ ڕاستە، واتە: کە فەرموویەتی ڕۆژی دوایی دێ، سزاو پاداشت هەیە، ئەوە ڕاستەو چەسپاوە.

٢)- ﴿ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا ﴾، با ژیانی دنیا فریوتان نەدات، ژیانی دنیا، واتە: ڕابواردن و خۆشییە ناشەرعییەکانی ژیانی دنیا فریوتان نەدات و بێ ئاگاتان نەکات، هەڵتانەخەڵەتێنێ.

٣)- ﴿ وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ ﴾، هەروەها با بەرانبەر بە خوا، فریودەر فریوتان نەدات، فریودەر بە پلەی یەکەم شەیتانە، ئنجا هەر شتێکی دیکەیە، مرۆڤ فریو بدات، (**الغَرُورُ: الشَّدِيدُ التَّغْرِير**)، ئەو شتەی یان ئەو کەسەی زۆر خەڵك فریو دەدات و هەڵدەخەڵەتێنێ،

کە مەبەست پێی شەیتانە بە پلەی یەکەم، بەڵام هەر شتێکی دیکەش خەڵك زۆر پێی هەڵبخەڵەتێ، وەك پارەو سامان، دەسەڵات، خۆشیی و لەززەتی ناڕەوای ماددیی، ئەوانە هەموویان دەگرێتەوە.

دەڵێ: (الغُـرورُ: إيهَـامُ النَّفْـعِ وَالصَّـلاَحِ فِيـمَا هُـوَ ضُرٌ وفَسَـادٌ)، (غُـرور): بریتیـە لـەوەی شـتێك کـە مایـەی زیـان و تێکدانـە، وا بهێنرێتـە پێـش چـاو، کـە مایـەی سـوودو بەرژەوەندییـە.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ ﴾، هەروەهـا بافریـودەر لەبـارەی خـواوە فریوتـان نـەدات، لێـرەدا: (بِاللهِ أَي: بِشَأْنِ اللهِ)، لـە بـارەی خـواوە، لـە بـارەی حـاڵ و کاری خـواوە، بـا هەڵتـان نەخەڵەتێنـێ، بـۆ وێنـە: خوتخوتەتـان بـۆ بـکات و بڵـێ: خـوا بەزەیـی و لێبوردنـی زۆرە، خـوا چاوپۆشـیی زۆرە، خـوا دەسـەڵاتی زۆرە، خـوا پایـەی زۆر بـەرزەو پێویسـتیی بـە سـزادانی ئێـوە نیـە، بـەو قسـانە بەرانبـەر بـە خـوا، بـا هەڵتـان نەخەڵەتێنـێ، مـادام خـوا زۆر بـەرزەو، زۆر مەزنـەو، زۆر گەورەیـەو، زۆر بەبەزەیـی و چاکـەکارە، ئەوجـار دەبـێ هیـچ کـەس لـە قسـەی دەرنەچـێ و، چـۆن بـۆ ئـەو شایسـتەیە نـاوا بپەرسـترێ، نـەك بـە پێچەوانـەوەوە!

٤)- ﴿ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمْ عَدُوٌّ ﴾، بە دڵنیایی شەیتان بۆ ئێوە دوژمنە.

٥)- ﴿ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّا ﴾، دەجا ئێوەش بە دوژمنی بگرن، واتە: بە دوژمنی بزانن و، دوژمنایەتیی بکەن، دوژمنایەتیی شەیتان بۆ مرۆڤ، وەك ئەو سیفەتی دڕندایەتییەیە، کە لە گورگ و سەگ و دڕندەکاندا دانراوە، کە بە سروشت دڕندەن، شەیتانیش هەر بە سروشت لە ئەنجامی بیرو بۆ چوونە هەڵەکەی خۆی و، لە ئەنجامی هەڵوێست و کردەوە خراپەکانیدا، سروشتەکەی وای لێهاتوە، کە هەر بە سروشت دژی مرۆڤە، وەك چۆن دوو پشکەو مار هەر بۆیان بگونجێ پێوە دەدەن، ئەویش بە هەمان شێوەیە.

٦)- ﴿ إِنَّمَا يَدْعُواْ حِزْبَهُۥ لِيَكُونُواْ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴾، بە دڵنیایی ئەو (شەیتان) کۆمەڵەکەی خۆی بانگ دەکات، تاکو بیانکاتە هاوەڵی کڵپە (ی دۆزەخ) واتە: هەر کەسێك شوێنی

بکەوێ و پێڕو حیزبی ئەو بن، دەیکاتە هاوەڵی دۆزەخ، کەواتە: وریا بن! نەبنە هاوەڵ و شوێنکەوتەو کۆمەڵی شەیتان.

٧)- ﴿ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ ﴾، ئەوانەی بێبڕوان، سزایەکی توندو سەختیان هەیە، واتە: شوێنکەوتووانی شەیتان، سزایەکی سەختیان هەیە، لە زۆر ئایەتی دیکەدا خوا ﷻ باسی ئەو سزا سەختەی دۆزەخ دەکات، بەڵام لێرەدا هەر بە کورتیی دەیفەرموێ و درێژەکەی لە شوێنانی دیکە دایە.

٨)- ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾، ئەوانەش کە بڕوایان هێناوەو، کردەوە باشەکانیان ئەنجام داون، بڕوایان هێناوە بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ و، کردەوە باشەکانیان ئەنجام داون، چ کردەوەی دڵ بن و، یان دەربڕینی زمان بن و، یان جموجۆڵی ئەندامەکان بن، چ لە زاتی خۆیاندا، یان چوارچێوەی خێزان، یان لە چوارچێوەی کۆمەڵگادا.

٩)- ﴿ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ ﴾، ئەوانە لێبوردنێکی ناوازەو مەزن و، پاداشتێکی گەورەیان هەیە.

**مەسەلەی پێنجەم و کۆتایی:**

**کەسێك کە کردەوەی خراپی خۆی بۆ ڕازێنراوەتەوە، وەك کەسێك نیە کە چاك و خراپ وەك خۆیان دەبینێ و، گومڕا کردن و ڕاستە ڕێ کردنیش بە دەست خوان، بۆیە نابێ پێغەمبەر ﷺ لە خەفەتی بڕوا نەهێنانی کافران، خۆی بفەوتێنێ بە مەراق و دڵتەنگیی و ناڕەحەتییەوە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أَفَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ فَرَءَاهُ حَسَنًاۖ فَإِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُۖ فَلَا تَذْهَبْ نَفْسُكَ عَلَيْهِمْ حَسَرَٰتٍۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٨﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ أَفَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ فَرَءَاهُ حَسَنًا ﴾، ئایا کەسێك کە کردەوە خراپەکەی خۆی بۆ جوان کراوەو، بۆی ڕازێنراوەتەوەو، بە چاکی بینیوە، (وەك کەسێکە کە چاك و خراپ وەك خۆتان دەبینێ؟). کێ کردەوە خراپەکەی بۆ ڕازاندۆتەوە؟ بە دڵنیایی شەیتان، بەڵام لێرەدا بە بکەر نادیار هێناویەتی، چونکە لە شوێنانی دیکەدا دیارە، وەك لە سووڕەتی (الأنفال)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ زَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ ﴾، شەیتان کردەوە خراپەکانی بۆ ڕازاندوونەوە، وشەی (تَزيين)، یانی: شتێك جوان نەبێت، بەڵام جوان بخرێتە بەرچاو.

﴿ فَرَءَاهُ حَسَنًا ﴾، ئەو کەسە بە جوانی بینیوە، بەڵام بەرانبەرەکەی باسنەکردوە، یانی: ئایا کەسێك کە کردەوە خراپەکەی خۆی بۆ جوان کراوەو بۆی ڕازێنراوەتەوەو، بە جوانی هاتۆتە بەرچاو، لە حاڵێکدا کە لە زاتی خۆیدا ناشیرین و خراپە، وەك کەسێك وایە کە چاك بە چاك و خراپ بە خراپ دەبینێ؟! بۆیە خوا ﷻ باسی بەرانبەرەکەی نەکردوە، چونکە هەر دیارە هەر شتێك بە سیاق و سەلیقە بزانرێ، خوا ﷻ کتێبی خۆی پێ قەڕەباڵغ نەکردوە.

٢)- ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِي مَن يَشَآءُ﴾، بە دڵنیایی خوا ﷻ هەر کەسێکی بیەوێ گومڕای دەکات و، هەر کەسێکیشی بوێ ڕاستەڕێی دەکات.

لێرەدا (هدایة) بە مانای ڕێنمایی کردن نیە، چونکە خوا ﷻ هەموو کەسی ڕێنمایی کردوە، بەڵکو هیدایەت لێرەدا بە مانای ڕاستە ڕێ کردن و خستنە سەر ڕێی ڕاستە.

٣)- ﴿فَلَا تَذْهَبْ نَفْسُكَ عَلَيْهِمْ حَسَرَٰتٍ﴾، با نەفست بەهۆی خەفەت لێ خواردنیانەوە، لەبەین نەچێ، خوێندراویشەتەوە: (فَلا تُذْهِبْ) واتە: نەفسی خۆت مەفەوتێنە لە خەفەتانیان، ئەگەر بەو شێوەیە بخوێنرێتەوە: ﴿فَلَا تَذْهَبْ نَفْسُكَ عَلَيْهِمْ حَسَرَٰتٍ﴾، ئەمە وەك ئەو تەعبیرە وایە کە دەڵێ: (فَلا أَرَيَنَّكَ هَهُنَا) واتە: با لێرە نەتبینم، یانی: با نەفست نەفەوتێ بە هۆی خەفەت لێ خواردنی ئەو بێبڕوایانەوە کە بڕوا ناهێنن.

٤)- ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِمَا يَصْنَعُونَ﴾، بە دڵنیایی خوا زانایە بەوەی ئەوان بە کارامەیی و لێزانیی و وردەکاریی دەیکەن، واتە: مادام خوا زانایەو شارەزایە دەزانێ چی دەکەن و، چۆن دەکەن، پێویست ناکات زۆر خەفەتیان لێ بخۆی، ئەو خوایەی کە پێیان زانایە، دەشزانێ چۆن مامەڵەیان لەگەڵ دا دەکات لە ڕۆژی دواییداو، چۆن سزایان دەدات!

## چوار کورتە سەرنج لە بارەی ئەم ئایەتەوە

١- کە خوا ﷻ دەفەرموێ: کەسێك کە کردەوە خراپەکەی خۆی بۆ ڕازێنراوەتەوەو جوانی بینیوە، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە بەشەر دەتوانێ خۆی ئیقناع بکات، بەشتی ناماقووڵ و نالۆژیکیی و، شتی خراپ بە چاك ببینێ و، شتی ناشیرین بە جوان ببینێ و، شتی ناخۆش بە خۆش ببینێ، بابایەکی جگەرە کێش و، بابایەکی مەی خۆرو، بابایەکی قومارچیی و، بابایەکی داوێن پیس و، بابایەکی پیاو کوژو، بابایەکی ڕێگرو دز، هەرکامیان کردەوەکەی خۆی جوان دەبینێ، نەفسی بەشەر، خوا ﷻ ئەو توانایەی داوەتێ، کە بتوانێ چاك بە خراپ ببینێ، خراپ بە چاك، جوان بە ناشیرین، ناشیرین بە جوان ببینێ، بۆ ئەوەی کە بگونجێ تاقیبکرێتەوە.

٢- لە ڕووی پزیشکییەوە، شتێکی چەسپاوە کە هەندێك جۆری مردن، لە ئەنجامی هەڵچوونی دەروونیی ڕوودەدات، یان حاڵەتێك کە بەسەر نەفسدا دێ و، مرۆڤ لە توانایدا نیە، لە ئەنجامی ئەوەدا مرۆڤ دەمرێ، وەك زۆرجار گوتراوە: فڵانکەس دڵی ڕاوەستا، یان: فڵانکەس دڵی تۆقی، یان: فڵانکەس زراوی چوو، یان: فڵانکەس لە خەفەتان مرد، ئەوە لە ڕووی پزیشکییشەوە شتێکی ڕاست و چەسپاوە، کە ئەم ئایەتە موبارەکە ئاماژەی پێ دەکات، دەفەرموێ: ﴿ فَلَا تَذْهَبْ نَفْسُكَ عَلَيْهِمْ حَسَرَٰتٍ ﴾، هەروەك خوێندراویشەتەوە: (فَلا تُذْهِبْ)، واتە: نەفسی خۆت مەفەوتێنە بەهۆی ئەوانەوەو لە خەفەتانیان، ئاوا مانا کراوە: (فَلا تُهْلِك نَفْسَكَ عَلَيهِم مِن جَرّاءِ الحَسرَةِ وَالغَمِّ)، واتە: خۆت مەفەوتێنە لە ئەنجامی زۆر خەفەت لێ خواردن و زۆر پەژارەدار بوون دا، بۆیان، ئەمە لە سوورەتی (الكهف)یشدا هاتوە، خوا ﷻ بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿ فَلَعَلَّكَ بَٰخِعٌ نَّفْسَكَ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِمْ إِن لَّمْ يُؤْمِنُوا۟ بِهَٰذَا ٱلْحَدِيثِ أَسَفًا ﴿٦﴾ ﴾، واتە: ڕەنگە خۆت بفەوتێنی بە دوایانەوە، لە ئەنجامی ئەوەدا کە بڕوا ناهێنن (بەو فەرمایشتانەی خوا).

**٣- کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِمَا يَصۡنَعُونَ ۝٨﴾، واتە: بە دڵنیایی خوا دەزانێ ئەوانە چی دەکەن، (صُنْع: إِجَادَةُ الفِعل)، (صنع) ئەوەیە شتێك بە لێزانیی و وردەکاریی و کارامەیی بکرێ، واتە: هەرچەندە کارەکەیان زۆر بە شەیتانیی و بە لێزانیی و بە وردەکاریی بکەن، بەڵام خوا پێی زانایە، دەگونجێ ئەوان مرۆڤان هەڵخەڵەتێنن لە دنیادا، بەڵام بە دڵنیایی خوای پەروەردگار بە هیچکەس هەڵناخەڵەتێ.**

**٤- کە خوا ﷻ دەفەرموێ: خۆت مەفەوتێنە بە هۆی خەفەت لێ خواردنیانەوە، ئەمە وەك پێشتریش باسمان کرد، سیفەتێکی گەورەی پێغەمبەری خوایە ﷺو، مەدح و ستایشێکی گەورەی پێغەمبەری تێدایە، هەرچەندە خوا ﷻ ئامۆژگاریی پێغەمبەر دەکات، کە زیاد لە توانای خۆی خەفەت و پەژارە لە دڵی خۆیدا کۆنەکاتەوە، وەك پەرۆشیی و بە تەنگەوە بوون بۆ کافرەکان، هەرچەندە ئەوە جۆرێکە لە ئامۆژگاریی کردنی خوا ﷻ و جۆرێکە لە رێ لێگرتنی و لە لۆمە کردنی، بەڵام هاوکات مەدح و ستایشێکی گەورەشی تێدایە بۆ پێغەمبەر ﷺ، کە زۆر بە تەنگ خەڵکەوە بووەو، زۆر بۆیان بە پەرۆش بووەو بۆیان دڵ ناڕەحەت بووەو، لەگەڵیان بەبەزەیی بووە.**

**خوا بە لوتف وکەرەمی خۆی، ئێمەش وا لێ بکات کە لەگەڵ خەڵکی دەوروبەری خۆماندا وابین، بەتەنگیانەوە بین و، پەرۆشیانمان بێ و، لەگەڵیان بەرەحم بین و، خەفەتیان بۆ بخۆین، لەڕاستیدا ئەوە سیفەتێکی گەورەیە لەهەر کەسێکدا بێ، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئینسان لەشتەکاندا تێنەپەڕێنێ و، وریای زێدەڕۆیی و سنوور بەزێنیی بێ.**

**سُبحَانَكَ اللّهُمّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ أَنتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ**

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان شـەش ئایـەت دەگرێتـە خـۆی، ئایەتەکانـی: (٩ - ١٤)، کـە تێیانـدا خـوای بـەرزو مـەزن لـە میانـی خسـتنە ڕووی پێنـج لـە نیشـانەکانیدا، کـە هـاوکات نیعمـەت و چاکـەی گـەورەو گرنگـی خواشـن ﷻ لـە ژیانـی بەشـەردا، باسـی تـاک و تەنیایـی خـۆی لـە پەروەردگارێتیـی و مشـوورخۆرێتی داو، باسـی پووچیـی و بـێ بنەمایـی پەرسـتراوە سـاختەکان دەکات.

هەروەهـا ڕایدەگەیەنـێ کـە تەنیـا خـوا هەمـەکارەی گـەردوون و ژیـان و مرۆڤـەو، ئـەو شـتانەی لـە جیاتـی خـوا دەپەرسـترێن و، بەندایەتییـان بـۆ دەکـرێ، بـۆش و پووچـن و، لـە ڕۆژی دوایـی دا ئەوانەیـان کـە خاوەنـی ئیـرادەو هەسـت و شـعوور بـوون، حاشـا لـە پەرسـتراوەکانیان دەکـەن و، ئەوانیـش هیـچ دادێکیـان نـادەن و، هیچ سـوودێکیان پـێ ناگەیەنـن و، ڕەنـج بـە خەسـار دەبـن، واتـە: پەرسـتەرەکانیان ڕەنـج بـە خەسـار دەبـن، کـە شـتانێکیان پەرسـتوە، لـە ڕۆژی دواییـدا هیـچ سـوودێکیان پـێ ناگەیەنـن.

﴿ وَٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ ٱلرِّيَٰحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَسُقْنَٰهُ إِلَىٰ بَلَدٍ مَّيِّتٍ فَأَحْيَيْنَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا ۚ كَذَٰلِكَ ٱلنُّشُورُ ﴿٩﴾ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعِزَّةَ فَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ جَمِيعًا ۚ إِلَيْهِ يَصْعَدُ ٱلْكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ وَٱلْعَمَلُ ٱلصَّٰلِحُ يَرْفَعُهُۥ ۚ وَٱلَّذِينَ يَمْكُرُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ ۖ وَمَكْرُ أُو۟لَٰٓئِكَ هُوَ يَبُورُ ﴿١٠﴾ وَٱللَّهُ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ جَعَلَكُمْ أَزْوَٰجًا ۚ وَمَا تَحْمِلُ مِنْ أُنثَىٰ وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلْمِهِۦ ۚ وَمَا يُعَمَّرُ مِن مُّعَمَّرٍ وَلَا يُنقَصُ مِنْ عُمُرِهِۦٓ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴿١١﴾ وَمَا يَسْتَوِى ٱلْبَحْرَانِ هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ سَآئِغٌ شَرَابُهُۥ وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ ۖ وَمِن كُلٍّ تَأْكُلُونَ لَحْمًا طَرِيًّا وَتَسْتَخْرِجُونَ حِلْيَةً

تَلْبَسُونَهَا وَتَرَى ٱلْفُلْكَ فِيهِ مَوَاخِرَ لِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٢﴾ يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِى ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِى ٱلَّيْلِ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِى لِأَجَلٍ مُّسَمًّى ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ ٱلْمُلْكُ وَٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ مَا يَمْلِكُونَ مِن قِطْمِيرٍ ﴿١٣﴾ إِن تَدْعُوهُمْ لَا يَسْمَعُوا۟ دُعَآءَكُمْ وَلَوْ سَمِعُوا۟ مَا ٱسْتَجَابُوا۟ لَكُمْ وَيَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ يَكْفُرُونَ بِشِرْكِكُمْ وَلَا يُنَبِّئُكَ مِثْلُ خَبِيرٍ ﴿١٤﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{هەروەها خوا ئەو کەسەیە کە بایەکان دەنێرێ، هەوران (لە هەڵمی سەر دەریا پەیدا دەکەن و) دەجووڵێنن و بڵاو دەکەنەوە، ئنجا بەرەو وڵات و شوێنێکی مردوو لێی دەخورین و، زەوییە (وشکە)کەی دوای مردنی پێ دەژیەنینەوە، زیندووکرانەوە (ی مرۆڤان)یش هەر بەو جۆرەیە ﴿٩﴾ هەر کەس عیززەتی دەوێ (با لە لای خوا بیخوازێ، چونکە)، بە دڵنیایی عیززەت هەمووی هی خوایە، (ڕێی وەدەستهێنانی عیززەتیش بەمجۆرەیە:) وشە پەسەندو چاکەکان بۆ لای (خوا) بەرز دەبنەوەو، کردەوەی چاکیش بڵندی دەکات، ئەوانەش کە پیلانە خراپەکان دەگێڕن، ئازارێکی توندیان هەیە لە (ڕۆژی دواییدا)و، ئەوە هەر فێڵ و پیلانی ئەوانە، کە پووچەڵ دەبێتەوە ﴿١٠﴾ هەروەها خوا ئێوەی (لە سەرەتاوە) لە گڵ دروست کردوە، دوایی لە تۆوێك، ئنجا ئێوەی گێڕاوە بە جووت (تاکو زاوزێ بکەن)و، هیچ مێینەیەکیش تۆڵدار نابێ و داینانێ، مەگەر بە زانیاریی وی و، هیچ تەمەندارێك تەمەن ناکات و، لە تەمەنی کەم ناکرێ، مەگەر لە نووسینێك دایەو، ئەوەش لەسەر خوا سێنایە ﴿١١﴾ دوو دەریایەکانیش یەکسان نین، ئەمەیان شیرین و سازگارو (بە ئاسانیی) چووە خوار (لە گەروو)و، ئەمەشیان سوێرو تاڵ و تفت و، لە هەر کامێکیشیان گۆشتی تەڕو تازە دەخۆن و، خشڵێك دەردەهێنن،

کە دەیپۆشن (بۆ خۆ ڕازاندنەوە)، کەشتییەکانیشی تێدا دەبینی قڵیشێنەرن (بۆ ئاوەکەی)، (بۆیە ئەوەی بۆ ڕەخساندوون) تاکو لە بەخششی خوا بخوازن (بە هۆی سەفەرو هات و چۆی بازرگانییەوە)و، بەڵکو سوپاسگوزاریی بۆ (خوا) بکەن ﴿١٢﴾ (خوا) شەوگار دەخاتە نێو ڕۆژگارەوەو، ڕۆژگاریش دەخاتە نێو شەوگارەوەو، خۆرو مانگیشی ڕام و دەستەمۆ کردوون، هەر کامێکیان بەرەو کاتێکی دیاریکراو دەڕوات، ئا ئەو خوایە پەروەردگارتانە، موڵک وحوکمڕانیی تەنیا هی ویەو، ئەوانەی جیا لەو لێیان دەپاڕێنەوە، (هێندەی) توێژی تەنکی سەر نێوکە خورماشیان بەدەست نیە ﴿١٣﴾ ئەگەر لێیان وەپاڕێن، بانگکردنەکەتان نابیستن و، ئەگەر (گریمان) بیستباشیان، وەڵامیان نەدەدانەوە، هیچ کەسیش وەك (خوای) شارەزا (لەو بارەوە) هەواڵت پێ نادات ﴿١٤﴾].

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(فَتُثِيرُ): (ثَارَ الغُبَارُ وَالسَّحَابُ وَنَحْوهُمَا يَثُورُ ثَوْرًا وَثَوَرَانًا: انْتَشَرَ سَاطِعاً)، تۆزو خۆڵ، هەروەها هەور و وێنەی وانیش، کاتێك بڵاودەبێتەوە، پەیدادەبێ و بڵاودەبێتەوەو دەدرەوشێتەوە، بریقەدار دەبێ.

کە دەفەرموێ: (فَتُثِيرُ سَحَاباً)، واتە: ئەو بایانە کە دێن، هەڵمی ئاو لەسەر ڕووی دەریا پەیدا دەکەن، هەڵمەکە خۆی هەیە، بەڵام هەڵمەکە لەگەڵ خۆیان دێنن و، سەرەنجام بەشە بچووکەکانی هەڵمەکە، کۆدەبنەوەو هەوریان لێ دروست دەبێ.

(اَلنُّشُورُ ): (النَّشْرُ: نَشَرَ الثَّوبَ، والصَّحِيفَةَ، والسَّحَابَ، والنِّعْمَةَ، والحَدِيثَ: بَسَطَهَا: ﴿وَالنَّشِرَٰتِ نَشْرًا ﴿٣﴾﴾ المرسلات، أي: المَلَائِكَةُ الَّتي تَنْشُر الرِّيَاحَ، أو الرِّيَاحُ الَّتي تَنْشُرُ السَّحَابَ)، (نَشْر): واتە: بڵاوبوونەوە، هەم بۆ پۆشاکە، هەم بۆ لاپەڕە، هەم بۆ

هـەور، هـەم بـۆ چاکـە، هـەم بـۆ قسـە، وشـەی (نَشْـر) بـەکاردێ، (نَشَـرَ الثَّـوبَ)، پۆشـاکەکەی بڵاوکـرد، لێکـی کـردەوە، (نَـشَرَ الصَّحِيفَـةَ)، لاپەڕەکانـی لێککردنـەوە، ئـاوەڵا کـردن، (نَشَـر السَّحَابَ)، هەورەکـەی بڵاوکـردەوە، (نَـشَرَ النِّعْمَـةَ)، چاکەکـەی بڵاوکـردەوە، (نَـشَرَ الحَدِيثَ)، قسـەکەی بڵاوکردەوە، (نَشَـرَ، أي: بَسَـطَهَا)، واتـە: پانیکرد، یـان: بـڵاوی کـردەوە، ﴿ وَٱلنَّٰشِرَٰتِ نَشۡرٗا ﴾ المرسلات، بڵاوکـەرەوەکان بـە بڵاوکردنـەوە، کـە دەگونجـێ مەبەسـت پێـی فریشـتەکان بـێ، کـە بایـەکان دەنێـرن و بڵاودەکەنەوە، دەشـگونجێ مەبەسـت پێـی بایـەکان بـێ، کـە هـەورەکان بڵاودەکەنـەوە.

(ٱلۡعِزَّةَ): (العِـزَّةُ: حَالَـةٌ مَانِعَـةٌ للإنْسَانِ مِـنْ أنْ يُغْلَـبَ)، (عِـزَّة): حاڵەتێکـە کـە ڕێگریی دەکات لـەوەی مـرۆڤ تێبشـکێ، بۆیـە ئەگـەر بگوتـرێ: باڵادەسـتیی، زاڵیـی، بەهێـزو پێزیـی، ئـەوە بەشـێك لـە واتاکـەی دەگەیەنـێ، منیـش ئـەو وشـانەم هەموویـان لـە مانـای دا بەکارهێنـاون، دەگوتـرێ: (أَرْضٌ عَـزَازٌ: أي صُلْبَـةٌ)، زەوییەکـی پتـەو کـە بـە ئاسانیی هەڵنەقەنـرێ، پاچـی تێنەچـێ، کەواتـە: (عِـزَّة)، حاڵەتێکـە هێـزو پێـزو توانـاو بڕشـت بـۆ ئینسـان دەڕەخسـێنێ و، مـرۆڤ وای لێـدەکات، لـە ئاسـت کەسـێکدا کـە چـاوی لەوەبـێ سـتەمی لێبـکات، حاڵەتێکـی وای بـۆ دەڕەخسـێنێ کـە کـەس بەسـەریدا زاڵ نەبـێ و، بـە سـەربەرزیی و بـە باڵادەسـتیی بمێنێتـەوە.

(ٱلۡكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ): (الكَلِـمُ: اسـمُ جِنْـسٍ لأنَّـهُ يَـدُلُ عَلَى المَاهِيَـةِ، قِيْـلَ: الكَلِمُ جَمْـعُ الكَلِمَة، وَالكَلِـمَات: المُعْجِـزَات والآيَـات والأحْـكَام والحُجَـج)، (الكَلِـمُ الطَّيِّـب)، دەگونجـێ نـاوی جینـس بـێ، واتـە: وشـەی پـاك و چـاك، هەندێکیـش گوتوویانـە: وشـەی (کَلِـم)، کـۆی (کَلِمَة)یـە، وەك چـۆن (کَلِـمَات)، وشـەی (کَلِمَة)یـە، هەروەهـا (کَلِـمَات)، دەگونجـێ بـە مانـای معجیـزان و نیشـانان و یاسـایان و بەڵگان، بەکاربـێ، وەك: ﴿ وَتَمَّتۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدۡقٗا وَعَدۡلٗا ﴾ الأنعام، بـەڵام لێـرەدا: ﴿ إِلَيۡهِ يَصۡعَدُ ٱلۡكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ ﴾، (الكلـم) واتـە: وشـەی پـاك و چـاك، کـە زۆر لـە توێـژەرەوان بـە شـایەتمانیان لێـك داوەتـەوە، یـان بـە وشـەی خوابەیەکگرتـن: (لَا إِلَـهَ إِلَّا اللَّـه)، بێجگـە لـە خـوا هیـچ پەرسـتراوێك نیـە، بـەڵام وا باشـترە، بـە کـۆی وشـە پـاك و چاکـەکان لێـك بدرێتـەوە، واتـە: چ وشـەی

تەوحید، چ وشەی دان بە پێغەمبەرایەتیی موحەممەد ﷺدا هێنان، کە تەواوکەری وشەی تەوحیدە، چ شایەتمان، چ وشە پاك و چاکەکانی دیکە، کە بە پاکگرتنی خوا، ستایشکردنی خوا، بە گەورە گرتنی خوا، بە مەزنگرتنی خوا، داوای لێبوردن کردن لە خوایان تێدا بەرجەستە دەبێ.

(وَمَكْرُ ): (المَكْرُ: صَرْفُ الغَيرِ عَمَّا يَقْصِدُهُ بِحِيْلَةٍ)، (مَكْرُ): بریتیە لەوە کە تۆ غەیری خۆت بە فێڵێك لەوە لابدەی کە مەبەستیەتی، بە کوردیی وشەی (مَكْر)، بە فێڵ، پیلان، لێك دەدەینەوە، وەك لە نامیلکەی ئەحمەدییشدا هاتوە: (جەبین و جەبهە تەوێڵەمەکرو کەیدو حیلە فێڵە)، بە کوردیی فێڵی بۆ بەکاردێنن، دەشگونجێ پیلانیشی بۆ بەکاربهێندرێ، ئەگەر بۆ خراپە بێ، ئەگەر بۆ چاکە بێ، پلانە، وشەی پیلان و پلانیش هەردووکیان وشەی ئینگلیزیین، بەڵام لە کوردییدا بۆ خراپە (ی) ی بۆ زێدە دەکەن: پیلان، ئەوی دیکەش بۆ چاکە: (پلان) پلان و نەخشەی دانا، کە ئەوە هەر کورد دەستکارییان کردوە، ئەگەرنا لە ئەصڵدا هەردووکیان لە پلان (plan)ی ئینگلیزییەوەن.

(يَبُورُ ): (البَوَار: فَرْط الكَسَادِ، والهَلَاك)، (بَوَار): بریتیە لەوەی کەسێك لە سەوداو مامەڵەدا، زۆر زەرەر بکات، هەروەها بۆ فەوتان (هَلَاك)یش بۆ بەکاردەهێنرێ، دەگوترێ: (بَارَ يَبُورُ بَوْراً وَبَوَاراً، أي: هَلَكَ)، واتە: فەوتا، لە بەین چوو، (بَوَّرَ الأَرْضَ: تَرَكَهَا أو صَيَّرَهَا بَائِرَةً)، ئەگەر بگوترێ: (بَوْر الأرْض)، زەوییەکەی واز لێهێنا، داینەچاند، نەیکێڵا، نەیکردە کشتوکاڵ، بە کوردییش هەر دەگوترێ: ئەو زەوییە بەیارە، واتە: دانەچێندراوە، کشتوکاڵی لێ نەکراوەو، بە سوورو سەقەتاڵیی و رووتیی ماوەتەوە، بەڵام لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿وَمَكْرُ أُوْلَٰئِكَ هُوَ يَبُورُ﴾، یانی: پیلانی ئەوانەیە کە پووچەڵ دەبێتەوەو بێ بەرهەم دەبێت، وەك چۆن زەوییەك هیچی لێ دانەچێندرێ، هیچ حاسەڵات و بەرهەمی نابێ.

(عَذْبٌ): (مَاءٌ عَذْبٌ: طَيِّبٌ بَارِدٌ)، (مَاءٌ عَذْبٌ): بە کوردیی دەڵێن: ئاوێکی شیرین، یاخود جاری وایە وشەی سازگاریشی بۆ بەکاردەهێندرێ، بەڵام لێرەدا (مَاءٌ عَذْبٌ: طَيِّبٌ بَارِدٌ)، ئاوێکی پاك و خۆش و سارد.

(فُرَاتٌ): (الفُرَات: المَاءُ العَذْب)، دیسان وشەی (فُرَات)یش هەر بە ئاوی شیرین و سازگار لێکدراوەتەوەو، وشەی (فُرَات) بۆ تاك و بۆ کۆش بەکاردێ.

(سَآئِغٌ): (سَاغَ الشَّرَابُ فِي الحَلْقِ: سَهُلَ انحِدَارُهُ)، (سائغ) ناوی بکەر (إسم فاعل)ە، واتە: بە ئاسانیی بە گەرووێدا چووە خوار، لە گەرووێ ناگیرێ، چونکە ئاویش هەیە تاڵ و تفتەو لە گەرووێ دەگیرێ، کەواتە: (سَاغَ الشَّرَابُ)، خواردنەوەکە چووە خوار بە گەرووودا.

(لَحْمًا طَرِيًّا): گۆشتێکی تەڕو تازە، (أي: غَضًّا جَدِيدًا، مِنَ الطَّرَاءِ وَالطَّرَاوَةِ، وَالإِطْرَاءُ: مَدْحٌ وَتَمْجِيدٌ لِشَخْصٍ مِن شَخْصٍ)، واتە: تازەیەو کۆن نەبووە، لە وشەی (طِرَاءِ وَطَرَاوَةِ)، هاتوە، (إِطْرَاء)یش بە ستایشکردنی کەسێك دەگوترێ بۆ کەسێك، کە بە چاکەو شکۆمەندیی باسی بکات و ناوی بێنێ.

(حِلْيَةً): (الحُلِيُّ: جَمْعُ الحَلْيِ، نَحْو ثَدِي وَثُدِيّ، وَقِيْلَ: الحُلِيُّ جَمْعُ حِلْيَة)، (حُلِيّ) کۆی (حَلْي)یە، (حَلْي)، یانی: خشڵ، (حُلِيّ)، یانی: خشڵەکان، وەك: (ثَدِي) مەمك، (ثُدِيّ)، مەمکەکان، هەندێکیش گوتوویانە، (حُلِيّ)، کۆی (حِلْيَة)یە، کەواتە: کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَتَسْتَخْرِجُونَ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا﴾، (حِلْيَة) بە (حُلِيّ)، کۆدەکرێتەوە، دەگونجێ (حُلِيّ) کۆی (حَلْي) بێ و، دەشگونجێ (حُلِيّ) تاکەکەی هەم (حَلْي) بێ، هەم (حِلْيَة)، هەردووکیان یانی: خشڵ، بۆ حاڵەتی تاك (حِلْيَة)، یان (حَلْي)، بۆ حاڵەتی کۆ (حُلِيّ).

(فِيهِ مَوَاخِرَ): (جَمْعُ مَاخِرَة، مَخَرَتِ السَّفِيْنَةُ البَحْرَ مَخْرًا، إِذَا شَقَّتِ المَاءَ بِجُؤْجُؤِهَا)، کەشتیی نووکەکەی، لووتەکەی پێی دەگوترێ: (جُؤْجُؤ)، ئنجا دەگوترێ: (مَخَرَتِ السَّفِيْنَةُ البَحْرَ)، کەشتییەکە ئاوەکەی شەقکرد بە نووك و لووتەکەی. (مَوَاخِر) کۆی

(مَاخِرَة)یـە، کـە مـن بـە: قڵیشـێنەرەکانم لێکداوەتـەوە، (مَوَاخِـر)، واتـە: قڵیشـێنەرن، ئاوەکـە دەقڵیشـێنن، شـەقی دەکـەن.

(قِطْـمِيرٍ): (القِطْمِـير: الأَثَـرُ فِي ظَهْـر النَّـوَاةِ، وَذَلِـكَ مَثَـلٌ للـشَّيءِ الـدَّنِيِّ الطَّفِيْـف، أَو لَفَافَـةُ النَّـوَاةِ وَهِـيَ القِـشْرَةُ الرَّقِيْقَـةُ المُلْتَفَّـةُ حَوْلَهَـا، وَقِيْـلَ هِـيَ النُّكْتَـةُ فِي ظَهْرِهَـا)، (قِطْمِـير): بـە دوو واتـا هاتـوە:

أ- بەو خاڵە بچووکەی، بەو کونە بچووکەی لەسەر نێوکی خورمایە، ئەو شوێنکە گچکەی لە سەریەتی، کە ئەوە بە وێنە دەهێنرێتەوە بۆ شتی کەم بایەخ و بچووك.

ب- هەروەها بەو توێژاڵە تەنکە {(لَفَافَة)، واتە: توێژاڵ} بەو توێژاڵە سپییە کە بە نێوکی خورماوە ئاڵاوە، لە نێوکەکەی ئاڵاوە، توێژاڵێکی تەنکی سپییەو مەیلەو بۆرە، پێی دەگوترێ: (قِطْمِير)، کەواتە: (قِطْمِير)، یان ئەو شوێنکە بچووکەیە کە لەسەر نێوکە خورمایە، یاخود بەو توێژاڵە سپییە تەنکە دەگوترێ، کە لە نێوکەکەی ئاڵاوە، وەك کیفێك.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

وەك پێشتر گوتمان: لەم شەش ئایەتەدا، خوا ﷻ پێنج لە چاکەو نیعمەتە گەورەو گرنگەکانی خۆی، کە هاوکات نیشانەو بەڵگەی بێ چەندو چوونیشن، لەسەر یەکتایی و، بێ هاوتایی خوا، لە بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگاریتیی و، خاوەنداریتیی و مشوورخۆرییدا، دەخاتەڕوو، ئنجا مادام خوا ﷻ تەنیا بە دیهێنەرو پەروەردگارو خاوەن و مشوورخۆر بێت، عەقڵ و مەنتیق و ویژدانیش وا دەخوازن، کە تەنیا ئەویش بەندایەتیی بۆ بکرێ و، بپەرسترێ، پەرستن و بەندایەتییش واتە: ئەوپەڕی ملکەچیی، وێڕای ئەوپەڕی خۆشویستن و، ئەوپەڕی سام و هەیبەت بەرانبەر هەبوون و، ئەوپەڕی پشت پێ بەستن و، ئەوپەڕی بە بەرزو گەورەو مەزنگرتن، ئەوە تەنیا دەبێت بۆ خوا ﷻ بێت.

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ ٱلَّذِیٓ أَرۡسَلَ ٱلرِّیَٰحَ فَتُثِیرُ سَحَابࣰا﴾، خوا ﷻ ئەو کەسەیە کە بایەکانی ناردوون، بایەکانی ڕەوان کردوون، ﴿فَتُثِیرُ سَحَابࣰا﴾، ئەوانیش هەوران پەیدا دەکەن لە ڕووی دەریا، هەڵمی دەریا کۆدەکەنەوەو، ڕەپێچەکی دەدەن، هەروەها بەشە لێکبڵاوەکانی هەڵمەکە، کە پێشێ بەچاو نابینرێن، بایەکان لێکیان نزیك دەکەنەوەو، سەرەنجام زیاتر خەست و خۆڵ دەبێت و دەبێتە هەور، ﴿فَسُقۡنَٰهُ إِلَىٰ بَلَدࣲ مَّیِّتࣲ﴾، دوایی ئەو هەورەمان لێخوڕی و بردمان، بەرەو وڵاتێکی مردوو، بەرەو سەر زەمینێکی مردوو، واتە: نیشانەی ژیانی لێ نیە، ڕووەکی لێ نیە، ﴿فَأَحۡیَیۡنَا بِهِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَاۚ﴾، دوایی زەوییەکەمان پێ زیندوو کردەوە، زەوییەکەی پێ دەژێنینەوە، دوای ئەوەی ڕووتەن بووەو، ڕووەکی پێوە نەماوەو، وشك هەڵگەڕاوە، کە ئەو هەورانە دەنێرین و، ئەوانیش ئاویان لێ دێتە خوار، بە شێوەی باران و بەفرو تەرزە، ئەو سەر زەمینە وشکە مردوە، جارێکی دیکە دەژێتەوەو، زیندوو دەبێتەوەو پڕ دەبێت لە ڕووەك و شینایی، ﴿كَذَٰلِكَ ٱلنُّشُورُ﴾، ئنجا بڵاوبوونەوەو زیندوو کرانەوەی ئێوەش، هەر بەو شێوەیە!

یانی: پێتان شتێكی قورس و بە زەحمەت نەبێت، وەك چۆن خوا ﷻ زەوییەكی وشك و برینگ و مردوو زیندوو دەكاتەوە، بەهۆی ئەو ئاوەوە كە لە هەورەكان دێتە خوار، لەشێوەی باران و بەفر و تەرزەدا، بە هەمان شێوەش، هەر كاتێك خوا ویستی، ئێوەش دوای ئەوەی جەستەكانتان تێكەڵ بە زەوی دەبنەوە، بەڵام ڕووحەكانتان لە شوێنێكی دیكەن، دوای ئەوە خوا ﷻ جەستەكانی ئێوەش، زیندوو دەكاتەوەو، ڕووحەكانیان بەبەردا دەكاتەوەو، بە پێكهاتەو چۆنیەتییەكی گونجاو لەگەڵ ئەو قۆناغەدا، دروستتان دەكاتەوە.

﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعِزَّةَ فَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ جَمِيعًا ﴾، هەر كەسێك عیززەتی دەوێ، عیززەت هەمووی تێكڕا هی خوایە، پێشتریش باسمان كرد، كە عیززەت: باڵادەستیی و زاڵبوون و، بەهێزو پێز بوون و، پتەویی و قایمیی و دامەزراویی، دەگەیەنێ، (العِزَّةُ: حَالَـةٌ مَانِعَـة للإِنْسَـان مِـنْ أَنْ يُغْلَـب)، عیززەت بریتییە لە حاڵەتێك كە ڕێ دەگرێ لەوەی مرۆڤ تێك بشكێ، كەواتە: هەر كەسێك هێزو پێزو باڵادەستیی و بە دەماریی دەوێ، عیززەت و باڵادەستیی هەمووی هی خوایە، با لە لای وی داوای بكات و پەیدای بكات.

ئنجا ڕێی پەیدا كردنی عیززەتمان پێشان دەدات و دەفەرموێ: ﴿ إِلَيْهِ يَصْعَدُ ٱلْكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ ﴾، وشە پاك و چاكەكان بەرەو لای خوا بەرز دەبنەوە، بەڵام ئایا وشە پاك و چاكەكان هەر بۆ خۆیان بەرز دەبنەوە؟ بێگومان نەخێر، ﴿ وَٱلْعَمَلُ ٱلصَّٰلِحُ يَرْفَعُهُۥ ﴾، كردەوەی باشیش، وشە پاك و چاكەكان بڵند دەكەن، كەواتە: بڵندكەر (رافعة)ی وشە پاك و چاكەكان بەرەو لای خوا، بریتییە لە كردەوەی چاك، كە دەڵێی: (لا إلهَ إلا الله) جگە لە خوا هیچ پەرستراوێك نییە، ئەگەر بە كردەوە ئەوە بەرجەستە نەكەی لە خۆتدا، ئەو وشەیە خوا ﷻ وەری ناگرێ، بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {أَسْعَدُ النَّاسِ بِشَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ مَنْ قَالَ :لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ خَالِصاً مِنْ قِبَلِ نَفْسِهِ} (أخرجه البخاري: ٩٩)، واتە: بەختەوەرترین كەس بە تكای من لە ڕۆژی دوایی دا، ئەو كەسەیە بە دڵسۆزیی و خۆ ساغ كردنەوەوە، بڵێ: هیچ پەرستراوێك نییە جگە لە خوا.

کەواتە: دەبێ بە کردەوە، وشە چاك و پاکەکان بەرجەستە بکەی و، کاریان پێ بکەی، ئنجا خوا ﷻ ئەو تەعبیرو وشە پاك و چاکانەو، ئەو شایەتمانەت لێ قبووڵ دەکات، ئا ئەوە ڕێی بەدەست هێنانی عیزەتە، ڕێیەکە بریتیە لە وشە پاك و چاکەکان، بەتایبەت خوا بەیەکگرتن (توحید الله) ئەویش دەبێ بە کردەوەی چاك و، بە پراکتیك و کرداریی بەرجەستە بکرێ، ئنجا ئەوە دەبێتە هۆی ئەوە کە بەرزی بکاتەوە بۆ لای خوا.

هەندێکیش گوتوویانە: کە دەفەرموێ: ﴿وَٱلۡعَمَلُ ٱلصَّٰلِحُ يَرۡفَعُهُۥ﴾، واتە: کردەوەی چاك، خوا ﷻ بۆ لای خۆی بەرزی دەکاتەوە، وشە پاك و چاکەکانیش خۆیان بەرەو لای خوا هەڵدەکشێن، بەڵام مانای یەکەمیان لەگەڵ ڕواڵەتی ئایەتەکەو سیاقەکەشیی دا گونجاوترە، دواییش لە مەسەلە گرنگەکاندا زیاتر شیی دەکەینەوە.

﴿وَٱلَّذِينَ يَمۡكُرُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾، بەڵام ئەوانەی پیلانە خراپەکان دەگێڕن، واتە: (يَمكُرُونَ المَكْرَاتِ السَّيِّئَات)، چونکە دەڵێ: (السَّيِّئَات: صفة لِمَوصُوف محذوف)، واتە: پیلانە خراپەکان دەگێڕن، لە بەرانبەر ئایین و بەرنامەی خواو، لە بەرانبەر پێغەمبەری خوا ﷺو، لە بەرانبەر کتێبی خوادا، ﴿لَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدٞ﴾، ئەوانە سزایەکی سەخت و توندیان هەیە، لە ڕۆژی دواییدا، ﴿وَمَكۡرُ أُوْلَٰٓئِكَ هُوَ يَبُورُ﴾، هەر پیلانی ئەوانیشە، بێ بەرهەم دەبێت و پووچەڵ دەبێت و، خاوەنەکەیان ڕەنج بە خەسار دەبێ، (بَارَ، يَبُورُ، بَوراً)، واتە: زەوییەك کە بێ بەرهەم دەبێت، یان بازرگانییەك کە خاوەنەکەی لێی دەچێتە زەرەرێ، یان زەوییەك کە ناچێنرێ و، ڕووەکی لێ نامێنێ، پێی دەگوترێ: (بَائِر) یان (بَيَار).

ئنجا خوا ﷻ دوای ئەوەی لە ئایەتی یەکەمدا باسی ناردنی بایەکانی کرد، کە هەورەکان پەیدا دەکەن و، ئاو دادەبەزێننە سەر زەوی و، سەر زەوی وشك و دێمەکار زیندوو دەکەنەوە، باسی چاکەو نیعمەتێکی دیکەی خۆی دەکات و

دەفەرموێ: ﴿ وَاللَّهُ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ﴾، خوا ﷻ ئێوەی لەگڵ (خاك) هێناوەتە دی، واتە: ئێوە لەسەرەتاوە لە گڵ دروست بوون، ئنجا ئەمە دوو واتایان هەڵدەگرێ:

١- باب و دایکی مرۆڤان، ئادەم و حەووا، ڕاستەوخۆ لە گڵ دروست بوون، وەك لە تەفسیری سەرەتای سووڕەتی (الأعراف)دا بە درێژیی باسی دروستکردنی ئادەم و حەووامان کردوە، هەروەها لە سەرەتای تەفسیری سووڕەتی (المؤمنون)دا.

٢- ئەو کەرەستەیەی نوتفەی لێ دروست دەبێت و، دوایی دەبێتە عەلەقەو، موضغەو ...هتد، ئەو کەرەستەیە یاخود ئەو ماددە خاوە، ئەویش سەرەتا لە گڵەوە دێ، ئنجا ئەگەر ڕووەکە، یان گۆشتی ئاژەڵە، هەرچی هەیە لە گڵەوە دێ، مەبەست پێی ئەوەیە.

خوا ﷻ ئێوەی لە گڵ هێناوەتە دی، ﴿ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ﴾، دوایی لە نوتفە، واتە: لە تۆویلکەیەك، ﴿ ثُمَّ جَعَلَكُمْ أَزْوَاجًا ﴾، دوایی ئێوەمان کردوە بە جووت، دوایی لە نوتفەی ئەو جووتانەوە، وەچەی ئێوە بەردەوام دەبێت، ﴿ وَمَا تَحْمِلُ مِنْ أُنثَىٰ وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلْمِهِ ﴾، هیچ مێینەیەك تۆلدار نابێت و ئاوس نابێت[1]، هەروەها تۆلەکەی دانانێت، هیچ مێینەکە کۆرپەلەی ناچێتە نێو سکەوەو، کۆرپەلەکەی دانانێت، مەگەر بە زانیاریی خوا ئەوە ڕوو دەدات، ئنجا چ مێینەی مرۆڤ بێت کە ئافرەتە، یان مێینەی ئاژەڵان بێت، هی هەموو ئەوانە، کە تۆلدارو ئاوس دەبن و، بەچکە لە سکی خۆیاندا هەڵدەگرن، چونکە هەندێك لە ئاژەڵان لە ڕێی هێلکە دانانەوە، بەچکەیان دەبن و، لە سکی خۆیاندا هەڵیناگرن، بەڵام بەشێکیان لە سکی خۆیاندا کۆرپەلە هەڵدەگرن، ئنجا خوا ﷻ دەفەرموێ: هیچ مێینەیەك کۆرپەلەکە هەڵناگرێ لە سکیداو، داینانێ کاتێ کە پێویستە تۆلەکەی دابنێ، مەگەر بە زانیاریی خوا.

﴿ وَمَا يُعَمَّرُ مِن مُّعَمَّرٍ وَلَا يُنقَصُ مِنْ عُمُرِهِ ﴾، هەروەها تەمەن ناکات هیچ تەمەندارێك و، لە تەمەنیشی کەم نابێتەوە، هەر لە تەمەنی ئەو، یاخود لە

---

(١) تۆلدار بۆ مرۆڤ و، ئاوس بۆ ژیاندارانی دیکە، تۆل: حەمل.

تەمەنی یەکێکی دیکە، ﴿إِلَّا فِي كِتَٰبٍ﴾، مەگەر هەمووی لە نووسینێك دا هەیە، واتە: لە لای خوا تۆمار کراوەو، لە زانیاریی خوادا هەیە، ﴿إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ﴾، ئەوەش لە لای خوا ئاسانە، بۆ خوا ئاسانە، کە هەم زانیاریی بە هەموو شتەکان هەبێت، بەوەی کە لە سکی مێینەکان دا هەیەو، بەوەی کە دایدەنێن، هەروەها تەمەنی تەمەنداران و، تەمەنی کەم تەمەنان و، لێ کەمبوونەوەی تەمەنیان، هەمووی لە زانیاریی خوادا پارێزراوە.

دوایی دێتە سەر باسی چاکەو نیعمەتێکی دیکەی خۆی و، دەفەرمووێ: ﴿وَمَا يَسْتَوِي ٱلْبَحْرَانِ﴾، دوو دەریایەکانیش یەکسان نین، ﴿هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ سَآئِغٌ شَرَابُهُۥ﴾، ئەمەیان ئاوەکەی شیرین و زولاڵەو، بە ئاسانیی لە گەروو دەچێتە خوار، ﴿وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ﴾، ئەمەشیان سوێرو تفت و تاڵەو، لە گەروو دەگیرێ و، ئەگەر لە گەرووش بچێتە خوارێ، مرۆڤ لێی تووشی زیان دەبێت، وەك پیرەمێرد دەڵێ: (تەماع وەك ئاوی سوێری دەریایە هەر دەیخۆیتەوەو تەسەللات نایە)، دیارە شتی سوێر تاکو بیخۆی، زیاتر تینووت دەکات، دوای ئەوەی خوا ﷻ سەرنجی بۆ ئەوە ڕاکێشاین، کە ئاوی شیرین و زولاڵ و سازگار، کە بە ئاسانیی لە گەروو دەچێتە خوارو، مرۆڤی پێ تێر ئاو دەبێت، یەکسان نیە، لەگەڵ ئاوی سوێرو تاڵ و تفت دا، کە نە لە گەروو چاك دەچێتە خوارو، نە مرۆڤیشی پێ تێر ئاو دەبێت، کە دەگونجێ ئەمە هەر مەبەست پێی مانا ڕواڵەتییەکەی بێت، کە تەماشا بکەن! خوا ﷻ لەو ئاوە سوێرو تاڵە، ئەو ئاوە شیرین و زولاڵەتان بۆ بەرهەم دێنێت، دەشگونجێ لە پشت ئەوەوە مەبەست پێی ئەوە بێت، کە ئینسانی بڕوادار وەك ئاوی شیرین و زولاڵ و سازگار وایە و، ئینسانی بێبڕواش وەك ئاوی تاڵ و تفت وایە.

ئنجا دوای ئەوە خوای میهرەبان، باسی چەند چاکەو نیعمەتێکی دیکەی خۆی، هەر پەیوەست بە دەریاوە دەکات:

﴿وَمِن كُلٍّ تَأْكُلُونَ لَحْمًا طَرِيًّا﴾، لە هەر کام لە دەریای ئاوی شیرین و، لە دەریای ئاوی سوێرو تاڵ و تفت، گۆشتێکی تەڕو تازە دەخۆن، خوا ﷻ ماسیی و ژیاندارەکانی ئاوی وا خوڵقاندوون، کە هەم لە ئاوی شیرین دا بتوانن بژین و، هەم لە ئاوی سوێردا، (لَحْمًا)، واتە: گۆشت، (طَرِيًّا)، واتە: تەڕو تازە، ﴿وَتَسْتَخْرِجُونَ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا﴾، هەروەها خشڵێکیان لێ دەردێنن، کە دوایی دەیپۆشن و، خۆتانی پێ دەڕازێننەوە، ﴿وَتَرَى الْفُلْكَ فِيهِ مَوَاخِرَ﴾، کەشتییەکانیش دەبینی لە دەریادا کە قڵیشێنەرن، واتە: بە لووتەکەیان ئاوی دەریا دەقڵیشێنن، تاکو بتوانن بڕۆن، ﴿لِتَبْتَغُوا مِن فَضْلِهِ﴾، تاکو بەهۆی ئەو کەشتییانەوە کە بارو سواریان پێ دەکەن، لە بەخششی خوا ﷻ داوا بکەن، واتە: سەفەرو هاتوچۆو بازرگانیی بکەن و، لە بەخششی خوا داوا بکەن، بەخششی خواش ئەو ماڵ و سامانەیە لە ڕێی کاسبییەوە پەیدا دەبێ، ﴿وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾، هەروەها هەموو ئەوانەی بۆ ڕەخساندوون، بەڵکو سوپاسگوزاریی بۆ خوا ئەنجام بدەن.

ئنجا دێتە سەر باسی چاکەو نیعمەتێکی دیکەی خۆی، کە نیعمەتی چوارەمە لێرەدا باس کرابێ، دەفەرموێ: ﴿يُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ وَيُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ﴾، شەوگار دەخاتە نێو ڕۆژگارەوەو، ڕۆژگاریش دەخاتە نێو شەوگارەوە، وشەی (إيلاج) بریتیە لەوەی شتێك بخەیە نێو شتێك، بەڵام بە نەرمیی و بە ئەسپایی، بەبێ ئەوەی زۆر هەستی پێ بکرێ، یان دەنگی بێ، کە لێرەدا مەبەست پێی ئەوەیە شەوگار دێتە جێی ڕۆژگار، ڕۆژگار لادەچێ و شەوگار دێتە جێی، دوای ئەوەی خۆرئاوا دەبێ و، وردە وردە شەو بە ئەسپایی دێ، نەك كتوپڕ بێ و، ڕۆژگاریش دەچێتە شوێنی شەوگار، دوای ئەوەی شەوگار لادەچێ و، سپێدەی بەیانیی شەبەق دەدات، ئەویش دیسان هێدیی هێدیی دێ، تەعبیری (يُولِجُ)، پڕ بە پێستی ئەو حاڵەتەیە، یانی: كتوپڕ دنیا تاریك دانایەت و، كتوپڕ دنیا ڕووناك دانایەت، ئەگەرنا حاڵەتێکی ناخۆش دەبوو بۆ مرۆڤ، بەڵکو بە شێنەیی، شەو جێی ڕۆژێ دەگرێتەوەو، ڕۆژ جێی شەوێ دەگرێتەوەو، بە دوای یەکدا دێن.

ئنجا نیعمەتی پێنجەم: ﴿وَسَخَّرَ ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ كُلّٞ يَجۡرِي لِأَجَلٖ مُّسَمّٗى﴾ هەروەها خۆرو مانگیشی دەستەمۆو ملکەچ و ڕامکردوون، هەر کامێکیان بۆ ژوانگەو شوێنێکی دیاریکراو، یان بۆ کاتێکی دیاریکراو دەڕۆن، ئەو کاتەی دیاریکراوە، مەبەست پێی جووڵەیانە، جووڵەی خۆر لە شەوو ڕۆژاندا، یان جووڵەی خۆر، لە ماوەی ساڵدا، هەروەها جووڵەی مانگە لە شەوەکاندا، یاخود جووڵەی مانگ، لە میانەی مانگێکدا، یان لە میانەی ساڵێکدا، یاخود جووڵەی خۆرو مانگە تاکو کۆتایی تەمەنیان، تاکو ئەوکات و شوێنەی خۆر دەوەستێ و، مانگ کۆتایی پێ دێ، هەموویان دەگرێتەوە، چونکە: ﴿يَجۡرِي لِأَجَلٖ مُّسَمّٗى﴾، دەڕوا بۆ کاتێك کە ناوبراوەو دیاریکراوە ، ئەمەش چەمك و واتایەکەی فراوان و گشتگیرە. ﴿ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡ﴾، ئا ئەوەتان کە باسکرا، کە ئەو نەکردەوەو سیفەتەکانی، ئەو خوایە پەروەردگارتانەو خاوەنتانەو مشوورخۆرتانە، ﴿لَهُ ٱلۡمُلۡكُ﴾، دەسەلات و حوکمڕانیی هەمووی هی ئەوە، ﴿وَٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ﴾، ئەوانەش کە جیا لەو لێیان دەپاڕێنەوە، لە جیاتی ئەو لێیان دەپاڕێنەوە، جگە لەو لێیان دەپاڕێنەوە، ﴿مَا يَمۡلِكُونَ مِن قِطۡمِيرٍ﴾، هیچیان بەدەست نیە، تەنانەت توێژاڵی تەنکی سەر نێوکە خورماشیان بەدەست نیە، یان: ئەو شوێنکە بچووکەی لەسەر دەنکە خورمایە، تەنانەت ئەوەندەشیان بەدەست نیە!.

﴿إِن تَدۡعُوهُمۡ لَا يَسۡمَعُواْ دُعَآءَكُمۡ﴾، ئەگەر لێیان بپاڕێنەوە، پاڕانەوەکەتان نابیستن، ﴿وَلَوۡ سَمِعُواْ مَا ٱسۡتَجَابُواْ لَكُمۡ﴾، ئەگەر گریمان بشبیستن، وەڵامتان نادەنەوەو بەدەنگتانەوە نایەن، کە دەفەرموێ: ئەگەر لێیان بپاڕێنەوەو، پاڕانەوەکانتان نابیستن، مەبەست پێی مانگ و خۆر و پەیکەرو دارو بەردو... هتد، چونکە ئێستاش ئەوانە دەپەرسترێن، ئەگەر ئا ئەگەر کەسێك مرۆڤێکی پەرستبێ، یان شەیتانی پەرستبێ، پاڕانەوەکەی دەبیستن، بۆیە دەفەرموێ: ﴿وَلَوۡ سَمِعُواْ مَا ٱسۡتَجَابُواْ لَكُمۡ﴾، ئەوانەشیان کە دەشبیستن، گریمان بشبیستن، وەڵامتان نادەنەوە، ئەوەی دەتانەوێ، بۆیان جێبەجێ ناکرێ، واتە: ئەگەر کەسێك بڵێ: شیفام بدەن،

یـان بژیـوم بـۆ زۆر بکـەن، یـان سـەرم بخـەن، یـان هـەر داوایەکـی دیکـە، وەڵام نادەنـەوەو بۆشـیان جێبەجـێ ناکـرێ.

﴿ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكْفُرُونَ بِشِرْكِكُمْ ﴾، لـە ڕۆژی هەڵسانەوەشـدا بێبـڕوا دەبـن بـەو هاوبـەش دانانـەی ئێـوە، واتـە: یەخەتـان لەبـەر دادەڕن و، حاشـاتان لـێ دەکـەن و، دەڵێـن: هەڵەتـان کـردوە کـە ئێمەتـان پەرسـتوەو، ئێمەتـان کردۆتـە هاوبەشـی خـوا.

﴿ وَلَا يُنَبِّئُكَ مِثْلُ خَبِيرٍ ﴾، هەروەهـا هیـچ کەسـیش وەك شـارەزا (مەبەسـت پێـی خوایـە) هەواڵـت پـێ نـادات، شـارەزای ڕەهـاو بـێ سـنوور، شـارەزا بـە هەمـوو شـتێك و، بـە هەمـوو کـەس، تەنیـا خوایـە ﷻ، واتـە: هیچکـەس وەك خـوا ﷻ لـەو بـارەوە هەواڵـت پـێ نـادات.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**ناردنی خوا بۆ بایەکان و وروژاندنی هەڵمی سەر دەریاکان و، سەرەنجام بوونی بە هەورو، لێخوڕینی خوا بۆ هەورەکان بەرەو سەر زەمینێکی وشك و، پێ زیندوو کرانەوەی، هەروەها بەراوردکردنی ئەو زیندوو کرانەوەی زەوی، لەگەڵ زیندوو کرانەوەی مرۆڤەکان لە ڕۆژی دواییدا، پێچوێنرانی:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ ٱلرِّيَـٰحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَسُقْنَـٰهُ إِلَىٰ بَلَدٍ مَّيِّتٍ فَأَحْيَيْنَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا ۚ كَذَٰلِكَ ٱلنُّشُورُ ﴿٩﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ وَٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ ٱلرِّيَـٰحَ ﴾، خوا ﷻ ئەو زاتەیە کە بایەکانی ناردوون، وشەی (رِیَاح) وەك خوێندراویشەتەوە: **(الرِّیْح)**، **(أرسل الرِّیْح)** واتە: بایەکەی ناردوە، بەڵام **(أرسل الرِّیَاح)** واتە: بایەکانی ناردوون، کە بشفەرموێ: **(الرِیْح)** کە ئەلیف و لامی ناساندنی لەسەرە، واتە: جینسی بای ناردوە.

٢)- ﴿ فَتُثِيرُ سَحَابًا ﴾، هەور پەیدا دەکات و، هەور دەوروروژێنێ، دیارە کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ ٱلرِّيَـٰحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا ﴾، پێشێ خوا ﷻ باسی خۆی دەکات، دوایی بە شێوەی نادیار باسی بایەکان دەکات، کە چۆن هەور پەیدا دەکەن و بە ڕێژگەی بەردەوام و ئێستا (مضارع) دەیهێنێ، یەکەمیان ڕابردوو (ماضي)یە: ﴿ وَٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ ٱلرِّيَـٰحَ ﴾، هی دووەمیان بۆ (مضارع)ە: ﴿ فَتُثِيرُ سَحَابًا ﴾، کە ئەمە ئاوڕدانەوەیە لە ڕابردووەوە بۆ ئێستا.

٣)- ﴿ فَسُقْنَـٰهُ إِلَىٰ بَلَدٍ مَّيِّتٍ ﴾، ئنجا لێمانخوڕی بەرەو سەرزەمنێکی مردوو، ئەمەش دیسان جارێکی دیکە ئاوڕدانەوەیەکی دیکەی تێدایە، کە خوا ﷻ دەیکات بە حاڵەتی

قسەکەر، ﴿فَسُقۡنَٰهُ﴾، واتە: لێمان خوڕیی بەرەو سەر زەمینێکی مردوو، وشەی (البَلَدُ: يُذَكَّرُ وَيُؤَنَّثُ، وَالبَلَدُ والبَلْدَةُ تُطلَقُ عَلَى كُلِّ مَوضِعٍ مِنَ الأَرضِ عَامِراً كَانَ أَو خَلاءً)، وشەی (بَلَد)، هەم بە (مذكَّر) دێ (هذا بلد)، هەم بە (مؤنث) دێ، (هذه بلد)، وشەی (بلد)و (بَلْدَة) کە وشەی (بَلْدَة) هەر بە (مؤنث) ئاماژەی بۆ دێ، ئنجا وشەی (بلد) و (بَلْدَة) بە هەر شوێنێك لە زەوی دەگوترێ، چ ئاوەدان بێ، چ چۆڵ بێ، ﴿فَسُقۡنَٰهُ إِلَىٰ بَلَدٖ مَّيِّتٖ﴾، واتە: لێمان خوڕیی بەرەو سەر زەمینێکی مردوو، مەبەست لە سەر زەمینی مردووش، شوێنێکە هیچ ڕووەك و شینایی لێ نەمابێ.

٤)- ﴿فَأَحۡيَيۡنَا بِهِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَاۚ﴾، ئنجا سەر زەمینەکەمان پێ زیندوو کردەوە، دوای مردنی، واتە: دوای وشك بوونی و، نەمانی ڕووەك و شیناورد لەسەری و، ڕووتەن بوونی، جارێکی دیکە ئاوەدانی دەکەینەوەو، پڕ دەبێ لە جۆرەکانی ڕووەك و دارو درەخت و دانەوێڵەو، هەموو ئەوەی کە مرۆڤ بۆ خۆی دەیچێنێ و، خزمەتی دەکات و، پەیدای دەکات، لەسەر ڕووی زەوی.

٥)- ﴿كَذَٰلِكَ ٱلنُّشُورُ﴾، واتە: بڵاوبوونەوەو زیندوو بوونەوەو هەڵساندنەوەی ئێوەش، هەر بەو شێوەیە، (أَي: كَمَثَلِ إِحيَاءِ المَوَاتِ، نَشْرُ الأَحْيَاءِ)، زیندوو کردنەوەی زەوی مردوو چۆنە، بڵاوکرنەوەی زیندووانیش هەر بەو شێوەیە، لە ڕۆژی دواییدا.

دەگونجێ دوو ئامانج لێرەدا هەبن:

أ- لە ڕووی توانینەوە: واتە: خوا ﷻ وەك چۆن ئەوەی توانیوە، ئەوەش دەتوانێ، وەك چۆن توانی زەوی دێمەکار بەهۆی بارانەوە زیندوو بکاتەوە، بە هۆی ئاوێکەوە کە دایدەبەزێنێ، لە شێوەی باران و بەفرو تەرزەدا، بە هەمان شێوە کە ئەوەی توانی، ئەوەش دەتوانێ: ئێوەش زیندوو بکاتەوە.

ب- لە ڕووی چۆنیەتییەوە: واتە: چۆن ئەو زەوییە قاقڕو وشك و برینگە، زیندوو بۆوە، بەهۆی داباراندنی ئاوەوە بۆ سەری، بە هەمان شێوە، ئێوەش هەر بەو جۆرە زیندوو دەکرێنەوەو، هەڵدەستێنرێنەوە.

با لەو بارەوە ئەو فەرموودەیە ببینین: {عَن أَبِي رَزِينٍ الْعُقَيْلِيِّ، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ يُحْيِي اللَّهُ الْمَوْتَى؟ وَمَا آيَةُ ذَلِكَ فِي خَلْقِهِ؟ قَالَ: «أَمَا مَرَرْتَ بِوَادٍ لَكَ مُمْحِلاً، ثُمَّ مَرَرْتَ بِهِ يَهْتَزُّ خَضِرًا؟ قَالَ قُلت: بَلَى. قَالَ: «فَكَذَلِكَ يُحْيِي اللَّهُ الْمَوْتَى، وَذَلِكَ آيَتُهُ فِي خَلْقِهِ} (أخرجه أحمد، والطيالسي: ١٨٠٢، وابن أبي شيبة في مُصَنَّفه، وقريب منه في صحيح مسلم عَن ابن مسعود).

واتە: ئەبی ڕەزینی عوقەیلیی، دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ خوا ﷻ چۆن مردووان زیندوو دەکاتەوە؟ نیشانەو بەڵگەی ئەوە لە دروستکراوەکانییدا چییە؟ فەرمووی: ئایا بە لای شیوو دۆڵێك دا نەڕۆیشتوویی {کە خەڵك و خزمەکانت بارگەو بنەیان لێ هەڵداوە؟! ئەوان ئەو کاتە ئاژەڵدار بوون} لە حاڵێکدا ڕووتەن و وشك بووە، دوایی جارێکی دیکە بەلایدا نەڕۆیشتوویی کە سەوز هەڵگەڕاوە؟ دەڵێ گوتم: با {ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ} فەرمووی: هەر بەو شێوەیەش خوا ﷻ مردووان زیندوو دەکاتەوەو، ئەوەش نیشانەو بەڵگەکەیەتی لە نێو دروستکراوەکانیدا.

**مەسەلەی دووەم:**

**سـەربەرزیی و پارێزراویـی لـە زەبوونیـی، هەمـووی هـی خوایـەو، هـەر کـەس عەودالّیەتـی بـا لـەلای وی بیخوازێ و، بـە هـۆی ئیمانـی ڕاسـت و سـاغ و کـردەوەی باشـەوە، کـە خـوا وەریـان دەگـرێ، پیلانگێڕانیـش لـە قیامەتـدا، سـزای سـەختیان هەیـەو ڕەنجـەڕۆ دەبـن:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعِزَّةَ فَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ جَمِيعًا ۚ إِلَيْهِ يَصْعَدُ ٱلْكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ وَٱلْعَمَلُ ٱلصَّـٰلِحُ يَرْفَعُهُۥ ۚ وَٱلَّذِينَ يَمْكُرُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ ۖ وَمَكْرُ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُوَ يَبُورُ ﴿١٠﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعِزَّةَ فَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ جَمِيعًا ﴾، هەر کەسێك عیززەتی دەوێ، عیززەت هەمووی هی خوایە، وشەی عیززەت ئەلیف و لامی لەسەرە:

أ- ئەو عیززەتەی دەوێ کە پێشتر باسکراوە، (ال) بۆ ناساندنی (عهد)ە، یانی: ئەو عیززەتەی کە زانراوە.

ب- یاخود (أل) بۆ هەمەگیریی (إستِغرَاق)ە، واتە: هەر کەسێك هەرچی عیززەت و سەربەرزیی و باڵادەستیی و هێزو پێزو پتەوییە، دەیەوێ.

﴿ فَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ جَمِيعًا ﴾، واتـە: بـا لـە لای خـوای داوا بـکات، چونکـە هەرچـی عیززەتـە، تێکـڕای هـی خوایـە، عیـززەت پێشـتریش قسـەمان لـێ کـردو، هەندێـك ناوایـان لێکداوەتـەوە: (العِـزَّةُ: الـشَّرَفُ وَالحصَانَـةُ مِـنْ أَنْ يُنَـالَ بِسُـوءٍ)، بریتیـە لە شـەڕەف و بەرزیی و پارێزراویـی، لـەوەی هیـچ خراپەیـەك ڕوو لەو کەسـە بـکات، یان هیچ تێکشـکانێك ڕووی تـێ بـکات، لـە سـووڕەتی (النسـاء)دا، خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ فَإِنَّ ٱلْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا ﴿١٣٩﴾ ﴾، بـەڵام لێـرەدا دەفەرمـوێ: ﴿ فَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ جَمِيعًا ﴾، لـەوێ دڵنیـای دەکاتـەوە، لەبـەر ئـەوەی

باسی مونافیقانە، بۆیە پێویستی بە تەئکید کردن و جەختکردنەوە بووە، دەفەرموێ: ﴿أَيَبْتَغُونَ عِندَهُمُ ٱلْعِزَّةَ﴾، ئایا عیززەتیان لێ دەخوازن؟! ﴿فَإِنَّ ٱلْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا ۝١٣٩﴾، بە دڵنیایی عیززەت هەمووی تێکڕا هی خوایە، لە سوورەتی (یونس)، ئایەتی ژمارە (٦٥)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ إِنَّ ٱلْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا﴾، با قسەی وان تۆ دڵتەنگ نەکات، بە دڵنیایی عیززەت تێکڕای هی خوایە ﷻ، پێویستە بزانرێ کە لێرەدا: ﴿وَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ﴾، پێویستە بابای قورئان خوێن بوەستێ، ئەگەرنا مانایەکەی هەڵە دەردەچێ، چونکە: ﴿وَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ إِنَّ ٱلْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا﴾، ئەگەر نەوەستی واتاکەی دەبێتە: با قسەی ئەوان کە دەڵێن: عیززەت هەمووی هی خوایە، تۆ دڵتەنگ نەکات، کە لە ڕاستییدا مەبەست ئەوە نیە! ﴿وَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ﴾، یانی: قسەی ئەوان کە باسی شیرکەو باسی کوفرە، یان باسی هەر شتێکە، با تۆ دڵتەنگ نەکات، چونکە: ﴿إِنَّ ٱلْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا﴾.

پێغەمبەر ﷺ لەو بارەوە کە عیززەت هەمووی هی خوایەو، بە بەندایەتیی و فەرمانبەریی بۆ خوا، ئەو عیززەتە دەستەبەر دەبێ، دەفەرموێ: {ما تَوَاضَعَ لِلَّهِ أَحدٌ إلاَّ رَفَعَهُ اللَّه} (أخرجه مسلم: ٢٥٨٨، والترمذي: ٢٠٢٩).

واتە: هەر کەسێك بۆ خوا خۆی بە کەمبگرێ، خوا بەرزی دەکاتەوە.

ئنجا خوا ﷻ چۆنیەتی وەدەستهێنانی عیززەت و باڵادەستیی و زاڵیی و هێزو پێزمان، پێشان دەدات.

٢)- ﴿إِلَيْهِ يَصْعَدُ ٱلْكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ﴾، وشەی پاك و چاك بەرەو لای وی بەرز دەبێتەوە، دەشگونجێ (الكَلِم) کۆی (كَلِمَة) بێ، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەگەر کۆ (جمع)بێ، دەبێتە مێینەی مەجازیی (المؤنث المجازي)، ئەویش هەردووك لای تێدا دروستن، کە ڕاناوی نێر یان مێینەی بۆ بەکاربهێنرێ، بۆیە ڕاناوی نێرینەی بۆ بەکارهێنراوە، ئنجا وشەی پاك و چاك، خوا بەیەکگرتن (لَا إلَه إلاَّ الله)ە، یان هەر کام لە وشە پاك و چاکەکانی دیکەن و، بۆ لای خوا بەرز دەبنەوە.

٣)- ﴿ وَٱلْعَمَلُ ٱلصَّـٰلِحُ يَرْفَعُهُۥ ﴾، کردەوەی باشیش بەرزی دەکاتەوە، ئەم ڕستەیە سێ واتای هەن:

١- **(العمل الصالحُ يرفع الكلمَ الطيِّبَ)**، واتە: کردەوەی باش، وشە پاك و چاکەکە بەرز دەکاتەوە بۆ لای خوا.

٢- **(وَالعَمَلُ الصَّالِحُ يَرفَعُ المُسلِم)**، واتە: کردەوەی باش ئینسانی مسوڵمان بەرز دەکاتەوە.

٣- **(وَالعَمَلُ الصَّالِحُ يَرفَعُهُ الله)**، واتە: خوا کردەوەی باش بەرەو لای خۆی بەرز دەکاتەوە، هەموو مانایەکانی تێدا ڕەوان لە ڕووی زمانی عەرەبییەوە، بەڵام زیاتر وا پێدەچێ مەبەست ئەوە بێ، کە کردەوەی باش، وشەی پاك و چاك بەرەوە لای خوا بەرز دەکاتەوەو، بۆی دەبێتە بەرزکەر **(رافعة)**.

هەڵبەتـە **(صعـود)** بریتیـە لـە ڕۆیشـتن بـەرەو شـوێنێکی بڵنـد، هەروەکـو **(رفـع)** یـش بریتیـە لـەوە کـە شـتێك لـە شـوێنێکەوە بـۆ شـوێنێکی بڵندتـر بگوازیـەوە.

٤)- ﴿ وَٱلَّذِينَ يَمْكُرُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ ﴾، ئەوانەش کە پیلانە خراپەکان دەگێڕن، سزایەکی سەختیان هەیە، **(يَمكُرُونَ المَكَرَاتِ السَّيِّئَات)**، واتە: پیلانە خراپەکان دەگێڕن، یاخود: **(ضُمِّنَ يَمْكُرُونَ، مَعْنَى يَكْسِبُون)**، وشەی **(يَمْكُرُون)**، مانای **(يَكسِبُون)**ی خراوەتە نێو، کەواتە: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَمْكُرُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ﴾، یانی: **(يَكسِبُونَ السَّيِّئَات)**، ئەو کاتە: **(السَّيِّئَات)** دەبێتە بەرکار **(مفعول به)**، چونکە **(مَكْر)** **(متعدِّي)** نیەو، **(لازم)**ەو، پێویستیی بەرکار **(مفعول به)** نیە، بەڵام ئەگەر مانای **(يَكسِبُون)**ی خرایە نێو، ئەو کاتە **(تعدِّي)** دەکات و **(السَّيِّئَات)** دەبێتە بەرکار **(مفعول به)**، واتە: پیلانە خراپەکان وە دەست دێنن، پیلانە خراپەکانیش هەموو جۆرەکانی خراپە دەگرێتەوە، وەك دژایەتیی قورئان و، دژایەتیی پێغەمبەر ﷺ و، شیرك بەرانبەر بە خواو، کوفرو، ... هتد.

٥)- ﴿ وَمَكْرُ أُوْلَـٰٓئِكَ هُوَ يَبُورُ ﴾، هەر پیلانی ئەوانیشە، کە پووچەڵ و بێ بەرهەم دەبێ، وەك چۆن زەوییەك کە هیچی لێ ناڕوێ، پیلانی ئەوانیش هیچی لێ سەوز نابێ،

چونکە وشەی (بوار) لە ئەسڵدا بریتیە لەوە کە بازرگانییەك زەرەر بکات و، خاوەنەکەی لێی بچێتە زەرەرێ و، دەسمایەکەشی بفەوتێ، هەروەها کەل و پەلێك کە دەیەوێ بیفرۆشێ، بۆی نەفرۆشرێ، بەڵام لێرەدا وشەی: (یَبُور) خوازراوەتەوە بۆ کارێکی بێ بەرهەم، پیلانێك کە خاوەنەکەی تێیدا ڕەنج بە خەسار بێ.

وشەی (مَکر)یش بە کورتیی بریتیە لە تەگبیر کردن بۆ ئەوەی زیان بە کەسێك بگەیەنی بە پەنهانیی، بۆ ئەوەی هەست بە خۆی نەکات، کە ئەگەر بە پەنهانیی بێ، هەست بە خۆی ناکات و خافڵگیر دەبێت.

## کورتە باسێک
## چوار ڕوونکردنەوە لە بارەی ئەم ئایەتەوە

﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعِزَّةَ فَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ جَمِيعًاۚ إِلَيْهِ يَصْعَدُ ٱلْكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ وَٱلْعَمَلُ ٱلصَّٰلِحُ يَرْفَعُهُۥۚ وَٱلَّذِينَ يَمْكُرُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌۖ وَمَكْرُ أُوْلَٰٓئِكَ هُوَ يَبُورُ ﴿١٠﴾ ﴾، هەرچەندە لە حەوت بڕگەدا، ئەم ئایەتەمان شیکردەوە، بەڵام زانایان لە بارەی ئەم ئایەتەوە زۆر قسەیان کردووەو، بە پێویستم زانی چوار تیشکێکی دیکەش، بخەمە سەر ئەم ئایەتە موبارەکە:

١- قسەیەکی (ابن العربي) دێنین کە (القرطبي) لە تەفسیرەکەی خۆی دا،[1] لێی خواستۆتەوە، دەڵێ: (قَالَ ابْنُ الْعَرَبِيِّ:» إِنَّ كَلَامَ الْمَرْءِ بِذِكْرِ اللَّهِ، إِنْ لَمْ يَقْتَرِنْ بِهِ عَمَلٌ صَالِحٌ، لَمْ يَنْفَعْ، لِأَنَّ مَنْ خَالَفَ قَوْلُهُ فِعْلَهُ، فَهُوَ وَبَالٌ عَلَيْهِ، وَتَحْقِيقُ هَذَا: أَنَّ الْعَمَلَ إِذَا وَقَعَ شَرْطًا فِي قَبُولِ الْقَوْلِ أَوْ مُرْتَبِطًا، فَإِنَّهُ لَا قَبُولَ لَهُ إِلَّا بِهِ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ شَرْطًا فِيهِ، فَإِنَّ كَلِمَهُ الطَّيِّبَ يُكْتَبُ لَهُ، وَعَمَلَهُ السَّيِّئَ يُكْتَبُ عَلَيْهِ، وَتَقَعُ الْمُوَازَنَةُ بَيْنَهُمَا، ثُمَّ يَحْكُمُ اللَّهُ بِالْفَوْزِ وَالرِّبْحِ وَالْخُسْرَانِ«. قُلْتُ: مَا قَالَ ابْنُ الْعَرَبِيِّ تَحْقِيقٌ، وَالظَّاهِرُ أَنَّ الْعَمَلَ الصَّالِحَ شَرْطٌ فِي قَبُولِ الْقَوْلِ الطَّيِّبِ).

واتە: دەڵێ: (ابن العربي) گوتوویەتی: قسەی مرۆڤ بە یادی خوا [کە دەڵێ: (لا إلە إلاّ اللە)، یان: (سبحان اللە)، یان هەر وشەیەکی دیکە کە یادی خوا دەکات] ئەگەر کردەوەی باشی لەگەڵدا نەبێ، سوودی نیە، چونکە هەر کەسێک قسەکەی پێچەوانەی کردەوەکەی بێ، لە جیاتی ئەوەی لە قسەکەی بەهرەمەند بێ، لێی زەرەرمەند دەبێ، (مانای وایە درۆیەکی کردوە)، ساغکردنەوەی ئەوەش بەو شێوەیە: کردەوە ئەگەر بە مەرج گیرابێ بۆ وەرگرتنی قسە، یاخود پێیەوە پەیوەست بێ، ئەوە ئەو قسەیە بەبێ ئەو کردەوەیە، وەرناگیرێ، بەڵام ئەگەر

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج١٤، ص٣٦٥.

کردەوەکە مەرج نەبێ لە قسەکەداو، پێیەوە پەیوەست نەبێ، ئەوە قسە باش و چاکەکەی بۆ دەنووسرێ، بەڵام ئەگەر کردەوەی خراپیشی هەبێ ئەویشی لەسەر دەنووسرێ، دوایی پێك هەڵدەسەنگێنرێن، خواش ﷻ دادوەریی دەکات، لە نێوان سوودو زیان دا.

ئنجا (القرطبي) دەڵێ: ئەوەی (ابن العربي) گوتوویەتی: ساغکردنەوەیەکی باشە بۆ ئەو بابەتە.

واتە: مەرج نیە هەموو قسەیەك پەکی لەسەر کردەوەی چاك کەوتبێ، ئنجا بەرز بێتەوە، بەڵام ئەگەر کردەوەی چاك بە مەرج گیرابوو لەو قسەیەدا، یاخود پێیەوە پەیوەست بوو، دیارە بەبێ ئەوە وەرناگیرێ، ئەگەر کەسێکیش قسەی چاك و کردەوەی خراپیشی هەبێ، ئەو کاتە دیارە پێك هەڵدەسەنگێنرێن.

٢- (الطبري) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1] لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، لە بارەی ئەو فەرمایشتەی خواوە ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿إِلَيْهِ يَصْعَدُ ٱلْكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ وَٱلْعَمَلُ ٱلصَّٰلِحُ يَرْفَعُهُۥ﴾، ئەم قسەیە دێنێ، کە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس گوتوویەتی:

(الْكَلَامُ الطَّيِّبُ: ذِكْرُ اللَّهِ، وَالْعَمَلُ الصَّالِحُ: أَدَاءُ فَرَائِضِهِ؛ فَمَنْ ذَكَرَ اللَّهَ سُبْحَانَهُ فِي أَدَاءِ فَرَائِضِهِ، حُمِلَ عَلَيْهِ ذِكْرُ اللَّهِ، فَصَعِدَ بِهِ إِلَى اللَّهِ، وَمَنْ ذَكَرَ اللَّهَ، وَلَمْ يُؤَدِّ فَرَائِضَهُ، رَدَّ كَلَامَهُ عَلَى عَمَلِهِ، فَكَانَ أَوْلَى بِهِ).

واتە: وشەی پاك و چاك، بریتیە لە یادی خوا، کردەوەی باشیش جێبەجێکردنی ئەرکەکانە، (ئەو ئەرکانەی خوا پێویستی کردوون)، ئنجا هەر کەسێك خوای پاك یاد بکات، لە کاتی جێبەجێکردنی ئەرکەکانیدا، (واتە: ئەرکەکان جێبەجێ بکات و خوای لە یاد بێ)، ئەوە یادی خوا کردنەکە، دەخرێتە سەر کردەوە چاکەکەو، بەرەو لای خوا بەرزی دەکاتەوە، بەڵام هەر کەسێك یادی خوا بکات و ئەرکەکانی

---
[1] ( ١ ) بەژمارە: ٢٨٩٧٢.

کـە خـوا واجبـی کـردوون، جێبەجێیـان نـەکات، ئـەوە قسـەکەی دەگێڕدرێتـەوە بـۆ لای کردەوەکـەی، (فَكَانَ أَوْلَىٰ بِهِ)، ئـەو کـردەوە خراپـە شایسـتەترە بـەو قسـە چاکـە.

یـانی: ئـەو قسـە چاکـە بـۆ لای خـوا بـەرز نـا بێتـەوە، کـە کـردەوەی باشـی لەگەڵـدا نیە .

ئـەم قسـەیەی عەبدوڵـڵای کـوڕی عەببـاس زۆر وردو بەجێیـە، ئـەو مانایـەش زیاتـر بەهێـز دەکات کـە گومـان، کـە دەفەرمـوێ: ﴿وَٱلْعَمَلُ ٱلصَّـٰلِحُ يَرْفَعُهُۥ﴾، واتـە: کـردەوەی بـاش، ئـەو وشـە چـاك و پاکانـە بـەرەو لای خـوا بـەرز دەکاتـەوە.

٣- ﴿إِلَيْهِ يَصْعَدُ ٱلْكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ وَٱلْعَمَلُ ٱلصَّـٰلِحُ يَرْفَعُهُۥ﴾، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە وشەی پاك و چاك بۆ خۆی بەرەو لای خوا هەڵدەکشێ و، بەرزدەبێتەوە، بەڵام: کردەوەی باش بەرزی دەکاتەوە، ئنجا وێڕای ئەوە کە دەگونجێ مەبەست پێی ئەوە بێ، کردەوەی باش وشەی پاك و چاك بەرەو لای خوا بەرز دەکاتەوە، دەشگونجێ مەبەست ئەوە بێ، کە وشەی پاك و چاك بۆ خۆی بۆ لای خوا هەڵدەکشێ، بەڵام کردەوەی چاك خوا بۆ لای خۆی بەرزی دەکاتەوە، ئەو واتایەش دەگەیەنێ بەپێی ڕێزمانی عەڕەبیی، بەڵام جاری وا هەیە بەپێی ڕێزمانی عەڕەبیی واتایەك وەردەگیرێ لە ڕستەیەك، بەڵام دەبێ تەماشای سیاقەکە بکەی: ئایا ئەو واتایە کە لە ڕووی ڕێزمانییەوە دەگونجێ، لە ڕووی قورئانیشەوە، ئەوە مەبەستە، یاخود واتایەکی دیکە مەبەستە؟ دەبێ وردەکاریی لەوەدا بکرێ، مەرج نیە هەرچی لە ڕووی زمانی عەڕەبییەوە گونجا، لەگەڵ ئایەتێکدا، قورئان ئەوەی مەبەست بووبێ، کە بە داخەوە هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان، جاری وا هەیە ئایەتێك شەش واتایان هەڵدەگرێ، یان چوار پێنج واتایان هەڵدەگرێ، لە ڕووی زمانی عەڕەبییەوە، هەموو واتایەکان دێنن، بەڵام سەرنج نادەن، ئایا کام لەم واتایانە لەگەڵ ڕووحی قورئان و، لەگەڵ سیاقەکەداو، لەگەڵ ئەو تەوەرەی کە ئایەتەکانی لە بارەوە هاتوون، کامیان گونجاوە؟! بەڵکو دەڵێن: ئاخر لە ڕووی ڕێزمانی عەڕەبییەوە ئەو واتایەش دەگونجێ و، واتایەکانی دیکەش دەگونجێن! بۆیە زۆرجار ئەو کەسەی بیەوێ

حاڵیی بێ لە ئایەتەکە، ئایا خوا ﷻ مەبەستی پێ چی بووە؟ شتەکەی لێ بڵاوو ئاڵۆز دەبێ.

٤- بەراوردی نێوان خوازیارانی عیززەتی لای خوا ﷻ و، خوازیارانی عیززەت لەلای جگە لە خوا، خوا ﷻ بە نسبەت ئەوانەوە کە عیززەت لە لای خوا داوا دەکەن، دەفەرموێ: ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعِزَّةَ فَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ جَمِيعًا ﴾، واتە: هەر کەسێك عیززەتی دەوێ، ئەوە عیززەت هەمووی لە لای خوایە، واتە: با لە لای خوا ﷻ بیخوازێ، ئنجا لە بارەی ڕێی وەدەست هێنانی عیززەتەوە، خوا ﷻ یەکسەر دوا بە دوای ئەوە دەفەرموێ: ﴿ إِلَيْهِ يَصْعَدُ ٱلْكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ ﴾، یانی: لە ڕێی وشەی پاك و چاکەوە، عیززەت وەدەست دێ، کە دەگونجێ بگوترێ: وشەی پاك و چاك واتە: بووناسیی ڕێك و ڕاست و، ئیمانێکی پتەوو مەحکەم، ئەوە بۆ لای خوا بەرز دەبێتەوەو، خوا ﷻ ئەوە وەردەگرێ، ئنجا: ﴿ وَٱلْعَمَلُ ٱلصَّٰلِحُ يَرْفَعُهُۥ ﴾، ئیمانی پتەوو مەحکەم و، عەقیدەی ڕاست و ساغ، پێویستی بە کردەوەی باش هەیە، بۆ ئەوەی بۆ لای خوا بەرزی بکاتەوە، دەبێ مۆری کردەوەی پێوە بێت.

ئەمە بە نسبەت ئەوانەوە، کە عیززەت لە لای خوا ﷻ دەخوازن، دەبێ لە ڕێی بیرو بڕوای ڕێك و ڕاست و دروست و، کردەوەی باش و پەسندەوە، عیززەتی لای خوا وەدەست بێنن، ئەو عیززەتەی کە تەنیا لە لای خوایەو، تەنیا لەلایەن خواوە دەبەخشرێ.

ئنجا با تەماشای ئەوانە بکەین کە عیززەت لە لای غەیری خوا دەخوازن، با تەماشای شوێنکەوتووانی فیرعەون بکەین، هەروەك لە سووڕەتی (الشعراء) دا، جادووگەرەکان بەرلەوەی ئیمان بێنن، چییان گوت: ﴿ وَقَالُوا۟ بِعِزَّةِ فِرْعَوْنَ إِنَّا لَنَحْنُ ٱلْغَٰلِبُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾، گوتیان بە دڵنیایی ئێمە بە هۆی عیززەتی فیرعەونەوە زاڵ بووین، یاخود واتە: سوێند بە عیززەتی فیرعەون، ئێمە زاڵبووین، ئەوان بە عیززەتی فیرعەونیان خوریی و، خوای پەروەردگاریش یەکسەر دوا بە دوای ئەوەی باسی ڕێگای وەدەست هێنانی عیززەتی لای خوا دەکات، کە بریتیە لە وشەی

پـاك و چـاك و، کـردەوەی چـاك و پەسـند، یەکسـەر دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَمۡكُرُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ لَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدٞۖ وَمَكۡرُ أُوْلَٰٓئِكَ هُوَ يَبُورُ ١٠ ﴾، ئەوانـەی پیلانـە خراپـەکان دەگێـڕن، سـزای سـەختیان هەیـەو، پیلانـی ئـەوان ڕەنـج بـە خەسـارەو بەتاڵـەو بـۆش و پووچـە، کەواتـە: ئەوانـەی کـە عیـززەت لـەلای غەیـری خـوا دەخـوازن، لـە ڕێـی پیلانگێڕییـەوەو، لـە ڕێـی فیرعـەون پەرسـتییەوە، لـە ڕێـی کۆیلایەتیـی کـردن بـۆ حوکمڕانـە خۆسـەپێن و بـە زەبـرو زۆرەکانـەوە، لـەو ڕێیـەوە دەیانـەوێ عیـززەت وەدەسـت بهێنـن، بێمـرادو ڕەنـج بەخەسـارن، هـەر بۆیـە خـوا ﷻ لـە سـوورەتی (النسـاء)دا، دەفەرمـوێ: ﴿ بَشِّرِ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ بِأَنَّ لَهُمۡ عَذَابًا أَلِيمًا ١٣٨ ٱلَّذِينَ يَتَّخِذُونَ ٱلۡكَٰفِرِينَ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۚ أَيَبۡتَغُونَ عِندَهُمُ ٱلۡعِزَّةَ فَإِنَّ ٱلۡعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعٗا ١٣٩ ﴾، واتـە: مـوژدە بـدە بـە موونافیقـەکان، کـە ئازارێکـی بـە ئێشـیان هەیـە، ئەوانـەی بێبڕوایـان لـە جیاتـی بـڕواداران بـە دۆسـت و پشـتیوانی خۆیـان دەگـرن، ئایـا عیزەتیـان لـەلا دەخـوازن؟! بـە دڵنیایـی عیـززەت تێکـڕای هـی خوایـە، واتـە: عیـززەت لـەلای غەیـری خـوا نیـە.

کـە بەداخـەوە لـەم ڕۆژگارەی ئێسـتاماندا، خەڵکێکـی زۆر کـە لەسـەر ئیسـلام حیسـابەو، بـە ڕواڵـەت مسـوڵمانن، ئەمەیـان بەسـەردا دەچەسـپێ، کـە چاویـان لەوەیـە بەهـۆی حیزبێکـی کافـرەوەو، بەهـۆی ڕژێمێکـی سـتەمکارو لادەرەوە، یـان بەهـۆی زلهێزانێکـی خـوا نەنـاس و نامسـوڵمان و، بەڵکـو دژ بـە ئیسـلامەوە، عیـززەت و باڵادەسـتییان بـۆ پەیدابـێ، زۆر دەوڵەتۆکـەی مسـوڵمانانیش دەبینیـن، لـە دەوڵەتانـی عەڕەبیـی و، لـە دەوڵەتانـی غەیـرە عەڕەبیـی، کـە تامـەزرۆو عـەوداڵ و چاوەڕێـی مەرحەبایەکـی زلهێزانیـی، وەك ڕووسـیاو ئەمریـکاو چیـن و وڵاتانـی دیکەی ڕۆژهـەڵات و ڕۆژئـاوان، لـە جیاتـی ئـەوەی عیـززەت و باڵادەسـتیی و سـەربەرزیی دنیـاو دواڕۆژ، بـە هـۆی پابەندیـی بـە شـەریعەتەوەو، بـە هـۆی وشـەی پـاك و چـاك و ئیـمان و عەقیـدەی ڕاسـت و دروسـت، بـە هـۆی کـردەوەی بـاش و، پابەندیـی بـاش بـە شـەریعەتەوە بخـوازن، دەیانـەوێ بـە هـۆی کەیـن و بەیـن لەگـەڵ زلهێـزان

دا، لەسەر ئاستی دنیا، یاخود کەین و بەین لەگەڵ ئەو حیزب و ڕژێمانەدا، کە حوکم بە شەریعەت ناکەن، بەڵکو دژی شەریعەتی خوان، دەیانەوێ بە هۆی ئەوەوە، پارووە نانێکیان دەست بکەوێ و، مەرحەبایەکیان لێ بکرێ، ڕێزو حورمەتێکیان دەستبکەوێ، کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَمَكْرُ أُوْلَٰٓئِكَ هُوَ يَبُورُ ۝١٠﴾، واتە: پیلانی ئەوانە پووچ و بۆشە. ئەگەر لە دنیاشدا بۆیان دەرنەکەوێ، لە دواڕۆژدا بۆیان دەردەکەوێ، هەرچەندە لە دنیاشدا زۆرجار دیتوومانە، چۆن ئەو ڕژێمانەی پشت بەزلهێزەکان دەبەستن، یان ئەو کەسانەی پشت دەبەستن بە حیزبێکی عەلمانیی و لاڕێ و دژ بە ئیسلام، یان ڕژێمێکی خۆسەپێن، دەبینن چۆن دوای ئەوەی ئەو ڕژێمە یان ئەو حیزبە گلۆڵەی دەکەوێتە لێژیی، چۆن ئەوانیش دەکەونە گۆڕێ و، ئارەقەی شەرمەزاریی و خەجاڵەتییان لێ دەچۆڕێ!

مەسەلەی سێیەم:

**دروستکردنی خوا ﷻ بۆ مرۆڤان لە خاك و، دوایی لە تۆ و گێڕانیان بە جووت و، زانیاریی هەبوونی خوا بە هەر کۆرپەلەیەك کە هەر مێینەیەك لە سکیدا هەڵیدەگرێ و دایدەنێ و، هەر کەسێك چەند لە تەمەنی زیاد دەکات، یاخود کەم دەکات، بۆ خوا ﷻ هەمووی زانراوە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ جَعَلَكُمْ أَزْوَٰجًا ۚ وَمَا تَحْمِلُ مِنْ أُنثَىٰ وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلْمِهِۦ ۚ وَمَا يُعَمَّرُ مِن مُّعَمَّرٍ وَلَا يُنقَصُ مِنْ عُمُرِهِۦٓ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴿١١﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿ وَٱللَّهُ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ﴾، هەروەها خوا ئێوەی لە گڵ هێناوەتە دی.

ئەمە دوو واتـــای هەن:

أ- دەگونجێ مەبەست پێی ئادەم عليه السلام و حەووای هاوسەری، بێ واتە: دایك و بابی مرۆڤایەتیی، کە ڕاستەوخۆ لە گڵ دروستکراون.

ب- دەشگونجێ مەبەست پێی ئەو کەرەستە خاوە بێ، کە دوایی دەبێتە تۆو (**نُطفة**)، کە لە خوێن دروست دەبێت و، خوێنیش لە خۆراکی هەرسکراوو، ئەویش بریتیە لە هەموو ئەو شتانەی لە زەوی پەیدا دەبن، کە بریتین لە: ئاو و ڕووەك و دانەوێڵەو میوەو گۆشتی ئاژەڵ و پەلەوەرو ... هتد، هەرچی هەیە دەگەڕێتەوە بۆ زەوی.

٢)- ﴿ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ﴾، دوایی خوا ﷻ ئێوەی لە تۆو (**نُطفة**) هێناوەتە دی، واتە: بەردەوامیی وەچەی ئێوە لە ڕێی تۆو (**نطفة**)وەیە، (**نطفة**)ش بە تۆو (**مني**)ی پیاوو ئافرەت دەگوترێ، دوای ئەوەی یەکدەگرن، کە لەنێو هەر دڵۆپەیەك لە ئاوی پیاودا، ملیۆنان زیندەوەری بچووك هەن، پێیان دەگوترێ: (**الحَيوانُ المَنَوي**) کورتەکەی: (**حیمن**) ژیانداری تۆوی، هەروەها لە نێو

ئاوی ئافرەتیشدا هێلکۆڵە هەیە (بُوَیضَة) کە ئەویش زیندەوەرێکی بچووکە، ئنجا یەکێك لە زیندەوەرە بچووکەکانی نێو ئاوی پیاو، لەگەڵ ئەو زیندەوەرە بچووکەی نێو ئاوی ئافرەت دا، کە هێلکۆڵەی پێ دەگوترێ، یەکدەگرن تۆو (نُطفة) پێك دێنن.

ئێمە لە سەرەتای تەفسیری سوورەتی (المؤمنون)دا، بە درێژیی باسی چۆنیەتی دروستکردنی مرۆڤمان کرد لەلایەن خوای پەروەردگارەوە، چ ئادەم ﷺ، چ وەچەکەی و، باسی حەوت قۆناغەکانی: خوڵاسەی قوڕ (سلالة من طين)و (نُطفَة)و، (عَلَقَة)و، (مُضْغَة)و، ئێسقان و، گۆشت و، ڕووح بە بەرداکرانمان کرد.

٣)- ﴿ ثُمَّ جَعَلَكُمْ أَزْوَٰجًا ﴾، دوایی گێڕامانن بە جووت، (ثُمَّ: لِلتَّرْتِيب الرُّتْبِي)، (ثُمَّ) بۆ ڕیزبەندیی پلەییە، لەو ڕووەوە کە مرۆڤەکان بوونە جووت، بۆیان گرنگترە لەوەی کاتێك لە (نُطْفَة) دروست بوون، کە لە ڕاستییدا بەبێ جووتیەتیی (نُطْفَة)ش نەدەبوو بە مرۆڤ، چونکە (نُطْفَة) لە ئاوی هەردووکیان (باب و دایك) پێك دێ، ئەگەرنا (نُطْفَة)ش دروست نەدەبوو، بۆیە دەفەرموێ: دوایی ئێوەی گێڕا بە جووت.

٤)- ﴿ وَمَا تَحْمِلُ مِنْ أُنثَىٰ وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلْمِهِۦ ﴾، هیچ مێینەیەك تۆڵدار نابێ و تۆڵەکەی دانانێ، مەگەر بەزانیاریی وی.

ئنجا ﴿ أُنثَىٰ ﴾، ئەگەر مێینەی مرۆڤە، کە ئافرەتە، تۆڵدار دەبێ و، ئەگەر مێینەی ژیاندارانی دیکەیە، ئاوس دەبێ، چ هی ئاژەڵان وەك هەر چوار جۆرەکە: حوشترو ڕەشە وڵاخ و مەڕو بزن، یاخود هی دڕندەکان، یان هی ئاژەڵانی دیکە، وەك: فیل و هەموو ئاژەڵەکانی دیکە، هەموو ئەوانەی ئاوس دەبن و بەچکە هەڵدەگرن، خوا ﷻ دەزانێ کە هەموو مێینەکان چ بەچکەیەکیان هەڵگرتووەو، هەروەها کە بەچکەکەش دادەنێن، هەمووی بە زانیاریی خوایە. هیچ مێینەیەك هیچ بەچکەیەك لە سکیدا هەڵناگرێ و، دایناێ، مەگەر بە زانیاریی خوا، لێرەدا (إِلاَّ بِعِلْمِهِ: الإِسْتِثْنَاءُ مُفَرَّغٌ مِنْ عُمُومِ الأَحْوَالِ، يَعْنِي: لاَ تَضَعُ فِي حَالٍ مِنَ الأَحْوَالِ إِلاَّ بِعِلْمِهِ)، هەڵاواردن خاڵیی کراوەتەوە لەسەرجەم حاڵەکان، واتە: ئەو مێینە لە هیچ حاڵێکدا ئەو بەچکەیە هەڵناگرێ و، دایناێ، مەگەر بە زانیاریی خوا.

٥)- ﴿ وَمَا يُعَمَّرُ مِن مُّعَمَّرٍ ﴾، هەروەها هیچ تەمەندارێك تەمەن ناكات، (**عَمَّرَهُ أي: جَعَلَهُ بَاقِياً مُدَّةً زَائِدَةً عَلَى المُدَّةِ المُتَعَارَفَةِ فِي أَعْمَارِ الأَجْيَالِ**)، (**عَمَّرَهُ**) تەمەنی پێداو وای لێكرد بمێنێتەوە، زیاد لەو ماوەیەی كە باوە لە تەمەنی (وەچەكان).

كـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَا يُعَمَّرُ مِن مُّعَمَّرٍ ﴾، لـە ئەسـڵدا ئاوایـە: (**وَمَـا يُعَمَّـرُ مُعَمَّـرٌ**)، بـەڵام ئـەو (مِـن)ە، بـۆ تۆخكردنـەوەو، بەهێزكردنــی واتایەكەیەتـی، یـانی: هــەر تەمەنداركراوێـك بەبـێ هـەڵاواردن. (**التَّعْمِيرُ: جَعْلُ الإِنْسَانِ عَامِراً أي: بَاقِياً فِي الحَيَاةِ، إِذِ العُمُـرُ مُـدَّةُ الحَيَـاةِ**)، (**تَعْمِير**): بریتیـە لـەوە كـە مـرۆڤ تەمەنـدار بكـرێ، چونكـە (**عُمـر**) بریتیـە لـە مـاوەی ژیـان.

٦)- ﴿ وَلَا يُنقَصُ مِنْ عُمُرِهِ ﴾، هەروەها لە تەمەنی كەم ناكرێتەوە، یانی: هیچ كەسێك تەمەنی بۆ زیاد ناكرێ و، تەمەندار ناكرێ و، هیچ كەسێكی دیكەش لە بەرانبەردا تەمەنی كەم ناكرێتەوە.

كـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَا يُعَمَّرُ مِن مُّعَمَّرٍ وَلَا يُنقَصُ مِنْ عُمُرِهِ ﴾، ناگونجـێ كەسـێك تەمەنداریـش بـێ و، لـە تەمەنیشـی كـەم بكرێتـەوە[1]، كەواتـە: یـانی: هیـچ كەسـێك تەمەنـدار ناكـرێ و، هیـچ كەسـێكی دیكەش لـە بەرانبەریدا لـە تەمەنی كـەم ناكرێتەوە، مەگـەر ئـەوە هەمـووی لـە نووسراوێـك دا هەیـەو ئـەوەش لـە لای خـوا ئاسـانە.

كـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَا يُنقَصُ مِنْ عُمُرِهِ ﴾، وەك ئەوەیـە بگوتـرێ: (**عِنْـدِي دِرْهَـمٌ وَنِصْفُـهُ**)، واتـە: درەمێكـم لایـەو نیوەكەیشـی، دیـارە نیوەكـە هـی خـودی ئـەو درەمـە نیـە، لێرەشـدا: ﴿ وَمَا يُعَمَّرُ مِن مُّعَمَّرٍ ﴾، واتـە: هیـچ تەمەندارێـك تەمەنـدار ناكـرێ، ﴿ وَلَا يُنقَصُ مِنْ عُمُرِهِ ﴾، لـە تەمەنـی تەمەندارێكـی دیكـەش كـەم ناكرێتـەوە، وەك: (**عِنْـدِي دِرهَـمٌ**) واتـە: درەمێكـم لـە لایـە، (**وَنِصْفُـهُ**) نیـوەی درەمێكـی دیكـەش، نـەك نیـوەی خـودی ئـەو درەمـە كـە بەتەواویـی لەلایـەتی.

---

(١) بـەڵام ئەگـەر بـە دوو ئیعتیبـاری جیـاو لـە دوو ڕووەوە بـێ، دەگونجـێ: لـە ڕووێكـەوە تەمەنداركـراوەو لـە ڕووێكـی دیكەشـەوە لـە تەمەنـی كـەم كراوەتـەوە و (عومـر كـورت) كـراوە!

٧)- ﴿إِلَّا فِي كِتَٰبٍ﴾، مەگەر لە نووسراوێکدا هەیە، کە کینایەیە لە زانیاریی خوا ﷻ، کە هیچ شتێکی لێ پەنهان نابێ، وەك چۆن شتێك کە بنووسرێ، دوایی کەم و زیادیی تێدا ناکرێ، زانیاریی خواش کەم و زیادیی تێدا ناکرێ، شتەکان وەك خۆیان دەزانێ.

٨)- ﴿إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ﴾، بە دڵنیایی ئەوە لە لای خوا ﷻ ئاسانە.

پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێکدا دەفەرموێ: {مَنْ أَحَبَّ أَنْ يُبْسَطَ لَهُ فِي رِزْقِهِ، وَيُنْسَأَ لَهُ فِي أَثَرِهِ، فَلْيَصِلْ رَحِمَهُ} (أخرجه البخاري: ٥٦٤٠)، واتە: هەر کەسێك دەیەوێ بژێوی بۆ فراوان بکرێ و، تەمەنی بۆ دوابخرێ، با پەیوەندیی خزمایەتیی بگەیەنێ.

ڕەنگە یەکێك بڵێ: باشە مادام خوا ﷻ تەمەنەکەی دیاریی کردوە، چۆن دوایی زیاد دەکرێ بەهۆی چاکە لەگەڵ خزماندا؟!

وەڵامەکەی ئاوایە: خوا ﷻ لە ئەزەلدا تەمەنی ئەو مرۆڤەی دیارییکردوەو بەهۆی ئەوەوە کە پەیوەندیی خزمایەتیی دەگەیەنێ، هەر لە ئەزەلدا ئەندازەیەك تەمەنی بۆ زیاد کردوە، یان لەبەرئەوەی فڵان کارە چاکە دەکات، ئەندازەیەك تەمەنی بۆ زیاد کردوە، واتە: زیاد کردنەکە هەر لە ئەزەلدا زانراوە، بە هۆی ئەو هۆکارەوە کە ئەو مرۆڤە پەنای پێ دەبات و دەستەبەری دەکات.

پێشتریش ئاماژەمان پێدا کە ئێمە لە سەرەتای سووڕەتی (الأعراف)دا، لە کاتی تەفسیر کردنی ئایەتەکانی: (١٠ - ٢٥)دا، باسێکی تێرو تەسەلمان لە بارەی دروستکرانی ئادەمەوە ﷺ کردوە، لەوێ باسمان کرد، کە لە ئایەتەکانی قورئاندا، بۆ دروستکردنی ئادەم ﷺ باسی پێنج قۆناغان کراوە، کە بریتین لە: (١- تُرَاب، ٢-طِين، ٣-حَمَإٍ مَسْنُون، ٤-صَلْصَال، ٥-صَلْصَالٍ كَالفَخَّار)، کە ئەوانە هەموویان ئەو قۆناغانەن، ئەو کەرەستەیەی جەستەی ئادەمیان ﷺ لێ دروستکراوە، ئەو قۆناغانەی بڕیون، نەك ئایەتەکان تێك بگیرێن، ئەگەر کەسێکی سەرکێڵ و سادە تەماشا بکات، دەڵێ: ئەوە چییە! خوا ﷻ لە شوێنێك دەفەرموێ: لە قوڕێ

دروستمان کردووەو، لە شوێنێك دەفەرموێ: لە گڵ و، لە شوێنێك دەفەرموێ: ﴿مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ﴿٢٦﴾﴾، لە قوڕێکی ڕەشهەڵگەڕاوی بۆگەن و، لە شوێنێك دەفەرموێ: ﴿صَلْصَٰلٍ﴾، قوڕێکی وشك هەڵگەڕاو، کە ئەگەر پەنجەی لێ بدەی، دەنگی بێ و، لە شوێنێك دەفەرموێ: ﴿صَلْصَٰلٍ كَٱلْفَخَّارِ﴾، واتە: قوڕێکی ڕەق هەڵگەڕاوی وەك خەزەف؟! بەڵام بێگومان ئەوانە هەموویان قۆناغەکانی دروستبوونی جەستەی ئادەمن.

هەروەها ئێمە لە سەرەتای تەفسیری سووڕەتی (المؤمنون)، لە ئایەتەکانی: (١٣ - ١٤)دا، باسێکی تێرو تەسەلمان لە بارەی دروستکرانی مرۆڤەوە کردوە، چ ئادەم و حەوا (علیهما السلام)، چ وەچەکەیان، بۆیە لێرە هەروا بەو ئاماژە کورتە لێی دەگەڕێین.

**مەسەلەی چوارەم و کۆتایی:**

**خستنە ڕووی ژمارەیەکی دیکە لە چاکەو نیعمەتەکانی خوا ﷻ لە ژیانی مرۆڤدا، کە هاو کات بەڵگەو نیشانەی پەروەردگاریتیشینی، وەك هەردوو دەریای شیرین و سوێرو، بەهرەمەند بوون لە گۆشتی تەڕو تازەی نێو ئاوی شیرین و سوێر، هەروەها لەو خشڵەی کە لە نێویاندا هەیەو، هاموشۆی کەشتییان، هەروەها خستنە نێو یەکدیی شەو و ڕۆژان بە شێنەیی و، ڕامکرانی خۆرو مانگان و، هیچ لە دەست نەهاتوویی پەرستراوە ساختەکان لە دنیاو قیامەتدا، بۆ ئەو کەسانەی پەرستوویانن:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَمَا يَسْتَوِي الْبَحْرَانِ هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ سَائِغٌ شَرَابُهُ وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ ۖ وَمِن كُلٍّ تَأْكُلُونَ لَحْمًا طَرِيًّا وَتَسْتَخْرِجُونَ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا ۖ وَتَرَى الْفُلْكَ فِيهِ مَوَاخِرَ لِتَبْتَغُوا مِن فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٢﴾ يُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ وَيُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِي لِأَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ ذَٰلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ الْمُلْكُ ۚ وَالَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِهِ مَا يَمْلِكُونَ مِن قِطْمِيرٍ ﴿١٣﴾ إِن تَدْعُوهُمْ لَا يَسْمَعُوا دُعَاءَكُمْ وَلَوْ سَمِعُوا مَا اسْتَجَابُوا لَكُمْ ۖ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكْفُرُونَ بِشِرْكِكُمْ ۚ وَلَا يُنَبِّئُكَ مِثْلُ خَبِيرٍ ﴿١٤﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە بیست بڕگەدا:

١)- ﴿وَمَا يَسْتَوِي الْبَحْرَانِ﴾، دوو دەریایەکان یەکسان نین، وشەی (بَحر) **(إسمٌ لِلْمَاءِ الكَثِيرِ القَارِّ فِي سَعَةٍ، فَالفُرَاتُ والدِّجْلَةُ بَحرَانِ عَذْبَانِ، وَبَحْرُ خليج العَجَمِ مِلحٌ)**، (بحر) ناوە بۆ ئاوێکی زۆر کە لە شوێنێکی فراواندا نیشتەجێیە، بە هەر کام لە فوڕات و دیجلە دەگوترێ (بحر)، [هەروەها لە قوڕئاندا (بحر) بۆ نیل بەکارهاتوە] ئنجا فوڕات و دیجلە دوو دەریای شیرینن، بەڵام ئاوی کەنداوی عەجەم، ئاوێکی سوێرە.

دوای ئـەوەی خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: دوو دەریـاكان یەكسـان نیـن، ئنجـا وردی دەكاتـەوەو دەفەرمـوێ:

٢)- ﴿هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ سَآئِغٌ شَرَابُهُۥ﴾، ئەمەیان شیرین و سازگارەو بە ئاسانیی لە گەرووێ دەچێتە خوار، واتە: چووە خوارە لە گەروو، بە ئاسانیی، دەگوترێ: (سَاغَ الشَّرَابُ فِي الحَلْقِ، أيْ: سَهُلَ انحِدَارُهُ)، واتە: بە ئاسانیی لە گەروو چووە خوار.

(عَـذْبٌ) بـە مانـای شـیرین دێ، شـیرینییەك كـە پەسـند بـێ، (فُـرَات) بـە مانـای سـازگار دێ، (سَـائِغ) بـە مانـای چـووە خـوار لـە گـەروو دێ، ئەمـە جۆرێـك لـە دەریـا.

٣)- ﴿وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ﴾، ئەمەشیان سوێری تاڵە، (أُجَاج: الشَّدِيدُ المُلُوحَة)، زۆر سوێر، دەشگونجێ بڵێی: تاڵ و تفت، ئنجا وشەی: (مِلْح) بە شتێك دەگوترێ كە لە زاتی خۆیدا سوێر بێت، ﴿وَهَٰذَا مِلْحٌ﴾، ئەمە سوێرە وەك خودی خوێ، بەڵام (مَالِح) ئەوەیە كە لە ئەسڵدا سوێر نەبێ و، سوێر كرابێ و خوێی تێكرابێ.

دوای ئـەوەی خـوا ﷻ هـەردوو دەریایەكـە بـاس دەكات: ئەویـان سـازگارو شـیرین و چـووە خـوار لـە گەروویـە بـە ئاسـانیی و، ئەویشـیان تـاڵ وتفـت، ئنجـا دەفەرمـوێ:

٤)- ﴿وَمِن كُلٍّ تَأْكُلُونَ لَحْمًا طَرِيًّا﴾، لە هەركامێكیان گۆشتی تەڕو تازەش دەخۆن، (طَرِيٌّ أي: طَازِج)، واتە: تەڕو تازە.

ئەمـە ئاماژەیـە بـەوە كـە دەبـێ بـەو جـۆرە لـە گۆشـتی دەریـا بەهـرە وەربگیـرێ، بـە تـەڕو تازەیـی بخـورێ، كـۆن نەبـێ و نەمێنێتـەوە، چونكـە ئـەو كاتـە گۆڕانـی بەسـەردا دێ.

٥)- ﴿وَتَسْتَخْرِجُونَ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا﴾، خشڵێكیشی لێ دەردێنن، كە دەیپۆشن، واتە: خۆتانی پێ دەڕازێننەوە، (حِلْيَة) وەك پێشتر گوتمان بە: (حُلِيٌّ) كۆدەكرێتەوە، وەك (ثَدِي) بە (ثُدِيٌّ) كۆدەكرێتەوە، خشڵ: خشڵەكان، مەمك: مەمكەكان.

٦)- ﴿ وَتَرَى ٱلْفُلْكَ فِيهِ مَوَاخِرَ ﴾، کەشتییەکانیش دەبینی لە دەریادا قڵیشێنەرن، (مَاخِرَةٌ أَي: شَاقَّةٌ لِمَاءِ البَحْرِ بِجُؤْجُؤِهَا)، واتە: بە نووکەکەیان قڵیشێنەرن بۆ ئاوی دەریا، نووکی کەشتییەکان تیژ دروست دەکرێ، بۆ ئەوەی ئاوەکە شەق بکات و بیقڵیشێنێ.

٧)- ﴿لِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ ﴾، تاکو [بە هۆی سواریی ئەو کەشتییانەوە] لە بەخششی خوا داوا بکەن، واتە: ئامانج لە دەستەمۆ کرانی دەریاو، کە دەریا وا هەڵخراوە کەشتیی و بەلەمەکان تێیدا بێن و بچن و، ئاوەکەش وابێ کەشتیی بتوانێ بیقڵیشێنێ و شەقی بکات، ئامانج ئەوەیە کە لە بەخششی خوا داوا بکەن و، بتوانن هاموشۆی تێدا بکەن، بۆ پەیدا کردنی بژیوێك کە خوا ﷻ ناوی لێ ناوە: بەخششی خوا.

٨)- ﴿وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾، [ئەوەش ئامانجی هەرە بەرزەو خوا ﷻ ئەو هەموو نیعمەتانەی بۆ ڕەخساندوون] بەڵکو سوپاسگوزاریی بکەن (بۆ خوا ﷻ).

## بەراوردێک لە نێوان ئایەتی ژمارە (١٢)ی سوورەتی (فاطر) و ئایەتی ژمارە (١٤)ی سوورەتی (النحل)دا

با سەرنج بدەینە جیاوازییەکانیان، دواییش حیکمەت و نهێنیی جیاوازییەکان:

لە سوورەتی (النحل)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِي سَخَّرَ ٱلۡبَحۡرَ لِتَأۡكُلُواْ مِنۡهُ لَحۡمٗا طَرِيّٗا وَتَسۡتَخۡرِجُواْ مِنۡهُ حِلۡيَةٗ تَلۡبَسُونَهَاۖ وَتَرَى ٱلۡفُلۡكَ مَوَاخِرَ فِيهِ وَلِتَبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِهِۦ وَلَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ١٤ ﴾، واتە: ئەو (خوا) ئەو کەسەیە کە دەریای بۆ دەستەمۆ کردوون، تاکو گۆشتی تەڕو تازەی لێ بخۆن و، خشڵێکی لێ دەربێنن کە دەیپۆشن، هەروەها کەشتییەکان دەبینی قڵیشێنەرن لە ئاوی دەریادا، بۆ ئەوەی لە بەخششی خوا داوا بکەن و سوپاسگوزاریی بکەن.

با بزانین جیاوازییەکانی نێوان ئەم دوو ئایەتە، چین؟

أ- لە سوورەتی (فاطر)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَمِن كُلّٖ تَأۡكُلُونَ لَحۡمٗا طَرِيّٗا ﴾، بەڵام لە سوورەتی (النحل)دا دەفەرموێ: ﴿ لِتَأۡكُلُواْ مِنۡهُ لَحۡمٗا طَرِيّٗا ﴾.

ب- لە سوورەتی (النحل)دا دەفەرموێ: ﴿ وَتَرَى ٱلۡفُلۡكَ مَوَاخِرَ فِيهِ ﴾، بەڵام لە سوورەتی (فاطر)دا دەفەرموێ: ﴿ وَتَرَى ٱلۡفُلۡكَ فِيهِ مَوَاخِرَ ﴾.

ج- لە سوورەتی (النحل)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلِتَبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِهِۦ ﴾، بەڵام لە سوورەتی (فاطر)دا دەفەرموێ: ﴿ لِتَبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِهِۦ ﴾.

د- هەروەها بڕگەی: ﴿ وَلَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴾یش هەروەک خۆیەتی.

حیکمەت و نهێنیی جیاوازییەکەش ئەوەیە، کە ئەوەی لە سوورەتی (النحل) دا بە ئامانج گیراوە، بیرخستنەوەی چاکەکانی خوایە ﷻ، کە سوورەتی (النحل)

پانتاییەکی زۆری بریتیە لە خستنە ڕووی چاکەکانی خواو، نیعمەتەکانی خوا لە ژیانی مرۆڤدا، بەڵام لە سوورەتی (فاطر)دا ئەوەی بە ئامانج گیراوە، بریتیە لە: بەڵگە هێنانەوە لەسەر بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتیی و خاوەندارێتیی خوا ﷻ، بە هۆی دروستکراوەکانیەوە.

١)- ئنجا کە لە سوورەتی (النحل)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى سَخَّرَ ٱلْبَحْرَ ﴾، خوا ﷻ ئەو کەسەیە کە دەریای بۆ دەستەمۆ کردوون، ئەوە چاکەو نیعمەتی خوایە، چونکە ئەوەی بە ئامانج گیراوە لە سوورەتی (النحل)دا خستنە ڕووی چاکەو نیعمەتەکانی خوایە.

بەڵام کە لە سوورەتی (فاطر)دا دەفەرموێ: ﴿وَمَا يَسْتَوِى ٱلْبَحْرَانِ هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ سَآئِغٌ شَرَابُهُۥ وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ ﴾، ئەمە مەبەست پێی بەڵگە هێنانەوەیە لەسەر پەروەردگارێتیی و بەدیهێنەرایەتیی و سیفەت و کردەوە بەرزو ناوازەکانی خوا.

٢)- لە سوورەتی (النحل)دا، دەفەرموێ: ﴿لِتَأْكُلُواْ مِنْهُ لَحْمًا طَرِيًّا ﴾، واتە: تاکو لە ئاوی دەریا گۆشتێکی تەڕو تازە بخۆن بە گشتیی.

بەڵام لە سوورەتی (فاطر)دا، دەفەرموێ: ﴿وَمِن كُلٍّ تَأْكُلُونَ لَحْمًا طَرِيًّا ﴾، واتە: لە هەر کامێکیان، هەم لە ئاوی سوێرو، هەم لە ئاوی شیرین، چونکە لە سوورەتی (فاطر)دا وەك بەڵگە هێنانەوە باس دەکات، خوا هەم ئاوە سوێرەکەو، هەم ئاوە شیرینەکەی وا دروست کردوون، بتوانن گۆشتی تەڕو تازەیان لێ بخۆن.

٣)- لە سوورەتی (النحل)دا، دەفەرموێ: ﴿وَتَسْتَخْرِجُواْ مِنْهُ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا ﴾، خشڵێك دەردێنن لە ئاوی دەریا، کە دەیپۆشن، بەڵام لە سوورەتی (فاطر)دا، دەفەرموێ: ﴿وَتَسْتَخْرِجُونَ حِلْيَةً ﴾، خشڵێك دەردێنن، وشەی لەوێدا (منه)ی تێدانیە.

٤)- لە سوورەتی (النحل)دا دەفەرموێ: ﴿ وَتَرَى ٱلْفُلْكَ مَوَاخِرَ فِيهِ ﴾، کەشتییەکان دەبینی قڵیشێنەرن تێیدا [قڵیشێنەرن بۆ ئاو لە دەریاکەدا]، بەڵام لە سوورەتی (فاطر)دا،

دەفەرموێ: ﴿ وَتَرَى ٱلْفُلْكَ فِيهِ مَوَاخِرَ ﴾، لە نێو دەریاکەدا کەشتییەکان دەبینی قڵیشێنەرن بۆ ئاوەکە، چونکە سەر ئاو کەوتنی کەشتییەکان لە دەریادا، لە ڕووی بەڵگەهێنانەوەوە، گرنگترە لە قڵیشاندنیان بۆ ئاوەکە، بۆیە لە سووڕەتی (النحل)دا کە مەقامی خستنە ڕووی چاکەو نیعمەتەکانەو، قڵیشاندنی کەشتییانیش بۆ ئاوی دەریا، لەو ڕووەوە لە سەر ئاوکەوتنیان لە پێشترە، بۆیە قڵیشاندنەکە پێش سەرئاو کەوتنەکە خراوە: ﴿ وَتَرَى ٱلْفُلْكَ مَوَاخِرَ فِيهِ ﴾، کەشتییەکان دەبینی قڵیشێنەرن لە دەریادا، بەڵام لە سووڕەتی (فاطر)دا، سەر ئاو بوونی کەشتییەکان پێش خراوە بەسەر قڵیشاندنی ئاوەکەدا: ﴿ وَتَرَى ٱلْفُلْكَ فِيهِ مَوَاخِرَ ﴾، کەشتییەکان دەبینی لە دەریادا قڵیشێنەرن، ئەمەش لەبەر ئەوەی کە سەر ئاو کەوتنی کەشتییەکان لە دەریادا، وەك: بەڵگە هێنانەوە لەسەر کاربەجێیی و کارزانیی خوا، گرنگترە لەوە کە کەشتییەکان وان، ئاوەکە بقڵیشێنن، قڵیشاندنەکە خراوەتە دوایی، چونکە ئەوەی لە سووڕەتی (فاطر)دا بە ئامانج گیراوە بەڵگە هێنانەوەیە.

٥)- ﴿ وَلِتَبْتَغُواْ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾، لە سووڕەتی (النحل)دا هەردووکیان (و) یان هەیە، ﴿ وَلِتَبْتَغُواْ مِن فَضْلِهِۦ ﴾، بۆ ئەوەی لە بەخششی خواش داوا بکەن، ﴿ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾، هەروەها بۆ ئەوەی سوپاسگوزاربن، چونکە مەقام مەقامی خستنە ڕووی نیعمەت و چاکەکانی خوایە لە ژیانی بەشەردا، کە خوازیاری سوپاسگوزارییین بۆ خوا، بەڵام لە سووڕەتی (فاطر)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَلِتَبْتَغُواْ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾، هەموو ئەوانەی کردون، تاکو لە بەخششی خوا داوا بکەن، واتە: کارو کاسبیی بکەن لە دەریادا بە هۆی کەشتییەکانەوەو، سەرەنجامیش سوپاسگوزاریی بۆ خوا بکەن.

وردەکارییەکانی قورئان و نهێنییەکانی قورئان کۆتاییان نیە، هەر کەسێك زۆر لە قورئان ورد بێتەوە، باشتر دەزانێ ئەم قورئانە لە زانیاریی و حیکمەتی بێ سنووری خواوە سەرچاوەی گرتوەو، لە ڕاستییدا مرۆڤ هەرچەندە پێیدا قووڵ بێتەوە، ئاگاتە بنی، هەرچەندە زانیاریی زۆری هەبێ و، زۆر ورد بێتەوە، بەشی خۆی لێ دەستگیر دەکات، بەڵام مەحاڵە هیچ کەسێ بتوانێ بڵێ: هەرچی ماناو

چەمك و مەبەست هەیە لەم ئایەتەدا، هەموویم دەرهێناوەو، هەرچی نهێنییە هەموویم دەستگیر بووە، تەنیا خوا ﷻ بە هەموو نهێنییەكانی كتێبی خۆی ئاگادارە.

٩)- ﴿ يُولِجُ ٱلَّيۡلَ فِي ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيۡلِ ﴾ [بەڵگەیەكی دیكە بۆ بەدیهێنەرایەتیی و پەرستراوێتیی خوا ئەوەیە كە] بە ئەسپایی شەوگار دەخاتە نێو ڕۆژگارو، بەشێنەیی ڕۆژگار دەخاتە نێو شەوگار، (يُولِجُ)، واتە: بە شێنەیی و بە ئەسپایی، بە جۆرێك كە هەستی پێ ناكرێ.

شەوگار خستنە نێو ڕۆژگارو ڕۆژگار خستنە نێو شەوگاریش، دوو واتایان لە خۆی دەگرێ:

أ- دەگونجێ مەبەست ئەوە بێ، كە شەوگار دێنێتە شوێنی ڕۆژێ و، ڕۆژگار دێنێتە شوێنی شەوێ.

ب- دەشگونجێ مەبەست پێی ئەوە بێ، كە لە شەوێ دەخاتە سەر ڕۆژێ، لە شەوێ كورت دەبێ و، لە ڕۆژێ درێژ دەبێ، هەروەها لە ڕۆژێش دەخاتە سەر شەوێ، ڕۆژ كورت دەبێ و، شەو درێژ دەبێ، بۆ وێنە: شەوانی پایز درێژن، بەڵام ڕۆژانی بەهار درێژن، بۆیە كوردەواریی خۆمان دەڵێن: (یا خوا بەخێر بێی ئەی دۆستی ئازیز، بە ڕۆژی بەهار بە شەوی پایز)، یانی: شەوانی پایزان درێژن و، ڕۆژەكانی كورتن، بە پێچەوانەوە ڕۆژانی بەهار درێژن و، شەوەكانی كورتن، دیارە زستان و هاوینیش، ئەوانیش هەندێكی بە دەم پایزەوە دەچێ و، هەندێكی بە دەم بەهارەوە دەچێ و، هەندێكیشی نێوە ڕاستە.

١٠)- ﴿ وَسَخَّرَ ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ ﴾، هەروەها (خوا) خۆرو مانگیشی دەستەمۆو ملكەچ كردوون، ئێمە كاتی خۆی لە تەفسیری سوورەتی (یونس)دا، باسێكی سەربەخۆمان لە بارەی گەردوونەوە كردوە، هەروەها باسێك دەربارەی خۆرو، باسێك دەربارەی زەوی و، باسێك دەربارەی مانگ، بۆیە لێرەدا دووبارەی ناكەینەوەو، خوێنەری بەڕێز حەواڵەی ئەوێ دەكەین، چونكە لەوێ بە تێرو تەسەلیی باسمان كردوە، هەروەها دواتر لە كاتی

تەفسیرکردنی سوورەتی (فصلت)و سوورەتی (الرحمن) و سوورەتی (الشمس)یش دا، کەم و زۆر لەوبارەوە قسەو باسمان کردوە.

١١)- ﴿كُلٌّ يَجْرِي لِأَجَلٍ مُّسَمًّى﴾، هەر کام [لە خۆرو مانگ کە دەستەمۆ کراون] بەرەو کاتێکی دیارییکراو دەڕۆن، لە سوورەتی (لقمان)دا گوتراوە: ﴿إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى﴾، واتە: بەرەو لای کاتێکی دیارییکراو، بەڵام لێرەدا دەفەرموێ: ﴿لِأَجَلٍ مُّسَمًّى﴾، واتە: بۆ کاتێکی دیارییکراو، کە دەگونجێ لێرەدا مەبەست پێی کۆتایی هاتنی هەر کامێکیان بێ، واتە: هەر کامێك لە مانگ و خۆر، کاتێکیان بۆ دیارییکراوە، کۆتاییان پێ دێ، یاخود مەبەست پێی کاتی دیارییکراوی ساڵانەیانە، یاخود کاتی دیارییکراوی مانگانەیانە، یاخود کاتی دیارییکراوی شەوانەو ڕۆژانەیانە، ئەوانە هەموویان دەگرێتەوە.

(الزمخشري) لەو بارەوە کە بۆچی لە سوورەتی (لقمان)دا دەفەرموێ: ﴿إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى﴾، بەڵام لێرەدا دەفەرموێ: ﴿لِأَجَلٍ مُّسَمًّى﴾، لە وەڵامی ئەوانەدا کە گوتوویانە: (إلى)و (ل) هەر بەیەك واتان، بە توندیی ڕەخنەی گرتوەو دەڵێ: نەخێر! بەڵکو (إلى: لِلإنتِهاءِ، وَلام: لِلإختِصَاصِ)، واتە: (إلى) بۆ کۆتایی هاتنە، بەڵام (ل) بۆ تایبەتمەندبوونە، واتە: کە دەفەرموێ: ﴿إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى﴾، واتە: هەر کام لە خۆرو مانگ دەڕۆن، بەرەو لای کاتێکی دیارییکراو، بەڵام لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿كُلٌّ يَجْرِي لِأَجَلٍ مُّسَمًّى﴾، واتە: هەر کامێك لە خۆرو مانگ دەڕۆن، بۆ کاتێکی دیارییکراو، واتە: بۆیە دەڕۆن تاکو ئەو کاتە دیارییکراوە بێتە دی.

١٢)- ﴿ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ﴾، ئا ئەو خوایەتان پەروەردگارتانە، واتە: ئەوەی کە ئەو سیفەتانەی لە بارەوە باسکران و، ئەو هەواڵانەی لەبارەوە دران، ئا ئەوەتان پەروەردگارو خاوەنتانە، نەك ئەو شتانەی دیکە کە دەپەرسترێن.

١٣)- ﴿لَهُ ٱلْمُلْكُ﴾، حوکمڕانیی و باڵادەستیی بەس هی ویە، کە (الجارّ والمجرور) پێش خراوە، واتە: هەرچی حوکمڕانیی و موڵکە هەمووی هی خوایە، یانی: (كُلُّ المُلْكِ لَهُ حَصْرًا)، واتە: هەرچی موڵك و دەسەڵات و حوکمڕانییە هەمووی هی خوایە.

١٤)- ﴿ وَٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ مَا يَمۡلِكُونَ مِن قِطۡمِيرٍ ﴾، ئەوانەش کە لە جیاتی خوا، یان جگە لە خوا لێیان دەپاڕێنەوە، تەنانەت تۆێژاڵی تەنکی سەر نێوکە خورماشیان بە دەست نیە. ﴿ مَا يَمۡلِكُونَ مِن قِطۡمِيرٍ ﴾، لێرەدا: (مِنْ) بۆ هەندێك (تَبْعيض)ە، (قِطْمير: القِشْرَةُ الّتي في شقّ النّوات)، (قطمیر) ئەو توێژاڵە تەنکەیە کە بەسەر نێوکە خورماوەیە، هەندێکیش گوتوویانە: بەو شوێنکە بچووکە دەگوترێ، کە لەسەر پشتی نێوکە خورمایە، قلّیشێکی بچووکە.

١٥)- ﴿ إِن تَدۡعُوهُمۡ لَا يَسۡمَعُواْ دُعَآءَكُمۡ ﴾، ئەگەر لێیان بپاڕێنەوە، ئێستا، یاخود لە ڕۆژی دواییدا، گوێبیستی پاڕانەوەکەتان نابن.

١٦)- ﴿ وَلَوۡ سَمِعُواْ مَا ٱسۡتَجَابُواْ لَكُمۡ ﴾، ئەگەر بشبیستن، وەڵامتان نادەنەوە.

لێرەدا خوا ﷻ بەپێی عەقڵی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان دواوە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ إِن تَدۡعُوهُمۡ ﴾، ڕاناوی کۆی عاقڵان (ضمیر جمع العقلاء)ی بۆ بە کارهێناون، ﴿ لَا يَسۡمَعُواْ دُعَآءَكُمۡ ﴾، دیسان ڕاناوی کۆ، کە بۆ عاقڵان بە کاردێ، ﴿ وَلَوۡ سَمِعُواْ مَا ٱسۡتَجَابُواْ لَكُمۡ ﴾، لێرەدا چوار ڕاناوی بۆ بەکارهێناون، هەموویان بۆ عاقڵان بەکاردێن، چونکە بە پێی عەقڵ و ئاستی بیرکردنەوەیان دواندوونی و، ڕەنگە ئەگەر بە جۆرێکی دیکە باسیکردبانایە، بە سووکایەتییان دانابایە بۆ پەرستراوەکانیان!

١٧)- ﴿ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ يَكۡفُرُونَ بِشِرۡكِكُمۡ ﴾، لە ڕۆژی دواییشدا بێبڕوا دەبن بە هاوبەش دانانی ئێوە، ئەوە پێنج جار ڕاناوی کۆی عاقڵان بەکارهاتوە، بەڵکو لە پێشیانەوەش کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ ﴾، (والّذِينَ) دیسان لەوێش هەر ڕاناوی کۆی عاقڵانی بەکارهێناوە، ڕوونکەرەوانی قوڕئان گوتوویانە: (تَنْزِيلٌ لِلأَصْنَامِ مَنْزِلَةَ العُقَلاءِ، مُجَارَاةٌ لِعُقُولِ المُشْرِكِين)، بت و صەنەمە پەرستراوەکانی لە شوێنی عاقڵان داناون، وەك لەگەڵدا ڕۆیشتنی عەقڵی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان و، بەپێی عەقڵی ئەوان خوا ﷻ فەرمایشتی کردوە، کە ئێوە پەرستراوەکانی خۆتان بە خاوەن ئیرادەو عەقڵ و شعوور

تێدەگەن، بەڵام ئەوەتا لێیان دەپاڕێنەوە، کەچی هیچیان بەدەست نیە، تەنانەت بە قەدەر توێژاڵی تەنکی سەر نێوکە خورما، پاشان ئەگەر لێشیان بپاڕێنەوە چ لە دنیاو، چ لە دواڕۆژدا، گوێبیستی پاڕانەوەکەتان نابن و، ئەگەر بشبیستن وەڵامتان نادەنەوە!!

مەبەست لە: (**إستجابة**)، وەڵامدانەوەی قسەیە، یان: وەڵامی داواکردنی شتێکە یانی: وەڵامی قسەتان نادەنەوەو قسە ناکەن، یان: وەڵامی پێ بەخشینتان نادەنەوەو، ئەوەی داوای دەکەن، پێتان نادەن.

﴿ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكْفُرُونَ بِشِرْكِكُمْ ﴾، لە ڕۆژی هەڵسانەوەشدا ئەو پەرستراوانە بێبەڕوا دەبن بە هاوبەش دانانی ئێوە، یانی: (**بِشِرْكِكُم إِيَّاهُم فِي الإِلهِيَّةِ**)، کە ئێوە ئەوانتان هاوبەش و بەشدار کردوە لە پەرستراوێتیی خوادا، ئەوان پێتان بێبەڕوا دەبن، دەڵێن هەڵەتان کردوەو، حاشاتان لێ دەکەن.

١٨)- ﴿ وَلَا يُنَبِّئُكَ مِثْلُ خَبِيرٍ ﴾، وەك شارەزاش هیچ کەس هەواڵت پێ نادات، (**المِثْل: المُسَاوِي إِمَّا فِي القَدْرِ فَهُوَ ضِعْفٌ، أَوِ المُسَاوِي فِي الصِّفَةِ أَي: شَبِيهٌ**)، وشەی (**مِثْل**) بە مانای یەکسان دێ لە ئەندازەدا، کە لە ئەندازەدا پێی دەگوترێ: (**ضِعْفٌ**) دوو هێندە، یاخود لە سیفەتدا، وەك وی لە سیفەتێکدا، واتە: وەك کە کەسێکی شارەزا هەواڵت پێ دەدا، هیچ کەس وا هەواڵت پێ نادات، (**أَيْ: لا يُنَبِّئُكَ بِهَذا الخَبَرِ، مِثْلِي لأَنِّي خَبَرْتُهُ، أَو لا يُنَبِّئُكَ بِهَذا الخَبَرِ أَحَدٌ يُمَاثِلُ الخَبِيرُ الَّذِي أَنْبَأَكَ بِهِ**)، واتە: هیچکەس ئەو هەواڵەت پێ نادات وەك من، چونکە من شارەزام، {خوا ﷻ وا دەفەرموێ} یاخود هیچ کەس هەواڵی ئەم شتەت پێ نادات، کە من پێم داوی، وەك ئەو شارەزایەی کە هەواڵی پێداوی کە خوایە ﷻ.

وشەی: (**خَبِير: صِفَةٌ مُشَبَّهَةٌ بِالفِعْلِ، مُشْتَقَّةٌ مِنْ: خَبَرَ فُلانٌ الأَمْرَ، إِذَا عَلِمَهُ عِلْماً لا شَكَّ فِيهِ**)، واتە: وشەی (**خَبِير**) سیفەتی چوێنراوە بە کردارەوە، لە (**خَبَرَ**)ەوە هاتوە، بۆ نموونە: ئەگەر بڵێی: فڵانکەس شارەزای شتەکە بوو، واتە: بە شێوەیەك زانی کە هیچ دوو دڵیی تێدا نەبێ.

لـە کۆتایـی ئـەم دەرسـەماندا، ئامـاژە بـە پێناسـەی چـوار وشـە دەکەیـن، کـە هەموویـان پەیوەندییـان هەیـە بـە خورمـاوە، کـە (إعـراب القـرآن)ی (محـي الديـن درويـش)[1] هێناونــی:

١- (فَتيل): کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا﴾، (فَتيل) بریتیە لەو دەزووە باریکەی کە لەنێو درزی نێوکی دەنکە خورمادایە، خورما نێوکەکەی قڵیشێکی تێدایە، ئنجا شتێکی باریکی تێدایە، پێی دەگوترێ: (فَتيل)، وەك دەزوویەکی سپیی وایە.

٢- (قِطْمیر): بریتیە لەو توێژاڵە تەنکەی سەر نێوکە خورما، کە لە نێوکە خورماوە پێچراوە، بۆ ئەوەی گۆشتی خورمایەکە لەگەڵ نێوکەکەی دا زۆر پێکەوە نەنووسێن، زۆرجار کە ئینسان خورما دەخوات، بە ئاسانیی نێوکەکەی دەردێ، لەبەر ئەو توێژاڵە تەنکە کە پێی دەگوترێ: (قِطْمير).

٣- (نَقير): ئەویش هەر لە قورئاندا هاتوە: ﴿وَلَا يُظْلَمُونَ نَقِيرًا﴾، ئەویش بریتیە لەو درزو شوێنکەیەی کە لە سەر پشتی نێوکە خورمایە.

٤- (ثُفروق)یش وشەیەکی دیکەیە، بەڵام لە قورئاندا بەکارنەهێنراوەو ئاوا پێناسە کراوە: (ثُفْرُوق: هُو مَا بَيْنَ القِمعِ وَالنَّوَاة)، (قِمْع) سەرەوانەی دەنکە خورمایە، تەنك و بچووکە، ڕەقەو ناخورێ، (ثُفروق) دەکەوێتە نێوان ئەو و نێوکە خورمایەکە[2].

لـە خـوای پـەروەردگار دەپاڕێینـەوە یارمەتییـمان بـدات کـە بـە چـاوی عەقـڵ و دڵ نیشـانەکانی خـوا ﷻ ببینیـن، هەروەهـا بـە چـاوی عەقـڵ و دڵ نیعمەتەکانی خوا ﷻ ببینیـن و، لـەو کەسـانە بیـن کـە سوپاسـگوزارو شـوکرانە بژێـر دەبـن بـۆ نیعمـەت و چاکەکانـی خـوا ﷻ، بـە شـێوەیەك تەماشـای هـەر شـتێك بکـەن بەزەیـی و دەسـەڵات و سـیفەتەکانی دیکـەی خـوای تێـدا ببینـن، وەك کاتـی خـۆی لـە شـیعرێکدا گوتوومـە:

---

(١) ج٨، ص١٢٤.

(٢) لسـان العـرب،ج٢ ص١٠٧، هەندێکیـش گوتوویانـە: (ثُفـروق) خـودی (قِمْـع)ە، کـە بـە (أقـماع) کـۆ دەکرێتـەوە یـانی: سـەرەوانەی دەنکـە خورمـا.

**سروشت ئاوێنەی تەجەللای خوایە باش سەرنجی بدە بزانە چی تیایە!**
**لە ڕێی کرەوە کردگار دەناسرێ سروشت کرێکەو کردگاری خوایە**

**داواکارین خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی، عەقڵ و دڵمان بە شێوازێکی وا زیندوو ڕابگرێ، کە هەر شتێکمان بینی، سیفەتەکانی خوای پەروەردگاری بە درەوشاوەیی تێدا ببینین.**

**سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ**

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان دوازدە (١٢) ئایـەت دەگرێتـە خـۆی، ئایەتەکانـی: (١٥ - ٢٦)، کـە سـەرەتا لـە سێ ئایەتـی: (١٥ - ١٧)دا، خـوا ﷻ بانگـی مرۆڤایەتیـی دەکات، کـە بزانـن ئـەوان ئاتاجـی خـوان، هـەژارن بـۆ لای خـواو، خـوا بـێ نیـازی ستایشـکراوە، ئەگـەر بیـەوێ ئـەوان لادەبـات و، خەڵکێکـی تـازە دێنـێ.

پاشـان لـە ئایەتـی (١٨)دا، باسـی حـاڵ و باڵـی مرۆڤـەکان دەکات، لـە قیامەتـداو، باسـی هـۆکارە گرنگەکانـی دەربازبـوون و سـەرفرازیی دەکات.

دواییـش لـە پێنـج ئایەتەکانـی: (١٩ - ٢٣) دا، بەراوردێکـی نێوان بـڕوادارو بێبڕوایان دەکات و پێکیـان هەڵدەسـەنگێنێ، کـە بـڕوادارو بێبـڕوا وەك بینـەرو کوێـر، یـان وەك ڕووناکیـی و تاریکاییـەکان، یاخـود وەك سـێبەرو هەتـاو، یـان وەك زینـدوو مـردووان.

لـە کۆتاییـشـدا لـە ئایەتەکانـی: (٢٤ - ٢٦)دا، خـوای کارزان و میهرەبـان، پێغەمبەری خاتـەم موحەممـەد ﷺ دەدوێنـێ و، ئـەو ڕاسـتییە گـەورەو گرنگـە دووپات دەکاتەوە، کـە هیـچ کۆمەڵگایـەك نەبـووە هۆشـیارکەرەوەو ترسـێنەرێکی تێـدا نەنێـردرێ، هەروەهـا دڵـی پێغەمبەریـش ﷺ دەداتـەوە، کـە بـە درۆ دانـان، عادەتـی لـە مێژینەی گەلـە بێبڕوایـەکان بـووە، بـا بـە هـۆی ئـەوەوە کـە خەڵکـە بێبڕوایەکـەی کۆمەڵـگای خۆیشـی، ئـەو بـە درۆ دادەنێـن، دڵـی سـەغڵەت نەبـێ و، خـۆی شـلوێ نـەکات.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ أَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِ ۖ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿١٥﴾ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ ﴿١٦﴾ وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ بِعَزِيزٍ ﴿١٧﴾ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۚ وَإِن تَدْعُ مُثْقَلَةٌ إِلَىٰ حِمْلِهَا لَا يُحْمَلْ مِنْهُ شَىْءٌ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰٓ ۗ إِنَّمَا تُنذِرُ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِٱلْغَيْبِ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ ۚ وَمَن تَزَكَّىٰ فَإِنَّمَا يَتَزَكَّىٰ لِنَفْسِهِۦ ۚ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٨﴾ وَمَا يَسْتَوِى ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ

﴿١٩﴾ وَلَا ٱلظُّلُمَٰتُ وَلَا ٱلنُّورُ ﴿٢٠﴾ وَلَا ٱلظِّلُّ وَلَا ٱلْحَرُورُ ﴿٢١﴾ وَمَا يَسْتَوِى ٱلْأَحْيَآءُ وَلَا ٱلْأَمْوَٰتُ إِنَّ ٱللَّهَ يُسْمِعُ مَن يَشَآءُ وَمَآ أَنتَ بِمُسْمِعٍ مَّن فِى ٱلْقُبُورِ ﴿٢٢﴾ إِنْ أَنتَ إِلَّا نَذِيرٌ ﴿٢٣﴾ إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ ﴿٢٤﴾ وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدْ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَبِٱلزُّبُرِ وَبِٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُنِيرِ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ أَخَذْتُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ ﴿٢٦﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{ئـەی خەڵکینـە! ئێـوە ناتاجـی چاکـەو بەخششـی خـوان و، خـواش هـەر بـۆ خـۆی بـێ نیـازی سـتاییش کـراوە ﴿١٥﴾ ئەگـەر (خـوا) بیـەوێ (لاتانبـەرێ)، ناتانهێڵـێ و، خەڵکێکـی تـازە دێنـێ ﴿١٦﴾ ئـەوەش لەسـەر خـوا زەحمـەت و قـورس نیـە ﴿١٧﴾ هەروەهـا (لـە ڕۆژی دواییـدا) هیـچ گوناهکارێـك گوناهـی یەكـی دیكـە هەڵناگـرێ و، ئەگـەر بابایەکـی بارگـران (بـە هـۆی گوناهانـەوە) داوا بـکات کۆڵەکـەی لـێ هەڵبگیـرێ، هیـچ شـتێك لـە کۆڵەکـەی هەڵناگیـرێ، هەرچەنـدە (بابـای داوا لێکـراو) خـزم و نیزیکیـش بـێ، (ئـەی موحەممـەد!) بێگومـان تـۆ تەنیـا کەسـانێك هۆشـیار دەکەیـەوەو دەترسـێنی (لـە حاڵێکـدا لـە کارەکـەی تـۆ بەهرەمەندبـن)، کـە بـە مەزنگرتنـەوە (بـە پەنامەکیـی) لـە پەروەردگاریـان دەترسـن و، نوێـژ بەرپـا دەکـەن، هـەر کەسـێکیش خـۆی پـاك و چـاك بـکات، بـەس بـە سـوودی خـۆی پـاك و چـاك دەکات و، سـەرەنجامیش تەنیـا بـۆ لای خوایـە ﴿١٨﴾ کوێـرو بینەریـش یەکسـان نیـن ﴿١٩﴾ هەروەهـا تاریکاییـەکان و ڕووناکییەکانیـش (یەکسـان نیـن) ﴿٢٠﴾ دیسـان سـێبەرو گـرە بـا (وەك یـەك نیـن) ﴿٢١﴾ هەروەهـا زینـدووان و مـردووان، یەکسـان نیـن، تـۆش (ئـەی موحەممـەد!) پـێ بیسـتەری کەسـانێك نـی، کـە لـە نێـو گۆڕانـدان ﴿٢٢﴾ تـۆ تەنیـا وریاکـەرەوەی (زیندووانـی) ﴿٢٣﴾ ئێمـە تۆمـان بەهەقـەوە نـاردوە،

مـوژدە دەرو ترسـێنەری و، هیـچ كۆمەڵێكیـش نەبـووە، مەگـەر پێغەمبەرێكـی وریاكـەرەوەو، ترسـێنەری تێـدا (نێـردراوەو)، گوزەری كـردوە ﴿٢٤﴾ ئەگـەر بـە درۆشـت دابنێـن، بێگومـان ئەوانـەی پێـش وانیـش (پەیامێـك كـە خـوا ناردبـووی) بـە درۆیـان دانـا، پێغەمبەرانیـان بـە بەڵگـە ڕۆشـنەكان و بـە نامۆژگارییـەكان و بـە كتێبـی ڕوونكـەرەوەوە هاتنـە لایـان ﴿٢٥﴾ دوایـی ئەوانـەم گـرت (سـزادا)، كـە بێبـڕوا بـوون، ئنجـا ئایـا نكووڵیلێكـردن (و سـزادانم بۆیـان) چـۆن بـوو؟! (زۆر بێـڕەزا بـوو) ﴿٢٦﴾).

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(مُثْقَلَةٌ): (ذَاتُ ثِقْـلٍ مِـنَ الذُنـوبِ، الَّتـي أُثْقِلَـت)، (مُثْقَلَـة) واتـە: بارگـران بـە هـۆی گوناهانـەوە، بووبێتـە خـاوەن كۆڵێكـی گـران، (مُثْقَلَـة: أي: الَّتـي أُثْقِلَـت)، قورسـكراو، یـانی: كۆڵـی گوناهانـی زۆر چۆتـە سـەر شـان.

(حِمْلِهَا): (الحِمْـلُ بِالظَهْـرِ، وَالحَمْـلُ بِالْبَطْـنِ، وَالحَمَـلُ للنَخْلَـةِ)، سـێ وشـە هـەن: (حِمْـلُ) و (حَمْـل) و (حَمَـلُ)، (حِمْـل): كۆڵێكـە بـە پشـت هەڵدەگیـرێ، (حَمْـل): تۆڵـی ئافرەتـە، ئافـرەت كۆرپـەی دەكەوێتـە سـك و بـە سـك هەڵیدەگـرێ، (حَمَل)یـش، بـە بـەری دارخورمـا دەگوتـرێ.

(وَازِرَةٌ): (أي: آثِمَـة)، (وِزرٌ)، واتـە: (ثِقْـل)، (وَازِرَة) واتـە: (آثِـمَة)، (مُذْنِبَـة)، گوناهكار، چونكـە كەسـێك گوناهـو تـاوان دەكات، كۆڵـی خـۆی قـورس دەكات.

(الْحَرُورُ): (بِـمَنْزِلَةِ السَّـمُومِ)، وەك گڕەبایـە، بـەڵام گڕەبـا (سَـمُومِ)، ئەوەیـە كـە بـە شـەوێ هەڵـدەكات و (حَـرُور)، بـە ڕۆژێ، بـە كوردیـی گـڕە بـای پێدەڵێـن، بـە هـەردووك جـۆری شـەوو ڕۆژێ.

(وَبِالزُّبُرِ): (زَبَـرْتُ الكِتَابَـة: كَتَبْـتُ كِتَابَـةً غَلِيْظَـةً، وَالزُّبُـرُ جَمْـعُ زَبُـور، الزَّبُـورُ اسْـمُ لِلكِتَـابِ المَقْصُـورِ عَـلَى الحِكَـمِ العَقْلِيَـةِ دُونَ الأحْـكَامِ الشَرعِيَـةِ)، وشـەی (زَبَـرْتُ الكِتَابَـة)

واتـە: نووسـینەکەم نووسـی بـە خەتـی درشـت و پیتـی درشـت، (زُبُـرٌ)، کـۆی (زَبُـور)ە، (زَبُـور)، هـەم نـاوە بـۆ ئـەو کتێبـەی کـە بـە داود دراوە: ﴿وَءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ زَبُورًا ۝٥٥﴾ الإسراء، هـەم بـەو جـۆرە کتێبـەش دەگوتـرێ، کـە حیکمەتـە عەقڵییەکانـی تێـدان، پەنـدو ئامۆژگاریـی، بـەڵام یاسـا شـەرعییەکانی نەگرتوونـە خـۆی.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا ﷻ دوای ئـەو ئایەتانـەی سـەرەتای سـووڕەتەکە، کـە ژمارەیـەك لـە نیشـانەکانی پەروەردگارێتیـی و، خاوەنداریێتیـی خـۆی، خسـتنە ڕوو، کـە هـاوکات نیعمەتـی گـەورەو گرنگیشـن، لـە ژیانـی مرۆڤـدا، دوای ئـەوەی ئەوانـەی خسـتنە ڕوو، وەك: ناردنـی بایـەکان، کـە دوایـی هـەورەکان لەسـەر ڕووی دەریـا دەورووژێنـن (پەیدایـان دەکـەن)، - چونکـە هەڵمـی ئـاوە دوایـی دەبێتـە هـەور - هەروەهـا دواتـر دروسـتکرانی مرۆڤـەکان لـە گڵ، ئنجـا لـە نوطفـەو، دوایـی کردنیـان بـە جووت، پاشـان باسـی دوو دەریایـەکان، دەریـای سـوێرو شـیرین، کـە چەنـدان جۆرە سـوود و کەڵکیان لـێ وەردەگیرێـن، پاشـان خسـتنە نێـو یەکـدی شـەوو ڕۆژان و، جێگۆڕکـێ پێکردنیـان، هەروەهـا ڕامکرانـی خـۆرو مانـگ، کـە هـەر کامیـان بـۆ کاتێکـی دیاریکـراو دەڕوات.

دوای ئـەوەی خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾، ئـەی خەڵکینـە! لێـرەدا مەبەسـت پێـی هەمـوو مرۆڤەکانـن، بـە مسـوڵمان و نامسـوڵمانەوە، بـە ڕەش و سـپییەوە، بـە عـەرەب و غەیـرە عەڕەبـەوە، بـە نێـرو مـێ وە، هەموویـان دەگرێتـەوە، ﴿أَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِ﴾، ئێـوە ناتاجـن بـۆ لای خـوا، ئێـوە هـەژارن، واتـە: ئێـوە پێویسـتییتان بـەو چاکـەو بەخششـە هەیـە، کـە لـەلای خواوەیـە، ﴿وَٱللَّهُ هُوَ ٱلْغَنِيُّ ٱلْحَمِيدُ﴾، بـەس خـواش ﷻ خـۆی بـێ نیـازی ستایشـکراوە، پێویسـتیی بـە کـەس نیـە، هەروەهـا ستایشکراویشـە، ئەگـەر خەڵـك بیپەرسـتێ یـان نەیپەرسـتێ، ستایشـی

بکات یان نەکات، لە خودی خۆیدا خوا ﷻ ستایشکراوەو، خاوەنی هەموو سیفەتێکی بەرزو پەسندە.

﴿ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ ﴾، ئەم ئایەتە دوو واتایان لە خۆی دەگرێ:

یەکەمیان: ئەگەر خوا ﷻ بیەوێ لاتانبەرێ (نەتانهێڵێ)، لاتاندەبات و، خەڵکیکی تازە دێنێ.

دووەمیان: ئەگەر خوا ﷻ بیەوێ جینسی مرۆڤان لادەبات و، جۆرە دروستکراوێکی دیکە دێنێ.

﴿ وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ بِعَزِيزٍ ﴾، ئەوەش لەسەر خوا ﷻ قورس نیەو، بۆ خوا گران و بە زەحمەت نیە، چونکە دەسەڵاتی خواو، ویستی خواو، زانیاری خواو، سیفەتەکانی خوا بە گشتیی، سنووریان نیەو ڕەهان.

لێرەدا خوا ﷻ دەیەوێ لە هەموو مرۆڤەکان حاڵیی بکات کە پێغەمبەرانی ناردوە، بانگیان دەکەن بۆ یەکتاپەرستیی و، بەندایەتیی بۆ خوا، لەبەر ئەوە نیە کە خوا پێویستیی پێیانە، لەبەر ئەوە نیە کە خوا ﷻ پەکی لەسەر خواپەرستیی ئەوان کەوتوە! چونکە ئەگەر خوا ﷻ بیەوێ، ئەوان لادەبات و، خەڵکێکی دیکە دێنێ.

هەروەها خوا ﷻ لە زاتی خۆیدا بێ نیازەو، ستایشکراوە، کەواتە: کە بانگیان دەکات لە ڕێی پێغەمبەرانەوە (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) بەندایەتیی بۆ بکەن و، بۆی ملکەچ بن، لەبەر ئەوەیە کە ئەوان پێویستییان بەو بەندایەتیی کردنە هەیە بۆ خوا ﷻ، چونکە مرۆڤ ئەگەر بەندەی خوا نەبێ، کۆیلەی جگە لە خوا دەبێ، کاتێک کۆیلەی جگە لە خواش دەبێ، ئەوە پێچەوانەی ڕەوتی گەردوونەو، پێچەوانەی خوارسك و زگماکی خۆیەتی، هەروەها پێچەوانەی عەقڵ و مەنتیقیشە، چونکە خوا پەیداکەرو ژیێنەرو مرێنەرو سەرپەرشتیارو،

هەمەکارەی تۆیەو، بەس ئەو شایستەی ئەوەیە بەندایەتیی بۆ بکەی، تەنیا ئەو خاوەنی ئەو کەون و کائیناتەیەو، جگە لەو بپەرستریْ، شتێکی نالۆژیکییەو، پێچەوانەی ڕەوتی گشتیی گەردوون و، پێچەوانەی خوارسك و زگماکیکیشە کە خوا ﷻ مرۆڤەکانی لەسەر خولْقاندوون، وێڕای پێچەوانەی عەقڵ و مەنتیقبوونی.

دوایی خوا ﷻ دەفەرمویْ: ﴿ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ﴾، هیچ گوناهکارێك گوناهی یەکێکی دیکە هەڵناگریْ، ئەوەش بۆ ئەوەیە کە گومان نەبەن: ئەگەر بێت و بەدەم بانگی خواو پێغەمبەری خواوە نەیەن، بە کەمتەرخەمیی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ لە قەڵەم دەدریْ! نەخێر، ﴿ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ﴾، هیچ گوناهکارێك گوناهی یەکێکی دیکە هەڵناگریْ، ﴿ وَازِرَةٌ ﴾، واتە: (وَلا تَـزِرُ نَفْسٌ وَازِرَةٌ)، هیچ نەفسێکی گوناهکار کە کۆڵی گوناهە قورسەکانی بە کۆڵیِ داداوە، گوناهی نەفسێکی دیکە هەڵناگریْ، ﴿ وَإِن تَدْعُ مُثْقَلَةٌ إِلَىٰ حِمْلِهَا ﴾، ئەگەر نەفسێکی بارگران کە کۆڵێکی قورسی لە کۆڵێیە، کۆڵی گوناهانی قورسکراوە[1]، ئەگەر بارگرانیك داوا بکات بۆ ئەوەی کۆڵەکەی لیْ هەڵبگیریْ، (حِمْل) واتە: کۆڵ، کۆڵێك کە بە پشت هەڵدەگیریْ، ﴿ لَا يُحْمَلْ مِنْهُ شَيْءٌ ﴾، هیچی لیْ هەڵناگیریْ، هیچ هاوکاریی ناکریْ، ﴿ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰٓ ﴾، با بانگکراوەکەش خزم و نیزیکیش بیْ، واتە: کەس دەفریای کەس نایەت لە ڕۆژی دواییدا، وەك لە شیکردنەوەی وشەکانیشدا گوتمان: (حِمْل) واتە: کۆڵێك کە بە پشت هەڵدەگیریْ، بەڵام (حَمْل) شتێکە بە سك هەڵدەگیریْ، تەنیا بۆ ئافرەت بەکاردیْ، هەروەها (حَمْل)یش بەری دارخورمایە، ئەو هێشووە قورسەی کە خورمای پێوەن، پێی دەگوتریْ: (حَمْل).

دوایی خوا ﷻ دەفەرمویْ: ﴿ إِنَّمَا تُنذِرُ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِٱلْغَيْبِ ﴾، {ئەی موحەممەد ﷺ!} بێگومان تۆ تەنیا ئەوانە دەترسێنی و وریا دەکەیەوە، کە لە

---

(١) (مُثْقَلَة: يَعْنِي الَّتِي أُثْقِلَتْ)، کە بێگومان هەر بۆ خۆی قورسی کردوە، بەڵام خوای موتەعال بەو تەعبیرە هێناویەتی، وەك لەکاتی گوناهکردنی دا، ویستی ئازادی خۆی لە دەست دابیْ و، بە ناچاریی گوناهی پیْ کرابیْ!

پەروەردگاریـان دەترسـێن بـە پەنامەکیـی، واتـە: لـە کاتێکـدا کـە خـوا نابینـن و، تـرس و سـام و ڕێـزو هەیبەتیـان بەرانبـەری هەیـە.

یاخـود: لـە کاتێکـدا کـە خۆیـان لـە نێـو خەڵـك دا نیـن و نادیـارن (لـە شـوێنێکی پەنامەکیـن)، لـە پەروەردگاریـان دەترسـێن.

یاخـود: لـە سـزای پەروەردگاریـان دەترسـێن لـە کاتێکـدا ئـەو سـزایەی خـوا ﷻ نابینـن، کـە دۆزەخـە، ﴿وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ﴾، نوێژیشیان بەرپا کـردوە، تـۆ تەنیا ئەوانـە وریـا دەکەیـەوە، واتـە: وریاکردنـەوەو ترسـاندنێك، کـە لێـی بەهرەمەندبـن، تەنیـا ئەوانـەن، کـە تـرس و سـام و هەیبەتـی خوایـان لـە دڵـدا هەیـە، ڕێـزو مەزنیـی و گەورەیـی خـوا لـە دڵ و دەروونیانـدا هەیـەو، نوێـژ بەرپـا دەکـەن، تـۆ هـەر ئەوانـە دەترسـێنی و وریایـان دەکەیـەوە، وریاکردنـەوەو ترسـاندنێك کـە ببێتـە مایـەی بەهـرە لـێ وەرگرتنیـان، ئەگەرنـا پێغەمبـەر ﷺ بـە گشـتیی خەڵکی وریـاو هۆشـیار کردۆتەوە، بـەڵام کـێ بەهرەمەنـد دەبـێ؟ تەنیـا ئەوانـەی ئـەو دوو سـیفەتە سـەرەکییەیان تێدان:

**یەکەم:** ترس و سام و هەیبەتیان بەرانبەر بە خوا هەیە، لە حاڵێکدا کە خوا پەنهانە، یان: لە حاڵێکدا کە خۆیان لە نێو خەڵکدا نین، بە پەنامەکیی، یان: لە حاڵێکدا کە سزاو دۆزەخی خوا پەروەردگار بۆ ئەوان پەنامەکییەو نایبینن، ترسیان بەرانبەری هەیە.

**دووەم:** نوێژیش بەرپا دەکەن، واتە: پەیوەندییان لەگەڵ خوادا، بەس ئەوە نیە هەست و نەستێکی دەروونیی ڕووت بێ، بەڵکو کردەوەشی لەگەڵدایە، کردەوەش پەلکێش دەکات.

لـە ڕاستییشـدا هـەر کاتێـك دڵ و دەروونـی مـرۆڤ ڕێـزو سـام و هەیبەتـی خـوا پـەروەردگارو، بـە مەزنگرتـن و بـە گەورەگرتنـی خـوای پـەروەردگاری تێـدا سـەقامگیر بـوو، ئـەو دڵ و دەروونـە جەسـتەش هەڵدەسـووڕێنێ بـەو ئاڕاسـتەیەدا کـە خـوا فەرمانـی پێکـردوە، بۆیـە ئـەو کەسـەی دەڵـێ: دڵـم پـڕە لـە ئیمان، بـەڵام نوێـژ نـاکات و، ڕۆژوو ناگـرێ و، خـۆی لـە گوناهـان ناپارێـزێ، بەدڵنیایی درۆیەکی شـاخدار دەکات،

چونکە ئەگەر دڵەکەی پڕ بێ لە ئیمان و، لە خۆشەویستیی خواو، لە ترس و سام و هەیبەت بەرانبەر بە خواو، بە مەزنگرتنی خوا ﷻ، ئەو دڵە پڕ لە ئیمانە، ئەو دڵە پڕ لە ترس و خۆشەویستیی خوایە، جەستەکەی هەڵدەسووڕێنێ بەو ئاراستەیەدا کە خوا ﷻ پێیخۆشە، هەروەها ئەو جەستەیە دەگێڕێتەوە لەو شتانەی خوا ﷻ پێی ناخۆشن.

﴿ وَمَن تَزَكَّىٰ فَإِنَّمَا يَتَزَكَّىٰ لِنَفْسِهِۦ ﴾، هەر کەسێکیش خۆی پاك و چاك کرد، بە دڵنیایی خۆ پاك و چاك کردنەکەی تەنیا بۆ خۆیەتی، واتە: خۆی لەوە بەهرەمەندە، با وا نەزانێ سوودێك بە پێغەمبەری خوا ﷺ دەگات، یاخود پێی وابێ خوا ﷻ بەهرەمەند دەبێ، لەو خۆ پاك و چاك کردنەی، بەڵکو سوودەکەی تەنیا بۆ خۆیەتی، ﴿ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلْمَصِيرُ ﴾، سەرەنجامەکانیش هەموویان بۆ لای خوان.

کەواتە: ئەی مرۆڤەکان! با هەر کام لە ئێوە باش سەرنج بدات، بە چ نەفسێکەوە دەچێتەوە خزمەت خوا؟ بە نەفسێکی پاك و چاکەوەو، بە دڵ و دەروونێکی پڕ لە ئیمان و خوا بەیەکگرتنەوەو، بە ڕەوشتێکی بەرزو پەسندەوەو، بە کۆڵێك کردەوەی باشەوە، یاخود بە کۆڵی گرانی گوناهو تاوانەکانەوەو، بە دڵ و دەروونێکی پیس و، موخەنەتەوەو، بە ڕەوشت و ئاکارێکی دزێو و قێزەونەوە، دەچێتەوە خزمەت خوا!

دوایی خوا ﷻ بە چەند سیفەتێك بەراورد دەکات لە نێوانی هەق و ناهەق و، خوا بە یەکگرتن و شیرك بە تایبەت و، ئیمان و کوفردا بە گشتیی، هەروەها ئیمانداران و بێبڕوایان دا، دەفەرموێ: ﴿ وَمَا يَسْتَوِى ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ ﴾، کوێرو بینەر یەکسان نین، کە بە تەئکید لێرەدا مەبەست لە کوێر، ئەو کەسەیە کە عەقڵ و دڵی نابینێ، کوێری دەروون، مەبەست لە بینەریش ئەو کەسەیە کە بە چاوی عەقڵ و دڵ ڕاستییەکان دەبینێ، واتە: کەسێك کە لە بەرانبەر هەقدا کوێرەو،

کەسێك کە هەق دەبینێ، وەك یەك نین. ﴿ وَلَا ٱلظُّلُمَٰتُ وَلَا ٱلنُّورُ ﴾، تاریکاییەکان و ڕووناکییش یەکسان نین، وەك یەك نین، هەمیشە خوا ﷻ کە باسی ناهەق و باتیڵ دەکات، بە تاریکاییەکان (الظُّلمات) دەیهێنێ، بەڵام کە باسی هەق دەکات، بە (النُّور) ڕووناکیی دەیهێنێ، لەبەر ئەوەی هەق یەکە، بەڵام ناهەق زۆرو جۆراو جۆرە، بۆ وێنە: (٢+٢)، ئەنجامە ڕاستەکەی تەنیا چوار (٤)ە، بەڵام ئەگەر بڵێی: سێ، یان پێنج، یان حەوت، هەر ژمارەیەك بڵێی، هەمووی هەر هەڵەیە، بۆیە هەمیشە ناهەق زۆرەو جۆراو جۆرە، بەڵام هەق بە تایبەت لە بواری بووناسیی و ئیمان و عەقیدەدا، یەکە، تەوحید هەقەو، شیرك ناهەقە، ئیمان هەقەو، کوفر ناهەقە، بەندایەتیی بۆ خوا هەقەو، کۆیلایەتیی بۆ غەیری خوا ناهەقە، هەروەها لە بواری بووناسییدا ئەم گەردوونە خاوەنەکەی خوایە، هەقەو، پێچەوانەکەی کە بێ سەرپەرشتیارەو بێ خاوەنە، ناهەقە.

﴿ وَلَا ٱلظِّلُّ وَلَا ٱلْحَرُورُ ﴾، هەروەها سێبەرو گڕەباش یەکسان نین، سێبەر کە خەڵك تێیدا پشوو دەدات، مرۆڤ لە سێبەران پشوو دەدەن و، ئیسڕاحەت دەکەن، بەڵام گڕەبا کاتێك ڕووبەڕووی مرۆڤ دێ، حەجمینی نامێنێ، هەندێك لە زانایان هەر وشەی (سَموم) بۆ گڕەبای شەوو ڕۆژان بەکاردێنن، هەندێکیش دەڵێن: (سَموم) ئەو بایەیە کە بە شەوێ هەڵ دەکات، بەڵام (حَرور) ئەو گڕەبایەیە کە بەڕۆژێ دێ، گرنگ ئەوەیە سێبەرو بای گەرم، وەك یەك نین.

﴿ وَمَا يَسْتَوِي ٱلْأَحْيَآءُ وَلَا ٱلْأَمْوَٰتُ ﴾، هەروەها زیندووان و مردووان، وەك یەك نین و یەکسان نین، زیندووان ئەوانەن کە بە ئیمانەوە دڵ و دەروونیان زیندوویەو ئاوەدانە، هەروەك ڕواڵەتیان بە پابەندیی بە شەرعەوە جوانە، دەروونیشیان بە ڕووناکیی ئیمان ئاوەدانە، مردووانیش ئەوانەن کە دڵ و دەروونێکی تاریکیان هەیە، لەبەر ئەوەی کوفر، یان شیرك، یان نیفاقی تێدایە، هەروەها لەبەر ئەوەی خۆشویستنی گوناهان لە دڵ و دەروونیاندا هەیە، ئەوانەش دڵ و دەروونیان تاریك و وێرانەو، ڕواڵەتیشیان ناشیرینەو، پڕ لە گوناهو تاوانە، زیندووان و مردووانیش وەك یەك نین.

هەڵبەتە لێرەدا مەبەست لەو هەشت (٨) سیفەتە، بەراورد پێکردنی ئەهلی ئیمان و ئەهلی کوفرە:

١- لەڕووی هەق بینین و نەبینینەوە، وەك کوێرو بینەر، وان.

٢- لە ڕووی ئەوەوە کە کامیان لەسەر هەقەو، کامیان لەسەر ناهەقە؟ هەقەکە وەك ڕووناکیی وایەو، ناهەقیش وەك تاریکییەکان وایە.

٣- لە ڕووی ژیانی دڵ و دەروون و، پڕ لە هێمنیی یان دڵەڕاوکەوە، بابای ئیماندار وەك ئەوە وایە، لە سێبەرو نیسێیەك بێ، بەڵام بابای بێبڕوا وەك ئەوە وایە، گڕەبا لێی بدات.

٤- هەروەها لە ڕووی ئەوەوە کە چۆن دێنە بەرچاو، بابای بڕوادار وەك زیندوو وایە، هێزی عەقڵ و دڵ و هەستەوەرەکانی زۆر باش کاردەکەن و، ئەرکی خۆیان ئەنجام دەدەن، بەڵام بابای بێبڕوا وەك مردوو وایە، لەبەر ئەوەی هەستەوەرەکانی خۆی لە کارخستوون و، ئەو ئەرکەی پێویستە پێیان ئەنجام بدات، پێیان ئەنجام نادات، نە بە عەقڵی حەقیقەت دەرك دەکات، نە بەچاوی هەق دەبینێ، نە بە گوێی هەق دەبیستێ، نە بە زمان هەق دەڵێ.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُسۡمِعُ مَن يَشَآءُ﴾، بە دڵنیایی خوا بە هەر کەسێك بیەوێ دەبیستێنێ، (سَمِعَ) واتە: بیستی، بەڵام (أَسۡمَعَ) واتە: پێی بیستاند، بە دڵنیایی خوا هەر کەسێکی بیەوێ پێی دەبیستێنێ و، وای لێ دەکات ببیستێ.

﴿وَمَآ أَنتَ بِمُسۡمِعٖ مَّن فِي ٱلۡقُبُورِ﴾، بەڵام تۆ ناتوانی بەوانەی کە لە گۆڕاندان (خراونە نێو گۆڕانەوە) پێیان ببیستێنی، لێرەدا خوا ﷻ بێبڕوایان دەچوێنێ بە کەسانێکی مردووەوە، کە خراونە نێو گۆڕانەوە، کەسێك کە بخرێتە نێو گۆڕ، بە دڵنیایی ناتوانێ ئەوە ببیستێ کە لەگەڵیدا باس دەکرێ.

لێرەدا هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان زۆر قسەیان لەو بارەوە کردوە: ئایا چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ باسی ئەوەی کردوە کە وەختێك سڵاو دەکەین لە گۆڕستان، دەبیستن، یان باسی کوژراوەکانی کافران کە خرانە نێو قەلیبی

بـەدرەوە[1]، ئێمـە کاتـی خـۆی لـە تەفسـیری سـوورەتی (النمـل)دا لـەو بـارەوە هەنـدێ شـتمان باسـکرد، گرنـگ ئەوەیـە لێرەدا خـوا ﷻ بە پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ دەفەرمـوێ: کەسـێك خرابێتـە نێـو گـۆڕەوە، تـۆ ناتوانـی پێـی ببیسـتێنی، بـەڵام خـوا ﷻ ئەگـەر بیـەوێ، بـە هـەر کەسـێك ئـەو پەیامـەی کـە ناردوویەتـی، دەتوانـێ پێـی ببیسـتێنێ.

لێـرەدا خـوا ﷻ دەیـەوێ دڵـی پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ بداتـەوە، کـە ئەوانـە هەندێکیـان وەك مـردووی نێـو گـۆڕ وان، کـە لـە تـۆ نابیسـتن و، لێـت وەرناگـرن و، ئـەوەش لـە توانـای تـۆدا نیـە پێیـان ببیسـتێنی، کەواتـە: مـادام تـۆ ئەرکـدار نەکـراوی بـەوەو، لـە توانـای تـۆدا نیـە، تـۆ هیـچ سـەغڵەتییت ناکەوێتـە سـەر، ﴿ إِنۡ أَنتَ إِلَّا نَذِيرٌ ﴾، تـۆ تەنیـا هۆشـیارکەرەوەی، (إِنْـذَار: إِعْـلَامٌ مَـعَ تَخْوِيـفٍ)، (إِنـذار) ئاگادارکردنەوەیـە لەگـەڵ ترسـاندن دا، هەندێـك جـاران (نَذِيـر)م بـە ترسـێنەر مانـا کـردوەو، هەندێـك جـار بـە وریاکـەرەوەو، هەندێـك جـار بـە وشـیار کـەرەوەو، هەندێـك جـار بـە ترسـێنەرو وریاکـەرەوەم مانـا کـردوە، هەڵبەتـە زمانـی کوردیـی و زمانەکانـی دیکـەش، بەڵکـو هـەر خـودی زمانـی عەرەبییـش، لـە بەرانبـەر وشـەو تەعبیرەکانـی قورئانـدا، هـەژارو ناتاجـن، جـاری وا هەیـە تـۆ دەبـێ چەنـد وشـەیەك بێنـی، ئنجـا مانـای وشـەیەکی قورئانـت بـۆ دەردێ، مەرجیـش نیـە بـە تەواویـی بـێ!

﴿ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ بِٱلۡحَقِّ ﴾، بـە دڵنیایـی ئێمـە تۆمـان نـاردوە بـە هەقـەوە، واتـە: تـۆ هەقـت پێیـە، یـان ناردنـی تـۆ بـە شـێوەیەکی هـەق بـووە، یاخـود تـۆ هەقـی کـە ناردوومانـی، ﴿ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗا ﴾، دڵخۆشـکەری و ترسـێنەری، یاخـود مـوژدەدەری و هۆشـیارکەرەوەی، ﴿ وَإِن مِّنۡ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٞ ﴾، هیـچ کۆمەڵگایـەك نەبـووە، مەگـەر وریاکـەرەوەو ترسـێنەرێکی تێـدا گـوزەراوە (ژیـاوە).

---

(١) قەلیـب چاڵێکـە کـە هـەر چـاڵ بـێ و بـۆ بیـر لێدرابـێ، بـەڵام بیـراز نەکرابـێ، دیـواری بـۆ نەکرابـێ و، ڕێـك نەخرابـێ.

﴿ وَإِن يُكَذِّبُوكَ ﴾، ئەگـەر كۆمەڵگایەكـەت تـۆش بـە درۆ دابنێـن، ﴿ فَقَدْ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ﴾، ئەوانـەی پێـش وانیـش پەیامـی خوایـان بـە درۆ دانـاو، پێغەمبەرانیـان بـە درۆ دانـا، ﴿ جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَبِٱلزُّبُرِ وَبِٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُنِيرِ ﴾، كـە پێغەمبەرانیـان هاتبوونـە لایـان، بـە بەڵگـە ڕۆشـنەكانەوەو، بـە لاپەڕەكانـەوە كـە ئامۆژگاریـی و، پەندیـان تێدابـوون، هەروەهـا بـە كتێبـی ڕۆشنكەرەوەشـەوە.

﴿ ثُمَّ أَخَذْتُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ﴾، دوایـی ئەوانـەی كـە بێبـڕوا بـوون، گرتمـن، سـزامدان، ﴿ فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ ﴾، ئنجـا نكووڵیلێكردنـی مـن كـە بـووە هـۆی ئـەوەی، سـزایان بـدەم چـۆن بـوو؟! واتـە: زۆر سـامناك بـوو، كەواتـە: بـا بێبڕوایانـی كۆمەڵگاكـەی تۆش، پەنـدو عیبـڕەت لـەو پێشـینانە وەربگـرن، كـە بـە هـۆی بـە درۆ دانانـی پێغەمبـەران و پەیامەكانـی خـواوە، تووشـی سـزاو جەزرەبـەی خـوا ﷻ بـوون.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**بانگکردنی خوا بۆ خەڵک کە ئەوان ئاتاجی چاکەو بەخششی لای خوان و، خوا ﷻ بێ نیازو ستایشکراوەو، ئەگەر بیەوێ، نایانهێڵێ و، خەڵکێکی دیکە دێنێ، یان دروستکراوانێکی دیکە دێنێتە شوێنیان، لە قیامەتیش کەس گوناهی کەس هەڵناگرێ و، هۆشیارکردنەوەی پێغەمبەریش ﷺ تەنیا کەسانێك لێی بەهرەمەند دەبن، کە بە پەنامەکیی، سام و هەیبەتیان بەرانبەر بە خوا هەیەو، نوێژ بەرپا دەکەن و، خۆیان پاك و چاك دەکەن:**

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ أَنتُمُ ٱلۡفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِۖ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلۡغَنِيُّ ٱلۡحَمِيدُ ﴿١٥﴾ إِن يَشَأۡ يُذۡهِبۡكُمۡ وَيَأۡتِ بِخَلۡقٖ جَدِيدٖ ﴿١٦﴾ وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ بِعَزِيزٖ ﴿١٧﴾ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٞ وِزۡرَ أُخۡرَىٰۚ وَإِن تَدۡعُ مُثۡقَلَةٌ إِلَىٰ حِمۡلِهَا لَا يُحۡمَلۡ مِنۡهُ شَيۡءٞ وَلَوۡ كَانَ ذَا قُرۡبَىٰٓۗ إِنَّمَا تُنذِرُ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُم بِٱلۡغَيۡبِ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَۚ وَمَن تَزَكَّىٰ فَإِنَّمَا يَتَزَكَّىٰ لِنَفۡسِهِۦۚ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلۡمَصِيرُ ﴿١٨﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چواردە بڕگەدا:

**١)- ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ أَنتُمُ ٱلۡفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِ﴾، ئەی خەڵکینە! ئێوەن ئاتاج بۆ لای خوا.**

لێرەدا ئەی خەڵکینە! یانی: بە مسوڵمان و نامسوڵمانەوە، هەموو ئەوانەی کە لە ئادەم و حەوواوە هاتوون و، هەموو ئەوانەی بە مرۆڤ دەناسرێن، ﴿أَنتُمُ ٱلۡفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِ﴾، ئێوەن ئاتاج بۆ لای خوا، ئێوە ئاتاج و هەژارن و، پێویستییتان بە بەخشش و چاکەیەك هەیە، کە لە لایەن خواوەیە.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿أَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِ﴾، ئەمـە کورتهەڵێنـان دەگەیەنـێ، (قَـصْرُ صِفَـةُ الفَقْـرِ عَـلَى النَّـاس)، کورتهەڵێنـانی سـیفەتی هەژاریـی لـە سـەر خەڵـك. ﴿أَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِ﴾، واتـە: هـەر ئێـوە هـەژارو ئاتاجـن بـۆ لای خـوا.

هەندێـك لـە توێژەرەوانـی قورئـان گوتوویانـە: لێـرەدا مەبەسـت لـە: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾، هاوبـەش بـۆ خـوا دانەرەکانـن، بەڵکـو هەندێکیـان گوتوویانـە: هاوبـەش بـۆ خـوا دانەرەکانـی مەککـەن! کـە بە بـڕوای مـن ئـەوە تەسـککردنەوەو، بچووککردنەوەی چەمـك و واتـای ئایەتەکانـی قورئانـە، ئەگەرنـا خـوا ﷻ دەیتوانـی بفەرمـوێ: (يَـا مُـشْرِكِي مَكَّـة)، ئـەی هاوبەشـدانەرانی مەککـە! یـان بفەرمـوێ: (يَـا أَيُّهَـا المُشْرِكُـون)، ئـەی هاوبەشـدانەرینە! بـەڵام کاتێـك دەفەرمـوێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾، مەبەسـت پێـی هەمـوو مرۆڤەکانـە.

ئنجـا: ئایـا تەنیـا هاوبەشـدانەرەکانی مەککـە، یـان: هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەران، پێویسـتییان بـە خـوا هەیـەو هـەر ئـەوان ئاتاجـی خـوان؟! بێگومـان نەخێـر! هەمـوو مرۆڤـەکان ئاتـاج و هـەژارو نـەدارن و، پێویسـتییان بـەو چاکـەو بەخششـانە هەیـە، کـە لـە خزمـەت خـوادا هـەن.

٢)- ﴿وَٱللَّهُ هُوَ ٱلْغَنِيُّ ٱلْحَمِيدُ﴾، خوا ﷻ بەس خۆی دەوڵەمەندی ستایشکراوە، واتە: خوا بێ نیازە لە خوا پەرستیی ئێوەو، ئەگەر ئێوەش ستایشی نەکەن، ستایشکراوە لە زاتی خۆیدا، خوا ﷻ پەکی نەکەوتوە، وەك لە سوورەتی (الزمر)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿إِن تَكْفُرُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ عَنكُمْ ۖ وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلْكُفْرَ ۖ وَإِن تَشْكُرُوا۟ يَرْضَهُ لَكُمْ ...﴿٧﴾﴾، واتە: ئەگەر ئێوە بێبڕوابن، یان ئەگەر ئێوە ناسوپاس بن[1]، بە دڵنیایی خوا بێ نیازە لە ئێوە، بەڵام خوا ڕازیی نیە بۆ بەندەکانی کە بێبڕوابن، یاخود ناسوپاس و سپڵەبن، بەڵام ئەگەر بڕواداربن یان: سوپاسگوزاریی بکەن، خوا بۆ ئێوەی پێ پەسندەو پێ چاکە.

---

(١) (وشـەی (تَكْفُـرُوا) بەپێـی سیاق، لـەو ئایەتـەی سـوورەتی: (الزمـر)دا، وا پێدەچـێ مەبەسـت پێـی سپڵەیی و بـێ ئەمەکیـی و ناسوپاسـیی بـێ).

**٣)- ﴿ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ ﴾، ئەگەر بیەوێ لاتاندەبات، یانی: (إِنْ يَشَأْ إِذْهَابَكُم يُذْهِبْكُم)، ئەگەر خوا ﷻ بیەوێ لاتانبەرێ، لاتاندەبات، واتە: لەبەینتان دەبات و ناتانهێڵێ.**

**٤)- ﴿ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ ﴾، دروستکراوێکی دیکە دێنێ، یاخود: خەڵکێکی دیکە دێنێ، چونکە (خَلْق) دەگونجێ مەبەست پێی خەڵکێکی دیکە بێ، کە خوا ﷻ دروستیان دەکات، یاخود: ﴿ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ ﴾، مەبەست پێی دروستکراوێکی دیکە بێ، لە جێی مرۆڤان، خوا ﷻ بیانهێنێ، کە بە تەئکید هەردووکیان بۆ خوای پەروەردگار ئاسانن، چ خەڵکێکی دیکە بێنێ و، ئەو مرۆڤانەی ئێستا لەسەر زەوین، هەمووان لابەرێ و خەڵکێکی دیکە لە نوێ دروست بکات، یاخود خەڵکی کافر لابەرێ و، خەڵکی دیکە بێنێتە شوێنیان، یاخود هەر ئەسڵەن جینسی مرۆڤ لەسەر زەوی لابەرێ و، گەسکێکیان لێ بدات و، جۆرە دروستکراوێکی دیکە بێنێ، هەمووی بۆ خوای پەروەردگار ئاسانە.**

**٥)- ﴿ وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ بِعَزِيزٍ ﴾، ئەوەش لەسەر خوا ﷻ قورس نیە، (العَزِيز: المُمْتَنِعُ الغَالِب)، یانی: پێ نەوێراوی زاڵ، (عزیز) یانی: شتێك کە نەگونجێ بکرێ، واتە: ئەو شتە بۆ خوا نەلواو و نەگونجاو نیەو، قورس و بە زەحمەت نیە، بەڵکو ئاسانە.**

**٦)- ﴿ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ﴾، هیچ گوناهکارێك گوناهی یەکێکی دیکە هەڵناگرێ، ئەمە هۆشدارییدانە بە بێبڕوایەکان، کە ئەگەر ئێوە بەدەم بانگی پێغەمبەری خواوە ﷺ نەچن و، ملکەچ نەکەن بۆ پەیامی خواو، ڕوو لە خوا بەیەکگرتن نەکەن و، واز لە بتپەرستیی و هاوبەش بۆخوا دانان نەهێنن، هیچ کەس لە بەرانبەر ئێوەدا بەرپرسیار نابێت، بە تایبەت پێغەمبەر ﷺ بەرپرسیار نابێ، چونکە هیچ گوناهکارێك گوناهی یەکێکی دیکە هەڵناگرێ[1].**

---

**(١) (الوِزْرُ: الوِقْرُ بِوَزْنِهِ وَمَعْنَاهُ، وَهُوَ الحِمْلُ، وَزَرَ أَيْ: حَمَلَ، الوَازِرَةُ النَّفْسُ الآثِمَةُ)، وشەی (وِزْر) لەگەڵ (وِقْر)، هەم لە کێش داو، هەم لە مانادا وەك یەکن، (وِقْر) و (وِزْر) هەردووکیان بە واتای قورسایی دێن، (وَازِرَة) واتە: (مُثْقَلَة)، نەفسێکی گوناهکار، لەبەرئەوەی کۆڵێکی قورسی لە کۆڵێ ناوە.**

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ﴾، واتـە: (وَلا تَحْمِـلُ حَامِلَـةٌ حِمْـلَ أُخْرَى)، هیـچ کـۆڵ هەڵگرێـك کۆڵـی قورسـی یەکێکـی دیکـە لـە کۆڵـێ نانـێ، هـەر کەسـە گوناهـی خـۆی لەسـەر خۆیەتـی.

٧)- ﴿ وَإِن تَدْعُ مُثْقَلَةٌ إِلَىٰ حِمْلِهَا ﴾، ئەگەر نەفسێکی بار گرانکراویش، بانگ بکات بۆ هەڵگرتنی کۆڵەکەی، واتە: (وَإِنْ تَدْعُو نَفْسٌ مُثْقَلَةٌ بِالإِثْمِ أَيٌّ مَدْعُوٍ)، واتە: ئەگەر نەفسێکی شان قورسکراو و بار قورسکراو، کە کۆڵێکی قورسی خراوەتە سەر شان، هەر کەسێك بانگ بکات بۆ کۆڵەکەی، کە لێی هەڵبگرن.

٨)- ﴿ لَا يُحْمَلْ مِنْهُ شَيْءٌ ﴾، هیچی لێ هەڵناگیرێ، واتە: هیچ هاوکاریی ناکرێ.

٩)- ﴿ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰٓ ﴾، هەرچەندە ئەو کەسە کە بانگیشی دەکات، یان بانگیش دەکرێ، خاوەن نیزیکایەتیی و، خزمایەتییش بێ.

لێـرەدا خـوای موتەعـال دەیـەوێ ئـەو خەڵکـە حاڵیـی بـکات، کـە کاروبـاری ڕۆژی دوایـی قیـاس مەکەنـە سـەر کاروبـاری دنیـا، لـەم دنیـاو ڕۆژگارەدا، ئەگـەر کەسـێك هـاوار لـە کەسـێك ببەسـتێ و، داوای هاوکاریـی لـێ بـکات، ناجوامێرییـە وەڵامـی نەداتـەوە، ئنجـا وا مەزانـن لـە قیامەتیـش وایـە، بـە تایبەتـی کاتـی خـۆی لـە نێـو عەرەبانـدا وا بـاو بـووە، بەڵکـو ئێسـتاش لـە نێـو زۆر لـە عەشـیرەت و تیـرەو هۆزەکانـدا، وا بـاوە، کـە ئەگـەر کەسـێك هـاواری لـە کەسـێك بەسـت، دەبـێ بەدەنگیـەوە بچێـت، یـان کەسـێك پەنـای بـۆ کەسـێك هێنـا، دەبـێ پەنـای بـدات، بـەڵام وا مەزانـن لـە قیامەتیـش وایـە! بێگومـان لـە قیامەتـێ وا نیـە، ئـەوە عـورف و عادەتێکـی نێـو خۆتانـە لـە دنیـاداو پێیـەوە ڕاهاتـوون، کـە زۆر لـەو عـورف و عادەتانە ڕەنگـە شـتی جـوان و چاکیـش بـن، ئەگـەر لـە جێـی خۆیـدا بەکاربێـن، بـەڵام نەخێـر! خۆتـان بـەوە هەڵمەخەڵەتێنـن و، پێتـان وابـێ لـە قیامەتیـش دەگونجـێ، بابایـەك کـە کۆڵـی گوناهانـی قورسـە، داوا لـە یەکێکـی دیکـە بـکات، بتوانـێ هاوکاریـی بـکات، نەخێـر! بەڵکـو هیچـی لـێ هەڵناگیـرێ، هەرچەنـدە نیزیـك و خـاوەن پەیوەندیـی

خزمایەتیش بێ، یاخود هەر جۆرە نیزیکییەکی لەگەڵیدا هەبێت، لەبەر ئەوەی بابای خزم لەگەڵ خزم بەزەیی و شەفەقەتی زیاترە، هەروەها نزیك، - چ بە حوکمی دراوسێیەتیی، چ بە حوکمی ڕەفاقەت و هاوەڵایەتیی - لەگەڵ نزیکەکەی خۆیدا، بەزەیی و شەفەقەتی زیاترە.

١٠)- ﴿إِنَّمَا تُنذِرُ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُم بِٱلۡغَيۡبِ﴾، ئنجا ڕوو دەکاتەوە پێغەمبەر ﷺ: (ئەی موحەممەد!) بە دڵنیایی تۆ تەنیا ئەوانە دەترسێنی و وریا دەکەیەوە، کە بە پەنامەکیی لە پەروەردگاریان دەترسێن، وشەی (خَشْيَة) جیاوازییەکەی لەگەڵ (خَوف)دا ئەوەیە: (خَوف) یانی: شتێك مەترسییت بەرانبەری هەبێ و، لێی بترسی، بەڵام (خَشْيَة) ئەوەیە کە بە بەمەزنگرتنەوە ترس و سام و هەیبەتت بەرانبەری هەبێت، بۆیە هەر لەم سوورەتەدا هاتوە، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يَخۡشَى ٱللَّهَ مِنۡ عِبَادِهِ ٱلۡعُلَمَٰٓؤُاْۗ﴾، بە دڵنیایی تەنیا بەندە زانایەکان بە بە مەزنگرتنەوە، سام و هەیبەتی خوایان لە دڵدا هەیە.

کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا تُنذِرُ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُم بِٱلۡغَيۡبِ﴾، بە دڵنیایی تۆ تەنیا ئەوانەی بە پەنامەکیی لە پەروەردگاریان دەترسێن، بە بە مەزنگرتنەوە، تەنیا ئەوانە وریا دەکەیەوەو دەترسێنی، واتە: تەنیا ئەوانە بەهرەمەند دەبن لە هۆشیارکردنەوەو ترساندنی تۆ، (**أُطْلِقَ الإنْذَارُ هُنَا عَلَى حُصُولِ الأَثَرِ وَهُوَ الإنكِفَافُ، أَوِ التَّصدِيقُ بِهِ، وَلَيْسَ الْمُرَادُ حَقِيقَةُ الإنذَار**)، لێرەدا وشەی (إِنْذَار) ترساندن، وریاکردنەوە، بەکارهێنراوە بۆ پەیدابوونی شوێنەوارەکەی، کە بریتیە لە گەڕانەوە لە گوناهو تاوان و کوفرو خراپە، یاخود مەبەست لە (إِنْذَار) پەیدابوونی بڕوا پێهێنان و بە ڕاست دانانی ئەو شتانەیە، کە بابای ئاگادارکراو و هۆشداریی پێدراو دەبێ بڕوایان پێ بێنێ، نەك مەبەست پێی خودی ترساندن و وریاکردنەوەکە بێ

لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بە دڵنیایی هەموو لایەکی ئاگادار کردۆتەوەو ترساندوەو، هۆشیار کردۆتەوە، بە تایبەتییش لێرەدا کە ئامرازی (إِنَّمَا)ی چۆتە

سەر، تۆ تەنیا ئەوانە دەترسێنی، کە بە پەنامەکیی لە پەروەردگاریان دەترسێن و، نوێژ بەرپا دەکەن، واتە: تۆ تەنیا ئەوانە هۆشیار دەکەیەوەو دەترسێنی، لە حاڵێکدا کە لە هۆشیارکردنەوەو ترساندنەکەی تۆ بەهرەمەند دەبن، کە بە پەنامەکیی ترس و سامیان بەرانبەر بە پەروەردگاریان هەیەو، نوێژیش بەرپا دەکەن.

کە دەفەرموێ: ﴿يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِٱلْغَيْبِ﴾، ئەمە:

١- دەگونجێ مەبەست پێی ئەوەبێ کە لە پەروەردگاریان دەترسێن، یاخود سام و هەیبەتیان بەرانبەر بە پەروەردگاریان هەیە بە بە مەزنگرتنەوە، لە حاڵێکدا کە پەروەردگاریان نادیارە.

٢- یاخود: لە حاڵێکدا کە خۆیان لە نێو خەڵك دا نین و، لە شوێنێکی چۆڵن.

٣- یاخود: مەبەست ئەوەیە کە ترس و سامیان بەرانبەر بە پەروەردگاریان هەیە، لە حاڵێکدا کە سزای پەروەردگاریان نابینن، کە ئاگری دۆزەخە.

١١)- ﴿وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ﴾، نوێژیشیان بەرپا کردوە، ئێمە لە سوورەتی (العنكبوت)دا کە دەفەرموێ: ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ﴾، لەوێدا باسێکی تێرو تەسەلمان کرد لە بارەی نوێژ بەرپا کردنەوە، کردوە.

١٢)- ﴿وَمَن تَزَكَّىٰ﴾[1]، هەر کەسێکیش خۆی پاك و چاك کرد.

١٣)- ﴿فَإِنَّمَا يَتَزَكَّىٰ لِنَفْسِهِۦ﴾، ئەوە بۆ خۆی خۆی پاك و چاك کردوە: یانی: سوودەکەی بۆ خۆیەتی.

١٤)- ﴿وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلْمَصِيرُ﴾، سەرەنجامیش تەنیا بۆ لای خوایە.

کەواتە: ئەم ئایەتە لێی وەردەگیرێ کە: ترس و سام و هەیبەت هەبوون بەرانبەر بە خوا ﷻ و، نوێژ بەرپا کردن، دەبێتە هۆی پاك و چاك بوون و

---

(١) لە تەفسیری سوورەتی (الشمس) دا باسێکی سەربەخۆمان لەبارەی تەزکیەی نەفسەوە کردووە.

تەزكیــەی نەفــس، لــە ڕاســتییدا نەفــس بــەوە چــاك دەبــێ، كــە یەكەمجــار لــە دەروونــەوە بەرانبــەر بــە خــوا، ســام و هەیبــەت و ڕێــزو حورمــەت و بەمەزنگرتنــی هەبــێ، پاشــان بــە ڕواڵەتیــش بەندایەتیــی و ملكەچیــی بــۆ خــوا هەبــێ، ئنجــا گەورەتریــن شــتێك كــە بــە باشــترین شــێوە ملكەچیــی و، بەندایەتیــی بــۆ خــوا تێــدا بەرجەســتە دەبــێ، نوێــژە، بۆیــە خــوا ﷻ لــە دوای تــرس و ســام و هەیبــەت بەرانبــەر بــە خــواو، نوێــژ بەرپــا كــردن، دەفەرمــوێ: ﴿ وَمَن تَزَكَّىٰ فَإِنَّمَا يَتَزَكَّىٰ لِنَفْسِهِۦ ﴾، واتــە: لــە ئەنجامــی ئــەو دووانــەدا، (ئــەو دوو كارە ســەرەكییە، ئەگەرنــا تەنیــا بــەس ئــەو دووانــە نــا)، نەفســی مــرۆڤ پــاك و چــاك دەبــێ، هــەر كەســێكیش خــۆی پــاك و چــاك بــكات، ئــەوە بــە قازانجــی خــۆی و، بــە ســوودی خــۆی پــاك و چــاك دەكات و، ســوودەكەی بــۆ خۆیەتــی، ســەرەنجامیش بــۆ لای خوایــە.

وشــەی: (مَصــير)، كــە (أل)ی ناســاندنی جینسی لەســەرە، یــانی: هەموو ســەرەنجامێك بــۆ لای خوایــە، كــە (الجــارّ والمجرور)یــش پێــش خــراون، ﴿ وَإِلَى اللَّهِ الْمَصِيرُ ﴾، ئەمــە ئــەوە دەگەیەنــێ كــە تەنیــا ســەرەنجامەكان بــۆ لای خــوا دەچنــەوە، كەواتــە: ئــەی مرۆڤــەكان! ئێــوە ســەرەنجام بــەس دەچنــەوە بــۆ لای خــوا ﷻ، بۆیــە بزانــن چــۆن دەچنــەوە بــۆ خزمەتــی؟! بــە نەفســێكی تەزكیــە كــراوو، بــە دڵێكــی پــڕ لــە ڕێــزو ســام و هەیبــەت بەرانبــەر بــە خــواو، بــە نوێــژو تاعــەت و چاكــەوە، یاخــود بــە كــۆڵ و بارێكــی قورســی گوناهــو تاوانــەوە، بزانــن چــۆن دەچنــەوە خزمــەت خــوا؟ خۆتــان ئامــادە بكــەن بــۆ دیــداری خــوا ﷻ!

**مەسەلەی دووەم:**

**ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە کوێرو بینەرو، تاریکایی و ڕووناکیی و، سێبەرو گرەباو، زیندووان و مردووان، یەکسان نین، پێغەمبەریش ﷺ تەنیا هۆشیارکەرەوەو ترسێنەرەو، ناتوانێ پەیامی خوا بە مردووان ببیستێنێ:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَمَا يَسْتَوِي الْأَعْمَىٰ وَالْبَصِيرُ ﴿١٩﴾ وَلَا الظُّلُمَاتُ وَلَا النُّورُ ﴿٢٠﴾ وَلَا الظِّلُّ وَلَا الْحَرُورُ ﴿٢١﴾ وَمَا يَسْتَوِي الْأَحْيَاءُ وَلَا الْأَمْوَاتُ إِنَّ اللَّهَ يُسْمِعُ مَن يَشَاءُ وَمَا أَنتَ بِمُسْمِعٍ مَّن فِي الْقُبُورِ ﴿٢٢﴾ إِنْ أَنتَ إِلَّا نَذِيرٌ ﴿٢٣﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم پێنج ئایەتە لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿وَمَا يَسْتَوِي الْأَعْمَىٰ وَالْبَصِيرُ﴾، کوێرو بینەریش یەکسان نین، پێشتریش گوتمان: مەبەست لە کوێر بابای بێبڕوایە، یان هاوبەش بۆ خوا دانەرە، یان بابای مولحیدو دان بە هیچ شتێك دانەهێنەرە، هەروەها (بَصِيْر) واتە: بینەر، مەبەست پێی مرۆڤی بڕوادارە، لەبەرئەوەی هەر بەڕاستیی ئەوەی کە خوا دەیفەرموێ، هیچ زێدەڕۆیی تێدا نیە، ئێمەی مرۆڤ ئەگەر قسە بکەین، جاری وا هەیە بەشێك لە عاتیفەو سۆزی خۆمانی دەخەینە سەر، بەڵام وەك خوا ﷻ لە سوورەتی (الكهف)دا فەرموویەتی: ﴿وَقُلِ الْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ﴿٢٩﴾﴾، بڵێ هەق لە پەروەردگارتانەوەیە، ئەوەی خوا دەیفەرموێ، هیچ عاتیفەو سۆزو هەڵچوون و ئەوانەی تێدا نیە، ئەوەی خوا دەیفەرموێ، ڕێك وایە، کوێرو بینەر وەك یەك نین، بابای بێبڕوا وەك کوێر وایە، کوێر نازانێ لەبەردەمیدا چی هەیە، نازانێ لە لای ڕاست و لە لای چەپی و، لەلای پشتەوەو لە پێشەوەی، چی هەیە، بابای بێبڕواش نازانێ لە کوێ هاتوەو، بۆ کوێ دەچێ و، بۆچی هاتوە، سەر بەرەو ئاسمان بەرز ناکاتەوە، بۆ لای خوا، بزانێ خەبەر چییە؟ لە تاریکاییاندایەو، کوێرو کوترە، بەڵام ئینسانی بڕوادار دەزانێ کێیە؟ ئەم گەردوونە چییە؟ لە کوێوە هاتوەو بۆ کوێ دەچێ؟

٢)- ﴿ وَلَا ٱلظُّلُمَٰتُ وَلَا ٱلنُّورُ ﴾، تاریکاییەکان و ڕووناکییش وەك یەك نین، مەبەست لە تاریکاییەکان کوفرە، لەبەرئەوەی کوفر هەر یەك جۆر نیە، ڕێبازەکانی کوفر وەك سۆسیالیزم و، کۆمۆنیزم و، لیبرالیزم و، کاپیتالیزم و، سیکۆلاریزم و، هەموو ئەو شتە ئیزمدارانەی کە ئێستا لەو ڕۆژگارەی خۆماندا هەن، ئەگەر تەماشای مێژووی مرۆڤایەتیی بکەین، کوفری یۆنانییەکان جۆرێك بووە، هەر لە نێو خۆشیاندا چەند جۆرە کوفرێك بووە، کوفری میصرییەکان، کوفری ئەوانەی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، لە ئێران، لە میزۆپۆتامیا، لە ڕۆژئاوا، لە ڕۆژهەڵات، کوفر جۆری زۆرن، بەڵام هەمیشە ئەو هەقەی کە پێغەمبەران هێناویانە (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، کە لە خوا بەیەکگرتن و تەنیا خوا پەرستندا، بەرجەستە بووە، لەبەرئەوەی تەنیا خوا بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەنە، دەبێ بەس ئەویش بەندایەتیی بۆ بکرێ و، بەرنامەی لێ وەربگیرێ و، دەبێ هەر ئەویش دروشمەکانی پێشکەش بکرێن، دروشمەکانی دینداریی دەبێ تەنیا پێشکەشی خوا بکرێن و، بەرنامەکانیش تەنیا لە خوا وەربگیرێن، تەنیا خوا ﷻ وەك تاکە بەدیهێنەرو تاکە پەروەردگارو خاوەن، مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ، ئەویش بەوە کە تەنیا بەندایەتیی بۆ وی بکرێ، لە هەردووك بواری سەرەکیی شەعائیرو شەرائیعدا، ئا ئەوە هەمووی، پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، لە هێڵە گشتییەکانیدا، یەکدەنگ و یەك قسە بوون، بەڵام لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، بەولا بکەوە، جەنگەڵ و چخوردێکە، نە کەس بەڕەی کەس دەپێوێ، نە کەس لە مەڕی کەس دەخێوێ، نە کەس دان بە شتی کەس دادێنێ، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ، لە قیامەتێ: ﴿كُلَّمَا دَخَلَتْ أُمَّةٌ لَّعَنَتْ أُخْتَهَا ﴿٣٨﴾﴾الأعراف، لە دنیاشدا کەس شتی کەسی پێ ڕاست نیە، بۆچی؟ چونکە هەرکەسە ڕێبازەکەی لە هەواو ئارەزوو و بۆچوونی خۆیەوە هاتوە، ئەوپەڕی لەو عەقڵەو، لەو توانا کەم و بچووکەوە هاتوە، کە خوا بە مرۆڤی داوە، تاکو پەیامی خوای پێ دەرك بکات و، ژیانی ماددیی خۆی پێ ڕێك بخات، بەڵام ئەو عەقڵە هی ئەوە نیە، نهێنییەکانی بوونی پێ بزانێ، کە: من چیم و کێم؟ دەبێ چی بکەم؟ خوا کێیە ﷻ؟ چۆن بپەرسترێ؟ پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) کێن؟ ژیانی دنیاو ڕۆژی دوایی چین؟ ئەو نهێنیی و بابەتە مەزنانە، تەنیا لەڕێی

وەحییەوە دەرك دەكرێن و، دەزانرێن، بۆیە هەركات مرۆڤ لە پەیام و وەحیی خوا لایدابێ، كەوتۆتە نێو جەنگەڵ و چخوردی ڕێچكەو بیردۆزەكانەوەو سەرگەردان بووە، بۆیە هەمیشە خوا بێبڕوایی و ناهەق، بە: (ظُلُمَاتٌ) تاریكاییەكان، ناودەبا، هەروەها هەق بە: (نور) ڕووناكیی، چونكە ڕووناكیی وەك هەق، یەكە، بەڵام تاریكاییەكان وەك ناهەق، زۆرو جۆراو جۆرن.

٣)- ﴿ وَلَا ٱلظِّلُّ وَلَا ٱلْحَرُورُ ﴾، هەروەها سێبەرو گڕەباش یەكسان نین، (الحَرُور أي: حَرُّ الشَّمسِ) (حرور) گەرمایی خۆرە، سێبەرو گەرمایی خۆر، یان سێبەرو خۆرەتاو، یان سێبەرو گڕەبا، وەك یەك نین، هەندێكیش گوتوویانە: (سَمُوم) ئەو گڕە بایەیە كە بە شەو هەڵدەكا، بەڵام (حَرُوُر) ئەو گڕە بایەیە كە بە ڕۆژ دێ، گرنگ ئەوەیە سێبەرو گەرما، وەك یەك نین.

٤)- ﴿ وَمَا يَسْتَوِى ٱلْأَحْيَآءُ وَلَا ٱلْأَمْوَٰتُ ﴾، هەروەها زیندووان و مردووانیش یەكسان نین، واتە: ئەهلی ئیمان كە بەهۆی ئیمانەوە زیندوون، ئەهلی كوفریش كە بەهۆی كوفرەوە بە مردوو لە قەڵەم دەدرێن، یەكسان نین.

٥)- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُسْمِعُ مَن يَشَآءُ ﴾، بە دڵنیایی خوا هەر كەسێك بیەوێ، پێی دەبیستێنێ. ئەمە وەڵامی پرسیارێكە كە لێرەدا سەرهەڵدەدا:

باشە مادام بڕوادار وەك بینەرو، بێبڕوا وەك كوێر وایەو، هەق وەك ڕووناكیی و، ناهەق وەك تاریكاییەكان وایە، پاشان دینداریی و خواپەرستیی، وەك ژیانی بەر سێبەرو، بێبڕوایی وەك ژیانی بەر خۆرەتاو، یاخود بەر گڕەباو، بڕواداران وەك زیندووان و، بێبڕوایان وەك مردووان وان، ئەدی بۆچی پەیامی خوا كە بە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد دا ﷺ ناردوویەتی بە تایبەت و، بە گشتیی هەموو پەیامەكانی خوا كە بە پێغەمبەراندا ناردوونی، بۆچی نە لە پێغەمبەری خاتەم ﷺ وەك پێویست پەیامی خوا وەرگیراوەو، نە لە پێغەمبەرانی دیكەش وەك پێویست ئەو پەیامانەی خوا وەرگیراون؟ خوا لە وەڵامی ئەو پرسیارە

گریمانەییەدا دەفەرموێ:﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُسْمِعُ مَن يَشَآءُ ﴾، بە دڵنیایی خوا هەر کەسێکی بیەوێ، پێی دەبیستێنێ.

٦)- ﴿ وَمَآ أَنتَ بِمُسْمِعٖ مَّن فِي ٱلْقُبُورِ ﴾، بەڵام تۆ ناتوانی بە کەسانێك کە لە گۆڕەکاندان، ببیستێنی، واتە: ناتوانی بە مردووانێك ببیستێنی، کە خراونە نێو گۆڕەکانەوە، کەسانێك کە لە گۆڕەکاندا نێژراون (بە خاك سپێردراون) زۆر دوورن لەوەی گوێیان لە قسە بێ، بێبڕوایانێکیش کە گوناهو تاوانەکانی خۆیان، وەك چۆن کرمی ئاوریشم بە لیکی خۆی قۆزاخەیەك بە دەوری خۆیدا دروست دەکاو، دوایی لە نێویدا دەمرێ، بێبڕوایەکانیش بە ئیرادەو ویستی ئازادانەی کە خوا پێیداون، تەونێکی چڕو پڕی گوناهانیان بە دەوری خۆیاندا چنیوەو، خۆیان تێیدا قەتیس کردوەو، بۆتە پەردەیەك کە پەیامی خوا نەگاتە گوێ و چاوی عەقڵ و دڵیان، بۆیە ناتوانی پێیان ببیستێنی، وەك چۆن ناتوانی بە کەسانێك ببیستێنی، کە لە گۆڕەکاندا نێژراون.

٧)- ﴿ إِنْ أَنتَ إِلَّا نَذِيرٌ ﴾، تۆ تەنیا ترسێنەرو وشیارکەرەوەی، (النَّذِيرُ: المُنبِئُ عَن تَوَقُّعِ حُدُوثِ مَكرُوهٍ أَو مُؤْلِمٍ)، (نَذِير) بریتیە لە هەواڵدەر بە شتێك کە دەگونجێ ڕووبدا، کە بریتیە لە شتێکی ناپەسند، یان شتێکی خراپ، یاخود شتێکی بە ئازار.

ئەگەر تەماشای ئەو ئایەتانە بکەین، دەبینین خوا ﷻ هەشت سیفەتی پێکەوە بەراورد کردوون:

١و٢- کوێریی و بینەریی.

٣و٤- تاریکایی و ڕووناکیی.

٥و٦- سێبەرو گرەبا.

٧و٨- مردووان و زیندووان.

چواریان کە بریتین لە: ١- کوێریی و، ٢- تاریکایی و،٣- گرەباو، ٤- مردووان، ئەوانە سیفەتی بێبڕوایانن، چواریشیان کە بریتین لە: ١- بینەریی و، ٢- ڕووناکیی

و، ٣- سێبەرو، ٤- زیندووان، ئەوانەش سیفەتی بڕواداران، هەر کەسێك بە ئینسافەوە تەماشای ئینسانی بڕوادار وەك تاك و، کۆمەڵی بڕوادار وەك کۆ بکا، هەروەها تەماشای مرۆڤی بێبڕواو، کۆمەڵی بێبڕوایان بکا، زۆر بە درەوشاوەیی و بە جوانیی ئەو چوار جووت سیفەتە دژ بەیەکە، واتە: ئەو هەشت سیفەتە، چوار لەوانداو، چوار لەواندا، دەبینێ، هەر بە ڕاستیی بابای بێبڕوا وەك کوێر وایە، نازانێ لە کوێ هاتوەو، بۆچی هاتوە، نازانێ لای ڕاستی چییەو، لای چەپی چییەو، پێشەوەی چییەو، دواوەی چییە! هەروەها بابای بێبڕوا لە تاریکاییدایە، داهاتوو و ڕابردوو و ئێستاو، سەرەوەو خوارەوەی خۆی نازانێ! ژیانیشی بریتیە لە ژیانێکی پڕ لە مەینەتیی و ناڕەحەتیی لە دەروونی خۆیدا، با لە ڕووی ماددییشەوە خۆشگوزەران بێ، وەك کەسێك کە لەبەر گڕەبا دادەنیشێ، لە ئەنجامی ئەوەدا کە دەروونی خۆی ژەنگاوی کردوەو، هەستەوەرەکانی خۆی ئەگەر عەقڵە ئەگەر پێنج هەستەکانن، ئەرکی سرووشتیی خۆیانیان پێ ئەنجام نادات، بۆیە لە ئەنجامدا وەك مردوو وایە.

بە پێچەوانەوەش لە بەرانبەریاندا ئینسانی بڕوادار، وەك کەسێکی بەرچاو ڕوونە کە دەبینێ، ئیمان لە وەك ڕووناکیی و ڕۆشناییەکە کە مرۆڤ دەوروبەری خۆی و، ئێستای خۆی و، داهاتووی خۆی پێ دەزانێ، ژیانی ئیماندارانە وەك ژیانی بەر سێبەرو نیسێ وایە، کە ئینسان تێیدا پشوو دەدا، دڵ ئارامە، هێمنە، بەرچاو ڕوونە، پشت بە خوا بەستوویە، سەرەنجام بابای ئیماندارو کۆمەڵی ئیمانداران، وەك زیندووان وان، لەبەرئەوەی لە ناخەوە زیندوون، لە ناخەوە پاك و چاکن.

شایانی باسە لە تەفسیرەکاندا ئەم فەرمایشتە هێنراوە، بە بۆنەی ئەوەوە کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَا ٱلظِّلُّ وَلَا ٱلْحَرُورُ ﴾، چونکە هەندێکیان وایان تەفسیر کردوە، ئەو سێبەرەی خوا وەك پاداشت بۆ بڕوادارانی داناوە لە بەهەشتدا، لەگەڵ ئەو دووکەڵ و گڕەباو ناڕەحەتییەی، کە بۆ بێبڕوایانی داناوە وەك سزا، یەکسان نین، چونکە خوا ﷻ کە لە سوورەتی (الواقعة)دا، باسی (أصحاب

**الیمین)** و **(أصحاب الشمال)** دەكات، ئاوا باسی پاداشتی ئەوانە دەكات، كە بە دەستی ڕاست، نامەی كردەوەكانیان وەردەگرنەوە، دەفەرموێ: ﴿ وَأَصْحَٰبُ ٱلْيَمِينِ مَآ أَصْحَٰبُ ٱلْيَمِينِ ﴿٢٧﴾ فِى سِدْرٍ مَّخْضُودٍ ﴿٢٨﴾ وَطَلْحٍ مَّنضُودٍ ﴿٢٩﴾ وَظِلٍّ مَّمْدُودٍ ﴿٣٠﴾ وَمَآءٍ مَّسْكُوبٍ ﴿٣١﴾ وَفَٰكِهَةٍ كَثِيرَةٍ ﴿٣٢﴾ لَّا مَقْطُوعَةٍ وَلَا مَمْنُوعَةٍ ﴿٣٣﴾ وَفُرُشٍ مَّرْفُوعَةٍ ﴿٣٤﴾ ﴾، هاوەڵانی ڕاستە، هاوەڵانی ڕاستە چین؟ لە نێو درەختی (سیدر)دان، كە دڕكەكەی شكێندراوە (بێ دڕكە)و، سێبەرێك كە دوورو درێژەو، ئاوێك كە هەڵدەڕژێ (بە شێوەی تاڤگە)و، میوەی زۆر، نەبڕاوو نەقەدەغەكراوە و، تەخت و نشینگە بەرز كراوەكان.

بەڵام كە باسی **(أصحاب الشمال)** دەكات، بە پێچەوانەی ئیماندارانەوە، كە دەفەرموێ: ﴿ وَأَصْحَٰبُ ٱلشِّمَالِ مَآ أَصْحَٰبُ ٱلشِّمَالِ ﴿٤١﴾ فِى سَمُومٍ وَحَمِيمٍ ﴿٤٢﴾ وَظِلٍّ مِّن يَحْمُومٍ ﴿٤٣﴾ لَّا بَارِدٍ وَلَا كَرِيمٍ ﴿٤٤﴾ ﴾، واتە: هاوەڵانی چەپە، هاوەڵانی لای چەپ چۆنن؟ لە نێو گڕەباو ئاوی كوڵاودان، سێبەرێك كە دووكەڵە، نە ساردەو، نە ڕێزو حورمەتیشی تێدایە.

ئنجا بەو بۆنەوە، هەندێك لە توێژەرەوان ئەم فەرمایشتەیان هێناوە، بەڵام من وام تەفسیر كرد كە سێبەر (ظِل) و گڕەبا (حَرُور) هەر لە دنیادان، ژیانی ئینسانی بڕوادار وەك هی كەسێكە لە ژێر سێبەرێك (نیسێیەك) دانیشتبێ و، پشوویدابێ، بەڵام ژیانی بێبڕوایی وەك حاڵی كەسێك وایە لەبەر گڕەبا بێت، بەڵام دەشگونجێ مەبەست پێی ئەوەبێ، كە ئەو سێبەرە لە ڕۆژی دواییدا پاداشتی ئیماندارانە، كە لێرەدا خوا پاداشتی ئیماندارانی لە سێبەردا خوڵاصە كردۆتەوە، هەروەك سزای كافرانیشی لە گڕەبادا خوڵاصە كردۆتەوە.

فەرموودەكەش بەم شێوەیە: **{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَتِ النَّارُ: رَبِّ أَكَلَ بَعْضِي بَعْضاً فَأْذَنْ لِي أَتَنَفَّسْ، فَأَذِنَ لَهَا بِنَفَسَيْنِ، نَفَسٌ فِي الشِّتَاءِ وَنَفَسٌ فِي الصَّيْفِ، فَمَا وَجَدْتُمْ مِنْ بَرْدٍ أَوْ زَمْهَرِيرٍ، فَمِنْ نَفَسِ جَهَنَّمَ، وَمَا وَجَدْتُمْ مِنْ حَرٍّ أَوْ حَرُورٍ، فَمِنْ نَفَسِ جَهَنَّمَ}** (أخرجه مسلم: ١٤٣٤).

واتـە: ئەبـوو هورەیـرە ﷺ، دەگێڕێتـەوە کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئاگـری دۆزەخ گوتـی: پـەروەردگارم! هێنـدە ئاگرەکـەم بـە تینـە هەندێکـم هەندێکـی خـوارد، مۆڵەتـم بـدە دوو هەناسـە بـدەم، خـوا مۆڵەتیـدا کـە دوو هەناسـان بـدا، یەکێکیـان لـە زسـتانداو، یەکێکیـان لـە هاوینـدا، ئنجـا هـەر سـەرماو سـۆڵەیەکتان بینـی، ئـەوە لـە هەناسـەدانی دۆزەخـە (لـە زسـتاند)و، هـەر گەرمـاو گڕەبایەکیشـتان بینـی، ئـەوە دیسـان لـە هەناسـەدانی دۆزەخـە (لـە هاوێـن دا).

واتـە: گڕەبـای هاویـن دەشـوبهێتە هەندێـك لـە گەرمـای دۆزەخ، هەروەك سـەرماو سـۆڵەو زوقمـی زسـتان دەشـوبهێتە هەندێـك لـە زەمهەریـرو سـاردیی دۆزەخ، ئـەم فەرمایشـتە لێـی وەردەگیـرێ کـە دۆزەخ تەنیـا گڕەبـاو گەرمیـی نیـە، بەڵکـو سـەرماو زوقمیشـی تێـدا هەیـە.

**مەسەلەی سێیەم و کۆتایی:**

**ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە خوا موحەممەدی ﷺ بە هەقەوە، بەموژدەدەرو ترسێنەر ناردوە، چونکە هیچ کۆمەڵگایەکی مەزن نەبووە، وریاکەرەوەیەکی تێدا نەنێردرێ، هەروەها دڵدانەوەی پێغەمبەر ﷺ کە بەهۆی بەدرۆ دانرانی، دڵ نارەحەت نەبێ، چونکە هەموو پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، لەگەڵ عادەت و نەریتی خراپی بەدرۆ دانانی گەلانی پێشوودا ڕووبەڕوو بوونەوە، خواش بەردەوام بە درۆ دانەرانی پێغەمبەرانی و پەیامەکانی خۆی سزاداوە، چ لە دنیادا، چ بۆی هەڵگرتبن بۆ ڕۆژی دوایی:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ بِٱلۡحَقِّ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗاۚ وَإِن مِّنۡ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٞ ﴿٢٤﴾ وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدۡ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَبِٱلزُّبُرِ وَبِٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُنِيرِ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ أَخَذۡتُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۖ فَكَيۡفَ كَانَ نَكِيرِ ﴿٢٦﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم سێ ئایەتە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ بِٱلۡحَقِّ ﴾، خوا ﷻ پێغەمبەری خاتەم دەدوێنێ ﷺ، دەفەرموێ: بە دڵنیایی ئێمە تۆمان بە هەق ناردوە، کە دەفەرموێ: ئێمە تۆمان بەهەق ناردوە (بِالحَقِّ)، ئەمە سێ واتای لێ وەردەگیرێن:

أ- یان حاڵە لە ڕاناوی قسەکەر لە: ﴿ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ ﴾، واتە: ئێمە کە تۆمان ناردوە، بە هەق تۆمان ناردوەو ناردنەکەی تۆ هەق بووە لە لایەن ئێمەوە.

ب- یان حاڵە لە (ك)ی دواندن (كاف الخطاب) لە وشەی (أَرْسَلْنَاكَ)دا، واتە: تۆمان کە ناردوە، هەقی و ڕاستی و، وەك نەیارەکانت دەڵێن: درۆنی.

ج- یان سیفەتە بۆ چاوگێکی قرتێنراو (أَي: إِنَّا أَرسَلنَاكَ إِرسَالاً مُلابِساً بِالحَقِّ، لا يُشْبِهُ شَيْئاً مِنَ البَاطِلِ)، واتە: ئێمە تۆمان ناردوە بە ناردنێکی ئاوێتە لەگەڵ هەق دا، کە هیچ جۆرە ناهەقییەکی تێدانیە.

کەواتە: (بِالحَقِّ) کە لە چەندان ئایەت دووبارە بۆتەوە، یانی:

١- کاتێك ئێمە تۆمان ناردوە هەق بووی و، لە کات و شوێنی خۆیدا بە شێوەی خۆی کە ڕێك و ڕاستە، تۆمان ناردوە.

٢- یاخود: کە تۆمان ناردوە، تۆ هەقی و هەقت پێیە.

٣- یاخود: ناردنەکەی تۆ، ناردنێکی ئاوێتە بووە لەگەڵ هەقدا.

٢)- ﴿بَشِيرًا وَنَذِيرًا﴾، تۆ موژدەدەرو ترسێنەری، یان: دڵخۆشکەرو هۆشیارکەرەوەی، دیارە پێغەمبەر ﷺ موژدەدەرو دڵخۆشکەر بووە، بۆ ئەوانەی فەرمانبەریی خوا دەکەن و، بەدەم بانگەوازی خواوە دێن، موژدەو بەشارەتیان پێدەداو، دڵخۆشیان دەکات، بەوە کە هەم لە دنیادا سەرفرازو سەرکەوتوو دەبن، هەم لە دواڕۆژیشدا ڕوو سوورو براوە دەبن.

لەبەرانبەریش دا ترساندن و هۆشیارکردنەوەکەشی بۆ سەرپێچییکارانە، کە هەم لە دنیادا تووشی ڕۆژ ڕەشیی و پەشێمانیی دێن، هەم لە دواڕۆژیشدا تووشی زیانباریی و ماڵوێرانیی دەبن.

٣)- ﴿وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ﴾، هیچ کۆمەڵگایەکیش نەبووە، مەگەر ترسێنەرو وشیارکەرەوەیەکی تێدا گوزەراوە، یەکێك لە توێژەرەوان دەڵێ: ئوممەت ئەوانەن کە دەچنەوە سەر یەك باپیرە، وەك ئوممەتەکانی: فارس و، ڕۆم و، هیندو، کوردو، عەرەب و تورك و ... هتد، بەڵام من پێموایە ئوممەت بریتین لە خەڵکێك کە لەسەر ڕێبازێك و لەسەر شتێك کۆدەبنەوە، بۆیە لە ڕاستییدا هەرکام لە کوردو، عەرەب، و تورك، و، فارس و، ئەفغان و، ئینگلیزو ... هتد... ئوممەتیان پێ ناگوترێ، بۆیەش قسەکەی ئەو زانایەم هێنا، تاکو بزانرێ ئەو ڕایەش هەیە، ئەگەرنا ئوممەت دەگونجێ بگوترێ ئوممەتی ئیسلامیی، دەگونجێ بگوترێ ئوممەتی لیبڕالیستەکان، ئوممەتی مارکسیستەکان، ئوممەتی ئەمریکیی، واتە: ئەوانەی لەسەر شێوەیەك لە ژیان و بەرنامە کۆدەبنەوە، ئەوانە پێیان دەگوترێ: ئوممەت، ئوممەتی ئیسلام لەبەرئەوەی لەسەر ئیسلام کۆبوونەوە، ئوممەتی

کوفر لەسەر کوفر کۆدەبنەوە، ئۆممەتی شیرك لەسەر شیرك کۆدەبنەوە، بەڵام ئەوەی دیکە پێیان دەگوترێ گەل (قوم) و نەتەوە (شعب)، گرنگ ئەوەیە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ ﴾.

هەڵبەتـە ئۆممـەت لێـرەدا یانـی: کۆمەڵـە خەڵکێکـی زۆر، نـەك هـەر تیـرەو هۆزێـك لـە هـەر شـوێنێك بووبـێ، پێغەمبەرێکـی تێـدا ڕەوانـە کرابـێ، ئۆممـەت واتـە: خەڵکێکـی زۆر لەهـەر شـوێنێك بووبـن، ترسێنەرو وشـیارکەرەوەیەکیان تێـدا ڕەوان کـراوە، کـە مەبەسـت پێغەمبەرانـە (عَلَيْهِـم الصَّـلاَةُ وَالسَّـلاَم)، هەرچەندە وشـەی (نَذِيـر): بەزۆریـی لـە قورئانـدا بـۆ پێغەمبـەران بەکارهێـنراوە، کـە ئـەوان بـە پلـەی یەکـەم بەنـاوی خـواوە خەڵکیـان هۆشـیار کردۆتـەوە، هۆشـدارییان بـە خەڵـك داوە بـە نـاوی خـواوە، وەك پەیامبـەری خـوا، بـەڵام دەشـگونجێ مەبەسـت پێـی غەیـری پێغەمبەرانیـش بـێ (عَلَيْهِـم الصَّـلاَةُ وَالسَّـلاَم).

٤)- ﴿ وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدْ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ﴾، ئەگەر بەدرۆشت دابنێن [کافرەکانی ڕۆژگاری خۆت] بەدڵنیایی ئەوانەی پێش وانیش بەدرۆیان داناوە، چییان بەدرۆ داناوە؟ پەیامەکانی خواو، پێغەمبەرانی خوایان بەدرۆ داناون.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِن يُكَذِّبُوكَ ﴾، بێگومـان وەڵامـی ﴿ يُكَذِّبُوكَ ﴾، قرتێنـدراوە، چونکـە دوایـی کـە دەفەرمـوێ: ﴿ فَقَدْ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ﴾، ئەمـە دەلالـەت لەسـەر ئـەو وەڵامـە دەکات، کـە بـەو شـێوەیەی لێـدێ: (وَإِنْ يُكَذِّبُـوكَ فَـلاَ تَحْـزَنْ وَلاَ تَحْسَـبْهُم مُفلِتِيـنَ مِـنَ العِقَـابِ عَـلَى ذَلِـكَ، فَقَـد كَـذَّبَ الأَقْـوَامُ الَّذِيـنَ مِـنْ قَبلِهِـم، الأنبيـاء، وَعُوقِبُـوا عَـلَى ذَلِـكَ)، واتـە: ئەگـەر تـۆ بـەدرۆ دابنێـن، دڵتەنـگ مەبـەو، پێـت وانەبـێ لـە سـزاو تۆڵـەی خـوا دەربازیـان دەبـێ، لەسـەر ئـەو بـەدرۆ دانانـە، چونکـە گەلـە پێشـووەکانی پێـش وان، کـە پێغەمبەرانیـان بـەدرۆ دانـا و، لەسـەر ئـەوەش سـزادران، کەواتـە: ئـەو گـەل و کۆمەڵگایـەی تـۆش لەسـەر ئـەوە سـزا دەدرێـن، یـان لـە دنیـادا، یـان لـە دواڕۆژدا، یـان لـە هەردووکیانـدا.

٥)- ﴿ جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ ﴾، پێغەمبەرانیان (عَلَيْهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، موعجیزەو بەڵگە ڕۆشنەکانیان بۆ هێنان، کە ئیسپاتی پێغەمبەرایەتییان بکەن.

٦)- ﴿ وَبِٱلزُّبُرِ ﴾، هەروەها پەندو ئامۆژگارییان هێنان، (زُبُر) کۆی (زَبُور)ە، (زَبُور) دەگونجێ بەو پەڕانە بگوترێ کە شتیان تێدا نووسراوە، کە پێغەمبەران (عَلَيْهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، هەندێکیان مەرج نیە کتێبی تەواویان پێدرابێ، بەڵام زەبووریان پێدراوە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَءَاتَيۡنَا دَاوُۥدَ زَبُورٗا ﴿٥٥﴾ ﴾، یانی: چەند پەڕەیەك، بەڵام زۆرێك گوتوویانە: (زَبُور) واتە: ئەو کتێبەی کە ئامۆژگاریی و پەندو قسەی نەستەقی تێدایە، لەلایەن خوای پەروەردگارەوە، نەك حوکمە شەرعییەکان.

٧)- ﴿ وَبِٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُنِيرِ ﴾، هەروەها پێغەمبەران (عَلَيْهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، کتێبی ڕۆشنکەرەوەشیان هێنا.

٨)- ﴿ ثُمَّ أَخَذۡتُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۖ ﴾، دوایی ئەوانەی بێبڕوا بوون، گرتمن (سزامدان).

٩)- ﴿ فَكَيۡفَ كَانَ نَكِيرِ ﴾، ئنجا ئایا نکووڵییلێکردنی من چۆن بوو؟! واتە: نکووڵییلێکردنی من زۆر بێڕەزاو سەخت بوو، ئەگەر خوا ڕەخنەی گرت و، نکووڵییکرد لە کەسێك، مانای وایە شتەکەی بەهەڵە دەزانێ و، لەسەر ئەوەش سزای دەدا، کەواتە ﴿ فَكَيۡفَ كَانَ نَكِيرِ ﴾، نکووڵییلێکردنی من، کە سزاو جەزرەبەی منی بەدوای خۆیدا هێنا، چۆن بوو؟! یانی: هێندە سەخت و بێڕەزا بوو، وەسف ناکرێ.

بێگومان ئەمە هەمووی دڵدانەوەیە بۆ پێغەمبەر ﷺ: تۆ دڵی خۆت سەغڵەت و ناڕەحەت مەکە، کە تۆ بە درۆ دادەنێن، تۆ یەکەمین پێغەمبەرێك نی بە درۆ دانرابی، هەروەها کافرەکانی ڕۆژگاری تۆش یەکەمین کافرانێك نین، کە پێغەمبەران و پەیامەکەی خوایان بەدرۆ دانابێ، بەڵکو ئەوە عادەت و نەریتی لەمێژینەی کافرانی ڕابردوویە، پێغەمبەرانیش (عَلَيْهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، هەموویان لەگەڵ ئەوەدا ڕووبەڕوو بوونەوە.

لێرەدا خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَبِٱلزُّبُرِ وَبِٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُنِيرِ﴾، خوا سێ شتی باس کردوون، بۆ پێغەمبەران (عَلَيْهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم):

١- ﴿بِٱلۡبَيِّنَٰتِ﴾، هیچ گومانی تێدانیە مەبەست پێیان ئەو بەڵگە ڕۆشنانەن، کە پێغەمبەران (عَلَيْهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، پێیان بوون، بۆ سەلماندنی پێغەمبەرایەتیی خۆیان، ئنجا چ موعجیزە بووبن، موعجیزەیەکی دیارو بەرهەست، چ بەڵگەیەکی دیکەی ڕۆشن بووبن، بایی ئەوەیان کردبێ، کە ئیسپاتی پێغەمبەرایەتیی خۆیانی پێبکەن، بەڵگەشمان ئەوەیە کە لە قورئاندا خوای پەروەردگار وشەی (البَيِّنَات)ی زۆر بەکار هێناوە، بۆ بەڵگەو موعجیزەکانی پێغەمبەران، بۆ وێنە: لە سووڕەتی (الحديد) ئایەتی (٢٥)دا دەفەرموێ: ﴿لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا رُسُلَنَا بِٱلۡبَيِّنَٰتِ﴾، پێغەمبەرانمان (عَلَيْهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، بەبەڵگە ڕۆشنەکانەوە ناردن، هیچ پێغەمبەرێك نەبووە، مەگەر بەڵگەیەکی بە دەستەوە بووە، ئیسپاتی پێغەمبەرایەتیی خۆی پێ بکات، وەك پێغەمبەر (عَلَيْهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، لە فەرمایشتێکدا دەفەرموێ: **{مَا مِنَ الأَنْبِيَاءِ مِنْ نَبِيٍّ إلاَّ قَدْ أُعْطِيَ مِنَ الآيَاتِ مَا مِثْلُهُ آمَنَ عَلَيْهِ الْبَشَرُ} (أخرجه البخاري: ٦٨٤٦، ومسلم: ٤٠٢).**

واتە: هیچ پێغەمبەرێك لە پێغەمبەران نەبووە، مەگەر خوا نیشانەو بەڵگەیەکی وای پێداوە، کە لەسەر ئەوە مرۆڤەکان بڕوا بێنن، واتە: بایی قەناعەت پێهێنانی مرۆڤەکان بکات، کە بزانن ئەو کەسەی داوای پێغەمبەرایەتیی دەکا، پێغەمبەری خوایە (عَلَيْهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، چونکە جیاوازیی نێوان ڕاست و درۆ، بریتیە لە بەڵگە.

٢- ﴿وَبِٱلزُّبُرِ﴾، گوتمان: (زُبُر) کۆی (زَبُور)ە‌و، زۆرێك لە زانایان دەڵێن: (زَبُور) مەبەست پێی ئەو قسە ئەستەق و پەندو ئامۆژگارییانەن، کە خوا ﷻ بە پێغەمبەرانی داون، یان پێغەمبەران (عَلَيْهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، لەبەر ڕۆشنایی وەحییەك دا کە خوا بۆی ناردوون، ئەو قسە ئەستەقانەیان کردوون، وەك فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خۆمان (عَلَيْهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، هەندێکیش گوتوویانە: (زَبُور) کتێبێك بووە کە خوا بە پێغەمبەرانی (عَلَيْهِم

الصَّلاةُ وَالسَّلَام) داوە، بەڵام کتێبێکی وەك تەورات و قورئان و ئینجیل تەواو نەبووە، بەو واتایەی کتێبێك بێت گشتگیر بێت، بەڵکو چەند بابەتێك بووە، لە چەند لاپەڕەیەکدا نووسراون، چونکە هەندێك گوتوویانە: (زُبُر: زَبَرَه، أيْ: كَتَبَهُ وخَطَّهُ)، هەندێکی دیکە گوتوویانە: (زَبُور) واتە: نووسراوێك کە بەخەتی درشت نووسرابێ، بەڵام ڕای یەکەم کە هی زۆربەیە، وێچووترە.

٣- ﴿وَبِٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُنِيرِ﴾، هەروەها کتێبێکی ڕۆشنکەرەوەش، وەك تەورات و ئینجیل و قورئان و، هەر کتێبێکی دیکە، خوا بە پێغەمبەرانی دابێ (عَلَيْهِم الصَّلاةُ وَالسَّلَام)، کە بۆ ئێمە باس نەکراوە.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ثُمَّ أَخَذۡتُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ (الأخـذ: مُسـتَعَارٌ للإسـتِئصَالِ وَالإفنَـاءِ، شُـبِّهَ إهلاكُهُـم بِإتـلافِ المُغِيريـنَ عَـلَى عَدُوِّهِـم يَقتُلُونَهُـم وَيُغنِمُـونَ أموَالَهُـم)، خـوای پـەروەردگار لـە چەنـد شـوێنێکدا وشـەی (أخـذ) بەکاردێنـێ: ﴿وَأُخِذُواْ مِن مَّكَانٖ قَرِيبٖ ٥١﴾، یـان: (فَأَخَذۡنَاهُـمْ)، یـان: (فَأَخَذۡتُهُـم)، ئنجـا (أَخْـذ) لـە ئەسـڵدا بریتیـە لـەوە کـە شـتێك بەدەسـت بگـری، بـەڵام خوازراوەتـەوە بـۆ لـە بەینـبردن و بنبڕکـردن و، فەوتێنرانـی کافـرەکان بـە سـزای خـوا، چوێنـدراوە بـە لـە بەینبردنـی کەسـانێك کـە شـەبەیخوون دەکەنـە سـەر دوژمنیـان، دەیانکـوژن و مـاڵ و سامانەکەشـیان بـە غەنیمـەت دەگـرن [بەدیلیـان دەگـرن، ئـەوی دەیکـوژن دەیکـوژن، ئەوانـی دیکـە بـە دیـل دەگـرن].

کـە دەفەرمـوێ: ﴿فَكَيۡفَ كَانَ نَكِيرِ﴾، ئـەم تەعبیـرەش هـەم لێـرەدا هاتـوە، هەم لـە چەنـد شـوێنێکی دیکـەی قورئانـدا هاتـوە، (فَكَيْـفَ)، چـۆن؟ ئەمـە پرسـیار کردنـە، (إستِفهَامٌ مُستَعمَلٌ فِي التَّعجِيبِ مِـن حَالِهِـم)، واتـە: پرسـیار کردنـە بـۆ سەرسـوڕماندن لـە حاڵیـان، واتـە: حاڵیـان زۆر خـراپ بـوو، کـە مـن نکووڵییـم لێکـردن، (نَكِـير: إسـمٌ لِشِـدَّةِ الإنـكَار، وَهُـوَ هُنَـا كِنَايَـةٌ عَـنِ شـدةِ العِقَـابِ لأنَّ الإنـكَارَ يَسـتَلزِمُ العِقَـابَ عَـلَى الفِعِـلِ المُنكَـر)، واتـە: (نَكِـير) نـاوە بـۆ نکووڵیلێکـردن و، ڕەخنـە لێگرتنێکـی قـورس

و سەخت، (نَكِيرِ) یانی: (نَكِيرِي)، (ي)ە كە، بە كەسرە قەرەبوو كراوەتەوە، واتە: نكووڵییلێكردن و ڕەخنە لێگرتنی من چۆن بوو؟! لێرەدا ئەم تەعبیرە كینایەیە لەوە، كە خوا زۆر بە سەختیی ئەوانەی سزاداوە، چونكە ئەگەر خوا ڕەخنە لە شتێك یان كەسانێك بگرێ و، نكوڵییان لێ بكا، مانای وایە ئەو ڕەخنە لێگرتن و نكووڵیی لێكردنە، سزا پەلكێش دەكا، لەسەر ئەو خراپەیەی خوا ڕەخنەی لێ گرتوە، چونكە خوا ڕەخنە لە شتی خراپ دەگرێ، كە ڕەخنەشی لێ گرت، مانای وایە ئەو بابایەی ئەو خراپەیەی هەیە، سزای دەدا.

# کورتە باسێک
## سێ سەرنجی گرنگ

**سەرنجی یەکەم:** یەکێك بۆی هەیە پرسیار بکات: بۆچی لە قورئاندا تەنیا ناوی ئەو پێغەمبەرانە هاتوە، کە لە نێو کۆمەڵگایەکانی نیشتەجێی وڵاتانی ڕووبارەکانی نیل و دیجلەو فوڕاتدا هەبوون، هەر لە نووحەوە بگرە، هەتا موحەممەد؟!

١)- نووح (عَلَيْهِ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، کە کەشتییەکەی لەسەر چیای جوودیی نیشتۆتەوە، کە دیارە چیای جوودیی سەرچاوەکانی دیجلەو فوڕاتی لێن و لەوێوەدێن، چیای جوودییش ئێستا دەکەوێتە کوردستانی باکوور، کە لکێندراوە بە دەوڵەتی تورکیاوە.

٢)- ئیبراهیم (عَلَيْهِ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، کە لە ئووری کلدانییەکان بووە، دوایی چووە بۆ شام و، دوایی چووە بۆ میسڕو، بەشێك لە ماڵ و منداڵی لە حیجاز داناوەو، کەعبەی لەوێ بنیاتناوە، کەواتە: ئیبراهیمیش هەر لەو ناوچەیە بووە[1].

٣)- مووسا (عَلَيْهِ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، لە میسڕ بووە، دوایی هاتوە بۆ شام و، دوایی بەنوو ئیسرائیلی دەرباز کردوەو، لە دەشتی سینا بوون.

٤)- عیسا (عَلَيْهِ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، دیسان لە فەڵەستین بووە، سەفەرێکیان کردوە لەگەڵ دایکی بۆ میسر بەپێی هەندێك لە ڕیوایەتەکان، دوایی هەر لە فەڵەستین و لەو ناوچانە ژیاوە، تاکو خوا بەرزی کردۆتەوە بۆ ئاسمان.

٥)- موحەممەد (عَلَيْهِ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، کە ئەویش هەر لە حیجاز بووە.

ئنجا لێرەدا ئەو پرسیارە دەکرێ: بۆچی خوا ﷻ تەنیا ناوی ئەو پێغەمبەرانەی هێناوە؟! کە لەو دەڤەرەدا بوون؟ بە تایبەت ئەوانە، کە بەڕای زۆربەی زانایان،

---

(١) بڕوانە: مفصل العرب واليهود في التأريخ، أحمد سوسة، ص ٥٠٦، ٥٠٧ أبراهيم الخليل: مولده وسيرته.

پێنـج پێغەمبـەرە هـەرە گەورەکانـن ، کـە خـوا ﷻ هـەم لـە سـوورەتی (شـوری)دا نـاوی هـەر پێنجیانـی هێنـاوە، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحًا وَٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ وَمَا وَصَّيۡنَا بِهِۦٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓۖ أَنۡ أَقِيمُواْ ٱلدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُواْ فِيهِۚ ﴿١٣﴾ ﴾، هەروەهـا لـە سـوورەتی (الأحزاب)یشـدا دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِذۡ أَخَذۡنَا مِنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِيثَٰقَهُمۡ وَمِنكَ وَمِن نُّوحٖ وَإِبۡرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَۖ وَأَخَذۡنَا مِنۡهُم مِّيثَٰقًا غَلِيظٗا ﴿٧﴾ ﴾، بۆیـە زانایـان دەڵێـن: خـوا کـە نـاوی ئـەو پێنجانـە لـە دوو شـوێنی قورئانـدا پێکـەوە دێنـێ، واتـە: ئـەو پێنجـە، لەوانـی دی پایـە بەرزتـرو مەزنـتر بـوون (عَلَيْهِـم الصَّلاَةُ وَالسَّـلاَم).

بەڵـێ، نـاوی پێغەمبەرانـی دیکـەش هاتـوە، بـەڵام ئەوانـی دیکـەش کـەم و زۆر، ئەگـەر تەماشـا بکەیـن هـەر لـەو شـوێنە بـوون، جـارێ پێغەمبەرانـی بەنـوو ئیسـرائیل هەموویـان هـەر لـە ناوچـەی شـام و میسـرو ئەوانـە بـوون، هەروەهـا پێغەمبەرەکانی دیکـەش: یونـوس لـە موسـڵ بـووە، لـە (ئەینـەوا)، شـوعەیب لـە مەدیـەن بـووە، هوود کـە پێغەمبـەری گەلـی عـاد بـووە، لـە حیجـاز بـووە، هەروەهـا ساڵـح کـە پێغەمبـەری گەلـی سـەموود بـووە، لـە حیجرو ئـەو ناوچانـە بـووە، نشـینگەی هەمـووان دەکەوێتە شـام و حیجـاز و میـسرو عیـراق و کوردسـتان، لووطیـش کـە بـرازای ئیبراهیـم بـووە، دیـارە کـە لـە شـام بـووە؟!

وەڵامی ئەو پرسیارە، دووانن:

أ- ئەو شوێنانە نشینگەی سەرەکیی مرۆڤایەتیی بوون، شوێنی نیشتەجێبوونی مرۆڤایەتیی بە پلەی یەکەم ئەو شوێنانە بوون، واتە: دەوروبەری ڕووبارەکانی دیجلەو فورات و نیل، ناوچەکانی: کوردستان و عێراق و شام و میسرو حیجازو دەوروبەریان، ئەوە وەڵامێك.

ب- وەڵامێکی دیکە: خوا ﷻ زۆر بە ڕۆشنیی ئەوەی فەرمووە کە مەرج نیە ناوی هەموو پێغەمبەران (عَلَيْهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، لە قورئاندا هاتبێ و، مەرجیش نیە خوا ﷻ هەر پێغەمبەرێکی ناردوە، ناوی هێنابێ و، بەسەرهاتەکەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ

گێڕابێتەوە، کەواتە: بۆیە تەنیا ئەو پێغەمبەرانە (عَلَيْهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلَام)، ناویان هاتوە، لەبەر ئەوەی کە:

یەکەم: مرۆڤایەتیی زیاتر لەو شوێنانە نیشتەجێ بوون.

دووەم: ئەوانە پێغەمبەرانی بەرجەستەو بەرچاوی خوا بوون بۆ مرۆڤایەتیی، بە تایبەتی ئەو پێنجەی باسمان کردن: نووح و ئیبراهیم و عیساو مووساو موحەممەد (عَلَيْهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلَام)، ئەگەرنا پێغەمبەرانی دیکەش لە شوێنانی دیکە هەبوون.

ئەگەر تەماشاش بکەین: هەموو ئەوانەی خۆیان بە شوێنکەوتووی ئایینێکی ئاسمانیی دەزانن، شوێنکەوتووی ئەو پێنجەن: (صابیئە) کە خۆیان بە شوێنکەوتووی نووح دەزانن، هەروەها خۆیان بە شوێنکەوتووی یەحیا دەزانن، دیارە ئوممەتی ئیسلام شوێنکەوتووی هەموو پێغەمبەرانە، بەڵام پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ ئەو پێغەمبەرەیە کە سەرمەشقیانە، هەروەها جوولەکە شوێنکەوتووی مووسان و، نەصرانییەکان شوێنکەوتووی عیسان، هەروەها هەرکام لە مسوڵمانان و جوولەکەو نەصرانیی و صابینەش، هەموویان ڕێزو حورمەتی زۆریان بۆ ئیبراهیم هەیە (عَلَيْهِ الصَّلاَةُ وَالسَّلَام)و، ئەو خاڵی هاوبەشی بەینی هەموویانە.

هەندێک لە توێژەرەوان لە وەڵامی ئەو پرسیارەی سەرەوەدا دەڵێن: لەبەرئەوەی عەرەب تەنیا ناوی ئەوانەیان بیستوە، بۆیە قورئان تەنیا باسی وانی کردوە! بەڵام من ئەو وەڵامەم پێ بێهێزە، هەرچەندە (محمد الطاهر بن عاشور) یش لە تەفسیرەکەی خۆیدا هێناویەتی، ئەو وەڵامەم پێ بێهیزە، چونکە خوا ﷻ ئەم قورئانەو، پێغەمبەری خاتەمی ﷺ تەنیا بۆ گەلی عەرەب نەناردوە، تاکو تەنیا ڕەچاوی ئاستی ڕۆشنبیریی ئەوان بکات، بەڵکو بابەتەکە ئەوەیە کە پێغەمبەرە مەزنەکان، ئەو پێنجەیان بە تایبەت و، ئەوانی دیکەش، بەزۆریی لەو شوێنانە بوون، کە لانکەی مرۆڤایەتیی بوون، مرۆڤایەتیی زیاتر لەو شوێنانە نیشتەجێ بووە.

**سەرنجی دووەم:** خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ ﴾، واتە: هیچ کۆمەڵگایەك نیە مەگەر وشیارکەرەوەیەکی تێدا گوزەراوەو ڕۆیشتوە، ئەمە پرسیارێك دروست دەکات: کوان پێغەمبەرانی گەلانی هیندو، چین و، ئەمریکاو، ئەفریقاو، ... هتد؟!

ئەم پرسیارە دەگونجێ دوو وەڵامی بدرێنەوە:

**یەکەم:** ١- خوا ﷻ لە سوورەتی (غافر) ئایەتی (٧٨)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ مِنْهُم مَّن قَصَصْنَا عَلَيْكَ وَمِنْهُم مَّن لَّمْ نَقْصُصْ عَلَيْكَ ﴾، واتە: لە پێش تۆدا پێغەمبەرانێکمان ناردوون، هەیانە بەسەرهاتیمان بەسەر تۆدا خوێندۆتەوەو، هەشیانە بەسەرهاتیمان بەسەر تۆدا نەخوێندۆتەوە، واتە: باس و خواسی نیە لە قورئاندا.

٢- لە سوورەتی (النساء) ئایەتی (١٦٤)دا، خوا ﷻ دوای ئەوەی باسی ژمارەیەك لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمِ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) دەکات و دوازدە (١٢) لە پێغەمبەران ناودێنێ، دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَرُسُلًا قَدْ قَصَصْنَاهُمْ عَلَيْكَ مِن قَبْلُ وَرُسُلًا لَّمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ ﴾، واتە: پێغەمبەرانێکی دیکەش کە پێشتر بەسەرهاتیانمان بەسەر تۆدا خوێندۆتەوەو، پێغەمبەرانێکیش کە بەسەرهاتیانمان بەسەر تۆدا نەخوێندۆتەوە.

کەواتە: مەرج نیە هەموو پێغەمبەرانی خوا، صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ، ناویان لە قورئاندا هاتبێ.

**دووەم:** پاشان وەك لە سەرنجی یەکەمیشدا باسمان کرد: خوا ﷻ ئەو پێغەمبەرانەی زیاتر ناوهێناوە کە لەو شوێنەدا بوون، کە مرۆڤایەتیی زیاتر لەوێ نیشتەجێ بووە، واتە: دەوری ڕووبارەکانی دیجلەو فوڕات و نیل.

سـەرنجی سـێیەم: بێگومـان هیـچ پێغەمبەرێـك نەهاتـوە کـە بەڵگەیەکـی پـێ نەبێـت، ئیسـپاتی پێغەمبەرایەتیی خـۆی پـێ بـکات، ئنجـا مـەرج نیـە ئـەو بەڵگەیـە تەنیـا موعجیزەیەکـی بەرهەسـت بووبـێ، ئـەوەی خـوا لـە قوڕئانـدا بـۆ ئێمـەی باسـکردوە:

١- حوشترەکەی صالیحە (عَلَيْه الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، کە لە چیایەك هاتۆتە دەر.

٢- گۆچان و دەستی مووسایە (عَلَيْهِ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، وێڕای کۆمەڵێك موعجیزەی دیکە، کە سەرجەمیان نۆ بوون، خوا لە سووڕەتی (الإسراء)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ ﴾.

٣- پاشان موعجیزەکانی (عیسا)ن (عَلَيْهِ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، کە خوا دەفەرموێ: مردووی زیندو دەکردەوە، نەخۆشەکانی بەڵەك و، کوێری زگماك و، لاڵی زگماکی چاك دەکردنەوەو، لە قوڕ باڵندەی دروست دەکردو فووی پێدا دەکردو دەفڕی و، چەند موعجیزەی دیکەش، خوا ﷻ تەنیا ئەوانەی بۆ ئێمە باسکردوون، ئەدی پێغەمبەرانی دیکە؟

لە وەڵامدا دەڵێین:

یەك: پێغەمبەرانی دیکەش دەگونجێ لەو شێوە موعجیزانەیان بووبێ.

دوو: بێگومان: ﴿ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ ﴾، هەر ئەوە نیە کە موعجیزەی بەرهەست بێ، بەڵکو هەرکام لەو پێغەمبەرانە بە جۆرێك خوا ﷻ پشتگیریی کردوە، کە خەڵکەکەی بزانن پێغەمبەری خوایە، ئنجا ئەگەر بەهۆی ڕەوشتی بەرزو جوانیەوە بووبێ، کە هەموو پێغەمبەران وابوون، ئەگەر بە هۆی زانیاریی و قسەزانی و لێزانییەکەوە بووبێ، ئەگەر بەهۆی حاڵەتێکی دیکەی تایبەتیی لە جەستەیاندا، بووبێ، مووسا (عَلَيْه الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) دەستی ڕاستی خستۆتە بن هەنگڵی و دەری هێناوە، وەك گڵۆپ ئایساوە، دەگونجێ ئەو پێغەمبەرانەش تایبەتمەندییەکی وا لە جەستەیاندا بووبێ، یاخود بە شێوەیەك لە شێوەکان بووبێتیان و، مەرج نیە هی هەمووان هەر ئەو موعجیزانە بووبن، چونکە خوا

ﷺ موعجیزەی هەر کام لە پێغەمبەرانی بە شێوەیەك ناردوە، کە لەگەڵ ئاستی فیکرو فەرهەنگ و ڕۆشنبیریی ئەو خەڵك و گەل و نەتەوەیەدا بگونجێ، کە بۆیان نێرراوە، هەر بۆیە موعجیزەی پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ ئەم قورئانەیە، وەك خوا لە سوورەتی (العنكبوت)دا دەفەموێ: ﴿ وَقَالُواْ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَٰتٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۖ قُلْ إِنَّمَا ٱلْءَايَٰتُ عِندَ ٱللَّهِ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٥٠﴾ أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَرَحْمَةً وَذِكْرَىٰ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٥١﴾ ﴾، موحەممەد ﷺ تەنیا ئەم قورئانەی هێناوە، وەك بەڵگە بۆ سەلماندنی پێغەمبەرایەتیی خۆی، کە زۆر لە مسوڵمانان ئەوە نازانن، وا دەزانن کە ئاو لەنێو پەنجەکانی هاتۆتە دەرێ و، خواردنی کەمی بە پارانەوە بۆ زۆر بووەو، دەنکە چەو (بەرد) لە دەستیدا تەسبیحاتی کردوەو، بنکە خورمایەکە ناڵاندوویەتی و، گەلێك شتی دیکە، کە پێغەمبەری خوا کە بوونی، گەلێك لە مسوڵمانان وا دەزانن، ئەوانەش هەموویان موعجیزەی ئیسپاتی پێغەمبەرایەتیی موحەممەدن ﷺ!! بەڵام نا، ئەوانە هەموویان بەپلەی یەکەم ڕێز لێگرتنی خوا بوون بۆ پێغەمبەر ﷺ و بە پلەی دووەم بۆ هاوەڵانی، کە لە هەندێك تەنگانەو نارەحەتیی دەربازیان بکا، هەروەها مسوڵمانانیش زیاتر ئیمانیان پێی دابمەزرێ، ئەگەر نا تاکە شتێك کە پێغەمبەر ﷺ وەك بەڵگە بۆ ئیسپاتی پێغەمبەرایەتیی خۆی، بەکاری هێنابێ، ئەم قورئانە بووە، کە خوا لە سوورەتی (العنكبوت)دا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالُواْ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَٰتٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۖ قُلْ إِنَّمَا ٱلْءَايَٰتُ عِندَ ٱللَّهِ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٥٠﴾ أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَرَحْمَةً وَذِكْرَىٰ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٥١﴾ ﴾، واتە: گوتیان: بۆچی نیشانەی لە پەروەردگارییەوە دانابەزنە سەرێ؟ {(آیات) کۆی (آیة)ە، ئەم ئایەتە مەبەست پێی ڕستەکانی قورئان نیە، بەڵکو مەبەست پێی موعجیزە بەرهەستەکانە، وەك هی پێغەمبەرانی پێشوو} (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ: موعجیزەکان و نیشانەکان تەنیا لە لای خواوەن، من تەنیا وشیارکەرەوەیەکی ڕوون و ئاشکرام، {ئنجا موعجیزەو بەڵگەیان بۆچییە؟!} ئایا بۆ ئەوان بەس نیە کە ئێمە کتێبێکمان بۆ تۆ دابەزاندوە، بەسەریاندا دەخوێندرێتەوە {ئەوە موعجیزەی تۆیە} لەوەدا [لە دابەزاندنی قورئان و لە کتێبەدا] بیرخستنەوەو، بەزەیی هەیە {لە لایەن خواوە} بۆ کەسانێك بڕوا بێنن.

بۆ کەسانێك بڕوا بێنن، ئەم قورئانە موعجیزەو بەڵگەی پێغەمبەری خاتەمە ﷺ.

ئنجا حیکمەتی ئەوەش:

یەکەم: ئەم قورئانە وێڕای ئەوەی بەڵگەی ئیسپاتی پێغەمبەرایەتیی موحەممەدە ﷺ، خودی بەرنامەکەشیەتی.

دووەم: ئەم قورئانە وێڕای ئەوەی بەڵگە بووە بەدەستی پێغەمبەرەوە ﷺ، بەڵگەشە بەدەستی ئوممەتیشیەوە، بەڵام پێغەمبەرانی پێشوو، چونکە بۆ کۆمەڵگایەکی دیاریکراوو، بۆ کاتێکی دیاریکراوو، بۆ قۆناغێکی دیاریکراو، هاتوون، موعجیزەکەشیان پەیوەست بووە بە خۆیانەوە، بە کات و شوێنی خۆیانەوە، کاتێ خۆیان وەفاتیان کردوە، موعجیزەکەش نەماوە، بەڵام چونکە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ بۆ هەموو مرۆڤایەتیی نێردراوە، بە درێژایی زەمان و بە پانایی زەمین، هەروەك چۆن بەرنامەکەی بەردەوامەو، پارێزراوە، خوا پاراستوویەتی، بەڵگەکەشی لەنێو بەرنامەکەدا پارێزراوە، ئێستا ئەو بەڵگەیەی کە موحەممەد ﷺ پێی بووە، بۆ ئیسپاتی پێغەمبەرایەتیی خۆی، ئێمەش پێمانە، کە قورئانە.

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـە یـازدە (١١) ئایـەت دەگرێتـە خـۆی، ئایەتەکانـی: (٢٧ - ٣٧)، لـەم یـازدە ئایەتـەدا، خـوای بـێ وێنـە باسـی دیـاردەی جیاوازیـی ڕەنگەکانـی میـوەی درەختـان و، چیـاکان و، مـرۆڤ و، ژیانـدارو ئاژەڵانـی کـردوە، بـەو بۆنەیەشـەوە مـەدح و ستایشـی زانایانـی کـردوە، کـە تەنهـا ئـەوان وەك پێویسـت سـام و هەیبەتـی خوایـان لـە دڵدایـەو، بـە مەزنگرتنـەوە لێـی دەترسـێن، واتـە: ئـەو زانایانـەی کـە بـە دروسـتکراوەکانی خـوا زانـان، هەروەهـا بـە وەحیـی و پەیامـی خـوا زانـان.

دوایـی ستایشـی کۆمەڵێـك کـراوە، کـە خوێنـەری کتێبـی خـواو، بەرپاکـەری نوێـژن و، سـامانی خۆشـیان دەبەخشـن لـە پێنـاوی خـوادا.

دوایـی باسـی کتێبـی هەقـی خـوا کـراوە، کە بـۆ موحەممـەد ﷺ سروشـکراوە، واتە: قورئـان، ئـەو کتێبـە هەقـە بەڕاسـت دانـەری کتێبەکانـی پێـش خۆیەتـی، هەروەهـا پەیامەکانـی پێـش خـۆی کـە بـۆ پێغەمبەرانـی دیکـە نێـردراون ﷺ، بـەو بۆنەیەشـەوە، خـوا ستایشـی ئـەو بەندانـەی خـۆی کـردوە، کـە هەڵیبـژاردوون و، کتێبـی خـۆی پێـداون و، لـە کتێبـی خۆیـدا شـارەزای کـردوون، دوای پۆلێـن کرانیشـیان بـۆ سـێ کۆمـەڵ، ستایشـی ئەوانەیـان کـراوە بـە تایبـەت کـە لـە چاکانـدا پێشـدەکەونەوەو، باسـی پاداشـتی بـەرزو ناوازەیـان کـراوە، لـە ڕۆژی دواییـدا، کـە بەهەشـتە پـڕ نـازو نیعمەتەکانـی خـوان.

لـە کۆتایـی دا، باسـی سـزای بێـڕەزای خـوای دادگـەر کـراوە بـۆ بێبڕوایان، کـە ئاگری بـێ ئامانـی دۆزەخـە، هەروەهـا باسـی پەشـێمانیی و بـێ دەرەتانیـی دۆزەخییـەکان کـراوە، هەروەهـا سەرزەنشـتی خـوا ﷻ بۆیـان، کـە ئایـا بایـی ئەوەنـدە نەمانژیانـدن، کـە ئەگـەر هـەر کەسـێك ویسـتبای بیـری بکەوێتـەوە، بیـری دەکەوتـەوە؟ واتـە: ئـەو

ڕاستییانەی بیر دەکەوتنەوە، کە لە ڕێی وەحییەوە خوا بە پێغەمبەراندا ﷺ ناردوونی.

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ ثَمَرَاتٍ مُّخْتَلِفًا أَلْوَانُهَا ۚ وَمِنَ الْجِبَالِ جُدَدٌ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَانُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ ﴿٢٧﴾ وَمِنَ النَّاسِ وَالدَّوَابِّ وَالْأَنْعَامِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ كَذَٰلِكَ ۗ إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ ۗ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ ﴿٢٨﴾ إِنَّ الَّذِينَ يَتْلُونَ كِتَابَ اللَّهِ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَأَنفَقُوا مِمَّا رَزَقْنَاهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً يَرْجُونَ تِجَارَةً لَّن تَبُورَ ﴿٢٩﴾ لِيُوَفِّيَهُمْ أُجُورَهُمْ وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِ ۚ إِنَّهُ غَفُورٌ شَكُورٌ ﴿٣٠﴾ وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ مِنَ الْكِتَابِ هُوَ الْحَقُّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ ۗ إِنَّ اللَّهَ بِعِبَادِهِ لَخَبِيرٌ بَصِيرٌ ﴿٣١﴾ ثُمَّ أَوْرَثْنَا الْكِتَابَ الَّذِينَ اصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا ۖ فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِ وَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌ بِالْخَيْرَاتِ بِإِذْنِ اللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ الْفَضْلُ الْكَبِيرُ ﴿٣٢﴾ جَنَّاتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ وَلُؤْلُؤًا ۖ وَلِبَاسُهُمْ فِيهَا حَرِيرٌ ﴿٣٣﴾ وَقَالُوا الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَذْهَبَ عَنَّا الْحَزَنَ ۖ إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٌ شَكُورٌ ﴿٣٤﴾ الَّذِي أَحَلَّنَا دَارَ الْمُقَامَةِ مِن فَضْلِهِ لَا يَمَسُّنَا فِيهَا نَصَبٌ وَلَا يَمَسُّنَا فِيهَا لُغُوبٌ ﴿٣٥﴾ وَالَّذِينَ كَفَرُوا لَهُمْ نَارُ جَهَنَّمَ لَا يُقْضَىٰ عَلَيْهِمْ فَيَمُوتُوا وَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُم مِّنْ عَذَابِهَا ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِي كُلَّ كَفُورٍ ﴿٣٦﴾ وَهُمْ يَصْطَرِخُونَ فِيهَا رَبَّنَا أَخْرِجْنَا نَعْمَلْ صَالِحًا غَيْرَ الَّذِي كُنَّا نَعْمَلُ ۚ أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَاءَكُمُ النَّذِيرُ ۖ فَذُوقُوا فَمَا لِلظَّالِمِينَ مِن نَّصِيرٍ ﴿٣٧﴾﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{ئایا (بە چاوی سەر، یان بەچاوی عەقڵ و دڵ) نەتدیوە، کە خوا لە ئاسمانەوە ئاوێکی دابەزاندوە؟! ئنجا (درەختی) میوە ڕەنگ جیاوازەکانمان پێ (لەزەوی) دەرهێناون، هەروەها لە چیاکانیشدا ڕێگاو هێڵە ڕەنگ سپیی و سوورە ڕەنگ جیایەکان و، ڕەنگ ڕەشە تۆخەکان هەن (٢٧) دیسان هەر بەو شێوەیە لە خەڵك و ژیانداران و ئاژەڵانیشدا، ڕەنگە جیاوازەکان هەن، بەدڵنیاییش لەنێو بەندەکانی (خوادا) تەنها زانایان (بە شێوەیەکی شایستە) لێترسان و بەمەزنگرتنیان بۆ خوا هەیە، بێگومان خوا زاڵی لێبوردەیە (٢٨) بەڕاستیی ئەوانەی کتێبی خوا دەخوێننەوەو، شوێنی دەکەون و، نوێژیان بەرپاکردوەو، لەوەی پێمان داون بە پەنهانیی و بەئاشکرا دەبەخشن، بە هیوای سەوداو بازرگانییەکن (لەگەڵ خوادا) کە هەرگیز زیان ناکات (٢٩) (ئەو کارە چاکانە دەکەن) تاکو (خوا) بە تەواویی پاداشتەکانیان بداتەوەو، لە بەخششی خۆیشی بۆیان زیاد بکات، بێگومان ئەو لێبوردەی سوپاسگوزارە (٣٠) ئەوەی لەکتێبیش بۆلای تۆمان سروشکردوە (ئەی موحەممەد!)، هەر ئەوە هەق و ڕاستە، بەڕاستدانەری ئەو (کتێب) انەی پێش خۆیەتی، بەدڵنیایی خوا شارەزاو بینەری بەندەکانیەتی (٣١) دوایی کتێبەکەی خۆمانمان کردە میراتی ئەوانەی لەبەندەکانمان هەڵمان بژاردن، ئنجا هەیانە ستەمکاری خۆیەتی و، هەیانە میانجییەو، هەیانە بە مۆڵەتی خوا، (لە ئەنجامدان)ی چاکەکاندا، پێش کەوتوویە، ئا ئەوەشە بەخششی گەورە (لە لایەن خواوە) (٣٢) دەچنە نێو بەهەشتانێکی هەمیشەییەوە، بە بازنەی زێڕو گەوهەر دەڕازێندرێنەوەو، پۆشاکیشیان لەوێ ئاوریشمە (٣٣) (پاش نیشتەجێبوونیشیان) لە بەهەشتدا گوتیان: ستایش بۆ ئەو خوایەی کە خەم و پەژارەی نەهێشتین، بێگومان پەروەردگارمان لێبوردەی سوپاسگوزارە (٣٤) ئەو کەسەی لە بەخششی خۆیەوە، لە مەنزڵگای هەمیشە تێدا مانەوەدا، نیشتەجێی کردین، هیچ جۆرە

ماندوویەتیی و شـەکەتییمان تێیـدا تـووش نابـێ ﴿٣٥﴾ ئەوانـەش کـە بێبـڕوا بـوون (بـەوەی کـە پێویسـت بـوو بـڕوای پـێ بهێنـن)، ئاگـری دۆزەخیـان هەیـە نـە بڕیـاری مردنیـان بەسـەردا دەدرێ، کـە بمـرن، نـە ئازارەکەشـیان لەسـەر سـووك دەکـرێ، بـەو شـێوەیە سـزای هـەر ناسـوپاس و سـپڵەیەك دەدەیـن ﴿٣٦﴾ لـە حاڵێکـدا کـە ئـەوان هـاوارو ڕۆی تێـدا دەکـەن (دەڵێـن): پەروەردگارمـان! دەرمـان بێنـە، کـردەوەی بـاش دەکەیـن جیـاواز لـەوەی پێشـتر دەمانکـرد، (خـوا دەفەرمـوێ): ئایـا هێندەمـان نەژیانـدن کـە ئـەوەی بیـەوێ (ڕاسـتییەکانی) بیـر بکەوێتـەوە، بیـری دەکەوتـەوەو، وریاکـەرەوەو ترسێنەریشـتان بـۆ نەهـات (کەچـی هیـچ گوێتـان پـێ نـەدا)؟!، دەجـا (سـزای دۆزەخ) بچێـژن، مسـۆگەر سـتەمکاران هیـچ پشـتیوانییەکیان نیـە﴿٣٧﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(جُدَدٌ): (جَمْعُ جُدْة أي: طَرِيقَةٍ ظَاهِرَة، طَرِيقٌ مَجْدُود: مَسْلُوكٌ مَقْطُوع، وَجَادَّةُ الطَّرِيق مَا يَمْشِي عَلَيْهَا النَّاس)، وشـەی (جُـدَد)، کـە دەفەرمـوێ: ﴿وَمِنَ ٱلْجِبَالِ جُدَدٌۢ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ﴾، کـۆی (جُدْة)یـە، (جُـدْة)، (أي: طَرِيقَةٍ ظَاهِرَة)، یـانی: ڕێیەکـی دیـار، (وَطَرِيقٌ مَجْدُود: مَسْلُوكٌ مَقْطُوع)، ڕێیـەك بگیرێتـە بـەرو ببـڕدرێ، (وَجَادَّةُ الطَّرِيق)، یانـی: نێوەڕاسـتی ڕێـگا، ڕێگایـەك کـە خەڵـك پێیـدا بـڕوات، هەڵبەتە لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿جُدَدٌۢ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ﴾، مەبەسـت پێـی هێـڵ و خەتەکانـی چیایەکانـە، کـە هەندێکیـان سـوور بـاون، هەندێکیـان سـپیی بـاون، هەندێکیشـیان ڕەشـی تۆخـن.

(وَغَرَابِيبُ سُودٌ): (جَمْعُ غِرْبِيب، وَهُوَ الْمُشْبِهُ لِلْغُرَابِ فِي السَّوَادِ)، (غَرابِيب)، کـۆی (غِرْبِيب)یـە، (غِرْبِيب)، ئەوەیـە کـە لـە ڕەشـییدا وەك قەلـە ڕەشـە وابـێ، زۆر زۆر ڕەش بـێ، کەواتـە: (أَسْودٌ غِرْبِيب)، وەك (أَبْيَضُ نَاصِع)و (أَصْفَرُ فَاقِع)، سـپییەکی زۆر سـپیی و، زەردێکـی زۆر تـۆخ و، ڕەشـێکی زۆر ڕەش.

(لَّن تَبُورَ): واتـە: زیـان نـاكات، (البَـوَارُ: فَـرْطُ الكَسَـادِ)، كەسـێك لـە سـەوداو مامەڵەكەیـدا زۆر زەرەر بـكات، دەڵێـن: (بَـارَ، يَبُـور)، یـان (بَـارَتْ تِجَارَتُـهُ)، واتـە: بازرگانییەكـەی زۆری زەرەر كـرد، (وَعُـبِّرَ عَـنِ الهَـلَاكِ بِالبَـوَارِ، بَـارَ الشَّـيء بَـوَاراً وَبَـوْراً)، وشـەی (بَوَار): بەكارهێنراوە بـۆ لـە بەیـن چوونـی شـتێك، دەگوتـرێ: (بَـارَ الشَّيءُ بَـوَاراً وَبَـوْراً)، واتـە: ئـەو شـتە لـە بەیـن چـوو، بـە لەبەیـن چـوون، (بَـوَاراً وَبَـوْراً)، هەردووكیـان چاوگـن، كـە دەفەرمـوێ: ﴿تِجَـٰرَةً لَّن تَبُورَ ﴾، بازرگانییـەك كـە زیـان نـەكات.

( جَنَّـٰتُ عَدْنٍ ): باخانێـك كـە هەمیشـەیین، (عَـدَنَ بِالمَـكَانِ: اسْـتَقَرَّ، المَعْـدِنُ: مُسْـتَقَرُّ الجَوَاهِـرِ)، (عَـدَنَ بِالمَـكَانِ) واتـە: نیشـتەجێی شـوێنەكە بـوو، (مَعْـدِن) نشـینگەو كانیـی كانزایـان، لەبـەر ئـەوەی شـوێنەكەی چەسـپاوە.

(يُحَـلَّوْنَ): دەڕازێندرێنـەوە، (حَـلِيَ يَحْلَى)، ڕازایـەوە، دەڕازێتەوە، (حُلُّوا)، ڕازێنرانەوە. (أَسَاوِرَ): (جَمْـعُ سِـوَار)، هەندێكیـش گوتوویانـە: (جَمْـعُ أَسْـوِرَة)، و (أَسْـوِرَة جَمْـعُ سِـوَار)، كەواتـە: (أَسَـاوِر)، كـۆی كۆیـە، (جَمْـعُ الجَمْـعِ)، (سِـوَار)یش واتـە: بـازن.

(ٱلْمُقَامَةِ ): (أي: الإِقَامَة)، شوێنی نیشتەجێ بوون و تێدا مانەوە.

(نَصَبٌ ): (النُّصْبُ وَالنَّصَبُ: التَّعَبُ)، واتە: ماندوێتیی.

(لُغُوبٌ ): (اللُّغُـوبُ، التَّعَـبُ وَالنَّصَـبُ، أَتَانَـا سَـاغِباً لَاغِبَـاً، أي: جَائِعَـاً تَعِبَـاً)، ﴿لَا يَمَسُّنَا فِيهَا نَصَبٌ وَلَا يَمَسُّنَا فِيهَا لُغُوبٌ ﴾، (لغُـوبُ)، ماندوێتیـی و شـەكەتیی، دەگوتـرێ: (أَتَانَـا سَـاغِباً لَاغِبَـاً، أي: جَائِعَـاً تَعِبَـاً)، فلانكـەس هـات بـۆ لامـان بـە برسـێتیی و ماندوێتیـی، بـەڵام (لغُـوبُ)، پێـم وایـە لـە كوردییـدا دەبێتـەوە بـە شـەكەتیی، چونكـە (لغُـوبُ)، لـە دوای ماندووێتییـە، دوای ئـەوەی ئینسـان مانـدوو دەبـێ، دوایـی كـە لـە ماندووێتییـان برسـتی لـێ دەبـڕێ، دەگوتـرێ: شـەكەت بـووەو فـزرەی لـێ بـڕاوە.

(يَصْطَرِخُونَ ): (الإِصْطِـرَاخُ: افْتِعَـالٌ مِـنَ الـصُّرَاخِ، وَهُـوَ الصِّيَـاحُ بِشِـدَّةٍ وَجُهْـدٍ، وَالإِصْطِرَاخُ مُبَالَغَـةٌ فِيـه)، (اصْطِـرَاخُ)، لەسـەر كێشـی (افْتِعَـالُ)ە لـە (صُرَاخِ)ەوە هاتـوە، كـە بریتیـە

لـە هاوارکردنـی زۆر تونـدو، بـە خـۆ ماندووکردنـەوە، چونکـە (اصْطِـرَاخ)، زێدەڕۆیـی کردنـە لـە هاوارکـردن و هـاوارو بـڕۆ.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا ﷻ لـەم یـازدە ئایەتـە موبارەکـەدا، سـەرنجمان ڕادەکێشـێ بـۆ چاکـەو نیعمەتەکانـی خـۆی، کـە لـە نێویانـدا جیاوازیـی و ڕەنـگاو ڕەنگیـی دروسـتکراوەکانی خوایـە، چ لـە میوەکانـدا، چ لـە چیایەکانـدا، چ لـە مرۆڤـان و ژیانداراندا، بـە گشـتیی و ئـاژەڵان دا بـە تایبـەت، دوایـی خـوا ﷻ باسـی زانایانـی لـە خـوا تـرس دەکات، کـە سـام و هەیبەتیـان هەیـە بەرانبـەر بـە خـوا، کـە بەڕاسـتیی هـەر زانایـان بـە تەواویـی ئـەو هەسـتەیان هەیـە، ئنجـا باسـی خەسـڵەتە سـەرەکییەکانی بڕوادارانـی سـەرفراز دەکات، ئنجـا باسـی پۆلێنکردنـی مسـوڵمانانی هەڵگـری قورئـان و، سـەرەنجامی خێریـان، دەکات، دوایـی باسـی سـەرەنجامی شـووم و نارەحەتـی بـێ بڕوایانێك دەکات کـە لـە تەمەنـی خۆیـان بەهرەمەنـد نەبـوون، ئـەو ماوەیـەی کـە خـوا ﷻ ژیاندوونی، وەك دەرفەتێکـی زێڕیـن و هەلێـك نەیانقۆسـتۆتەوە، کـە خوایـان بیـر بکەوێتـەوە، بزانـن بۆچـی لێـرەن و، بۆچـی هاتـوون و، بـۆ کـوێ دەچـن؟!

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ﴾، ئایـا نابینـی کـە خـوا لـە ئاسـمانەوە ئـاوی دابەزانـدوە؟! ئایـا نابینـی، زانایـان دەڵێـن: لێـرەدا دەگونجـێ مەبەسـت لـە بینیـن، دیتنـی چـاو بـێ، چونکـە بـە چـاو دەبیـنرێ، کاتێـك ئـاو کـە لەئاسـمان دێتـە خـوار، هەروەهـا کـە میوەکانـی پـێ دەڕوێـن، هەروەهـا چیایەکانیش کـە ڕەنگیـان جـۆراو جـۆرەو، خەڵـك و ژیانـداران و ئاژەڵانیـش.

دەشـگونجێ مەبەسـت پێـی لـە دیتنـی عەقـڵ و دڵ بـێ، چونکـە هەمـوو ئـەو شـتانە، مـەرج نیـە ڕاسـتەوخۆ بەچـاو ببینرێـن، هەردووکیشـیان دەگرێتـەوە، هـەم

چاوی سەر، هەم چاوی عەقڵ و دڵ، ﴿ أَلَمْ تَرَ ﴾، ئایا نەتدی؟! کە لێرەدا ئەو پرسیارکردنە پرسیارکردنی چەسپاندن (إستفهام تقريري)ە، چونکە شتێکی ئاشکرایەو، شتێك نیە کە نکووڵیی لێ بکرێ، ئایا نەتبینی کە خوا لە ئاسمانەوە، لەسەرەوە ئاوی دابەزاندوە؟! وەك زۆر جار گوتوومانە: خوا نافەرموێ: باران، یان بەفر، یان تەرزە، کە دەفەرموێ: ئاوێکی دابەزاندوە، واتە: بەهەر سێ حاڵەتی باران و بەفرو تەرزە، ﴿ فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ ثَمَرَٰتٍ مُّخْتَلِفًا أَلْوَٰنُهَا ﴾، پێشتر بەشێوەی نادیار (غائب) دەیفەرموێ، دواتر خوا ﷻ یەکسەر دەیکاتە حاڵەتی دواندن و فەرمایشتکردن (خطاب) دەفەرموێ: بەو ئاوە کە دامانبەزاندوە، بێگومان لە زەوی، پێمان دەرهێنا، ﴿ ثَمَرَٰتٍ مُّخْتَلِفًا أَلْوَٰنُهَا ﴾، چەند میوەیەك کە ڕەنگەکانیان جیاجیان، هەڵبەتە ڕەنگە جیاوازەکان هەر لە یەك میوەش دا هەن، بۆ نموونە: سێوی سوور هەیە، سەوز هەیە، زەرد هەیە، یان ترێی سپیی هەیە، ڕەش هەیە، یان ترێی بۆڵد و درشت هەیە، هی بۆڵد و ورد هەیە، ترێی بێ نێوك هەیەو ... هتد، ئنجا بچۆ بۆ جۆرەکانی دیکە میوەکان، لە یەك جۆری میوەش ڕەنگی جیاواز هەن، چ جای میوەکانی دیکە ئەگەر پێکەوە دابنرێن بە چەند ڕەنگێکی جیاواز، چەند دیمەنێکی سەرنجڕاکێشیان هەیە؟! ﴿ وَمِنَ ٱلْجِبَالِ جُدَدٌۢ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهَا ﴾، هەروەها لە چیایەکانیش هێڵە سپیی و سوورە ڕەنگ جیاوازەکان، (جُدَد) کۆی (جُدَّة)یە، بە مانای ڕێگە دێت، هەروەها بەمانای هێڵ و دەمار دێ، (بِيض) کۆی (أَبْيَض)ە واتە: هێڵە سپییەکان هەن، (حُمر) کۆی (أحْمَر)ە، هەروەها هێڵە سوورەکانیش هەن، ﴿ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهَا ﴾، ئنجا لەوانیش سووری تۆخ و کاڵ هەیە، سپیی ساف و، سپیی مەیلەو زەرد هەیەو، سپیی تێکەڵ لە ڕەنگی دیکە هەیە، ﴿ وَغَرَابِيبُ سُودٌ ﴿٢٧﴾ ﴾، ڕەشە زۆر تۆخەکان، (سُود)یش کۆی (أَسْوَد)ە، (غَرَابِيب)یش کۆی (غربيب)ە، (أسود غربيب) واتە: ڕەشێکی زۆر تۆخ.

ئنجا وەنەبێ هەر لە دەمارو هێڵی شاخەکان و چیایەکان ڕەنگی سوورو سپیی و ڕەشی تۆخ هەبێ و، ڕەنگە جیاوازەکان هەبن، ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ

﴿وَٱلدَّوَآبِّ وَٱلۡأَنۡعَٰمِ﴾، هەروەها لە خەڵك و لە ژیانداران، (دَوَابّ) كۆی (دَابَّة) یە، (كُلُّ مَا يَدُبُّ عَلَى الأَرض)، هەر شتێك كە لە سەر زەوی بڕوا، چ لەسەر سك بخشێ، وەك خشۆكەكان، چ بە دوو پێیان بڕوا، چ بە چواران بڕوا، چ بە زیاتران بڕوا.

(والأنْعَام) هەروەها ئاژەڵ، ئاژەڵ بەو چوارە دەگوترێ: یەكەم: حوشتر، دووەم: ڕەشەوڵاخ (كە هەم گاو مانگاو، هەم كەڵ و گامێش دەگرێتەوە)، سێیەم و چوارەم: مەڕو بزن، مەڕیش نێرومێی و: بەران و مەڕ، هەروەها بزن: نێریی و بزن، هەموو جووتەكان دەگرێتەوە، ئنجا لەوانیش ﴿مُخۡتَلِفٌ أَلۡوَٰنُهُۥ كَذَٰلِكَۗ﴾، بە هەمان شێوە ڕەنگیان جیاجیایەو جۆراوجۆرە، ﴿إِنَّمَا يَخۡشَى ٱللَّهَ مِنۡ عِبَادِهِ ٱلۡعُلَمَٰٓؤُاْۗ﴾، بە دڵنیایی تەنیا ئەو بەندانەی خوا، ترس و سامیان بەرانبەری هەیە، كە زانان، واتە: تەنیا بەندە زانایەكان لە خوا دەترسێن، بە بە مەزنگرتنەوە، سام و هەیبەتیان بەرانبەری هەیە، زۆر بە ئاشكرا دیارە، كە لێرەدا مەبەست لە بەندە زانایەكان، ئەوانەن كە بە دروستكراوەكانی خوا زانان، چونكە باسی جیاوازیی ڕەنگی دروستكراوەكان كراوە، هەر لە میوەكانەوە بگرە، تاكو چیایەكان و، مرۆڤ و ژیانداران و ئاژەڵان.

كەواتە: كە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يَخۡشَى ٱللَّهَ مِنۡ عِبَادِهِ ٱلۡعُلَمَٰٓؤُاْۗ﴾، بەڕاستیی تەنها بەندە زانایەكان، وەك پێویست سام و هەیبەتیان بەرانبەر بەخوا هەیە، واتە: ئەو بەندانەی كە زانان بە دروستكراوەكانی خوا، بەڵام هاوكات ئەوە ڕێگریش نیە لەوە كە مەبەست لە زانایان ئەوانەش بن، كە لە كتێبی خوا شارەزان و، لە پەیامی خوا ئاگادارن، بەڵام بێگومان مرۆڤ تاكو بە دروستكراوەكانی خوا زاناتربێ و، لێیان شارەزاتربێ و، بزانێ خوا بە چ سیستمێكی ڕێك و پێك و ئەوپەڕی پڕ وردەكاریی، هەموو شتەكانی ئەم گەردوونەی هێناونە دی، ئەو مرۆڤە باشتر دەزانێ خوا چی دروستكردوە، بۆیە مەلای گەورەی كۆیە دەڵێ: (عیلمی كیمیات گەر نەخوێندوە نازانی خوا چی دروستكردوە!)، یان دەڵێ:

(عیلمـی تەبیعـەت عیلمـی خودایـە قالـەو فەوەلـە گشـتی هەبایـە).

هەڵبەتـە مـن واناڵێـم، بـەڵام دەڵێـم: بێگومـان شـارەزا بـوون لـە زانسـتەکانی دیکـە، کـە یاسـایەکانی خـوا لـە دروسـتکراوەکانی داو، سیسـتمی پـڕ وردەکاریـی خوامـان لـە گـەردوون دا پـێ دەناسێنن، کاریگەریـی زۆری هەیـە لـەوەدا کـە مـرۆڤ هەتا زیاتـر شـارەزای دروسـتکراوی خـوا بێـت، زیاتـر بەبەدیهێنـەرو پەیداکـەری ئـەو دروسـتکراوەش ئاشـنا دەبـێ.

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ ﴾، بێگومـان خـوا زاڵـی لێبوردەیـە، زاڵـەو باڵادەسـتە بەرانبـەر بـە کەسـانێك کـە قـەدری چاکـەو نیعمەتەکانـی نازانـن، لێبوردەشـە بـۆ کەسـانێك کـە ئەگـەر پێشـتریش قەدریـان نەزانیبـێ، دوایـی دەگەڕێنـەوە.

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَتْلُونَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ ﴾، بـە دڵنیایـی ئەوانـەی کتێبـی خـوا دەخوێننـەوە، ﴿ يَتْلُونَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ ﴾، وەك دواتـر باسـی دەکەیـن: واتـە: دەیخوێننـەوەو شـوێنی دەکـەون، ﴿ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾، نوێژیـش بەرپـا دەکـەن، واتـە: بـەو شـێوەیەی خـوا فەرموویەتـی: نوێـژ ئەنجـام دەدەن، ﴿ وَأَنفَقُوا۟ مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً ﴾، بـە پەنهـان و بـە ئاشـکراش لـەوەی پێـمان داون دەبەخشـن، لـەوەی پێـمان داون و کردوومانـە بـە بژیـوی ئـەوان، چ شـتی مەعنەویـی بـێ، چ ماددیـی بـێ، لـە هەمـوو ئـەو نیعمەتانـەی پێـمان داون، دەوروبەریـان بەهرەمەنـد دەکـەن، ئـا ئەوانـە: ﴿ يَرْجُونَ تِجَٰرَةً لَّن تَبُورَ ﴾، بـە ئومێـدی بازرگانییەکـن، بە ئومێدی سـەودایەکن، لەگـەڵ خـوادا، کـە هەرگیـز زیانـی تێدانیـە، مامەڵـە کـردن لەگـەڵ خـوادا هەرگیـز زیانـی تێـدا نیـەو، هەمیشـە خـوای میهرەبـان و بەخشـەر مامەڵـە لەگـەڵ کـەرانی بەهرەمەنـدو سـوودمەند دەکات.

﴿ لِيُوَفِّيَهُمْ أُجُورَهُمْ وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِۦٓ ﴾، بۆیـەش ئـەو کارانـە ئەنجـام دەدەن: تاکـو خـوا بـە تەواویـی پاداشـتەکانیان بداتـەوەو، لـە بەخششـی خۆیشـی بۆیـان زیـاد بـکات، ئـەم (ل)ە یـان (ل)ی (عِلّة)یـە، واتـە: بۆیـە وا دەکـەن، تاکـو خـوا

بەو شێوەیە پاداشتەکانیان بەتەواویی بداتەوەو، لە بەخششی خۆی بۆیان زیاد بکا، یاخود (ل)ی (عاقبة)یە، یانی: ئەو کردەوانە دەکەن، کە سەرەنجامەکەی ئاوایە، خوا بە تێرو تەواویی پاداشتەکانیان دەداتەوەو، لە بەخششی خۆیشی بۆیان زیاد دەکات، ﴿إِنَّهُۥ غَفُورٞ شَكُورٞ﴾، بێگومان خوا لێبووردەی سوپاسگوزارە، واتە: کەسێك هەڵەو پەڵەی هەبن لێی دەبووریّ و، کەسێك شتێك بكات چاك بێت، خوا ﷻ سوپاسی دەکات.

﴿وَٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ هُوَ ٱلۡحَقُّ﴾، ئەوەش کە لە کتێب بۆ تۆمان سروشکردوە، بەس ئەوە هەقە، تەنیا ئەوە هەقی ڕەهاو بێ سنوورە، بە تەواویی هەقی گرتۆتە خۆی، کە قورئانە، ﴿مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ﴾، بەڕاستدانەری ئەوەیە کە لەپێش دوو دەستەکانیەوەیەتی، واتە: هەرچی کتێبێك کە لەپێش ویدا دابەزیوەو، هەرچی پەیامێك و پەیامبەرێك، نێرراوە، ئەم قورئانە هەموویان بەڕاست دەزانێ، وەك ئەسڵەکەیان، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِعِبَادِهِۦ لَخَبِيرُۢ بَصِيرٞ﴾، بەدڵنیایی خوا شارەزای بینەرە بۆ بەندەکانی، شارەزایانە چی دەکەن و چۆن دەکەن و، بینەری حاڵ و کردەوەکانیانە.

﴿ثُمَّ أَوۡرَثۡنَا ٱلۡكِتَٰبَ ٱلَّذِينَ ٱصۡطَفَيۡنَا مِنۡ عِبَادِنَا﴾، دوایی کتێبی خۆمان کردە میراتی ئەو بەندانەمان کە هەڵمان بژاردوون، ئنجا خوا ﷻ ئەوانیش پۆلێن دەکات، بۆ سێ کۆمەڵ و سێ پلە، چونکە هەموویان یەك جۆر نین: ﴿فَمِنۡهُمۡ ظَالِمٞ لِّنَفۡسِهِۦ﴾، ئنجا هەیانە ستەمکارە بەرانبەر بەخۆی، ﴿وَمِنۡهُم مُّقۡتَصِدٞ﴾، هەشیانە میانجییە، نە خراپەو نەزۆریش چاکە ﴿وَمِنۡهُمۡ سَابِقُۢ بِٱلۡخَيۡرَٰتِ﴾، هەشیانە لە چاکەکاندا پێشکەوتۆتەوە، ﴿بِإِذۡنِ ٱللَّهِ﴾، بە مۆڵەتی خوا، ﴿ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَضۡلُ ٱلۡكَبِيرُ﴾، بە دڵنیایی ئەوەی کە لە چاکەکاندا پێش دەکەوێتەوە، ئەوەی لە پێشبڕکێی چاکەکارییدا لە پێش خەڵکی دەبێ، ئەوە بەخششی گەورەیە کە خوا ﷻ بەبەندەکانی دەیبەخشێ، بەڵام نەك لە گۆترە، بەڵکو خوا ﷻ هەموو شتێکی لە جێی خۆیدایە، کەسانێك کە شایستەی ئەوەبن و،

هەوڵیـان دابێـت و خۆیـان وا لێکردبـێ کـە شایسـتەبن، خـوا ئـەو بەخشـشـەیان پـێ دەدات.

ئنجا خـوا ﷻ باسـی ئـەو بەخشـشـە گەورەیـەی خـۆی دەکات و، شـی دەکاتـەوەو دەفەرمـوێ: ﴿ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ يَدۡخُلُونَهَا ﴾، چەنـد باخێکـی هەمیشـەیین، دەچنـە نێویان، ﴿ يُحَلَّوۡنَ فِيهَا مِنۡ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٖ ﴾، دەڕازێنرێنـەوە لـەو باخانـەدا بـە بازنـە زێـڕەکان، ﴿ وَلُؤۡلُؤٗاۖ ﴾، هەروەهـا بـە گەوهەریـش دەڕازێنرێنـەوە، ئنجـا ئایـا گەوهەرەکانیـش هـەر بۆیـان دەکرێنـە بـازن، یـان بـە شـێوەی دیکـە، دەبـن؟ ئایا گەوهـەرەکان چۆن پێیـان دەڕازێنرێنـەوە؟ ئـەوە ڕوون نەکراوەتەوە، ﴿ وَلِبَاسُهُمۡ فِيهَا حَرِيرٞ ﴾، پۆشاکیشـیان لەوێـدا ئاوریشـمە.

مـرۆڤ لـە کانزایـەکان، لـە زێڕ چاکـترو، هەروەهـا دوای زێڕیـش زیو، پاشـان ئەوانەی کـە لـە دەریـا دەردەهێنرێـن، لـە گەوهـەر جوانـترو، لـە جـۆری قوماشـیش، لە ئاوریشـم باشـتری، پـێ شـك نایـەت، بۆیـە خـوا ﷻ باشـترین شـتانێك كـە ئێمـە پێـمان شـك دێـن، دەفەرمـوێ: ئەهلـی بەهەشـت بەوانـە دەڕازێنرێنـەوە، ئەگەرنـا وەك عەبدوڵـڵای کـوڕی عەبـاس (خـوا لـە خـۆی و بابـی ڕازی بـێ) قسـەیەکی جوانـی هەیـە دەڵـێ: {ئەوانـەی خـوا باسـیان دەکات لـە نـازو نیعمەتـی بەهەشـت، تەنیـا لەنـاودا لەگـەڵ شـتەکانی دنیـادا تێـك دەکەنـەوە، ئەگەرنـا لـەڕووی نێوەڕۆکـەوە زۆر بەرزتـرن}.

کـە بێگومـان وایـەو، نیعمەتەکانـی دنیـا لـە قـەدەر ژیانـی دنیـان و، نیعمـەتی بەهەشـتیش لـە قـەدەر بەهەشـتە، نیعمەتەکانی دنیا لـە قـەدەر خەڵکـی دنیـان، کـە کافـرو مسـوڵمانیان تێـدان، بـەڵام هـی بەهەشـت، لەقـەدەر خەڵکـی بەهەشـتن، کـە تەنیـا دۆسـتانی خـوان، ئەوانیـش دیـارە هـەر کەسـە، بـە پلـەی خـۆی.

﴿ وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِيٓ أَذۡهَبَ عَنَّا ٱلۡحَزَنَۖ ﴾، گوتیـان: سـتایش بـۆ ئـەو خوایـەی کـە دڵتەنگیـی و خـەم و پـەژارەی لـێ لابردوویـن، ﴿ إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٞ شَكُورٌ ﴾، بـە دڵنیایـی پەروەردگارمـان زۆر لێبوردەیـە زۆریـش سوپاسـگوزارە.

﴿ ٱلَّذِیٓ أَحَلَّنَا دَارَ ٱلۡمُقَامَةِ مِن فَضۡلِهِۦ ﴾، ئـەو كەسـەی كـە نیشـتەجێی كردوویـن لـە شـوێنی نیشـتەجێبووندا، لـە بەخششـی خـۆی، ﴿ لَا یَمَسُّنَا فِیهَا نَصَبٌ وَلَا یَمَسُّنَا فِیهَا لُغُوبٌ ﴾، نەماندوێتییـمان لەوێـدا تـووش دەبـێ، نـە شـەكەتیمان لەوێـدا بەسـەردێ، تەنیـا شـوێنی پشـوودان و ئیسـڕاحەتەو، بـەس شـوێنی تێـدا بەختـەوەر بـوون و سـەرفرازییە.

ئنجا دوای ئـەوەی خـوا باسـی ئەوانـەی كـرد، كـە لـە بەخششـی گـەورەی خـۆی پێیـان دەدات، ئنجـا باسـی سـەرەنجامی شـوومی ئەوانـەش دەكات، كـە ئاییـن و بەرنامـەو پەیامـی خوایـان ڕەتكردۆتـەوە، دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱلَّذِینَ كَفَرُوا۟ لَهُمۡ نَارُ جَهَنَّمَ ﴾، ئەوانـەی بێبـڕوان (واتـە: بێبڕوابـوون بـەو شـتانەی پێویسـت بـوو بڕوایـان پـێ بهێنـرێ) ئەوانـە ئاگـری دۆزەخیـان هەیـە، ﴿ لَا یُقۡضَىٰ عَلَیۡهِمۡ فَیَمُوتُوا۟ ﴾، بڕیاریـان بەسـەردا نـادرێ، كـە بمـرن، واتـە: بڕیـاری مەرگیـان بەسـەردا نـادرێ و لـە دۆزەخـدا مـردن نیـە، وەك دەفەرمـوێ: ﴿ ثُمَّ لَا یَمُوتُ فِیهَا وَلَا یَحۡیَىٰ ﴾، دوایـی لەوێـدا نـە دەژی و نەدەمـرێ، واتـە: نـە ئەوەیـە كـە كۆتایـی پـێ بـێ، نـە ئەوەشـە ژیانێـك بـژی كـە پێـی بگوتـرێ: ژیـان.

﴿ وَلَا یُخَفَّفُ عَنۡهُم مِّنۡ عَذَابِهَا ﴾، هەروەهـا نـە سـزاو ئـازاری دۆزەخیشـیان لەسـەر سـووك دەكـرێ، ﴿ كَذَٰلِكَ نَجۡزِی كُلَّ كَفُورٍ ﴾، هـەر بـەو شـێوەیە سـزای هـەر كەسـێكی زۆر سـپڵە، كـە پێنەزانـن بەرانبـەر چاكەكانـی خـوا، دەدەینـەوە، ﴿ كَفُورٍ ﴾ لێـرەدا واتـە: سـپڵە، لەبـەر ئـەوەی لەگـەڵ (شـكور)دا بـەراوردی پێكـراوە، كـە چەنـد جارێـك لـەم سـوورەتەدا هاتـوە، ﴿ كَفُورٍ ﴾ لێرەدا مەبەسـت پێـی: (كثـیر الكفـران)ە، واتـە: زۆر ناسـوپاس و پێنـەزان، ئەگەرنـا ﴿ كَفُورٍ ﴾، دەشـگونجێ مەبەسـت پێـی زۆر بێبـڕوا بـێ، بـەڵام سـیاقەكە مانایەكـەی دیكـە دەخـوازێ، ﴿ وَهُمۡ یَصۡطَرِخُونَ فِیهَا ﴾، ئـەوان لەوێـدا هـاوارو بـڕۆ دەكـەن، (یَصْطَرِخُون، اصْطـراخُ: إفْتِعَـالٌ مِـن الـصُّراخ)، (صُراخ) واتـە: هاواركـردن بـە دەنگـی بـەرز، لـە كوردییـدا پێـی دەڵێـن: هـاوارو بـڕۆو دادو فیغـان، ﴿ وَهُمۡ یَصۡطَرِخُونَ فِیهَا ﴾، ئـەوان

لەوێـدا لـە ناێـو دۆزەخـدا هاواردەکـەن، هـاوارو بـرۆ دەکـەن، دەڵێـن چـی؟ ﴿رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا نَعْمَلْ صَٰلِحًا غَيْرَ ٱلَّذِى كُنَّا نَعْمَلُ﴾، پەروەردگارمـان! دەرمانبێنـە کـردەوەی بـاش دەکەیـن جیـا لـەوەی دەمانکـرد، واتـە: جۆرێکـی دیکـە کـردەوە دەکەیـن کـە جێـگای ڕەزامەندیـی تۆبـێ، بـەڵام ئایـا وەڵامـی ئـەو داوایەیـان دەدرێتـەوە؟ ﴿أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ﴾، خـوا فریشـتەکان ڕادەسـپێرێ پێیـان بڵێـن: ئایـا بایـی ئەوەنـدە تەمەنمـان پـێ نەدابـوون، ئەگـەر کەسـێك ویسـتبای بیـری بکەوێتـەوە، بیـری دەکەوتـەوە؟! ﴿وَجَآءَكُمُ ٱلنَّذِيرُ﴾، وریاکـەرەوەو هۆشیارکەرەوەشـتان بـۆ هـات، بێگومـان هۆشـیارکەرەوە پێغەمبەرانـن (عَلَيْهِـم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، بـەڵام وێـڕای پێغەمبـەران، هۆشـیارکەرەوەی دیکـەش زۆرن، وەك: نەخۆشـیی و ناخۆشـیی، کەوتنـە تەمـەن، نـازو نیعمەتەکانـی خـوا، ئنجـا کەسـێك کـە ئـەو نیعمەتانـەت پێـدەدا، دەبـێ سوپاسـی بکـەی، هەروەهـا لـە بەرانبەریـان دا بـەڵاو ناڕەحەتییـەکان، هـەن کـە زللـەی میهرەبانییـن، بـۆ ئـەوەی مـرۆڤ هۆشـیار بێتـەوە، ﴿فَذُوقُوا۟﴾، بـەڵام ئێـوە هـەر هۆشـیار نەبوونـەوە، کەواتـە: سـزای دۆزەخ بچێـژن، ﴿فَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ﴾، بێگومـان سـتەمکاران هیـچ پشـتیوان و یارمەتیدەریـان نیـە، کـەس نیـە لـە فریایـان بێـت و، خۆشـیان خۆیـان پـێ دەربـاز ناکـرێ، خـوا پەنامـان بـدات.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**سەرنجڕاکێشانی مرۆڤان بۆ نیعمەتی دابەزاندنی ئاو لەسەرێوەو، ڕوێنرانی درەختانی میوە ڕەنگ جۆراو جۆر، هەروەها چیایە ڕێ و هێڵە سپیی و سوورو ڕەشە تۆخ و جۆراو جۆرەکان، هەروەها مرۆڤ و ژیاندارو ئاژەڵە ڕەنگ جۆراو جۆرەکان و، جەختکردنەوە لەسەر سام و هەیبەت هەبوونی بەندە زانایەکان بەرانبەر بە خوا ﷻ وەك بۆ خوا شایستەیە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ ثَمَرَاتٍ مُّخْتَلِفًا أَلْوَانُهَا وَمِنَ الْجِبَالِ جُدَدٌ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَانُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ ﴿٢٧﴾ وَمِنَ النَّاسِ وَالدَّوَابِّ وَالْأَنْعَامِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ كَذَٰلِكَ إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ ﴿٢٨﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً﴾، ئایا نابینی کە خوا لە سەرێوە، لە ئاسمانەوە، ئاوی دابەزاندوە؟! وەك پێشتر گوتمان: لێرەدا مەبەست لە بینین: ﴿أَلَمْ تَرَ﴾، هەردووك ڕووەکەی تێدا دروستن: دەگونجێ بگوترێ: دیتنی چاویی مەبەستە، یان: دیتنی عەقڵیی مەبەستە، لەبەر ئەوەی دابەزاندنی ئاو لەسەرێوە، بە شێوەی باران و بەفرو تەرزە، هەم بە چاوی سەر دەبینرێ، هەم بە عەقڵ و هۆشیش دەرك دەكرێ، دەشگونجێ لەیەك کاتدا هەردووکیان مەبەست بن: ئایا بە چاوی سەر نەتاندیوەو، بە چاوی عەقڵ و دڵیش سەرنجتان نەداوە، کە خوا ﷻ لەسەرێوە ئاوی دابەزاندوە؟!

٢)- ﴿ فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ ثَمَرَٰتٍ مُّخْتَلِفًا أَلْوَٰنُهَا ﴾، ئنجا پێمان دەرهێنا بەو ئاوە، (بێگومان لە زەوی) چەند میوەیەك كە ڕەنگەكانیان جۆراوجۆرن، كە دەفەرموێ: ﴿ فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ ثَمَرَٰتٍ مُّخْتَلِفًا أَلْوَٰنُهَا ﴾، لەبەر ئەوەی (ألوان) بۆ خۆی بكەر (فاعل)ەكەیەو، لەبەر ئەوەش كە كۆیە بۆ شتانێك كە خاوەنی عەقڵ و هۆش نین، بۆیە فرتێترانی (ت)ی مێینە لێی دروستە، یانی خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ مُّخْتَلِفًا أَلْوَٰنُهَا ﴾، نەیفەرمووە: (مُختَلِفَةً أَلْوَانُهَا)، لەبەر ئەوەی لە ڕێزمانی عەرەبییدا، كۆی ئەو شتانەی خاوەنی عەقڵ و شعوور نین، دەگونجێ كە (تاء التأنیث)ی پێوە نەبێ و، دەشگونجێ پێیەوە بێت.

كـە دەفەرمـوێ: ﴿ فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ ﴾، بێگومـان ئەمـە ئاوڕدانـەوە (إلتفـات)ە، پێشـێ لـە شـێوەی دواندنـی نادیـار بـۆ قسـەكردن، چونكـە پێشـێ دەفەرمـوێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً ﴾، بـە شـێوەیەكی نادیـار، پاشـان دەفەرمـوێ: ﴿ فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ ﴾، ئەمـە ئاوڕدانەوەیـە لـە شـێوە قسـەكردنی نادیـارەوە بـۆ شـێوە قسـەكردنی دوانـدنی ڕووبـەڕوو، چونكـە چاكـەی خـوا ﷻ لـەوەدا كـە میـوە جـۆراو جۆرەكانـی دەرهێنـاون لـە زەوی، ئـەو چاكەیـە گەورەتـرو گرنگـترە لـە دابەزاندنـی ئاوەكـە.

٣)- ﴿ وَمِنَ ٱلْجِبَالِ جُدَدٌۢ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهَا ﴾، لە چیایەكانیش هێڵە سپییەكان و سوورە ڕەنگ جۆراوجۆرەكان هەن، (جُدَد) كۆی (جُدَّة)یە، واتە: هێڵ و خەت، یان ڕێگاو دەمار، هێڵە سپیی و سوورەكان هەن، ڕەنگیان جۆراو جۆرە.

٤)- ﴿ وَغَرَابِيبُ سُودٌ ﴾، هەروەها ڕەشە تۆخەكانیش هەن، (غرابیب) كۆی (غِربِیب)ە، كە بە واتای زۆر تۆخ دێ، كە دەگوترێ: (أَسوَدٌ غِربِیب) واتە: ڕەشێكی زۆر تۆخ، هەروەك دەگوترێ: (أَصفَرٌ فَاقِع، وَأَبیَضٌ نَاصِع، وَأَحمَرٌ قَانٍ)، واتە: زەردێكی زۆر تۆخ، سپییەكی زۆر سپیی، سوورێكی زۆر تۆخ.

(جُـدَد جَمـعُ جُـدَة، الخَـطُ وَالطَّرِيقَـةُ فِي شَيءٍ تَكُـونُ وَاضِحَـةً فِيـهِ)، واتـە: ڕێیـەك و دەمارێـك لـە شـتێكدا كـە بـە ئاشـكرا تێیـدا دیـار بـێ.

٥)- ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ وَٱلدَّوَآبِّ وَٱلْأَنْعَٰمِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ كَذَٰلِكَ ﴾، هەروەها لە خەڵك و لە ژیانداران و لە ئاژەڵانیش، دیسان هەر بەو شێوەیە ڕەنگی جیاواز هەیە، مرۆڤ و هەندێ لە ژیانداران، ڕەنگی جیاوازیان هەیە، سپییان هەیە، ڕەشیان هەیە، سووریان هەیە، زەردیان هەیە، مۆرو بۆریان هەیە، خاكییان هەیە.

كە دەفەرموێ: (كَذَٰلِكَ)، ئەمە دەگونجێ پەیوەندیی بە فەرمایشتی پێشەوە هەبێ، واتە: ئەوانیش بە هەمان شێوە ڕەنگیان جیا جیایە، دەشگونجێ ئەم (كَذَٰلِكَ)، مەبەست پێی دەستپێكردنی قسەیەك بێ، وەك چۆن دەڵێی: ئەوە بەم شێوەیە، یان: ئەوەبا لەوێ بێ، ئنجا دوایی دەست بە قسەی دیكە دەكەی، ئنجا ئەگەر وابێ ئەوكاتە: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ وَٱلدَّوَآبِّ وَٱلْأَنْعَٰمِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ ﴾، دەخوێنرێ ئنجا دوایی: (كَذَٰلِكَ)، بەجیا دەخوێنرێتەوە.

٦)- ﴿إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُاْ ﴾، بێگومان لە بەندەكانی خوا تەنها زانایان سام و هەیبەتیان لێی هەیە، وشەی (خَشیَة) بریتیە لە لێترسان بە مەزنگرتنەوە، بۆیە من وشەی سام و هەیبەت زیاتر بەكاردێنم، چونكە بەڕاستیی وەك زۆرجاران گوتوومانە: نەك هەر زمانی كوردیی، بەڵكو هەموو زمانەكان لە بەرانبەر زمانی عەرەبییداو، زمانی عەرەبییش لەبەرانبەر وشەو تەعبیرەكانی قورئاندا، هەژارن.

مەبەست لە بەندە زانایەكان ئەوانەن كە زانان بە دروستكراوەكانی خوا، چونكە خوا ﷻ سەرەتا باسی ناردنە خواری ئاو لە ئاسمانەوە دەكات، ئنجا پێ ڕواندنی میوە ڕەنگ جۆراو جۆرەكان و، دوایی ڕەنگی چیایەكان و، دوایی باسی ڕەنگاو ڕەنگی مرۆڤان و ژیانداران و ئاژەڵان دەكات، سەرەنجامیش دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُاْ ﴾، كەواتە: ئەو زانایانەی بە دروستكراوەكانی خوا زانان، سام و هەیبەتیان بەرانبەر بە خوا هەیە.

٧)-﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ ﴾، بە دڵنیایی خوا زاڵی لێبووردەیە، واتە: خوا زاڵەو بێ نیازە لە ئیمانی خەڵك، بەڵام لێبووردەشە بۆ كەسانێك بگەڕێنەوە، دوای ئەوەی ماوەیەك سەرەڕۆ بوون و بەملاولادا ترازاون و ڕۆیشتوون.

چۆنیەتیی پەیوەست بوونی ئەم دوو ئایەتەش بە ئایەتەکانی پێشەوە، ئەوەیە کە خوا ﷻ هەر لەسەر باسکردنی چاکەکانی خواو بەڵگەکانی خواناسیی بەردەوامەو، ئەمە باسی جۆراو جۆر بوونی دروستکراوەکانی خواو جۆراو جۆر بوونی ڕەنگەکانیانە، پاشان زەمینەسازییە بۆ خستنەڕووی پێگەی زانایان بە هەردوو کتێبی گەردوون و قورئان، بەهەردوو کتێبەکەی خوا: کتێبی خوێنراوەی خواو، کتێبی بینراوی خوا، (كِتَابُ اللهِ المَقْرُوء ، وَكِتَابُ اللهِ المَنظُور)، ڕوونکەرەوانی قوڕئانیش لە بارەی (زانایان)ەوە، لەم ئایەتەدا چەند ڕایەکیان هەن، هەندێکیان ڕایان وایە: زانایانی شەرعزانن و، هەندێکیش گوتوویانە: مەبەست زانایانی گەردووناسە.

بەڵام دەڵێم: مەبەست لە (العُلَمَاء) لێرەدا زانایانێکە کە شارەزان بە دروستکراوەکانی خواو، بە یاساکانی خوا، هەم بەوەی خوا دروستیکردوە، هەم بەوەی کە خوا فەرمانی پێکردوە: (عُلَمَاء بِخَلقِ اللهِ وَأَمرِهِ)، هەڵبەتە بەبێ شارەزاییش بە کتێبی خواو، شارەزابوون بە دروستکراوانی خوا، ئەو هەست و هۆشە بە مرۆڤ نادات کە دەستی خواو، سیفەتەکانی خوا لە دروستکراوەکانیدا ببینێ و، دیاردە سرووشتییەکان وەك نیشانەکانی خوا ﷻ ببینێ، کەواتە: بەبێ شارەزایی لە کتێبی خواو، لە وەحیی و پەیامی خوا، بەبێ خواناسیی ڕاست و دروست، کە بەهۆی کتێب و وەحیی و پەیامی خواوە بۆ مرۆڤ دەستەبەر دەبێ، مرۆڤ با شارەزاش بێ بە دروستکراوەکانی خوا، بەڵام بەو چاوە نایانبینێ کە سیفەتەکانی خوای پەروەردگاریان تێدا ببینێ.

ئەمەش ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە کەسێك ترس و سامی بەرانبەر بەخوا نەبێ و، بە بەرزو مەزنی نەگرێ، زانا نیەو بە زانا لە قەڵەم نادرێ، چونکە تۆ ئەگەر دروستکراوەکان هەموویان بناسی، بەڵام دروستکەرەکەیان نەناسی، هەموو ڕێك و پێکییەکە ببینی، بەڵام ڕێکخەرەکەی نەبینی، هەموو سیستم و یاسایەکان ببینی، بەڵام سیستم دانەرو یاسا دانەرەکە نەبینی، ئەوە چ زانیارییەکە؟! هەروەها

کەسێکیش کە شارەزای کتێب و پەیام و وەحیی خوا نەبێ و، نەزانێ خوا چی لە مرۆڤەکان و لە بەندەکانی ویستوە؟ بێگومان بە زانا لەقەڵەم نادرێ، چونکە کەسێك نەزانێ لە کوێ هاتوەو، بۆ کوێ دەڕواو، بۆچی هاتوەو، کێ هێناویەتی و دەبێ چی بکات و چۆن بکات؟ کەسێك وەڵامی ئەو پرسیارە وجوودییانە نەزانێ و، نەزانێ بۆ خۆی چییە؟ ئەم گەردوونە چییە؟ کێ خاوەنیەتی؟ لە کوێ هاتوە؟ بۆ کوێ دەچێ؟ لە ڕاستییدا بە زانا لە قەڵەم نادرێ.

دەتوانین بڵێین: زانیاریی دەبێتەوە بە سێ جۆری سەرەکیی:

**یەکەم:** زانیاریی بە خوا (**العِلمُ باللهِ**).

**دووەم:** زانیاریی بە بەرنامەو پەیامی خوا (**العِلمُ بِأمرِ اللهِ**).

**سێیەم:** زانیاریی بە دروستکراوی خوا (**العِلمُ بِخَلقِ اللهِ**).

زانا (عَالِم) کەسێکە ئەو سێ زانیارییەی تێدا کۆبووبنەوە، هەم خوا بناسێ و، پێی زانا بێ بە سیفەتەکانی و بە ناوەکانی، بەوە کە خوا ﷻ چ زاتێکە، پاشان دروستکراوەکانی بۆچی هێناوەنە دی و حیکمەت چییە لە ژیانی مرۆڤدا، خوا بناسێ و، بەرنامەو پەیامی خوا بزانێ و، بە دروستکراوەکانی خواش لە قەدەر خۆی ئاشنا و شارەزابێ.

## پێنج کورتە سەرنج لە بارەی ڕەنگەکانەوە

**سەرنجی یەکەم:** هۆی دەرکەوتنی ڕەنگەکان، ئەوەیە کە تەنەکان (أَجْسَام) هەموو تیشکەکانی دیکە دەمژن، جگە لەو ڕەنگانەی کە دەرکەوتوون، بۆ وێنە: ئاسمان هەموو ڕەنگەکان دەمژێ، جگە لە ڕەنگی شین، ئاو هەموو ڕەنگەکان دەمژێ، جگە لە ڕەنگی سەوزی شین باو، دارو درەخت هەموو ڕەنگەکان دەمژن، جگە لە ڕەنگی سەوزو ئەو دەردەکەوێ، گوڵێك كە سوورە، هەموو ڕەنگەکان دەمژێ، جگە لە ڕەنگی سوور، ڕەنگە سوورەكە دەردەكەوێ، لەڕووی زانستییەوە ئاوایە.

**سەرنجی دووەم:** ڕەنگەکان چەند ڕۆڵێك دەگێڕن، بۆ وێنە:

**١)- ناسینەوەی شتەکان، زۆرجار بە هۆی ڕەنگیانەوە شتەکان دەناسرێنەوە.**

**٢)- جوانیی و ڕەونەق دەدەن بە شتەکان.**

**٣)- زانینی گەیشتن و نەگەیشتن بۆ میوەو سەوزەو تەڕەکارو دانەوێڵە، چۆن دەزانین ئەو میوەیە گەیشتوە؟ بە ڕەنگەکەی دەزانین، ئەو تەڕەکارە ئەو دانەوێڵەیە، دانەوێڵە وەك (گەنم و جۆو نیسك و نۆك وبرنج و هەرزن و .... هتد).**

**٤)- ئارەزوو جووڵاندن (فَتحُ الشَّهيَة)، جاری وایە مرۆڤ بەهۆی ڕەنگی جوانی میوەیەکەوە، دڵی بۆی دەچێ، یان بەهۆی ڕەنگی جوانی خواردنێکەوە، دڵی بۆی دەچێ، بۆیە خوا لە سوورەتی (عبس)دا دەفەرموێ: ﴿ فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَـٰنُ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ ﴿٢٤﴾ ﴾، واتە: با مرۆڤ سەرنجی خواردنەکەی بدا، هەروەها لە بارەی میوەکانەوە لە ئایەتی (٩٩)ی سوورەتی (الانعام)دا دەفەرموێ: ﴿ ٱنظُرُوٓا۟ إِلَىٰ ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثْمَرَ وَيَنْعِهِۦٓ ﴾، واتە: تەماشای میوەکەی بکەن کە بەر دەردەکات و، تەماشای پێگەیشتنی بکەن.**

**سـەرنجی سـێیەم:** ڕەنگـی چیایـەکان بـۆ پێزانینـەوەی ڕێگەوبـان و شـوێنەکان و، بـۆ ڕێدەرکردنـی ڕێبـواران سـوودی هەیـە، زۆر جـار ڕێبـواران بەهـۆی ڕەنگـی چیایەکـەوە، یـان ڕەنگـی گـردو دەشـتێکەوە، ئەگـەر ڕێگایـان لـێ تێکچـوو، بـە ڕێگـە دەزاننـەوە، هەروەهـا بـۆ جوانیـی و ڕەونـەق، کـە جوانیـی توخمێکـی پێویسـت و ڕەچاوکـراوە لـە دروسـتکراوەکانی خـوادا.

**سـەرنجی چـوارەم:** ڕەنگـی مرۆڤـەکان جـۆراو جـۆرە، لەسـەر ئاسـتی گـەلان و هـۆزو تیـرەکان و کەسـەکان، هەندێکیـان سـوورو سـپین، هەندێکیـان ڕەشـن، هەندێکیـان گەنـم ڕەنگـن، هەندێکیـان مەیلـەو زەردن، ئـەوە لەسـەر ئاسـتی توخمـەکان و گـەلان و نەتـەوەکان، ئنجـا هـەر کامێـك لـە مرۆڤەکانیـش ڕەنـگ و سـیماو بیچمێکـی تایبـەت بەخـۆی هەیـە، کـە پێـی دەناسرێتـەوە.

**سـەرنجی پێنجـەم:** ڕەنگـی ئاژەڵـەکان و پەلـەوەرەکان، بـۆ ناسـینەوەیان و بـۆ جوانییـان، وەك خـوا لـە سـوورەتی (النحـل)دا دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَكُمْ فِيهَا جَمَالٌ حِينَ تُرِيحُونَ وَحِينَ تَسْرَحُونَ ﴿٦﴾ ﴾، واتـە: بـۆ ئێـوە جوانیـی هەیـە لـە ئاژەڵانـدا، کاتێـك ئێـواران دەیانهێننـەوەو، کاتێـك بەیانییـان دەریـان دەکـەن، (تُرِيحُون) لـە (إِرَاحَة)وە هاتـوە، واتە: دوای ئـەوەی دەیانلەوەڕێنـن، دەیانهێننـەوە، بۆچـی هێنانـەوە (إراحـة)ی پێشخسـتوە؟ چونکـە ئاژەڵـەکان کـە ئێـواران دەگەڕێنـەوە بە تێرو تەسـەلیی و، بە زەوق و خۆشـحاڵیی و بـە گوانـی پـڕ لـە شـیرەوە، دیمەنەکەیـان زۆر جوانـترە لـە دیمەنـی دەرکردنیـان لـە بەیانیـان دا بـەرەو لـەوەڕگا، بـە پەژموردەیـی و بەبرسـیەتیی، کـە ئـەو دیمەنـە جوانـەی ئێوارانیـان نیـە، بۆیـەش خـوا ئـەو دیمەنـە جوانـەی ئێوارانـی پێشخسـتوە، ﴿ وَلَكُمْ فِيهَا جَمَالٌ ﴾، واتـە: بـۆ ئێـوە لـە ئاژەڵەکانـدا جوانیـی هەیـە، جوانییەیـان کـەی زیاتـر دەردەکـەوێ؟ ﴿ حِينَ تُرِيحُونَ وَحِينَ تَسْرَحُونَ ﴿٦﴾ ﴾، واتـە: کاتێـك دەیانهێننـەوەو، کاتێـك دەریـان دەکـەن بـۆ لـەوەڕگا، کە لـەڕووی ڕیزبەندیـی کاتییـەوە، دەرکردنیان بـۆ لەوەڕگا لـە پێشـەوەیە، بـەڵام خـوای پـەروەردگار هێنانەوەیان لـە لەوەڕینی پێشخسـتوە، چونکە جوانییەکەیـان زیاتـر لەوحاڵـەدا بەرجەسـتە بـووە.

**مەسەلەی دووەم:**

**پێناسە کردنی زانایانی بۆ خوا صوڵحاو، بە سێ خەسڵەتی بنەڕەتییان و، سەرەنجامی خێریان و، پێناسەی قورئان:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَتۡلُونَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُواْ مِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ سِرّٗا وَعَلَانِيَةٗ يَرۡجُونَ تِجَٰرَةٗ لَّن تَبُورَ ﴿٢٩﴾ لِيُوَفِّيَهُمۡ أُجُورَهُمۡ وَيَزِيدَهُم مِّن فَضۡلِهِۦٓۚ إِنَّهُۥ غَفُورٞ شَكُورٞ ﴿٣٠﴾ وَٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ هُوَ ٱلۡحَقُّ مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِعِبَادِهِۦ لَخَبِيرُۢ بَصِيرٞ ﴿٣١﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم سێ ئایەتە، لە دە (١٠) بڕگەدا:**

١)- ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَتۡلُونَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ ﴾، واتە: بە دڵنیایی ئەوانەی کتێبی خوا دەخوێننەوەو، شوێنی دەکەون.

ئەمە پێناسەی زانایانێکی دڵ پڕ لە سام و هەیبەتە بەرانبەر بە خوا، (الطبري) لە تەفسیرە ناودارەکەی خۆی (جامع البیان)دا،[1] ئەم شوێنەوارەی هێناوە: (**عَنْ قَتَادَةَ، قَالَ: كَانَ مُطَرِّفٌ إِذَا مَرَّ بِهَذِهِ الْآيَةِ:** ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَتۡلُونَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ ﴾،[فاطر: ٢٩] **يَقُولُ: «هَذِهِ آيَةُ الْقُرَّاءِ»**).

واتە: قەتادە گوتوویەتی: موتەڕڕیف (کە یەکێکە لە زانایان)، کاتێک بەلای ئەم ئایەتەدا تێدەپەڕی (لە کاتی قورئان خوێندندا) کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَتۡلُونَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُواْ مِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ سِرّٗا وَعَلَانِيَةٗ يَرۡجُونَ تِجَٰرَةٗ لَّن تَبُورَ ﴿٢٩﴾ ﴾، دەیگوت: ئەمە ئایەتی زانایانە، کاتی خۆی وشەی (قُرَّاء) بە زانایان دەگوترا، ئەوانەی شارەزای قورئان بوون، ئەوانە زانا بوون.

---

(١ ) بە ژمارە: (٢٩٠٢٢).

کەواتــە: ئــەم ئایەتــە موبارەکــە پێناســەی زانایانێکــی لــە خواتــرس دەکات، کــە لــە ئایەتــی پێشــوودا خــوا باســیکردن و فەرمــووی: ﴿إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُاْ﴾، ئەوانــە کێــن؟ دوا بــە دوای ئــەوە دەفەرمــوێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَتْلُونَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ﴾، کەواتــە: ئەمانــە ســیفەت و خەســڵەتە بنەڕەتییەکانــی ئــەو زانایانــەن، کــە ســام و هەیبەتیــان هەیــە بەرانبــەر بــە خــوا ﷻ.

وشــەی (تِلاوَة)یــش جیــاوازە لــە وشــەی (قِــراءَة)، چونکــە خــوا ﷻ هەردووکیــانی بەکارهێنــاون، لــە ســوورەتی (الکهــف)دا دەفەرمــوێ: ﴿وَٱتْلُ مَآ أُوحِىَ إِلَيْكَ مِن كِتَابِ رَبِّكَ﴾، هەروەهــا لــە ســوورەتی (الأنفــال) دەفەرمــوێ: ﴿وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٢﴾﴾، بــە هەمــان شــێوە وشــەی (قِراءَة)ش هاتــوە، خــوا ﷻ دەفەرمــوێ: ﴿ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ﴿١﴾﴾، بــەڵام لێــرەدا بــا بزانیــن جیاوازیی نێــوان (تِــلاوَة) و (قِــراءَة) چییــە؟

لــەو بــارەوە ڕاغیبــی ئەصفەهانیــی لــە موفرەداتــە ناودارەکــەی خۆیــدا[1] دەڵــێ: **(التِّـلاوَةُ تَخْتَـصُ بِاتْبَاعِ كُتُـبِ اللّـهِ المُنَزَّلَـة تَـارَةً بِالقِـرَاءَةِ، وَتَـارَةً بِالإِرْتِسَـامِ لِـمَا فِيْـهِ مِـنْ أَمْـرٍ وَنَهِـيٍ وَتَرغِيـبٍ وَتَرْهِيْـب، وَهِـيَ أَخَـصُ مِـنَ القِـرَاءَة، فَـكُلُ تِـلَاوَةٍ قِـرَاءَةٌ، وَلَيْسَـتْ كُلُ قِـرَاءَةٍ تِـلاوَةً)**، واتــە: (تِــلاوَة) تایبەتــە بــە شــوێنکەوتنی کتێبــە دابەزێنراوەکانــی خــوا، هەندێــك جــار بــە خوێندنەوەیــان و، هەندێــك جــار بــە جێبەجێکــردن و، پابەندیــی بــەو فەرمــان و قەدەغانــەو بــەو هانــدان و ترســاندنانەی گرتوویانــە خۆیــان، (تِــلاَوَة) تایبەتــترە لــە (قِــرَاءَة)، هەمــوو (تِلاوَة)ێــك (قِــرَاءَة)ە، بــەڵام هەمــوو (قِرَاءَة)ێــك (تِلاوَة)نیــە.

چونکــە (تِــلاوَة) واتــە: هــەم خوێندنــەوەو، هــەم کارپێکــردن و شــوێنکەوتنی کتێبی خوا.

هەروەهــا هــەر ڕاغیبــی ئەســفەهانیی دەڵــێ: **(وَأَمّـا قَوْلـه تَعَـالَى: ثُمَّ: ﴿يَتْلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ ﴿١٢١﴾﴾البقـرة، وَالمـرَادُ بِـهِ الإِتِّبَـاع لَـهُ بِالعِلْـمِ وَالعَمَـل)**، واتــە: کــە دەفەرمــوێ:

---

(١ ) ص: (١٦٧ و ١٦٨).

ئەوانـەی وەك پێویسـت (تِلاوَة)ی کتێبـی خـوا دەکـەن، ئـەوە شـوێنکەوتنی کتێبـی خوایـە بـە زانیاریـی و کارپێکردنـەوە.

شـایانی باسـە: کـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَتۡلُونَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ﴾، بـە شـێوەی ڕانەبـردوو (مضـارع) هێناویەتـی.

٢)- ﴿وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ﴾، نوێژیان بەرپا کردوە، بە شێوەی ڕابردوو هێناویەتی.

٣)- ﴿وَأَنفَقُواْ مِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ سِرّٗا وَعَلَانِيَةٗ﴾، لەوەی پێمان داون بە پەنهانیی و، بە ئاشکرا دەبەخشن، دیسان بە شێوەی ڕابردوو هێناویەتی، دوایی دەفەرموێ: ﴿يَرۡجُونَ تِجَٰرَةٗ لَّن تَبُورَ﴾، ئومێدەواری بازرگانییەکن کە زیان ناکا، ئەمەش دیسان بە (مضارع) هێناویەتی، واتە بۆ ئێستاو بۆ داهاتوو، ئەمە زیاتر هونەری دەربڕین بەکارهێنان (تَفَنُّنٌ فِي العِبَارَة) و جۆراو جۆرکردنی دەربڕینەکانە، بۆ ئەوەی بابای گوێبیست، یان کەسێك کە قورئان دەخوێنێ، ماندوو نەبێ و، لەسەر یەك شێوەو ڕیتم نەڕواو جۆراوجۆر بێ.

هەندێکیـش لەوبـارەوە گوتوویانـە: (مَجِـيءُ الصَّـلاَةِ وَالإنْفَـاقِ بِصِيغَـةِ المُـضِيِّ لأَنَّ فَرْضهـما قَـدْ تَقَـرَّرَ سَـابِقاً)، بۆیـە بـۆ نوێـژو بەخشـین، بـە ڕابـردوو هێناونـی، چونکـە پێشـتر پێویسـتکراون، بـەڵام مـن پێـم وایـە کـە ئـەوەی دیکـە ڕێکـترە، بەڵـێ ئەوەشـی تێدایـە، بـەڵام ئـەوەی دیکـە گشـتگیرترو ڕێکـترە، چونکـە ئـەوە ڕەنگـە هەمـوو جـارێ ڕاسـت دەرنەچـێ و، خوێندنـەوەی کتێبـی خـواش هـەر لە سـەرەتاوە بووەو ئاشـکرایە: یەکەمیـن وشـە، لـە یەکەمیـن ئایـەت، لـە یەکەمیـن سـوورەت، کـە دابەزیـوە، بـە بخوێنـە دەسـتی پێکـردوە: ﴿ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ۝١﴾ العلـق.

هەڵبەتـە کـە دەفەرمـوێ: ﴿سِرّٗا وَعَلَانِيَةٗ﴾، دەڵـێ: (يَعنِـي: إِنفَـاقَ السـرُ، وَإِنفَـاقَ العَلانِيّـةِ)، واتـە: بـە بەخشـینی پەنهـان و، بەخشـینی ئاشـکرا، لـەوەی کـە پێمانـداون، دەبەخشـن، چونکـە: جـاری وایـە وا باشـە بـە پەنهانیـی ببەخـشرێ، لەبـەر ڕەچاوکردنـی حاڵەتـی بابـای خێرپێکـراوو هاوکارییکـراو، جاری واش هەیە وا باشـە بە ئاشـکرا ببەخشرێ، بـۆ ئـەوەی خەڵکێکـی دیکـەش تەماشـا بـکات و، هاوکاریـی زیاتر بـۆ بابـای هاوکارییکراو،

بێ، ئنجا ئێمە باسێکی خەست و خۆڵمان لەوبارەوە کردوە لە سوورەتی (البقرة) دا، لە تەفسیری لەو ئایەتەدا کە باسی ئەوە دەکات ئەوانەی بە ئاشکراو بە پەنهان و، بەشەو و بەڕۆژ دەبەخشن: ﴿ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُم بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ سِرًّا وَعَلَانِيَةً فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٢٧٤﴾ ﴾.

٤)- ﴿ يَرْجُونَ تِجَٰرَةً لَّن تَبُورَ ﴾، ئەوانە بە نومێدی بازرگانییەکن، زیان ناکات، (التِّجَارَةُ: مُسْتَعَارَةٌ لِلأَعْمَالِ الَّتِي يُزاولونها)، وشەی (التِّجَارَة): خوازراوەتەوە بۆ ئەو کردەوانەی، دەیانکەن، وەك بازرگانیی وان، چۆن کەسێك کە بازرگانیی و مامەڵەیەك دەکات، پێی ئومێدەوارە کە زیان نەکات، ئەو بازرگانییەی ئەوانیش هەرگیز زیان ناکات.

٥)- ﴿ لِيُوَفِّيَهُمْ أُجُورَهُمْ ﴾، تاکو (خوا) پاداشتەکانیان بە تەواویی بداتەوە.

(التَّوفِيَـةُ: جَعْلُ الشَّيْءِ وَافِيَاً أَي: تَامَّاً لاَ نَقْصَ فِيهِ وَلا غُبْنَـة)، واتە: (تَوفِيَـة) بریتیە لەوەی شتێك تەواو بکرێ و ڕێك بێ، هیچ نوقسانیی و زەرەری تێدا نەبێ.

کە دەفەرموێ: ﴿ لِيُوَفِّيَهُمْ أُجُورَهُمْ ﴾، لێرەدا (أُجُور) کۆی (أَجر)ە، واتە: پاداشت و کرێ، بۆ ئەوەی کرێیەکەیان بە تەواوی بداتەوە.

ئەم (ل)ەی (لِيُوفِّيَهُم)، زانایان بە دوو شێوە لێکیان داوەتەوە:

أ- هەندێکیان گوتوویانە: (لامُ عِلَّةٍ)، لامی هۆکار، بۆیە ئەو کردەوانە دەکەن، هۆکارو هاندەریان ئەوەیە کە خوا ﷻ بە تەواویی پاداشتەکانیان بداتەوە.

ب- هەندێکی دیکەش گوتوویانە: (لامُ عَاقِبَةٍ)، لامی ئاکام و سەرەنجامە، واتە: ئەو کردەوانە دەکەن، کە سەرەنجام خوا بە تەواویی پاداشتی کردەوەکانیان دەداتەوە.

٦)- ﴿ وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِۦٓ ﴾، هەروەها لە بەخششی خۆیشی بۆیان زیاد دەکات، واتە: هەر ئەوە نیە پڕ بە پێستی کردەوەکانیان پاداشتیان بداتەوە، بەڵکو لە بەخششی خۆیشی بۆیان زیاد دەکات، چونکە: وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا هاتوە ﷺ: بەهەشتی خواو پاداشتی خوا، بارتەقای کردەوەکانی ئێمەومانان نیەو زۆر لەوە زیاترە!

ئەگەر ئێمە لە ماوەیەكی كەمی تەمەنمان دا، كردەوەكانمان ئەنجامداون، بەڵام خوا بەهەشتێكی نەبڕاوەو بێ كۆتاییمان دەداتێ، ئنجا ژیانێكی بێ كۆتایی و پڕ نازو نیعمەتی خوایی، بارتەقای ئەوەندە كردەوانە نیە كە ئێمە ئەنجاممان داون.

٧)- ﴿إِنَّهُۥ غَفُورٌ شَكُورٌ﴾، بە دڵنیایی خوا زۆر لێبوردەیە، زۆریش سوپاسگوزارە، واتە: لە كەم و كوڕیی دەبووریٚ و، كەسێكیش چاكەی هەبێ، خوا سوپاسگوزارە و چاكەكەی نادیدە ناگریٚ.

٨)- ﴿وَٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ هُوَ ٱلۡحَقُّ﴾، {دوایی خوا ﷻ باسی كتێبی خۆی دەكات و پێناسەی دەكات، دەفەرمویٚ:} ئەوەی كە بۆ لای تۆمان سروشكردوە لە كتێب، بەس ئەوە هەقەو ڕاستە، پسپۆڕانی زمان لێرەدا لەبارەی (أل)ی (الكتاب)ەوە گوتوویانە:

(التَّعرِيفُ فِي الكِتَاب لِلعَهدِ)، واتە: ئەوەی بۆ تۆمان سروشكردوە لە كتێبەكە، هەر ئەوە ڕاستە، كە دەفەرمویٚ: ﴿مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ﴾، ئەم (من)ە بۆ ڕوونكردنەوەیە، چونكە پێشتر كە دەفەرمویٚ: ﴿وَٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ﴾، ئەوەی بۆ لای تۆمان سروشكردوە، جۆرێك لە ناداریی (إبهام)ی پێوە دیارە، بۆیە خوا ﷻ (من)ی خستۆتە سەر (الكِتَاب)، ﴿مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ﴾، ئەوەی بۆ تۆمان سروشكردوە لە كتێبەكە.

كە دەفەرمویٚ: ﴿هُوَ ٱلۡحَقُّ﴾، (هُوَ) ڕاناوی لێك جیاكردنەوە (ضَمِيرُ الفَصل) یە، كە لێرەدا كورت هەڵێنان دەگەیەنێ، واتە: بەس ئەوە هەقە، وشەی (الحَقُّ) یش كە (أل)ی ناساندنی لەسەرە، ناساندنەكە بۆ جینسە، یانی: تەواوی هەق و، هەموو تاكەكانی هەق، لەو كتێبەدا كۆبوونەوە.

٩)- ﴿مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ﴾، بە ڕاستدانەرە بۆ ئەوەی لە پێش دەستیەوەیەتی، واتە: لە كتێبەكانی خوا، ئەوەی كە سەلمێنراوەو چەسپاوە كتێبی خوان، وەك ئەسڵەكەیان، بەڕاستیان دەزانێ، بەڵكو جگە لە كتێبەكان، پێغەمبەرانیش (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) دەگرێتەوە، ئەوانەی كە لە پێش موحەممەدو قورئانەوە بوون، سەرجەم ئەو پێغەمبەرانەو، ئەو كتێبانەی خوا، هەموویان بەڕاست دەزانێ.

١٠)- ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِعِبَادِهِۦ لَخَبِيرٌۢ بَصِيرٌ﴾، بە دڵنیایی خوا بەرانبەر بە بەندەكانی زۆر شارەزای بینەرە، (**الخَبِيرُ: العَالِمُ بِدَقَائِقِ الأُمُورِ المَعقُولَةِ وَالمَحسُوسَةِ وَالظَّاهِرَةِ وَالخَفِيَّةِ**)، واتە: (**خَبِير**) كەسێكە زانابێ بە وردەكارییەكانی ئیشەكان، چ بە عەقڵ دەرك بكرێن، چ بەرهەست بن، چ ئاشكرابن، چ پەنهان بن، (**البَصِيرُ: العَالِمُ بِالأُمُورِ المُبصَرَةِ**)، واتە: زانا بە بەكارە بینراوەكان.

بەڵام ڕاست ئەوەیە كە بڵێین (**بَصِير**) واتە: بینەری سەرجەم كردەوەكان و، هەموو شتەكان و تێكڕای مرۆڤەكان و، پێویست بەوە ناكات (**بَصِير**) بە (**عَالِم**) لێك بدرێتەوە، هەندێك لە تەفسیرەكان ئەو تەعبیرەیان هێناوە، منیش هەروا بە ئانقەست هێنام، ئەگەرنا لە ڕاستییدا بینین سیفەتی خوایەو خوا دەبینێ، بەڵام بینینی خوا سیفەتێكی خوایەو، وەك زاتی خوایە، هەروەك خوا دەبیستێ، خوا فەرمایشت دەكات، سیفەتەكانی خوا بەو شێوەیەن كە بۆ خوا شایستەن، نەك بشوبهێنرێن بە سیفەتی دروستكراوەكانەوەو، ڕاستیش نیە بینین و بیستنی خوا، بە زانینی خوا، تەئویل بكرێن!

**مەسەلەی سێیەم:**

**پێناسەو پۆلێنکردنی بەندە هەڵبژاردەکانی شارەزای کتێبی خواو، خستنەڕووی بەخششی ناوازەی خوا بۆیان لە ڕۆژی دوایی دا، کە لە بەهەشتە ڕازاوەو، پڕ نازو نیعمەتەکانیدا بەرجەستە دەبێ:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ أَوْرَثْنَا الْكِتَابَ الَّذِينَ اصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِنَفْسِهِ وَمِنْهُمْ مُقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌ بِالْخَيْرَاتِ بِإِذْنِ اللَّهِ ذَلِكَ هُوَ الْفَضْلُ الْكَبِيرُ ﴿٣٢﴾ جَنَّاتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِنْ ذَهَبٍ وَلُؤْلُؤًا وَلِبَاسُهُمْ فِيهَا حَرِيرٌ ﴿٣٣﴾ وَقَالُوا الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَذْهَبَ عَنَّا الْحَزَنَ إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٌ شَكُورٌ ﴿٣٤﴾ الَّذِي أَحَلَّنَا دَارَ الْمُقَامَةِ مِنْ فَضْلِهِ لَا يَمَسُّنَا فِيهَا نَصَبٌ وَلَا يَمَسُّنَا فِيهَا لُغُوبٌ ﴿٣٥﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم چوار ئایەتە، لە چواردە بڕگەدا:

١)- ﴿ ثُمَّ أَوْرَثْنَا الْكِتَابَ الَّذِينَ اصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا ﴾، دوایی کتێبی خۆمان کردە میراتی ئەو بەندانەمان کە هەڵمانبژاردوون.

لێرەدا (ثُمَّ: لِلتَّرتِيب الرُّتبِي)، (ثم) بۆ ڕیزبەندیی پلەو پایەیە، چونکە ئەوە کە خوا کتێبی خۆی بدات بەو بەندانەی هەڵیبژاردوون، پلەکەی بەرزترە، لەوە کە بەندەکانی خۆی بە گشتیی لە کتێبی خۆی شارەزا بکات.

کە دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ أَوْرَثْنَا الْكِتَابَ ﴾، واتە: شارەزایی لە کتێبی خۆمان و، زانینی خوێندنەوەی کتێبی خۆمان و، کارپێکردنی کتێبی خۆمان، کردە میراتی بەندە هەڵبژاردەکانمان.

کە دەفەرموێ: (أَوْرَثْنا)، واتە: کردمانن بە میراتگر بۆ ئەو کتێبە، کە وشەی میراتگرتن (وراثة) بەمانای وەدەستهێنان دێ، بێ ئەوەی مرۆڤ پێیەوە ماندوو بووبێ و، بێ ئەوەی لە بەرانبەردا شتێك بدات، چونکە کەسێك کە میرات دەگرێ

لـە میرات لێگیراوێکـی خزمـی و ئـەو میراتـەی بـۆ دێ، هیـچ ئارەقـەی پێـوە نەکـردووە، هیچیشـی لـە بەرانبـەردا نـادات، خـواش ﷻ کتێـب و هیدایەتـی خـۆی دەبەخشـێ بـە ئـەو بەندانـەی کـە هەڵبـژاردوون، کـە پێیـەوە مانـدوو نەبـوون و، ئارەقەیـان پێیـەوە نەکـردوە، هیچیشـی لـە بەرنبـەردا نـادەن، بۆیـە وشـەی (أَوْرَثْنـا)ی بەکارهێنـاوە.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا﴾، بەتەئکیـد مەبەسـت پێـی بڕواداراـن، وەك خـوا ﷻ لـە سـوورەتی (الحـج) ئایەتەکانـی: (٧٧ و ٧٨)دا دەفەرمـوێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱرْكَعُوا۟ وَٱسْجُدُوا۟ وَٱعْبُدُوا۟ رَبَّكُمْ وَٱفْعَلُوا۟ ٱلْخَيْرَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ۝٧٧ وَجَـٰهِدُوا۟ فِى ٱللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِۦ ۚ هُوَ ٱجْتَبَىٰكُمْ ...﴾، واتـە: ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! ڕکـووع بـەرن و سـەجدە بـەرن و بەندایەتیـی بـۆ پەروەردگارتـان بکـەن و، چاکـە بکـەن، بەڵکـو سـەرفرازبن، هەروەهـا وەك بـۆ خـوا شایسـتەیە لـە پێنـاوی خـوادا تێبکۆشـن، خـوا ئێـوەی هەڵبـژاردوە...

کەواتـە: هەڵبژێـردراوەکان، بەنـدە ئیمانداراەکانـن، بـە تەئکیـد ئـەوەی کـە بـڕوادار نەبـێ، سـیفەتی هەڵبژاردنـی لـە لایـەن خـوای پـەروەردگارەوە بـۆ بەکارناهێـنرێ، دوایـی خـوا ﷻ بەنـدە هەڵبژاردەکانـی کـە کتێبـی خـۆی پێـداون و، لـە کتێبـی خـۆی دا شـارەزای کـردوون و، یارمەتییـداون کـە پابەندبـن بـەو کتێبـەوە، پۆلێنیـان دەکات بـۆ سـێ کۆمـەڵ:

٢)- ﴿فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ﴾، هەیانە ستەمکارە بەرانبەر بە خۆی.

٣)- ﴿وَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ﴾، هەشیانە میانجییە.

٤)- ﴿وَمِنْهُمْ سَابِقٌۢ بِٱلْخَيْرَٰتِ﴾، هەشیانە لە چاکەکاندا پێشکەوتۆتەوە.

٥)- ﴿بِإِذْنِ ٱللَّهِ﴾، بە مۆڵەتی خوا.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ﴾، مـادام سـتەمی لـە خـۆی کردبـێ، دیـارە گوناهـو کەموکوڕیـی و تاوانـی هەیـە.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿مُّقۡتَصِدٞ﴾، کـە وشـەی (مُقتَصِـد) (مفتعـل)ە لـە (قَصـد)ەوە، (وَهُـوَ الوَسَـطُ بَـینَ الطَّرَفَـینِ)، واتــە: نــە زۆر پێشــکەوتوە، نــە زۆریــش دواکەوتــوە، بەڵکـو میانجییــە.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿وَمِنۡهُمۡ سَابِقُۢ بِٱلۡخَيۡرَٰتِ﴾، دەڵـێ: (سَـابِق: الوَاصِـلُ إِلَى الغَايَـةِ المُعَيَّنَـةِ قَبـلَ غَـيرِه)، (سـابق) ئەوەیـە بگاتـە ئامانجێـك پێـش غەیـری خـۆی، واتـە: لـە پێشبڕکێدا پێشـکەوتوونەوە، (خَـیرات: جَمـعُ خَـیرٍ عَلَى غَـیرِ قِيَاسٍ، الخَـيرُ: النَّافِـع)، واتـە: (خَـیر) هەرشـتێکە سـوودو کەڵکـی هەبـێ، کـە (خَـیر) بـە (خَـیرَات) کۆدەکرێتـەوە، کەواتـە ﴿سَابِقُۢ بِٱلۡخَيۡرَٰتِ﴾، واتـە: لـە چاکەکانـدا پێـش کەوتۆتـەوە، بـەڵام ﴿بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ﴾، واتـە: بـە ئاسـانکاریی خـوا، (إذن) لێـرەدا بـە مانـای فەرمـان نیـە، بەڵکـو بـە مانـای ئاسـانکاریی و هاوکاریـی و یارمەتیـی خوایـە ﷻ.

٦)- ﴿ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَضۡلُ ٱلۡكَبِيرُ﴾، ئـا ئـەوە بەخششـی گەورەیـە، لێـرەدا هەندێـك لـە زانایـان گوتوویانـە: مەبەسـت پێـی هەرسێکیانە، چ ئـەوەی سـتەمی لـە خـۆی کـردوەو، چ ئـەوەی میانجییـەو، چ ئـەوەی پێشـکەوتۆتەوە لـە چاکەکانـدا.

هەندێکیـش گوتوویانــە: نەخێـر! مەبەسـت پێـی تەنیـا کۆمەڵـی سـێیەمە، کـە دەفەرمـوێ: ﴿وَمِنۡهُمۡ سَابِقُۢ بِٱلۡخَيۡرَٰتِ﴾، واش پێدەچـێ لێـرەدا: ﴿ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَضۡلُ ٱلۡكَبِيرُ﴾، ئـا ئـەوە بەخششـی گەورەیـە، هـەر تاقمـی سـێیەمی مەبەسـت بـێ، چونکـە خـوا ئـەو بەخششـە گەورەیـەی هـەر بـەوان داوە، هەڵبەتـە ئەوانـی دیکـەش کـەم و زۆر بەشـیان لـە بەخششـی خـوادا هەیـە، مـادام شـارەزان لـە کتێبـی خـواو، مـادام بەگشـتیی خـوا هەڵیبـژاردوون، بـۆ شـوێنکەوتنی کتێبـی خـۆی و، تێـدا شـارەزابوونی، بـەڵام ئـەوەی کـە بـەوان دراوە، پێـی ناگوتـرێ بەخشـشێکی گـەورە، هەڵبەتـە دوایـی زیاتـر تیشـك دەخەینـە سـەر چەمکـی ئـەو ئایەتـە موبارەکـە.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَضۡلُ ٱلۡكَبِيرُ﴾، (الفَضـل: زِيَـادَةٌ فِي الخَـيرِ)، (فَضـل) بریتیـە لـە زێدەیـی لـە چاکـەدا، هەروەهـا زانایـان گوتوویانـە: (فَضـل) بریتیـە

لـەوە کـە ئـەو کەسـەی شـتێك دەبەخشـێ، لەسـەری پێویسـت نەبـێ بیبەخشـێ، واتـە: بەبـێ بەرانبـەر ببەخشـێ و، بەبـێ ئـەوەی لەسـەری پێویسـت بـێ.

ئنجـا خـوا ﷻ ئـەو بەخشـشـە گـەورەی خـۆی شـیدەکاتەوە، کـە چۆنـە؟ کـە لـە ڕۆژی دوایـی دا بەرجەسـتە دەبـێ لـە پاداشـتی خوادا، جـا ئەوەمان بـۆ شـیدەکاتەوە، دەفەرموێ:

٧)- ﴿ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ يَدۡخُلُونَهَا ﴾، {ئەو بەخشـشە گەورەیەش} چەند باخێکی هەمیشەیین دەچنە نێویان.

٨)- ﴿ يُحَلَّوۡنَ فِيهَا مِنۡ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٖ وَلُؤۡلُؤٗا ﴾، لەوێدا دەڕازێنرێنەوە بە بازنە زێڕەکان و بە گەوهەر.

خوێندراویشـەتەوە: (وَلُؤلُـؤٍ)، بـە بازنـی زێـڕ و بـە بازنـی گەوهـەر، دەڕازێنرێنـەوە، بـەڵام خوێندنـەوەی: (ولؤلـؤاً)، واتـە: دەشـڕازێنرێنەوە بـە گەوهـەرەکان، مـەرج نیـە بۆیـان بکرێنـە بـازن، (يُحَلَّـونَ: أي يُجعَـلُ عَلَيهِـمُ الحُـلِيُّ)، واتـە: خشـڵیان دەدرێتـێ، خشـڵیان لەسـەر جەسـتە دادەنـرێ، پێشـتر گوتمان: (أسَـاوِر) کـۆی (أسـوِرَة)یە، (أسـوِرَة) ش کـۆی (سِـوَار)ە، کەواتـە (أسَـاوِر) کـۆی کۆیـە.

٩)- ﴿ وَلِبَاسُهُمۡ فِيهَا حَرِيرٞ ﴾، پۆشاکیشیان لەوێدا، {لەو بەهەشت و باخانەدا} بریتیە لە ئاوریشم.

١٠)- ﴿ وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِيٓ أَذۡهَبَ عَنَّا ٱلۡحَزَنَ ﴾، هەروەها گوتیان: ستایش بۆ ئەو خوایەی دڵتەنگیی و (خەم و پەژارەی) لێ لابردین.

١١)- ﴿ إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٞ شَكُورٌ ﴾، بەدڵنیایی پەروەردگارمان زۆر لێبوردەی سوپاسگوزارە، لێبوردەیە بۆ تاوان و سەرپێچیی و کەم و کورِییەکان و، سوپاسگوزاریشە بۆ چاکەو فەرمانبەرییان.

١٢)- ﴿ ٱلَّذِيٓ أَحَلَّنَا دَارَ ٱلۡمُقَامَةِ مِن فَضۡلِهِۦ ﴾، ئەو کەسەی ئێمەی لە مەنزڵگای مانەوەدا، مەنزڵگای ژیانی هەمیشەییدا، نیشتەجێ کرد، لە بەخششی خۆیەوە.

(**المُقَامَـةُ: مَصـدَرٌ مِيمِـيٌ مِـن أَقَـامَ بِالمَـكَانِ أَي: قَطَنَـهُ، وَالمُـرادُ دَارُ الخُلُـود**)، واتـه: (**مُقَامَـةُ**) چاوگـی میمییـه یـانی: نیشـتەجێبوون، دەگوتـرێ: (**أَقَـامَ بِالمَـكَانِ أي: قَطَنَـهُ**)، لـه شـوێنەکەدا نیشـتەجێ بـوو، کـه مەبەسـت پێـی مەنزڵـگای ژیانـی هەمیشـەیی و نەبڕاوەیـە.

١٣)- ﴿لَا يَمَسُّنَا فِيهَا نَصَبٌ﴾، هیچ جۆرە ماندوویەتییەکمان لەوێدا تووش نابێ، (**مَسُّهُ**) واتە: تووشی بوو، با بەکەمییش بێ، تۆزێ ماندوێتییشمان لەوێدا تووش نابێ.

١٤)- ﴿وَلَا يَمَسُّنَا فِيهَا لُغُوبٌ﴾، هەروەها لەوێدا هیچ جۆرە شەکەتییەکمان تووش نابێ، (**النَّصَبُ: التَّعَبُ**) ماندوویەتیی، بەڵام (**اللُّغُوبُ: الإعيَاءُ مِن جَرَّاءِ عَمَلٍ أَو جَرِيٍ، أَو أَشَدُّ التَّعبِ**)، واتە: (**لُغُوب**) بریتیە لە شەکەتیی لە ئەنجامی کارێك، یان لە ئەنجامی ڕاکردندا، کە ئینسان شەکەت دەبێ و فززەی لێ دەبڕێ، هەندێکیش گوتوویانە: (**لُغُوب**) یانی: ئەوپەڕی ماندووێتیی، بەڵام ئێمە لە کوردییدا بە (**تعب**) دەڵێین: ماندووێتیی، بۆ (**لُغُوب**)یش شەکەتیی و بڕست لێبڕان، بەکاردەهێنرێ.

## پێنج کورتە سەرنج لە بارەی پۆلێنکردنی بەندە هەڵبژاردەکانی خواوە:

**سەرنجی یەکەم:** هەندێك قسەی (القرطبي)ە، خاوەنی (الجامع لأحكام القرآن)[1]، چەند قسەیەك دێنێ، بە چاكم زانی دەقی قسەكانی بێنم، بە تۆزێك ڕوونكردنەوەوە دەڵێ:

**(هَذِهِ الآيَةُ مُشْكِلَةٌ، لِأَنَّهُ قَالَ جَلَّ وَعَزَّ: اصْطَفَيْنا مِنْ عِبادِنا» ثُمَّ قَالَ: «فَمِنْهُمْ ظالِمٌ لِنَفْسِهِ وَقَدْ تَكَلَّمَ الْعُلَمَاءُ فِيهَا مِنَ الصَّحَابَةِ وَالتَّابِعِينَ وَمَنْ بَعْدَهُمْ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ فَمِنْهُمْ ظالِمٌ لِنَفْسِهِ» قَالَ: الْكَافِرُ، وَقَالَ الْحَسَنُ: أَيْ فَاسِقٌ. وَيَكُونُ الضَّمِيرُ الَّذِي فِي يَدْخُلُونَهَا» يَعُودُ عَلَى الْمُقْتَصِدِ وَالسَّابِقِ لَا عَلَى الظَّالِمِ. قَالُوا: وَهَذِهِ الْآيَةُ نَظِيرُ قَوْلِهِ تَعَالَى فِي سُورَةِ الْوَاقِعَةِ «وَكُنْتُمْ أَزْواجاً ثَلاثَةً» [الواقعة: ٧] الْآيَةَ. قَالُوا وَبَعِيدٌ أَنْ يَكُونَ مِمَّنْ يُصْطَفَى، ظَالِمٌ. وَقِيلَ: الضَّمِيرُ فِي يَدْخُلُونَهَا» يَعُودُ عَلَى الثَّلَاثَةِ الْأَصْنَافِ، عَلَى أَلَّا يَكُونَ الظالم ها هنا كَافِرًا وَلَا فَاسِقًا، وَالتَّقْدِيرُ عَلَى هَذَا الْقَوْلِ: أَنْ يَكُونَ الظَّالِمُ لِنَفْسِهِ الَّذِي عَمِلَ الصَّغَائِرَ، وَقَوْلٌ ثَالِثٌ- يَكُونُ الظَّالِمُ صَاحِبُ الْكَبَائِرِ، وَالْمُقْتَصِدُ الَّذِي لَمْ يَسْتَحِقَّ الْجَنَّةَ بِزِيَادَةِ حَسَنَاتِهِ عَلَى سَيِّئَاتِهِ، فَيَكُونُ: «جَنَّاتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَها» لِلَّذِينَ سَبَقُوا بِالْخَيْرَاتِ لَا غَيْرَ، وَهَذَا قَوْلُ جَمَاعَةٍ مِنْ أَهْلِ النَّظَرِ، لِأَنَّ الضَّمِيرَ فِي حقيقة النظر لما يَلِيهِ أَوْلَى).**

واتە: ئەم ئایەتە گرفت پەیداكەرە (بەڕواڵەت) چونكە خوا ﷻ پێشی فەرمووی: ﴿ ثُمَّ أَوْرَثْنَا ٱلْكِتَٰبَ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا ﴾، كتێبی خۆمان كردە میراتی ئەو بەندانەمان كە هەڵمان بژاردوون، دوایی فەرمووی: ﴿ فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ ﴾، هەیانە ستەم لە خۆكەرە (ئنجا كە ستەمی لەخۆی كردبێ، خوا

---

(١) ج١٤، ص(٢٧٦ و ٢٧٧).

چۆن هەڵیبژاردوە؟! مەبەستی ئەوەیە) زانایان لەو بارەوە هەم لەهاوەڵان و لە تابیعین و لە ئەوانەی دوای ئەوانیشەوە، لەو بارەوە قسەیان کردوە، (القرطبي)، سێ رایان دێنێ:

**ڕای یەکەم:** لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ) هاتوە، گوتوویەتی: ﴿فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ﴾، مەبەست پێی بابای کافرە، حەسەنی بەصرایی (رەحمەتی خوای لێ بێ) گوتوویەتی: مەبەست پێی بابای لادەر (فاسق)ە، کەواتە: ڕاناوی ﴿يَدْخُلُونَهَا﴾، دەگەڕێتەوە بۆ ﴿وَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌۢ بِٱلْخَيْرَٰتِ﴾، ئەوەی کە میانجییەو، ئەوەش کە لە چاکەکاندا پێشکەوتۆتەوە، واتە: ناگەڕێتەوە بۆ ستەمکار، ﴿فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ﴾، چ کافر بێ، چ فاسق بێ، (حسابێکی دیکەیان هەیە).

ئەم ئایەتە وەك قسەی خوای بەرزە ﷻ لە سووڕەتی (الواقعة)دا کە دەفەرموێ: ﴿وَكُنتُمْ أَزْوَٰجًا ثَلَٰثَةً ﴿٧﴾﴾، دوایی کە پۆلێنیان دەکات، دەیانکات بە: ﴿ٱلسَّٰبِقُونَ﴾، دوایی ﴿وَأَصْحَٰبُ ٱلْيَمِينِ﴾، دواتریش ﴿وَأَصْحَٰبُ ٱلشِّمَالِ﴾، کە دەفەرموێ: ﴿وَكُنتُمْ أَزْوَٰجًا ثَلَٰثَةً ﴿٧﴾﴾، دواتر تەفصیلەکەی باس دەکات لە چەند ئایەتێکدا، هەروەها گوتوویانە: دوورە بابای ستەمکار لەوانەبێ کە خوا هەڵیانبژێرێ.

**ڕای دووەم:** گوتراوە ڕاناوی: ﴿يَدْخُلُونَهَا﴾، دەگەڕێتەوە بۆ هەرسێك کۆمەڵەکە، بەڵام ئەو کاتە وشەی ﴿ظَالِمٌ﴾، مەبەست پێی کافر نیەو، مەبەست پێی فاسق و لادەریش نیە، بەڵکو لێرەدا ئەو کاتە وشەی: ﴿ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ﴾، واتە: کەسێك کە گوناهی گچکەی کردوون.

**ڕای سێیەم:** دەڵێن: ﴿فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ﴾، بابای ستەمکار کەسێکە کە گوناهە گەورەکانی کردوون، ﴿مُّقْتَصِدٌ﴾یش ئەو کەسەیە، بەهۆی ئەوەوە کە چاکەکانی لە خراپەکانی زیاتر نین، بە شێوەیەك نیە تاکو شایستەی چوونە

بەهەشت بێ، کەواتە: ﴿ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ يَدۡخُلُونَهَا ﴾، تەنیا بۆ: ﴿ سَابِقُۢ بِٱلۡخَيۡرَٰتِ ﴾ە، ئەوانەی لە چاکەکاندا پێشکەوتوونەوەو، بۆ جگە لەوان نیە.

(القرطبي) دەڵێ: ئەمە قسەی کۆمەڵێکە لە ئەوانەی کە تێفکریون لە زانایان، چونکە ڕاناو بگەڕێتەوە بۆ نیزیکتر باشترە، کە نیزیکترین لە ڕاناوەکەش بریتیە لە: ﴿وَمِنۡهُمۡ سَابِقُۢ بِٱلۡخَيۡرَٰتِ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَضۡلُ ٱلۡكَبِيرُ ﴿٣٢﴾ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ يَدۡخُلُونَهَا ﴾.

کەواتە ئەوەی کە لە دوایە هاتوە، ڕاناوەکە بۆ ئەو بچێتەوە باشترە، کە بریتین لەوانەی کە لە پێشبڕکێی چاکەکاندا پێشکەوتوونەوە.

**سەرنجی دووەم:** هۆی پێشخرانی ﴿ ظَالِمٞ لِّنَفۡسِهِۦ ﴾و ﴿ مُّقۡتَصِدٞ ﴾، لەسەر ﴿ سَابِقُۢ بِٱلۡخَيۡرَٰتِ ﴾ چییە، کە لە ڕووی ڕیزبەندیی لۆژیکییەوە، دەبێ ئەوەی چاکترە پێش بخرێ، ئنجا ئەوەی دوای وی، ئنجا ئەوەی دوای وی؟!

لە بارەی هۆکارەکەیەوە زەمەخشەریی لە تەفسیرەکەی خۆی (الكشاف)دا دەڵێ: لەبەر ئەوەی ژمارەی هی یەکەم، پاشان هی دووەم، لە هی سێیەم زیاترن، واتە: لەبەر زۆریی پێشخراون، زۆرینەی ئەوانەی کە خوا کتێبی خۆی پێداون لە بەندەکانی، ستەم لە خۆیان دەکەن، دوای ئەوان بە ژمارەیەکی کەمتر لەوان، میانجیین، ئنجا دوایی بە ژمارەیەکی کەمتر لە هەردوو ژمارەکان، ئەوانەن کە لە چاکەکاندا پێشدەکەونەوە، ئنجا لە ڕووی زۆریی ژمارەوە: ﴿ ظَالِمٞ لِّنَفۡسِهِۦ ﴾، پێشخراوە، دوایی: ﴿ وَمِنۡهُم مُّقۡتَصِدٞ ﴾، دوایی نۆرە گەیشتۆتە سەر ئەوانەی کە لە پێشبڕکێی چاکەکارییدا پێشکەوتوونەوە ﴿ سَابِقُۢ بِٱلۡخَيۡرَٰتِ ﴾، ئەوانە کەمینەن.

خاوەنی تەفسیری (الخازن) کە هەر بە ناوی خۆیەوەیەتی، بە جۆرێکی دیکە وەڵامی ئەو پرسیارە دەداتەوە: (**قَالَ الخَازِنُ: فَإِنْ قُلتَ: لِمَ قُدِّمَ الظَّالِمُ ثُمَّ المُقْتَصِدُ ثُمَّ السَّابِقُ؟ قُلتُ: قِيلَ: رَتَّبَهُمْ هَذَا التَّرْتِيبَ عَلَى مَقَامَاتِ النَّاسِ، لأَنَّ أَحْوَالَ النَّاسِ ثَلَاثَةٌ: مَعْصِيَةٌ وَغَفْلَةٌ وَتَوْبَةٌ، فَإِذَا عَصَى الرَّجُلُ دَخَلَ فِي حَيِّزِ الظَّالِمِينَ، فَإِذَا**

**تَابَ دَخَلَ فِي جُمْلَةِ المُقْتَصِدِيْن، فَإِذَا صَحَتْ تَوْبَتُه وَكَثُرَتْ عِبَادَتُهُ وَمُجَاهَدَتُه، دَخَلَ فِي عِدَادِ السَّابِقِيْن)**[1].

دەڵێ: ئەگەر گوتت بۆچی ستەمکار پێشخراوە، دوایی میانجیی، دوایی پێشکەوتوو؟ دەڵێم: گوتراوە: بەم ڕیزبەندییە ڕیزکراون، بە پێی پێگەکانی خەڵك، چونکە حاڵی خەڵك سێ جۆرە: گوناهکردنە، بێ ئاگاییە، پەشیمانییە، ئنجا کاتێك پیاو سەرپێچیی دەکات، دەچێتە نێو بازنەی ستەمکارانەوە، کە گەڕایەوە دەچێتە نێو ڕیزی میانجییەکانەوەو، ئەگەر تەوبەکەی ڕاست بوو، خواپەرستییەکەی زۆر بوو و زۆر تێکۆشا، دەچێتە ڕیزی پێشکەوتووانەوە.

لە ڕاستییدا هەم وەڵامەکەی (زمخشري)، هەم وەڵامەکەی (خازن)، هەردووکیان جوانن.

**سەرنجی سێیەم:** هەر کام لە بڕواداران و بێبڕوایان بە گوێرەی هەڵوێستیان لەبەرانبەر قورئاندا، پێگەو حاڵیان دەگۆڕێ، واتە: ئەوەی پێوەرو تەرازوویە، بۆ دیارییکردنی پێگەو پلەو پایەی شوێنکەوتووانی قورئان و هەڵگرانی قورئان، بریتیە لە چۆنیەتی مامەڵەیان لەگەڵ قورئاندا:

أ- چ بە تێگەیشتن و کارپێکردن و خوێندنەوەوە.

ب- چ هەر بە خوێندنەوەی، بەبێ کارپێکردن و بڕوا پێهێنان.

ج- چ بە نەخوێندنەوەو بڕوا پێنەهێنانی، کە دەبن بە چوار جۆرە کەس، وەك لەو فەرمایشتەی پێغەمبەردا ﷺ ئەوە خراوەتە ڕوو،

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: **{مَثَلُ الْمُؤْمِنِ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ كَمَثَلِ الأُتْرُجَّةِ؛ رِيحُهَا طَيِّبٌ وَطَعْمُهَا طَيِّبٌ، وَمَثَلُ الْمُؤْمِنِ الَّذِي لَا يَقْرَأُ الْقُرْآنَ؛ كَمَثَلِ التَّمْرَةِ لَا رِيحَ لَهَا وَطَعْمُهَا حُلْوٌ، وَمَثَلُ الْمُنَافِقِ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ، مَثَلُ الرَّيْحَانَةِ؛ رِيحُهَا طَيِّبٌ وَطَعْمُهَا**

---

(١) (محي الدين درويش) خاوەنی (إعراب القرآن وبيانه) لە بەرگی (٨) لاپەڕە (١٥٧) هەم قسەکەی زەمەخشەریی و، هەم قسەکەی خازینیشی هێناوە.

**مُرٌّ، وَمَثَلُ الْمُنَافِقِ الَّذِي لَا يَقْرَأُ الْقُرْآنَ، كَمَثَلِ الْحَنْظَلَةِ لَيْسَ لَهَا رِيحٌ وَطَعْمُهَا مُرٌّ}** **(أخرجه البخاري: ٥٠٢٠، ومسلم: ٧٩٧، وأبو داود: ٤٨٣٠، والترمذي: ٢٨٦٥، والنسائي ج٨، ص١٢٤، وابن ماجه: ٢١٤).**

واتە: وێنەی ئەو بڕوادارەی کە قورئان دەخوێنێ، وەك بەهێ وایە، هەم بۆنی خۆشە، هەم تامیشی خۆشە، هەروەها وێنەی ئەو بڕوادارەی کە قورئان ناخوێنێ، وەك خورما وایە، تامی خۆشە بەڵام بۆنی نیە، وێنەی ئەو مونافیقەش کە قورئان دەخوێنێ، وەك ڕیحانە وایە، بۆنی خۆشە بەڵام تامەکەی تاڵە، وێنەی ئەو مونافیقەش کە قورئان ناخوێنێ، وەك گوژاڵك (قەلەفسە) وایە تامەکەی تاڵەو، بۆنیشی تاڵە.

**سەرنجی چوارەم:** ڕای بەندە لەبارەی ئەم ئایەتەوە: وای تێدەگەم کە مەبەست لە: ﴿ٱلَّذِينَ ٱصۡطَفَيۡنَا مِنۡ عِبَادِنَا﴾، ئەوانەی کە هەڵمان بژاردوون لە بەندەکانمان، سەرجەم کەسانێکە کە ئەهلی قورئانن، هەموو ئەوانەی کە ئەهلی قورئانن و، بڕوایان بە قورئان هەیەو، کەم و زۆر تێیدا شارەزان، کەم و زۆر پێیەوە پابەندن، خوا هەڵیبژاردوون بۆ شارەزایی لە قورئان و، پێیەوە پابەندبوونی، بەڵام ئەوانیش وەك سەرجەم مسوڵمانان، دابەش دەبنەوە بۆ سێ جۆر: کەمتەرخەم، میانجیی، ئەوپەڕی باش، بەڵام ئەوە ڕاست نیە کە هەموویان وەك یەك و، لە یەك پلەو پایەدابن، ئەم دەقەش کە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ هاتووەو دەفەرمووێ: **{عَنْ أُسَامَةَ بِنِ زَيْدٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَرَأَ هَذِهِ الآيَةَ، وَقَالَ: كُلُّهُم فِي الجَنَّةِ}** **(أخرجه أبو داود الطيالسي: ٢٢٣٦، والبيهقي: ٢٩٨، والسيوطي في الدر المنثور ج٧، ص٢٤).**

واتە: ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ، دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوەو فەرموویەتی: هەموویان لە بەهەشتن.

ئەم دەقە پێویستە هەر بەو جۆرەی گوتمان: مانا بکرێ، کە ئەوانە بەگشتیی بەهەشتیین، بەڵام هەرکەسە پلەیەکی تایبەت بەخۆی هەیە، مەرجیش نیە

کـە دەڵێیـن: هەموویـان بەهەشـتیین، هەموویـان یەکسـەرو ڕێـك بـۆ بەهەشـتێ بچـن، بەڵکـو ئـەوەی سـتەمی لـە خـۆی کـردوە، لەوانەیـە بایـی سـتەمەکەی سـزا بـدرێ، ئەگـەر بـە سـزای گـۆڕو، عالەمـی بـەرزەخ و، ناڕەحەتییەکانـی قیامـەت و، زیندووبوونـەوەو هەڵسـانەوە، پـاك نەبێتـەوە، دەسـووتێنرێ و سـزا دەدرێ، بـەڵام دوای ئـەوەی پـاك دەکرێتـەوە، هـەر دەچێتـە بەهەشـت.

ئـەم دەقـەش کـە پێـم وانیـە سـەنەدێکی زۆر ڕاسـتی هەبـێ، دەیهێنیـن، چونکـە مانایەکـەی ڕاسـت و دروسـتە:

**{قَرَأَ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﷺهَـذِهِ الآيَـةَ ثُـمَّ قَـالَ: قَـالَ رَسُـولَ اللـه ﷺ: سَـابِقُنَا سَـابِقٌ، وَمُقْتَصِدُنَـا نَـاجٍ، وَظَالِمُنَـا مَغْفُـورٌ لَـهُ} (رواه العقيـلي في «الضعفـاء» (٣٥١)، والديلمـي (٢/ ٢١٠)، وضعفـه الألبـاني في «الضعيفـة»: ٣٦٧٨).**

لەگـەڵ ئەوەشـدا لـە ڕووی سـەنەدەوە بێهێـزە، بـەڵام پێـم وایـە مانایەکـی ڕاسـت و دروسـتی هەیـەو، تیشـکیشـمان بـۆ دەخاتـە سـەر چەمـك و واتـای ئایەتەکـە.

واتـە: عومـەری کـوڕی خەتتـاب ﷺ ئـەم ئایەتـەی خوێنـدەوە، دوایـی گوتـی: پێغەمبـەر ﷺ فەرموویەتـی: پێشـکەوتووەکەمان پێشـکەوتوویەو، میانجییەکەمـان دەربازبوویـەو، ستەمکارەکەشـمان لێـی دەبـوردرێ.

کـە دەفەرمـوێ: لێـی دەبـوردرێ، دیـار نیـە پێـش سـزادانە، یـان دوای سـزادانە؟ گرنـگ ئەوەیـە ئەویـش سـەرەنجامەکەی هـەر دەچێتـە بەهەشـت.

**سەرنجی پێنجەم:** شەش قسەی زانایان دێنین لەو بارەوە:

**یەکەم:** سەهلی کوڕی عەبدوڵڵای توستوریی دەڵێ: **(السَّابِقُ: العَالِمُ، وَالمُقْتَصِدُ: المُتَعَلِّمُ، وَالظَّالِمُ: الجَاهِلُ)**، واتە: **(سَابِق)** پێشکەوتوو، بریتیە لە زانا، **(مُقْتَصِد)** میانجیی، بریتیە لەوەی کە دەیەوێ فێربێ، بەڵام ستەمکار **(ظَالِم)** بریتیە لەو کەسەی کە مسوڵمانە، بەڵام نەزانەو بێئاگایە.

دووەم: (ذو النون المصري) ئەویش یەكێكە لە عاریفە گەورەكان، دەڵێ: **(الظَّالِمُ: يَذْكُرُ اللَّهَ بِلِسَانِهِ فَقَط، وَالْمُقْتَصِدُ الذَّاكِرُ بِالقَلْبِ، وَالسَّابِقُ: الَّذِي لاَ يَنْسَاهُ)**، واتە: ستەمكار كەسێكە كە تەنیا بە زمان یادی خوا دەكات، میانجیی كەسێكە، كە تەنیا بە دڵ یادی خوا دەكات، بەڵام پێشكەوتوو، كەسێكە كە هەرگیز خوای لەبیرناچێت. [بە دڵ و زمان یادی خوا دەكات].

سێیەم: (الأنطاكي) دەڵێ: **(الظَّالِمُ: صَاحِبُ الأَقْوَالِ، وَالْمُقْتَصِدُ: صَاحِبُ الأَفْعَالِ، وَالسَّابِقُ: صَاحِبُ الأَحْوَالِ)**، واتە: ستەمكار بریتیە لە خاوەنی قسان، میانجیی بریتیە لە خاوەنی كردەوان و، پێشكەوتوو بریتیە لە خاوەنی حاڵان، (واتە: هەر قسە نیەو، بەس كردەوەش نیە، بەڵكو قسەو كردەوەكەی تێدا بۆتە حاڵ و چەسپاوە، مەبەست قسەو كردەوەی چاكە).

چوارەم: (ابن عطاء الله الأسكندري) خاوەنی (الحِكَم) دەڵێ: **(الظَّالِمُ: الَّذِي يُحِبُّ اللَّهَ مِنْ أَجْلِ الدُّنيَا، وَالْمُقْتَصِدُ الَّذِي يُحبُّهُ مِنْ أَجلِ العُقْبَى، وَالسَّابِقُ: الَّذِي أَسْقَطَ مُرَادَهُ بِمُرَادِ الحَقِّ)**، ئەو عاریفانەی لە بواری تەزكیەی نەفس و تەصەووف و عیرفاندا كاریان كردوە، بەڕاستی فكریان بۆ زۆر عیبارەتی نەرم و ناسك و جوان لە ڕووی ڕۆحانییەتەوە چووە، كە زانایانی دیكە كەمتر وایە بیریان بۆ ئەو شتانە چوو بێ، **(أحمد بن عطاء الله)** دەڵێ: ستەمكار بریتیە لەو كەسەی خوای خۆشدەوێ لەبەر دنیا، میانجیی كەسێكە خوای خۆشدەوێ لەبەر قیامەت (بەهەشت)، بەڵام پێشكەوتوو كەسێكە، مەبەستی خۆی لەبەر مەبەستی خوا نادیدە گرتوە، واتە: تەماشا دەكات، خوا ڕەزامەندیی لەچی دایەو، خوا چی دەوێ، چی پێ خۆشە، ئەویش ئەوەی دەوێ.

پێنجەم: هەر لەو بارەوە لە هەندێك لە زانایانەوە هاتوە: **(الظَّالِمُ: الَّذِي يَعْبُدُ اللَّهَ خَوْفاً مِنَ النَّارِ، وَالْمُقْتَصِدُ: الَّذِي يَعْبُدُ اللَّهَ طَمَعاً فِي الجَنَّةِ، وَالسَّابِقُ: الَّذِي يَعْبُدُ اللَّهَ لِوَجهِهِ لَا لِسَبَبٍ)**، واتە: ستەمكار كەسێكە خوا دەپەرستێ لە ترسی ئاگری دۆزەخ، میانجیی كەسێكە خوا دەپەرستێ بە تەماعی چوونە بەهەشت، بەڵام پێشكەوتوو كەسێكە خوا دەپەرستێ، تەنیا لەبەر خوا، نەك لەبەر هۆكارێك، (واتە: نە لە ترسی سزایەكەی، نە لە خۆشی نیعمەتەكەی، بەڵكو لەبەر ئەوەی خوا شایستەی پەرسترانە).

شەشەم: قسەیەکی دیکەش هەر لەوبارەوە هاتوە: (الظَّالِمُ: الَّذِي يَعْبُدُ اللَّهَ عَلَى الغَفْلَةِ وَالعَادَةِ، وَالمُقْتَصِدُ: الَّذِي يَعْبُدُهُ عَلَى الرَّغْبَةِ وَالرَّهْبَةِ، وَالسَّابِقُ: الَّذِي يَعْبُدُ اللَّهَ عَلَى الهَيْبَةِ)، واتە: ستەمکار کەسێکە خوا دەپەرستێ، بەڵام بە بێئاگایی و بە عادەتەوە، وەك نەریتێك، میانجیی کەسێکە خوا دەپەرستێ، لەبەر ئەوەی بە تەمای پاداشتیەتی و، ترسی لە سزایەکەی هەیە، بەڵام پێشکەوتوو کەسێکە خوا دەپەرستێ، لەبەر ئەوەی سام و هەیبەت {و ڕێزو مەزنی و خۆشەویستیی}ی خوای لە دڵدا هەیە.

هەڵبەتە زۆر قسەی دیکەش لەوبارەوە کراون، کە هەموویان تیشکی زیاتر دەخەنە سەر چەمك و واتای ئەو ئایەتە موبارەکە.

### مەسەلەی چوارەم و کۆتایی:

**سزای سەخت و دژواری بێبڕوایان و هاوارو ڕۆکردنیان و، نائومێدکردن و سەرزەنشت کرانیان، کە بۆچی لە دەرفەتی تەمەنیان بەهرەمەند نەبوون، بۆ بیرکەوتنەوەی ڕاستییەکان و پەند وەرگرتنیان و، ڕێی ڕاستگرتنیان؟:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَهُمْ نَارُ جَهَنَّمَ لَا يُقْضَىٰ عَلَيْهِمْ فَيَمُوتُوا۟ وَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُم مِّنْ عَذَابِهَا ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِى كُلَّ كَفُورٍ ﴿٣٦﴾ وَهُمْ يَصْطَرِخُونَ فِيهَا رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا نَعْمَلْ صَـٰلِحًا غَيْرَ ٱلَّذِى كُنَّا نَعْمَلُ ۚ أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَآءَكُمُ ٱلنَّذِيرُ ۖ فَذُوقُوا۟ فَمَا لِلظَّـٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ ﴿٣٧﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە یازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ﴾، ئەوانەی بێبڕوا بوون، هەمیشە بەرکار (**مفعول به**) وشەی (**كفروا**) فرتێنراو (**محذوف**)ە، واتە: بێبڕوابوون بەخواو، بە پێغەمبەری خواو ﷺ، بە کتێبی خواو، بە هەموو ئەو شتانەی کە کتێبی خواو پێغەمبەری خوا هەواڵیان پێداون.

٢)- ﴿ لَهُمْ نَارُ جَهَنَّمَ ﴾، ئاگری دۆزەخیان هەیە، (**لَهُم**) ئەم (ل)ە (**لامُ الإستِحقَاق ولامُ التَّمليك**)، واتە: ئاگری دۆزەخ، هی وانەو تایبەتە بەوانەوە، هیچی دیکەیان نیە.

٣)- ﴿ لَا يُقْضَىٰ عَلَيْهِمْ فَيَمُوتُوا۟ ﴾، بڕیاریان بەسەردا نادرێ کە بمرن، چونکە (**قضاء**) بە مانای بڕیاردان دێ، هەروەها بە مانای تەواوکردن و مراندنیش دێ، لە سووڕەتی (**القصص**)دا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَوَكَزَهُۥ مُوسَىٰ فَقَضَىٰ عَلَيْهِ ﴾، واتە: مووسا کۆڵە مستێکی لێداو تەواوی کرد (کۆتایی پێهێنا).

کەواتە: (**قضاء**) بەمانای بڕیاردان دێ، وەك دەڵێ: (**قَضَى عَلَيهِ: حَكَم عَلَيهِ**) هەروەك بە مانای تەواوکردنیش دێ، (**قَضَى عَلَيهِ: أعدَمَهُ**)، کە لێرە دەگونجێ

مەبەست پێی ئەوەبێ تەواو ناکرێن، بمرن، یانی: کۆتاییان پێ ناهێنرێ، بمرن، یاخود بڕیاریان بۆ نادرێ و بەسەردا نادرێ، بە بڕیاری مراندن، تاکو بمرن.

٤)- ﴿وَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُم مِّنْ عَذَابِهَا﴾، لە ئازارەکەشی لەسەریان سووک ناکرێ، کە هەم بە ئاگر سزا دەدرێن، هەم بەسەرمای زۆر، کە (زمهریر)ی پێدەگوترێ و سەرمای زۆریش، وەك ئاگر دەسووتێنێ.

٥)- ﴿كَذَٰلِكَ نَجْزِي كُلَّ كَفُورٍ﴾، هەر ئاوا سزای هەر سپڵەیەك دەدەینەوە، **(أي: نَجزِيهِم جَزَاءاً كَذَٰلِكَ الجَزَاء)**، واتە: سزایان دەدەین وەك ئەو سزایە.

٦)- ﴿وَهُمْ يَصْطَرِخُونَ فِيهَا﴾، {تنجا خوا باسی حاڵ و باڵیان دەکات لە دۆزەخداو، دەفەرموێ:} لەوێدا هاوارو بڕۆ دەکەن، دادو فیغان دەکەن، **(الإصطِرَاخ: إفتِعَالٌ مِنَ الصُّرَاخ، وَهُوَ الصِّيَاحُ بِشِدَّةٍ وَجُهْد)**، واتە: **(إصطراخ)** هاوارکردنێکی بەتوندیی و بە خۆماندووکردنەوەیە، پێی دەگوترێ: **(صُراخ)** و **(إصطِرَاخ)**یش **(إفتِعَالٌ)**ە لە **(صراخ)** واتە: زۆر بەتوندیی هاواردەکەن، دەڵێن چی؟

٧)- ﴿رَبَّنَا أَخْرِجْنَا نَعْمَلْ صَالِحًا غَيْرَ الَّذِي كُنَّا نَعْمَلُ﴾، واتە: پەروەردگارمان! دەرمان بێنە {واتە: لە دۆزەخ} کردەوەی باش دەکەین، جگە لەوەی کە دەمانکرد، ئنجا لەبەرئەوەی مەبەستیان ئەوە بووە زۆر بە جەختکردنەوە بەڵێن بدەن، بۆیە گوتوویانە: ﴿أَخْرِجْنَا نَعْمَلْ صَالِحًا غَيْرَ الَّذِي كُنَّا نَعْمَلُ﴾، **(لإرَادَةِ الوَعدِ، جُزِمَ نَعمَل صَالِحَاً فِي جَوَابِ الدُّعَاءِ)**، کردەوەیەك دەکەین جیا لەو کردەوەیەی کە پێشتر دەمانکرد، کە دەفەرموێ: ﴿نَعْمَلْ صَالِحًا﴾، کردەوەیەك دەکەین چاك، جیا لەوەی کە پێشتر دەمانکرد، ئەمە بۆ تەئکید کردنەوەیە.

٨)- ﴿أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ﴾، {واتە: پێیان دەگوترێ **(يُقَالُ لَهُم)**، یان پێیان دەڵێ **(يَقُولُ لَهُم)**} ئایا بایی ئەوەندە نەمانژیاندن کە ئەوەی ویستبای بیری بکەوێتەوە، بیری دەکەوتەوە؟ بە تەئکید لێرەدا هەمزەی پرسیارکردن ﴿أَوَلَمْ﴾، **(الإستِفهَامُ: تَفرِيعٌ لِلتَّوبِيخ)**، بۆ سەرزەنشتکردنە، (و)یش بادەرەوەی کرداری گوتنێکی

قرتێنراوە، یانی: پێیان دەگوترێ: ﴿أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ﴾ (تعمیر) تەمەندرێژکردن یاخود پێدانی تەمەن، چونکە مەرج نیە تەنیا ئەوەی تەمەنی درێژ بێ، خوا ئاوا سەرزەنشتی بکات، (تعمیر) تەمەن پێدان، ئایا نەمانژیاندن و تەمەنمان پێنەدان؟!

کە دەفەرموێ: ﴿مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ﴾، ئەم (ما)یە (ما المصدَرِيّة)یەو بۆ مانای (ظَرْف)ە، واتە: ئەندازەیەك، یاخود چاوگە، بە مانای ماوەیەك لە كات، یانی: ماوەیەك لە تەمەنكردنمان پێنەدان؟! ﴿يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ﴾، واتە: ئەمە سیفەتە بۆ (ما)، واتە: بیری دەكەوتەوە ئەو كەسەی بیری دەكەوتەوە، واتە: كەسێك ویستبای، ڕاستییەكانی بیربكەوێتەوە، لەو ماوەیەدا، بیری دەكەوتنەوە، ئەگەر ویستبای و ئیرادەی هەبووایە.

٩)- ﴿وَجَآءَكُمُ ٱلنَّذِيرُ﴾، ترسێنەرو هۆشیاركەرەوەشتان بۆ هات، بەڵام ئێوە گوێتان پێنەدا.

١٠)- ﴿فَذُوقُواْ﴾، بۆیە بیچێژن، ئەمە لێرەدا بەكارهێنراوە بۆ بەردەوام بوون، واتە: بەردەوام بچێژن.

١١) ﴿فَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ﴾، بە دڵنیایی ستەمكاران هیچ یارمەتیدەرو هاوكارێكیان نیە.

## دوو سەرنجی پێویست

سەرنجی یەکەم: کە دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ﴾، ئەم ئایەتە لێرەدا سێ ڕاستییان دەگەیەنێ:

یەکەم: کەواتە ئەم ژیانە دنیاییە، بایی ئەوەندەیە مرۆڤ خوای تێدا بێتەوە یادو، ئەو ڕاستییانەی لەڕێی وەحییەوە نەبێ نازانرێن، بیانزانێ، ئەو ژیانە دنیاییە هەر بەشی ئەوەندە دەکات، بۆ ئەوە بە مرۆڤ دراوە کە خوای خۆی بناسێ و، خۆی بناسێ و، سەرەنجامی خۆی بزانێ، هەروەها ڕابردووی خۆی و، ئێستای خۆی و، داهاتووی خۆی، کە ئەویش لەڕێی وەحییەوە نەبێ، نازانرێ.

دووەم: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {أَعْذَرَ اللَّهُ إِلَى امْرِئٍ أَخَّرَ أَجَلَهُ، حتَّى بَلَّغَهُ سِتِّينَ سَنَةً} (أخرجه البخاري: ٦٠٥٦، عَنْ أَبِي هريرة ﷺ).

واتە: خوا مرۆڤێك کە کاتەکەی دواخستوە، تاکو گەیشتۆتە شەست (٦٠) ساڵ بیانووی بۆ نەهێشتۆتەوە، هیچ پاساوو بیانووی بەدەستەوە نەهێشتوون.

مەرجیش نیە هەر شەست ساڵ بێ، لە سوورەتی (الأحقاف)دا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿حَتَّىٰ إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُ وَبَلَغَ أَرْبَعِينَ سَنَةً قَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِي أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ الَّتِي أَنْعَمْتَ ...﴿١٥﴾﴾، بەڵام دیارە تاکو تەمەنەکە زیاتر بێ، مرۆڤ بێ بیانووتر و بێ پاساوتر دەبێ، ئەگەرنا خوا دەفەرموێ: هەتا گەیشتە ئەوپەڕی توانای خۆی و، گەیشتە چل ساڵ، گوتی: پەروەردگارم! یارمەتیم بدە، سوپاسی ئەو چاکەیەت بکەم کە لەگەڵت دا کردووم.

سێیەم: ئنجا ئەوەش ڕێژەییەو، مەرج نیە مرۆڤ هەتا نەگاتە چل یان شەست ساڵ، بەڵگەی لەسەر تەواو نەکرێ، بەڵام بێگومان هەتا تەمەنەکەی زیاتر بێ، مرۆڤ بێ قسەترو بێ بیانووتر دەبێ.

**سەرنجی دووەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَجَآءَكُمُ ٱلنَّذِيرُ﴾ ترسێنەریشتان بۆ هات، ورياکەرەوەشتان بۆ هات، ئەمە دەگونجێ:

١- مەبەست پێی پێغەمبەر بێ ﷺ، پێغەمبەری خوا هۆشیارکەرەوەیەو، هەموو پێغەمبەرانیش وابوون.

٢- هەروەها بەڵا و موصیبەت کە بەسەر مرۆڤ دێ، وریاکەرەوەیە.

٣- دیسان نازو نیعمەتێك کە خوا پێت دەدات، وریاکەرەوەیە.

٤- هەروەها کەوتنە تەمەن و پەیدابوونی مووی سپیی، وریاکەرەوەیە.

٥- مردنی خزمان وریاکەرەوەیەو ترسێنەرە، مردنی دراوسێیان وریاکەرەوەیە.

٦- گەیشتنە تەمەنی چل ساڵیی، جۆرێکە لە وریاکردنەوە.

٧- هەروەها زانایان هەرکامێکیان بەئەندازەی خۆی، وریاکەرەوەو هۆشیارکەرەوەن.

٨- هەروەها مێژوویەك کە پڕە لە ڕووداوی جۆراوجۆر، وریاکەرەوەیە.

٩- گۆڕانکارییەکانیش هەموویان هۆشیارکەرەوەن، کە دەفەرموێ: ﴿وَجَآءَكُمُ ٱلنَّذِيرُ﴾ ترسێنەرو وریاکەرەوەتان بۆ هات، تەنیا پێغەمبەر ناگرێتەوە ﷺ، هەموو ئەو شتانەی دیکە کە دەبێ مرۆڤ پەندیان لێ وەربگرێ و، بە هۆیانەوە هۆشیارو وریا بێتەوە، هەموویان دەگرێتەوە.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی، ئێمە لەو کەسانە بگێڕێ کە هەمیشە هۆشیارو وریاو بێدار دەبن، هەمیشە ئەو ڕاستییەیان لەبەرچاوە، کە خوا بۆ تاقیکردنەوە لەسەر ئەم زەوییەی داناون و، بەبەرچاو ڕوونانە دەژین و، دەزانن لە کوێرا هاتوون، بۆچی هاتوون، بۆ کوێ دەچن؟ خوا سەرەنجاممان خێر بکات، بەو شێوەیە بمانژیەنێ کە لە ڕۆژی دواییدا، بەسەری بەرزو ڕووی سوورەوە بچینەوە خزمەتی خواو ﷻ پێغەمبەری خوا ﷺ.

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

# پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان ئایەتەکانـی: (٣٨ - ٤٥)، واتـە: هەشـت ئایەتـی کۆتایـی سـوورەتی (فاطـر) دەگرێتـە خـۆی، لـەو هەشـت ئایەتـەی کۆتایـی سـوورەتی (فاطـر)دا، خـوای بـەرزو مـەزن، حـەوت ڕاسـتیی گـەورەو گرنگـی خسـتوونە ڕوو:

**یەکەم:** زانیاریی خوا بە نهێنیی نێو ئاسمانەکان و زەوی و، نێو دڵ و سینەی مرۆڤەکان.

**دووەم:** گێڕانی خوا بۆ مرۆڤەکان، بە جێنشینی خۆی لەسەر زەوی.

**سێیەم:** هیچ لە دەست نەهاتنی پەرستراوانی ساختە، بۆ ئەوانەی کە دەیانپەرستن، لە جیاتی خواو جگە لە خوا، لە دنیاو دواڕۆژدا.

**چوارەم:** ڕاگرتنی خوا بۆ ئاسمانەکان و زەوی، کە ئەگەر خوا ﷻ ڕایاننەگرێ، لە بەین دەچن، یاخود لەسەر ئەو هێڵ و سیستەمەی خوا دایناون، لا دەچن.

**پێنجەم:** سوێند خواردن بە خوا لە لایەن هاوبەش دانەرەکانەوە، کە ئەگەر هۆشیارکەرەوەیان بۆ بێت، واتە: پێغەمبەرێك کە هۆشیاریان بکاتەوە، ئاگاداریان بکاتەوەو بیان ترسێنێت، بڕوا دەهێنن، چ کۆمەڵگایەك لە هەمووان بڕوادارترە، لەوان زیاتر بڕوا دێنن، کەچی سڵەمینەوەو خۆ بە زلگرییان و، پیلانگێڕییان، دوای ئەوەی خوا ﷻ هۆشیارکەرەوەی بۆ ناردن، کە پێغەمبەری کۆتایی موحەممەدە ﷺ.

**شەشەم:** جەختکردنەوە لەسەر ئەوە کە یاسا گەردوونییەکانی خوا ناگۆڕێن و، هیچ شتێکیش خوا دەستەوسان ناکات، نە لە ئاسمانەکان و نە لە زەویدا، واتە: لە ژێر دەستی قوتار نابێ.

**حەوتەم:** پەلە نەکردنی خوا، لە سزادانی خراپەکاراندا، دواخستنیان بۆ قیامەت.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَٰلِمُ غَيْبِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٣٨﴾ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ فَمَن كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُۥ ۖ وَلَا يَزِيدُ ٱلْكَٰفِرِينَ كُفْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ إِلَّا مَقْتًا ۖ وَلَا يَزِيدُ ٱلْكَٰفِرِينَ كُفْرُهُمْ إِلَّا خَسَارًا ﴿٣٩﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ شُرَكَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَرُونِى مَاذَا خَلَقُوا۟ مِنَ ٱلْأَرْضِ أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَمْ ءَاتَيْنَٰهُمْ كِتَٰبًا فَهُمْ عَلَىٰ بَيِّنَتٍ مِّنْهُ ۚ بَلْ إِن يَعِدُ ٱلظَّٰلِمُونَ بَعْضُهُم بَعْضًا إِلَّا غُرُورًا ﴿٤٠﴾ ۞ إِنَّ ٱللَّهَ يُمْسِكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ أَن تَزُولَا ۚ وَلَئِن زَالَتَآ إِنْ أَمْسَكَهُمَا مِنْ أَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا ﴿٤١﴾ وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ لَئِن جَآءَهُمْ نَذِيرٌ لَّيَكُونُنَّ أَهْدَىٰ مِنْ إِحْدَى ٱلْأُمَمِ ۖ فَلَمَّا جَآءَهُمْ نَذِيرٌ مَّا زَادَهُمْ إِلَّا نُفُورًا ﴿٤٢﴾ ٱسْتِكْبَارًا فِى ٱلْأَرْضِ وَمَكْرَ ٱلسَّيِّئِ ۚ وَلَا يَحِيقُ ٱلْمَكْرُ ٱلسَّيِّئُ إِلَّا بِأَهْلِهِۦ ۚ فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا سُنَّتَ ٱلْأَوَّلِينَ ۚ فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًا ۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَحْوِيلًا ﴿٤٣﴾ أَوَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَكَانُوٓا۟ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً ۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعْجِزَهُۥ مِن شَىْءٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَلِيمًا قَدِيرًا ﴿٤٤﴾ وَلَوْ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِمَا كَسَبُوا۟ مَا تَرَكَ عَلَىٰ ظَهْرِهَا مِن دَآبَّةٍ وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ۖ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِعِبَادِهِۦ بَصِيرًۢا ﴿٤٥﴾﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە دڵنیایی خوا زانای پەنهانی ئاسمانەکان و زەوییەو، بێگومان بە نهێنیی سینەکانیش زانایە (٣٨) ئەو (خوا) کەسێکە گێڕاونی بە جێنشینانی لە زەویدا، ئنجا هەر کەس بێبڕوابێ، بێبڕواییەکەی بە زیانی خۆیەتی و، بێبڕوایی بێبڕوایانیش بێگومان بەردەوام خەشم و تووڕەییان لە لای خوای پەروەردگاریان بۆ زێدە دەکات، هەروەها بێبڕوایی کافران هەر زیانبارییان بۆ زیاد دەکات (٣٩) (بە هاوبەشدانەرەکان) بڵێ: (هەواڵم پێ بدەن)، ئایا ئەو هاوبەشانەتان کە جگە لە خوا لێیان دەپاڕێنەوە، پیشانم بدەن: چییان لە زەوییدا دروستکردووە؟ یان ئایا لە (دروستکردنی) ئاسماناندا هاوبەشیان هەیە؟! یان ئایا کتێبێکمان پێداون، کە لەسەر بەڵگەیەکی ڕۆشنن تێیدا، (لە بارەی ڕاستیی بتپەرستییەکەیانەوە)؟ بەڵکو ستەمکاران تەنیا بەڵێنی فریودەرانە بە یەکدی دەدەن (٤٠) بێگومان خوا ئاسمانەکان و زەوی دەگرێ، کە (لەڕێی خۆیان و لەو سیستەمەی بۆیان دانراوە) لابدەن و، ئەگەر (گریمان) لاشبدەن، هیچ کەسێك دوای وی، نایانگرێ (نایانپارێزێ لە لادان)، بێگومان ئەو (خوا) هێدیی لێبوردەیە (٤١) هەروەها ئەوان (کافرەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەری کۆتایی) بەوپەڕی توانایانەوە (بە جەختکردنەوەوە) سوێندیان بە خوا خوارد، کە ئەگەر (پێغەمبەرێك و) وریا کەرەوەیەکیان بۆ بێ، مسۆگەر لە هەر کۆمەڵێك ڕێی ڕاستگرتووتر دەبن، کەچی کاتێك (پێغەمبەرو) وشیارکەرەوەیەکیان بۆ هات، تەنیا سڵەمینەوەو، دوورکەوتنەوەی تێدا زیاتر کردن (٤٢) (ئەوەش هەمووی) بە مەبەستی خۆبەزلگرتن و، پیلانگێڕیی خراپ لە زەویدا، فێڵی خراپیش تەنیا دەوری خاوەنەکەی دەدات (و سەری خاوەنەکەی دەخوات)، ئایا ئەو (کافر) انە جگە (لە چەسپانی) یاسای پێشووەکان (بەسەریاندا) چاوەڕێی چی دیکە دەکەن! کە هەرگیزیش گۆڕانکاریی بۆ یاسای

خوا (لە ژیانی بەشەردا) نابینی و، هەرگیزیش لادان بۆ یاسای خوا نابینی ﴿٤٣﴾ ئایا (ئەوانە) بە زەویدا نەڕۆیشتوون، ئنجا سەرنج بدەن، داخۆ سەرەنجامی ئەوانەی پێش وان چۆن بووە؟! لە حاڵێکدا کە ئەوان هێز و توانایان لەوان (کافرانی ڕۆژگاری تۆ ئەی موحەممەد!) توندتربوو، خواش هیچ شتێك نە لە ئاسمانەکان و نە لە زەویدا دەستەوسانی ناکات، چونکە بێگومان ئەو زانای توانایە ﴿٤٤﴾ ئەگەر خواش، خەڵکی بە هۆی ئەوەوە کە (لە کاری خراپ) دەیکەن گرتبایەو، سزای دابان، ژیاندارێکی لەسەر پشتی (زەوی) نەدەهێشت (و هەموویانی قڕەبڕ دەکرد)، بەڵام بۆ کاتێکی ناوبراو (و دیاریکراو) دوایان دەخات و، وەختێکیش کاتی خۆیان هات، بە دڵنیایی خوا بینەری (کردارو حاڵ و باڵی) بەندەکانیەتی (و سزای پڕ بە پێستیان دەدات) ﴿٤٥﴾].

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(خَلَٰٓئِفَ): (خَلَائِف: جَمْعُ خَلِيْفَة وَخُلَفَاء جَمْعُ خَلِيْف، وَالخِلَافَةُ النِّيَابَة عَنِ الغَيْرِ، إِمَّا لِعَجْزِهِ وَإِمَّا لِتَشْرِيفِ المُسْتَخْلَفِ)، (خَلائِف): کۆی (خَلِيْفَة)یە، جێنیشین، (خُلَفَاء)یش کۆی (خَلِيْف)ە، ئەویش هەر بە مانای جێنیشینە، (خِلَافَة): بریتیە لە جێگرتنەوەی یەکێکی دی و نوێنەرایەتیی کردنی، یان بە هۆی ئەوەوە کە ئەو یەکەی دیکە ناتوانێ، یان بۆ ڕێزگرتن لەو کەسەی کە کراوە بە جێگرەو جێنیشین.

(مَقْتًا): (المَقْتُ: البُغْضُ الشَّدِيْدُ، لِمَنْ تَرَاهُ تَعَاطَى القَبِيْح)، (مَقْت): بریتیە لە ڕق لێبوونەوەی زۆر، بۆ کەسێك ببینی شتی ناقۆلا دەکات، (مَقْت): بە کوردیی بریتیە لە: خەشم و قین، ڕق لێبوونەوەی زۆر.

(تَزُولَا): لابدەن، یاخود نەمێنن، (زَالَ الشَّيءُ، يَزُولُ زَوَالاً: فَارَقَ طَرِيْقَهُ جَانِحاً عَنْهُ، أَو فُقِدَ وَعُدِمَ)، (زَالَ الشَّيءُ يَزُولُ زَوَالاً)، شتەکە لاچوو، لادەچێت، لاچوون،

ئەو ڕێیەی کە لەسەریەتی لێی لادەچێت، واتایەکی دیکەی: (زَالَ الشَّيءُ: فُقِدَ أو عُدِمَ)، ئەو شتە نەما، لە بەین چوو.

(نُفُورًا): (النُّفُورُ: الإنْزِعَاجُ مِنَ الشَّيءِ وَإلى الشَّيءِ)، (نُفُور): بریتیە لە بێزاریی لە شتێك، یان بۆ لای شتێك، سڵەمینەوە لە شتێك و، چوون بە هەڵەداوان بۆ لای شتێك، وەك پێشینان دەڵێن: (لە کۆڵك سڵەمیەوە بەسەر بەرازدا کەوت).

(وَلَا يَحِيقُ): (أي: وَلَا يَنْزِلُ وَلَا يُصِيبُ، وَلَا يُحِيطُ)، (حاق يحيق) یانی: دابەزی دادەبەزێ (نَزَل يَنْزِلُ) و تووشیبوو تووشی دەبێ (أَصَابَ يُصِيبُ) و دەوری دا دەوری دەدا (أَحَاطَ يُحِيط)، ﴿وَلَا يَحِيقُ ٱلۡمَكۡرُ ٱلسَّيِّئُ إِلَّا بِأَهۡلِهِۦۚ﴾، فێڵی خراپ بەس دادەبەزێتە سەر خاوەنەکەی، (سزایەکەی) یاخود: دەرەنجامە خراپەکەی، تووشی خاوەنەکەی دەبێ و، تەنیا دەوری خاوەنەکەی دەدات.

(سُنَّتَ): (سُنَّة: طَرِيقَة، جَمْعُهَا سُنَن، وَالسُّنَّةُ: العَادَة)، (سُنَّت) بە مانای ڕێباز دێ، بە مانای نەرێت دێ و بە (سُنَن)، کۆدەکرێتەوە، مەبەست پێیان یاساکانی خوایە ﷻ لە گەردوون و لە ژیانی مرۆڤدا.

(تَحۡوِيلًا): (التَّحْوِيلُ: نَقْلُ الشَّيءِ مِنْ مَكَانٍ إلى غَيْرِهِ)، (تَحْوِيل): ئەوەیە کە شتێك بگوازیەوە لە شوێنێك بۆ شوێنێکی دیکە، (تَبْدِيل): ئەوەیە کە شتێك لابەری و شتێکی دیکەی لە شوێن دابنێی، خوا ﷻ دەفەرموێ: نە (تَحْوِيل)، لە یاسای خوا هەیە، واتە: لایبدەی لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دی، نە (تَبْدِيل)یش، واتە: بیگۆڕی، ئەو یاسایە لابدەی و یاسایەکی دیکەی لە جێی دابنێی.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

وەك لە پێناسەی ئەم دەرسەدا گوتمان، ئەم هەشت (٨) ئایەتە، حەوت (٧) ڕاستیی گەورەو گرنگیان گرتوونە خۆیان، کە ئێمە لە پێناسەی ئەم دەرسەدا ئاماژەمان پێیانداو، ئێستاش لە میانی مانای گشتیی دا، جارێکی دیکە تیشکێکی فراوانتریان دەخەینە سەر:

خوا ﷻ وەك یەکەمین ڕاستیی گەورەو گرنگ، کە لەم هەشت ئایەتەدا خراونە ڕوو، دەفەرمووێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عَـٰلِمُ غَيْبِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴾، یەکێك لە حەوت ڕاستییە گەورەو گرنگەکان، کە هەم سیفەتێکی زۆر بەرزو مەزنی خوایەو، هەم زۆریش پەیوەستە بە گەردوون و، بە ژیانی مرۆڤەوە، خوا دەیخاتە ڕوو و دەفەرمووێ: بەدڵنیایی خوا زانای نهێنیی ئاسمانەکان و زەوییە، هەرچی نهێنیی و پەنهان لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، زانیارییە ڕاستەقینەکەی تەنیا لە لای خوایە ﷻ، بەشەر ڕەنگە گۆشەیەك، یان چەمکێك و شتێکی لێ بزانن، بەڵام زانیاریی تەواو، لە بارەی پەنهانەکانی زەوی و ئاسمانەکانەوە، تەنیا لەلای خوایە، ﴿ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴾، ئنجا بەشێك لە نێو ئەو پەنهان و نادیارەی کە لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، بریتیە لەوەی لە سینەی مرۆڤەکاندا هەیە: بە دڵنیایی ئەو (خوا) زانایە، ﴿ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴾، بە هاوەڵ یان خاوەنی سینەکان، (ذو) یانی: هاوەڵ یان خاوەن، (ذات) باری مێینەکەیەتی، هەر بە مانای (صاحب) دێ (صَاحِب وصَاحِبَة)، (الصدور) کۆی (صدر)ە، سینە، ئنجا ئایا مەبەست لە هاوەڵ یان خاوەنی سینەکان چییە؟ هەموو زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کە مەبەست پێی ئەو نهێنییانەن، ئەو نیازو مەبەستانەن، ئەو خولیاو ئاواتانەن، کە لە عەقڵ و سینەو دڵی مرۆڤەکاندا پەنهانکراون، هاوەڵەکانیان، خاوەنەکانیان پەنهانیان دەکەن، بەڵام خوا ﷻ بەو

نهێنییانـە زانایـە، بۆیـەش دەفەرمـوێ: ﴿بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾، چونکـە ئـەو نهێنییانـە هێنـدە شـێردراوەو پەنهانـن لـە سـینەکاندا، وەك بووبـن بـە هـاوەڵ و خاوەنـی ئـەو سـینانە، چونکـە هـەر لەوێـدان و لێیـان ناچنـە دەر.

هۆکارێکـی دیکـەی ئـەو ناونرانـە، ئەوەیـە کـە ئـەو نیـازو مەبەسـت و خولیـاو ئاواتانـە، ئەوەنـدە کاریگەرییـان لەسـەر دڵ و دەروونـەکان هەیـە[1] و، هێنـدە کاریگـەرن لەسـەر خاوەنـی سـینەکان کـە بەمـلاولادا بیانجووڵێنـن، وەك بووبنـە هـاوەڵ و خاوەنیـان! ئنجـا خـوای پـەروەردگار بـۆ زانینـی نهێنیـی ئاسـمانەکان و زەوی، وشـەی (عَالِـم)ی بەکارهێنـاوە، بـەڵام بـۆ ئاگاداریـی بـە نهێنیی سینەو دڵ و دەروونـەکان (عَلِیـم)ی بەکارهێنـاوە، کـە دیـارە (عَلِیـم) ڕێژگـەی زێدەڕۆیـی (صیغة المبالغة)یـە بـۆ (عَالِـم)، لەبەرئـەوەی نهێنیی نێـو دڵ و سـینەکان بـە نسـبەت ئێمـەی مرۆڤـەوە، زۆر کاریگـەرن و زۆریـش گرنگـن کـە پەییـان پـێ ببردرێ، خـواش ﷻ بـەر لـەوەی سـزادان و پاداشـت دا ئـەوەو لێپرسـینەوە لەگـەڵ بەندەکانـی دا بکات لەسـەر کـردەوە ڕواڵەتییەکانیـان، لەسـەر حاڵەتـە پەنهانەکانیـان ئەوەیـان لەگەڵـدا دەکات، چونکـە لەڕاسـتییدا کـردەوە ڕواڵەتییەکانیشـیان، هـەر لـەو سـەرچاوەی عەقـڵ و دڵ و دەروون و، نیـازو مەبەسـت و خولیـاو ئاواتانـەوە هەڵدەقوڵـن.

ڕاسـتییەکی دیکـەی دووەم ئەوەیـە، کـە خـوا ئێمـەی کردۆتـە جێنشـینی خـۆی لەسـەر زەوی، کـە دەفەرمـوێ: ﴿هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَكُمۡ خَلَٰٓئِفَ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾، خـوا ئـەو زاتەیـە کـە ئێـوەی کردۆتـە جێنشـین لەسـەر زەوی، (خَلَائِـف) کـۆی (خلیفة)یـە، و (خُلَفَـاء) کـۆی (خَلِیـف)ە، هەردووکیـان بـە مانـای جێنشـین دێـن، جێنشـینبوونی ئێمـە بـۆ خـوا لەسـەر زەوی دوو واتـای هـەن:

یەکەم: خوا ئێمەی هێناوەتە شوێنی کەسانێك، کە پێش ئێمە لەسەر زەوی بوون، واتە: جیل لە دوای جیل، شوێنی یەکدی دەگرنەوە.

---

(١) ئەوەم نەدیوە ڕوونکەرەوانی قورئان باسیان کردبێ، ڕەنگە هەشبێ و من نەمدیبێ.

دووەم: واتایەکی دیکەی، کە من ئەمەی دووەمیانم پێ ڕاسترە، ئەوەیە کە خوا ئێمەی کردۆتە جێنشینی خۆی لەسەر زەوی، یانی: خوا ﷻ دەستی مرۆڤانی ئاوەڵا کردۆتەوە بۆ تەصەڕروف کردن لە زەویدا، چاکە دەکەن یان خراپە دەکەن! گرنگ ئەوەیە کە دەستی ئاوەڵا کردوون و دەستی کردوونەوە، کەواتە: بە کردەوە مرۆڤ جێنشینی خوایە لەسەر زەوی، ئنجا یان جێنشینێکی سەر ڕاست و چاك دەبێ و، سەرەنجام سەربەرزو ڕوو سوور دەردەچێ، یان جێنشینێکی خراپ دەبێ و، چەپلەك و نارێك دەبێ و، سەرەنجام تووشی سزاو جەزرەبەی خوا دێ، لەسەر ئەوەی کە باش جێنشینایەتیی خوای نەکردوەو، باش تەصەڕروفی نەکردوە لە زەویدا.

پێشتریش باسی ئەو بابەتەمان کردوە، کە هەندێك لە زانایان پێیان وایە ناگونجێ بە مرۆڤ بگوترێ: جێنشینی خوا (خليفة الله) یەکێك لەوانە ئیبنو تەیمییەیە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ)، هەروەها یەکی دیکە لە زانایان (حسن حبنكة الميداني) (ڕەحمەتی خوای لێ بێ)، کە ئەویش زانایەکی گەورەی هاوچەرخی سووریا بوو، هەروەها هەندێك زانای دیکەش هەن، بەڵام لە ڕاستییدا ئەگەر ئینسان باشی لێ ورد بێتەوە: بە کردەوە مرۆڤ جێنشینی خوایە لەسەر زەوی، ئنجا ئەوە کە مرۆڤ جێنشینی خوایە لەسەر زەوی، بە مانای ئەوە نیە کە ئەوە لە خودی خۆیدا، بێ ئەوەی تەماشای نێوەڕۆك و چۆنیەتییەکەی بکرێ، شتێکی گەورەو چاك (فضيلة) بێ، بەڵکو بە پێی نێوەڕۆك و چۆنیەتییەکەی، حوکمەکەی دیاریی دەکرێ، هەیە جێنشینێکی باشە، وەك پێغەمبەران (عَلَيْهِم الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) کە خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلۡنَٰكَ خَلِيفَةً فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾ ص: ٢٦، هی واشە جێنشینێکی خراپەو، خراپ جێنشینایەتیی دەکات، هەروەك چۆن کەسێك کەسێکی دیکە دەکات بە جێگرەوەو جێنشین و وەکیلی خۆی، بەڵام بە شێوەیەکی خراپ دەیکات و، تووشی سزاو لێپرسینەوە دێ، ﴿ فَمَن كَفَرَ فَعَلَيۡهِ كُفۡرُهُۥۖ ﴾.

ئنجا هەر کەسێك بێبڕوا بێت، زیانی بێبڕواییەکەی بۆ خۆیەتی، ﴿ وَلَا يَزِيدُ ٱلۡكَٰفِرِينَ كُفۡرُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ إِلَّا مَقۡتٗاۖ ﴾، بێبڕوایی بێبڕوایانیش لە لای پەروەردگاریان

هەر خەشم و قین و توورەییان بۆ زیاد دەكات، ﴿ وَلَا يَزِيدُ ٱلْكَٰفِرِينَ كُفْرُهُمْ إِلَّا خَسَارًا ﴾، هەروەها بێبڕواییان بێبڕواییەكەیان بەس زیانبارییان بۆ زیاد دەكات.

ڕاستییەكی دیكەی سێیەم ئەوەیە، كە فەرموێ: ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُمْ شُرَكَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، خوا ﷻ بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ، ڕوو لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان بكات و بفەرموێ: ئایا ئەو هاوبەشانەتانتان دیون كە لە جیاتی خوا، یان جگە لە خوا لێیان دەپاڕێنەوە! ﴿ أَرُونِى مَاذَا خَلَقُوا۟ مِنَ ٱلْأَرْضِ ﴾، پێشانم بدەن: چییان لەزەوی دروستكردوە! وشەی: ﴿ أَرَءَيْتُمْ ﴾، هەندێ لە زانایان هەر بە مانا ڕواڵەتییەكەی خۆی لێكی دەدەنەوە، كە دیتنە واتە: ئەو هاوبەشانەتانتان بینیون و سەرنجتان داون بە چاوی عەقڵ و دڵ، یاخود بە چاوی سەر تەماشاتان كردوون؟ هەندێكیشیان وایان لێكداوەتەوە كە: ﴿ أَرَءَيْتُمْ ﴾، یانی: هەواڵم پێ بدەن (أخبروني) هەواڵم پێ بدەن، دەربارەی ئەو هاوبەشانەتان كە لە جیاتی خواو جگە لە خوا لێیان دەپاڕێنەوە، هەواڵم پێ بدەن لەبارەیانەوە، ﴿ أَرُونِى مَاذَا خَلَقُوا۟ مِنَ ٱلْأَرْضِ ﴾، پێشانم بدەن چییان لە زەوی دروستكردوە، ﴿ أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ ﴾، یاخود هاوبەشییان هەیە لە ئاسمانەكاندا، واتە: ئەگەر شتێك یان بەشێكیان لە زەوییدا دروستكردوە، پێشانم بدەن، یاخود ئەگەر لە زەوییدا هیچیان دروستنەكردوە، ئایا هاوبەشیەتییان هەیە لە دروستكردنی ئاسمانەكاندا؟ ﴿ أَمْ ءَاتَيْنَٰهُمْ كِتَٰبًا فَهُمْ عَلَىٰ بَيِّنَتٍ مِّنْهُ ﴾، یاخود ئەگەر ناتوانن شتێكم پێشان بدەن كە لە زەوییدا دروستیان كردوە، یان ئیسپاتی بكەن كە لە دروستكردنی ئاسمانەكاندا هاوبەشیەتییان هەیە، ئایا كتێبێكمان پێداون بەوان، بەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانە، كە ئەوان لەسەر ڕۆشنایی بن لەو كتێبەوە؟! واتە: ئایا بەڵگەیەكیان هەیە لەو كتێبەوە كە تێمە پێمان داون لەبارەی ڕاستیی بتپەرستیی و هاوبەش بۆ خوا دانانەوە؟! ﴿ بَلْ إِن يَعِدُ ٱلظَّٰلِمُونَ بَعْضُهُم بَعْضًا إِلَّا غُرُورًا ﴾، بەڵكو ڕاستییەكەی ئەوەیە كە ستەمكاران تەنیا بەڵێنی فریودەرو هەڵخەڵەتێنەر بەیەكدی دەدەن، واتە: سەرانی ئەهلی كوفرو شیرك، بەڵێن و گفتی فریودەرانە

بە شوێنکەوتووەکانیان دەدەن، کە ئەو بت و صەنەمانە، یاخود ئەو پەرستراوانە، یان هەر شتێکی هەن، شەفاعەتتان بۆ دەکەن و، لە خواتان نزیك دەخەنەوەو، ئەوانەش زیان و قازانجیان بەدەستە، نەخۆشیی و شیفایان بەدەستەو سەرکەوتن و ژێرکەوتن و ... هتد، کە ئەوە هەمووی بەڵێنی فریودەرانەو درۆ بووە، لە لایەن دەمڕاستەکانەوە، بە شوێنکەوتووە لاساییاکەرەوەکان دراوە.

ڕاستییەکی دیکەی چوارەم: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُمۡسِكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ أَن تَزُولَاۚ﴾، بە دڵنیایی خوا ئاسمانەکان و زەوی دەگرێ کە لابدەن، واتە: دەیانگرێ بۆ ئەوەی لانەدەن، هەندێك لە زانایان وایان لێکداوەتەوە، ﴿أَن تَزُولَا﴾، واتە: (أَنْ لاَ تَزُولا) واتە: بۆ ئەوەی لانەدەن، هەندێکیش وایان لێکداوەتەوە: ﴿أَن تَزُولَا﴾، واتە: (كَرَاهَةَ أَنْ تَزُولا)، واتە: نەبادا لابدەن، یاخود: نەبادا لەبەین بچن، چونکە وشەی (تَزُولا) هەم بە مانای لادان دێ، بە مانای لادانی ئاسمانەکان و زەوی لەو سیستەمەی خوا بۆی داناون، هەم بە مانای لاچوون و لەبەین چوونیش دێ، ﴿وَلَئِن زَالَتَآ﴾، ئەگەر لاشبدەن، یان لە نێویش بچن، ﴿إِنۡ أَمۡسَكَهُمَا مِنۡ أَحَدٖ مِّنۢ بَعۡدِهِۦٓۚ﴾: (مَا أَمسَكَهُمَا)، هیچ کەسێك لە دوای وی (لە دوای خوا ﷻ) ناتوانێ بیانپارێزێ و، بیانگرێ و نەهێڵێ لابدەن لەو سیستەمەی خوا بۆی داناون، یاخود نەهێڵێ لەبەین بچن و نەمێنن، ﴿إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورٗا﴾، بە دڵنیایی ئەو زۆر هێدیی، زۆریش لێبوردەیە، (حليم) واتە: هێدیی و مەند، پێچەوانەی (سَرِيعُ الغَضَب)ە، کەسێك کە زوو تووڕە دەبێ، خوا ﷻ زۆر هێدیی و مەندە زوو تووڕە نابێ، زۆریش لێبوردەیە، زۆر چاوپۆشیی دەکات لە هەڵەو کەم و کوڕیی بەندەکانی.

ڕاستییەکی دیکەی پێنجەم بریتیە لەوەی کافرەکانی ڕۆژگاری موحەممەد ﷺ بەرلەوەی پێغەمبەری کۆتایی بێت و، خوا ڕەوانەی بکات و بانگیان بکات بۆ لای خواو، پەیامی خوایان پێ بگەیەنێ: زۆر بە جەختکردنەوە سوێندیان بە خوا دەخوارد، کە ئەگەر بێت و ئەوانە هۆشیارکەرەوەو ورياکەرەوەیەکیان بۆ بێ، لە

هەمـوو کـەس سـەر ڕاسـترو چاکتر دەبـن، ﴿ وَأَقْسَمُوا بِاللَّهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ ﴾، سـوێندیان بـە خـوا خـوارد بەوپـەڕی سـوێند خواردنـەوە، واتـە: بەوپـەڕی جەختکردنـەوەو بەوپـەڕی تواناییانـەوە، سـوێندیان بـە خـوا خـوارد، ﴿ لَئِن جَاءَهُمْ نَذِيرٌ ﴾، ئەگـەر هۆشـیارکەرەوەو، ترسـێنەرێکیان بـۆ بـێ، واتـە: پێغەمبەرێك کـە بیانترسـێنێ و، وریایان بکاتـەوە، ﴿ لَيَكُونُنَّ أَهْدَىٰ مِنْ إِحْدَى الْأُمَمِ ﴾، بـە دڵنیایـی و بەجەختکردنـەوەوە ئـەوان ڕێـی ڕاسـتگرتووتر دەبـن لـە هـەر کام لـە کۆمەڵگایـەکان، واتـە: چ کۆمەڵگایـەك لـە هەمـووان ڕێـی ڕاسـتگرتووترە، ئـەوان لەویـش ڕێـی ڕاسـتگرتووتر دەبـن، ﴿ فَلَمَّا جَاءَهُمْ نَذِيرٌ ﴾، بـەڵام کاتێـك وریاکـەرەوەو هۆشـیار کەرەوەیەکیان بـۆ هـات، کـە (محمـد)ە ﷺ ﴿ مَّا زَادَهُمْ إِلَّا نُفُورًا ﴾، هاتنـی ئـەو، تەنهـا سـڵەمینەوەو دوورکەوتنـەوەی تێـدا زێـدە کـردن.

بـە چ هاندەرێـك؟ ﴿ اسْتِكْبَارًا فِي الْأَرْضِ وَمَكْرَ السَّيِّئِ ﴾، بـە مەبەسـتی خـۆ بەزلگرتـن لـە زەویـداو، بەمەبەسـتی پیلانـی خـراپ، ئەوانـە تەماشـایان کـردوە، وەك چـۆن ئێسـتاش ڕژێمـە عەلمانییـەکان و، حیزبـە عەلمانییـەکان و، هەمـوو ئەوانـەی کـە دژایەتیـی ڕووناکیـی هیدایەتـی خـوا دەکـەن، لـە ژێـر هـەر ناوێـکدا بێـت، تەماشـا دەکـەن ئەگـەر بێـت و نایـن و پەیامـی خـوا بچەسـپێ، ئـەوان ئـەو بـەزم و بـازاڕەی پێکیانـەوە نـاوە، لـە کاتـی نەزانیـی و تاریکایـی کۆمەڵـگادا، لـە کاتـی نەبوونـی ڕووناکیـی خـۆری ئیسـلام و شـەریعەتدا، ئـەو بازاڕەیـان لـێ تێکدەچـێ، ئەگەر ئیسـلام دەسـەڵاتی هەبـێ، چـۆن لـێ دەگـەڕێ، ماڵێك، یـان بنەماڵەیـەك، یان عەشـیرەتێك، یان حیزبێـك دەسـت بەسـەر موقەددەراتـی وڵاتێـکدا بگـرێ، عیبـادو بیـلاد بـە هـی خـۆی بزانـێ، مرۆڤـەکان بـە کۆیلـەی خـۆی بزانـێ و، کـەل و پەلـەکان و ئیمکانیەتەکـەش بـە موڵکـی خـۆی بزانـێ، ئەگـەر دینـی خـوا ﷻ دەسـتەڵاتی هەبـێ ڕێ بـەوە نـادا، کـە بـە داخـەوە ئێسـتا زۆربـەی وڵاتانـی مسوڵماننشـین بـەو شـێوەیەن، یـان حوکمێکـی عەسـکەرتارییە، یـان حیزبێـك خـۆی سـەپاندوە، یـان بنەماڵەیـەك خـۆی سـەپاندوەو حوکمێکـی میراتییـە، ئـەوەش هەمـووی پێچەوانـەی ئەوەیـە کـە خـوا ﷻ فەرمـانی

کـردوە کۆمەڵگاکانـی بەشـەری پـێ ئیـدارە بدرێـن، هەروەهـا پێچەوانـەی عەقـڵ و مەنتیقـەو، پێچەوانـەی بەرژەوەندیـی خەڵکـەو، پێچەوانـەی دادگەریـی خوایـە ﷻ، کـە نیعمەتەکانـی بـۆ هەمـووان خوڵقانـدوون، بۆیـە دەفەرمـوێ: کاتێـك کـە کافرەکانـی ڕۆژگاری پێغەمبـەر ﷺ وشیارکەرەوەیەکیان بـۆ هـات، هـەر سـڵەمینەوەو دوورکەوتنـەوەی تێـدا زیـاد کـردن، بـە مەبەسـتی ئـەوەی لـە زەویـدا خـۆ بـەزل بگـرن و، پیلانـی خـراپ بگێـڕن، ﴿وَلَا يَحِيقُ ٱلْمَكْرُ ٱلسَّيِّئُ إِلَّا بِأَهْلِهِۦ﴾، فێڵـی خراپیـش تەنیـا سـەری خاوەنەکـەی دەگرێتـەوەو، تەنیـا دەوری ئـەو دەدا.

ڕاسـتییەکی دیکـەی شەشـەم، ئەوەیـە کـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا سُنَّتَ ٱلْأَوَّلِينَ فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًا وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَحْوِيلًا﴾، ئایـا جگـە لـە هاتنـی یاسـای پێشـینان، چاوەڕێـی چـی دیکـە دەکـەن؟! واتـە: یاسـای خـوا کـە لـە میللەتـە پێشـووەکاندا چەسـپاوەو، بەسـەریاندا جێبەجـێ بـووە، کـە بەدڵنیاییـی گۆڕیـن بۆ یاسـای خـوا نابینـی و، لادانیـش بـۆ یاسـای خـوا نابینـی. هەرگیـز! (لـن) بـۆ (تأبیـد) بـۆ لابردنـەو بـۆ (تأكيـد)ە، هەرگیـز نابینـی یاسـای خـوا بگـۆڕدرێ، هەروەهـا هەرگیـز نابینـی یاسـای خـوا لابـدرێ، چونکـە شـتێك کـە بویسـترێ نەهێڵـرێ، دوو حاڵەتـی بـۆ هـەن:

أ- یان لایدەبەی و، شتێکی دیکەی لە شوێن دادەنێی.

ب- یاخود لای نابەی، بەڵام لایدەدەی، بەڵام نە لابردن هەیە بۆ یاسای خوا، نە لادانیش هەیە.

ئنجـا خـوا ﷻ ئـەو ڕاسـتییە پـتر دەخاتـە ڕوو و دەفەرمـوێ: ئەگـەر مرۆڤـەکان سـەرنجی مێـژوو بـدەن، پەندیـان لـێ وەردەگـرن، پەنـد لـە ڕووداوەکانـی مێـژوو وەردەگـرن، خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿أَوَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾، ئایـا بـە زەوییـدا نەڕۆیشـتوون سـەرنج بـدەن سـەرەنجامی ئەوانـەی پێـش وان چـۆن بـوو؟! بـە زەوییـدا ڕۆیشـتن، دوو واتـای هـەن، وەك زانایـان دەڵێـن: ڕۆیشـتنی کردەیـی هەیـەو، ڕۆیشـتنی فیکریـی هەیـە.

أ- ڕۆیشتنی کردەیی ئەوەیە کە بە کردەوە مرۆڤ بڕواو، تەماشای هەڕەمەکانی میسر بکات، تەماشای شوێنی گەلی عادو گەلی سەموود و گەلی لووط بکات، لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، لە ئێران، لە میزۆپۆتامیا.... هتد، تەماشای شوێنەوارەکان بکات، ئەوە ڕۆیشتنی کردەییە.

ب- ڕۆیشتنی فیکریی ئەوەیە کە مێژوو بخوێنێتەوە، بە چاوی عەقڵ و دڵ تەماشای ڕووداوەکان بکاو، لێیان وردبێتەوە، ﴿وَكَانُوٓاْ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً﴾، ئەوانەی پێش وان لەوان بەهێزتربوون، واتە: بێبڕوایانی پێشوو، لە کافرەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ بەهێزتربوون، تواناداتر بوون، بەڵام کاتێك لایاندا، خوا سزای دان و ئەو بەهێزییەیان نەبووە هۆی ئەوەی چەپاڵە بدرێن و، دەربازو قوتاربن، ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعْجِزَهُۥ مِن شَىْءٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ﴾، ناشگونجێ هیچ شتێك نە لە ئاسمانەکان و نە لە زەویدا، خوا دەستەوسان بکات، (إعجاز) واتە: دەستەوسانکردن، دەستەپاچەکردن، (جَعلُ المُقَابِلِ عَاجِزاً)، هیچ کەس خوای پێ دەستەوسان ناکرێ، (عاجز) نەك بە مانا کوردییەکەی، یەکێك دەڵێ: لێت عاجز بووم، واتە: لێت تووڕە بووم! نەخێر، (عَجْز) یانی: بێ توانایی، (عاجِزْ) کەسێکە بێ توانابێ، (مُعْجِز) کەسێکە بەرانبەرەکەی خۆی بێ توانا بکا، هیچ کەسێك و هیچ شتێك لە ئاسمانەکان و زەویدا خوا دەستەپاچەو بێ توانا ناکات و، لە دەستەڵاتی خوا دەرباز نابێ، ﴿إِنَّهُۥ كَانَ عَلِيمًا قَدِيرًا﴾، بە دڵنیایی خوا بەردەوام زاناو توانا بووە.

ئنجا لە کۆتایی دا خوای پەروەردگار ئەو ڕاستییەی حەوتەم دەخاتە ڕوو، کە خوا هێدیی و مەندەو، پەلە ناکات لە سزادانی بەندەکان دا، ئەگەرنا ئەگەر پەلەی بکردایە، کەسێکی لەسەر زەوی دەدا، نەك هەر مرۆڤ بگرە ژیاندارو زیندەوەری لەسەر زەوی نەدەهێشت، ﴿وَلَوْ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِمَا كَسَبُواْ﴾، ئەگەر خوا خەڵکی گرتبایە بە هۆی ئەوەوە کە کردوویانە، واتە: خراپەو تاوانەکانیان، ﴿مَا تَرَكَ عَلَىٰ ظَهْرِهَا مِن دَآبَّةٍ﴾، هیچ شتێکی لەسەر پشتێ نەدەهێشتەوە، لێرەدا باسی زەوی نەکراوە، بەڵام (ظَهرِهَا) ڕاناوی

(ها) ڕاناوی مێیەنەیەو، بۆ زەوی دەچێتەوەو، بە سیاق دەزانرێ کە مەبەست زەوییە، چونکە مرۆڤەکان و ژیاندارەکان لەسەر زەوی دەژین، ئەگەر خوا خەڵکی گرتبایە، بەهۆی ئەوەوە کە کردوویانە، لە تاوان و خراپە، ئەگەر سزای دابان، ژیاندارێك و پێڕۆیەکی لەسەر پشتی زەوی نەدەهێشت، ﴿ وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ﴾، بەڵام دوایان دەخات بۆ کاتێکی ناوبراوو دیاریکراو، کە ڕۆژی قیامەتە، ﴿ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ ﴾، ئنجا هەر کاتێك کاتی دیاریکراوی خۆیان هات، واتە: کاتی دیاریکراوی خۆیان بۆ لەبەین چوون، ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِعِبَادِهِۦ بَصِيرًۢا ﴾، بە دڵنیایی خوا بینەرە بۆ بەندەکانی، هەموو شتێکیان دەبینێ و، هەموو شتێکیانی ئاگا لێیە، ئنجا ئەوانەی خراپەیان کردوە، سزای پڕ بە پێستیان دەدا، نەك تەنیا هی ئەو خراپانەیان کە خەڵك پێیان زانیون، بەڵکو هی ئەو خراپانەش کە بە پەنامەکیی کردوویانن، هەروەها ئەو نیازو مەبەست و پیلان و فێڵ و تەڵەکەیەی، کە لە عەقڵ و دڵیشیاندا چەسپاندوویانە، چ دوایی بۆیان جێبەجێ کرابێ، یان جێبەجێ نەکرابێ.

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

**خـوا ﷻ خـۆی وەسـف دەکات بـە زانـای پەنهانـی گـەردوون و، زۆر زانـا بـە نهێنییەکانـی دەروونـی مرۆڤـان و، گێـڕەری مرۆڤـان بـە جێنشـینانی زەوی و، خسـتنەڕووی ئـەو ڕاسـتییە کـە کوفـری بێبڕوایـان، مایـەی خەشـم و تووڕەیـی خـواو، زیاتـر زیانبارییـی خۆیانـە:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عَـٰلِمُ غَيْبِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٣٨﴾ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَكُمْ خَلَـٰٓئِفَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ فَمَن كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُۥ ۖ وَلَا يَزِيدُ ٱلْكَـٰفِرِينَ كُفْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ إِلَّا مَقْتًا ۖ وَلَا يَزِيدُ ٱلْكَـٰفِرِينَ كُفْرُهُمْ إِلَّا خَسَارًا ﴿٣٩﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە شەش بڕگەدا:**

**١)- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عَـٰلِمُ غَيْبِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، بە دڵنیایی خوا زانای پەنهانی ئاسمانەکان و زەوییە. واتە: هەر پەنهان و نادیارییەك لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، خوا ﷻ دەیزانێ، لە هەر گۆشەیەکی زەوی و لە هەر گۆشەیەکی ئاسمان، لە هەر کام لە کەهکەشانەکان، لە هەر شوێنێك، نادیارێك و پەنهانێك هەبێ، هیچ شتێك لە خوا پەنهان و نادیار نیە.**

**٢)- ﴿ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴾، بە دڵنیایی ئەو زۆر زانایە بە هاوەڵ و خاوەنی سینەکان.**

**(عَالِـم) نـاوی بکـەر (إسـم فَاعِـل)ە، بـەڵام (عَلِيـم) ڕێژگـەی زێدڕۆیـی (صِيغَـة المُبَالَغَـة)ی (عَالِـم)ە.**

وەك پێشتر گوتمان: لەبەرئەوەی نهێنیی نێو دڵ و دەروون و سینەی مرۆڤەکان، بە نسبەت مرۆڤەکانەوە زانینی ئەو نهێنییانە گەورەترو گرنگترە، لەبەرئەوە خوا وشەی (عَلِیم)ی بۆ بەکارهێناوە، واتە: زۆر زانایە بەو نهێنییانەی کە بوونە هاوەڵ و خاوەنی سینەکان، نهێنییەکانی سینەکان، وەك بووبن بە هاوەڵ و خاوەن بۆ سینەکان، وا لەوێدا نیشتەجێبوون، یان هێندە کاریگەرن لەسەر خاوەنی ئەوسینەو دڵ و دەروونانە، بۆیە خوا ﷻ بە (ذات) ناوی بردوون، واتە: (صَاحِبَة) هاوەڵ، خاوەن.

ئنجا دوای ئەوەی خوا ﷻ ئەو ڕاستییە مەزنە دەخاتە ڕوو، کە هیچ شتێك لەخوا پەنهان نیە لە ئاسمانەکان و زەویداو، هیچ شتێك نیە کە خوا ﷻ نەیزانێ، هەروەها هیچ شتێك نیە لە دەروون و سینەی بەندەکاندا، کە خوا ﷻ پێی ئاگادار نەبێ، ئنجا دەفەرموێ:

٣)- ﴿هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ فِي ٱلْأَرْضِ﴾، {ئەو خوا زانایە بە پەنهانەکانی ئاسمان و زەوی و، بە نهێنیی سینەکان} ئێوەی گێڕاوە بە جێنشینانی (خۆی) لە زەوییدا.

(خَلَائِف) کۆی (خَلِیفَة)یەو (خُلَفَاء) کۆی (خَلِیف)ە، کە هەردووکیان بە مانای جێنشین دێن، (الخلیفة: هُوَ الَّذِي يَخلُفُ غَيرَهُ فِي أمرٍ كَانَ لِذَلِكَ الغَيْر)، (خَلِيْفَة): خەلیفە کەسێکە دەبێتە جێنشین و جێگرەوەی کەسێك، لە شتێك دا کە هی ئەو کەسە بووە، کە بۆتە جێنشینی.

هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ﴿هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ فِي ٱلْأَرْضِ﴾، (أي: تَخْلُفُونَ الأُمَمَ السَّابِقَة) واتە: دەبنە جێنشینی گەلانی پێشوو، هەڵبەتە ئەم ڕستە قورئانییە ئەو واتایە هەڵدەگرێ، بەڵام ئەگەر مەبەست لەو مانایە ئەوە بێ، کە ناگونجێ بڵێین: مرۆڤ جێنشینی خوایە، ئەوە ڕاست نیە، چونکە خوا ﷻ لە سوورەتی (الأعراف)دا، زۆر بە ڕوونیی دەفەرموێ: ﴿وَيَسْتَخْلِفَكُمْ فِي ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ ١٢٩﴾، واتە: (خوا) ئێوە دەکات بە جێنشین لە زەویدا،

دوایـی سـەرنج بـدات چـی دەكـەن و، چـۆن دەكـەن؟ چـۆن جێنشـینایەتیی خـوا دەكـەن لەسـەر زەوییـدا؟ كەواتـە: ئـەو مانایـەش: (تَخلُفُونَ اللّـهَ فِي التَّـصَرُّفِ فِي الأَرض)، (دەبنـە جێنشـینی خـوا لـە مامەڵـە كـردن لـە زەوییـدا) ئـەو مانایـەش هەڵدەگـرێ، كـە مـن ئـەم مانایـەم لەگـەڵ ئـەم سـیاقەدا پـێ گونجاوتـرە.

هەروەهـا خـوا ﷻ لـە سـوورەتی (الحدیـد)دا، دیسـان زۆر بـە ڕوونیـی ئـەوە دەخاتـە ڕوو، كـە ئێمـە جێنشـینی ئەویـن لـە زەوییـدا، دەفەرمـوێ: ﴿وَأَنفِقُواْ مِمَّا جَعَلَكُم مُّسۡتَخۡلَفِينَ فِيهِ﴾، لـەو مـاڵ و سـامانە ببەخشـن كـە ئێـوەی تێـدا كردۆتـە جێنشـین، یانـی: خـوا ئـەو مـاڵ و سـامانەی خسـتۆتە دەسـتی ئێـوەو، كردوونـی بـە جێنشـینی خـۆی، كـە چـۆن لـەو مـاڵ سـامان و نیعمەتانـەی خـوای پـەروەردگاردا، تەصـەڕروف دەكـەن و، چـۆن مامەڵەیـان پـێ دەكـەن!

٤)- ﴿فَمَن كَفَرَ فَعَلَيۡهِ كُفۡرُهُۥ﴾، ئنجا هەر كەسێك بێبڕوا بوو، زیانی بێبڕواییەكەی بۆ خۆیەتی، كەواتە: دەگونجێ هەندێك لە جێنشینانی خوا بێبڕوا بن و بە خراپیی جێنشینایەتیی خوا دەكەن، چونكە دوای ئەوەی دەفەرموێ: ئێوەی كردوە بە جێنشین لەسەر زەوی، یەكسەر باسی بێبڕوایی دەكا، دەفەرموێ: ﴿فَمَن كَفَرَ فَعَلَيۡهِ كُفۡرُهُۥ﴾، یانی: هەر كەسێك لەو جێنشینانەی خوا كردوونی بە جێنشین و جێگری خۆی، دەستی ئاوەڵا كردوونەوە لە زەوییدا، هەر كەسێك بێبڕوا بوو، ئەوا زیانی كوفرەكەی بۆ خۆیەتی.

٥)- ﴿وَلَا يَزِيدُ ٱلۡكَٰفِرِينَ كُفۡرُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ إِلَّا مَقۡتٗا﴾، بێبڕوایی بێبڕواكانیش لـــــە لای پەروەردگاریان، هەر خەشم و قینیان زیاتر بۆ دەستەبەر دەكات و، بۆیان زیاد دەكات.

كـە دەفەرمـوێ: ﴿إِلَّا مَقۡتٗا﴾ (المَقتُ: البُغضُ الشَّدِید)، تووڕەیـی زۆر، بـە كوردیـی دەبێتـە خەشـم و قیـن، هەروەهـا (مَقْـت) ئـاواش لێكدراوەتـەوە: (البُغضُ مَعَ خِزْيٍ وَصَغَـارٍ) ڕق لـێ هەڵسـان وێـڕای سەرشـۆڕیی و بچـووك بوونـەوەو زەبوونیـی، واتـە: بەهـۆی كوفـرەوە بێبڕوایـان خەشـم و تووڕەیـی پەروەردگاریـان بـۆ خۆیـان زیـاد دەكـەن، هەروەهـا تووڕەیـی و زەبـوون كـردن و شـەرمەزار كـردن، لـە لایـەن پەروەردگاریانـەوە بـۆ خۆیـان زیـاد دەكـەن.

٦)- ﴿وَلَا يَزِيدُ ٱلْكَٰفِرِينَ كُفْرُهُمْ إِلَّا خَسَارًا﴾، بێبڕوایان بێبڕواییەکەیان هەر زیانیان بۆ زیاد دەکات.

کە دەفەرموێ: ﴿إِلَّا خَسَارًا﴾، دەڵێ: (الخَسَارُ: مَصْدَرُ خَسِرَ، مِثْلُ: الخَسَارَة، وَهُوَ نُقْصَانُ التِّجَارَة، واسْتُعِيرَ لِخَيْبَةِ العَمَلِ، شُبِّهَ عَمَلُهُم فِي الكُفْرِ، بِعَمَلِ التَّاجِرِ وَالخَاسِرِ، أي: الَّذِي بَارَتْ سِلْعَتُهُ فَبَاعَ بِأَقَلَّ مِمَّا اشْتَرَاهَا بِهِ فَأَصَابَهُ الخَسَار، فَكُلَّمَا زَادَ بَيْعاً، زَادَتْ خَسَارَتُهُ حَتَّى تُفْضِيَ بِهِ إِلى الإِفْلَاس). ئەمە شیکردنەوەیەکی جوانی وشەی (خَسَار)ە.

واتە: (خَسَار) چاوگی (خَسِرَ)یە، وەك (خَسَارَة)، (خَسَار)و (خَسَارَة) هەردووکیان چاوگن، (خَسَارَة)و (خَسَار)یش لە زمانی عەرەبییدا بریتیە لە کەمکردنی بازرگانیی و، زیانکردنی بازرگانیی و سەوداو مامەڵە، بەڵام لێرەدا ئەو وشەیە خوازراوەتەوە بۆ کردەوەیەك کە پەشێمانیی و بێ بەرهەمیی بە دوای خۆیدا بێنێ، کردەوەی بێبڕوایەکان لە کوفردا، چوێنراوە بە کاری بازرگانێکی زیان لێکەوتوو، کە کەلوپەلەکەی بێ ڕەواج دەبێ و، بە کەمتر لەو نرخەی کە پێی کڕیوە، دەیفرۆشێ {واتە: مایەکەی خۆیشی بۆ تێهەڵناهێنێتەوە، وەك دەڵێن: بنە تۆوی خۆیشی بۆ ناکاتەوە} ئنجا تاکو ئەو زیاتر لەو کەلوپەلەی خۆی بفرۆشێ، زیانەکەی زیاتر دەبێ و دەستمایەکەی زیاتر لە دەست دەچێ، تاکو سەرەنجام تووشی مایە پووچیی و قەلۆشبوونی دەکات.

کەواتە: کافرانیش تاکو کوفرەکەیان خەستتر بێ، زیاتر تووشی زیانباریی دێن و تووشیماڵوێرانیی و، مایە پووچیی دێن.

**مەسەلەی دووەم:**

**ئـەو پەرسـتراوانەی هاوبەشـدانەران بـە خەیاڵـی خۆیـان، بـە هاوبەشـی خوایـان دادەنێـن، هیـچ پشـك و بەشـێکیان لـە دروسـتکردنی گەردوونـدا نیـەو، هیـچ بەڵگەیەکیشـیان لـە کتێبێکـی خوایـی لەسـەر ڕەوایـی شـیرك لەبـەر دەسـتدا نیـەو، تەنیـا یەکـدی فریـو دەدەن، دەمڕاسـت و پەیڕەویـی لێکـراوەکان، شـوێنکەوتووە لاسـاییکەرەوەکانی خۆیـان فریـو دەدەن:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُمْ شُرَكَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَرُونِى مَاذَا خَلَقُوا۟ مِنَ ٱلْأَرْضِ أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَمْ ءَاتَيْنَٰهُمْ كِتَٰبًا فَهُمْ عَلَىٰ بَيِّنَتٍ مِّنْهُ ۚ بَلْ إِن يَعِدُ ٱلظَّٰلِمُونَ بَعْضُهُم بَعْضًا إِلَّا غُرُورًا ﴿٤٠﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُمْ شُرَكَآءَكُمُ ﴾، بڵێ: ئایا هاوبەشەکانتانتان دیون! واتە: ئەوانەی کە ئێوە پێتان وایە هاوبەشی خوان لە پەرستراوێتیی دا، بۆیە گوتراوە: ﴿ شُرَكَآءَكُمُ ﴾، هاوبەشەکان پاڵدراونە لای وان، واتە: لە ئەسڵدا هاوبەشی خوا نین و، بوونیان نیە وەك هاوبەشی خوا.

کە دەفەرموێ: ﴿ أَرَءَيْتُمْ ﴾، واتە: هەواڵم پێ بدەن، یاخود ئایا بینیوتانن؟

٢)- ﴿ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، کە لە جیاتی خوا، یان جگە لە خوا لێیان دەپاڕێنەوە، ﴿ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، یانی: (مِنْ غَيْرِ اللّٰهِ) جگە لەخوا لێیان دەپاڕێنەوە.

٣)- ﴿ أَرُونِى مَاذَا خَلَقُوا۟ مِنَ ٱلْأَرْضِ ﴾، پیشانم بدەن چییان لە زەوی دروستکردوە؟! چ شتێکیان لە شتەکانی زەوی دروستکردوە؟! یان چ شتێکیان لە زەویدا دروستکردوە؟!

لێـرەدا کـە دەفەرمـوێ: ﴿ أَرُونِى مَاذَا خَلَقُوا۟ مِنَ ٱلْأَرْضِ ﴾، (**هَـذَا أَمْـرٌ لِلتعجيـزِ وَهُـوَ فِي قُوَّةِ النَّفـيِ**)، ئـەم فەرمانکردنـە (**أَرُونـِي**) پیشـانم بـدەن، بـۆ دەسـتەپاچە کردنـەو

مەبەست پێی نەکردنە، واتە: هیچ شتێکیان لە زەوییدا دروست نەکردوە، تاکو بتوانن پێشانمی بدەن.

وشەی (مَاذَا)، (كَلِمَةٌ مُرَكَّبَةٌ مِنْ (مَا) الإِسْتِفْهَامِيَة وَ(ذَا) الَّتِي بِمَعْنَى (الَّذِي)، واتە: وشەی (مَاذَا) وشەیەکی لێکدراوە، لە (مَا)ی پرسیار کردن و (ذَا) کە بە مانای (الَّذِي)ە، (مَاذَا) واتە: چییە ئەو شتەی؟ ﴿مَاذَا خَلَقُوا۟ مِنَ ٱلْأَرْضِ﴾، چ شتێکە ئەوەی کە ئەوان لە زەوییدا دروستیانکردوە.

(من)ی ﴿مِنَ ٱلْأَرْضِ﴾، (مِنْ: الإِبْتِدَائِيَّة) (لە)ی دەستپێکردنە، واتە: چ شتێك کە لە زەوییەوە دێت، پێشانم بدەن، یاخود: (من: التَّبْعِيضِيَّة) بۆ هەندێکە، واتە: چ شتێك بەشێکە لە زەوی پێشانم بدەن، کە ئەو هاوبەشانە دروستیان کردبێ؟!

٤)- ﴿أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ﴾، یاخود ئایا هاوبەشیان هەیە لە ئاسمانەکاندا، یانی شتێکیان دروست کردبێ لە ئاسمانەکان، ئەوە هیچ ئاسمانەکانیان هەمووی دروست نەکردوە، بەڵام ئایا پشك و بەشێکیان تێیان دا هەیە؟!

کە دەفەرموێ: ﴿أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ﴾، (شرك) (إِسْمٌ لِلنَصِيبِ الْمُشْتَرَكِ بِهِ فِي مُلكِ شَيءٍ)، واتە: شیرك ناوە بۆ پشکێکی هاوبەش کە کەسێك هەیبێ لە شتێکدا، دەگوترێ: (لِيَ شِرِكٌ فِي هَذَا البَيت)، واتە: پشکم هەیە، بەشم هەیە لەوماڵەدا.

٥)- ﴿أَمْ ءَاتَيْنَـٰهُمْ كِتَـٰبًا فَهُمْ عَلَىٰ بَيِّنَتٍ مِّنْهُ﴾، {ئەوە کە نەتانتوانی شتێکم پشان بدەن کە لە زەوییدا دروستیان کردبێ و، نەشتان توانی بۆم ئیسپاتکەن کە پشك و بەشێکیان لە دروستکردنی ئاسمانەکاندا هەبێ} یان ئایا ئەو ئیددیعایە دەکەن، کە ئێمە کتێبێکمان پێداون، کە ئەوان (هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان) لەسەر بەڵگەیەکی ڕوونن لەو کتێبەدا کە پێماندا‌ون؟!

﴿فَهُمْ عَلَىٰ بَيِّنَتٍ مِّنْهُ﴾، خوێندراویشەتەوە: (عَلَى بَيِّنَاتٍ مِنهُ)، هەم بە کۆو هەم بە تاك خوێندراوەتەوە، ئایا بەڵگەیەکی ڕوونیان بەدەستەوە هەیە، لە کتێبێك کە ئێمە پێماندابن و پشتڕاستی ئەو هاوبەش بۆ خوا دانانەیان بکاتەوە؟!

٦)- ﴿ بَلْ إِن يَعِدُ ٱلظَّٰلِمُونَ بَعْضُهُم بَعْضًا إِلَّا غُرُورًا ﴾، [(بل) بۆ گواستنەوەیە] بەڵكو ئەوانە هیچیان نین، بەڵكو ستەمكاران تەنیا گفتی فریودان بە یەكدی دەدەن، یانی: نەهیچیان لە زەوی دروستكردوەو، نەك پشك و بەشیان هەیە لە ئاسمانداو، نە بەڵگەیەكی ڕوونیشیان بەدەستەوەیە لە كتێبێك كە ئێمە پێماندابن. ﴿ إِن يَعِدُ ٱلظَّٰلِمُونَ بَعْضُهُم بَعْضًا إِلَّا غُرُورًا ﴾، (إن) یانی: (ما النافية) (ما)ی لابردن، بەڵكو ستەمكارەكان تەنیا بەڵێنی فریودەر بە یەكدی دەدەن.

وشـەی (غُـرُور) چاوگـە، واتـە: فریـودان، تەنیـا بەڵێنـی فریـودان بەیەكـدی دەدەن، ئنجا ئایا كامانـە بەڵێن بـە كامانـە دەدەن؟ بـە تەئكیـد ئەوانـەی كـە دەمڕاسـت و بڕیـار بەدەسـتن، بەڵێـن بـە شـوێنكەوتووەكانیان دەدەن، ئنجـا ئـەوە چ لـە ڕۆژگاری پێغەمبـەردا ﷺ و، چ ئێسـتاش هـەر بـە هەمـان شـێوەیە، هەمـوو ئەوانـەی كـە جگـە لـە خـوا دەپەرسـتن، ڕژێمێكـی كافـر، یـان حزبێـك، یـان شەخسـێك، كەسـێك كـە بـە ڕێـی غەیـری پێغەمبـەردا ﷺ دەڕوا، خەڵـك بـە چـاوی كوێلـەو مـەڕو بـزن تەماشـا دەكات، هەمـوو ئـەو دەمڕاسـت و سـەركردانە، بەڵێنـی فریـودەر بە شـوێنكەوتووانیان دەدەن، بەڵێنێـك كـە تەنیـا كڵاویـان لەسـەر دەنێـن و هەڵیـان دەخەڵەتێنـن.

كـە دەفەرمـوێ: ﴿ بَلْ إِن يَعِدُ ٱلظَّٰلِمُونَ بَعْضُهُم بَعْضًا إِلَّا غُرُورًا ﴾، واتـە: (مَـا يَعِـدُ الظَّالِمِـيْنَ بَعْضُهُـم بَعْضَـاً وَعْـدَاً إِلاَّ وَعْـدَاً غُـرُوراً)، واتـە: سـتەمكاران هەندێكیـان تەنیـا بەڵێنـی فریـودەر بـە هەندێكیـان دەدەن، واتـە: ئـەوەی كـە لەگـەڵ یەكدیـدا باسـی دەكـەن، تەنهـا كڵاو لەسـەرنان و هەڵخەڵەتاندنـە.

ئـەوەی كـە لـەم ئایەتـە موبارەكانـە وەردەگیـرێ و، ئامانجەكـە ئەوەیـە: بەڵگـە لەسـەر ئەوانـە دابـنرێ كـە پەرسـتراوەكان، چ پەیكـەرو صەنەمـەكان بـن، چ هەمـوو پەرسـتراوەكانی دیكـە بـن، چ شـەخص بـن، چ حیـزب بـن، یـان ڕژێـم بـن، یـان پـارەو سـامان بـن، چ شـتی مەعنەویـی، یـان ماددیـی بن، ئەوانە لەڕاسـتییدا پشـت ئەسـتوور نیـن بـە هیـچ بەڵگەیـەك و، هیـچ كام لـە تایبەتمەندییەكانـی پەرسـتراوێتییان تێدانیـە،

هەروەها هیچ بەڵگەیەکی نەقڵیشیان لەسەر نیە، پەراستراویش یان دەبێ بە چاوی عەقڵ و دڵ بزانرێ و، تایبەتمەندییەکانی پەرستراوێتیی تێدا ببیندرێن و، دەبێ بەڵگەیەکی نەقڵیی (سَمْعِي) لەسەر هەبێ، بەڵام پەرستراوەکانی وان نە بەڵگەی عەقڵیی لەسەریان هەیە، نە بەڵگەی نەقڵیی، کەواتە: هەروا لەخۆڕا دەیانپەرستن و، بەبێ ئەوەی پەرستنەکەیان و بەپەرستراو دانانەکەیان بۆ ئەوان، پشت ئەستوور بێ بە بەڵگەیەکی عەقڵیی یان نەقڵیی.

## کورتە باسێک لەبارەی
## داگیرکردنی ئاسمان (غزو الفضاء)ەوە

بەڕێـــــزان!

تەعبیرێـک لـەم ڕۆژگارەدا بەکاردەهێـنرێ: داگیرکردنـی ئاسـمان (غـزو الفضـاء)، کـە ئەمـە زاراوەیەکـی ئەفسـانەیی و نازانسـتییە، ئـەو زاراوەیـە چەنـد دەیەیەکـە بـاوە، لـە نیـوەی دووەمـی سـەدەی ڕابـردووەوە (سـەدەی بیسـتەوە)، کـە بێگومـان عەرەبیـی زمانـەکان، لـە زمانـە بیانییەکانـەوە وەریان گێـڕاوە و، ئـەو زاراوەیە ڕەواجـی پەیداکردوە، ئەویـش دوای ئـەوە دێ کـە مـرۆڤ توانـی بچێتە سـەر مانـگ، هەرچەندە تاکو ئێسـتاش ئـەو مەسـەلەیە مشـتومڕی لەسـەرە، هەرچەنـدە بـە بـڕوای مـن مـرۆڤ بچێتـە سـەر مانـگ، یـان بچێتـە سـەر خڕۆکەکانـی دیکـە کـە دوورتریشـن، مـادام ئامـڕازو هـۆکاری دەسـتەبەر کردبـێ، شـتێکی ئاسـاییە، جـارێ لـە ڕووی شـەرعییەوە، نـەك هـەر ڕێـی لـێ نەگیـراوە، بەڵکـو ڕێیـدراوەو بگـرە فەرمانـی پێکـراوە، خـوا ﷻ لـە چەنـدان شـوێندا دەفەرمـوێ: هەرچـی لـە ئاسـمانەکان و زەویـدا هەیـە بـۆ ئێـوەم ڕام و دەسـتەمۆو مەیسـەر کـردوە، بـۆ دەرچـوون لـە مـەودای ئاسـمان و زەوییـش، خـوا ﷻ لە سـوورەتی (الرحمـن)دا دەفەرمـوێ: ﴿ يَٰمَعۡشَرَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ إِنِ ٱسۡتَطَعۡتُمۡ أَن تَنفُذُواْ مِنۡ أَقۡطَارِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ فَٱنفُذُواْۚ لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلۡطَٰنٖ ﴿٣٣﴾ ﴾، واتـە: ئـەی کۆمەڵـەی جنـدو مـرۆڤ! ئەگـەر توانیتـان لـە سـنوورەکانی ئاسـمانەکان و زەوی دەربچـن، دەربچـن، ناشـتوانن دەربچـن مەگـەر بـە دەسـتەڵات، دەسـتەڵات واتـە: ئـەو ئامـڕاز و هۆکارانـەی کـە لـە ئەنجامـی بـەرەو پێشـچوونی زانسـت دا، مـرۆڤ پێیـان دەگاو دەتوانـێ دروسـتیان بـکا.

دەگونجـێ ئـاوا تەفسـیر بکـرێ، بـەڵام ئەگـەر وا تەفسـیر بکـرێ: دەربچـن لـە ئاسـۆیەکانی گـەردوون، ئـەوە بێگومـان ئەوکاتـە بـۆ دەستەوسـان کـردن (تعجیـز)ە

ئەگەر بەو شێوەیە تەفسیر بکرێ، چونکە ئەو توانایە هەرگیز دەستی مرۆڤ ناکەوێ، ئێستا زانایان دەڵێن: تیرەی گەردوون، واتە: لەم سەری بۆ ئەوسەری، بە پازدە ملیار ساڵی تیشکیی مەزەندە دەکرێ، واتە: ئەو ماوەیەی کە تیشک لە پازدە ملیار ساڵدا دەیبڕێ، کە زۆر زۆرە! بەڵێ لەو کاتەوە کە مرۆڤ بە حیساب پێی نایە سەر مانگ، زارەوەی داگیرکردنی فەزا داهێنرا، بەڵام بێگومان ئەو زاراوەیە بۆ ئەو هەنگاوە بچووکەی مرۆڤ، کە بریتیە لە چوونە سەر مانگ، جگە لە لەخۆبایی بوونێکی بۆش، هیچی دیکە نیە، وێڕای ئەوەی زاراوەیەکی بۆش و هەڵەو نازانستییشە، چونکە:

یەکەم: گەردوون لە لایەن خواوە بۆ مرۆڤ ڕام و دەستەمۆ کراوە، ئەگەر مرۆڤ بتوانێ بەهرەمەند بێت لە هەرکام لە خڕۆکەکان، لە ئەستێرەکان، لە کەهکەشانەکان، گریمان دەربچێ لە سنووری کەهکەشانی خۆمان، کە ئەوە مەحاڵی هەزار جار مەحاڵە، بەو توانایەی کە بە مرۆڤ دراوە، وەك دوایی ئاماژەی پێ دەکەین، بەڵام ئەگەر گریمان مرۆڤ بشتوانێ ئەوە بکات، ئەوە هیچ شتێکی نەکردوە خوا پێی ناخۆش بێ، شتێکی نەکردوە کە خوا ﷻ ڕێی لێ گرتبێ، بۆچی؟ تەماشای ئەم ئایەتە بکەن لە سوورەتی (لقمان)دا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَوْا أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُ ظَاهِرَةً وَبَاطِنَةً ﴿٢٠﴾ ﴾، واتە: ئایا نابینن کە خوا هەرچی لە ئاسمانەکان و لە زەویدا هەیە، بۆ ئێوەی دەستەمۆو ملکەچ کردوەو، چاکەکانی خۆیشی بە ئاشکراو پەنهان بەسەردا ڕشتوون بە تەواویی؟!

هەروەها لە سوورەتی (الجاثیة)دا دەفەرموێ: ﴿ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٣﴾ ﴾، واتە: هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، خوا لە لایەن خۆیەوە بۆ ئێوەی دەستەمۆو ملکەچ و ڕامکردوە، لەوەدا نیشانە هەن بۆ کۆمەڵێك بیربکەنەوە.

هەروەها لە چەندان شوێنی دیکەدا، خوا ﷻ باسی ئەوەی کردوە کە گەردوونی بۆ ئێمە مەیسەرو ڕام و دەستەمۆ کردوە، کە لێی بەهرەمەند بین.

کەواتـە: کاتێـك ئێمـە بەهـرە وەردەگریـن، لـە دروسـتکراوێك لـە دروسـتکراوەکانی خـوا، مانـای وایـە دەبـێ وەك دۆسـت تەماشـای ئـەو دروسـتکراوەی خـوا بکەیـن، نـەك وەك دوژمنێـك کـە بەسـەریدا زاڵ بوویـن! خـوا ﷻ گەردوونمـان وا پـێ دەناسـێنێ کـە بـۆ ئێمـەی دەسـتەمۆ کـردوە، وەك چـۆن کـە باسـی وڵاخ دەکات، کـە بـۆ بـارو سـواریی بەکاریـان دێنیـن، لـە سـووڕەتی (الزخـرف)دا چەنـد تەعبیرێکـی جوانـە خـوا ﷻ دەیهێنـێ، دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَزْوَٰجَ كُلَّهَا وَجَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلْفُلْكِ وَٱلْأَنْعَٰمِ مَا تَرْكَبُونَ ﴿١٢﴾ لِتَسْتَوُۥا۟ عَلَىٰ ظُهُورِهِۦ ثُمَّ تَذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ رَبِّكُمْ إِذَا ٱسْتَوَيْتُمْ عَلَيْهِ وَتَقُولُوا۟ سُبْحَٰنَ ٱلَّذِى سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقْرِنِينَ ﴿١٣﴾ ﴾، واتـە: خـوا ئـەو زاتەیـە، کـە هەمـوو جووتەکانـی دروسـتکردوون و، لـە کەشـتییەکان و لـە ئاژەڵانیـش، وای بـۆ ڕەخسـاندوون کـە سـواریان بـبن، [ سـواری پشـتیان بـبن] بـۆ ئـەوەی بچنـە سـەر پشـتیان [هـی کەشـتییەکان و ئاژەڵـەکان] دوایـی چاکـەی پەروەردگارتـان یـاد بکەنـەوە، کاتێـك سـەقامگیربوون لـە سـەریان و بڵێـن: پاکیـی بـۆ ئـەو زاتـەی کـە ئەمـەی بـۆ دەسـتەمۆ کردیـن، کـە ئێمـە توانامـان بەسـەریدا نەدەشـکا، ئێمـەش بـۆ لای پەروەردگارمـان دەگەڕێینـەوە.

واتە: بەو سەفەرەی دەیکەن، کۆی سەفەری ژیانی خۆشتان بێتەوە یاد.

کەواتـە: ئـەو زاراوەیـە زاراوەیەکـی نازانسـتییەو، زاراوەیەکـی نالۆژیکییشـە، چونکـە خـوا ﷻ ئـەم گەردوونـەی بـۆ ئێمـە دەسـتەمۆو ملکـەچ کـردوە، کـە لێـی بەهرەمەندبیـن، کەواتـە شـتێك کـە لێـی بەهرەمەنـد دەبیـن لـە گەردوونـدا، نابـێ زاراوەی بەسـەردا زاڵبـوون، بەکاربێنیـن، چونکـە ئەگـەر هـەر (بـا) لـە مـرۆڤ وەخـۆی بکـەوێ، دەمانفەتێنـێ، وەك خـوا بـای کـردە سـەربازێك لـە سـەربازەکانی خـۆی، بـۆ لەبەیـن بردنـی گەلـی عـاد، ئـاوی بـۆ گەلـی نـووح و بـۆ گەلـی فیرعـەون نـارد، زەوی بـۆ گەلـی لـووط و بـۆ قـاڕوون، دانـا کـە بەزەوییـدا بردنیـە خـوا، هەروەهـا هـەورە تریشـقە بـۆ هەندێـك لـە گـەلان و، هـاڕژن (صیحة) بـۆ هەندێکیـان، بۆیـە هەمـوو ئـەو نیعمەتانـەی کـە خـوا بـۆی ڕەخسـاندووین، ئەگـەر بێـت و لـە سـنووری خۆیـان

دەربچن، خوا دەتوانێ هەر بەوانە بمانفەوتێنێ، کە بەبێ ئەوانیش ژیانمان بەڕێوە ناچێ.

دووەم: ئەو زاراوەیە پەیوەندیی بە بووناسیی ڕۆژئاوایی و، کتێبە دەستکاریی کراوەکانیاوەنەوە هەیە، بە پێی بووناسیی ڕۆژئاوا، مرۆڤ لەگەڵ خوادا بەربەرەکانێی هەیەو، لەگەڵ دروستکراوەکانی خوادا، دژایەتیی و ناکۆکیی هەیە، ئەوە لە پەیمانی کۆندا - وەك پێشتر باسمان کردوە بەبۆنەی دیکەوە - هاتوە:

کە کاتێك ئادەم لە درەختە قەدەغە کراوەکەی خواردوە، بە پێی قسەی پەیمانی کۆن، خوا ﷻ زۆر نارەحەت بووە!، فەرموویەتی: ئەگەر بێت و دەستیشی بگاتە کانیاوی، ئاوی حەیات و لێی بخواتەوە، ئەوە یەکجاریی ژیانی هەمیشەیی دەستدەکەوێ! یانی: خوا حەسوودیی بە مرۆڤ بردوەو، زۆریش پێی ناخۆش بووە ئادەم فێری زانیاریی بێ و چاوی بکرێتەوە!! ئەمە بەپێی پەیمانی کۆن، بەڵام بەپێی قورئان، خوا ﷻ لە سوورەتی (البقرة)دا، لە ئایەتەکانی (٣٠ - ٣٣)دا باسی بە جێنشین دانانی ئادەم دەکا لەسەر زەوی، شتێکیش کە وایکردوە ئادەم بە کەڵکی جێنشینایەتیی خوا بێ لەسەر زەوی و، پێویست بکات فریشتەکان ڕێزی لێبگرن و سڵاوی لێ بکەن، ئەوە بووە کە ناوی شتەکانی زانیون، خوا ﷻ ئادەمی کردوە بە مامۆستا بۆ فریشتەکان، ناوی شتەکانی فێرکردوون، ئنجا فەرموویەتی: کڕنووش بۆ ئادەم بەرن، کەواتە لە قورئانداو لە ئیسلامدا، زانا بوونی مرۆڤ، فەزیلەتە، زانا بوونی مرۆڤ هۆکاری ئەوەیە کە جێنشینی خوا بێ و، لە لایەن فریشتەکانەوە ڕێز لێگیراو بێ، بەڵام لە (پەیمانی کۆن)دا بە پێچەوانەوە، زانا بوونی مرۆڤ موصیبەت و بەڵایەکەو، خوا ناهێڵێ ئەوە دەست مرۆڤ بکەوێ!! کە زاراوەی داگیرکردنی ئاسمان، لە ڕاستیی دا لەو بووناسییە سەقەتەی ڕۆژئاواوە، هاتوە، کە هەم وەك خۆیان، گریك و ڕۆمان و یۆنان، هەمیشە لە ئەفسانەکانی ئەواندا کێشە هەیە لە نێوان مرۆڤ و پەرستراوەکاندا، هەم لە ڕووی کتێبە ئایینییەکەشیانەوە، (پەیمانی کۆن)ی دەستکاریی کراو، لەوێوەش ئەو تێڕوانینە سەقەتە، لەو بووناسییە لارو خوارەوە سەرچاوەی گرتوە.

**سێیەم: گەردوون و فەزا زۆر لەوە فراوانترو گەورەترە، کە بە مرۆڤ و غەیری مرۆڤیش داگیر بکرێ، - لێرەدا دەمەوێ ئەوە بسەلمێنم، کە ئەو زاراوەیە زاراوەیەکی نازانستیی و نالۆژیکیی و ئەفسانەییە - با تەماشا بکەین:**

تیرەی گەردوون، وەك پێشتریش گوتمان: بە پازدە ملیار ساڵی تیشکیی مەزەندە دەکرێ، هەڵبەتە هەندێکیان دەڵێن: سێزدە ملیارو هەشتسەد ملیۆن ساڵ و هەندێك دەڵێن: چواردەو ئەوەندە، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئەوپەڕەکەی هەندێکیان دەیگەیەننە پازدەو، هەندێکیان دەیگەیەننە بیست ملیار ساڵی تیشکیی، هەروەها ژمارەی کەهکەشانەکانی نێو گەردوون، ئەوەی هەتا ئێستا دووربینەکان (تەلیسکۆبەکان) بینیویانە، بە یەك تریلیۆن (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) هەزار ملیار کەهکەشان مەزەندە دەکرێ، کە یەکێك لە کەهکەشانەکانی نێو گەردوون کە بە ئینگلیزیی (Galaxy) پێ دەڵێن، یەکێك لە گالاکسییەکان (کەهکەشانەکان) ڕێی کاکێشانە، بە عەرەبیی (**مجرة درب التّبان**)و، بە فارسیی (**راهي شيري**)و، بە ئینگلیزیی (Milk way) پێ دەڵێن، کاتی خۆی هەندێك لە گەلان پێیان وابووە شیری لێ ڕژاوەو، هەندێك گوتوویانە: کای لێ ڕژاوە، کە لە ڕاستییدا نە کایەو نە شیرە، بەڵکو ئەستێرەن لە دوورەوە سپیی دەچن، وەك هەورێك، ئنجا یەکێك لەو یەك تریلیۆن کەهکەشانەی کە لە نێو گەردووندا دۆزراونەوە، کەهکەشانەکەی خۆمانە، کە ژمارەی ئەستێرەکانی بە یەك تریلیۆن دادەنرێ، هەندێکیش گوتوویانە: بە کەمترو هەندێك دەڵێن زیاتر، کە یەکێکیان - لە ئەستێرەکانی- خۆری ئێمەیە، ئەویش نۆ خڕۆکەی بە دەورەدا دەخولێنەوەو، بە هەموویان کۆمەڵەی خۆر پێکدێنن.

ئنجا ساڵی تیشکیی (**السنة الضوئية**)، ئەو ماوەیە کەتیشك بە ساڵێك دەیبڕێ کە دەڵێن: تیرەی گەردوون پازدە ملیار ساڵی تیشکییە، واتە: ئەو ماوەیەی کە تیشك لە پازدە ملیار ساڵدا دەیبڕێ، تیشکیش سێ سەد هەزار کیلۆمەتر لە چرکەیەکدا دەبڕێ، کەواتە بۆ ئەوەی بزانین ساڵی تیشکی چەندە، دەبێ سێ سەد هەزار

(٣٠٠٠٠٠) کیلۆمەتر کە تیشك لە چرکەیەکدا دەیبڕێت، جارانی شەستی بکەین، بۆ ئەوەی دەقەیەکمان بۆ دەرکەوێ، دوایی دەرەنجامەکەی جارانی شەست بکەین، بۆ ئەوەی سەعاتێکمان بۆ دەربکەوێ، دوایی دەرەنجامەکەی جارانی بیست و چواری بکەین، بۆ ئەوەی شەو و ڕۆژێکمان بۆ دەربکەوێ، بۆ ئەوەی بزانین تیشك لە ماوەی شەو و ڕۆژێك چەند دەبڕێ، دواییش ئەنجامەکەی جارانی سێسەد و شەست و پێنج (٣٦٥) بکەین، بۆ ئەوەی ساڵێکمان بۆ دەربکەوێ، جا ئەو دەرەنجامەکە زیاتر لە نۆ ریلیۆن کیلۆمەتر دەکات، (٣٠٠٠٠٠ x ٦٠ x ٢٤ x ٣٦٥ = ٩,٤ [١٢]) ئەوە کە لە ساڵێکدا تیشك دەیبڕێ، ئنجا پازدە ملیار ساڵی ئاوا دەبێ بەڕێوەبێ، ئنجا ئەمسەرو ئەوسەری گەردوون دەکات.

چوارەم و کۆتایی: بۆ چوونی مرۆڤ بۆ سەر مانگ، پێویستە سێسەدو شەست هەزار، یان سێسەدو حەفتا، یان سێسەدو هەشتا هەزار کیلۆمەتر ببڕدرێ، کە ئەوە دووریی نێوان مانگ و زەوییە، چونکە مانگ هەندێك جار نیزیکتر دەکەوێتەوە لە زەوی و، هەندێك جاریش دوورتر دەکەوێتەوە، ئەویش ئەگەر ڕۆکێتێك کە چوار هەزار کیلۆمەتر لە سەعاتێکدا ببڕێ، واتە: چوار هێندەی تەیارە خێراتربێ، سێسەدو هەشتا هەزار دابەشی چوار هەزار بکەین (٣٨٠,٠٠٠÷٤٠٠٠=٩٥)، واتە: لە سەعاتێکدا ئەو ڕۆکێتە چوار هەزار کیلۆمەتر ببڕێ، دەکاتە سێ شەوو سێ ڕۆژو بیست و سێ سەعات، واتە: (٩٥) سەعات چوار شەوو ڕۆژ شتێك کەم، ئەوە هەمووی بۆ بڕینی ئەو ماوەیەی کە دەکەوێتە نێوان مانگ و زەوییەوە، کە تیشك لە مانگەوە بۆ زەوی بە چرکەیەك و یەك لەسەر چواری چرکەیەك دەگات، ماوەیەك کە بریتیە لە چرکەیەك و یەك لەسەر چواری چرکەیەك، ئەگەر مرۆڤ ڕۆکێتێك دروست بکات، لە سەعاتێکدا چوار هەزار کیلۆمەتر ببڕێ، ئنجا نیزیکی چوار شەو و ڕۆژی پێ دەچێ.

بەڵام ئەگەر سەفەرەکەی بۆ لای خۆر بێ، کە سەدو پەنجا ملیۆن کیلۆمەتر لێمان دوورەو، تیشك بە هەشت خولەك دەمانگاتێ، یانی: هەشت جارانی شەست واتە: چوار سەدو هەشتا چرکە، ئەوە مانای وایە زۆر زۆری پێدەچێ!

یان ئەگەر بۆ برینی تیرەی كۆمەڵەی خۆر بێ، كە سێزدە سەعاتی تیشكیی دەوێ، سێزدە سەعاتی تیشكیی تیرەی كۆمەڵەی خۆر لە زەوییەوە دوورە، یان بۆ نیزیكترین ئەستێرە بێ لێمانەوە، كە چوار ساڵی تیشكیی دەوێ، بە چوار ساڵی تیشكیی دەبێ بڕۆی، ئەوجار دەیگەیە، یان بۆ تیرەی كەهكەشان بێ، كە سەدو پەنجا هەزار ساڵی تیشكیی دەوێ، یان بۆ لای ڕستەژنە (المرأة المُسَلْسِلَة)، كە یەك ملیۆن ساڵی تیشكیی دەوێ، یان بۆ لای هەندێك لە كەهكەشانەكان، كە شازدە ملیۆن ساڵی تیشكیی دەوێ!

كەواتە: نەدەبوو بە برینی ماوەی یەك چركەو چارەگێكی چركە، مرۆڤ هێندە لە خۆی بایی بێ، بڵێ گەردوون (فەزا)م داگیر كردوە!!

هەندێ لەو زانیارییانەم لە تەفسیری (النابلسي) یەوە هێناون[1]، بەڵام (د. محمد راتب النابلسي) خوا پاداشتی بداتەوە، تووشی هەڵەیەك بووە، دەڵێ: ئەو ڕۆكێتەی هەڵیان داوە بۆ سەر مانگ، لە سەعاتێكدا چل هەزار (٤٠٠٠٠) كیلۆمەتری بڕیوە، كە ئەو كاتە نۆ سەعاتی پێچووە بۆ چوونە سەر مانگ، بەڵام ئەو دەڵێ نەوەد (٩٠) سەعاتی پێچووە، بەڵام لە ڕاستییدا ئەگەر ڕۆكێتەكە چل هەزار كیلۆمەتری لە سەعاتێكدا بڕیبێ، تەنها نۆ سەعاتی پێدەچن بۆ چوونە سەر مانگ، نەك نەوەد سەعات، كە نەوەد سەعاتەكە دەكاتە سێ شەوو ڕۆژو هەژدە سەعات، بەڵكو ئەگەر چوار هەزار كیلۆمەتری بڕیبێ لە سەعاتێكدا، ئنجا دەكاتە سێ شەو ڕۆژو هەژدە سەعات، بە هەرحاڵ ئەو لێرەدا تووشی ئەو هەڵەیە بووە.

---

(١) ج٧ ص٤٤٥.

**مەسەلەی سێیەم:**

**ڕاگیرکردنـی خـوا بـۆ ئاسـمانەکان و زەوی و، لانەچـوون و لانەدانیـان لـەو سیسـتمەی بۆیـان دانـراوە:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُمۡسِكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ أَن تَزُولَاۚ وَلَئِن زَالَتَآ إِنۡ أَمۡسَكَهُمَا مِنۡ أَحَدٖ مِّنۢ بَعۡدِهِۦٓۚ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورٗا ٤١﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:**

۱)- ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُمۡسِكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ أَن تَزُولَا﴾، واتە: بە دڵنیایی خوا ئاسمانەکان و زەوی دەگرێ کە لانەچن، یاخود نەفەوتێن (لەبەین نەچن)، (**الإِمْسَاكُ: الْقَبْضُ بِالْيَدِ عَلَى الشَّـيءِ بِحَيْثُ لا يَنفَلِتُ وَلا يَتَفَرَّقُ**)، واتە: (**إمسَاك**): بریتیە لەوە کە ئینسان بە دەست شتێك بگرێ، بۆ ئەوەی دەرنەچێت لە دەستی و بڵاو نەبێت و توند بیگرێ.

﴿أَن تَزُولَا﴾، واتـە: بـۆ ئـەوەی لانەچـن، یاخـود لەبەیـن نەچـن، وشـەی (**زَال**) دوو واتـای هـەن، یەکـەم: (**زَال: أَي تَحَوَّلَ مِـن مَـكَانٍ إِلَى مَـكَانٍ آخَـر**)، واتـە: لاچـوو لـە شـوێنێکەوە بـۆ شـوێنێکی دی، مانـای دووەم: (**عُـدِمَ وَفُنِـيَ**)، واتـە: ئـەو شـتە لـە بەیـن چـوو و فەوتـا، ئەگـەر وشـەی (تـزولا) نەبووایـە، وشـەیەکی دیکـە بووایـە، هـەر یـەك واتـای دەگەیانـد، بـەڵام ئێسـتا هـەردوو واتایەکـە دەگەیەنـێ.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿أَن تَزُولَا﴾، واتـە: (**أَنْ لاَ تَـزُولا**)، تاکـو لانەچـن، یـان (**كَرَاهَـةَ أَن تَـزُولا**)، لەبـەر پێناخۆشـبوونی لاچـوون، تێیـدا (تقدیـر) دەکرێ، عـەڕەب وا بـەکاری دێنن.

۲)- ﴿وَلَئِن زَالَتَآ﴾، ئەگەر لاشبچن (ل) (**مُوَطِّئَةٌ لِلقَسَمِ وَالشَّـرطِ وَجَوَابُهُ مُقْسَمٌ عَلَيهِ**)، لامەکە زەمینە خۆشکەرە بۆ سوێند.

ئنجـا ﴿وَلَئِن زَالَتَآ﴾، (**إن**) و (**زالتـا**) کـە دەبنـە مـەرج و وەڵام، دەبنـە سـوێند لەسـەر خـوراو.

٣)- ﴿إِنۡ أَمۡسَكَهُمَا مِنۡ أَحَدٖ مِّنۢ بَعۡدِهِۦٓ﴾، واتە: هیچکەس لە دوای ئەو نایانگرێ، (إن) بە مانای (ما) دێ، واتە: (مَا أَمْسَكَهُمَا)، (مِنْ أَحَدٍ) ئەم لە (مِنْ)ە، زیاد کراوە بۆ جەختکردنەوەی لابردنەکە، واتە: هیچ کەس نایانگرێ.

کە دەفەرموێ: ﴿مِّنۢ بَعۡدِهِۦٓ﴾، (من) بۆ دەستپێکردنە، (أَيُّ أَحَدٍ كَائِنٍ أَوْ نَاشِيءٍ مِن زَمَانٍ بَعدَهُ)، واتە: ئەو دوو (من)ە، یەکێکیان بۆ جەختکردنەوەی لابردنەکەیە و ئەوەی دیکەش بۆ دەستپێکردنە، واتە: هیچ کەس ئەو ئاسمان و زەوییە ناگرێ، ئەگەر خوا نەیانگرێ، ﴿مِّنۢ بَعۡدِهِۦٓ﴾، واتە: لە دوای خوا ﷻ، ئەگەر خوا نەیانگرێ، هیچ کەس نایانگرێ.

٤)- ﴿إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورٗا﴾، واتە: بە دڵنیایی خوا هێدیی لێبوردەیە، (حلیم) واتە: هێدیی و مەند، پێچەوانەی (سریع الغضب)ە، واتە: زوو تووڕەبوو.

لە سوورەتی (الرعد)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِي رَفَعَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيۡرِ عَمَدٖ تَرَوۡنَهَا﴾، واتە: خوا ئەو زاتەیە ئاسمانەکانی بەرز کردوونەوە، بەبێ کۆڵەکەی بیندراو، یاخود بە کۆڵەکانێك کە نابیندرێن، هەروەها لە سوورەتی (لقمان)یشدا دەفەرموێ: ﴿خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيۡرِ عَمَدٖ تَرَوۡنَهَا﴾، لەوێ دەفەرموێ: (رفع)، هەروەها لەوێ دەفەرموێ: (خلق)، هەر یەك واتایان هەیە، واتە: بەرزی کردوونەوەو، دروستی کردوون.

کە دەفەرموێ: ﴿بِغَيۡرِ عَمَدٖ تَرَوۡنَهَا﴾، زانایان بە دوو واتا لێکیان داوەتەوە، وەك لە تەفسیری سوورەتی (الرعد)یشدا باسمان کردو، لە تەفسیری سوورەتی (لقمان)یشدا باسمان کردوە، کە دەفەرموێ: ﴿بِغَيۡرِ عَمَدٖ تَرَوۡنَهَا﴾، یانی (بِعَمَدٍ غَيرِ مَرئِيَّة) واتە: بە کۆڵەکە نەبیندراوەکان، یاخود بەبێ کۆڵەکە، ئێوە ئاسمانەکان دەبینن، کە هیچ کۆڵەکەی لەبەر نین.

مەبەست لە کۆڵەکەی نەبینراو، هێزی کێشکردن (قُوَّة الجَاذِبِيَّة)ە، کە خوا ﷻ بەوە تەعبیری لێدەکات، کە خوا دەیانگرێت، هەندێك شت کە لە هەندێ

تەفسیراندا هاتوون، کاتی خۆی لە کتێبی {مەولوودنامە}دا هەبوو، زەوی لەسەر پشتی گایە، گا لەسەر پشتی ماسییە، ماسی لەسەر پشتی ئاوە ... هتد، ئەو شتە ئەفسانانە پێچەوانەی قورئانن، ئنجا با لەو بارەوە ئەم شوێنەوارە بگێڕینەوە، کە (الطبري) لە تەفسیرەکەی خۆی (جامع البیان)دا[1] دەڵێ:

(جَاءَ رَجُل إِلَى عَبْد اللَّـه هُـوَ إِبْـن مَسْعُود ﷺ، فَقَـالَ: مِنْ أَيْـنَ جِئْـتَ؟ قَـالَ: مِـنَ الشَّام، قَـالَ: مَنْ لَقِيْـتَ؟ قَـالَ: لَقِيتُ كَعْبَاً، قَـالَ: مَـا حَدَّثَـكَ؟ قَـالَ: حَدَّثَنِـي أَنَّ السَّمَاوَاتِ تَـدُورُ عَـلَى مَنْكِـبِ مَلَـكٍ، قَـالَ: أَفَصَدَّقْتَـهُ أَوْ كَذَّبْتَـهُ؟ قَـالَ: مَـا صَدَّقْتَـهُ وَلَا كَذَّبْتَـهُ، قَـالَ: لَـوَدِدْتُ أَنَّكَ اِفْتَدَيْـتَ مِنْ رِحْلَتِـكَ إِلَيْـهِ بِرَاحِلَتِـكَ وَرَحْلِهَـا، وَكَـذَبَ كَعْـب، إِنَّ اللَّـه تَعَـالَى يَقُـول: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُمْسِكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ أَن تَزُولَا ﴿٤١﴾﴾).

واتە: پیاوێک هات بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ، ئەویش لێی پرسی: لە کوێوە هاتووی؟ گوتی: لە شامەوە، گوتی: کێت بینیوەو بە کێ گەیشتووی؟ گوتی بە کەعب گەیشتم، (کە یەکێک بووە لە زانایانی جوولەکەو مسوڵمان بووە)، گوتی: کەعب چی بۆ باس کردی؟ [دڵی هەواڵی داوە، عەجانیب نیە کە خوا ئیلهامی بۆ کردبێ، یاخود بەپێی شارەزایی و ئەزموونی لەگەڵ کەعب دا، کە زۆر شتی باسکردوە، لەبەر ئەوەی خۆی زۆر بە شارەزا زانیوە لە کتێبە ئاسمانییەکان، ئەوەی هەڵهێنجاوە] گوتی: ئەوەی بۆ باسکردم کە ئاسمانەکان لەسەر شانی فریشتەیەك دەسووڕێن، عەبدوڵڵا ﷺ لێی پرسی: ئایا بەڕاستت دانا، یان بە درۆت دانا؟ گوتی: نە بەڕاستم داناو، نە بەدرۆم دانا، عەبدوڵڵا ﷺ گوتی: حەزم دەکرد لە جیاتی ئەو سەفەرەت بۆ لای کەعب، وڵاخەکەش و باری وڵاخەکەشت، یان کورتانی وڵاخەکەشت کردبایە بەخێر، بەڵام ئەو سەفەرەت نەکردبایە، کەعب بەهەڵەدا چووە، {مەبەستیان لە (کذب)، (أخطأ) بووە، واتە بەهەڵەدا چووە} چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُمْسِكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ أَن تَزُولَا﴾، واتە: خوا ئاسمانەکان و زەوی دەگرێ کە لابچن، نافەرموێ: لەسەر شانی

---

(١) برقم: (٢٩٠٠٧٣).

فریشتەیەکن، یان لەسەر پشتی گاو، گا لەسەر پشتی ماسییە، ئەمە هەمووی ئەفسانەیە، بە ناوی دینەوە گوتراوە، کە زۆر جار خەڵکێکیش بە هۆی ئەو ئەفسانەو شتە بێ بنەمایانەوە، لەبەر ئەوەی بۆ خۆی نەشارەزاو نەزان بووە، ئەو قسە ئەفسانانەی لەسەر دین حساب کردوون و، لە دین دوورکەوتۆتەوە.

ئنجا بۆ ئەوەی بزانین، ئەو هێزی ڕاکێشانە کە خوا گەردوونی پێوە بەستوە، چەندە؟ یەك ئاماژەی کورت دەکەین بە هێزی ڕاکێشانی نێوان زەوی و خۆر، ئنجا زەوی و مانگ، (د. محمد راتب النابلسي) تەفسیرەکەیدا[1] دەڵێ: (**قُوَّةُ الجَذْبِ بَيْنَ الشَّمْسِ وَالأَرْضِ، بمليون مليون حبل مفتول فولاذي، قُطْرُ كُلِّ حَبْل خَمْسَة أمتارٍ وطول، كُلّ منها مائة وستةٌ خمس مليون كيلومتر**).

واتە: هێزی ڕاکێشانی نێوان خۆرو زەوی، بریتیە لە یەك ملیۆن ملیۆن پەتی پۆڵایی هۆندراو، کە تیرەی هەر کامێك لەو پەتانە پێنج مەتر بێ، واتە: پێنج جارانی تریلیۆن بکە: (٥×١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠=٥٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠ مەتر) چونکە ملیۆن ملیۆن دەکاتە تریلیۆنێك، یەك تریلیۆن حەبل، کە تیرەی هەرکامێکیان پێنج مەتر بێ، مانای وایە هێزی ڕاکێشانی نێوان زەوی و خۆر بە ئەندازەی حەبلێکی پۆڵاییە، کە تیرەکەی پێنج ترغلیۆن مەتر بێ، واتە: پێنج هەزار ملیار مەتر ئەستوور بێ، ئنجا لە پۆڵاش بێ، هەروەها درێژییەکەشی بریتی بێ لە (١٥٦) ملیۆن کیلۆمەتر، یان (١٥٠) ملیۆن کیلۆمەتر، کە دووریی نێوان زەوی و خۆرە.

هێزی ڕاکێشانی نێوان زەوی و مانگ، بە ئەندازەی ئەوەیە کە حەبلێکی پۆڵایی هەبێ، تیرەکەی پەنجا کیلۆمەتر بێ وو زەوی و مانگ پێکەوە ببەستێتەوە.

کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَئِن زَالَتَآ إِنْ أَمْسَكَهُمَا مِنْ أَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِهِۦٓ﴾، ئەگەر لابچن، جگە لە خوا کەس نایانگرێ، ئێستا زانستیی فیزیا دەریخستوە، کە بوونی ماددە پەیوەستە بە بوونی جووڵەوە، جووڵەی ئەلیکترۆنەکان بە دەوری نێوکەکاندا،

---

(١) ج٧ص: (٤٤٧ و، ٤٤٨).

کە لە پرۆتۆن و نیوترۆن پێکهاتوون، هەر کاتێك ئەلیکترۆن بە دەوری نێوکدا نەخولایەوە، ماددە نامێنێت و لەبەین دەچێ، ئنجا ئەوە بە نسبەت خودی ماددەوە.

بە نسبەت زەوییەوە کە بە دەوری خۆردا دەخولێتەوە، ئەگەر زەوی بە دەوری خۆردا نەخولێتەوە، واتە: ڕوویەکی بچەسپێ بەرانبەر بە خۆر، دیارە ڕوویەکیشی پشتی لە خۆر دەبێ، ئەو ڕووەی کە بەرانبەر بە خۆر دەبێ، پلەی گەرمیی لەسەر زەوی دەبێتە (٣٣٠) پلەی گەرمیی، لە (١٠٠) پلە دەکوڵێ، (٣٣٠) پلە واتە: سێ بەرانبەر پلەی کوڵان زیاتریش، دیوەکەی دیکەشی کە پشتی لە خۆرە، هێندە سارد دەبێ، بە ئەندازەی (٢٧٠) پلەی گەرمیی لە ژێر سفر، مانای وایە نە ئەو ڕووەی کە ڕووی لە خۆر دەبێ ژیانی تێدا دەبێ، نە ئەو ڕووەی کە پشتی لە خۆرە، دیوێکی دەسووتێ و دەبێتە خۆڵەمێش، دیوێکیشی دەبێتە بەستەڵەك و هیچ خاوەن ڕووح و زیندەوەرو ژیانداریکی لێ ناژی.

مەسەلەی چوارەم:

کافرەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ بەوپەڕی جەختکردنەوەوە، سوێندیان بە خوا دەخوارد، کە ئەگەر وریاکەرەوەیەکیان بۆ بێ، لە هەر کۆمەڵگایەکی دیکە ڕێی ڕاستگرتووتر دەبن، کەچی پاش هاتنی ئەو هۆشیارکەرەوەیە کە (محمد)ە ﷺ، بەهۆی خۆبەزلگریی و پلانگێڕییەوە، هەرچی زیاتر لێی سڵەمینەوەو، ئەگەر لەسەر ئەو حاڵەشیان بەردەوام بن، یاسای خوا کە لە گەلانی پێشوودا ڕابردوە، بەسەر ئەوانیشدا دەچەسپێ و لەبەین دەچن:

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَـٰنِهِمْ لَئِن جَآءَهُمْ نَذِيرٌ لَّيَكُونُنَّ أَهْدَىٰ مِنْ إِحْدَى ٱلْأُمَمِ ۖ فَلَمَّا جَآءَهُمْ نَذِيرٌ مَّا زَادَهُمْ إِلَّا نُفُورًا ﴿٤٢﴾ ٱسْتِكْبَارًا فِى ٱلْأَرْضِ وَمَكْرَ ٱلسَّيِّئِ ۚ وَلَا يَحِيقُ ٱلْمَكْرُ ٱلسَّيِّئُ إِلَّا بِأَهْلِهِۦ ۚ فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا سُنَّتَ ٱلْأَوَّلِينَ ۚ فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًا ۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَحْوِيلًا ﴿٤٣﴾ ﴾.

شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە دە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَـٰنِهِمْ ﴾، کافرەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ، بەوپەڕی توانایانەوە، سوێندیان بە خوا خوارد، واتە: سوێندەکانیان ئەوپەڕی توانایان تێدا بەکارهێنان، دەڵێ: (**جَهْدُ اليَمِينِ: أَبْلَغُهَا وَأَقْوَاهَا، وَأَصْلُهُ مِنَ الجَهْدِ وَهُوَ التَّعَبُ، فَجَهْدُ الأَيْمَانِ هُنَا كِنَايَةٌ عَنْ تَوكِيدِهَا، أَي: أَقْسَمُوا بِاللَّهِ قَسَماً جَاهِدِينَ فِيهِ**)، (**جَهْدُ اليَمِين**) واتە: سوێندێکی زۆر بەهێز و مەحکەم، کە لە ئەصڵ دا لە (**جهد**)ەوە هاتوە، کە بریتیە لە ماندووبوون، کەواتە (**جهد الأيمان**)، لێرەدا کینایەیە لە سوێندێکی زۆر مەحکەم، سوێندێك کە زۆر داکۆکیی لەسەر بکرێ، ئەو سوێندەیان خوارد.

٢)- ﴿ لَئِن جَآءَهُمْ نَذِيرٌ ﴾، ئەگەر هۆشیارکەرەوەیەکیان بۆبێ، واتە: پێغەمبەرێك کە هۆشیاریان بکاتەوە.

٣)- ﴿ لَيَكُونُنَّ أَهْدَىٰ مِنْ إِحْدَى ٱلْأُمَمِ ﴾، لە هەر گەل و کۆمەڵێکی تاك، ڕێی ڕاستگرتووتر دەبن، دەڵێ: (**إِحْدَى الأُمَم أي: أفْضَلُ الأُمَم، أو إِحْدَى الأُمَمِ المُهتَدِية**)، واتە: ڕێی ڕاستگرتووتر دەبن، لە چاکترین کۆمەڵەکان، کە لە مێژوودا ڕێی ڕاستیان گرتوە، لە هەمووان باشتر دەبن، یاخود لە یەکێك لە کۆمەڵە ڕێی ڕاستگرتووەکان، ڕێی ڕاستگرتووترو هیدایەتدراوتر دەبن، لەوانەی خاوەن دین بوون. (**أي: أشْهَدُوا اللَّهَ عَلَى أنفُسِهِم أنَّهُم إذَا جَاءَهُم رَسُولٌ يَكُونُونَ أسْبَقَ مِنْ غَيرِهِم اهتِدَاءً**)، واتە: زۆر بە جەختکردنەوەوە سوێندیان خواردو، خوایان بە شایەد گرت لەسەر خۆیان، کە ئەگەر پێغەمبەرێکیان بۆبێ، لە غەیری خۆیان لە پێشتر دەبن بۆ ڕێی ڕاستگرتن.

٤)- ﴿ فَلَمَّا جَآءَهُمْ نَذِيرٌ ﴾، بەڵام کاتێك کە هۆشیار کەرەوەیان بۆ هات [کە موحەممەدە ﷺ].

٥)- ﴿ مَّا زَادَهُمْ إِلَّا نُفُورًا ﴾، هاتنی وی بەس سڵەمینەوەو دوورخستنەوەی تێدا زیادکردن، (**أي: مَا أفَادَهُم صَلاَحَاً إلاَّ نُفُوراً، فَالإستِثْنَاءُ فِي قَولِهِ: (إلاَّ نُفُوراً) تَأكِيدٌ لِلشَّيءِ بِمَا يُشبِهُ ضِدَّهُ، لأنَّهُمْ لَمْ يَكُونُوا نَافِرِينَ مِنْ قَبْلُ**)، کە دەفەرموێ: ﴿ مَّا زَادَهُمْ إِلَّا نُفُورًا ﴾، واتە: چاکەی تێدا زیاد نەکردن، جگەلە سڵەمینەوە، کەواتە هەڵاواردنەکە کە دەفەرموێ: ﴿ إِلَّا نُفُورًا ﴾، ئەمە جەختکردنەوەی شتێکە کە دەشوبهێنرێتە دژەکەی، چونکە پێشتر سڵەمیوەوە نەبوون لە پێغەمبەر ﷺ و لێی دوور نەکەوتبوونەوە، پێش ئەوەی پێغەمبەر بێ ﷺ.

٦)- ﴿ ٱسْتِكْبَارًا فِى ٱلْأَرْضِ وَمَكْرَ ٱلسَّيِّئِ ﴾، [بۆچی وایانکرد] بە هاندەری خۆبەزلگرتن لە زەوییداو، پیلانگێڕیی خراپ، واتە: بۆیە سڵەمینەوە، تاکو خۆبەزلبگرن لە زەوییداو، خۆیان بسەپێنن، وەك پێشتر گوتمان: ئەو بەزم و بازاڕەی پێکیان وەناوە، لە ئەنجامی نەبوونی هیدایەتی خواو شەریعەتی خوادا، ئەو بەزم و بازاڕەیان لێ تێکنەچێ، هەروەها بۆ پیلانگێڕیی، چونکە ئەگەر نەسڵەمیبانەوە لەو هیدایەت و پەیامەی پێغەمبەر ﷺ و گوتبایان: ڕاستە، ئەو کاتە ڕەش و ڕووتەکان دەیانگوت: کەواتە: بۆ چی بە چاوی

کۆیلەو خزمەتکار تەماشامان دەکەن؟! بۆچی هەموو خێرو بێری وڵات دەست بەسەردا دەگرن؟! ئەو کاتە لێیان تێکدەچوو.

٧)- ﴿وَلَا يَحِيقُ ٱلْمَكْرُ ٱلسَّيِّئُ إِلَّا بِأَهْلِهِۦ﴾، پیلانی خراپیش بەس سەری خاوەنەکەی دەگرێتەوە، تەنیا دەوری خاوەنەکەی دەدا، (**المَكْرُ السَّيِّئ: مِنْ إِضَافَةِ المَوْصُوفِ إِلَى الصِّفَةِ، مِثْلُ: عِشَاءِ الآخِرَة**)، ئەمە لە پاڵدانی وەسفکراوە بۆ لای صیفەت، (**مكر**): بریتیە لە پیلان، پیلانێك کە بە پەنهانیی بکرێ.

کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَحِيقُ﴾، (**حَاقَ أَي: نَزَلَ، أو أَحَاطَ**)، واتە: شوێنەواری ئەو پیلان و فێڵ و خراپەیە، بەس سەری خۆیان دەگرێتەوە، خۆیان زیاتر باجەکەی دەدەن، دیارە لە ڕۆژی دوایی دا، لە دنیاشدا پێی عەیبدارو شەرمەزار دەبن.

٨)- ﴿فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا سُنَّتَ ٱلْأَوَّلِينَ﴾، ئایا چاوەڕێی چی دەکەن، جگە لە یاسای پێشووان، کە بەسەر ئەوانیشدا بچەسپێت؟!

٩)- ﴿فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًا﴾، هەرگیز تۆ گۆڕینت دەست ناکەوێ بۆ یاسای خوا.

١٠)- ﴿وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَحْوِيلًا﴾، هەروەها لادانیشت دەست ناکەوێ بۆ یاسای خوا.

وشەی (**يَنْظُرون**) یانی: (**يَنْتَظِرُون**)، ئایا چاوەڕێی چی دەکەن؟ (**سُنَّت الله**)یش واتە: یاسای خوا، (**العَادَةُ المُتَّبَعَة**) نەریتێك پەیڕەویی لێکرابێ، (**الأَوَّلِين**): (**السَّابِقِين**)، واتە گەلانی پێشوو.

ئەمە لە پەندی عەرەبیدا هاتوە: (**مَنْ حَفَرَ لأَخِيهِ جُبّاً، وَقَعَ فِيهِ مُنْكَبّاً**)، واتە: هەر کەسێك بیرێك بۆ برایەکەی لێبدات، بۆ خۆی لەپەوڕوو دەکەوێتە نێوی.

هەروەها پێغەمبەریش ﷺ فەرمویەتی: {**المَكْرُ وَالخَدِيعَةُ فِي النَّار**} (**أَخْرَجَهُ البَيْهَقِي: ٦٩٧٨، وَصَحَّحَهُ الأَلبَانِي فِي «الصحيحة»: ١٠٥٧**)، واتە: فێڵ و هەڵخەڵەتاندن لە دۆزەخدایە، واتە: خاوەنەکەی لە دۆزەخدایە، یان سزایەکەی دۆزەخە.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا سُنَّتَ ٱلْأَوَّلِينَ ﴾، واتـە: جگـە لـەوەی کـە بەسـەر پێشـووەکانیان هاتـوە، چاوەڕێـی چـی دیکـە دەکـەن؟ کـە ئەگـەر لەسـەر ئـەو حاڵەیـان بـەردەوام بـن، هـەر ئـەوەش بەسـەر وان دێ، کەواتـە: ئەگـەر دەیانـەوێ بـە مـەرەدی وان نەچـن و، هەمـان چارەنووسـی خـراپ یەخـەی ئەوانیـش نەگـرێ، بـا دەسـت هەڵبگـرن لـە خۆبەزلگرتـن و خۆسـەپاندن لـە زەوییـداو پیلانگێڕیـی خـراپ لـە زەوییـدا، لـە بەرانبـەر ئاییـن و پەیـام بەرنامـەی خـوادا ﷻ، کـە لـە بەرژەوەندیـی خۆشـیان و بەرژەوەندیـی هەمـوو مرۆڤەکانـەو، مایەی سـەربەرزیی دنیـاو دواڕۆژیانە.

**مەسەلەی پێنجەم و كۆتایی:**

**سەرنج ڕاكێشانی مرۆڤەكان بۆ مێژوو، كە گەلانی پێشوو لەوان بەهێزتر بوون، (واتە: لە كافرانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ)، بەڵام خوا سزای داون، چونكە هیچ شتێك لە گەردووندا خوا دەستەوسان ناكات، سزادانی خەڵكیش بە گشتیی، بۆ قیامەت هەڵدەگرێ، ئەگەرنا زیندەوەری لەسەر پشتی زەوی نەدەهێشت:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَكَانُوٓا۟ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً ۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعْجِزَهُۥ مِن شَىْءٍ فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَلِيمًا قَدِيرًا ﴿٤٤﴾ وَلَوْ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِمَا كَسَبُوا۟ مَا تَرَكَ عَلَىٰ ظَهْرِهَا مِن دَآبَّةٍ وَلَـٰكِن يُؤَخِّرُهُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ۖ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِعِبَادِهِۦ بَصِيرًۢا ﴿٤٥﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە یازدە بڕگەدا:

**١)- ﴿ أَوَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، واتە: ئایا بە زەوییدا نەڕۆیشتوون؟! هەمزە (أ) بۆ پرسیاركردنی نكووڵیلێكردنە، یان هەر بۆ پرسیاركردنی ئاساییە، چ ڕۆیشتنی جەستەیی، بە پێیان بڕۆن و شوێنەوارەكان ببینن، چ ڕۆیشتنی فیكریی، كە مێژوو بخوێننەوەو چاوی پێدا بگێڕن.**

**٢)- ﴿ فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ﴾[ئایا بە زەوییدا نەڕۆیشتوون، بە كردەوە، یاخود بە فیكرو عەقڵ] سەرنج بدەن، سەرەنجامی ئەوانی پێش وان چۆن بووە؟! واتە: هەموو ئەو گەلانەی كە لە پێش ئەواندا ڕابردوون، سەرنجیان لێ بدەن.**

**٣)- ﴿ وَكَانُوٓا۟ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً ﴾، كە ئەوان لەوان بەهێزتر بوون، ئەم (و)ە بۆ حاڵە (واو الحالية)یە، لە حاڵێكدا كە ئەوان، مەبەست پێی ڕابردووەكانی پێشووە، لە كافرەكانی**

ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ بەهێزتر بوون لە هەموو ڕوویەکەوە، لەگەڵ ئەوەشدا سەرەنجامیان بریتی بوو لە لەبەین چوون، هەرچەندە زۆریش بەهێز بوون، کەواتە با ئەوانەش، کافرەکانی ڕۆژگاری تۆ، ئەی موحەممەد ﷺ! بە زەبرو زۆری خۆیان نەنازن، هی لەوان بەهێزترو بە تواناتر لە بەین چووە، لە ئەنجامی ئەوەدا کە دژایەتیی پەیامی خوایان کردوە.

٤)- ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعْجِزَهُۥ مِن شَيْءٍ﴾، ناشگونجێ و هەرگیز نەبووە، کە هیچ شتێك خوا دەستەوسان بکات، دەستە پاچە بکات.

٥)- ﴿فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلْأَرْضِ﴾، نە لە ئاسمانەکان و نە لە زەوییدا.

(**أَعْجَزَهُ: أي: جَعَلَهُ عَاجِزاً**)، واتە: دەستەپاچەی کرد، دەستەوسانی کرد، بێتوانای کرد، هیچ شتێك خوا بێتوانا ناکات، کە دەفەرموێ: (**مِنْ شَيء**) واتە: (**أي شَيء كَان**)، هەر شتێك لە شتان، هیچ شتێك نیە، خوا دەستەوسان بکاو، دەستە پاچەی بکات، نە لە ئاسمانەکان و نە لەزەوییدا.

٦)- ﴿إِنَّهُۥ كَانَ عَلِيمًا قَدِيرًا﴾، واتە: بە دڵنیایی ئەو، (خوا ﷻ) زۆر زانایە، زۆریش توانایە.

ئەمە هۆکار هێنانەوە (تعليل)یە بۆ ئەوە کە چۆن هیچ شتێك خوا ﷻ دەستەوسان و دەستەپاچە ناکا، مادام ئەوپەڕی زانیاریی و توانای هەبێ، کەواتە: هیچ شتێکی لێ پەنهان نیەو، هیچ شتێکیشی لێ عاسێ نابێ کە نەتوانێ بیکات.

لە کۆتایی دا خوا ﷻ دەفەرموێ:

٧)- ﴿وَلَوْ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِمَا كَسَبُوا۟﴾، ئەگەر خوا خەڵکی گرتبایە، بە هۆی ئەوەوە کە کردوویانە، واتە: کردوویانە لە کردەوە خراپەکان، ئەمە بیرخستنەوەیانە، بۆ ئەوە کە با دواخستنی گرتنی خواو، دواخستنی سزادانی خوا، بۆیان، هەڵیاننەخەڵەتێنێ و فریویان نەدا، پێیان وا نەبێ ئەوە بەهۆی ئەوەوەیە، خوا توانای بەسەریاندا نیە، یاخود

**بە هۆی ئەوەوەیە، خوا ڕازییە لەو حاڵەی کە ئەوان لەسەرینی!! بەڵکو دواخستنیان هۆکارێکی دیکەی هەیە، کە دوایی باسی دەکات، ئەگەرنا ئەگەر خوا ﷻ خەڵکی گرتبایە، بە هۆی ئەوەوە کە لەسەر زەوی دەیکەن:**

**٨)- ﴿ مَا تَرَكَ عَلَىٰ ظَهْرِهَا مِن دَآبَّةٍ ﴾، لەسەر پشتی وی (زەوی) هیچ زیندەوەرێکی نەدەهێشت، ڕاناوی (ها) بۆ زەوی دەچێتەوە، چونکە بە پێی مەقام دەزانرێ، کە مەبەست پێی زەوی و دانیشتووانی سەر زەوییە، ئاوەدانکەرەوەکانی زەوییە، بە مرۆڤەوە، بە جینەوە، بە ئاژەڵەوە، بە دڕندەوە، بە پەڕەوەرەوە، بە هەموو ژیاندارانەوە.**

**٩)- ﴿ وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ﴾، بەڵام دوایاندەخات بۆ کاتێکی ناوبراو، بۆ کاتێکی دیارییکراو.**

**١٠)- ﴿ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ ﴾، ئنجا هەر کات ئەو کاتە دیارییکراوەیان هات.**

**١١)- ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِعِبَادِهِۦ بَصِيرًۢا ﴾، بێگومان خوا بینەری بەندەکانیەتی، دەزانێ چییان کردووەو چۆنیان کردووە؟!**

## بەراوردێکی نێوان ئایەتی (٤٥)ی (فاطر)و ئایەتی (٦١)ی (النَّحل)

شێوەی ئەم ئایەتەی (فاطر)- ٤٥-، لە سوورەتی (النَّحل)دا هاتوە، بەڵام بە جۆرێکی دیکە، دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِظُلْمِهِم مَّا تَرَكَ عَلَيْهَا مِن دَآبَّةٍ وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَـْٔخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ﴿٦١﴾ ﴾، واتە: ئەگەر خوا خەڵکی گرتبایە، بە هۆی ستەمیانەوە، هیچ زیندەوەرێکی لەسەر نەدەهێشت، بەڵام دوایان دەخات بۆ کاتێکی دیاریکراو، ئنجا هەر کاتێك کاتەکەیان هات، نە سەعاتێك دوادەخرێن، نە پێش دەخرێن.

قورئانی بە پێز هەموو وشەیەك و هەموو پیتێکی بە حیسابە: ﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا ﴾، بۆچی لە سوورەتی (النحل)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِظُلْمِهِم ﴾، بەڵام لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِمَا كَسَبُوا۟ ﴾، لەوێ بۆیە دەفەرموێ: (بِظُلْمِهِم)، چونکە لە ئایەتی پێشتردا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِٱلْأُنثَىٰ ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿٥٨﴾ يَتَوَٰرَىٰ مِنَ ٱلْقَوْمِ مِن سُوٓءِ مَا بُشِّرَ بِهِۦٓ أَيُمْسِكُهُۥ عَلَىٰ هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُۥ فِى ٱلتُّرَابِ أَلَا سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾، لەوێدا باسی ئەوە دەکات: کە کافرەکان کچان بۆ خوا بڕیار دەدەن، دەیانگوت: فریشتەکان کچانی خوان! بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِظُلْمِهِم ﴾، کە یەکێك لە زوڵمەکەیان ئەوە بوو، کە بەناوی خواوە دەیانگوت: فریشتەکان کچانی خوان و، شەیتانەکانیش کوڕانی خوان، بەڵام لێرەدا لە سوورەتی (فاطر)دا، باسی ئەوە نەکراوە، بۆیە هەر دەفەرموێ: ﴿ بِمَا كَسَبُوا۟ ﴾، لەسەر ئەوەی وە دەستیان هێناوە.

هەروەها لێرە دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِعِبَادِهِۦ بَصِيرًۢا ﴿٤٥﴾ ﴾، بەڵام لەوێ دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَـْٔخِرُونَ سَاعَةً وَلَا

يَسْتَقْدِمُونَ ﴿٦١﴾ ﴾، هەركات كاتيان هات نە سەعاتێك دوا دەخرێن، نە سەعاتێك پێش دەخرێن، واتە: ڕێك لە كاتی خۆیدا سزا دەدرێن.

كە دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِعِبَادِهِۦ بَصِيرًۢا ﴿٤٥﴾ ﴾، واتە: خوا سزایان دەدا بەوەی كە كردوویانە، چونكە دەزانێ چییان كردوە؟ كەواتە: با ئەوە كە خوا دوایان دەخات بۆ كاتی دیاریكراو، هەڵیاننەخەڵەتێنێ و، فریویان نەدا، پێیان وابێ خوا لێیان ڕازییە، یان خوا ﷻ دەسەڵاتی بەسەریاندا ناشكێ، بەڵكو حیكمەتەكەی ئەوەیە كە خوا بۆ ڕۆژێكی دیكەو، بۆ كاتێكی دیكەو دوای خستوون، ئنجا هەرشتە لە كاتی خۆیدا، دێ، خوا هەموو شتێكی بە سیستم (نظام) داناوە، دنیا شوێنی تاقیكردنەوەیە و قۆناغێكە دەبێت تێپەڕێ، دوای ئەو قۆناغی بەرزەخ دێ، دوای ئەویش قۆناغی قیامەت و لێپرسینەوەو سزاو پاداشت دێ.

كە لە سوورەتی (النحل)دا دەفەرموێ: ﴿ لَا يَسْتَـْٔخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ﴿٦١﴾ ﴾، ئەمە هەڕەشەكردنی خوایە بەوەی كە زۆر بە خێرایی دەیانگرێ، بە هۆی ئەو ستەمەوە كە كردوویانە، كە پێشتر باسیكراوە، كە بریتیە لەوەی فریشتەكانیان بە كچانی خوا داناون.

ئەلقوشەیریی قسەیەكی جوان دەكات، لێرەدا كە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِمَا كَسَبُوا۟ مَا تَرَكَ عَلَىٰ ظَهْرِهَا مِن دَآبَّةٍ وَلَـٰكِن يُؤَخِّرُهُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ۖ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِعِبَادِهِۦ بَصِيرًۢا ﴿٤٥﴾ ﴾.

**(قَالَ القُشَيْرِيُّ: لَوْ عَجَّلَ لَهُمْ مَا يَسْتَوجِبُونَهُ مِنَ الثَّوَابِ وَالعِقَابِ، لَمْ تَفِ أَعْمَارُهُم القَلِيلَةُ، وَمَا اتَّسَعَتْ أَفْهَامُهُمْ القَصِيرَةُ لَهُ، فَأَخَّرَ ذَلِكَ لِيَوْمِ الحَشْرِ، فَإِنَّهُ طَوِيلٌ)**[1]، واتە: ئەگەر خوا ئەوەی كە شایستەیانە، لە پاداشت و لە سزا، پەلەی كردباو بۆی هێنابانە پێش، تەمەنە كەمەكانیان بەشی ئەو پاداشتەی نەدەكرد، یان

---

(١) البحر المديد في تفسير القرآن المجيد، ج٦ ص١٣٤،١٣٣.

بەشی ئەو سزایەی نەدەکرد، هەروەها عەقڵە کورتەکانیشیان، بەشی تێگەیشتنی ئەوەی نەدەکرد، بەڵام ئەوە دواخراوە بۆ ڕۆژی حەشر، کە ڕۆژێکی زۆر دوورو درێژەو، کاتێکی بێ بڕانەوەو بێ پسانەوەیەو، بەشی هەموو شتێك دەکات.

خاوەنی (البحر المديد في تفسير القرآن المجيد)[1]، واتە ئیبنو عەجیبە لە تەفسیرەکەیدا، قسەیەکی جوان دەکات، وەك ئیشارەتێکی مەعنەویی و ڕووحیی بۆ تێگەیشتن لەو ئایەتە:

دەڵێ: (**تَعْجِيلُ العُقُوبَةِ فِي دَارِ الدُّنْيَا لِلمُؤْمِنِ إِحْسَانٌ، وَتَأْخِيرُهَا لِدَارِ الدَّوَامِ اسْتِدرَاجٌ وَخُذْلَانٌ، فَكُلُّ مَنْ لَهُ عِنَايَةٌ سَابِقَة، عَاتَبَهُ اللَّهُ فِي الدُّنْيَا بِمُصِيبَةٍ فِي بَدَنِهِ، أَو مَالِهِ أَو فِي أَهْلِهِ، وَمَنْ لَا عِنَايَةَ لَهُ، أُخِّرَتْ عُقُوبَاتُهُ كُلُّهَا لِدَارِ الجَزَاء**).

واتە: پەلەکردنی هێنانە پێشی سزا، لە مەنزڵگای دنیادا، بۆ ئیمانداری بڕوادار چاکەکارییە (واتە: چاکەکاریی خوایە بۆی) بەڵام دواخستنی بۆ مەنزڵگای بەردەوام، ئەوە پەلکێشکردن و پشت بەردانیەتی، هەر کەسێك خوا ﷻ مشوورخۆریی پێشووی بۆی هەبێ، لوتف و میهرەبانیی پێشووی لەگەڵیدا هەبێ، لە دنیادا بە بەڵایەك کە لە جەستەیدا، یان لە ماڵ و سامانیدا، یان لە خزم و کەسیدا بەسەری دێ، خوا سزای دەدا، بەڵام کەسێك خوا لوتف و میهرەبانیی لەگەڵیدا نەبێ، سزاکانی هەموویان دوا دەخرێن، بۆ مەنزڵگای سزاو پاداشت، بۆ قیامەت.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی لەو کەسانەمان بگێڕێ کە لوتف و میهرەبانیی لەگەڵماندا دەبێ و، ناڕەحەتیی و ئازارو مەینەتییەکانی ژیانی دنیامان بۆ بگێڕێ بە مایەی پاکبوونەوەو، خاوێنبوونەوەو، ئیمان زیاتر مەحکەم بوون و، زیاتر لە خوا نیزیك بوونمان.

هەروەها یارمەتییمان بدات زیاترو قووڵتر لە نهێنییەکانی کتێبەکەی تێبگەین و، پێی ئاشنا بین، هەروەها زیاتر کارلێك بکەین لەگەڵ ئایەتەکانی ئەم قورئانەدا،

---

(١) (البحر المديد..) ج٦ ص١٣٤.

بێگومـان ئـەم قورئانـە دوا نوسـخەی هیدایەتـی خوایـە ﷻ، خـوا دایبەزانـدوە بـۆ ئـەوە مرۆڤـەکان ڕێـی ڕاسـتی پـێ بگـرن، لـە دنیـادا بەختـەوەر بـن، لـە دوارۆژدا سـەرفراز بـن.

خـوا لـەو کەسانەمان بگێـڕێ کـە باشـترین بەهـرە لـە کتێبەکـەی وەردەگـرن، کـە بێگومـان ڕێبـازی پێغەمبـەری خـواش ﷺ، جگـە لـە جێبەجێکردنـی کتێبـی خـواو، بەرجەسـتەکردنی لەسـەر ئـەرزی واقیـع، شـتێکی دیکـە نەبـووە، خـوا یارمەتییـمان بـدات زیاتـر لـە کتێبـی خـوا شـارەزا بیـن و، باشـتر بـە ڕێبـازی پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئاشـنا بیـن.

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## دەستپێک

بەڕێـــــــزان!

خـوا پشـتیوان بـێ، ئەمـڕۆ کـە (٢٨)ی (ذي الحجـة)ی سـاڵی (١٤٤٠)ی کۆچییـە، بەرانبـەر (٢٠١٩/٨/٢٩)ی زایینـی، دەسـت دەکەیـن بـە تەفسـیر کـردنی سـوورەتی (یـس).

سـەرەتا وەك عـادەتی خۆمـان لـەم تەفسـیرە موبارەکـەدا، تیشـك دەخەینـە سـەر پێناسـە و نێـوەڕۆکی ئـەم سـوورەتە، لـە هەمـوو ئـەو ڕووانـەوە کە پێویسـتە شـارەزایی گشـتیی وردمـان لـە بارەیانـەوە هەبێ:

## پێناسەی سوورەتی (یس) و بابەتەکانی

پێناسەی سوورەتی (یس) دەکەین، لە حەوت بڕگەدا:

### یەکەم: ناوی:

ئـەم سـوورەتە نـاوی (یـس)ە، بـەو دوو پیتـەی سـەرەتای سـوورەتەکە ناونـراوە: (بسـم اللـه الرحمـن الرحيـم) ﴿يسٓ ۝١﴾، لـە هەندێـك دەقـی سوننەتیشـدا ئـەو نـاوە هاتـوە، هەرچەنـدە فەرموودەناسـان لـە ڕووی سـەنەدەکەیانەوە مشـتومڕیان هەیـە، هەندێکیـان سـەنەدەکەیان بـە ڕاسـت، یـان بـە بەهێزیـان دانـاون، هەندێکیان بـە بێهێزیـان دانـاون، بـۆ وێنـە:

أ- {«اقْـرَءُوا (يَس) عَلَى مَـوْتَاكُمْ»} (أخرجه ابن حبان: ٣٠٠٢، والحاكم: ٢٠٧٤، وأبو داود: ٣١٢١، وابن ماجه: ١٤٤٨، والنسائي في عمل اليوم والليلة: ١٠٧٤، والطَّيالِسِي: ٩٣١، عَنْ أَبِيهِ عَنْ مَعْقِلِ بْنِ يَسَارٍ، وَضَعَّفَهُ كُلّ من الألباني وشُعيب الأرنؤوط: ٦٨٨).

واتە: (یٰس) لەسەر مردووەکانتان بخوێنن.

کە بە دڵنیایی مەبەستی ئەوە بووە ئەوانەی کە بەرەو مەرگ دەچن، نەك دوای ئەوەی کە مردوون، بەڵکو ئەوانەی کە دەکەونە حاڵی خۆیان، نیشانەکانی مردن و مەرگیان لێ دەردەکەون.

ب- {«مَا مِنْ مَيِّتٍ يَمُوتُ، فَيُقْرَأُ عِنْدَهُ (يٰس) إِلاَّ هَوَّنَ اللهُ عَلَيْهِ»} (أخرجه الديلمي: ٦٠٩٩، عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ، وحده، وعزاه الحافظ في التلخيص: (١٠٤/٢) للديلمي، وضَعَّفَهُ الألباني).

واتە: هیچ مردوویەك سوورەتی یاسینی لەسەر ناخوێندرێ، مەگەر مردنی لەسەر سووك دەبێ.

لێرەش دیسان مردوو مەبەستی پێ کەسێکە، کە دەکەوێتە حاڵی خۆی و، دەکەوێتە گیانەڵا و، بەرەو مردن دەچێ، سوورەتی (یس) لەسەر بخوێنرێ، دەبێتە هۆی ئەوەی مردنەکەی ئاسانتر بێ.

ج- {«إِنَّ لِكُلِّ شَيْءٍ قَلْبًا، وَقَلْبُ الْقُرْآنِ (يٰس)، وَمَنْ قَرَأَ يٰس، كَتَبَ اللّٰهُ لَهُ بِقِرَاءَتِهَا قِرَاءَةَ الْقُرْآنِ عَشْرَ مَرَّاتٍ»} (أخرجه الدارمي: ٣٤١٦، والترمذي: ٢٨٨٧، وضَعَّفَهُ الألباني في الإرواء: ٦٨٨).

واتە: هەموو شتێك دڵی هەیە، دڵی قورئانیش (یس)ە [سوورەتی (یس)ە،] هەر کەسێك سوورەتی (یس) بخوێنێ، خوا بە هۆی خوێندنی ئەم سوورەتەوە، پاداشتی دە (١٠) جار خوێندنی هەموو قورئانی بۆ دەنووسێ. ئەمیش هەر هێنامان، ئەگەرنا برگەی دووەمی، وێڕای سەنەدی، لە ڕووی نێوەڕۆك (متن)یشەوە بێهێزە.

## دووەم: شوێنی دابەزینی:

بە یەکدەنگیی زانایان، ئەم سوورەتە مەککەییە، ئەو ڕایەش کە دەڵێ: ئەو ئایەتە موبارەکەی کە دەفەرموێ: ﴿وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا وَآثَارَهُمْ ۝١٢﴾ یس، لە

مەدینە دابەزیوەو، لە بارەی هۆزی (بنو سلمة) کە لە پشتیوانان بوون، کاتێ ویستیانماڵەکانیان لە دراوسێی مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ بگوازنەوە، بۆ ئەوەی دووربکەونەوە، تاکو هەنگاوان زیاتر هەڵێنن بەرەو مزگەوت و پاداشتیان زیاتر بۆ بنووسرێ، هەندێکیش گوتوویانە: ماڵەکانیان دووربوون، ویستوویانە لە مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ وەنیزیک کەون، بەهەرحاڵ، لەو بارەوە هەندێک گوتوویانە: ئەو ئایەتە لە مەدینە دابەزیوە.

بەڵام ئەوە ڕاست نیە کە ئەو ئایەتە موبارەکە لە مەدینە دابەزیبێ، هەرچەندە فەرموودەکە لەو بارەوە سەنەدەکەی ڕاستە، کە ئەمە دەقی فەرموودەکەیە:

**{عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللّهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: أَرَادَ بَنُو سَلِمَةَ أَنْ يَتَحَوَّلُوا إِلَى قُرْبِ الْمَسْجِدِ، قَالَ: وَالْبِقَاعُ خَالِيَةٌ، فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: «يَا بَنِي سَلِمَةَ! دِيَارَكُمْ تُكْتَبْ آثَارُكُمْ»، فَقَالُوا مَا كَانَ يَسُرُّنَا أَنَّا كُنَّا تَحَوَّلْنَا} (أخرجه أحمد: ج٣، ص٣٠٢، ومسلم: ٦٦٥، وابن حبان: ٢٠٤٢، وابن خزيمة: ٤٥١ ، وأبو يعلى: ٢١٥٧، واللفظ لمسلم).**

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: بەنوو سەلەمە ویستیان لە شوێنێکی دوورترەوە، نیزیک بکەونەوە بۆ لای مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ، کە ئەو کاتە بیقاع چۆڵ بوو، {گۆڕستانی بەقیع ئەوکاتە چۆڵ بووە} ئەوە بە پێغەمبەر ﷺ گەیشت، ئەویش فەرمووی: ئەی بەنو سەلەمە! لە ماڵەکانی خۆتاندا بمێننەوە، شوێنەوارەکانتان، شوێن پێیەکانتان دەنووسرێن، ئنجا بەنوو سەلەمە گوتیان: دڵخۆش نەدەبووین کە ماڵەکانمان گواستبایەوە، (دوای ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ ئەوەی پێ فەرمووین).

کەواتە: ماڵەکانیان دوور بوون و ویستوویانە بێنە نیزیک مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: ماڵەکانتان مەگوازنەوە، چونکە کاتێک کە دێن بۆ مزگەوت، هەنگاوەکانتان دەنووسرێن، کەواتە: هەتا ماڵەکەت دوورتر بێ، هەنگاوی زیاتر هەڵدێنی، مانای وایە پاداشتی زیاترت بۆ دەنووسرێ.

بەڵام ئەم دەقە کە لە ڕووی سەنەدەوە ڕاستە، نابێتە بەڵگە لەو بارەوە، کە ئەم ئایەتە لە مەدینە دابەزیبێ، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ئایەتە موبارەکەی بە بەڵگەی فەرمایشتەکەی هێناوەتەوە، کە مانای وانیە ئایەتەکە ئەوکاتە دابەزیوە، ئایەتەکە پێشتر هەبووە، بەڵام پێغەمبەر ﷺ بەبەڵگەی هێناوەتەوە، لە حاڵێکدا کە لە مەککە دابەزیوە، بەڵام بۆ ڕێگرتنەکەی خۆی، کە بە بەنوو سەلەمەی فەرمووە: ماڵەکانتان لە شوێنی دوورەوە مەگوازنەوە بۆ نیزیك مزگەوت، ئەم ئایەتە موبارەکەی بە بەڵگە هێناوەتەوە، هەرچەندە پێشتر دابەزیوە.

بە داخەوە ئەمە زۆرجار دووبارە بۆتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ ئایەتێك ڕستەیەکی فەرمووە، یەکسەر هەندێك لە زانایان، با ئەو ئایەتەو ڕستەیە پێشتر دابەزیبێ، وایانزانیوە لەو کاتە دابەزیوە کە فەرموویەتی! کە لە ڕاستیدا ئەوە وانیەو پێغەمبەر ﷺ هەموو قورئانی کە لەبەرچاو بووە، بۆ هەر هەڵوێستێك کە هاتۆتە پێش، ڕستەیەك یان ئایەتێکی هێناوە، یان چەند ئایەتێکی هێناون، مانای وانیە ئەو کاتە دابەزیوە، بەڵکو پێشتر هەبووە، بەڵام پێغەمبەر ﷺ ئەو ئایەتەی هێناوەتەوە، بەبەڵگەی ئەو فەرمایشتە، یان بەبەڵگەی ئەو هەڵوێستەی کە ویستوویەتی دەریببڕێ.

لێرەش بە تەئکید کە پێغەمبەر ﷺ ئەو ڕستەی قورئانییەی، یان ئەو ئایەتەی بە بەڵگەی ئەوە هێناوەتەوە کە ماڵەکانتان، لە دوورەوە مەگوازنەوە نیزیك مزگەوت، مانای وانیە کە ئەم ئایەتە بەس ئەو چەمکە دەگەیەنێ، ﴿وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا وَآثَارَهُمْ ﴿١٢﴾﴾یس، چونکە چەمك و واتایەکەی زۆر فراوانە، ئەوەی پێش خۆیانی دەخەن و، ئەو شوێنەوارانەی بەجێیان دەهێڵن، هەمووی دەگرێتەوە، بەڵام پێغەمبەر ﷺ لە نێو ئەو شوێنەوارانەدا، شوێن پێیەکانی ئەوان و هەنگاوەکانی ئەوانیشی، ڕەچاو کردوون، نووسرانی هەنگاوەکانی ئەوان و شوێنەوارەکانی ئەوان، لە کاتێکدا بەرەو مزگەوت دێن، بۆ نوێژی بە کۆمەڵ،

یـان بـۆ نوێـژی جومعـە، کـە ئەویـش هـەر بەشـێکە لـەو شـوێنەوارانەی خـوای پـەروەردگار فەرموویەتـی: دەیاننووسـین.

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و هاتنە خواردا:

ئـەم سـوورەتە لـە ڕیزبەندیـی موصحـەف دا، ژمـارە (٣٦)ەو، لـە ڕیزبەندیـی دابەزینـدا، ژمـارە (٤٠)ە، یـان (٤١)ە، لـە دوای سـوورەتی **(الجـن)**و، پێـش سـوورەتی **(الفرقـان)** دابەزیـوە.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەکان:

ئـەم سـوورەتە موبارەکـە ژمـارەی ئایەتەکانـی (٨٣)یـە، لـە لای زۆربەیـان، هەندێکیـش گوتوویانـە: (٨٢) ئایەتـە، وەك زۆرجـار گوتوومانـە: کـە زانایـان ڕاجیاییـان هەبـووە لـە کەمیـی و زیادیـی ژمـارەی ئایەتەکانـدا، ئـەوە دەگەڕێتـەوە بـۆ کورتیـی و درێژیـی ڕسـتەکان، زانایـەك ڕسـتەیەکی کـردوە بـە دوو کەرتـەوە، لـە نێـو قـەدێ وەسـتاوەو، بۆتـە دوو ئایـەت، یەکـی دیکـە ئـەو دوو ڕسـتەی پێکـەوە گوتـوون، بۆتـە یـەك ئایـەت، لـەوەدا کەمیـی و زیادیـی ژمـارەی ئایەتـەکان ڕوویـداوە.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی:

لەم سوورەتەدا، هەرسێ بنەڕەتە گەورەکەی ئیمان خراونە ڕوو:

١- خواناسیی و خوا بەیەکگرتن.

٢- وەحیی و پێغەمبەرایەتیی.

٣- ڕۆژی دوایی و سزاو پاداشت.

بەڵام باسی قیامەت و ڕۆژی دوایی لەم سوورەتەدا، پشكی شێری پێبڕاوەو، زیاتر لە (٣/١) یەك لەسەر سێی سوورەتی (یس) بۆ باسی ڕۆژی دوایی تەرخانكراوە.

## شەشەم: تایبەتمەندییەكانی:

هەموو جارێ كە سەرنجی هەر سوورەتێك دەدەم، كۆمەڵێك تایبەتمەندیی دێنە بەرچاو، كە دەگونجێ تایبەتمەندیی دیكەش هەبن، بەڵام ئێمە ئەوانەمان پێ زەقترو بەرچاوترە، كە دەیانهێنین، لەم سوورەتەش دا حەوت تایبەتمەندییمان هێناون:

**تایبەتمەندیی یەكەم:** تەنیا لەم سوورەتەدا، باسی كۆت و زنجیركردنە گەردنی كافران لە دنیادا كراوە، هەروەها بەربەست لە بەردەم دروستكردن و، پەردە بەسەر چاو هەڵكشانیان، تەنیا لە سوورەتەدا باسكراوە، لە ئایەتەكانی (٨ و ٩)دا.

**تایبەتمەندیی دووەم:** تەنیا لەم سوورەتەدا، باسی ئەوە كراوە كە خوا ﷻ، پێشخراوی بەندەكان، واتە: ئەو شتانەی كە پێشیان خستوون و، شوێنەوارەكانیشیان، ئەوانەی كە بەجێیان هێشتوون، هەموویان تۆمار دەكات و دەینووسێ، هەروەك لە ئایەتی (١٢) دەفەرموێ: ﴿وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا وَآثَارَهُمْ ﴿١٢﴾﴾.

**تایبەتمەندیی سێیەم:** چەند وشەیەك لەم سوورەتە موبارەكەدا هاتوون، كە تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوە، بۆ وێنە:

١- وشەی: **(إمام مبين)** كە مەبەست پێی: زانیاریی بێسنووری خوایە، یان مەبەست **(لوح محفوظ)**ە.

٢- وشەی: **(العرجون القديم)** **(عرجون)** واتە: لقە دارخورمای وشكی كۆن.

٣- وشەی: **(جِبِلًا)**، خەڵكی زۆر.

٤- وشەی: (المرقد)، گۆڕ.

٥- وشەی: (شغل)، سەرقاڵیی و ڕابواردن.

**تایبەتمەندیی چوارەم:** بەسەرهاتی (أصحاب القریة)و، نێردرانی سێ ڕەوانەکراوی خوا بۆ لایان، تەنیا لەم سوورەتەدا هاتووە، واتە: تەنیا لەم سوورەتەدا باسکراوە کە خوا سێ لە پێغەمبەرانی ناردبێ بۆ ئاوەدانییەك، بۆ بانگەوازکردنیان، هەڵبەتە مووساو هاڕوون (عَلَيْهِمَا السَّلَام)، زۆر باس کراون، بەڵام ئەوان دوو بوون و براش بوون، بەڵام سێ لە پێغەمبەران بنێردرێن بۆ بانگەوازکردنی ئاوەدانییەك، تەنیا لەم سوورەتەدا هاتووە.

**تایبەتمەندیی پێنجەم:** تەنیا لەم سوورەتەدا، ئەم ڕستەیە هاتووە، لە ئایەتی (٥٨)دا: ﴿ سَلَٰمٌ قَوْلًا مِّن رَّبٍّ رَّحِيمٍ ﴾، سەلامکردن فەرمایشتە لە پەروەردگارێکی میهرەبانەوە.

**تایبەتمەندیی شەشەم:** تەنیا لەم سوورەتەدا، ئەم ڕاستییە ڕاگەیەندراوە کە موحەممەد ﷺ خوا شیعری فێرنەکردووەو، ناشگونجێ و شایستەشی نیە، کە فێری شیعر ببێ، ئەویش لە ئایەتی (٦٩)دا هاتووە، ﴿ وَمَا عَلَّمْنَٰهُ ٱلشِّعْرَ وَمَا يَنۢبَغِى لَهُۥٓ ﴾،

**تایبەتمەندیی حەوتەم:** ئەم ڕستەیە تەنیا لێرەدا هاتووە: ﴿ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلشَّجَرِ ٱلْأَخْضَرِ نَارًا فَإِذَآ أَنتُم مِّنْهُ تُوقِدُونَ ﴿٨٠﴾ ﴾، ئەو خوایەی کە لە درەختی سەوز ئاگری بۆ ڕەخساندوون.

ئەمە ئەو حەوت تایبەتمەندییە زەق و بەرچاوەن، کە ئەم سوورەتە لە سوورەتەکانی دیکە جیادەکەنەوە.

## حەوتەم: دابەشکردنی ئەم سوورەتە بۆ چەند دەرسێك:

ئەم سوورەتەمان بۆ پێنج دەرس دابەشکردوە، بەم شێوەیەی خوارەوە:

**دەرسی یەکەم:** ئایەتەکانی: (١ - ١٢)، واتە: (١٢) ئایەت، ئەم دوازدە ئایەتە وەك پێشەکیی و پوختەی هەرسێك بابەتەکەی کە لەم سوورەتەدا باسکراون، وان.

**دەرسی دووەم:** ئایەتەکانی: (١٣ - ٣٢) واتە: (٢٠) ئایەت، لەم بیست ئایەتەدا بەسەرهاتێك باسکراوە، بە ناوی بەسەرهاتی هاوەڵانی ئاوەدانییەکە (أصحاب القرية)و، هەرسێك بنەڕەتەکە واتە: خواناسیی و خوا بەیەکگرتن، پێغەمبەرایەتیی و وەحیی، هەروەها ڕۆژی دوایی و سزاو پاداشت، لە دوو توێی ئەو (٢٠) ئایەتەدا خراونە ڕوو.

**دەرسی سێیەم:** ئایەتەکانی: (٣٣ - ٤٧) واتە: (١٥) ئایەت، نیشانە و بەڵگەکانی یەکتایی خواو، چاکەو نیعمەتەکانی خوا لە ژیانی مرۆڤدا، کە ژمارەیەکی باشیان لێ خراونەڕوو، هەم لە زەویی و هەم لە ئاسمان دا.

**دەرسی چوارەم:** ئایەتەکانی: (٤٨ - ٦٨) واتە: (٢١) ئایەت، باسی ڕۆژی دوایی کراوە بە گشتیی و، بە تایبەتی قیامەت و زیندووبوونەوەو، هەڵسانەوەی مرۆڤەکان.

**دەرسی پێنجەم:** ئایەتەکانی: (٦٩ - ٨٣) واتە: (١٥) ئایەت، باسی پێغەمبەرایەتیی و بەڵگەکانی خواناسیی، بە تایبەت باسی زیندووکرانەوەو قیامەت و سزاو پاداشت.

---

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان دوازدە (١٢) ئایەتـی سـەرەتای سـوورەتی (یـس) دەگرێتـە خۆی، ئـەم دوازدە ئایەتـە وەك پێشـەكیی و، پوختـەو گـوشراوی كـۆی سـوورەتەكەو، بابەتەكانـی سـوورەتی (یس) وان، كـە لـەم دوازدە ئایەتـەدا، خـوا ﷻ باسـی قورئانـی حەكیـم دەكات.

دواتـر بـاسی پێغەمبەرایەتیـی موحەممـەد ﷺ، پاشـان ئامانجـی دابەزێنرانـی قورئـان و ڕەوانەكرانـی موحەممـەد ﷺ باسـدەكات، دواتـر هەڵوێسـتی نەرێنییانـەو كەللەڕەقانـەی كافـرەكان لـە بەرانبـەر قورئـان و پێغەمبـەردا ﷺ دەخاتـەڕوو، وێـڕای هەڵوێسـتی لـە خواترسـاوانی شـوێنكەوتووی قورئـان و پێغەمبـەر ﷺ.

لـە كۆتایـی دا خـوای زانـاو توانـا ڕایدەگەیەنـێ، كـە مـردووان زینـدوو دەكاتـەوەو، ئـەوەی پێـش دەسـتی خۆیانیـان خستوە لـە چاك و خراپ، لـە كـردارو ڕەفتـاری چاك و خـراپ، هەروەهـا ئـەو شـوێنەوارانەش كـە بەجێیـان هێشـتوون، لـە دوای خۆیـان تۆمـار دەكرێـن و، بـە پێـی ئـەوە كـە بـە پێـش دەسـتی خۆیـان خسـتوەو، بـە پێـی ئـەوە كـە لە دوای خۆیـان بەجێیـان هێشـتوە، لـە چاك و خـراپ، سـزا، یاخـود پاداشـت دەدرێنـەوە.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ يسٓ ﴿١﴾ وَٱلْقُرْءَانِ ٱلْحَكِيمِ ﴿٢﴾ إِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٣﴾ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٤﴾ تَنزِيلَ ٱلْعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٥﴾ لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّآ أُنذِرَ ءَابَآؤُهُمْ فَهُمْ غَٰفِلُونَ ﴿٦﴾ لَقَدْ حَقَّ ٱلْقَوْلُ عَلَىٰٓ أَكْثَرِهِمْ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٧﴾ إِنَّا جَعَلْنَا فِىٓ أَعْنَٰقِهِمْ أَغْلَٰلًا فَهِىَ إِلَى ٱلْأَذْقَانِ فَهُم مُّقْمَحُونَ ﴿٨﴾ وَجَعَلْنَا مِنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا فَأَغْشَيْنَٰهُمْ فَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ ﴿٩﴾

﴿وَسَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ ءَأَنذَرۡتَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿١٠﴾ إِنَّمَا تُنذِرُ مَنِ ٱتَّبَعَ ٱلذِّكۡرَ وَخَشِيَ ٱلرَّحۡمَٰنَ بِٱلۡغَيۡبِۖ فَبَشِّرۡهُ بِمَغۡفِرَةٖ وَأَجۡرٖ كَرِيمٍ ﴿١١﴾ إِنَّا نَحۡنُ نُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ وَنَكۡتُبُ مَا قَدَّمُواْ وَءَاثَٰرَهُمۡۚ وَكُلَّ شَيۡءٍ أَحۡصَيۡنَٰهُ فِيٓ إِمَامٖ مُّبِينٖ ﴿١٢﴾﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە، یاسین ﴿١﴾ سوێند بە قورئانی پڕ حیکمەت ﴿٢﴾ بە دڵنیایی (ئەی موحەممەد!) تۆ لە نێردراوانی (خوای) ﴿٣﴾ لەسەر ڕێیەکی ڕاست و ڕێکی ﴿٤﴾ (ئەم قورئانە) دابەزێنراوی (خوای) زاڵی بەخشندەیە ﴿٥﴾ تاکو کۆمەڵێك هۆشیار بکەیەوە، بترسێنی کە باب و باپیرانیان وریا نەکرابوونەوە، بۆیە بێئاگان (لە پەیام و بەرنامەی خوا) ﴿٦﴾ (بڕیارو) قسە (ی خوا) کە دەبێ سزا بدرێن، لەسەر زۆربەیان چەسپاوە، بۆیە بڕواناهێنن ﴿٧﴾ ئێمە کۆتەکانمان کردوونە گەردنیانەوە، هەتا چەنەگەکانیان هاتوون، بۆیە سەریان بەرەو سەرێ بەرزبۆتەوە ﴿٨﴾ لە پێش دەستیشیانەوە بەربەستێکمان داناوە، لە پشتیشیانەوە بەربەستێك، ڕووشیانمان داپۆشیون، (پەردەمان بەسەر هەڵکشاندوون)، بۆیە نابینن ﴿٩﴾ بۆ ئەوانیش یەکسانە بە ترساندنەوە هۆشیاریان بکەیەوە، یان هۆشیاریان نەکەیەوە، هەر بڕواناهێنن ﴿١٠﴾ تۆ تەنیا کەسێك هۆشیار دەکەیەوە (کە لە هۆشیارکرانەوەکە بەهرەمەند بێ)، کە شوێن (قورئانی) بیرخەرەوە بکەوێ و، بە پەنامەکیی سام و ترسی هەبێ لە (خوای) پەروەردگار و بەبەزەیی، ئنجا ئەو کەسە موژدەی لێبوردنێك (ی تایبەت) و پاداشتێکی پەسندو نایابی پێ بدە ﴿١١﴾ بێگومان ئێمە مردووان دەژیێنینەوەو، هەرچی پێشیان خستوە (لە کردەوان) و شوێنەوارەکانیشیان دەنووسین، هەموو شتێکیشمان لە (تۆمارگەیەکی) پێشەوای ڕوون دا سەرژمێر کردوە ﴿١٢﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(أَغْلَٰلًا): (أَغْلَال جَمْعُ غُل، مُخْتَصٌ بِمَا يُقَيَّدُ بِهِ فَتُجْعَلُ الْأَعْضَاءُ وَسْطَهُ، حَلْقَةٌ عَرِيْضَةٌ مِنْ حَدِيد، كَالْقَلَادَةِ تُحِيْطُ بِالرَّقَبَةِ)، (أَغْلَال) كۆی (غُل)ە، (غُل) تایبەتە بەوەوە کە مرۆڤی پێ کەلەپچە دەکرێ، ئنجا ئەندامەکان دەخرێنە نێویەوە، دەشگونجێ بگوترێ: ئاڵقەیەکی پانە لە ئاسن، وەك ملوانکە وایە، یان وەك رێشمە وایە، دەخرێتە گەردنەوە، دەوری گەردن دەدا، بەڵام پانە، وا دەکات کە چەنەگەی مرۆڤ هەڵکشێ، نەتوانێ سەری بێنێتە خوار.

(ٱلْأَذْقَانِ): (الأَذْقَانُ جَمْعُ الذَّقَنْ أو الذِّقَن، مَجْتَمَعُ اللَّحْيَيْنِ مِنْ أَسْفَلِهِمَا)، (أَذْقَان) کۆی (ذَقَنْ) یان (ذِقَن)، کە ئەویش بریتیە لە باری خوارەوەی شوێنی کۆبوونەوەی دوو شەویلاگەکان، کە چەناگەی پێ دەڵێن.

(مُّقْمَحُونَ): (القَمحُ: رَفْعُ الرَأْسِ لِسَفِّ الشَّيءِ، أَقْمَحْتُ البَعِيْرَ: شَدَدْتُ رَأْسَهُ إلى خَلْفٍ)، (قَمْحُ) بریتیە لەوەی کاتێك مرۆڤ دەیەوێ شتێك بەهەڵمژینەوە بخوات، شتێکی وردی وەك تۆز، سەری بەرز دەکاتەوە، دەگوترێ: (أَقْمَحْتُ البَعِيْرَ) سەری حوشترەکەم ڕاکێشا، ئەویش بەرزی بکاتەوە، کەواتە: (مُّقْمَحُونَ)، واتە: سەربەرزکراوەکان.

(سَدًّا): (السَدُّ والسُدُّ: المَانِعُ، الجِدَارُ: الحاجِز بَيْنَ الشَّيئَيْنِ، وَالجَمْعُ أَسْدَاد)، وشەی (سَدّ) و (سُدّ) واتە: ڕێگر، پەرچ، دیوار، پەردە لە نێوان دوو شتاندا، (سَدُ) یاخود (سُدُ) بە (أَسْدَاد) کۆدەکرێتەوە، هەندێکیش گووتویانە: (سَدّ) ئەوەیە مرۆڤ دروستیبکات و (سُدُ)یش ئەوەیە خواکرد بێ.

(فَأَغْشَيْنَٰهُمْ): ڕوویانمان داپۆشیوە، کە مەبەست پێی چاون، چاوەکانیش لە پێشەوەن، لە ڕوودان، دەگوترێ: (غَشِيَةٌ: سَتَرَهُ، وَالغِشَاوَةُ مَا يُغْطَى بِهِ)، (غَشِيَهُ)،

واتـە: (سَـتْرَةُ) واتـە: داپۆشـی، (غشَـاوَة)ش، شـتێکە کـە دەم و چـاوو ڕووی پـێ دادەپـۆشرێ.

(إِمَامٍ مُّبِينٍ ): (الإمَـام: المُؤتَـمُّ بِـهِ إنْسَـاناً أو كِتَابَـاً)، (إمَـام)، واتـە: پەیڕەوییلێکـراو، هـەر شـتێك كـە مرۆڤ شـوێنی بكـەوێ، چ مـرۆڤ بـێ، چ نووسـینێك بـێ، كـە مـرۆڤ پێـوەی پابەندبـێ.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا ﷻ لـەم سـوورەتە موبارەكـەدا دەفەرمـوێ: بـە نـاوی خـوای بەبەزەیـی بەخشـندە، وەك زۆر جـار گوتوومانـە، لێـرەدا پێویسـتە چـوار واتـا لـە عەقـڵ و دڵ دا ئامادەبكرێـن:

١- بە ناوی خوا، ئەم قورئانخوێندنە دەست پێدەكەم.

٢- بە مەبەستی دەستخستنی ڕەزامەندیی خوا، ئەم قورئانخوێندنە ئەنجام دەدەم.

٣- بە پێی بەرنامەی خوا، ئەوكارە ئەنجام دەدەم.

٤- بە هەوڵ و توانای ڕەخسێنراویی خوا، ئەنجامی دەدەم، نەك بە شان و شەوكەتی خۆم.

ئنجـا دەفەرمـوێ: ﴿يسٓ﴾، ئەمانـە دوو پیـتن، پیتـی (یـاء)و، پیتـی (سـین)، هەندێـك گوتوویانـە: ئـەوە نـاوی پێغەمبـەرە، یاخـود نـاوی شـتێكی دیكەیـە، بـەڵام ڕاسـتییەكەی ئەمـەش وەك (طـە) وایـە، نـە (طـە) نـاوی پێغەمبـەر بـووە ﷺ، نـە (یـس) نـاوی پێغەمبـەر بـووە، بەڵكـو هـەم (طـە): (طـاء) (هـاء) دوو پیـتن، هـەم (یـس)، ئـەوە لـە هەنـدێ شـیعری كوردیـی دا هاتـوە: [نـاوی موبارەكـی موحەممـەدو ئەحمـەدو تاهـا و یاسـینە!] موحەممـەدو ئەحمـەد تـەواوە، لـە قورئانـدا هاتـوون، بـەڵام (طـە)و (یـس) هـەر كامێكیـان دوو پیـتن، لـەو پیتانـەی كـە زمانـی عەڕەبییـان لـێ پێـك دێ.

## قسەیەک دەربارەی پیتە پچڕپچڕەکان

شایانی باسە: ئەم سوورەتە موبارەکەش بە پیتە پچڕ پچڕەکان دەست پێدەکات، ئێمە کاتی خۆی، لە سەرەتای زۆر لە سوورەتەکان دا، باسی ئەم پیتە پچڕ پچڕانەمان کردوە، بەڵام لێکۆڵینەوەی تێرو تەسەلترمان لە سەرەتای سوورەتی (یونس)ەوە کردوەو، پانتاییەکی باشمان بۆ لێکۆڵینەوە لە بارەی ئەو پیتانەوە، کە لە سەرەتای سوورەتەکانەوە هاتوون، تەرخان کردوە، کە لە سەرەتای (٢٩) سوورەتدا ئەو پیتە پچڕ پچڕانە هاتوون و، بەم شێوەن:

١- یەك پیت وەك: (ص) و (ق) و (ن).

٢- دوو پیت وەك: (طه) و (یس) و (طس) حەوت (حم)ەکان، کە یەکیان (عسق)یشی زیادە.

٣- سێ پیت وەك: شەش (الم)ەکان و، پێنج (الر)ەکان و، دوو (طسم)ەکان.

٤- چوار پیت وەك: (المص)، (المر).

٥- پێنج پیتیش هەیە کە: (کهیعص)ە، لەوە زیاتر نین، واتە: لە یەك پیت کە ناگونجێ کەمتر بێ و، لە پێنجیش زیاتر نین.

ئێمە کاتی خۆی لەو بارەوە لێکۆڵینەوەیەکی باشمان کرد، بەڵام لێرەدا بە چاکم زانی شتێکی دیکە باس بکەین، ئەویش (فخرالدین الرازي) لە تەفسیرەکەی خۆی هێناویەتی، هەروەها (الشعراوي)[1]یش، خوڵاصەیەکی هێناوە، منیش بە شێوازی خۆم، خوڵاصەو پوختەکەی (الشعراوي) کە باشی پوخت کردۆتەوە، پوختەی ئەو پوختەیەی (الشعراوي)م هێناوەو، بە چوار خاڵ دەخەینەڕوو:

---

(١) تفسیر الخواطر: ج٢٠، ص١٢٥٦٢.

١- پیتەکانی زمانی عەرەبیی بیست و هەشت (٢٨) پیتن: (أ، ب، ت، ث، ج، ح، خ، د، ذ...)، چواردەیان لە سەرەتای (٢٩) سوورەتی قورئاندا هاتوون، واتە: نیوە ئەو (٢٨) پیتە، لە سەرەتای (٢٩) سوورەتی قورئاندا هاتوون، کە پێیان دەگوترێ: پیتە پچڕ پچڕەکان، (**الحُرُوف المُقَطَّعة**) چونکە ناگونجێ بە سەریەکەوە بخوێنرێنەوە، بۆ وێنە: (**ألم**) بگوترێ: ئەلەم، بەڵکو دەبێ لێك بچڕێندرێن: ئەلیف لام میم.

٢- ئەو چواردە پیتە کە هاتوون، لە سەرەتای بیست ونۆ (٢٩) سوورەتدا، نیوەی (٢٨) پیتەکانی زمانی عەرەبیین، ئنجا لەو (٢٨) پیتە، لە نۆی یەکەم، واتە: (أ، ب، ت، ث، ج، ح، خ، د، ذ) ئەم نۆ پیتە، تەنیا دوو پیتی هەمزەو حا (أ) و (ح) وەرگیراون، حەوتەکەی دیکەیان (ب، ت، ث، ج، خ، د، ذ)، وەرنەگیراون، بۆ ئەوەی بخرێنە نێو ئەو (١٤) پیتە پچڕ پچڕەی کە لە سەرەتای (٢٩) لە سوورەتەکانی قورئاندا هاتوون، کەواتە: لە نۆ پیتی یەکەم، تەنیا دووانیان وەرگیراون، (أ) لەگەڵ (ح)و حەوتیان وەرنەگیراون.

٣- لە نۆ پیتی دووەم و کۆتایی، کە بریتین لە: (ف، ق، ك، ل، م، ن، هـ، و، ي)، لەو نۆ پیتەی کۆتایی، تەنیا دوو پیتی (ف) لەگەڵ (و) وەرنەگیراون و، حەوتیان وەرگیراون کە بریتین لە: (ق، ك، ل، م، ن، هـ، ي)، یانی: بە پێچەوانەی نۆ پیتی یەکەمەوە، کە ئەوان تەنیا دووانیان لێوەرگیراون و، حەوتیان تەرك کراون، نۆ پیتی کۆتایی، حەوتیان وەرگیراون و، تەنیا دووانیان تەرك کراون.

٤- لە دە (١٠) پیتی نێوەڕاست، کە بریتین لە: (ر، ز، س، ش، ص، ض، ط، ظ، ع، غ)، لەم دە پیتە، تەنیا پێنج پیتە بێ نوقتەکان وەرگیراون، کە بریتین لە: (ر، س، ص، ط، ع)، بەڵام پێنج پیتە نوقتەدارەکان هیچیان وەرنەگیراون، کە بریتین لە: (ز، ش، ض، ظ، غ)، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ئەو پیتە پچڕ پچڕانە، زۆر بە وردەکاریی، دیارییکراون، هەڵبەتە لێرەدا بوار نیە باسی بکەین، ئایا بۆچی لە دە (١٠) پیتی نێوەڕاست، تەنیا پیتە بێ خاڵەکان (بێ نوقتەکان) وەرگیراون و خاڵدارەکان وەرنەگیراون و، لە نۆ پیتی یەکەم، بۆچی تەنیا دووانیان وەرگیراون و، حەوتیان تەرککراون و، لە نۆ پیتی دووەم، بۆچی تەنیا دووانیان تەرککراون و حەوتیان وەرگیراون؟

بێگومان ئەوە نهێنیی زۆری لە ژێردایە، گرنگ ئەوەیە دەبێ ئەمە سەرنجمان ڕابکێشێ، بۆ ئەوە کە ئەو پیتە پچڕ پچڕانە، بە گۆترە دانەنراون، هەڕەمەکیی نیە و نهێنیی زۆر ورد هەن، لە هەموو فەرمایشتی خواداو، لەو پیتە پچڕ پچڕانەش دا، کە تاکو ئێستاش بە گشتیی مەتەڵ و نهێنیی خوان ﷻ لە فەرمایشتەکەیدا.

ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلْقُرْءَانِ ٱلْحَكِيمِ ﴾، سوێند بە قورئانی حەکیم، (ٱلْحَكِيمِ) وەسفە بۆ زاتێکی خاوەن ئیرادەو خاوەن هەست، واتە: خاوەن حیکمەت:

أ- ئنجا دەگونجێ لێرەدا بگوترێ: (ٱلْحَكِيمِ) یانی: (ذُو الحِكْمَة)، خاوەن حیکمەت، یان پڕ حیکمەت.

ب- دەشگونجێ بگوترێ: هەر قورئان کاربەجێیە، قسەلەجێیە، بڕیارو هەواڵەکانی لە جێن.

ج- دەشگونجێ (ٱلْحَكِيمِ) بە مانای (مُحْكَم) قایمکراوو پتەوکراوو بە ڕێکیی گوتراو، تەفسیر بکرێ.

﴿ إِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾، بە دڵنیایی تۆ لە ڕەوانەکراوانی، ڕووی دواندن لە پێغەمبەری خاتەمە ﷺ، ﴿ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾، لەسەر ڕێیەکی ڕاستی، ڕێیە ڕاستەکە بریتیە لە کۆی ئەو بوونناسییەی کە ئیسلام دەیڵێ و، ئەو ئیمان و عەقیدەیە، کە ئیسلام دەیڵێ و، ئەو شەریعەیەتە کە قورئان دەیفەرموێ و، پێغەمبەری خاتەم ﷺ هێناویەتی بە هەموو ڕەهەندەکانیەوە، ئەوە ڕێیە ڕاستەکەیە.

﴿ تَنزِيلَ ٱلْعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ ﴾، ئەم قورئانە دابەزێنراوی (خوای) زاڵی میهرەبانە، خوێنراویشەتەوە: (تَنْزِيلُ العَزِيزِ الرَّحِيْم)، ئەم قورئانە دابەزێنراوی خوایەکی باڵادەستی میهرەبان و بەبەزەییە، بەخشندەیە، بۆچی هاتوە؟ ﴿ لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّآ أُنذِرَ ءَابَآؤُهُمْ فَهُمْ غَٰفِلُونَ ﴾، تاکو کۆمەڵێک، خەڵکێک، بترسێنی و وریایان بکەیەوەو

هۆشیاریان بکەیەوە، کە باب و باپیرانیان هۆشیار نەکراونەوە، بۆیە بێئاگان، دوایی لە مەسەلە گرنگەکان دا، تیشکی دەخەینە سەر، کە: یانی چی باب و باپیرانیان ئاگادار نەکراونەوە، لە حاڵێکدا کە خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ بَشِيرًا وَنَذِيرًا ۚ وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ ﴿٢٤﴾ ﴾فاطر، هیچ کۆمەڵگایەك نەبووە، مەگەر ترسێنەرو هۆشیارکەرەوەیەکی تێدا ڕابردوە؟! ڕوونی دەکەینەوە لێرە مەبەست چییە؟ کە ئەم ڕاستییە بە لای کەمەوە، جگە لێرە، لە دوو شوێنی دیکەی قورئانیشدا هاتوە، هەم لە سووڕەتی (القصص)دا هاتوەو، هەم لە سووڕەتی (السجدة)شدا هاتوە.

﴿ لَقَدْ حَقَّ ٱلْقَوْلُ عَلَىٰٓ أَكْثَرِهِمْ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾، قسە لە سەر زۆربەیان پێویست بووە، بۆیە بڕواناهێنن، مەبەست لە قسە (ٱلْقَوْلُ) فەرمایشتی خوایە ﷻ، واتە: بڕیاری خوا کە خۆی فەرموویەتی، لەسەر زۆربەیان پێویست بووە، لەسەر زۆربەیان چەسپاو بووە، بۆیە بڕواناهێنن، فەرمایشتی خوا، کامەیە کە لەسەریان چەسپاوە؟ زۆربەی زانایان وایان لێکداوەتەوە، واتە: ئەو فەرمایشتەی کە خوا دەفەرموێ: ﴿ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿١١٩﴾ ﴾هود، واتە: بە دڵنیایی دەبێ دۆزەخ لە جند و مرۆڤ تێکڕایان پڕ بکەم، ئەم فەرمایشتەی خوایان لەسەر چەسپیوە!

بەڵام ئەم فەرمایشتەی خوا بە گوترە ناچەسپێ، خوا کە فەرموویەتی: دۆزەخ لە مرۆڤ و جند پڕ دەکەم، واتە: ئەو جند و مرۆڤەی گوێ بە هیدایەتی من نادەن، ڕێنمایی خوا فەرامۆش دەکەن و، نایگرنەبەر.

بەڵام دەشگونجێ بڵێین[1]: بڕیارێك کە لەسەر زۆربەیان هاتۆتە دی، ئەوەیە کە هەر کەسێك، بەرەو خوا نەجووڵێ، بەرەو خوا وەرنەچەرخێ و واز لە بەرژەوەندییە ناشەرعییەکانی نەهێنێ، واز لە (هَوى) نەهێنێ بۆ (هُدى)، هەوا

---

(١) ئەمە ڕای خۆمەو ڕەنگە لە هەندێك تەفسیرانیش دا هاتبێ.

تەرك نەكاو، نەكەوێتە شوێن (هودا)، ئەوە خوا بڕیاری بۆ داوە، كە دەبێ سزا بدرێ، ئەو بڕیاری سزادرانەش، دەرەنجام و دەرهاویشتەی هەڵوێستی نەرێنییانەی كافرانە، بەرانبەر بە پەیام و هیدایەتی خواو بەرانبەر بە پێغەمبەری خوا.

كەواتە: دەگونجێ بڵێین: مەبەست لەو بڕیارە ئەوەیە، كە خوا دەفەرموێ: هەر كەسێك بەدوای هیدایەتی من نەكەوێ، سزا دەدرێ، ئەوە ئەو بڕیارەیە كە بەسەریان دا چەسپیوە، كە وەدوانەكەوتنی هیدایەتی خواش، بە ویستی خۆیانە، بەڵام دوایی بڕیار بەسەردادانیان كە دەبێ سزا بدرێن، ئەوە بە تەئكید لە دەرەوەی ویست و خواستی خۆیانەو، بڕیاری خوای پەروەردگارە.

ئنجا خوا ﷻ، حاڵەتی ئەوانمان بۆ وێنا دەكات، كە چەندە كەللەڕەق و داخراوو نەسەلمێنن، بەرانبەر بە هیدایەتی خوا، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا جَعَلْنَا فِيٓ أَعْنَٰقِهِمْ أَغْلَٰلًا ﴾، ئێمە (أَغْلَال)مان خستۆتە گەردنەكانیانەوە، (أغْـلَال) كۆی (غُـلّ)ە، كە ئەو ئاڵقەو ئاسنەپانەیە، كە دەخرێتە گەردنی ئینسانەوەو ملی ڕێك ڕادەگرێ و سەری بەرز دەكاتەوە، ئەوانە پێوەندو كۆتمان خستوونە گەردنەكانیانەوە، ﴿ فَهِيَ إِلَى ٱلْأَذْقَانِ فَهُم مُّقْمَحُونَ ﴾، ئەو كۆت و پێوەندانە هەتا چەنەگەیان هاتوون، بۆیە سەریان بەرز كراوەتەوە، واتە: ئەوانە وەك كەسێك وان، كۆتێكی خرابێتە گەردنەوەو نەتوانێ سەر دانوێنێ، یان نەتوانێ مل بسووڕێنێ بەملاولادا.

﴿ وَجَعَلْنَا مِنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا فَأَغْشَيْنَٰهُمْ فَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ ﴾، هەروەها لە پێش دەستیانەوە، بەربەستێكمان داناوەو، لە دوایانەوە بەربەست و دیوارێكمان داناوەو، پەردەشمان بەسەر دەم وچاو هەڵكێشاون، بۆیە هیچ نابینن، واتە: ئەوانە وەك كەسێك وان، پێشەوەیان دیوارو بەربەست بێ و، دواوەیان دیوارو بەربەست بێ، هەر چواردەورەیان دیوارو بەربەست بێ، نەتوانن تەكان بخۆن، پاشان پەردەپۆشیش كرابن، شتێكیشیان بەسەرچاو هەڵكشابێ، كە هیچ نەبینن.

﴿ وَسَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ ءَأَنذَرۡتَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴾، بـۆ ئەوانیـش یەکسـانە، بیانترسێنی یـان نەیانترسێنی، هۆشـیاریان بکەیـەوە، یـان هۆشـیاریان نەکەیـەوە، هـەر بڕواناهێنـن، چونکـە ئەوانـە بـە لاساییکردنەوەی کوێرانـەی پێشـینانیان و، بەدەسـت و پێـی خـۆ بەسـتنیان بـە عـادەت و نەرێتـەکان و، بیرۆکـە پـووچ و دواکەوتـووەکان، عەقڵـی خۆیـان داخسـتوە، وەك کەسـێکن کـە پـەردە بەسـەرچاوی هەڵکشـابێ و بـواری نەبێ هیـچ سـەری بەمـلاولادا، بـادات، واتـە: ئـەو لاساییکردنەوەی کوێرانـەی پێشـینان و، ئەو دەسـت و پێی خۆبەسـتن و، عەقڵی خۆداخسـتن، بەهۆی شـوێنکەوتنی کوفرو شـیرك و بتەپەرستیی و ئەفسـانەو، ئـەو عـادەت و نەرێتـە نەفامییانـەوە، کـە بۆیـان بەجێـماون، وای لێکـردوون وەك کەسـێك بـن، کـە بـەو شـێوەیە بـێ، ئـەوە وێناکردنـی حاڵـی ئەوانـە لـە بەرانبـەر هیدایەتـی خـوادا.

نـەك خـوا ﷻ کۆتـی خسـتبێتە گەردنیـان و، دیـواری لـە پێـش دانابـن و، دیـواری لـە دوا دانابـن و، پەردەشـی بەسـەر چـاو هەڵکشـابن، بەڵکـو ئـەو تەعبیرانـە بۆیـە بەکارهێـنراون، واتـە: ئەوانـە وەك کەسـێك وان، کـە بـەو شـێوەیەی لێکرابـێ، وەك دوایـی لـە مەسـەلە گرنگەکانـدا زیاتـر تیشـکی دەخەینـە سـەر.

ئنجـا خـوا دەفەرمـوێ: بـۆ ئـەوان یەکسـانە هۆشـیاریان بکەیـەوە، یـان هۆشـیاریان نەکەیـەوە، بـڕوا ناهێنـن، وایـان کـردوە کـە ڕێـی هیدایـەت گرتنیـان، لـە خۆیـان گرتـوە.

﴿ إِنَّمَا تُنذِرُ مَنِ ٱتَّبَعَ ٱلذِّكۡرَ ﴾، بـە دڵنیاییـەوە، تـۆ تەنیـا ئـەو کەسـە هۆشـیار دەکەیـەوە کـە شـوێن زیکـر کەوتـوە، ﴿وَخَشِيَ ٱلرَّحۡمَٰنَ بِٱلۡغَيۡبِ ﴾، هەروەهـا سـام و هەیبەتـی بەرانبـەر خـوای بـە بەزەیـی هەبـێ، بـە پەنامەکیـی، واتـە: بەبـێ ئـەوەی کـە خـوا ببینـێ، یـان لـە حاڵێکـدا کـە خـۆی نادیـارەو لـە نێـو خەڵـك نیـە، یاخـود لـە حاڵێکـدا کـە سـزای خـوا نابینـێ، بـەڵام ئـەو تـرس و سـام و هەیبەتـی هەیـە، ئنجـا کەسـێك کـە بـەو شـێوەیە: ﴿فَبَشِّرۡهُ بِمَغۡفِرَةٖ وَأَجۡرٖ كَرِيمٍ ﴾، مـوژدەی پێبـدە، بـە لێبوردنێکـی تایبـەت و بـە پاداشـتێکی پـڕ ڕێـز و حورمـەت، بێگومـان کـە دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّمَا تُنذِرُ مَنِ ٱتَّبَعَ ٱلذِّكۡرَ ﴾، تـۆ تەنیـا کەسـێك هۆشـیار دەکەیـەوە، کـە تەنیـا

شـوێن زیکـر کەوتـوە، مەبەسـت لـە زیکـر قورئانـە، (ذکر)یـش واتـە: بیرخـەرەوە، چونکـە قورئـان بیرخـەرەوەی ڕاسـتییەکانە بـۆ مـرۆڤ، کـە دەفەرمـوێ: تەنیـا ئـەو کەسـە هۆشـیار دەکەیـەوە، واتـە: تەنیـا ئـەو کەسـە هۆشـیار دەکەیـەوە، هۆشـیار کردنەوەیـەك کـە بەهرەمەنـد بـێ لـە هۆشـیارکردنەوەکەو، سـوودی لـێ ببینـێ، کـە ئـەو دوو سـیفەتەی تێدابـن:

١- شوێن فەرمایشتی خوا بکەوێ، کە بیرخەرەوەیە، هەروەها (ذکر) دەگونجێ بڵێین: قورئان مایەی ناوبانگ و بەرزییە، لە دنیا و دوارۆژدا.

٢- ترس و سام و هەیبەتی بەرانبەر خوای بە بەزەیی هەبێ، بە پەنامەکیی، بێ ئەوەی خوا ببینێ، یان بێ ئەوەی خۆی ئامادەی نێو خەڵك بێ، لە کاتێکدا کە کەسی لێ نیە، ترس و سام و هەیبەتی بەرانبەر بە خوا هەبێ، یان لە حاڵێکدا کە پاداشت و سزای خوا نابینێ، تەماعی لە پاداشتەکەیدا هەیەو، ترسی لە سزایەکەی هەیە، ئنجا کەسێکی ئاوا، دڵی خۆشبکەو موژدەی پێبدە، بە لێبوردنێکی تایبەت و، بە پاداشتێکی پڕ ڕێز و حورمەت.

لـە کۆتایـی دا دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّا نَحۡنُ نُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ ﴾، بـە دڵنیایـی ئێمـە خۆمـان مـردووان دەژیێنینـەوە، زیندوویـان دەکەینـەوە، ﴿ وَنَكۡتُبُ مَا قَدَّمُواْ وَءَاثَٰرَهُمۡ ﴾، ئەوەی پێشـیان خسـتوە دەینووسـین، تۆمـاری دەکەیـن و هەڵیدەگریـن و دەیپارێزین، هەروەهـا شوێنەوارەکانیشـیان، مـرۆڤ هەتـا لـە ژیـان دایـە، کـردەوان پێـش دەخـات، کـردەوەی چـاك یـان خـراپ، هەروەهـا نیەتـی چـاك یـان خـراپ و قسـەی چـاك یـان خـراپ، چونکـە ئـەوەی کـە مـرۆڤ پێشـیدەخات، دەگونجـێ نیـەت و خولیـاو نیـاز و مەبەسـتەکان بـن و، دەگونجـێ قسـەو تەعبیرەکانـی بـن و، دەشـگونجێ کـردەوەو هەڵوێسـت و ڕەفتارەکانـی بـن، خـوا فەرموویـەتی: ئـەوەی پێشـیدەخەن، دەینووسـین و ئـەوەش کـە بـە جێشـیدەهێڵن لـە شـوێنەوارەکانیان، دیسـان ئـەوەی کـە بەجێـی دێڵـن، ئـەو شـتانەن کـە مـرۆڤ لـە دوای خـۆی لێـی بەجـێ دەمێنـن، چ لـە ڕووی فیکرییـەوە، چ لـەڕووی کردەییـەوە، لـە ڕووی فیکرییـەوە، ئەگەر قسـەیەکی هەقـی کـردوە، خەڵکێکـی پـەروەردە کـردوە، خەڵکێکـی فێـری ڕاسـتییەکانی ئایینـی

بەرنامەی خوا کردوە، وەك پێغەمبەری خاتەم ﷺ و سەرجەم پێغەمبەران، یان کتێبێکی نووسیوە، یان دەرس و وتاری هەبووەو، لە نێو خەڵکدا بەهرەی لێ وەردەگیرێ، یاخود شتێکی کردەیی بەجێهێشتوە، مزگەوتی دروستکردوە، ڕێیەکی چاك کردوە، خەستەخانەیەکی دروست کردوە، کارێکی خێری کردوە، ئەو شوێنەوارانەش دەنووسین، ﴿وَكُلَّ شَيْءٍ أَحْصَيْنَهُ فِي إِمَامٍ مُّبِينٍ﴾، ئێمە هەموو شتێکمان لە پێشەوایەکی ڕۆشن و ڕوونکەرەوەدا سەرژمێر کردوە، (إِحْصَاء) واتە: سەرژمێر، (عَدّ) یانی: ژماردن، بەڵام (إِحْصَاء) یانی: سەرژمێر، بۆیە خوا دەفەرموێ ﴿وَإِن تَعُدُّواْ نِعْمَةَ اللَّهِ لَا تُحْصُوهَآ ﴿١٨﴾﴾النَّحل، ئەگەر چاکەکانی خوا بژمێرن، بۆتان سەرژمێر ناکرێن، دەتوانن بیانژمێرن، یەك، دوو، سێ، چوار... هەتا چەند هەزار، چەند ملیۆن بڕوات، بەڵام ناتوانن سەرژمێریان بکەن، بزانن کۆی نیعمەتەکانی خوا چەندن؟ بەڵام لێرەدا دەفەرموێ: ﴿وَكُلَّ شَيْءٍ أَحْصَيْنَهُ فِي إِمَامٍ مُّبِينٍ﴾، ئێمە هەموو شتێکمان سەرژمێر کردوە، لە پێشەوایەکی ڕوونکەرەوەو ڕووندا، لە لیستێکداو، لە نووسراوێك دا کە زۆر ڕوونەو ڕوونکەرەوەشە، هەموو ڕاستییەکانی تێدا تۆمار کراون، کە ئەمە دەگونجێ جیسمێك بێ و مەخلووقێکی خوا بێ، (إِمَامٍ مُّبِينٍ)، کە بە (كِتَابٌ مُبِين)یش تەعبیر کراوە، بە (لَوْحٍ مَحْفُوظ)یش تەعبیر کراوە، دەگونجێ تەختەیەك نووسراوێکی خوا بێ، خوا هەموو زانیارییەکانی خۆی و زاندراوەکانی خۆی، لەوێدا تۆمار کردبێ، دەشگونجێ ئەمە تەعبیرێکی مەجازیی بێ، بۆ زانیاریی بێ سنووری خوا، ئنجا ئایا بۆچی خوا ﷻ (كِتَابٌ) و (إِمَامٍ) و (لَوْحٍ)ی بەکارهێناون؟! لەبەر ئەوەی ئێمە عادەتمان وایە، شتێك کە نووسیبمان لە کتێبێکدا، لە لیستێکدا، لە لەوحێکدا، لێمان تێك ناچێ و، کەم و زیادیش ناکات، چونکە ئێمە لەوە حاڵیی دەبین، خوای پەروەردگار ئەو تەعبیرو وشانەی بەکارهێناون بۆ زانیاریی خۆی، واتە: خواش زانیاریی و زاندراوەکانی کەم و زیاد ناکەن و، هیچ شتێکی لێ تێکناچێ، وەك لە شوێنی دیکە دەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا ﴿٦٤﴾﴾مریم، واتە: پەروەردگارت لە بیرچووی هیچ شتێك نیە، هیچ شتێکی لە بیرناچێ.

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

**پێناسەی قورئان بە پڕ حیکمەتیی و، دڵنیاکردنەوەی موحەممەد ﷺ کە لە رەوانەکراوانی خوایەو، لەسەر ڕێیەکی ڕاستەو، نێردراوە تاکو کۆمەڵێك هۆشیار بکاتەوەو بترسێنێ، کە پێشووەکانیان وریا نەکراونەوەو، بڕیاری سزاش لەسەر زۆربەیان چەسپاوە، چونکە بڕواناهێنن:**

خوا دەفەرمویٚ: ﴿ يسٓ ﴿١﴾ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡحَكِيمِ ﴿٢﴾ إِنَّكَ لَمِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿٣﴾ عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٤﴾ تَنزِيلَ ٱلۡعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٥﴾ لِتُنذِرَ قَوۡمٗا مَّآ أُنذِرَ ءَابَآؤُهُمۡ فَهُمۡ غَٰفِلُونَ ﴿٦﴾ لَقَدۡ حَقَّ ٱلۡقَوۡلُ عَلَىٰٓ أَكۡثَرِهِمۡ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٧﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە (١٠) بڕگەدا:

١)- ﴿ يسٓ ﴾، (ي) و (س)، ئەمانە دوو پیتن، وەك پێشتریش گوتوومانەو، لە مانا گشتییەکەشدا تیشکێکی تاکو ڕاددەیەك باشمان خستەسەر ئەو پیتە پچڕ پچڕانە، کە پیتەکانی زمانی عەرەبیی کە هەموویان بیست و هەشت (٢٨)ن، نیوەیان کە چواردە (١٤)ن، هاتوون، ئەو چواردەیەش نیوەی هەموو جۆرە پیتەکانیان تێدان، کە لە نۆ پیتی سەرەتای ئەو پیتانە، تەنیا دوو پیتیان وەرگیراون، کە (أ) (ح)ن و، حەوتیان وەرنەگیراون، هەروەها لە نۆ پیتی کۆتایی، حەوتیان وەرگیراون و، تەنیا دووانیان تەرك کراون و، لە دە پیتی نێوەڕاست، کە پێنجیان خاڵدارن نوختەیان هەیەو، پێنجیان بێ خاڵن، تەنیا بێ خاڵەکان وەرگیراون، هیچ کام لە خاڵدارەکان وەرنەگیراون، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ، کە خوا ﷻ وەك شایستەی خۆیەتی، ئەوپەڕی وردەکاریی و لێزانیی، پڕ نهێنیی، لە فەرمایشتی خۆیدا بەکارهێناوە.

٢)- ﴿ وَٱلْقُرْءَانِ ٱلْحَكِيمِ ﴾، سوێند بە قورئانی حەکیم، (و)ی (وَٱلْقُرْءَانِ) بۆ سوێندە، سوێند بە قورئانی حەکیم، چونکە (و)و (ت)و (ب)، (وَالله) (بِالله) (تَالله)، هەرسێکیان پیتی سوێند خواردنن، وشە (ٱلْحَكِيمِ)یش کراوە بە ئاوەڵناو، (وصف) بۆ قورئان، مانای (حکیم) لێرەدا سێ ئەگەری هەن:

١- دەگونجێ مەبەست لە (ٱلْحَكِيمِ): (المُحكَم) بێ، واتە: قورئانە زۆر موحکەمە، (مُحكَم)یش یانی: قایم و پتەوو بێ کەلێن و درز.

٢- یاخود (ٱلْحَكِيمِ) یانی: (ذي الحكمة): خاوەن حیکمەت، پڕ حیکمەت.

٣- دەشگونجێ هەر بە مانای کارزان و، قسە لەجێ بێ، کە لێرەدا قورئان وەك کائینێکی زیندووی خاوەن هەست و ویست، تەماشا کراوەو حەکیمیش کراوە بە ئاوەڵناوی.

قورئـان زانایـان بـە زۆر شـێوە پێناسـەیان کـردوە، کـە ئەمـەش یەکێکـە لـە پێناسـەکان، دەڵـێ:

(القُرْآنُ عَلَمٌ بِالغَلَبَةِ عَلَى الكِتَابِ الذي أُوحِي بِهِ إلى مُحَمَّد، مِنْ وَقْتِ بَعثَتِهِ إلى وَفَاتِهِ، للإعْجَاز وَالتَّشْرِيع)[1].

ئەم پێناسەیەم زۆر پێ جوانە..

قورئـان ناوێکـی عەلەمـە {ناوێکـی ناسـێنەرە وەك زاڵبـوون بـۆ ئـەو کتێبـەی سروشکراوە بـۆ لای موحەممـەد، {قورئـان یانـی: خوێنـدراوە (مقروء) یـان خوێندنـەوە (قراءة) ﴿ فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ ﴿١٨﴾ ﴾القیامة، کەواتـە: قورئـان هـەم بە مانـای خوێندراوە دێ، هـەم بـە مانـای خوێندنـەوەش دێ} لـە کاتـی ڕەوانەکرانیـەوە تاکـو کاتـی کۆچـی دوایـی، بـە مەبەسـتی ئـەوە کـە هـەم موعجیـزەو بەڵگـەی دەستەوسانکەر بـێ {بـۆ نەیارەکانـی موحەممـەد ﷺ و نەیارەکانـی قورئـان} هـەم بەرنامـەش بـێ {بـۆ ئـەو ئۆممەتـە، ئـەو کۆمەڵـەی شـوێن قورئـان دەکـەون و بـڕوای پـێ دێنـن}.

---

(١) التحرير والتنوير: ج٢٢، ص٣٤٥.

ئنجا دوای ئەوەی خوا سوێندی خوارد بە قورئانی حەکیم، دەفەرموێ:

٣)- ﴿ إِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾، بە دڵنیایی تۆ لە ڕەوانەکراوانی، ئەمە وەڵامی سوێندەکەیە، (جَوَابُ القَسَم)، دەشگونجێ بگوترێ: (مُقْسَم عَلَيْهِ)، سوێند لەسەر خوراو، ئنجا (إنَّ) بۆ جەختکردنەوەیەو (ل)یش دیسان بۆ جەختکردنەوەیەو، دەتوانین بڵێین: لەم ڕستەیەدا سێ جۆرە جەختکردنەوە هەن:

١- خوا سوێندی خواردوە: ﴿ وَٱلْقُرْءَانِ ٱلْحَكِيمِ ﴾، سوێند بە قورئانی حەکیم.

٢- پیتی تەئکید کە (إنَّ)یە.

٣- (ل)ی (لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ): ﴿ إِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾، کە دیسان بۆ جەختکردنەوەیە.

ئەمانـە هەرسـێکیان جەختکـەرەوەو داکۆکییـەرن لەسـەر ئـەوەی، دێ، کـە بریتیـە لـەوەی موحەممـەد ﷺ لـە ڕەوانەکراوانـی خوایـە، ئەمە بێگومـان لەبەرڕاهاویشـتنەو، بـە کنـارە قسـەکردنە لەگـەڵ هاوبـەش بۆ خوا دانـەرەکان دا، کـە پەیامـی پێغەمبەریان ﷺ بـە ناڕاسـت دادەنـاو، جۆرێکیشـە لـە دڵدانـەوەی پێغەمبـەر ﷺ، کـە دڵنیابـە تـۆ بـەو شـێوەیەی، چونکـە مـرۆڤ مرۆڤـەو، هەرچـۆن بـێ، کـە هێنـدە هـەر خەڵـك بـە درۆیـان دانـاو، بـێ بڕوابـوون و کەللـەڕەق بـوون، دوور نیـە مـرۆڤ جۆرێـك لـە دوو دڵیـی بەرانبـەر بـە خـۆی، یـان نیگەرانیـی بـۆ پەیدابـێ، ئـەوە بـۆ دڵنیاکردنـەوەی پێغەمبـەرە ﷺ.

٤)- ﴿ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾، لەسەر ڕێیەکی ڕێك و ڕاست، (عَلَى: لِلإِسْتِعْلَاء الْمَجَازِيّ)، مەبەست پێی چەسپاوییە، یانی: تۆ لەسەر ئەو ڕێیە ڕاستە، لەسەر ئەو ڕاستە شەقامە، زۆر چەسپاوی و نەلەخشاوی، ڕێی ڕاست، ﴿ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾یش ئەو ڕێیەیە کە مرۆڤ بە ئامانج دەگەیەنێ، چونکە ئینسان لە ڕێگای ڕاستەوە دەگاتە ئامانج و، لە ڕێی لارو چەوت و پێچاو پێچەوە، لە ئامانج دوور دەکەوێتەوە.

٥)- ﴿ تَنزِيلَ ٱلْعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ ﴾، دابەزێنراوی خوایەکی زاڵی میهرەبانە، بەخشندەیە، وشەی: ( تَنزِيلَ) ئەگەر بەسەر (فتحة) بخوێنرێتەوە: (تنزيلَ)، واتە: لە حاڵێکدا کە ئەم قورئانە دابەزێنراوی خوایەکی زاڵی میهرەبانە، ئەگەر بە بۆر (ضمة)یش بخوێنرێتەوە، کە ئەو خوێندنەوەیەش هاتوە: (تَنْزِيلُ العَزِيزُ الرَّحِيْمِ) یانی: ئەم قورئانە دابەزێندراوە لە لایەن خوایەکی زۆر زاڵی خاوەن ئەوپەڕی بەزەییەوە.

وشـەی (عِـزّة) بریتیـە لـە حاڵەتێـك كـە مـرۆڤ ئەگـەر هەیبـوو، دوژمنەكانـی، پێـی ناوێـرن، (رَحْمَة)یـش بریتیـە لـە بەهرەمەندكـردنی خەڵـك لـە چاكـەو بەخشـش، ئنجـا بێگومـان خـوا لـە قـەدەر خـۆی و، مرۆڤیـش لـە قـەدەر خـۆی.

ئایا قورئان بۆچی دابەزێنراوەو، ئامانج لە دابەزێنرانی ئەم قورئانە چییە؟

٦)- ﴿ لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّآ أُنذِرَ ءَابَآؤُهُمْ فَهُمْ غَٰفِلُونَ ﴾، بۆ ئەوەی كۆمەڵێك وریاو هۆشیار بكەیەوە، كە باب و باپیرانیان هۆشیار نەكراونەوە، (الإِنْذَارُ: إِعْلَامٌ مَعَ تَخْوِيْفٍ) (إنذار) ئاگاداركردنەوەیە لەگەڵ ترساندن دا، كە دەفەرموێ: (لِتُنذِرَ) ئەمە (ل)ی (تَعْلِيل)ە، یانی: هۆكاری دابەزینی قورئان ئەوە بووە، كە تۆ كۆمەڵێك، خەڵكێك بترسێنی و هۆشیار بكەیەوە، كە باب و باپیرانیان هۆشیار نەكراونەوەو نەترسێنراون.

ئەم (ما)یە (ما أُنْذِرَ آبَاؤُهُم) وەك گوتمان:

أ- دەگونجێ (ما)ی لابەرە (نافية) بێ، یانی: باب و باپیرانیان ئاگادار نەكراونەوە،

بەڵام لە ڕووی زمانی عەرەبییەوە، دوو مانای دیكەشی هەن:

ب- دەشگونجێ ئەو (ما)یە (موصولة)ە بێ، یانی: (قَوْماً الَّذِينَ أُنذِرَ آباؤهُم)، كۆمەڵێك كە باب و باپیرانیشیان ئاگادار كراونەوە.

ج- هەروەها لێرەدا (ما) دەگونجێ (مصدرية) چاوگیی بێ، یانی: خەڵكێ وشیار بكەیەوە، هەمان هۆشیار كردنەوە، كە باب و باپیرانیان پێی وشیار كراونەوە.

بەڵام لە ڕووی سیاق و گونجان لەگەڵ ئێرەدا، هەر یەکەمیان ڕاستە، جاری دیکەش باسم کردوە کە بە داخەوە هەندێك لە توێژەرانی قورئان، تەماشایان کردوە، مادام چەند مانایەك لە ڕووی ڕێزمانی عەرەبییەوە ڕاست بن، ئەو نەگەرانەیان هەموویان هێناوە، بەڵام کە سەرنج بدەیە ئایەتەکە، یەکێکیان دەگونجێ، بەڵێ لە ڕووی ڕێزمانییەوە ئەوانی دیکەش، گونجاون، بەڵام لە ڕووی واتای قورئان و سیاقەکەوە، تەنیا یەکەمیان گونجاوە، بۆچی؟

چونکە ئەو ڕاستییە کە باب و باپیران و پێشینانی کافرانی کۆمەڵگایەك، کە پێغەمبەری خاتەم ﷺ لە نێویاندا ڕەوانەکراوە، لە شوێنی دیکەش لە قورئاندا هاتوە، کە نەترسێندراون و هۆشیار نەکراونەوە، ئاگادارکەرەوەو وشیار کەرەوەیان بۆ نەهاتوە، ئنجا کە لێرەش دەفەرموێ: ﴿ فَهُمۡ غَٰفِلُونَ ﴾ بۆیە ئەوان بێ ئاگان، چونکە باب و باپیرانیان هۆشیار نەکراونەوە، ئەمە بێگومان بەڵگەی ڕاستیی ڕای یەکەمە، کە (ما): لابەرە (نافیة)یە: ﴿ لِتُنذِرَ قَوۡمٗا مَّآ أُنذِرَ ءَابَآؤُهُمۡ ﴾، کۆمەڵێك بترسێنی و هۆشیار بکەیەوە، کە باب و باپیرانیان هۆشیار نەکراونەوە، بۆیە بێ ئاگان، ئەگەرنا ئەگەر (ما) (موصولة) بێ، ئەو خەڵکەی باب و باپیرانیان ئاگادار کراونەوە، ئەدی ﴿ فَهُمۡ غَٰفِلُونَ ﴾، چی لێدەکەی، ئەگەر ئاگادارکراونەوە، بۆچی بێئاگان؟ دیسان ئەگەر (ما) (مصدرية)یش بێ، بە هەمان شێوە.

کەواتە: هەر ئەگەر ئینسان پەلە نەکات و، تەماشای سیاقەکە هەمووی بکات، زۆرجار واتایەکەی زیاتر بۆ دەردەکەوێ، ئێستا ئەم ﴿ فَهُمۡ غَٰفِلُونَ ﴾، دەرخەری ئەوەیە کە (مَا) لە ڕستەی یەکەمدا، لابەرە (نافية)یە، یانی باب و باپیرانیان نەترسێنراون و ئاگادارنەکراونەوە، ئنجا ئەمە لە دوو شوێنی دیکەی قورئانیش دا هاتوە، کە من ئێستا لە یادمن:

یەکەمیان: لە سوورەتی (السجدة)دا هاتوە، کە دەفەرموێ: ﴿ لِتُنذِرَ قَوۡمٗا مَّآ أَتَىٰهُم مِّن نَّذِيرٖ مِّن قَبۡلِكَ لَعَلَّهُمۡ يَهۡتَدُونَ ۝٣ ﴾، واتە: تاکو کۆمەڵێك، بترسێنی و هۆشیار بکەیەوە، کە لە پێش تۆدا، هیچ وشیارکەرەوەو ترسێنەریان بۆ نەهاتوە، بەڵکو ڕێی ڕاست بگرن.

دووەمیان: لە سوورەتی (القصص)دا هەمان تەعبیر هاتوە، بە تۆزێك جیاوازییەوە: ﴿لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّآ أَتَىٰهُم مِّن نَّذِيرٍ مِّن قَبْلِكَ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٤٦﴾﴾ القصص: ٤٦، تاكو كۆمەڵێك بترسێنی و وریا بكەیەوە، كە هیچ وریاكەرەوەیەكیان پێش تۆ بۆ نەهاتوە، بەڵكو پەند وەربگرن.

كەواتـە: ئـەوەی كـە لە دوو سـوورەتی (السَّجدَة) و (القَصَص)دا هاتوە، پشتڕاسـتی ئـەوە دەكاتـەوە، كـە لێـرەدا مەبەسـت لـەوە كـە دەفەرمـوێ: ﴿مَّآ أُنذِرَ ءَابَآؤُهُمْ﴾، بـاب و باپیرانیـان، پێشـینانیان وریـا نەكراونـەوەو نەترسـێنراون، ئەوەتـا لـەو دوو سـوورەتەی دیكـەش دا بـە هەمـان شـێوە دەفەرمـوێ: ﴿مَّآ أَتَىٰهُم مِّن نَّذِيرٍ مِّن قَبْلِكَ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ﴾.

٧)- ﴿لَقَدْ حَقَّ ٱلْقَوْلُ عَلَىٰٓ أَكْثَرِهِمْ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ﴾، بە دڵنیایی قسە لەسەر زۆربەیان چەسپاوە، بۆیە بڕوا ناهێنن. (حَقَّ: أي ثَبَتَ وَوَقَعَ، فَلَا يَقْبَلُ نَقضاً)، چەسپاوەو هاتۆتە دی و، هەڵوەشانەوە هەڵناگرێ، لەسەر زۆربەیان قسە چەسپاوە، بۆیە بڕوا ناهێنن.

لێـرەدا وشـەی (ٱلْقَوْلُ) چاوگـەو مەبەسـت پێـی ئەوەیـە كە خـوا ﷻ ویسـتوویەتی، یـانی: وەك دەگوتـرێ: قسـەی دەروونیە، یاخـود: ئەوەیە كە خـوا ﷻ بـۆ پێغەمبەرانی ﷺ سروشـكردوە، زۆربـەی زانایـان هـەر وایـان لێكداوەتـەوە دەڵێـن: ئـەوە كـە خـوا لـە سـوورەتی (هـود)دا دەفەرمـوێ: ﴿لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿١١٩﴾﴾، هەروەهـا لـە سـوورەتی (السَّجدَة) - ١٣- شـدا بـە هەمـان شـێوە هاتـوە، مەبەسـت ئەوەیـە: كـە خـوا بڕیـاری داوە دۆزەخ پڕبـكات لـە جنـد و مـرۆڤ، بۆیـە دەبـێ زۆربەیـان بڕوانەهێنـن تاكـو دۆزەخ پـڕ بـێ! بـەڵام بەولێكدانەوەیـە جۆرێـك لـە جەبـر ڕوودەدا، ئایەتەكـەش وا نافەرمـوێ، بەڵكـو یـانی: ئـەو فەرمایشـتەی خـوا كـە بەسـەر ئەوانـدا چەسـپاوە، ئەوەیـە كـە هەركەسـێك بڕوانەهێنـێ، سـزا دەدرێ، هـەر كەسـێك هیدایەتـی خـوا ڕەفـز بـكات، سـزا دەدرێ، ئەوەیـە ئـەو بڕیـارەی خـواو ئـەو بڕیارەیان بەسـەردا چەسـپیوە، كـە ئەوانـە بـڕوا ناهێنـن، بۆیـە سـزا دەدرێـن، نـەك خـوا بڕیـاری

داوە ئیمان نەهێنن، تاکو سزا بدرێن، چونکە ئەوە جەبرە، نا، بڕیارەکەی خوا ئەوەیە: هەر کەسێك هیدایەتی خوا وەرنەگرێ و قبووڵ نەکات، سزا دەدرێ، ئەوە بڕیاری خوایە، ئەو بڕیارەیان بەسەردا چەسپیوە، واتە: سزا دەدرێن، نەك بڕیارەکەی خوا ئەوە بێ، کە دۆزەخ پڕ بکات، ئنجا بۆیە دەبێ، ئەوەندەی دۆزەخ پڕ دەبێ لە جند و مرۆڤ، بڕوا نەهێنن، تاکو فەرمایشتی خوا بێتە دی، کە دەبێ دۆزەخ پڕ بێ، نا، بەڵێ، خوا فەرموویەتی: دۆزەخ پڕ دەکەم، کە ئەمەش هەڕەشەیە لە مرۆڤ و جند، بەڵام ئەو بڕیارەی خوا کە چەسپاوەو لێرەدا هاتوەو لە شوێنی دیکەشدا هاتوە، ئەوەیە کە خوا دەفەرموێ: هەرکەس بڕوا نەهێنێ و هیدایەتی خوا ڕەفز بکات، سزای دەدەم، ئەو بڕیارەیان بەسەردا چەسپیوەو بە تەئکید ئەوانە سزا دەدرێن.

کەواتە: بڕیار بەسەر زۆربەیاندا چەسپیوە، ئەو بڕیارەی خوا کە: هەر کەسێك ئیمان نەهێنێ، خوا سزای دەدات، ئەوانەش بڕواناهێنن، بۆیە ئەو بڕیارەیان بەسەردا چەسپاوە، لە سوورەتی (النّحل) ئایەتی (١٠٤)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ لَا يَهۡدِيهِمُ ٱللَّهُ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾، واتە: بەدڵنیایی ئەوانەی بڕوا بە ئایەتەکانی خوا ناهێنن، خوا ڕێنماییان ناکات و ئازارێکی بە ئێشیان هەیە.

یانی: لەبەرئەوەی بڕوا ناهێنن، خوا دڵیان وەرناچەرخێنێ، کەواتە: پێشێ لەوانەوە هەڵوێستی نەرێنیی هەیەو، ئەوەی خوا ﷻ لەگەڵیاندا دەکات، دەرهاویشتەی هەڵوێست و کرداری خۆیانە.

لەو بارەوە کە ئایا مەبەست لەوانەی پێغەمبەر ﷺ هاتوە تاکو وریایان بکاتەوە، لەبەر ئەوەی کە باب و باپیرانیان وریا نەکراونەوە، کێن؟ چەند ڕایەك هەن، لە نێو توێژەرانی قورئان دا:

أ/ هەندێکیان گوتوویانە: عەرەبە عەدنانییەکان، (العرب المُستَعرَبَة)ن.

ب/ هەندێکیان گوتوویانە: هەموو عەرەبەکانن، عەرەبی عەدنانیی و قەحطانیی.

ج/ هەندێکیش گوتوویانە: نا مەبەست پێی خەڵکی مەککەو دەوروبەریەتی.

د/ بەڵام من پێم وایە، مەبەست پێی تێکڕای خەڵکە، هەرچەندە لە تەفسیرەکاندا ئەو ڕایەم نەبینیوە: ﴿ لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّآ أُنذِرَ ءَابَآؤُهُمْ ﴾ تاکو کۆمەڵێك بترسێنی کە باب و باپیرانیان وریانەکراونەوە، ئەوە بەس گەلی عەرەب نەبوون، کە پێش موحەممەد ﷺ پێغەمبەریان بۆ نەهاتوە، بەڵکو کوردیش وابوو، فاریسش وابوو، تورکیش وابوو، گەلانی دیکەش وابوون، قەومیش واتە: کۆمەڵە خەڵکێك، کەواتە: لە ڕاستییدا، ئەوەی کە پێغەمبەری خاتەم ﷺ هاتوە، وشیاریان بکاتەوەو، بیانترسێنێ، بەڵێ سەرەتا خەڵکی عەرەب بوون، بەڵام دوایی سەرجەم خەڵکەکانی دیکەش بوون، چونکە ئەگەر مەسەلە ئەوە بێ، کە پێش موحەممەد ﷺ ترسێنەر و وریارکەرەوەیان بۆ نەهاتوە، ئەوە بەس بۆ عەرەب وانەبووە، بەڵکو بۆ کوردیش و بۆ فارسیش و بۆ تورك و ئەفغان، گەلانی دیکەش پێش موحەممەد ﷺ بە نیزیکیی، هەروابووە، ئەگەرنا لە ڕابردوودی دووردا، هەموویان پێغەمبەریان بۆ هاتوون: ﴿ وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ ﴿٢٤﴾ ﴾فاطر، بەڵام لە ڕابردووی نیزیکیاندا، پێش موحەممەد ﷺ، پێغەمبەرێك بۆ هیچ کام لەو گەلانە، نەهاتوە، چونکە زۆرترین ماوە لە نێوان دوو پێغەمبەراندا بووبێ، ئەو ماوەیەیە کە دەکەوێتە نێوان موحەممەدو عیساوە (عَلَيْهِما الصَّلاةُ وَالسَّلَامُ)، کە ئەگەر عیسا لە (١)ی زایینیی لە دایك بووبێ و، موحەممەد ﷺ لە (٥٧١) زایینیی لە دایك بووە، واتە: لە نێوان لە دایك بوونی عیساو لە دایك بوونی موحەممەد دا: (٥٧٠) ساڵ هەیە، کە دیارە پێغەمبەر ﷺ دوای (٤٠) ساڵ کراوەتە پێغەمبەر، واتە: لە ساڵی (٦١٠) زایینیی دا، مانای وایە لە نێوان لە دایك بوونی عیساو، کرانە پێغەمبەری موحەممەد دا ﷺ (٦١٠) ساڵ هەیە، ماوەیەکی زۆرە، زۆرترین ماوەیەو لەو ماوەیەدا هیچ پێغەمبەرێك نەهاتوە، بۆ هیچ کام لە گەلان، بە پێی ئەوە کە لە مێژوودا باسکراوەو، قورئانیش ئاماژەی پێ دەکات.

**مەسەلەی دووەم:**

**وێناکردنی ئەوانەی بڕوا ناهێنن، لە شێوەی کەسانێکدا کە کۆتیان خراوەتە گەردنەوە، هەتا چەناگەیان و، سەریان هەڵبڕاوەو، بەربەستیان لە پێشەوەو لە دواوە هەیەو، ڕووشیان داپۆشراوە، پەردە بەسەر دەم و چاویان دادراوە، بۆیە توانای جووڵەو دیتنیان نیەو، وریاکردنەوەشیان بێ سوودە، بەڵام کەسێك شوێن قورئان بکەوێ و ترس و سامی خوای هەبێ، لە هۆشیارکرانەوە بەهرەمەند دەبێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا جَعَلْنَا فِيٓ أَعْنَٰقِهِمْ أَغْلَٰلًا فَهِىَ إِلَى ٱلْأَذْقَانِ فَهُم مُّقْمَحُونَ ﴿٨﴾ وَجَعَلْنَا مِنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا فَأَغْشَيْنَٰهُمْ فَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ ﴿٩﴾ وَسَوَآءٌ عَلَيْهِمْ ءَأَنذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنذِرْهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠﴾ إِنَّمَا تُنذِرُ مَنِ ٱتَّبَعَ ٱلذِّكْرَ وَخَشِىَ ٱلرَّحْمَٰنَ بِٱلْغَيْبِ فَبَشِّرْهُ بِمَغْفِرَةٍ وَأَجْرٍ كَرِيمٍ ﴿١١﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:**

١)- ﴿ إِنَّا جَعَلْنَا فِيٓ أَعْنَٰقِهِمْ أَغْلَٰلًا ﴾، ئێمە کۆتەکانمان خستوونە گەردنیانەوە، (**أغْلَال**) کۆی (**غُلّ**)ە، واتە: کۆت، پێوەند، کە مرۆڤ وا لێ دەکات نەتوانێ سەربادات، یان سەردانەوێنێ، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا جَعَلْنَا فِيٓ أَعْنَٰقِهِمْ أَغْلَٰلًا ﴾، (**الجَعْلُ تكْوِين شَيْء**) (**جعل**) پێکهێنانی شتێکە، (**غُلّ**) بریتیە لە ئاڵقەیەکی پان لە ئاسن، یان چەرم وەك گەردنبەندێك و ڕێشمەیەك دەخرێتە ملەوەو، دەوری گەردن دەدات و، وای لێ دەکات بەرزو نزم و ئەملاولا نەکات و ڕێك بوەستێ.

٢)- ﴿ فَهِىَ إِلَى ٱلْأَذْقَانِ فَهُم مُّقْمَحُونَ ﴾، ئنجا ئەو کۆتانە کە خراونە گەردنیانەوە، هەتا چەناگەکانەو ئەوان سەرهەڵبڕاون، (**أذقان**) کۆی (**ذَقَن**) یاخود (**ذِقْن**)ە، کە بە کوردیی دەڵێین: چەناگە.

﴿ فَهُم مُّقۡمَحُونَ ﴾، لە ئەنجامی ئەوەدا کە ئەو کۆتانەیان خراونە گەردنەوە، سەریان بەرز کراوەتەوە، سەریان هەڵبڕاوە، (مُقْمَحُون: جمع مقمح اسْمُ مَفْعُولٍ أي: المَجْعُولِ قَامِحَاً، أي: رَافِعَاً رَأْسَهُ نَاظِراً إلى فَوْق)، (قَمَحَ) یانی: (رَفَعَ رَأْسَهُ)، سەری بەرز کردەوە، (مُقْمَحُون)یش کۆی (مُقْمَح)ە، کەسێکە سەری بەرز کرابێتەوەو نەتوانێ تەماشای خوارەوە بکات.

٣)- ﴿ وَجَعَلۡنَا مِنۢ بَيۡنِ أَيۡدِيهِمۡ سَدّٗا ﴾، لە پێش دەستیانەوە بەربەستێکمان داناوە.

٤)- ﴿ وَمِنۡ خَلۡفِهِمۡ سَدّٗا ﴾، لە دواشیانەوە بەربەستێکمان داناوە، وشەی (سَدّ) خوێنراویشتەوە: (سُدّ) هەردووکیان واتە: دیوار، پەردە، نێوان، بەربەست.

٥)- ﴿ فَأَغۡشَيۡنَٰهُمۡ فَهُمۡ لَا يُبۡصِرُونَ ﴾، ئنجا پەردەشمان بەسەر چاو هەڵکێشاون، بۆیە نابینن، ئەوەی پێشێ فەرمووی: کۆتیان لە گەردن کراون، تاکو چەناگەکانیان هاتوون و سەریان بەرز کراوەتەوە، ئنجا ئەمەش تۆخکردنەوەی وێچواندنی ئەوانە، لە قبووڵ نەکردنی هیدایەتی خوادا، بە کەسێك، کە وێرای ئەوەی کۆتی لە گەردن کراوەو، دیوارێکی لە پێش دانراوەو دیوارێکیشی لە دواوە، دانراوەو، پەردەیەکیشی بەسەر چاو هەڵکشاوە، کەواتە: نە دەتوانێ بجووڵێ، بچێتە پێش و بچێتە دوا، نەدەشتوانێ ببینێ.

٦)- ﴿ وَسَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ ءَأَنذَرۡتَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴾، یەکسانیشە بۆ ئەوان، وریایان بکەیەوە، یان وریایان نەکەیەوە، بیانترسێنی، یان نەیانترسێنی، هەر بڕوا ناهێنن، یانی: ئاگادارکردنەوەو ترساندنت و، ئاگادار نەکردنەوەو نەترساندت بۆ ئەوان، وەك یەکە.

کە دەفەرموێ: ﴿ فَأَغۡشَيۡنَٰهُمۡ ﴾، (الغِشَاءُ: وَهُوَ مَا يُغَطِّي شَيْئاً، أي: أَغْشَيْنَا أَبْصَارَهُم)، (غِشَاء)، پۆشەرێکە شتێك دابپۆشێ و بەسەر شتێك دا بدرێ، یانی: چاوەکانیانمان داپۆشیون.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَسَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ ءَأَنذَرۡتَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ ﴾، ئەم شێوە پرسیارکردنە، بۆ یەکسانکردنە، بیانترسێنی یان نەیان ترسێنی، وشیاریان بکەیەوە یان وشیاریان نەکەیەوە، ئەمە لێرەدا بۆ یەکسانکردنە نەك بۆ پرسیارکردن، یاخود بۆ

سەرسوڕماندن، یاخود بۆ نکوولّییلێکردن، کە ئێمە دواتر لە خستنەڕووی چەند سەرنجێك دا، زیاتر تیشك دەخەینە سەر چەمك و واتای ئەو ئایەتانە، بەڵام زانایان گوتوویانە: بۆ لێکدانەوەی ئەم ئایەتانە، دوو واتا هەن:

١- حاڵی ئەو کافرانە، چوێنراوە لە بڕوا نەهێناندا، بە حاڵی کەسانێکەوە، کە کۆتیان خراوەتە گەردن و ناتوانن مل بجووڵێنن، پاشان دیوارێکیان لە بەردەم دا داندراوەو دیوارێك لە پشتیان و، پەردەشیان بەسەر چاو هەڵکشاوە، واتە: لە قبووڵ نەکردنی هیدایەتی خوادا، ئەوانە حاڵیان وەك حاڵی کەسێکی ئاوایە.

٢- مەبەست ئەوەیە، ئەوانە لە ڕۆژی دواییدا وایان لێدەکرێ، واتە: لە ڕۆژی دواییدا کۆتیان دەخرێتە گەردن و، دیواریان لە پێش دەبێ و، دیواریان لە دوا دەبێ، پەردەیان بەسەر چاو هەڵدەکشێ، وەك خوا ﷻ لە سووڕەتی (غافر)دا دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِٱلْكِتَـٰبِ وَبِمَآ أَرْسَلْنَا بِهِۦ رُسُلَنَا ۖ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٧٠﴾ إِذِ ٱلْأَغْلَـٰلُ فِىٓ أَعْنَـٰقِهِمْ وَٱلسَّلَـٰسِلُ يُسْحَبُونَ ﴿٧١﴾ فِى ٱلْحَمِيمِ ثُمَّ فِى ٱلنَّارِ يُسْجَرُونَ ﴿٧٢﴾﴾، واتە: ئەوانەی بڕوایان بە کتێب نەهێناوە، (کۆی کتێبەکانی خوا)و، بەوەی کە پێغەمبەرانمان پێ ڕەوانە کردوون، لەمەودوا دەزانن، کاتێك کە کۆتەکان دەخرێنە گەردنیانەوە، هەروەها زنجیرەکان، (زنجیرەکانیش دەخرێتە دەست و پێیانەوە)و، بە نێو ئاوی داغ و کوڵیودا ڕادەکێشرێن، دوایی لە نێو بڵێسەی ئاگردا، ئاگر دەدرێن (ئاگری بڵێسەداریان دەدرێتە بەرێ).

کە بە تەئکید ئەمە مەبەست پێی ڕۆژی دواییە.

بەڵام ئەوەی سووڕەتی (یس)، هەرچەندە دەگونجێ مەبەست پێی ڕۆژی دواییش بێ، بەڵام بە پێی سەلیقەو سیاق، ئەگەر لە ئایەتەکانەوە ڕامێنین، دەزانین مەبەست پێی دنیایە، ئنجا کە مەبەستیش پێی دنیایە، بە مەجاز ئەو تەعبیرە بەکارهاتوە، یانی: ئەوانە حاڵیان وەك حاڵی کەسێك وایە کە بەو شێوەیە بێت، نەك بە کردار کۆتیان خرابێتە گەردن و، دیوارو بەربەستیان لە پێش و لە بەردەم دا داندرابێ و، پەردەیان بەسەرچاو هەڵکشا بێ.

﴿لَا يُؤْمِنُونَ﴾، ئـەم ڕستەیە ڕوونکـەرەوەی ڕسـتەی پێشـێیە، کـە دەفەرمـوێ: ﴿وَسَوَآءٌ عَلَيْهِمْ ءَأَنذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنذِرْهُمْ﴾، یەکسـانە بـۆ ئـەوان وریایـان بکەیـەوە، یـان وریایـان نەکەیـەوە، (لَا يُؤْمِنُونَ ) چونکـە کـە بڕوایـان نەهێنـا، مانـای وایـە ئـاگادار کردنـەوەو ئـاگادار نەکردنەوەیـان وەك یەکـە، ترسـاندن و نەترسـاندنیان هـەر وەك یەکـە، ئنجـا ئایـا مـادام هـەردووك لایەکسـانن، بۆچـی پێغەمبـەر ﷺ بـە ئەرکـی هۆشـیارکردن و وریاکردنـەوەی خەڵـك هەڵدەسـتێ؟

٧)- ﴿إِنَّمَا تُنذِرُ مَنِ ٱتَّبَعَ ٱلذِّكْرَ وَخَشِيَ ٱلرَّحْمَٰنَ بِٱلْغَيْبِ﴾، بە دڵنیایی تۆ تەنیا کەسێك وریا دەکەیەوەو دەترسێنی {کە بەهرەمەند بێ لەو ترساندن و وریا کردنەوەیە} کە شوێن زیکر بکەوێ، {شوێن قورئان بکەوێ، کە بیرخەرەوەیە} و، بە پەنامەکییش لە (خوای) خاوەن بەزەیی بترسێ.

٨)- ﴿فَبَشِّرْهُ بِمَغْفِرَةٍ وَأَجْرٍ كَرِيمٍ﴾، ئنجا ئەو کەسە موژدەی پێبدە بە لێبوردنێکی تایبەت و، بە پاداشتێکی پڕ ڕێز و حورمەت، کەواتە: ئەگەر بۆ ئەوانی پێشێ، وریا کردنەوە و ترساندن و وشیارکردنەوەی پێغەمبەر ﷺ سوودی نەبێ، بەڵام بێگومان سوودی هەیە بۆ کەسانێك، کە دوو مەرجیان تێدا هەبن:

١- شوێن قورئان بکەون.

٢- ترس و سام و هەیبەتیان بەرانبەر بە خوای بەبەزەیی هەبێت.

بۆچـی خـوا ﷻ لـە نێـو هەمـوو سـیفەتەکانی خۆیـدا، لێـرەدا خـۆی بـە سـیفەتی بەبەزەیـی (الرَّحمـن) وەسـف کـردوە؟ دەتوانیـن بڵێیـن: لەبـەر دوو هـۆکار:

یەکەم: ئەمە ئاماژەیەکە بۆئەوە کە ڕەحمەت و بەزەیی خوا، خوازیاری ئەوە نیە، ترس و سام و هەیبەتت بەرانبەری نەبێ و لێی بێ باك بی.

دووەم: لەبەر ئەوەی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، هەستیار بوون بەرانبەر ناوی (الرحمن)، وەك لە سووڕەتی (الفُرقَان) ئایەتی (٦٠)دا، دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱسْجُدُوا۟ لِلرَّحْمَٰنِ

﴿قَالُوا۟ وَمَا ٱلرَّحْمَٰنُ أَنَسْجُدُ لِمَا تَأْمُرُنَا وَزَادَهُمْ نُفُورًا ﴾، واتە: ئەگەر پێیان بگوترێ: کڕنووش بەرن بۆ (خوای) خاوەن بەزەیی، دەڵێن: (الرّحمن) کێیە؟ ئایا کڕنووش بەرین بۆ کەسێك کە تۆ فەرمانمان پێدەکەی؟! بەس سڵەمینەوەشیان تێدا زیاد دەکات {ئەو فەرمان پێکردنە}.

**مەسەلەی سێیەم و کۆتایی:**

**ڕاگەیاندرانی ئەو ڕاستییە کە خوا ﷻ مردووان دەژێنێتەوەو، هەرچی دەشیکەن و پێش دەستی خۆیانی دەخەن، شوێنەوارەکانیشیان تۆمار دەکات و، هەموو شتێکیشی لە نووسینێکی بنەڕەتییدا سەرژمێر کردوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا نَحْنُ نُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا۟ وَءَاثَٰرَهُمْ ۚ وَكُلَّ شَىْءٍ أَحْصَيْنَٰهُ فِىٓ إِمَامٍ مُّبِينٍ ﴿١٢﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ إِنَّا نَحْنُ نُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە خۆمان مردووان زیندوو دەکەینەوە، واتە: لە قیامەت و لە کاتی هەڵسانەوەو زیندوو کرانەوەدا.

هەندێك لە زانایان لە تەفسیری: ﴿ إِنَّا نَحْنُ نُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ ﴾دا گوتوویانە: لە دنیادا ئێمە مرۆڤەکان لە مردنی مەعنەویی دەرباز دەکەین، بەهۆی هیدایەتی خواوە، کە لە قورئان و لە پێغەمبەردا ﷺ بەرجەستەیە.

دەڵێم: لەڕووی ڕێزمانی عەرەبییەوە، ئایەتەکە ئەو مانایەش دەگەیەنێ، بەڵام زیاتر وا پێدەچێ مەبەست مردوو زیندووکردنەوەی ڕاستەقینە بێ، نەك مردوو زیندووکردنەوەی مەعنەویی، ئەویش - مردوو زیندووکردنەوەی ڕاستەقینە - لە قیامەت دا دەبێ، ئەگەرنا ئەو مانایەش دەگەیەنێ و لە قورئان دا هاتوە، خەڵك زیندوو بکاتەوە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَٰهُ وَجَعَلْنَا لَهُۥ نُورًا يَمْشِى بِهِۦ فِى ٱلنَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُۥ فِى ٱلظُّلُمَٰتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا ۚ كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلْكَٰفِرِينَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٢٢﴾ ﴾الأنعام، واتە: ئایا کەسێك کە مردوو بوو، زیندوومان کردەوەو ڕووناکییەمان پێدا لە نێو خەڵك دا پێی بڕوا، وەك کەسێکە کە لە تاریکاییان دایەو لێیان دەربازبوو نیە ... بێگومان زیندووی کردوونەوە بە هیدایەتی خۆی،

بەو قورئانە کە ناوی لێناوە ڕووح، هەروەك لە ئایەتی (٥٢) سوورەتی (الشورى) دەفەرموێ: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا﴾.

کەواتە: دەشگونجێ وێڕای مانا ڕاستەقینەکەی، ئەو مانا مەجازییەش بگەیەنێ و قورئان هاتوە مردووان زیندوو بکاتەوە، ئەوانەی بە مردنی مەعنەویی مردوون، زیندوویان بکاتەوە، بەڵام بە پێی سیاقەکە، ئاشکرایە کە مەبەست پێی مردووانی ڕاستەقینەیە، کە بە جەستە مردوون و مەبەست زیندووکرانەوەی قیامەتە.

٢)- ﴿وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا۟ وَءَاثَٰرَهُمْ﴾، ئەوەی کە پێشیان خستوەو، شوێنەوارەکانیشیان، دەنووسین، ئەوەی کاتێ لە ژیاندابوون، کردوویانەو ئەنجامیان داوەو پێشیانخستوە، دەینووسین و، ئەوەش کە لە دوای بەجێهێشتنی ژیانی دنیا، بۆتە شوێنەواریان، شوێنەوارەکانیشیان دەنووسین.

٣)- ﴿وَكُلَّ شَىْءٍ أَحْصَيْنَٰهُ فِىٓ إِمَامٍ مُّبِينٍ﴾، هەموو شتێکیشمان سەرژمێر کردوە، لە پێشەوایەکی ڕوونکەرەوەو ڕۆشن دا، پێشەوا هەر کەسێکەو هەر شتێکە، کە پەیڕەویی لێبکرێ، چ مرۆڤ بێ، چ نووسین بێ.

کە دەفەرموێ: ﴿وَكُلَّ شَىْءٍ﴾، واتە: (كُلُّ شَيْءٍ مِنْ أَعْمَالِ النَّاس)، هەر شتێك لە کردەوەکانی خەڵك، یاخود هەموو شتێك لە دروستکراوەکان و لە کردەوەو هەڵسوکەوتەکان،

بێگومان (كُلُّ شَيْءٍ) هەموو شتێك، دەشگونجێ واتاو چەمکەکەی فراوان و گشتیی بێ، بەڵام بە پێی ڕەوت (سیاق) وا پێدەچێ تایبەت بێ، بە خەڵکەوە:

یانی: (كُلُّ شَيْءٍ مِنْ أَعْمَالِ النَّاسِ وَتَصَرُّفاتِهِم، وَأَحْوَالِهِم)، هەموو شتێك لە کردەوەو هەڵسوکەوت و حاڵ و باڵی خەڵك هەمووی لە پێشەوایەکی ڕوون دایە، کە مەبەست پێی (لَوحٌ مَحفوظ)ە، ئنجا ئایا (لَوحٌ مَحفوظ)و (إمَام مبِيْن)

دروستکراوێکی خوایە، کە خوا زانیاری و زانراوەکانی خۆی تێدا تۆمار کردبێ، یاخود مەبەست پێی زانیاریی خوایە؟ زانایان هەردوو ڕایەکەیان خستوونەڕوو.

منیش زیاتر وای تێدەگەم مەبەست پێی زانیاریی بێ سنووری خوا بێ، بەڵام بۆیە خوا ئەو تەعبیرەی بەکارهێناوە، چونکە ئێمە ئەگەر شتێك بنووسین، لە لەوحێکدا، لە تەختێکدا، لە کتێبێکدا، لە تۆمارێکدا بینووسین، دوایی ئەو نووسینەمان لێ تێك ناچێ و، کەم و زیادیش ناکات، واتە: خواش هەموو شتێك دەزانێ، زانیاریی خوا، گۆڕانی بەسەردا نایەت و کەم و زیاد ناکات و، خوا هیچ شتێکیشی لەبیر ناچێ.

## کورتە باسێک: پێنج سەرنجی گرنگ لەبارەی ئایەتەکانی سەرەتای (یس) ەوە

١- کە خوا فەرموویەتی: ﴿ لَقَدۡ حَقَّ ٱلۡقَوۡلُ عَلَىٰٓ أَكۡثَرِهِمۡ ﴾، پێشتریش باسمان کردو ئەو ڕایەی توێژەرەوانمان هێنا، کە دەڵێن: مەبەست لە (ٱلۡقَوۡلُ) لێرەدا ئەو بڕیارەی خوایە، کە دەفەرموێ: ﴿وَتَمَّتۡ كَلِمَةُ رَبِّكَ لَأَمۡلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلۡجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجۡمَعِينَ ﴿١١٩﴾ ﴾ هود، واتە: فەرمایشتی پەروەردگارت تەواو بووە کە دەفەرموێ: دۆزەخ پڕ دەکەم لە جند و مرۆڤ تێکڕایان.

هەروەها هەمان ڕاستیی لە سوورەتی (السَّجدَة)ش دا هاتووە، کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَٰكِنۡ حَقَّ ٱلۡقَوۡلُ مِنِّي لَأَمۡلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلۡجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجۡمَعِينَ ﴿١٣﴾ ﴾، واتە: قسە (بڕیار) لە منەوە چەسپاوە، کە دۆزەخ پڕ دەکەم لە جند مرۆڤ، تێکڕایان، کەواتە: لە دوو شوێنی قورئان دا، ئەو ڕاستییە ڕاگەیەندراوە کە خوا بڕیاری داوە، دۆزەخ پڕ بکات، لە مرۆڤ و جند.

زۆرێک لە توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: کە خوا لێرە دەفەرموێ: ﴿ لَقَدۡ حَقَّ ٱلۡقَوۡلُ عَلَىٰٓ أَكۡثَرِهِمۡ ﴾، قسە لەسەر زۆربەیان پێویست بووە، یانی: بڕیاری خوا ئەوەیە کە فەرموویەتی: دەبێ دۆزەخ پڕ بکەم، ئنجا بۆ ئەوەی دۆزەخ پڕ بێ، نابێ زۆبەی خەڵک بڕوابێنن!

بەڵام وەك پێشتریش گوتم: ئەوە مانا لێکدانەوەیەکی هەڵەیەو، سەردەکێشێ بۆ زۆرلێکردن (جبر)، کە خوا ﷻ تازە بڕیاری داوەو دەبێ دۆزەخ هەر پڕ بێ، ئنجا پریش نابێ ئەگەر زۆربەی خەڵک کافر نەبن، بۆیە نابێ بڕوابێنن! بەڵام لەڕاستییدا ئەم مانا لێکدانەوەیە شایستەی فەرمایشتی خوا نیە، بەڵکو مانای ڕاستی ئەو دوو ئایەتە ئەوەیە کە: بڕیاری خوا وایە: هەر کەسێك بڕوا

نەهێنن، سزا دەدرێ، ئەوانەش بڕوا ناهێنن، بۆیە دەبێ سزا بدرێن، کەواتە: بڕیاری خوایان لەسەر چەسپیوە، واتە: دەبێ سزا بدرێن، لەبەر ئەوەی بڕوا ناهێنن، کە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ لَقَدْ حَقَّ ٱلْقَوْلُ عَلَىٰٓ أَكْثَرِهِمْ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٧﴾ ﴾، بڕیار لەسەر زۆربەیان چەسپاوە، ئەو بڕیارەی کە دەبێ سزا بدرێن، لەسەریان چەسپاوە، لەسەر چی؟ ﴿ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾، لەبەرئەوەی بڕوا ناهێنن، لەبەر بڕوا نەهێنانیان بڕیاریان لەسەر چەسپاوە، نەك لەبەر ئەوەی دۆزەخ پڕ بێ، کە تازە خوا بڕیاری داوە دۆزەخ پڕ بکات، ئنجا ئەگەر مرۆڤ و جند زۆربەیان کافر نەبن، دۆزەخ پڕ نابێ!! بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە بڕیاری خوایان بەسەردا چەسپیوە، کە ئەویش دەگونجێ بە دوو واتایان لێکیبدەینەوە:

یەك: بڕیاری خوایان بەسەردا چەسپیوە، کە هەر کەسێك هیدایەتی خوا قبووڵ نەکات، خوا هیدایەتی نادات.

دوو: یاخود بڕیاری خوایان بەسەردا چەسپیوە، کە هەر کەسێك هیدایەتی خوا قبووڵ نەکات، خوا سزای دەدات.

ئەو دوو مانایە ڕاست و گونجاون، لەگەڵ ئەو فەرمایشتەی خوادا کە مرۆڤ و جند: {بڕیاری خوایان بەسەردا چەسپاوە}، یانی:

یەکەم: هەر کەسێك پێشەکییەکانی ئیمان هێنانی لە خۆیدا نەهێنانە دی و، تەماشای هیدایەتی خوای نەکردو، تێوەڕای نەماو سەرنجی نەداو، ویستی خۆی ئازاد نەکرد، کە ئازادانە تەماشای هیدایەتی خوا بکات، ناتوانێ بڕوا بهێنێ، ئنجا کە نەیتوانی بڕوا بهێنێ، ئەوە بڕیاری خوای بەسەردا دەچەسپێ، کە بە کافریی دەمێنێتەوە.

دووەم: هەموو ئەوانەی لە دنیادا هیدایەتی خوا ڕەفز دەکەن، بە هۆی ئەوەوە خوا سزایان دەدا، ئەوەش هەر بڕیاری خوایە.

٢- کە خوا فەرموویەتی: ﴿ إِنَّا جَعَلْنَا فِىٓ أَعْنَٰقِهِمْ أَغْلَٰلًا فَهِىَ إِلَى ٱلْأَذْقَانِ فَهُم مُّقْمَحُونَ ﴿٨﴾ وَجَعَلْنَا مِنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا فَأَغْشَيْنَٰهُمْ فَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ ﴿٩﴾ ﴾، ئەم

دوو ئایەتە مانای ڕێك و ڕاستیان ئەوەیە کە خوا حاڵی ئەوان، لە بەرانبەر وەرنەگرتنی هیدایەتی خوادا، کەللەڕەقیی و عینادییان، دەشوبهێنێ بە حاڵی کەسێکەوە کە کۆتی خراوەتە گەردن و، دیواری لە پێش دانراوەو دیواری لە دواوە دانراوەو، پەردەی بەسەر چاو هەڵکشاوە، ئیدی نە دەتوانێ بجووڵێ و، نە دەتوانێ ببینێ و، نە دەتوانێ سەر بسووڕێنێ، کەسێکیش وای لێکرابێ، توانای هیچ شتێکی نیە، ئەوانەش لە ئەنجامی بێبڕوایی خۆیاندا، خۆیان وەك حاڵی ئەو کەسە لێکردوە.

(فخر الدين الرازي) لە تەفسیرەکەی خۆیدا، قسەیەکی جوان دەکات دەڵێ:

(مَانِعُ الإِيمَانِ: إِمَّا أَنْ يَكُونَ فِي النَّفْسِ، وَإِمَّا أَنْ يَكُونَ خَارِجًا عَنْهَا، فَالْغُلُّ لَا يَسْمَحُ بِرُؤْيَةِ النَّفْسِ، وَالسَّدُّ يَمْنَعُ مِنْ رُؤْيَةِ الخَارِجِ) واتە: ڕێگر لە ئیمان، یان دەبێ لە خودی مرۆڤەکەدا بێ، یان لە دەرەوەی بێ، ئەو کۆتە کە دەخرێتە گەردنیانەوە، تەعبیر دەکات لەو حاڵەتە کە لە زاتی خۆیاندا پاڵنەریان نیە بۆ ئیمان، چونکە ڕێ نادا خۆیان ببینن، ئەو دیوارەش کە لەبەردەمیان دادەنرێ، تەعبیر لەوە دەکات کە لە دەرەوەیان ڕێگرو پەرچ هەیەو ناتوانن دەرەوە ببینن.

ئنجا خواش ﷻ لە سوورەتی (فصلت) ئایەتی (٥٣)دا دەفەرموێ: ﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴾، واتە: لەمەودوا نیشانەکانی خۆمانیان پێ نیشان دەدەین، لە ئاسۆیەکاندا و، لە خۆشیاندا، تاکو بۆیان دەرکەوێ هەقە، ئنجا کەسێك دیواری لە بەردەمدا دانرابێ و، لە پشتەوە داندرابێ، مانای وایە ناتوانێ تەماشای سەرەوە بکات، تاکو لە ئاسۆیەکاندا نیشانەکانی خوا ببینێ و، کەسێکیش کۆتی لە گەردن کرابێ، ناتوانێ سەرنجی خۆیشی بدات، تاکو لە خۆیدا ئایەتەکان ببینێ، کەواتە: بە هیچ لایاندا دەرفەتی نیە! بێبڕوایەکانیش حاڵیان چوێنراوە بە حاڵی کەسێکەوە کە تاوای لێکراوە.

منیش دەڵێم: بێبڕوایان بیرو ڕاو هەڵوێست و نەرێت و خووخدە نەفامیی و خراپەکانیان، وەك تۆقی گەردن و زنجیرو کەلەپچەی دەست و پێ، کۆتی

کـردوون، دەسـت و پێـی بەسـتوون، سـەرەنجام وەك بابایەکـی گرفتـاری نێـوان دیـواران و، چـاو داپۆشراو بـە پـەردە، کوێـر و کوتـرو، دەسـت و پـێ بەسـتراوو هیـچ لـە دەسـت نەهاتـوو دەبـن، ئەوانـەش بـۆ خۆیـان وایـان لـە خۆیـان کـردوە، وەك چـۆن کرمـی ئاوریشـم بـە لیکـی خـۆی دەزوویـەك دروسـت دەکات، ئـەو دەزووە لـە خۆیـەوە دەپێچـێ، دوایـی دەبێتـە قۆزاخەیـەك و هـەر لـە نێـو ئـەو قۆزاخەیـەدا دەمـرێ، ئەوانـەش هـەر لـە بیـرو بۆچوونـە هەڵـەو پووچەکانـی خۆیـان، لـە بیـرو خولیـا هەڵەکانـی خۆیـان، کـە لـە شـیرك و کوفـرو نیفاقـدا بەرجەسـتە دەبـێ، وەك حاڵەتـی عەقیدەیـی، هەروەهـا لـە کـردارو ڕەفتارەکانـی خۆیـان، کـە لـە تاوانەکانـدا بەرجەسـتە دەبـێ و، لـە جێبەجـێ نەکردنـی ئەرکـە شـەرعییەکان دا بەرجەسـتە دەبێ، ئەوانـە لـەو بیـرو بـڕواو خولیـاو فیکـرە پووچانـە، لـەو کـردەوەو ڕەوشـت و نـاکارە حـەڕام و قەدەغانـە، قۆزاخەیەکیـان بـۆ خۆیـان دروسـتکردوە، کـە دەشـوبهێتە حاڵـی کەسـێکەوە: کۆتـی لـە گـەردن کرابـێ و، دیـواری لـە بـەردەم و لـە پشـت دانرابـێ و، پـەردەی بەسـەرچاو هەڵکشـا بـێ.

٣- کە خوا فەرموویەتی: ﴿ وَسَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ ءَأَنذَرۡتَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴾، بۆ ئەوان یەکسانە، بیانترسێنی و وشیاریان بکەیەوە، یاخود نەیانترسێنی و وشیاریان نەکەیەوە، یەکسانە هەر بڕوا ناهێنن.

یەکێـك بـۆی هەیـە بڵـێ: ئـەدی بۆچـی بیانترسـێنن و ئاگاداریـان بکەنـەوە؟ ئـەم پرسـیارە بـە دوو جـۆر وەڵام دەدرێتـەوە:

یەك: بۆ ئەوەیە کە خوا بەڵگەیان لەسەر تەواو بکات، ئەگەرنا خوا زانیاریی بە هەموو شتێك هەیە، بەڵام بۆ ئەوەی بەڵگەیان لەسەر تەواو بکات و، کەس لە ڕۆژی دواییدا بواری بیانوو گرتنی نەبێ.

دوو: ئەوانە بەڵێ وەك کەسانێکن، کۆتیان لە گەردن کرابێ و، دیواریان لە بەردەم و لە پشت دانرابێ و، پەردەیان بەسەرچاو هەڵکشا بێ، بەڵام دەتوانن کۆتەکە بشکێنن و،

دیوارەکان لابەرن و، پەردەکە لەبەر چاوی خۆیان لابدەن، چونکە هەر خۆیان وایان لە خۆیان کردووەو، خۆشیان دەتوانن لەو واقیعە کە دەشوبهێتە حاڵی کەسێکەوە، ئاوای لێکراوە، خۆیان دەرباز بکەن، بۆیەش خوا ﷻ پێغەمبەرانی ناردوون و، بەکردەوە زۆریش لەوانە دەرباز بوون، ئەوانەی بوونە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ کێ بوون، هەر ئەوانە بوون کە لە حاڵێکی ئاوادا، کە دەشوبهێتە حاڵی کەسێکی کۆتکراوی، دیوار لە بەردەم و لە پشت دانراوی، پەردە بەسەر چاو هەڵکشاو، بەڵام خوا ﷻ بە هۆی ئاگادارکردنەوەو ترساندن و وشیارکردنەوەی پێغەمبەری خواوە ﷺ، لە ڕێی بە گوێدادانی قورئان و ڕاستییەکانی قورئانەوە، ئەوانە لەو واقیعە دژوارە دەرباز کران، کۆتەکەو زنجیرەکەی دەست و پێشیان، پساندن و، دیوارەکانی بەردەم و پشتیشیان ڕماندون، پەردەکەشیان لەسەر چاوی خۆیان لاداو، کەوتنە حاڵەتی وشیاریی و دیتن و جموجۆڵ و ئازادبوون، لەو حاڵەتی کۆیلایەتیی و دەست و پێ بەسترانە، خۆیان دەرباز کرد.

٤- کە خوا فەرموویەتی: ﴿ إِنَّمَا تُنذِرُ مَنِ ٱتَّبَعَ ٱلذِّكۡرَ وَخَشِيَ ٱلرَّحۡمَٰنَ بِٱلۡغَيۡبِۖ فَبَشِّرۡهُ بِمَغۡفِرَةٖ وَأَجۡرٖ كَرِيمٍ ﴾، بە دڵنیایی تۆ کەسێك دەترسێنی و هۆشیار دەکەیەوە، یانی: کەسێك لە هۆشیارکردنەوەو ترساندنی تۆ بەهرەمەند دەبێ، کە ئەو دوو مەرجەی تێدابن:

یەك: شوێن زیکر قورئانی بیرخەرەوە، بکەوێ.

دوو: بە پەنامەکیی ترس و سامی بەرانبەر خوای بەبەزەیی هەبێ.

یەکێك بۆی هەیە بپرسێ: بێگومان ترسان و سام و هەیبەت هەبوون، بەرانبەر خوای خاوەن بەزەیی، هۆکاری شوێنکەوتنی قورئانە، ئەدی بۆچی ترسان لە خوای بە بەزەیی، خراوەتە دوای شوێنکەوتنی زیکرەوە؟

وەڵامەکەی ئەوەیە: ئەوەی بە نسبەت ئەو خەڵکەوە گرنگترە، ئەوە خراوەتە پێش، ئەگەرنا لە ڕووی ڕیزبەندیی کاتییەوە دەبێ، پێشێ ترس و سام و هەیبەتی بەرانبەر بە خوا هەبێ، بەڵکو خۆشەویستیی و ڕێز و حورمەتی هەبێ

بەرانبەر بە خوا، ئنجا شوێن کتێبەکەی دەکەوێ، بەڵام لێرەدا کامە گرنگترە، ئەوە پێشخراوە، ئەوەك کامەیان هۆکارە بۆ کامیان، کامیان پێشەکییەو کامیان دەرەنجامە؟ بەڵکو کامیان گرنگترە، کە بە تەئکید شوێنکەوتنی قورئان گرنگترە، ئەگەرنا کەسێك با ترس و سامیشی بەرانبەر بە خوای خاوەن بەزەیی هەبێ و بیشیناسێ، بەڵام کە نەیجووڵاند بۆ شوێنکەوتنی زیکرو پەیام و بەرنامەکەی، مانای وایە لێترسان و سام و هەیبەتەکەی، سوودی پێ نەگەیاندوە.

٥- کە خوا فەرموویەتی: ﴿إِنَّا نَحْنُ نُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا۟ وَءَاثَٰرَهُمْ ۚ وَكُلَّ شَىْءٍ أَحْصَيْنَٰهُ فِىٓ إِمَامٍ مُّبِينٍ﴾، ئێمەش ئەوەی کە پێشیان خستوەو، شوێنەوارەکانیشیان دەنووسین و، هەموو شتێکیشمان سەرژمێر کردوە، لە پێشەوایەکی ڕوونکەرەوەو ڕووندا.

لەو بارەوە ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ دێنین کە دەفەرموێ:

**(مَنْ سَنَّ فِي الإِسْلَامِ سُنَّةً حَسَنَةً، فَلَهُ أَجْرُهَا، وَأَجْرُ مَنْ عَمِلَ بِهَا بَعْدَهُ، مِنْ غَيرِ أَنْ يَنْقُصَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيءٌ، وَمَنْ سَنَّ فِي الإِسْلَامِ سُنَّةً سَيِّئَةً، كَانَ عَلَيهِ وِزْرُهَا، وَوِزْرُ مَنْ عَمِلَ بِهَا مِنْ بَعْدِهِ، مِنْ غَيرِ أَنْ يَنْقُصَ مِنْ أَوْزَارِهِمْ شَيءٌ) (أخرجه الطيالسي: ٦٧٠، وأحمد: ١٩١٧٩، ومسلم: ١٠١٧، والترمذي: ٢٦٧٥، والنسائي: ٢٥٥٤، وابن ماجه: ٢٠٣، وابن حبان: ٣٣٠٨).**

واتە: هەر کەسێك لە ئیسلامدا ڕێیەکی باش دابنێ، (سوننەت بە مانای بنچینە دێ، بە مانای ڕێشکاندن دێ، بە مانای کارێکی باش دێ)، لە دوای خۆی کاری پێ بکرێ، ئەوە پاداشتی هەموو ئەوانەی هەیە کە کاریان پێکردوە (تاکو ڕۆژی قیامەت) بەبێ ئەوەی لە پاداشتی وان شتێك کەم بکرێتەوە، هەروەها کەسێك لە ئیسلامدا شتێکی خراپ دابنێ، (دابێکی خراپ، بنچینەیەکی خراپ، عادەتێکی خراپ، شوێنەوارێکی خراپ جێبهێڵێ) گوناهی خراپەکەی و گوناهی هەموو ئەوانەشی لە سەرە، کە کاریان بەو ڕێشکاندنە خراپە، بەو بنەڕەتە خراپە کردوە، بێ ئەوەی لە گوناهی ئەوان کەم بکرێتەوە، (هێندەی هەموویان

گوناهی دەگاتێ، چونکە ئەو هۆکار بووە، کە ئەو خەڵکە تووشی ئەو خراپە بووە، بەهۆی ئەو ڕێشکاندن و ئەو ڕێپێشاندانەی ئەوەوە}.

ئنجا ئەوە وەك بنچینەیەکی گشتیی هاتوە: [الدَّالُّ عَلَى الخَيْرِ كَفَاعِلِهِ] (أخرجه أحمد: ٢٣٠٧٧، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح رجاله ثقات رجال الصحيح).

واتە: کەسێك ببێتە هۆکاری چاکەیەك، وەك بکەری چاکەکە، پاداشتی هەیە.

بۆ چاکە وایەو، بۆ خراپەش دیسان هەر وایە، کەسێك ببێتە هۆی ئەوەی خەڵکێك لە ڕێ لابدرێ، بە ڕێی چەوتدا بڕوا، گوناهێك، تاوانێك بکات، ئەوانەی گوناهو تاوانەکەش دەکەن، گوناهی خۆیان هەر لە ئەستۆیە، بەڵام ئەو کەسەش کە بۆتە هۆی ئەوەی ئەوانە ئەو گوناهو تاوانە بکەن، ئەویش بە قەدەر هەموو ئەوانە گوناهی دەگاتێ، بێ ئەوەی لە گوناهی ئەوانیش کەم بێتەوە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان کـە بیسـت (٢٠) ئایـەت دەگرێتـە خـۆی، ئایەتـەکانی: (١٣ - ٣٢)، لـەم بیسـت ئایەتـەدا خـوای بـەرزو مـەزن، باسـی بەسـەرهاتی هاوەڵانـی ئاوەدانیـی (**أَصْحَابُ الْقَرْيَة**)مـان بـۆ دەگێڕێتـەوە، کـە بـاس نەکـراوە ئـەو ئاوەدانییـە کـوێ بووەو لـە کـوێ بـووە؟ لـە چ کاتێکـدا بـووە؟ چونکـە وەك زۆرجـاری دیکـە گوتوومانـە: خـوا ﷻ کـە بەسـەرهاتەکانمان بـۆ دەگێڕێتـەوە، ئـەوەی ئامانجێکـی پێویسـتی پێـوە پەیوەسـت نەبێ، باسـی نـاکات و، ناچێتـە نێـو ئـەو وردەکارییانـەوە، کـە هیـچ دەرس و پەندێکیـان پێـوە پەیوەسـت نیـە، بـەڵام کورتـەو پوختـەی بەسـەرهاتی هاوەڵانـی ئاوەدانییـە کـە (**أَصْحَابُ الْقَرْيَـة**)، ئەوەیـە:

خــوا ﷻ ســەرەتا دووان لــە پێغەمبەرانــی خۆیــان (**عَلَيْهِـمَا الصَّـلاَةُ وَالسَّـلاَم**) بـۆ دەنێـرێ، بـەڵام خەڵکەکـە بـە درۆیـان دادەنێـن و پێیـان بێبـڕوا دەبـن، بۆیـە پێغەمبەرێکـی دیکـەی سـێیەمیان دەکەوێتـە گـەڵ و، پەیامـی خـوا زۆر بـە ڕوونیـی بە خەڵکـی ئـەو ئاوەدانیـی و شـارە دەگەیەنـن، هەرچەنـدە زۆر خەریکـی ئیقناعکردنـی خەڵکەکـە دەبـن، کـە واز لـە پەرسـتنی جگـە لـە خـوا بێنـن و تەنیـا بەندایەتیـی بـۆ خـوا بکـەن، یـانی: ملکەچییـان تەنیـا بـۆ خـوا بـێ و، ئەوپـەڕی ڕێزلێگرتـن و، خۆشویسـتن و، پشـت بـێ بەسـتن و، سـام و هەیبـەت بەرانبـەر نوانـدن و، بـە گـەورە گرتنیان، تەنیا بـۆ خـوا بـێ، کـە ئـەوە مانـای پەرسـتنە، بـەڵام بـێ سـوود بـووە، دواتـر پیاوێکـی دڵسـۆزی خەڵکـی شـارەکە لـە دوورەوە، لەوپـەڕی شـارەوە دێت، پشـتگیریی ئـەو سـێ پێغەمبـەرە (**عَلَيْهِـم الصَّـلاَةُ وَالسَّـلاَم**) دەکات، خـوا لـەو بـڕوادارەش ڕازی بـێ، زۆر دڵسـۆزانە ئامۆژگاریـی خەڵکـی شـارو ئاوەدانییەکـەی خـۆی دەکات، بـەڵام وا پێدەچـێ کـە نـەك هـەر بـە قسـەیان نەکـردوە، بەڵکـو سـەرەنجام کوشتبیشـیان، ئەویـش پـاش چوونـە بەهەشـتیش، لەوێشـەوە هـەر دڵسـۆزیی بـۆ خەڵکەکـەی خـۆی

دەنوێنێ، سەرەنجامیش خوای دادگەر ئەو گەلەشی وەك سەرجەم گەلانی یاخیی و سەرکەش و بێبڕوا، دوای ئەوەی بەڵگەیان لەسەر تەواو کراوە، بە هاڕژن و چریکەیەکی گەورە دەفەوتێنێ و قڕەبڕیان دەکات و، لەگەڵ زەوییدا یەکسان دەبن.

﴿وَٱضْرِبْ لَهُم مَّثَلًا أَصْحَٰبَ ٱلْقَرْيَةِ إِذْ جَآءَهَا ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿١٣﴾ إِذْ أَرْسَلْنَآ إِلَيْهِمُ ٱثْنَيْنِ فَكَذَّبُوهُمَا فَعَزَّزْنَا بِثَالِثٍ فَقَالُوٓا۟ إِنَّآ إِلَيْكُم مُّرْسَلُونَ ﴿١٤﴾ قَالُوا۟ مَآ أَنتُمْ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا وَمَآ أَنزَلَ ٱلرَّحْمَٰنُ مِن شَىْءٍ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا تَكْذِبُونَ ﴿١٥﴾ قَالُوا۟ رَبُّنَا يَعْلَمُ إِنَّآ إِلَيْكُمْ لَمُرْسَلُونَ ﴿١٦﴾ وَمَا عَلَيْنَآ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٧﴾ قَالُوٓا۟ إِنَّا تَطَيَّرْنَا بِكُمْ ۖ لَئِن لَّمْ تَنتَهُوا۟ لَنَرْجُمَنَّكُمْ وَلَيَمَسَّنَّكُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٨﴾ قَالُوا۟ طَٰٓئِرُكُم مَّعَكُمْ ۚ أَئِن ذُكِّرْتُم ۚ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ مُّسْرِفُونَ ﴿١٩﴾ وَجَآءَ مِنْ أَقْصَا ٱلْمَدِينَةِ رَجُلٌ يَسْعَىٰ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱتَّبِعُوا۟ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٢٠﴾ ٱتَّبِعُوا۟ مَن لَّا يَسْـَٔلُكُمْ أَجْرًا وَهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٢١﴾ وَمَا لِىَ لَآ أَعْبُدُ ٱلَّذِى فَطَرَنِى وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢٢﴾ ءَأَتَّخِذُ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً إِن يُرِدْنِ ٱلرَّحْمَٰنُ بِضُرٍّ لَّا تُغْنِ عَنِّى شَفَٰعَتُهُمْ شَيْـًٔا وَلَا يُنقِذُونِ ﴿٢٣﴾ إِنِّىٓ إِذًا لَّفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٢٤﴾ إِنِّىٓ ءَامَنتُ بِرَبِّكُمْ فَٱسْمَعُونِ ﴿٢٥﴾ قِيلَ ٱدْخُلِ ٱلْجَنَّةَ ۖ قَالَ يَٰلَيْتَ قَوْمِى يَعْلَمُونَ ﴿٢٦﴾ بِمَا غَفَرَ لِى رَبِّى وَجَعَلَنِى مِنَ ٱلْمُكْرَمِينَ ﴿٢٧﴾ وَمَآ أَنزَلْنَا عَلَىٰ قَوْمِهِۦ مِنۢ بَعْدِهِۦ مِن جُندٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا كُنَّا مُنزِلِينَ ﴿٢٨﴾ إِن كَانَتْ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً فَإِذَا هُمْ خَٰمِدُونَ ﴿٢٩﴾ يَٰحَسْرَةً عَلَى ٱلْعِبَادِ ۚ مَا يَأْتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٣٠﴾ أَلَمْ يَرَوْا۟ كَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّنَ ٱلْقُرُونِ أَنَّهُمْ إِلَيْهِمْ لَا يَرْجِعُونَ ﴿٣١﴾ وَإِن كُلٌّ لَّمَّا جَمِيعٌ لَّدَيْنَا مُحْضَرُونَ ﴿٣٢﴾﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{هەروەهـا وێنەیەکیـان بـۆ بێنـەوە، هاوەڵانـی ئاوەدانیـە (شـارە)، کاتێـك نێـردراوەکان چوونـە لای (خەڵکەکـەی) ﴿١٣﴾ کاتێـك دووانمـان (لـە نێـردراوان) بـۆ لا نـاردن، کەچـی بـە درۆیـان دانـان، ئێمـەش بـە (نێـردراوی) سـێیەم بەهێـز و پشـت ئەسـتوورمان کـردن ﴿١٤﴾ پێغەمبـەرەکان گوتیـان: ئێمـە نێردراویـن بـۆ لای ئێـوە، (خەڵکەکـە) گوتیان: ئێـوە تەنیـا مرۆڤێکـی وەك ئێمـەن و (خـوای) بەبەزەیـی هیـچ شـتێکی دانەبەزانـدوەو ئێـوە بـەس درۆ دەکـەن ﴿١٥﴾ (سـێ نێـردراوەکان) گوتیـان: پەروەردگارمـان (شـایەدەو) دەزانـێ بەدڵنیایـی ئێمـە بـۆلای ئێـوە نێردراویـن ﴿١٦﴾ تەنیـا پێڕاگەیاندنـی ڕوونیشـمان لەسـەرە ﴿١٧﴾ خەڵکەکـە گوتیـان: ئێمـە بەهـۆی ئێـوەوە نەگبەتیـی گرتووینـی، ئەگـەر واز نەهێنـن، مسـۆگەر بـەرد بارانتـان دەکەین و، لـە ئێمـەوە ئـازارو (سـزایەکی) بـە ئێشـتان تـووش دەبـێ ﴿١٨﴾ (نێـردراوەکان) گوتیـان: نەگبەتییەکەتـان بـە خۆتانەوەیـە، ئایـا بەهـۆی ئـەوەوە کـە (ئامۆژگاریـی کـران و ڕاسـتییەکان) بیرتـان خرانـەوە، (نەگبەتییتـان تـووش بـوو)؟ بەڵکـو (هۆکارەکـەی ئەوەیـە) کـە ئێـوە کۆمەڵێکـی زێدەڕۆییـکارن ﴿١٩﴾ پیاوێکیـش بـە خێرایـی لەوپـەڕی شـارەوە هـات، گوتـی: ئـەی خەڵکەکـەم! شـوێن نێـردراوان (ی خـوا) بکـەون ﴿٢٠﴾ شـوێن کەسـێك بکـەون، هیـچ کـرێ و پاداشـتێکتان لـێ داوا نـاکات، ئەوانیـش ڕێـی ڕاسـتگرتوون ﴿٢١﴾ چیشـمە (چ بەربەسـتێکم لـە پێشـە) ئـەو زاتـە نەپەرسـتم کـە منـی هێناوەتـە دی (داهێنـاوە)و، تەنیـا بـۆ لای ئەویـش دەگەڕێمەوە؟ ﴿٢٢﴾ ئایـا جگە لەوی پەرسـتراوێکی دیکـە پەسـند بکـەم، کـە ئەگـەر (خـوای) بەبەزەیـی بیـەوێ زیانێکـم پـێ بگەیەنـێ، تکاکردنیـان هیـچ دادم نـادات (هیـچ سـوودێکم پـێ ناگەیەنـێ)و قوتـارم نـاکات؟ ﴿٢٣﴾ (ئەگـەر وابکـەم) کەواتـە: مـن لـە گومڕاییەکـی ئاشـکرا دام ﴿٢٤﴾ پیاوەکـە گوتـی: (ئـەی خەڵکەکـە!) گوێـم بـۆ بگـرن مـن بـڕوام بـە پەروەردگارتـان

هێنـاوە ﴿٢٥﴾ (دوای کوژرانـی) پێـی گوتـرا: بچـۆ بەهەشـتەوە، گوتـی: ئـەی خۆزگـە خەڵکەکـەم دەیانزانـی ﴿٢٦﴾ پـەروەردگارم لێـم بـوردووەو لـە ڕێزلێگیراوانـی گێـڕاوم ﴿٢٧﴾ ئێمـەش لـە دوای ئـەو هیـچ سـەربازمان لـە ئاسـمانەوە دانەبەزانـدن، (هیـچ فریشـتەمان بـۆ سـزادانیان نـە نـاردن) عادەتیشـمان وانەبـوو دابەزێنـەر (ی فریشـتان) بیـن، (بـۆ سـزادانی کۆمەڵگـە یاخییـەکان) ﴿٢٨﴾ (شـێوەی سـزادان و فەوتاندنیـان) تەنیـا یـەك نەعرەتـەو هـاڕژێ بەهێـز بـوو، یەکسـەر ئـەوان خامـۆش بـوون ﴿٢٩﴾ ئـەی داخ و خەفـەت لەسـەر بەنـدەکان، (پێشـتریش) هیـچ ڕەوانەکراوێکیـان بـۆ نەهاتـوە، مەگـەر گاڵتەیـان پێکـردوون ﴿٣٠﴾ ئایـا نەیاندیـوە (بـە چـاوی عەقـڵ و دڵ)، پێـش ئـەوان چەنـدان سـەدەمان فەوتانـدوون و، نەیاندیـوە کـە ناشـگەڕێنەوە بـۆ لایـان؟ ﴿٣١﴾ هیـچ کامێکیشـیان نیـە، مەگـەر بـە تێکڕایـی لـە لامـان ئامادەکـراو دەبـن [لـە ڕۆژی دوایـی دا] ﴿٣٢﴾.

## ڕشیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(فَعَزَّزْنَا بِثَالِثٍ): (أي: قَوَّيْنَا وَكَثَّرْنَا) واتـە: بەهێزمـان کـردن، زۆرمـان کـردن (تعـزّز اللَّحْـمُ: اشْـتَدَّ، العَزِيـزُ الَّـذِي يَقْهَـرُ وَلَا يُقْهَـر)، دەگوتـرێ: (تَعَـزَّزَ اللَّحْـمُ) واتـە: گۆشـتەکە پتەوبـوو، (عَزِيـز) ئـەو کەسـەیە کـە مـل بـە خەڵـك کـەچ دەکات و، کـەس بەڕوەسـتی نایـەت و پێـی ناوێـرێ.

(تَطَيَّرْنَا بِكُمْ): واتـە: نەگبەتیـی گرتووینـی بەهـۆی ئێـوەوە، دەگوتـرێ: (تَطَيَّرَ فُلَانٌ، والتَّطَيُّرُ أَصْلُـهُ التَّفَـاؤُلُ بِالطَّيرِ، ثُـمَّ يُسْـتَعْمَلُ فِي كُلِّ مَـا يُتَفَائَـلُ بِهِ وَيُتَشَـائَم)، وشـەی (تَطَيُّر) لـە بنەڕەتـدا بریتیـە لـە هەڵفڕاندنـی باڵنـدە، پاشـان ئـەوە بـۆ گەشـبینیی و ڕەشـبینیی، بەکارهێـنراوە، عەرەبـەکان عادەتیـان وابـوو، کـە دەیانویسـت کارێـك بکـەن، دەچـوون ئەگـەر باڵندەیـەك، کۆترێـك، کەوێـك، چۆلەکەیـەك، لـەو باڵندانـەی کـە لـە ناوچـەی خۆیـان دا هەبـوون، پێیـان شـك هاتبایـە، لەسـەر هێلانەکـەی خـۆی هەڵیاندەفڕانـد،

ئنجا ئەگەر بەلای ڕاستدا ڕۆیشتبایە، دەیانگوت: (تَيَامَنُوا)، ئەوە خێرو بەرەکەتە، ئەو کارەی بەتەمایـن بیکەیـن، بەڵام ئەگەر بەلای چەپدا ڕۆیشتبایە، دەیانگوت: (تَشَاءَمُوا) واتە: ئەوە نەگبەتیی و بێ خێرییەو ئەو کارە مەکەن.

(مِنْ أَقْصَا ٱلْمَدِينَةِ ): لەوپەڕی ئاوەدانییەکە، لە دووری شارەوە، (القَصِيُّ: البَعِيدُ، وَالمَكَانُ الأَقْصَى، وَالنَّاحِيَةُ القُصْوَى)، (قَصِيٌ): بە مانای دووریی دێ و شتێك کە دوور بێ، (المَكَانُ الأَقْصَى) شوێنێك کە دوورترە، (النَّاحِيَةُ القُصْوَى) ئەویش بۆ حاڵەتی مێینەیە، ئەو لایەی کە دوورترە.

(يَسْعَىٰ ): (السَّعْيُ: المَشْيُ السَّرِيعُ وَهُوَ دُونَ العَدْوِ) (سَعْي): بریتیە لە ڕۆیشتنێکی خێرا، بەڵام کەمتر لە ڕاکردن.

(صَيْحَةً): (الصَّيْحَةُ: رَفْعُ الصَّوْتِ)، (صَيْحَة): بە مانای دەنگ بەرزکردنەوە دێ، بەمانای چریکەو نەعرەتە دێ، بەمانای هاڕژن دێ، دەنگێکی زۆر قەبەو گەورە.

(خَـٰمِدُونَ): خامۆش و خەفە بوون، تەخت بوون، بێ هەست بوون، چونکە دەگوترێ: (خَمَدَتِ النَّارُ خَمْدَاً أَي: طُفِيءَ لَهَبُهَا وَيُسْتَعَارُ لِلْمَوْتِ)، ئاگر کە بکوژێتەوە، دەگوترێ (خَمَدَتِ النَّارُ) ئاگرەکە بڵێسەکەی نەماو کوژاوەتەوەو، ئەو وشەیە دەخوازرێتەوە بۆ مردنیش.

(يَـٰحَسْرَةً): (الحَسْرَةُ: الغَمُّ عَلَى مَا فَاتَهُ، وَالنَّدَمُ عَلَيْهِ)، (حَسْرَة): بریتیە لە خەم خواردن بۆ شتێك کە لە دەست چووەو بۆ پەشیمان بوونەوەی، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ يَـٰحَسْرَةً عَلَى ٱلْعِبَادِ ﴾، ئەی خەم و پەژارە لەسەر بەندەکان! وەرە ئێستا کاتی هاتنە.

(مُحْضَرُونَ): واتە: ئامادە کراوان، پەلکێش کراون، (الإِحْضَارُ: لِلْحِسَابِ وَالجَزَاءِ وَالعِقَابِ)، (إِحْضَار) بەمانای ئامادە کردنە، بەڵام زیاتر بۆ ئامادەکردنی کەسانێك دێ بۆ لێپرسینەوەو سزادان و ئازاردان.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

ئێمە سەرەتا بەسەرهاتی سێ نوێنەرەکەی عیسا و، ئەو شارەی بۆی چوون، یان بەسەرهاتی ئەو شارە، دەکەین کە سێ ڕەوانەکراوەکەی خوا ﷻ، بۆی چوون، کورتەیەك لەو بارەوە لە سێ تەوەردا باس دەکەین، دوایی دێینە سەر مانا لێکدانەوەی ئایەتە موبارەکەکان، ئەویش بە مەبەستی ئەوە، کە پێش ئەوەی واتای ئایەتەکان لێکبدەینەوەو شییان بکەینەوە، بەرچاو ڕوونییەکمان هەبێت، کە ئایا زانایان و توێژەرەوانی قورئان لە بارەی هاوەڵانی ئەو ئاوەدانییەوە، ئەو سێ نوێنەرو ڕەوانەکراوەی خواوە، کە بۆ لای ناردوون، چییان گوتوە؟

## هەڵسەنگاندنی: بەسەرهاتی سێ نوێنەرەکەی عیسا و شارەکە

**تەوەری یەکەم:** سەرەتا دەڵێین: زۆربەی هەرە زۆری مانا لێکدەرەوانی قورئان (المُفَسِّرون)، کە ئەو بیست ئایەتەیان مانا کردوون، ئەو بەسەرهاتەیان بە بەسەرهاتی سێ نوێنەری عیسا و، خەڵکی شاری (أنطَاكِيَة) تەفسیر کردوون، گوایە کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَٱضْرِبْ لَهُم مَّثَلًا أَصْحَٰبَ ٱلْقَرْيَةِ إِذْ جَآءَهَا ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿١٣﴾ إِذْ أَرْسَلْنَآ إِلَيْهِمُ ٱثْنَيْنِ فَكَذَّبُوهُمَا فَعَزَّزْنَا بِثَالِثٍ فَقَالُوٓا۟ إِنَّآ إِلَيْكُم مُّرْسَلُونَ ﴿١٤﴾﴾.

ئەو خەڵکە خەڵکی شاری (أنطَاكِيَة) بوون و، عیساش ﷺ دوو لە هاوەڵە تایبەتییەکانی خۆی کە (حَوارِيين)یان پێ گوتراوە، ناردوون بۆ لای خەڵکی ئەو شارە، بەڵام کە بە درۆیان داناون، ئنجا یەکێکی دیکەی سێیەمیشی بەدوادا ناردوون، گوایە ناوی ئەو سێ نوێنەرەش ئەوانە بوون: (شَمْعُون، يُوحَنَّا، بُولُس)،

هەندێکیش گوتوویانە: ناویان: (صَادق، مَصْدُوق، شَلُوم) بووە، هەندێکیش گوتوویانە: (سَمْعَان، یَحْیَی، بُولس) بوون، هەندێکیش گوتوویانە: دووەکان ناویان: (بَرناباو بُولس) بووە، سەرەتا ئەوان چوون، دوایی یەکێکی دیکەشیان خراوەتە گەڵ، کە یان (شَلُوم) بووە، یان (سَمْعَان) بووە، یاخود (شَمْعُون) بووە.

شاری (أنْطَاكية)ش ئێستا لە تورکیایەو سەر بە لیوای (أسكندرونة)یە، زۆربەی هەرە زۆری تەفسیرەکان، سێ کەسەکەی ئەو بەسەرهاتەیان کە خوا بە (أصْحَاب القَرْيَة)، هاوەڵانی ئاوەدانییە[1] گەورەکە، شارە قەرەباڵغەکە، ناوی بردوون، زۆربەی توێژەرەوانی قورئان، کە سەرنجی تەفسیرەکانیانم داوە، کە زیاتر لە سی (٣٠) تەفسیرم لەبەر دەستە، بۆ ئامادەکانی دەرسەکان و بەپێی توانا سەرنجیان دەدەم، زۆربەی هەرە زۆریان ئەم ئایەتانەیان وا تەفسیر کردوون، کە شارەکە شاری (أنْطَاكية) بووەو، ئەو سێیەش عیسا ﷺ ناردوونی، واتە: لە ڕۆژگاری عیسادا ئەو ڕووداوە ڕوویداوە! سەرەتا ویستم ڕای زۆربەی توێژەرەوانی قورئان بێنم لەبارەی تەفسیری ئەو ئایەتانەوە.

ئەوەری دووەم: بەڵام (إبن كثير) لە تەفسیرەکەی خۆیدا، کە هەندێکی دیکەش لە مانا لێکدەرەوانی قورئان، پشتگیریی ڕایەکەی ئەویان کردوە، لە کاتی تەفسیرکردنی ئەو ئایەتانەدا، سێ بەڵگە لەو بارەوە دەهێنێتەوە، کە ئەو ڕایە ڕاست نیە، ئەو سێ نوێنەرە، ئەو سێ ڕەوانەکراوە، سێ نوێنەری عیسا ﷺ بووبن و، ناردبنی بۆ لای خەڵکی (أنطاكية)، ئنجا (مَحاسِنُ التأويل) ی (جمال الدين القاسمي) یش پشتگیریی ڕایەکەی (إبن كثير) دەکات و، سێ بەڵگەکانی کە (إبن كثير) دەیان هێنێتەوەو (جمال الدين القاسمي)ش پشتگیریی ڕایەکەی دەکات، ئەمانەن:

---

(١) (القرية)، وەك زۆرجار گوتوومانە: ئەو چەمك و واتا باوەی ئێستا کە بە گوند و لادێ، دەگوترێ، لە قورئاندا بەو واتایە بەکارنەهاتوە، بەڵکو بە واتای شاری قەرەباڵغ و ئاوەدان و گەورە بەکارهاتوە.

یەك: ڕواڵەتی ئایەتەكان ئەوە دەگەیەنێ، كە ئەو سێ كەسە نێردراوی ڕاستەوخۆی خوا بووبن، نەك هی عیسا ، چونكە خوا دەفەرمووێ: ﴿وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلًا أَصۡحَٰبَ ٱلۡقَرۡيَةِ إِذۡ جَآءَهَا ٱلۡمُرۡسَلُونَ ﴿١٣﴾ إِذۡ أَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهِمُ ٱثۡنَيۡنِ فَكَذَّبُوهُمَا فَعَزَّزۡنَا بِثَالِثٖ﴾، كەواتە: خوا ڕاستەوخۆ ئەو ڕەوانەكراوانەی ناردوون، ئەگەر عیسا ناردبانی، دەیفەرموو: عیسا دووانی ناردن و، دوایی سێیەمیشی بەدوادا ناردن.

دوو: وەك لە (پەیمانی نوێ)دا هاتوە، خەڵكی (أَنْطَاكِيَة) بڕوایان بە نوێنەرانی مەسیح هێناوەو، (أَنْطَاكِيَة) یەكەمین شار بووە، بڕوای بە مەسیح هێناوەو، یەكێكە لە چوار شارە گرنگەكانی كە (بطاركة)یان لێبوون، (بطاركة) كۆی (بطريك)ە، كە پێگەیەكی ئایینی نەصرانییەكانە، ئەو چوار شارەش ئەمانەن: (القدس، أنطاكية، الأسكندرية، الرومية) شایانی باسە: شاری (أَنْطَاكِيَة) ئێستاش هەیەو، لە (حلب)ەوە دەوری (١٠٠كم)و، لە (الاسكندرية)ەوە دەوری (٦٠كم( دوورە، ئەوەش بەڵگەی دووەم، چونكە لە مێژووی نەصرانییەت دا هاتوەو، لە كتێبەكانیاندا باسكراوە، كە شاری (أنطاكية) یەكێكە لە چوار شارە بە پیرۆز دانراوەكانیان و (بطريك)ی تێدا دانیشتوە.

سێ: بەسەرهاتی (أَنْطَاكِيَة) دوای دابەزینی تەورات بووە، كە ژمارەیەكی زۆر لە زانایان گوتوویانە: بەپێی ئەم ئایەتەی سوورەتی (القصص) كە خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ مِنۢ بَعۡدِ مَآ أَهۡلَكۡنَا ٱلۡقُرُونَ ٱلۡأُولَىٰ بَصَآئِرَ لِلنَّاسِ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٗ لَّعَلَّهُمۡ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾، واتە: بە دڵنیایی دوایی ئێمە كتێبمان بە مووسادا، دوای ئەوەی پێشینەكانمان فەوتاندن، كە مایەی بەرچاوڕوونیی بوو بۆ خەڵك و ڕێنمایی و بەزەیی بوو، بەڵكو پەند وەربگرن و بیریان بكەوێتەوە، بەڵێ:

بەپێی ئەم ئایەتە، لە دوای دابەزینی تەورات، هیچ كۆمەڵگایەك بە سزایەكی گشتیی نەفەوتێندراوە، چونكە خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ مِنۢ بَعۡدِ مَآ أَهۡلَكۡنَا ٱلۡقُرُونَ ٱلۡأُولَىٰ ﴾القصص، دوای ئەوە سەدە پێشووەكانمان فەوتاندن، كتێبمان بە مووسادا ، كەواتە: دەگونجێ ئەم ئایەتە بكرێتە بەڵگەی ئەوە

- وەك كاتی خۆی لە تەفسیری سوورەتی (القصص)دا باسمان كردوە - كە لە دوای هاتنی مووسا ﷺ و دابەزاندنی تەورات بۆی، خوا هیچ ئاوەدانییەكی بە گشتیی نەفەوتاندوەو، بە تەئكید بەسەرهاتی (أنطاكية)ش لە دوای دابەزینی تەورات بووە!

كەواتە: ئەوە كە خوا دەفەرموێ: هاڕژن و چریكەیەكی گەورەمان بۆ ناردن و تەخت بوون، ئەوە نابێ لەسەردەمی عیسادا ﷺ بووبێ، بەڵكو دەبێ لە پێش مووساش دا بووبێ، (إبن كثير) لە ئەصڵدا ئەو خاوەنی ئەو ڕایەیە، بەڵام (جمال الدين القاسمي)ش لە تەفسیرەكەی خۆیدا، لێی خواستۆتەوە[1].

تەوەری سێیەم: كەواتە: ڕاستتر وایە وەك چۆن قورئان بەبێ ناوهێنان و دیارییكردنی شارەكەو كاتەكەی، بەسەرهاتەكەی هێناوە، واتە: دیاریی نەكردوە چ شارێك بووەو، كەی بووەو؟ فەرمووشیەتی: ئەو سێ كەسە، سێ لە پێغەمبەرانی خوا بوون، خوا ڕاستەوخۆ ناردوونی، ڕاستتر وایە ئێمەش ئایەتەكان هەر بەو جۆرە تەفسیر بكەین و، ئەو بەسەرهاتانەی نەصرانییەكان لە كتێبەكانی خۆیاندا، هێناویانن، كە عیسا هەندێك لە حەوارییەكانی ناردوون بۆ ئەم شار و ئەو شار، ئەو ئایەتانە بە پێی ئەوە تەفسیر نەكەین و، ئەو بەسەرهاتانە بەسەر ئایەتەكاندا، نەچەسپێنین، چونكە ئایەتەكان نابێ بەزۆر ملیان پێ با بدرێ و، پێویستە خۆیان دەلالەت و گەیاندنەكەیان چۆنە، هەر بەو شێوەیە تەفسیر بكرێن.

---

(١) محاسن التأويل، ج١٤، ص٦٨.

## ئێستاش تەفسیری گشتیی ئایەتەکان دەکەین :

خـوا ﷻ بــە پێغەمبــەری خاتــەم ﷺ دەفەرمــوێ: ﴿وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلًا أَصۡحَٰبَ ٱلۡقَرۡيَةِ﴾، وێنەیەکیـان بـۆ بێنـەوە، بەسـەرهاتێکیان بـۆ بگێڕەوە، وەك نموونـەی ئـەوە کـە ئەگـەر خەڵـك ملکـەچ نەبـێ بـۆ پەیامـی خـواو، گـوێ نەگـرێ بـۆ پێغەمبەرانـی خـواو، دڵسـۆزیی پێغەمبـەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) بۆیـان بەهەنـد وەرنەگـرن، لێیـان بەهرەمەنـد نەبـن، دوایـی تووشـی سـزا و جەزرەبـەی خـوا دێـن، لـە دنیـا و لــە دوارۆژدا.

وشـەی (أَصْحَاب) کـۆی (صَاحِب)ە، واتـە: هـاوەڵ، بـە مانـای خاوەنیـش دێ، کـە دیـارە لێـرەدا هـەردوو واتایـەکان هەڵدەگـرێ، خاوەنانـی ئاوەدانییەکـە، یاخـود هاوەڵانـی ئاوەدانییەکـە، خەڵکـی ئاوەدانیەکـە، وشـەی (ٱلۡقَرۡيَةِ)ش، بە شـاری قەرەباڵغ و ئاوەدانیـی گـەورە دەگوتـرێ، وێنەیەکیـان بـۆ بێنـەوە کـە بریتیـە لـە هاوەڵانـی ئاوەدانییـە گەورەکـە.

﴿إِذۡ جَآءَهَا ٱلۡمُرۡسَلُونَ﴾، کاتێـك کـە ڕەوانەکـراوەکان، چوونـە لای ئاوەدانییەکـە، واتــە: چوونــە لای خەڵکەکــەی، بۆچــی چــوون؟ بێگومــان بــۆ گەیاندنــی پەیامــی خــوا، ﴿إِذۡ أَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهِمُ ٱثۡنَيۡنِ﴾، یـاد بکـەوە! کاتێـك دووانمـان بـۆ نـاردن، دووان لـە ڕەوانەکراوانمـان بـۆ نـاردن، ﴿فَكَذَّبُوهُمَا﴾، بـەڵام خەڵکەکـە ئـەو دووەیـان بـە درۆ دانـان، ﴿فَعَزَّزۡنَا بِثَالِثٖ﴾، ئێمـەش ئـەو دووانەمـان بەهێـز کـردن بـە سـێیەمێك، واتــە: پێغەمبەرێکــی دیکــەی سێیەمیشــمان نــارد، کــە لــە هەمــوو قورئانــدا تەنیــا لێـرەدا هاتـوە: سـێ لـە پێغەمبـەران بـۆ یـەك ئاوەدانیـی و شـار بچـن، بەڵـێ مووسـا و هـاروون (عَلَيْهِما الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) چـوون بـۆ لای خەڵکـی میسـر، بـەڵام سـێ لـە پێغەمبـەران بنێردرێـن، تەنیـا لـەم بەسـەرهاتەدا هاتـوە.

﴿فَقَالُوٓاْ إِنَّآ إِلَيۡكُم مُّرۡسَلُونَ﴾، سـێ پێغەمبەرەکـە گوتیـان: ئێمـە بـۆ لای ئێـوە ڕەوانەکراویــن، بــۆ لای ئێــوە نێردراویــن، خــوا ﷻ بــە کورتیــی و پوختیــی

بەسەرهاتەکان دەگێڕێتەوە، کە گوتوویانە: ئێمە بۆلای ئێوە ڕەوانەکراوین، واتە: خوا دوای ئەوەی وەحیی بۆ ناردووین، بۆ لای ئێوەی ڕەوانەکردووین، ئەوەش پەیامەکەیە: هاتووین دڵسۆزییتان بۆ بنوێنین و...هتد، ئەو وردەکارییانەیان بە تەنکید لەگەڵدا باسکردوون، بەڵام خوا ﷻ بە کورتیی و پوختیی دەیگێڕێتەوە.

﴿ قَالُواْ مَآ أَنتُمْ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا ﴾، خەڵکەکە گوتیان: ئێوە تەنیا مرۆڤێکی وەك ئێمەن، ﴿ وَمَآ أَنزَلَ ٱلرَّحْمَٰنُ مِن شَيْءٍ ﴾، (خوای) خاوەن بەزەییش هیچ شتێکی دانەبەزاندوە، ﴿ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا تَكْذِبُونَ ﴾، ئێوە بەس درۆ دەکەن، ئنجا کە گوتوویانە: ﴿ قَالُواْ مَآ أَنتُمْ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا ﴾، پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، هەرگیز نکووڵییان لەوە نەکردوە، کە مرۆڤی وەك خەڵکن، بەڵکو هەمیشە ئەوان جەختیان لەسەر ئەوە کردۆتەوە: وەك لە سوورەتی (إبراهیم)دا خوا لەسەر زمانی تێکڕای پێغەمبەران، ڕوو بە گەلەکانیان دەفەرموێ: ﴿ إِن نَّحْنُ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَمُنُّ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ﴾، یانی: کە مرۆڤین وەك ئێوە، مانای وانیە هەر لە ئاستی ئێوە داین و، هیچمان لە ئێوە زیاد نیە، بەڵکو خوا پەیامی بۆ ناردووین، بەڵام بێبڕوایان لە هەمبانەی خۆیاندا گوێزیان ژماردوەو، هەمیشە نەیارانی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، لە خۆیانەوە تەماشای پێغەمبەرانیان کردوە، خۆیانیان پێ هیچ بووە، ئنجا گوتوویانە: مرۆڤ ناگونجێ نوێنەری خوا بێ و پەیامی بۆ بنێرێ، ئنجا وەك پێشینان گوتوویانە: (دز پێی وایە هەموو کەس دزە)، ئینسانی خراپ پێی وایە هەموو کەس خراپە .

﴿ قَالُواْ رَبُّنَا يَعْلَمُ إِنَّآ إِلَيْكُمْ لَمُرْسَلُونَ ﴾، پێغەمبەرەکان ئەو سێ پێغەمبەرە (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، وەڵامیان دایەوەو گوتیان: پەروەردگارمان دەزانێ، بە دڵنیایی ئێمە بۆلای ئێوە ڕەوانەکراوین، پەروەدگارمان دەزانێ، واتە: پەروەردگارمان شایەدو چاودێرە بەسەرمانەوە، کە ئێمە لە خۆوە، بەناوی پەروەردگارەوە قسە ناکەین، ﴿ وَمَا عَلَيْنَآ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴾، تەنیا گەیاندنی ڕوون و ئاشکراشمان لەسەرە، واتە: دوای ئەوەی پەیامی خواتان پێ ڕادەگەیەنین، ئنجا خۆتان ئەرکدار

(مُكَلَّف)ن و، ئـەرك دەكەوێتـە سـەر شـانی خۆتـان، چارەنووسـی خۆتـان دەكەوێتـە دەسـت خۆتـان، ئایـا پەیامـی خوامـان لـێ وەردەگـرن و، لـە دنیـادا بەختـەوەرو لـە دوارۆژدا سـەرفراز دەبـن؟ یاخـود پەیامـی خـوا ڕەفـز دەكـەن و، لـە دنیـادا تووشـی بەدبەختیـی و ژیـن تاڵیـی و، لـە ڕۆژی دواییشـدا تووشـی سـزا و زەبـری خـوا دێـن؟!

﴿ قَالُوٓاْ إِنَّا تَطَيَّرۡنَا بِكُمۡ ﴾، (خەڵكەكـە) گوتیـان: (بـە پێغەمبەرەكانیـان) ئێمـە بەهـۆی ئێـوەوە تووشـی نەگبەتیـی بوویـن، ﴿ لَئِن لَّمۡ تَنتَهُواْ لَنَرۡجُمَنَّكُمۡ وَلَيَمَسَّنَّكُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴾، ئەگـەر دەسـت هەڵنەگـرن و واز نەهێنـن، لـەو قسـانەی دەیانكـەن، لـەو پەیامـەی دەیگەیەنـن، بەدڵنیایـی ئێمـە بەردبارانتـان دەكەیـن و، لـە ئێمـەوە نازارێكـی بـە ئێشـتان تـووش دێ، یـانی: زۆر خـراپ جەزەربەتـان دەدەیـن.

(قَالُوٓاْ ) سـێ پێغەمبـەرەكان (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) گوتیـان: ﴿ طَـٰٓئِرُكُم مَّعَكُمۡ ﴾، نەگبەتیـی خۆتـان بـە خۆتانەوەیـە، ئەگـەر نەگبەتییەكتـان تـووش بووبـێ، ئـەوە هـی خۆتانـە، هـی جـۆری بیركردنـەوەو كـردارو ڕەفتـاری خراپتانـە، ﴿ أَئِن ذُكِّرۡتُمۚ ﴾، ئایا بـە هـۆی ئـەوەوە تووشـی نەگبەتیـی بـوون، كـە ڕاسـتییەكانتان بیرتـان خراونـەوەو، هۆشـیار كراونــەوە؟ ﴿ بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٞ مُّسۡرِفُونَ ﴾، وانیـە، بەڵكـو ئێـوە كۆمەڵێكـی زێدەڕۆییـكارن، تێپەڕێنـەرن، ئەگـەر نەگبەتیـی و نەهامەتییتـان بەسـەرهاتبێ، لـە ئەنجامـی كـردەوەی زێدەڕۆییكارانـەو تێپەڕێنەرانـەی خۆتانـە.

ئنجا ئـەوان لـەو مشـتومڕە دابـوون، سـێ پێغەمبـەرەكان (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) و خەڵـكی شـارەكە لـەو وتووێـژو مشـتومڕو شـەڕە قسـەیەدابوون، كـە شـتێكی دیكـە ڕوویـدا:

﴿ وَجَآءَ مِنۡ أَقۡصَا ٱلۡمَدِينَةِ رَجُلٞ يَسۡعَىٰ ﴾، لـەو پـەڕی شـارەوە، پیاوێـك هـات، بـە خێرایـی دەڕۆیـی، وشـەی (سَعي) هـەم بەمانـای بـە خێرایـی ڕۆیشـتن دێ، هـەم بـە مانـای ئـەوە دێ كەسـێك بـە جیددیـی بـەرەو كارێـك بچـێ، كـە دەفەرمـوێ: لەوپەڕی شـارەوە، واتـە: ئـەو ڕێیـە دوورە پـەرچ نەبـوو لەبەردەمیـدا كـە نەیبـڕێ و، نەیـەت بـۆ

پشتگیرییکردنی پێغەمبەرەکان، ڕەنگە ئەوەشی لێ وەربگیرێ: بەزۆریی خەڵکی دەوروبەری شارەکان، نەك نێو جەرگەکەیان، ئەوان ڕەنگە ئامادەیی وەرگرتنی هیدایەتی خوایان زیاتر بێ، لەبەر ئەوەی زۆر نوقمی ڕابواردنی ماددیی و خۆشگوزەرانیی و نەبوو ون و، دەوڵەمەندیی و ڕابواردنی ناشەرعیی دەست و پێی نەبەستوون، ﴿قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱتَّبِعُواْ ٱلۡمُرۡسَلِينَ﴾، بێگومان پیاوێکی بڕوادار بووە[1]، گوتی: ئەی خەڵکەکەم! - خەڵکی شارەکە بووەو خەڵکی کۆمەڵگاکەی خۆی بووە - بکەونە شوێن ڕەوانەکراوەکان، ﴿ٱتَّبِعُواْ مَن لَّا يَسۡـَٔلُكُمۡ أَجۡرًا﴾، بکەونە شوێن کەسێك کە کرێ و پاداشتتان لێ داوا ناکات و، هیچ ئەرکێکتان ناخاتە سەرشان، ﴿وَهُم مُّهۡتَدُونَ﴾، لە حاڵێکدا کە ئەوان ڕێی ڕاستکرتووشن، ﴿وَمَا لِيَ لَآ أَعۡبُدُ ٱلَّذِي فَطَرَنِي﴾، چیمە کە ئەو کەسە نەپەرستم، منی هێناوەتەدی، منی داهێناوە، ﴿وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ﴾، بەس بۆ لای ویش دەگەڕێنەوە؟

ئەم شێواز گۆڕینە، هونەر نواندنە لە قسەکردندا (تَفننُ في الكلام)، یانی: پێشێ بە خۆی دەڵێ: چیمە، چ شتێك ڕێگرمە، ئەو زاتە نەپەرستم کە منی هێناوەتە دی، دوایی ڕوو دەکاتە ئەوان و دەڵێ: بۆ لای ئەویش دەگێڕدرێنەوە.

﴿ءَأَتَّخِذُ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً﴾، ئایا جگە لەو پەرستراوانێکی دیکە بگرم، پەیدابکەم، هەڵبژێرم! ﴿إِن يُرِدۡنِ ٱلرَّحۡمَٰنُ بِضُرّٖ﴾، ئەگەر (خوای) خاوەنی بەزەیی، بیەوێ زیانێکم تووش بکات، ﴿لَّا تُغۡنِ عَنِّي شَفَٰعَتُهُمۡ شَيۡـٔٗا﴾، [نەك هەر ناتوانن ڕێگر بن لە بەردەم زیانگەیاندن و سزادانی خوادا، بەڵکو]: تکاکردنیشیان هیچ سوودێکم پێ ناگەیەنێ، ﴿وَلَا يُنقِذُونِ﴾، منیشیان پێ دەرباز و قوتار

---

(١) کە لە تەفسیرەکاندا دەڵێن: ناوی حەبیب بووە (حبیب النجار)، وەك گوتم: بینا لەسەر ئەوەی شارەکە شاری (أنطاكية) بووە، سێ نوێنەرەکانی عیسا بوون (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، بەڵام قورئان باسی نەکردوەو: ئێمەش لەبەر ڕۆشنایی ئەو بەسەرهاتەدا، ئەو ئایەتانە تەفسیر نەکەین باشترە.

ناكرێ (لە سزای خوا) ﴿ إِنِّيٓ إِذٗا لَّفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ﴾، ئەگەر وابكەم، كەواتە: من لە گومڕاییەكی ئاشكراو ڕوون دام.

لە كۆتاییدا، ئەو پیاوە بڕواداره ڕایدەگەیەنێ، دەڵێ: ﴿ إِنِّيٓ ءَامَنتُ بِرَبِّكُمۡ فَٱسۡمَعُونِ ﴾، من بڕوام بە پەروەردگارتان هێناوە، گوێم لێبگرن، واتە: گوێم بۆ بگرن، ئێوەش چاولەو بڕوا پێ هێنانەی من، بكەن، ئێوەش بڕوا بێنن! لە كۆتاییدا ڕایدەگەیەنێ و جاڕ دەدا: من بڕوام بەو سێ ڕەوانەكراوەی پەروەردگارتان هێناوە.

﴿ قِيلَ ٱدۡخُلِ ٱلۡجَنَّةَ ﴾، بێگومان لێرەدا چەند قسەیەكی زۆر قرتێنراون، واتە: كە ئەو وایگوت و، بوو بە دەمەقاڵێیان و بووبە دووبەرەكێیان و، ئەوان پیلانیان لێگێڕا، دوایی كوشتیان، ئنجا خوا پێی فەرموو: بچۆ بەهەشت، بەڵام ئەوە هەمووی قرتێندراوە، یەكسەر هاتۆتە سەر ئەصڵی مەبەست، كە ئەو گوتی: من بڕوام بە پەروەردگارتان هێناوەو گوێم بۆ بگرن، پێی گوترا: بچۆ بەهەشت، ئەمە لێی وەردەگیرێ، كە كوشتوویانەو پێی گوترا: بچۆ بەهەشت، ﴿ قَالَ يَٰلَيۡتَ قَوۡمِي يَعۡلَمُونَ ﴾، (لەوێرا لە بەهەشتەوە) گوتی: ئەی خۆزگە گەلەكەم زانیبایان، ﴿ بِمَا غَفَرَ لِي رَبِّي ﴾، بەوە كە پەروەدگارم لێی بوردووم، چاوپۆشیی لێكردووم، ﴿ وَجَعَلَنِي مِنَ ٱلۡمُكۡرَمِينَ ﴾، لە ڕێزلێگیراوانیشی گێڕاوم، لێرەدا بەسەرهاتی ئەو سێ پێغەمبەرەو، ئەو پیاوە كە خەڵكی شارەكە بووەو، پشتگیریی لە سێ پێغەمبەرەكە كردوە، لە بەرانبەر خەڵكەكەداو هاوكاریان بووە، لێرەدا كۆتایی دێ.

ئنجا خوا دێتە سەر باسی سەرەنجامی خەڵكی ئەو شارە، دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَىٰ قَوۡمِهِۦ مِنۢ بَعۡدِهِۦ مِن جُندٖ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا كُنَّا مُنزِلِينَ ﴾، ئێمە لە دوای خۆی، هیچ سەربازانێكمان لە ئاسمانەوە دانەبەزاندە سەر خەڵكەكەی، وشەی: (جُندٍ) كە كۆی (جُندي)ە، مەبەست پێی فریشتەكانە، واتە: هیچ فریشتەیەكمان دانەبەزاندو، پێشتریش عادەتمان نەبووە كە فریشتە دابەزێنین، بۆ سزادانی ئەو خەڵك و

ئاوەدانییانە کە لە خوا یاخیی دەبن، ﴿ إِن كَانَتْ إِلَّا صَيْحَةً وَاحِدَةً ﴾، سزادانی ئەو خەڵکە، تەنیا یەك هاڕژن بوو، ﴿ فَإِذَا هُمْ خَامِدُونَ ﴾، یەکسەر هەموویان خامۆش و تەخت بوون، بێ هەست و خوست و قرە بڕ بوون، ئنجا ئەوانیشمان بەو شێوەیە سزادا، واتە: هاڕژن و چریکەیەکی گەورە گرتنی، ﴿ يَا حَسْرَةً عَلَى الْعِبَادِ ﴾، ئەی داخ و خەفەت لەسەر بەندەکان، هەی خەفەت و پەژارە بۆیان! ﴿ مَا يَأْتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ ﴾، هیچ پێغەمبەرێکیان بۆ لا نەچووە، مەگەر گاڵتەیان پێکردوە، ﴿ أَلَمْ يَرَوْا كَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّنَ الْقُرُونِ أَنَّهُمْ إِلَيْهِمْ لَا يَرْجِعُونَ ﴾، ئایا نەیانبینیوە (بە چاوی عەقڵ و دڵ) لە پێش ئەواندا چەندان سەدەمان فەوتاندوون، کە ئەوان بۆ لایان ناگەڕێنەوە، تازە بوونە بەردی بن گۆمێ و ڕابردن، جارێکی دیکە نایەنەوە بۆ ژیانی دنیا، تازە تاقیکردنەوەی خۆیان دا و، کاتی تاقیکردنەوەیان بەسەرچوو، هەرکەس دەرچوو، دەرچوو، هەرکەسیش کەوت، کەوت، ﴿ وَإِن كُلٌّ لَّمَّا جَمِيعٌ لَّدَيْنَا مُحْضَرُونَ ﴾، هیچ کامیشیان نیە مەگەر لە لامان ئامادەکراو دەبن. واتە: کەنایەنەوە بۆ دنیا، با دڵنیابن ئەوە نیە تازە شوێنە ون و بزر بن و، جارێکی دیکە نەیەنەوە لامان، بەڵکو ﴿ وَإِن كُلٌّ لَّمَّا ﴾، (إِنْ) بە مانای (ما) لابەرە (نافية)یە، یانی: هیچ کامیان نیە، مەگەر تێکڕایان لەلای ئێمە ئامادەکراو دەبن، (كُلٌّ) هەموویان، (جَمِيعٌ) پێکەوە، ﴿ لَّدَيْنَا مُحْضَرُونَ ﴾، لە لای ئێمە ئامادەکراو دەبن، کە مەبەست پێی ئامادەکردنیانە بۆ سزای خوا لە ڕۆژی دواییدا، واتە: هەموویان پەلکێشی دۆزەخ دەکرێن و، بەر لە چوونە نێو دۆزەخ، هەموویان پەلکێش دەکرێن بۆ گۆڕەپانی لێرسینەوەو سزاو پاداشت، پاشان هەموویان لە دۆزەخدا ئامادە دەکرێن.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**وێنە هێنرانەوە بە خەڵکی ئاوەدانییەك، کە خوا دوو پێغەمبەری بۆ ناردوون، دواتر بە یەکێکی دیکەی سێیەم، پشتگیریی کردوون، خەڵکەکەش بڕوایان پێ نەهێناون و، بەوە تۆمەتباریان کردوون، کە مایەی نەگبەتیین بۆیان و، هەڕەشەی بەردبارانکردن و سزادان و، ئازاردانی بە ئێشیشیان لێ کردوون:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلًا أَصۡحَٰبَ ٱلۡقَرۡيَةِ إِذۡ جَآءَهَا ٱلۡمُرۡسَلُونَ ﴿١٣﴾ إِذۡ أَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهِمُ ٱثۡنَيۡنِ فَكَذَّبُوهُمَا فَعَزَّزۡنَا بِثَالِثٖ فَقَالُوٓاْ إِنَّآ إِلَيۡكُم مُّرۡسَلُونَ ﴿١٤﴾ قَالُواْ مَآ أَنتُمۡ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُنَا وَمَآ أَنزَلَ ٱلرَّحۡمَٰنُ مِن شَيۡءٍ إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا تَكۡذِبُونَ ﴿١٥﴾ قَالُواْ رَبُّنَا يَعۡلَمُ إِنَّآ إِلَيۡكُمۡ لَمُرۡسَلُونَ ﴿١٦﴾ وَمَا عَلَيۡنَآ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ﴿١٧﴾ قَالُوٓاْ إِنَّا تَطَيَّرۡنَا بِكُمۡۖ لَئِن لَّمۡ تَنتَهُواْ لَنَرۡجُمَنَّكُمۡ وَلَيَمَسَّنَّكُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿١٨﴾ قَالُواْ طَٰٓئِرُكُم مَّعَكُمۡۚ أَئِن ذُكِّرۡتُمۚ بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٞ مُّسۡرِفُونَ ﴿١٩﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شازدە بڕگەدا:

**١)- ﴿وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلًا أَصۡحَٰبَ ٱلۡقَرۡيَةِ﴾**، وێنەیەکیان بۆ بێنەوە، ئەو وێنەیە بریتیە لە هاوەڵانی ئاوەدانییەکە، یان خاوەنانی ئاوەدانییەکە، ئەمە مانایەکەی ئاوایە: **(اجْعَلْ أَصْحَابَ الْقَرْيَةِ وَالْمُرْسَلِينَ إِلَيْهِمْ، شَبَهًا لِأَهْلِ مَكَّةَ وَإِرْسَالِكَ إِلَيْهِمْ)**، واتە: خەڵکی ئاوەدانییە پێغەمبەرە بۆ لا ڕەوانەکراوەکانی، بکە بە وێنە بۆ خەڵکی مەککەو، ڕەوانەکرانی تۆش بۆ لایان، هەڵبەتە ئەوە بۆ یەکەم دوێنراوانێکە کە قورئانیان پێ دوێنراوە، ئەگەرنا هەموو ئەو خەڵك و ئاوەدانییانەی دیکەش لەسەر زەوی، بە درێژایی زەمان و بە پانایی زەمین،

با خۆیان بەراورد بکەن، لەگەڵ خەڵکی ئەو ئاوەدانیی و شارەدا، کە سێ لە پێغەمبەرانی خوایان بۆلا چوون، ئنجا پەندیان لێ وەربگرن و، ئەو خەڵکە وەك ئەوان نەکەن.

ئنجا خوا ﷻ باس دەکات، بەسەرهاتەکەیان چۆن بووە؟

٢)- ﴿إِذۡ جَآءَهَا ٱلۡمُرۡسَلُونَ﴾، کاتێك کە ڕەوانەکراوەکانیان بۆلا چوون، واتە: سێ ڕەوانەکراوەکان، سێ نێردراوەکان.

٣)- ﴿إِذۡ أَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهِمُ ٱثۡنَيۡنِ﴾، یادبکەوە! سەرەتا دووانمان بۆلا ڕەوانە کردن.

٤)- ﴿فَكَذَّبُوهُمَا فَعَزَّزۡنَا بِثَالِثٖ﴾، بە درۆیان دانان، ئێمەش ئەو دووانەمان بەهێز کردن، پشت ئەستوور کردن بە سێیەمێك، (عَزَّزْنَا) خوێندراویشەتەوە: (عَزَزْنَا)، بەبێ گیرە (شَدَّة)، (التَّعْزِيْزُ: التَّقْوِيَةُ وَالنَّصْرُ وَالتَّكْثِيرُ، فَالْمُشَدَّدُ وَالْمُخَفَّفُ بِمَعْنَى)، (عَزَّزْنَا) و (عَزَزْنَا) هەردووکیان بەمانای بەهێز کردن و پشتگرتن و زۆر کردنن، هەردووکیان یەك واتایان هەیە، ئەمەش زۆر بە ڕوونیی ئەوە دەگەیەنێ، کە خوا ﷻ ڕاستەوخۆ ئەو سێ پێغەمبەرانەی ناردوون، چونکە دەفەرموێ: ﴿إِذۡ أَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهِمُ ٱثۡنَيۡنِ فَكَذَّبُوهُمَا فَعَزَّزۡنَا بِثَالِثٖ﴾، ئنجا ئەگەر عیسا ﷺ ناردبانی، دەیفەرموو: (إِذْ أَرْسَلَ إِلَيْهِمُ الْمَسِيحُ اثْنَيْنِ، وَعَزَّزَهُمَا بِثَالِثٍ)، بەڵام خوا فەرموویەتی: ئێمە دووانمان بۆ ناردن، کە بە درۆیان دانان، بەهێزمان کردن، پشتمان گرتن بە پێغەمبەرێکی دیکەی سێیەم (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ).

٥)- ﴿فَقَالُوٓاْ إِنَّآ إِلَيۡكُم مُّرۡسَلُونَ﴾، ئەو سێ پێغەمبەرە (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) گوتیان: بە دڵنیایی ئێمە بۆ لای ئێوە ڕەوانەکراوین.

کە دەفەرموێ: (إِنَّآ إِلَيۡكُم مُّرۡسَلُونَ) لەجیاتی بفەرموێ: (إِنَّا مُرْسَلُونَ إِلَيْكُم) (الجار والمجرور)، کە پێشخراوە، بۆ گرنگیی پێدانە، واتە: ئێمە بۆ لای ئێوە ڕەوانەکراوین و، دیارە خوا گرنگیی و بایەخیی بە ئێوە داوە، بۆیە ئێمە بۆ لای ئێوە ڕەوانەکراوین، کەواتە: قەدری نیعمەتی خوا بزانن، هاتنی ئێمە بەهەند بگرن و، پەیامی خوامان لێ وەربگرن، چونکە خوا گرنگیی و بایەخیی بە ئێوە داوە.

٦)- ﴿ قَالُوا۟ مَآ أَنتُمْ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا ﴾، (خەڵكەكە) گوتیان: ئێوە تەنیا مرۆڤێكن وەك ئێمە، ئەمە قسەی تێكڕای نەیارانی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) بووە، نكووڵییكەران لە پێغەمبەران، هەمیشە ئەوەیان بە پاساوو بیانوو هێناوەتەوە، كە ئێوەش مرۆڤێكن وەك ئێمە، پێغەمبەرانیش (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) هەمیشە جەختیان لەوە كردۆتەوە، كە ئێمەش مرۆڤین وەك ئێوە، نەیانگوتوە: ئێمە شتێكی دیكەین، بەڵام ئەوان مەبەستیان ئەوە بووە، كە مرۆڤ شایستەی ئەوە نیە بكرێتە پێغەمبەری خواو، وەحیی و پەیامی خۆی بۆ بنێرێ، ئنجا ئەوانە لە هەمبانەی خۆیان دا گوێزیان ژماردوە، كە تەماشای خۆیانیان كردوە: بێبڕوا، سەرلێشێواو، سەرگەردان، لە ڕووی كردارو ڕەفتارەوە بێزراوو، داڕووخاوو، لادەرو تاوانبار، گوتوویانە: مرۆڤانێ كە وەك ئێمە - نغرۆ بوون لە گوناهو تاوان و بێبڕوایی و خراپەدا - كەی شایستەی ئەوەن خوا بیانكاتە نوێنەری خۆی؟ وایانزانیوە پێغەمبەرانیش (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) هەر وان، ئنجا ئێستاش هەر وایە، ئێستاش كەسانێك كە بەڕاستیی نوێنەرایەتیی پێغەمبەران دەكەن، كە لەگەڵ خەڵكێكدا ڕووبەڕوو دەبنەوە، بە تایبەتی چینە سیاسییەكە، چینە خۆشگوزەرانەكە، ئەوان كە بۆ خۆیان سەرگەمی خیانەتن و هەر خەریكی حەڕام خۆریی و زەبرو زۆرو خراپەن، وا دەزانن ئەوانیش هەر وان، دەڵێن: ئەوانە تەماحیان هەیە لە ماڵی خەڵكدا! ئەوانە دەیانەوێ خۆیان بەسەر خەڵكدا فەرز بكەن، مەبەستیان كورسیی و پارەو دەستەڵاتە، یانی: وەك خۆیانیان تەماشا دەكەن و پێوانەیان دەكەن، بەشەر بە زۆریی وایە، هەمیشە (قیاس النفس) دەكات و، خەڵك پێوانە دەكاتە سەر خۆی.

٧)- ﴿ وَمَآ أَنزَلَ ٱلرَّحْمَـٰنُ مِن شَىْءٍ ﴾، (خوای) خاوەن بەزەیی هیچ شتێكی دانەبەزاندوە، دیارە ئەمە مانای قسەی بێبڕوایەكان بووە، ئەگەرنا ئەوان بە عەرەبیی قسەیان نەكردوە، بەڵام بەهەر زمانێك بووە، ئەوە واتایەكەیەتی، یانی: خوای خاوەن بەزەیی، هیچ شتێكی دانەبەزاندوەو هیچ پەیامێكی نەناردوە.

٨)- ﴿ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا تَكْذِبُونَ ﴾، ئێوەش تەنیا درۆ دەكەن، ئەمە پێی دەگوترێ: هەڵاواردنی خاڵییكراو (الإِسْتِثْنَاءُ المُفَرَّغ)، واتە: ئێوە هیچ ناڵێن، جگە لە درۆ كردن.

پێغەمبەرانیش (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلَامِ) وەڵامیان دانەوە:

٩)- ﴿ قَالُوا۟ رَبُّنَا يَعْلَمُ إِنَّآ إِلَيْكُمْ لَمُرْسَلُونَ ﴾، گوتیان: پەروەردگارمان دەزانێ کە ئێمە بۆ لای ئێوە ڕەوانەکراوین، ئەم قسەیە بە سوێند دادەنرێ، چونکە بە شایەد گرتنی خوایە ﷻ لەسەر ڕاستیی قسەکەیان، زۆر لە زانایان دەڵێن: ئەگەر بڵێی: خوا ئاگادارەو دەزانێ، ئەمە بە سوێند لە قەڵەم دەدرێ، وەك سوێندەکانی دیکە، ئنجا کاتێك کەسێك ئەو قسەیە بکات و، بە درۆش بیکات، دوایی کەفارەتی دەکەوێتە سەر، بەڵام ئەگەر بشزانێ درۆ دەکات و بیشیڵێ، ئەوە (اليَمِينُ الزُّور) سوێندی بە درۆو ساختەیەو، گوناهی گەورەتریشە لەوەی کەسێك سوێندێك دەخوا لەسەر شتێك، دوایی بۆی دەردەکەوێ وانیە و، دەبێ کەفارەتەکەی بدات.

١٠)- ﴿ وَمَا عَلَيْنَآ إِلَّا ٱلْبَلَـٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴾، ئێمە تەنیا ڕاگەیاندنی ڕوون و ئاشکرامان لەسەرە، وشەی (بَلاَغ) ناوی چاوگ (اسم مصدر)ە لە (أَبْلَغَ)، واتە: گەیاندی، کاتێك هەواڵێك دەگەیەندرێ.

١١)- ﴿ قَالُوٓا۟ إِنَّا تَطَيَّرْنَا بِكُمْ ﴾، خەڵکەکە گوتیان: ئێمە بە هۆی ئێوەوە نەگبەتییمان تووشبوو، [(التَّطَيُّرُ): مَعْرِفَةِ دَلَالَةِ الطَّيْرِ عَلَى خَيْرٍ أَوْ شَرٍّ، ثُمَّ أُطْلِقَ عَلَى كُلِّ حَدَثٍ يَتَوَهَّمُ مِنْهُ أَحَدٌ أَنَّهُ كَانَ سَبَبًا فِي لَحَاقِ شَرٍّ] (تَطَيّر) لە سەر کێشی (تَفَعُّل)ە، بۆ زانینی پێشاندانی باڵندەیە بۆ چاکەو خراپە، دوایی بۆ هەر ڕووداوێك کە کەسێك پێی وابێ، هۆکاری ئەوەیە کە ناڕەحەتیی و نەگبەتییەکی بەسەر هاتوە، بەکارهێنراوە، کە دەڵێن: ﴿ إِنَّا تَطَيَّرْنَا بِكُمْ ﴾، واتە: ئێمە بەهۆی ئێوەوە بەڵاو نەگبەتییمان بەسەر هاتوە، یاخود مەبەستیان ئەوە بووە، کە بە هۆی ئەو بانگەواز و پەیامەی ئێوەوە، لە نێوماندا گرفت و کێشەو دەمەقاڵێ پەیدا بووە، ڕاجیایی و ناکۆکیی پەیدا بووەو، ئەوەش نەگبەتیی ێوەیە.

ئنجا ئەوان هەر لەسەر قسەی خۆیان بەردەوام دەبن.

١٢)- ﴿ لَئِن لَّمْ تَنتَهُوا۟ لَنَرْجُمَنَّكُمْ ﴾، ئەگەر دەست هەڵنەگرن، بە دڵنیایی بەرد بارانتان دەکەین.

١٣)- ﴿وَلَيَمَسَّنَّكُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾، لە ئێمەوەش ئازارێکی بە ئێشتان پێدەگات! ئنجا ئەو سێ پێغەمبەرە (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، وەڵام دەدەنەوە.

١٤)- ﴿قَالُوا طَائِرُكُم مَّعَكُمْ﴾، گوتیان: ئەگبەتیی خۆتان بە خۆتانەوەیە، واتە: هۆی ئەگبەتیی و بێ خێرییەکەتان خۆتانن، ئەگەر مەبەست پێی ئەگبەتیی و بێ خێرییەکی هۆکار نەزانراو بێ، ئەگەر مەبەستیش ناکۆکیی و دووبەرەکیی بێ، واتە: خەتاو هەڵەی خۆتانە، لە نێو خۆتاندا ناکۆکیی و دووبەرەکییتان لێ پەیدابووە بە هۆی پەیامی ئێمەوە، شوێن پەیامەکە بکەون و گوێی لێبگرن و وەری بگرن، ئەو کاتە پەیامی خوا دەبێتە هۆی تەبایی و یەکڕیزیی و تۆکمەیی و ڕێك و پێکیی نێوانتان.

١٥)- ﴿أَئِن ذُكِّرْتُم﴾، ئایا بەهۆی ئەوەوە کە (ڕاستیی) بیرتان خراوەتەوەو ئامۆژگاریی کراون، بەهۆی ئەوەوە ئەگبەتییتان تووشبووە؟ (أَئِن ذُكِّرْتُم) خوێندراویشەتەوە: (أَيْن ذُكِّرْتُم)، هەر یەك ماناشیان هەیە.

١٦)- ﴿بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ مُّسْرِفُونَ﴾، ڕاست ناکەن، بەڵکو ئێوە کۆمەڵێکی زێدەڕۆییکارن، کۆمەڵێکی تێپەڕێنەرن، واتە: زێدەڕۆیی وا ڕیشەدار بووە لە نێو ئێوەدا، کە بۆتە ڕاگری ئێوە، بۆتە سیمای ئێوە.

ئنجا ئەوە کە خێرو شەڕی مرۆڤ بە خۆیەوەیەتی، فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ هەیە دەفەرموێ، خوا لە فەرمایشتێکی دا دەفەرموێ:

**{يَا عِبَادِي إِنَّمَا هِيَ أَعْمَالُكُمْ أُحْصِيهَا لَكُمْ، وَأُوَفِّيكُمْ إِيَّاهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَمَنْ وَجَدَ خَيْرًا فَلْيَحْمَدِ اللهَ، وَمَنْ وَجَدَ غَيْرَ ذَلِكَ، فَلاَ يَلُومَنَّ إِلاَّ نَفْسَهُ} (أخرجه مسلم: ٢٥٧٧، وابن حبان: ٦١٩، والحاكم: ٧٦٠٦، وقال: صحيح على شرط الشيخين، عن أبي ذر).**

واتە: ئەی بەندەکانم! کردەوەکانی خۆتانن دەیانژمێرم، بۆتان سەرژمێر دەکەم، دوایی بەرانبەرەکەتان دەدەمەوە (سزا بێ یان پاداشت) ئنجا هەر کەسێك چاکەی بینی، با ستایشی خوا بکات و، هەرکەسێ جگە لەوەشی بینی، با جگە لە خۆی، سەرکۆنەی کەسی دیکە نەکا، (ڕەخنە لە کەسی دیکە دەگرێ).

مەسەلەی دووەم:

**لەوپەڕی شارەوە بەخێرایی هاتنی پیاوێکی بڕوادارو ئامۆژگاریی کردنی دڵسۆزانەی خەڵکەکەی، کە شوێن سێ پێغەمبەرەکان بکەون و، بەڵگە هێنانەوەی پوخت و بەهێزی لەسەر ڕاستیی تەنیا خواپەرستیی و پووچەڵیی شیرك:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَجَآءَ مِنۡ أَقۡصَا ٱلۡمَدِينَةِ رَجُلٞ يَسۡعَىٰ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱتَّبِعُواْ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿٢٠﴾ ٱتَّبِعُواْ مَن لَّا يَسۡـَٔلُكُمۡ أَجۡرٗا وَهُم مُّهۡتَدُونَ ﴿٢١﴾ وَمَا لِيَ لَآ أَعۡبُدُ ٱلَّذِي فَطَرَنِي وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴿٢٢﴾ ءَأَتَّخِذُ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً إِن يُرِدۡنِ ٱلرَّحۡمَٰنُ بِضُرّٖ لَّا تُغۡنِ عَنِّي شَفَٰعَتُهُمۡ شَيۡـٔٗا وَلَا يُنقِذُونِ ﴿٢٣﴾ إِنِّيٓ إِذٗا لَّفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ﴿٢٤﴾ إِنِّيٓ ءَامَنتُ بِرَبِّكُمۡ فَٱسۡمَعُونِ ﴿٢٥﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَجَآءَ مِنۡ أَقۡصَا ٱلۡمَدِينَةِ رَجُلٞ يَسۡعَىٰ ﴾، پیاوێك لەوپەڕی شارەوە، لە دووری شارەکەوە، هات بە خێرایی و گرنگیی پێدانەوە دەڕۆیشت، وشەی (أَقۡصَا)، واتە: دوور، یانی: ئەوپەڕی شارەکە، (قُدِّمَ أَقْصَى، وَعُبِّرَ بِيَسْعَى ثَنَاءً عَلَى الرَّجُلِ)، وشەی (أَقْصَى): ئەوپەڕ، پێشخراوەو (یَسْعَى) بەکارهێنراوە وەك ستایشکردنی پیاوەکە، پیاوێك لەوپەڕی شارەکەوە، لە دووری شارەوە هات بەخێرایی و، بە گرنگیی پێدانەوە دەڕۆیشت.

بێگومان ئەو پیاوە، یان هەر بە گەیشتنی پەیامی ئەو پێغەمبەرانە (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ) بڕوای هێناوە، یاخود پێشتر بڕوادار بووە، بە هۆی شوێنکەوتنی پەیامی پێغەمبەرێکی دیکەی پێش ئەوانەوە، کە باس نەکراوە، بێگومان ئەگەر بڕوادار نەبووایە، ئەو هەموو زانیارییانەی نەدەبوون و، بەو شێوەیەش لێبڕاوانەو، دڵسۆزانە نەدەهات ئامۆژگاریی خەڵکەکە بکات، وەك پێشینان دەڵێن: ملی خۆی بخاتە بەر چەقۆ!

٢)- ﴿قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱتَّبِعُواْ ٱلۡمُرۡسَلِينَ﴾، گوتی: ئەی خەڵکەکەم! شوێن پێغەمبەران بکەون، شوێن ڕەوانەکراوان بکەون، وشەی (ٱلۡمُرۡسَلِينَ) (أل)ەکەی بۆ ناساندنە، بەڵام لێرەدا مەبەستی (عهد)ە، واتە: شوێن سێ پێغەمبەرەکە بکەون، سێ پێغەمبەرەکە کە دەزانن کێن، شوێنیان بکەون، واتە: پەیڕەوییان لێ بکەون و، ئەوەی پێیانە لێیان وەربگرن.

٣)- ﴿ٱتَّبِعُواْ مَن لَّا يَسۡـَٔلُكُمۡ أَجۡرٗا وَهُم مُّهۡتَدُونَ﴾، شوێن کەسێك بکەون کە کرێتان لێ داوا ناکات، پاداشتتان لێ داوا ناکات، بارگرانییتان ناخاتە سەرشان و، ئەوانیش ڕێی ڕاستگرتوون، واتە: لە لایەکەوە هیچ ئەرك و بارگرانییتان ناخەنە سەرو، هیچ چاوەڕوانییەکیان لێتان نیە، پاشان خۆشیان لەسەر ڕێی ڕاستن، ڕێی ڕاستگرتوون، ئەگەر ئێوە شوێنیان بکەون، ئێوەش دەخەنە سەر ڕێگەی ڕاست، بەبێ ئەوەی هیچ چاوەڕوانییەکیان لێتان هەبێ.

گوایە ئەو پیاوە ناوی (حَبيبُ النَّجّار) بووە، هەندێکیش گوتویانە: (حبيب بن مُرَّة)، بەڵام لە قورئاندا نەهاتووەو، لە سوننەتی پێغەمبەریشدا ﷺ دەقێکی وا کە جێی متمانە بێ، نیە، ئەو بەسەرهاتەش کە زانایان بۆ تەفسیری ئەو ئایەتانە بەکاریان هێناوە، زیاتر بەسەرنجدانی کتێبی خاوەن کتێبەکان بووە، ویستوویانە ئەو بەسەرهاتە بچەسپێنن بەسەر ئەو ئایەتانەدا، یاخود ئەو ئایەتانە بچەسپێنن بەسەر ئەو بەسەرهاتەدا، بەڵام ئێمە بەبێ بەڵگەیەکی دڵنیاکەر، بۆمان نیە هیچ ئایەتێکی قورئان، یان هیچ کۆمەڵە ئایەتێکی قورئان، بەپێی بەسەرهاتێکی مێژوویی تەفسیر بکەین و، ئەو ئایەتە قورئانییانە بچەسپێنن بەسەر ئەو بەسەرهاتە مێژووییەدا.

پێشتریش باسمان کرد لە مانا گشتییەکەیدا، کە ناشکونجێ ئەوەی لەبارەی شاری (أنطاكية)وە هاتوە، کە چوارەمین شاری بە پیرۆزگیراوو گرنگیی پێدراوی نەصرانییەکان بووە، چوارەم شار بووە کە سەردەمی خۆی (بطريك)ی تێدا

دانیشتوە، کە پێگەیەکی گەورەی زانایان و مشورخۆرانی نەصرانیی بووەو هەیە، ناگونجێ بەسەر ئایەتەکاندا جێبەجێ بکرێ و، ئایەتەکان بەسەر ئەو شارەداو خەڵکی ئەو شارەدا ناچەسپێن، خەڵکی ئەو شارەش سزا نەدراون و نەمانزانیوە لە مێژوودا، شتی وا بووبێ، بەڵکو ئەو شارە شارێکی گرنگیی پێدراوو بە پیرۆزگیراویی نەصرانییەکان بووە.

ئنجا ئەو پیاوە لەسەر ئامۆژگاریی خۆی بەردەوام دەبێ:

٤)- ﴿ وَمَا لِيَ لَآ أَعۡبُدُ ٱلَّذِي فَطَرَنِي ﴾، ئایا چیمە ئەو کەسە نەپەرستم کە منی هێناوەتە دی؟ (مَا لِيَ) (مَا) بۆ پرسیار کردنە (مَا) (إستفهامية)، (مَا لِي) یانی: (وَمَا يَكُونُ لِي فِي حَالِ لَا أَعْبُدُ الَّذِي فَطَرَنِي، أَيْ: أيّ شَيْءٍ يَمْنَعُنِي مِنْ عِبَادَةِ الخَالِقِ)، واتە: چیمەو چ شتێکم بۆ دەبێ لە حاڵێك دا ئەو کەسە نەپەرستم کە هێناومیەدی؟ یانی: چی ڕێگرمە کە بەدیهێنەری خۆم بپەرستم؟

٥)- ﴿ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴾، تەنیا بۆ لای ویش، دەگێڕرێنەوە، بەس بۆ لای ئەو بەدیهێنەرەش، دەگێڕدرێنەوە، ئەمە لێرەدا هۆشداریی پێدانێکە، کە ئێوە سەرەنجام دەچنەوە بۆلای وی، بەڵام بۆ پەرستنەکە بەخۆی دەڵێ، بۆئەوەی ڕوویان تێنەکات، بڵێ: بۆچی ئەو پەروەردگارە ناپەرستن و، ئەو بەدیهێنەرە ناپەرستن کە پەیدای کردوون؟ بە خۆی دەڵێ: بۆچی ئەو پەروەردگارە نەپەرستم، چ شتێك ڕێگرمە، چ شتێك وام لێدەکات، ئەو پەروەدگارو بەدیهێنەرە نەپەرستم کە پەیدای کردووم؟ بەڵام ئاگادار بن بۆلای ویش دەگێڕدرێنەوە، ئەمە وەك گوتراوە: (تَعْرِيضٌ بِهِم) لەبەر ڕاهاویشتنە بۆ ئەوان، بە کنارە پێ گوتنیانە، کە بزانن ئێوە سەرەنجام بۆلای وی دەچنەوە.

٦)- ﴿ ءَأَتَّخِذُ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً ﴾، ئایا جگە لەو پەرستراوانێکی دیکە هەڵبژێرم! (الإتِّخَاذُ: افْتِعَالٌ مِنْ أَخذ، وَهُوَ التَّنَاول)، (إتِّخَاذ) لەسەر کێشی (إفْتِعَال)ە، لە (أَخْذ)ەوە، گرتن، (إتِّخَاذ) بریتیە لە گرتنی شتێك بەسەرنج دانەوە، بە هەڵبژاردنەوە، بە لێخەفتانەوە، (أَخْذ) بەمانای (تَنَاول)و دەست پێگەیاندنە، بەڵام (إتِّخَاذ) ئەوەیە کە ئینسان بە گرنگیی پێدانەوە شتێك

بکرێ، واتە: چ شتێك وام لێدەکات جگە لەو، جگە لە خوا، پەراستراوانێکی دیکە هەڵبژێرم! ئەم (ءَأَتَّخِذُ) دوو هەمزە (أ)ی هەن، هەمزەی یەکەمیان (هَمْزَةُ الإِسْتِفْهَامُ الإِنْكَارِي) هەمزەیە بۆ پرسیارکردنی نکووڵیلێکەرانە، پرسیارکردنی نکووڵیلێکەرانەش، وەڵامەکەی لە نێو خۆیدایە، یانی: (لاَ أَتَّخِذُ مِنْ دُونِهِ آلِهَةً) جگە لەو پەرستراوانی دیکە ناگرم، هەمزەی دووەمیشیان (أَتَّخِذ) هی کردارەکەیە و ئەسڵییە.

٧)- ﴿إِن يُرِدْنِ ٱلرَّحْمَٰنُ بِضُرٍّ لَّا تُغْنِ عَنِّى شَفَٰعَتُهُمْ شَيْـًٔا﴾، ئەگەر (خوای) بەبەزەیی بیەوێ زیانێکم لێ بدات، تکاکرد کردنی وان (هی پەرستراوەکان) هیچ شتێك سوودم پێناگەیەنێ، بێگومان خوای بەبەزەیی بەهۆی هاوبەش بۆ پەیداکردنی و نەپەرستنی و تاوان و لادانەوە، زیان لە مرۆڤ دەدات، ئەگەرنا خوای بەبەزەیی ﷻ، هەر بەزەیی و لوتف و کەرەمی لێ چاوەڕێ دەکرێ، بەڵام وەك پێشینانی خۆمان دەڵێن: [فلانکەس بۆ خۆی داری داوەتە دەست فلانکەس]، واتە: بۆخۆی بەرانبەرەکەی ناچار کردوە لێی بدا و زیانی پێ بگەیەنێ، ئنجا ئەو پیاوە مسوڵمانەش دەڵێ: ئەگەر خوای بەبەزەیی بیەوێ زیانم لێ بدات، واتە: بەهۆی بێبڕوایی و خراپەکارییمەوە.

﴿لَّا تُغْنِ عَنِّى شَفَٰعَتُهُمْ شَيْـًٔا﴾، تکاکردنی ئەو پەرستراوانە، کە لە جیاتی خوا هەڵیاندەبژێرم، هیچ سوودێکم پێ ناگەیەنێ، یانی: تکاکردنی ئەوان لەلای خوا، سوودم پێ ناگەیەنێ، گومانیشی تێدانیە لە ڕۆژی دوایی دا هیچکەس بێ مۆڵەتی خوا تکاناکات، بەڵام گریمان ئەو پەرستراوانە تکاش بکەن، بێ سوودە.

٨)- ﴿وَلَا يُنقِذُونِ﴾، هەروەها دەربازیشم ناکەن، ڕزگاریشم ناکەن، واتە: ئەو پەرستراوانە نەك هەر هیچیان بەدەست نیە، بەڵکو تەنانەت تکاکردنیشیان لەلای خوا بەدەست نیەو، ناشتوانن دەربازم بکەن لە سزای خوا.

٩)- ﴿إِنِّىٓ إِذًا لَّفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ﴾، {کەواتە: ئەگەر جگە لەخوا، پەرستراوانێکی دیکە هەڵبژێرم، بۆ بەندایەتیی بۆ کردن} بێگومان ئەوکاتە لە گومڕاییەکی ئاشکرا دام.

ئەمە وەڵامی پرسیارکردنە نکووڵیلێکەرانەکەیە: ( ءَأَتَّخِذُ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً )؟!

١٠)- ﴿ إِنِّيٓ ءَامَنتُ بِرَبِّكُمۡ فَٱسۡمَعُونِ ﴾، من بڕوام بە پەروەردگارتان هێناوە، ئنجا گوێم بۆ بگرن.

لێرەدا دووبارە سەرنجیان ڕادەکێشێتەوە، بۆ ئەوە کە ئەو خوایەی ئەو بڕوای پێهێناوە، وەك چۆن پەروەردگاری ئەوە، پەروەردگاری ئەوانیشە، ﴿ إِنِّيٓ ءَامَنتُ بِرَبِّكُمۡ ﴾، من بڕوام بە پەروەردگارتان هێناوە، نەیگوتوە: (آمَنْتُ بِرَبِّي)، هەرچەندە پەروەردگاری خۆشیەتی، بەڵام دەیەوێ ویژدانیان وەخەبەربێنێ و هۆشیاریان بکاتەوە، کە خوا خاوەن و پەروەردگارو مشوورخۆری ئێوەیە.

﴿ فَٱسۡمَعُونِ ﴾، گوێم بۆ بگرن، ئەمە ڕاگەیاندنی ئیمان هێنانەکەیەتی بە دەنگی بەرزو، داوای لێکردوون کە لێی تێبگەن و، پەیامەکەی وەربگرن، داواشی لێکردوون کە ئاگادار بن لە بڕوا هێنانی وی، نەك بە منجە منج و لە ژێر لێوەوە بڕوا بێنێ، بەڵکو بە دەنگی بەرز و، بە دەنگی زوڵاڵ ئیمان و بڕوا هێنان و مسوڵمانەتییەکەی خۆی ڕاگەیاندوە.

## کورتەباسێک
## هەڵوێستی جوامێرانەی ئەو پیاوە بڕوادارە لە پازدە بڕگەدا

ئەگەر تەماشا بکەین ئەو پیاوە بڕوادارە، خوا ﷻ لەم چەند ئایەتە کورتەدا، پازدە (١٥) هەڵوێستی لێ باس دەکات، کە هەموویان زۆر جێی سەرنجن:

١- ﴿ وَجَآءَ مِنۡ أَقۡصَا ٱلۡمَدِينَةِ ﴾، لەوپەڕی شارەوە هاتوە، واتە: لە دووری شارەوە هاتوە، کە ڕەنگە ئەوە ئامەژەش بێ بۆ ئەوە، کەسانێك کە لە قەراغ و کەناری شارەکاندا دەژین، لەبەر ئەوەی توانا و ئیمکانیەتیان نیە، لە نێو جەرگەی شاردا بژین، واتە: توانای ماددیی و دەسترۆیشتوویيان کەمترە، بە زۆریی وایە، ئەوانەی کە لە دامێن شارەکاندا دەژین، خەڵکی کەمدەست و تەنگدەست و نەدارن، ئەوانە کۆسپ و لەمپەر لەبەردەمیاندا بۆ بڕواهێنان بە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، بۆ بەندایەتیی بۆ خوا، کەمترن یان هەر نین، بۆیە ئاسانتر دەتوانن دڵی خۆیان بۆ هیدایەتی خوا بکەنەوە، هەروەها ئەوەشی لێ وەردەگیرێ: لەبەر ئەوەی دوورە دەست بووەو لەوپەڕی شار بووە، بە زەحمەتی نەزانیوە بێ بۆ پشتگیریی کردنی ئەو پێغەمبەرانە.

٢- ﴿ رَجُلٞ ﴾، پیاوێك، کە هەندێك لە زانایان گوتوویانە: (رَجُلٌ) بەڵێ بە مانای پیاوە، بەڵام یانی: مرۆڤێکی مەردو جوامێرو بوێر، مەسەلەکە بەس ئەوە نەبووە نێر بێ.

٣- ﴿يَسۡعَىٰ ﴾، (سَعي) بریتیە لە بە خێرایی و گرنگیی پێدانەوە ڕۆیشتن و بە خەم لێخواردنەوە حەڕەکەت کردن بەرەو شتێك.

٤- ﴿يَٰقَوۡمِ ﴾، ئەی خەڵکەکەم! مرۆڤ کاتێ خەڵك و کۆمەڵگای خۆی دەدوێنێ، پێویستە بەو شێوەیە بیاندوێنێ کە دڵیان و هەستیان بجووڵێنێ، تێیان بگەیەنێ کە منیش یەکێکم لە ئێوەو، منیش ئەندامێکم لە خۆتان و، ئێوەش کۆمەڵگاو خەڵکی خۆمن، بۆیە زیانی ئێوە زیانی منەو، قازانجی ئێوەش قازانجی منە.

٥- ﴿ٱتَّبِعُواْ ٱلْمُرْسَلِينَ﴾، شوێن ڕەوانەکراوەکان بکەون، شوێن ئەو سێ پێغەمبەرانە بکەون، کە لەلایەن خواوە بۆلاتان ڕەوان کراون.

٦- ﴿ٱتَّبِعُواْ مَن لَّا يَسْـَٔلُكُمْ أَجْرًا﴾، شوێن کەسێك بکەون، کە کرێتان لێ داوا ناکات، هیچ چاوەڕوانییەکی لێتان نیە، هیچ تەماعێکی لە ماڵ و سامانی تێوەدا نیە.

٧- ﴿وَهُم مُّهْتَدُونَ﴾، لە حاڵێکیشدا کە ئەوان ڕێی ڕاستکرتوون، واتە: لەسەر ڕێیەکی ڕاستن، ئەوان ئێوە بۆ کوێرە ڕێ و ڕێچکەیەك و، هەڵەت و هەڵدێرێك بانگ ناکەن، بەڵکو بۆ ڕاستە شەقامێك بانگتان دەکەن.

٨- ﴿وَمَا لِىَ لَآ أَعْبُدُ ٱلَّذِى فَطَرَنِى﴾، چیمە ئەو زاتە نەپەرستم کە منی هێناوەتە دی؟

لە ڕاستیدا تەنیا پەیداکەرو (فَاطِر)و دروستکەر (خَالِق)و پەروەردگار (رَبّ)، شایستەی ئەوەیە، مرۆڤ بەندایەتیی بۆ بکات، ئەگەرنا ئەوانی دیکە، یان وەك خۆتن، کە مرۆڤەکانن، یان لە خوار خۆتەوەن، کە شتەکانن.

٩- ﴿وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾، تەنیا بۆ لای ویش دەگێڕڕێنەوە، لێرەدا سەرنجیان ڕادەکێشێ، بۆ ئەوە کە بزانن کە سەرەنجام بزانن چۆن دەچنەوەو دەبرێنەوە بۆلای خوا؟!

١٠- ﴿ءَأَتَّخِذُ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً﴾، ئایا جگە لەو پەرستراوانێکی دیکە هەڵبژێرم؟!

یانی: شتێکی زۆر نالۆژیکیی و بێ مانایە، کە جگە لە خوای بەدیهێنەری پەروەردگار بپەرستێ!

١١- ﴿إِن يُرِدْنِ ٱلرَّحْمَٰنُ بِضُرٍّ لَّا تُغْنِ عَنِّى شَفَٰعَتُهُمْ شَيْـًٔا وَلَا يُنقِذُونِ﴾، ئەگەر خوای بەبەزەیی بیەوێ زیانێکم لێ بدات، تکا کردنی ئەوان هیچ سوودێکم پێ ناگەیەنێ و ناشتوانن دەربازم بکەن، کەواتە: ئەو پەرستراوانە هیچ کارە و بێ کەڵکن.

١٢- ﴿إِنِّىٓ إِذًا لَّفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ﴾، بەدڵنیایی ئەگەر من وا بکەم، لە گومڕاییەکی ڕوون و ئاشکرا دام، کەواتە: ئێوە ئێستا لە گومڕایی دان و، منیش ئەگەر وەك ئێوە بکەم، لە

گومڕاییدا دەبم، بەڵام خۆی دەپارێزێ لەوەی پێیان بڵێ: ئێوە لە گومڕایی دان، دەڵێ: ئەگەر من وابکەم لە گومڕاییدا دەبم، ئەو پیاوە زۆر بە سەلیقە بووە، خۆی لە هەر وشەو تەعبیرێك پاراستوە، کە دڵی ئەوانەی پێ بڕەنجێ و هەستیان بریندار بکات، هەموو ئەو شتانەی کە مەزەندەی ئەوەیان لێدەکرێ سەغڵەتیان بکاو، دڵیان بریندار بکات، بردوونیە سەر خۆی، نالێ: (أَتَتَّخِذُونَ مِنْ دُونِهِ آلِهَةً)، دەڵێ: ﴿ ءَأَتَّخِذُ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً ﴾، ئایا جگە لە خوا پەرستراوانێکی دیکە هەڵبژێرم! دوایی نالێ: (إِنْ يُرِدْكُم الرَّحْمَنُ بِضُرٍّ)، دەڵێ: ﴿ إِن يُرِدْنِ ٱلرَّحْمَٰنُ ﴾، ئەگەر خوای بەبەزەیی بیەوێ زیانێکم لێ بدات، نالێ: لە ئێوە، دوایی نالێ: (لَا تُغْنِ عَنْكُم شَفَاعَتُكُم شَيْئاً)، دەڵێ: ﴿ لَّا تُغْنِ عَنِّى شَفَٰعَتُهُمْ شَيْـًٔا وَلَا يُنقِذُونِ ﴾، تکاکردنی ئەو پەرستراوانەی، کە جگە لەخوا بیانپەرستم، هیچ سوودێکم پێ ناگەیەنێ و دەربازیشم ناکا، دوایی نالێ: (إِنَّكُمْ إِذاً لَفِي ضَلَالٍ)، دەڵێ: ﴿ إِنِّىٓ إِذًا لَّفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴾، ئەگەر وابکەم، کەواتە: لە گومڕاییەکی ئاشکرادا دەبم.

ئنجا کە ئەوانیش وایانکردوە، کەواتە: ئەوانیش لە گومڕاییدان، بەڵام ئەو قسەیە ڕێك بەدەم و چاویان دا نادات، بەڵکو هەموو ئەو شتانەی کە مەزەندەی ئەوەیان لێدەکرێ، دڵیان ئازاری پێ بکا و، دڵیان بڕووشێنێ، خۆی دەکات بە دوێنراو.

١٣- ﴿ إِنِّىٓ ءَامَنتُ بِرَبِّكُمْ ﴾، بە دڵنیایی من بڕوام بە پەروەردگارتان هێناوە، گوێم لێبگرن، بڕوام بە پەروەدگارتان هێناوەو، پەروەردگارەکە هی ئەویشە، بەڵام بۆچی دەڵێ: پەروەردگارتان؟ واتە: ئەوە پەروەردگاری ئێوەیە، خاوەنی ئێوەیە، بەخێوکەری ئێوەیە، دەتانژیێنێ، دەتانمرێنێ، بژیوتان دەدات، مشورتان لێ دەخوا، کەواتە: وەك چۆن من بڕوام پێهێناوە، ئێوەش بڕوا بێنن، بە خاوەن و پەروەردگاری خۆتان.

١٤- ﴿ فَٱسْمَعُونِ ﴾، گوێم لێ بگرن، ئەمەش ڕاگەیاندن و ئاشکراکردنی ئیمان هێنانەکەیەتی.

١٥- وا پێدەچێ ئەو پیاوە بڕوادارە دوای ئاشکراکردنی ئیمانەکەی، کوژرابێ و خرابێتە نێو

بەهەشتەوە، سیاقەکە وا دەگەیەنێ، ئنجا لە بەهەشتەوەش دڵسۆزیی بۆ خەڵکەکەی دەنوێنێ و دەڵێ: ﴿ يَٰلَيۡتَ قَوۡمِي يَعۡلَمُونَ ٢٦ بِمَا غَفَرَ لِي رَبِّي وَجَعَلَنِي مِنَ ٱلۡمُكۡرَمِينَ ﴾، ئەی خۆزگە! گەلەکەم، زانیبایان کە پەروەردگارم لێم بوردووە، منیشی لە ڕێزلێگیراوان گێڕاوە.

لەوێشەوە چاکەیان بۆ بە ئاوات دەخوازێ، ئینسانی بڕوادار بەو شێوەیە، ئەوان کوشتوویانەو سزایان داوەو، پەیامی خوایان لێ وەرنەگرتووەو، ناڕەحەتیان کردوە، کەچی ئەو لە بەهەشتیشەوە خێریان بۆ بە ئاوات دەخوازێ!!

**مەسەلەی سێیەم:**

**فەرمووڵێکرانی ئەو پیاوە دڵسۆزو فیداکارە بۆ چوونە بەهەشت و، خۆزگە خواستنی بە پێزانینی خەڵکەکەی، بە لێبوردران و ڕێزلێگیرانی لە لایەن خوای پەروەردگارەوە:**

خوا دەفەرمویّ: ﴿ قِيلَ ٱدْخُلِ ٱلْجَنَّةَ قَالَ يَٰلَيْتَ قَوْمِي يَعْلَمُونَ ﴿٢٦﴾ بِمَا غَفَرَ لِي رَبِّي وَجَعَلَنِي مِنَ ٱلْمُكْرَمِينَ ﴿٢٧﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ قِيلَ ٱدْخُلِ ٱلْجَنَّةَ ﴾، گوترا: بچۆ بەهەشتێ، دوای ئەوەی گوتی: ﴿ إِنِّيٓ ءَامَنتُ بِرَبِّكُمْ فَٱسْمَعُونِ ﴾، من بڕوام بە پەروەردگارتان هێناوە گوێم لێبگرن! یەکسەر خوا پێی دەفەرموێ: ﴿ ٱدْخُلِ ٱلْجَنَّةَ ﴾، بچۆ بەهەشت، ئنجا چۆن وا بە کت و پڕیی؟ هەرچەندە ڕێی تێدەچێ بڵێین، ئەوان بڕوایان نەهێناوە، هەر کەسە بە ڕێی خۆیدا ڕۆیشت، دوایی تەمەنی کرد و وەفاتی کردو کۆچی دوایی کردو پێی گوترا: بچۆ بەهەشت، دەگونجێ ئاوا لێك بدرێتەوە.

بەڵام زیاتر وا پێدەچێ هەر کە ئەو گوتوویەتی: من بڕوام بە پەروەدگارتان هێناوە، گوێتان لێم بێ! یەکسەر ئەوان کوشتبێتیان، ئەوان کە هەڕەشە لە پێغەمبەرەکان بکەن، بەردبارانیان بکەن، بێگومان پیاوێك لە خۆیان بەو شێوەیە زۆر بەڕوونیی و بە ڕاشکاویی بڵێ: بڕوام بەو سێ پێغەمبەرانە هێناوە، ئنجا ئەگەر دەسەڵاتیان بەسەر سێ پێغەمبەرەکەش دا نەبووبێ و، دەستیان لێ پاراستبێ، بەدڵنیاییی دەستەڵاتیان بەسەر ئەو پیاوە هاوشارییەکەی خۆیاندا بووە، بۆیە وا پێدەچێ کوشتبێتیان، هەرچەندە لە ئایەتەکەدا باس نەکراوە، یەکسەر دوای ئەوەی ئەو بڕواهێنانی خۆی ڕاگەیاند و گوتی: گوێتان لێم بێ، پێی گوتراوە: بچۆ بەهەشت، بەڵام ئەو ڕستەیە لێی وەردەگیرێ کە کوشتبێتیان

و بە شەهیدیی دنیای بەجێ هێشتبێ، چونکە یەکسەر دوای ڕاگەیاندنەکەی پێی بگوترێ: بچۆ بەهەشتێ، ئەمە لێی وەردەگیرێ کە دەستبەجێ ئەوانیش کوشتبێتیان و، یەکسەر ڕووحەکەی، خوای پەروەردگار فەرمانی پێکردوە، یان لە لایەن فریشتەکانەوە پێیگوتراوە: بچۆ بەهەشت.

٢)- ﴿قَالَ يَٰلَيۡتَ قَوۡمِي يَعۡلَمُونَ بِمَا غَفَرَ لِي رَبِّي﴾، گوتی: ئەی خۆزگە! خەڵکەکەم دەیانزانی بەوە کە پەروەردگارم لێم خۆشبووە.

کە دەفەرموێ: ﴿يَٰلَيۡتَ قَوۡمِي يَعۡلَمُونَ﴾، (ضُمِّنَ يَعْلَمُونَ مَعْنَى يُخْبَرُون، بِسَبَبِ دُخُولِ بَاء عَلَى مَفْعُولِ يَعْلَمُون، لأَنَّهُ لَا مطمع فِي أَنْ يَحْصُلَ لَهُمْ عَلِمٌ بِذَلِكَ)، وشەی: (يَعۡلَمُونَ)، مانای (يُخْبَرُون) {هەواڵیان پێ بدرێ} ی خراوەتە نێو، بەهۆی ئەوەوە کە (ب) چۆتە سەر بەرکاری (يَعۡلَمُونَ)، چونکە تەمایان نیە زانیارییان لەوبارەوە بۆ پەیدابێ.

﴿بِمَا غَفَرَ لِي﴾، بەوە کە پەروەردگارم لێم خۆشبووە، دەڵێ: (مَا مَصْدَرِيَة أي: بِغُفْرانِ رَبِّي، (وَجَعَلَنِي مِنَ الْمُكْرَمِينَ)، أي: وَجَعْلِهِ إِيَّايَ مِنَ الْمُكْرَمِينَ)، (ما) چاوگییە، یانی: خۆزگە خەڵکەکەم بەلێبوردنی پەروەردگارم بۆم و، گێڕانی بۆم لە ڕێز لێگیراوانیان دەزانی و، هەواڵیان پێدەدرا.

٣)- ﴿وَجَعَلَنِي مِنَ ٱلۡمُكۡرَمِينَ﴾ {خۆزگە خەڵکەکەم دەیانزانی و هەواڵیان پێدەدرا، بەوەی کە پەروەردگارم چاو پۆشیی لێکردووم} هەروەها لە ڕێز لێگیراوانی گێڕاوم، بۆیەش ئەوە بە خۆزگە دەخوازێ، چونکە هیچ ئومێدێکی نیە، کە زانیارییان لەوبارەوە پێ بگا، مەگەر پەروەردگاری ئەو هەواڵە بگەیەنێتەوە بەوان، یاخود بە گەلانی دیکەی دوای ئەوان.

ئەمە لێی وەردەگیرێ: کە چوونە بەهەشت، ئەوی بێ ئاگا نەکردوە لە حاڵی خەڵکەکەی و، بۆی بە ئاوات خواستوون، کە خەڵکەکەی بە حاڵ و باڵی ئەو بزانن، تاکو ئەوانیش وەك وی بکەن، لەوێشەوە بۆی بە خۆزگە نەخواستوون، خوا لەنێویان بەرێ، یان شانازییان بە سەردا بکات، بڵێ: من چوومە بەهەشتێ!

چونکە ئینسانی بڕوادار هەمیشە خێرخوازە بۆ خەڵک، دڵسۆزە بۆ خەڵک، با خەڵک قەدری ویش نەگرن و، ئەو دڵسۆزییەشی نەبینن، بەڵام ئەو لەبەر ئەوان دڵسۆز نیە، کە پاداشتی بدەنەوە، بەڵکو لەبەر خوا دڵسۆزە بۆ خەڵک و، خواش پێی دەزانێ.

بەڕێـــــزان!

ئنجا ئەوە زۆر گرنگە، کە ئێمە لە مامەڵەمان لەگەڵ خەڵکدا، هەمیشە خوا ﷻ ببینین، خەڵک نەبینین، بەو واتایە کە چاوەڕوانییمان لە خەڵک نەبێ و، بە بەرانبەر شت بۆ خەڵک نەکەین، ئەگەر بە بەرانبەر کار بۆ خەڵک بکەین و، خەڵکیش بێ وەفا و پێنەزان و سپڵە بوو، ئیدی نابێ چاکەیان لەگەڵدا بکەین! بەڵام ئەگەر کارت بۆ خوا کرد، خوا هەمیشە سوپاسگوزارەو، هەمیشەش بە چاکەی مرۆڤەکان دەزانێ.

شێخ عبدالقادری گەیلانیش زۆر جوانی گوتوە:

(کونوا مع الحق بلا خلق، ومع الخلق بلا نفس) واتە: لەگەڵ خوادابن بەبێ خەڵک و، لەگەڵ خەڵکیش دابن بەبێ نەفس.

یانی: لە مامەڵەتان لە خزمەت خوادا، لە ژێر کاریگەریی خەڵک دا مەبن و، لە مامەڵەشتان لەگەڵ خەڵک لەژێر کاریگەریی نەفس (و ئارەزوو ناشەرعییەکانی) دا مەبن.

**مەسەلەی چوارەم:**

**ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە، کە خوای باڵادەست بۆ سزادانی ئەو خەڵکە یاخییەی ئەو شارە، هیچ سەرباز (فریشتە)ی لە ئاسمانەوە دانەبەزاندوون، بەڵکو تەنیا یەك هاڕژن و نەعرەتەی بەهێز بەس بووە، بۆ خامۆش کردن و بنبڕ کردنیان:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَىٰ قَوۡمِهِۦ مِنۢ بَعۡدِهِۦ مِن جُندٖ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا كُنَّا مُنزِلِينَ ﴿٢٨﴾ إِن كَانَتۡ إِلَّا صَيۡحَةٗ وَٰحِدَةٗ فَإِذَا هُمۡ خَٰمِدُونَ ﴿٢٩﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿وَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَىٰ قَوۡمِهِۦ مِنۢ بَعۡدِهِۦ مِن جُندٖ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾، ئێمە لە دوای خۆی، دامانەبەزاندە سەر خەڵکەکەی، هیچ سەربازانێك لە ئاسمانەوە.

٢)- ﴿وَمَا كُنَّا مُنزِلِينَ﴾، هەروەها عادەتیشمان نەبوو، دابەزێنەربین، کە فریشتان دابەزێنین بۆ سزادانی گەلە یاخییەکان.

٣)- ﴿إِن كَانَتۡ إِلَّا صَيۡحَةٗ وَٰحِدَةٗ﴾، هۆکاری سزادانی خەڵکی ئەو ئاوەدانییە، ئەو شارە، تەنیا یەك هاڕژن و چریکە بوو.

٤)- ﴿فَإِذَا هُمۡ خَٰمِدُونَ﴾، یەکسەر هەموویان کتوپڕ خامۆش و خەفە بوون، قڕەبڕ بوون.

ئەگەر سەرنج بدەین، لێرەدا سێ جاران وشەی (مِنۡ)، هاتوە: ﴿مِنۢ بَعۡدِهِۦ مِن جُندٖ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ﴾،

أ- (مِنۡ)، لە (مِنۢ بَعۡدِهِۦ)دا، زیاد کراوە بۆ جەختکردنەوەی پەیوەستبوونی کات و کاری تێوکات (ظَرْفُ و مَظْروف)، یانی: لە دەستپێکی دوای ویەوە، هیچ فریشتەمان دانەبەزاندن.

ب- (من) لە (مِن جُندٖ)دا، بۆ بەشێك (تَبعيض)ە، یانی: هیچ جۆرە فریشتەو سەربازێکمان لە ئاسمانەوە دانەبەزاند، نەکەم نەزۆر.

ج- (مِن)ی سێیەم (مِّنَ ٱلسَّمَآءِ)، لە (مِن)ی دەستپێکردن (إبتدائية)یە، یانی: کە سەرەتایەکەیان لە ئاسمانەوە بێتەخوار.

وشـەی ﴿صَيۡحَةً﴾، وەك جـاری دیکـەش گوتومانـە، یانـی: هاڕژنێـك، چریکەیـەك، کـە دەفەرمـوێ: ﴿صَيۡحَةً وَٰحِدَةً﴾، ئەمـە بـۆ جەختکردنـەوەی ئەوەیـە کـە تەنیـا یـەك هـاڕژن بـووە، (صَيۡحَةً)ش واتـە: دەنگێکـی بەهێـز، نەعرەتـە، هـاڕژن، دەنگێکـی نائاسـایی، کـە ببێتـە هـۆی لەرزینـەوە زەوی و ببێتـە هـۆی مـردن و کـەڕ بوونـی ئـەو خەڵکـە، کـە بەدڵنیایـی دەنگـی زۆر قەبـەو گـەورە، هەمـوو ئـەو دەرهاویشـتانەی دەبـن.

کـە پێشـتر دەفەرمـوێ: ﴿وَمَا كُنَّا مُنزِلِينَ﴾، ئێمـە دابەزێنەریـش نەبوویـن، یـانی: عادەتمـان نەبـووە، فریشـتان لـە ئاسـمان دابەزێنیـن، بـۆ گەلانـی ڕابـردوو تاکـو بیانفەوتێنیـن، ئـەم تەعبیـرە ئـەوە دەگەیەنـێ، کـە لـە بەیـن بردنـی گەلـە یاخییـەکان، لـەوە کەمـترو بچووکـترە کـە خـوا فریشـتان دابەزێنـێ، بەڵکـو یـەك دەنگـی گـەورەو یـەك هـاڕژن چریکـەی گەورەیـان بـەس بـووە، کـە تەخـت بـن، بەڵکـو هەندێـك لـە گەلـەکان، خـوا بـە بـا لـە بەینـی بـردوون و پێویسـتییان بـە چریکـەش نەبـووە، یاخـود زەوییـان لـە ژێـردا ڕۆچـووە، یاخـود بـە ئـاو خنـکاون، یاخـود بـە بڵێسـە (صاعقة)یـەك کـە لـە ئاسـمانەوە هاتـوە، فەوتـاوون.

﴿فَإِذَا هُمۡ خَٰمِدُونَ﴾، (إذَا)، (إذَا)ی (فُجَائِيَة)یـە، واتـە: بەخێرایـی کتوپـڕ تەخـت بـوون، خامـۆش بـوون، ﴿خَٰمِدُونَ﴾، (الخُمُـودُ: إنْطِفَـاء النَّـارِ، اسْـتُعِيرَ للمَـوْت بَعْـدَ الحَيـاةِ المَلِيْئَـة بِالنَّشَـاط)، وشـەی (خُمُـود) لـە ئەسـڵدا دەگوتـرێ: (خَمَـدَت النَّـارُ أي: طُفِئَت)واتـە: ئاگرەکـە کوژایـەوە، بـەڵام لێـرەدا وشـەی (خُمُـود) خوازراوەتـەوە بـۆ مـردن، وەك چـۆن ئاگـر تاکـو بڵێسـەی بـەرز دەبێتـەوە، بەکاردەهێـنرێ بۆ سـووتاندنی شـت و بـۆ برژانـدن و ...هتـد، بـەڵام دوای ئـەوە ئاگرەکـە خامـۆش دەبـێ، تەنیـا خۆڵەمێشـێکی لـێ دەمێنێتـەوە، ئەوانیـش بـەو شـێوەیە، دوای جموجـۆڵ و چالاکیـی

و هاتن و چوونێکی زۆر، دوای ئەوەی ئەو هاڕژن و چریکەیە گرتنی، خامۆش بوون، وەك ئاگرێك كە دەكوژێتەوەو بڵێسەی نامێنێ، وەك لەبیدی کوڕی ڕەبیعە لەوبارەوە لە شیعرێکی دا دەڵێ:

(وَمَا الْمَرْءُ إلاَّ كَالشِّهَابِ وَضَوْئِه ... يَحُورُ رَماداً بَعْدَ إذْ هُوَ سَاطِعُ).

واتە: مرۆڤ تەنیا وەك بڵێسەیەك و ڕووناکییەکەیەتی، دەبێتە خۆڵەمێش دوای ئەوەی درەوشاوە بووەو، بەرز بۆتەوەو جموجۆڵی بووە.

(الزَّمَخشري) وەك (القُرطبي) لە تەفسیرەکەی خۆی دا[1] لێی خواستۆتەوە، دەڵێ: خوا ﷻ بۆ خەڵکی ئەو شارە کە بڕوایان بەو سێ پێغەمبەرانە نەهێناوە، فەرموویەتی: پێویستی نەکرد سەربازان دابەزێنین و فریشتان بنێرین، بەڵام بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ، لە سوورەتی (الأحزاب) ئایەتی ژمارە (٩)دا دەفەرموێ: ﴿فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا وَجُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا﴾، بایەکی بەهێز و سەربازانێك کە نەتاندەبینین، دامانبەزاندنە سەر دوژمنەکان، لە سوورەتی (آل عِمْرَان)یش ئایەتی (١٢٤)دا دەفەرموێ: ﴿بِثَلَٰثَةِ ءَالَٰفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُنزَلِينَ﴾، دیسان هەر لە سوورەتی (آل عِمران) لە ئایەتی (١٢٥)دا، دەفەرموێ: ﴿بِخَمْسَةِ ءَالَٰفٍ مِّنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ مُسَوِّمِينَ﴾، ئنجا ئەمە وەك ڕێزلێگرتنە بۆ پێغەمبەر ﷺ و بۆ ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ کە لە کاتە ناسکەکاندا و لە قۆناغە دژوارەکاندا، فریشتەکانی دابەزاندوون، بۆ پشتگیریی کردنی ئیمانداران، بۆ جەنگکردن و ترس خستنە نێو دڵی دوژمن و ناحەزەکانیان.

---

(١ ) الجامع لأحكام القرآن: ج١٥، ص١٩.

**مەسەلەی پێنجەم و کۆتایی:**

**ئەو بەندانەی، ئەو مرۆڤانەی گاڵتەیان بە پێغەمبەرانیان کردوە، شایستەی خەفەت و پەشیمانیین، خوا گەلێك کۆمەڵگەی پێشووی فەوتاندوون، کە دەبووایە پەندیان لێ وەربگرن و، بێگومان سەرجەمیان لە قیامەتدا، لەو شوێنەی خوا بۆی دیاریی کردوون، کۆدەکرێنەوەو ئامادە دەکرێن کە دۆزەخە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰحَسۡرَةً عَلَى ٱلۡعِبَادِۚ مَا يَأۡتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ٣٠ أَلَمۡ يَرَوۡاْ كَمۡ أَهۡلَكۡنَا قَبۡلَهُم مِّنَ ٱلۡقُرُونِ أَنَّهُمۡ إِلَيۡهِمۡ لَا يَرۡجِعُونَ ٣١ وَإِن كُلٌّ لَّمَّا جَمِيعٌ لَّدَيۡنَا مُحۡضَرُونَ ٣٢ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ يَٰحَسۡرَةً عَلَى ٱلۡعِبَادِ ﴾، ئەی داخ و خەفەت لە سەر بەندەکان! (يَا: حَرْفُ نِدَاءٍ لِمُجَرَّدِ التَّنْبِيهِ عَلَى خَطَرِ مَا بَعْدَه)، (يَا) پیتی بانگکردنە، بەڵام لێرەدا تەنیا بۆ ئاگادارکردنەوەیە، لە مەترسیی ئەوەی لەدوایەوە دێ، ﴿ يَٰحَسۡرَةً عَلَى ٱلۡعِبَادِ ﴾، وشەی: (حَسْرَة)، بریتیە لە زۆر پەشێمانیی تێکەڵ لەگەڵ بەتەنگەوە بوون، لەسەر ئەوە کە سوودێك لە دەست دەچێ، بەرژەوەندییەك دەفەوتێ، ئەی داخ و خەفەت بۆ بەندەکان! کە ئەو خێرو چاکەیان لەدەست خۆیاندا، کە شوێن پێغەمبەران بکەون.

٢)- ﴿ مَا يَأۡتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴾ [ئەمە ڕوونکردنەوەی ئەو شتەیە کە خەفەتەکەی لێ دەخورێ] هیچ پێغەمبەرێکیان بۆ نەهاتوە، مەگەر گاڵتەیان پێکردوە، ئەی داخ و خەفەت بۆ ئەوان، ئەو پێغەمبەرانە، ئەو ڕەوانەکراوانە، خوا بۆی ناردوون، کەچی لە جیاتی ئەوەی پەیامی خوایان لێ وەربگرن و، ڕێزیان لێبگرن و تەقدیریان بکەن، گاڵتەیان پێکردوون، کە دەفەرموێ: ﴿ يَٰحَسۡرَةً عَلَى ٱلۡعِبَادِ ﴾، مەبەست لە بانگکردن (نداء) لێرەدا، ئامادەبوونی بانگکراوەکەیە، واتە: ئەی حەسرەت و داخ و خەفەت، ئێستا

کاتتە وەرە، ئێستا کاتی ئەوەیە بێ بۆ ئەو مرۆڤانەی هەر کات پێغەمبەرێکی خۆیان بۆ هاتبێ، گاڵتەیان پێکردوە، لە جیاتی ئەوە ڕێزی لێبگرن و پەیامی خوای لێ وەربگرن!

٣)- ﴿ أَلَمْ يَرَوْا كَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّنَ الْقُرُونِ ﴾، ئایا نەیانبیوە، لە پێش وان دا چەندان سەدەمان فەوتاندوون! نەیانبینیوە بە چاوی سەر، ئەگەر بە شوێنەوارەکانیان دا بگەڕێن، یاخود بە چاوی عەقڵ و دڵ، ئەگەر مێژوو تەماشا بکەن و موتاڵا بکەن.

(كَمْ) لێرەدا، (كَمْ)ی (خَبَرِيَّة)یە، بۆ زۆریی بەکاردێ، یانی: لە پێش ئەواندا زۆر سەدەمان فەوتاندوون، واتە: لەو خەڵکانەی لە سەدەکاندا دەژیان، وشەی (قَرْن) یانی: ماوەیەك لە کات (٧٠-١٠٠) ساڵ کە ساڵەکان پێکەوەن و، خەڵکێك کە لەو سەدانەدا ژیاون، فەوتاندمانن.

٤)- ﴿ أَنَّهُمْ إِلَيْهِمْ لَا يَرْجِعُونَ ﴾، کە ئەوان بۆ لایان ناگەڕێنەوە، بۆ لایان ناگەڕێنەوە، یانی: ڕۆیشتن و ئاوەو ئاو چوون، تاقیکردنەوەی خۆیانداو ڕۆیشتن، بەڵام بە داخەوە کە لە تاقیکردنەوەکەدا کەوتن، جارێکی دیکەش ناگەڕێنەوە بۆ لایان، ناگەڕێنەوە بۆ دنیا، کە جارێکی دیکە شانسی خۆیان تاقیبکەنەوە، خوا یەکجار شانسی تاقیکردنەوە بە مرۆڤان دەدات.

٥)- ﴿ وَإِن كُلٌّ لَّمَّا جَمِيعٌ لَّدَيْنَا مُحْضَرُونَ ﴾، بەدڵنیایی هەمووشیان وێکڕا لە لامان ئامادەکراوە دەبن.

ئەم ئایەتە موبارەکە بە دوو جۆر ماناەکرێ:

أ- (إن) لابەرە (نافية) بێ و، (لمّا) بە مانای (إلاّ) بێ، بەمجۆرە: ( وَإِن كُلٌّ لَّمَّا جَمِيعٌ لَّدَيْنَا مُحْضَرُونَ): هیچ کامیان نیە، مەگەر وێکڕا لەلامان ئامادەکراو دەبن.

ب- (إن) (مخفّفة من المثقّلة) بۆ جەختکردنەوە، بەبەڵگەی هەبوونی (ل)ی سەر (لما) ئەگەر بە گیرەداریی (مُشدّد)ی نەخوێندرێتەوە، کە ئەو جۆرە خوێندنەوەیە شی هاتوە، یانی: بێگومان هەموویان وێکڕا، لەلامان ئامادە کراو دەبن.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِن كُلٌّ لَّمَّا جَمِيعٌ لَّدَيْنَا مُحْضَرُونَ ﴾، واتە: بە دڵنیایی هەموویان وێکڕا لەلامان ئامادە دەکرێن، (كُلٌّ) بۆ هەموویە، (جَمِيعٌ)یش بۆ وێکڕایە، جاری وایە هەموویان ئامادە دەکرێن، بەڵام نەك پێکەوە، بەڵام کە دەفەرموێ: (جَمِيعٌ)، واتە: پێکەوەش، هەموویان و پێکەوەش وێکڕا، لە لامان ئامادە دەکرێن، واتە: لە ئامادەکردنەکەیان لە کاتی جیاوازو، لە شوێنی جیاوازدا نابێ، بەڵکو وێکڕا دەبێ و لەیەك شوێن دا دەبێ، لەو شوێنەدا کە خوا ﷻ بۆی دیاریی کردوون.

هەڵبەتە لێرەدا خوا ﷻ بە گێڕانەوەی ئەو بەسەرهاتە، یاسایەکی گشتیی خۆی ڕادەگەیەنێ کە ئەو خەڵکەی، ئەو ئاوەدانییەی ئەو سێ پێغەمبەرەی بۆ چوون و پێیان بێبڕوا بوون و بڕوایان پێنەهێنان، پێویستی نەکرد خوا فریشتەیان بۆ دابەزێنێ، بەڵکو بە هاڕژن و چریکەیەك هەموویانی تەختکردن، هەروەها گەلانی دیکەش بە هەمان شێوە، دوایی دەفەرموێ: ﴿ يَٰحَسْرَةً عَلَى ٱلْعِبَادِ ﴾، ئەی داخ و خەفەت بۆ بەندەکان، ﴿ مَا يَأْتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴾،هیچ پێغەمبەرێکیان بۆ نەهاتوە، مەگەر گاڵتەیان پێکردوە، ﴿ أَلَمْ يَرَوْا۟ كَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّنَ ٱلْقُرُونِ ﴾، ئایا نەیانبینیوە لە پێش ئەوان دا چەندان سەدەمان فەوتاندوون، چەندان کۆمەڵگەمان فەوتاندوون: ﴿ أَنَّهُمْ إِلَيْهِمْ لَا يَرْجِعُونَ ﴾، کە بۆلایان ناگەڕێنەوەو هەموویان تێکڕاو وێکڕا، لەلامان ئامادە دەبن، کەواتە: بزانن هەمووتان ڕۆژێك دێ لە خزمەت خوا، لەو شوێنەدا کە خوا ﷻ بۆی دیاریی کردوون، کۆ دەکرێنەوە، ئنجا بزانن بە چ ڕوویەکەوە دەچنەوە خزمەت خوا!

کۆتایی تەفسیری ئەم ئایەتە موبارەکانە، بەم شیعرە دێنینەوە کە دەڵێ:

ولو أنّا إذا ما متْنا تُرِكْنا ... لَكَانَ المَوْتُ رَاحَةَ كُلِّ حَيٍّ

وَلكِنَّا إذا مِـتْنا بُعِثْـنا ... وَنُسْأَلُ بَعْدَهَا عَنْ كُلِّ شَيْءٍ.

واتــە: ئەگــەر ئێمــە کــە دەمردیــن، وازمــان لــێ هێندرابایــە، ئەوکاتــە مــردن ئاســوودەیی دەبــوو بــۆ هــەر زیندوویــەك، بــەڵام دوای ئــەوەی دەمریــن، زینــدوو دەکرێینــەوەو، دوای ئــەوەش لــە هەمــوو شــتێك لێمان دەپێچرێتــەوەو دەپرسرێتــەوە.

بــە تایبــەت بــۆ بابــای بێبــڕواو خراپــەکار، مــردن هــەر ئاواتێکــەو دەبــێ بیخــوازێ، وەك خــوای پــەروەردگار لــە ســوورەتی (النَّبَأ) ئایەتــی (٤٠)دا دەفەرمــوێ: ﴿ وَيَقُولُ ٱلْكَافِرُ يَٰلَيْتَنِي كُنتُ تُرَٰبًا ﴾، کافــر لــە ڕۆژی دواییــدا دەڵــێ: خۆزگــە گڵ بوومایــە، بێگومــان کــە بۆتــەوە خــۆڵ، ئەگــەر زینــدوو نەکرێتــەوە، زۆری قازانجــە، هەڵبەتــە بــڕواداران زەرەریانــە، بــەڵام بێبڕوایــان و خراپــەکاران زۆریــان قازانجــە، چونکــە تووشــی ســزا و جــەزرە بــە نابــن و تــازە دەڕۆن، بــەڵام بــۆ ئــەوان وانیــە، بەڵکــو زینــدوو دەکرێنــەوەو، لێیــان دەپرسرێتــەوەو، تووشــی ســزاو جەزرەبــەی خــواش دەبــن.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـە ئایەتەکانـی: (٣٣- ٤٧) دەگرێتـە خـۆی، واتـە: پـازدە (١٥) ئایـەت، کـە تێیـدا خـوا ژمارەیـەك لـە نیشـانەکانی پەروەردگارێتیـی و باڵادەسـتیی خـۆی، وەك بەڵگـە لەسـەر یەکتایـی لـە پەرسـتراوێتیی دا، هەروەهـا بەڵگـەش لەسـەر زیندووکرانـەوەو، هەبوونـی پاداشـت و سـزا، دەخاتـەڕوو، کـە دەتوانیـن بڵێیـن چـوار نیشـانەی سـەرەکیین:

١- زیندووکرانەوەی زەمین، بە ڕووەك و کشتوکاڵ و میوەجات و کانیی و سەرچاوەکان.

٢- بە دوای یەکداهاتنی شەوگارو ڕۆژگار، بەبێ ئەوەی لەو سیستمەی خوا بۆی داناون، لابدەن.

٣- خۆرو مانگ و، پاش و پێش نەکردنیان لەیەکدی و، سووڕانەوەی خۆرو مانگ و زەوی، هەر کامێکیان لە خولگەی خۆیدا.

٤- ڕەخسێنرانی کەشتیی نووح ﷺ، بۆ دەربازکردنی ئەو مرۆڤانەی کە لە خزمەت نووحدا بڕوایان هێنابوو، هەروەها سەرجەم کەشتیی و پاپۆڕەکانی دیکە، بۆ بارو سوارو گواستنەوەی مرۆڤەکان.

پاشـان باسـی هەڵوێسـتی خـراپ و کەللەڕەقانـەی بێبڕوایـان کـراوە، لـە بەرانبـەر قسـەی خێـرداو، لـە بەرانبـەر نیشـانەکانی خـواو ئایەتەکانیـداو، لـە بەرانبـەر ئامۆژگارییکرانیانـدا، بەبەخشـین، لـە پێنـاوی خـوا بەخشـەردا.

﴿ وَءَايَةٌ لَّهُمُ ٱلۡأَرۡضُ ٱلۡمَيۡتَةُ أَحۡيَيۡنَٰهَا وَأَخۡرَجۡنَا مِنۡهَا حَبّٗا فَمِنۡهُ يَأۡكُلُونَ ﴿٣٣﴾ وَجَعَلۡنَا فِيهَا جَنَّٰتٖ مِّن نَّخِيلٖ وَأَعۡنَٰبٖ وَفَجَّرۡنَا فِيهَا مِنَ ٱلۡعُيُونِ ﴿٣٤﴾ لِيَأۡكُلُواْ مِن ثَمَرِهِۦ وَمَا عَمِلَتۡهُ

أَيْدِيهِمْ أَفَلَا يَشْكُرُونَ ﴿٣٥﴾ سُبْحَٰنَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَزْوَٰجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلْأَرْضُ وَمِنْ أَنفُسِهِمْ وَمِمَّا لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٦﴾ وَءَايَةٌ لَّهُمُ ٱلَّيْلُ نَسْلَخُ مِنْهُ ٱلنَّهَارَ فَإِذَا هُم مُّظْلِمُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱلشَّمْسُ تَجْرِى لِمُسْتَقَرٍّ لَّهَا ۚ ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ﴿٣٨﴾ وَٱلْقَمَرَ قَدَّرْنَٰهُ مَنَازِلَ حَتَّىٰ عَادَ كَٱلْعُرْجُونِ ٱلْقَدِيمِ ﴿٣٩﴾ لَا ٱلشَّمْسُ يَنۢبَغِى لَهَآ أَن تُدْرِكَ ٱلْقَمَرَ وَلَا ٱلَّيْلُ سَابِقُ ٱلنَّهَارِ ۚ وَكُلٌّ فِى فَلَكٍ يَسْبَحُونَ ﴿٤٠﴾ وَءَايَةٌ لَّهُمْ أَنَّا حَمَلْنَا ذُرِّيَّتَهُمْ فِى ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ ﴿٤١﴾ وَخَلَقْنَا لَهُم مِّن مِّثْلِهِۦ مَا يَرْكَبُونَ ﴿٤٢﴾ وَإِن نَّشَأْ نُغْرِقْهُمْ فَلَا صَرِيخَ لَهُمْ وَلَا هُمْ يُنقَذُونَ ﴿٤٣﴾ إِلَّا رَحْمَةً مِّنَّا وَمَتَٰعًا إِلَىٰ حِينٍ ﴿٤٤﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّقُوا۟ مَا بَيْنَ أَيْدِيكُمْ وَمَا خَلْفَكُمْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٤٥﴾ وَمَا تَأْتِيهِم مِّنْ ءَايَةٍ مِّنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِمْ إِلَّا كَانُوا۟ عَنْهَا مُعْرِضِينَ ﴿٤٦﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ أَنفِقُوا۟ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَنُطْعِمُ مَن لَّوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ أَطْعَمَهُۥٓ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٤٧﴾ ﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{نیشانەیەکی دیکەش بۆ (بەرچاوڕوونیی و دڵنیایی) وان، (لە بارەی یەکتایی خواو زیندووکرانەوەیانەوە)، زەوی مردوویە، زیندوومان کردەوەو، دانەوێڵە (ی جۆراو جۆر)مان تێدا ڕواندوە، کە لێی دەخۆن ﴿٣٣﴾ هەروەها باخ و ڕەزە (جۆراو جۆرەکان)مان لە درەختەکانی خورماو ترێ تێدا (لە زەوییدا) ڕواندوون، لە کانیی و سەرچاوەکانیشمان تەقاندوونەوەو دەرهێناون ﴿٣٤﴾ تاکو لە بەروبەرهەمەکەی و، لەوەش کە بەدەستی خۆیان دەیکەن، {بەرهەمی دێنن و دروستیدەکەن} بخۆن ئایا هەر سوپاسگوزاریی (بۆ خوا) ناکەن؟ ﴿٣٥﴾ ئنجا پاکیی بۆ ئەو کەسەی کە هەموو جووتەکانی دروستکردوون، لەوەی زەوی دەیڕوێنێ و لە خۆیان، لەوەش کە نایزانن ﴿٣٦﴾ هەروەها نیشانەیەکی دیکەش بۆ ئەوان، شەوگارە، کە ڕۆژگاری

لێ دادەڕنین، یەکسەر دەکەونە تاریکاییەوە ﴿٣٧﴾ خۆریش (لە نیشانەکانی خوایە)، بەرەو مەنزڵگا (و جێژوان)ی خۆی دەڕوات، ئەوە ئەندازەگیریی (خوایی) زاڵی زانایە ﴿٣٨﴾ چەند شوێنێك، (مەنزڵگایەك)یشمان، بە ئەندازە بۆ مانگ داناون، تاکو (لە کۆتایی دا) وەك لقی (وشك و) چەماوەی هێشووی خورمای کۆنی لێدێ (وەك دەمە داسێك) ﴿٣٩﴾ نە خۆر بۆی دەلوێ بگاتە مانگ و، نە شەوگاریش پێش ڕۆژگار دەکەوێ، هەر کامێکیان لە سوورگەیەکی (تایبەت بە خۆیدا) مەلە دەکات (و هاتوچۆ دەکات) ﴿٤٠﴾ نیشانەیەکی دیکەش بۆ وان (لەسەر پەروەردگارێتیی خوا)، ئەوەیە کە (لە کاتی تۆفانی نووحدا)، وەچەکەیانمان لە کەشتییە پڕەکەدا هەڵگرت (و دەربازمان کردن لە تۆفانەکە) ﴿٤١﴾ هەروەها ئامرازی دیکەی وێنەی ئەو (کەشتییە)مان بۆ دروستکردوون، کە سواری بن (چ لە کەشتیی و پاپۆڕەکانی دەریا، چ لە هۆکارەکانی دیکەی بارو سواری وشکانیی) ﴿٤٢﴾ ئەگەر بشمانەوێ نغرۆیان دەکەین، ئنجا هیچ لە فریا هاتووێکیان نابێ، (کە نەهێڵێ نغرۆ بن و بکەونە پەلەقاژە)و، قوتاریش ناکرێن (دوای کەوتنە مەترسیی خنکانەوە) ﴿٤٣﴾ مەگەر بەهۆی بەزەییەکەوە لە ئێمەوەو، بۆ بەهرەمەند کردن (لە ژیانی دنیا) تاکو کاتێکی کەم ﴿٤٤﴾ ئەگەر پێشیان بگوترێ: (بە بێبڕوایان)، پارێز لەوە بکەن کە لە پێش دەستەکانتانەوەیەو لەدواتانەوەیە، بەڵکو بەزەییتان لەگەڵ بنوێنرێ (لە لایەن خواوە، گوێ بەو قسەیە نادەن) ﴿٤٥﴾ هیچ ئایەتێکیشیان بۆ نایەت لە ئایەتەکانی پەروەردگاریان، مەگەر پشتی تێدەکەن ﴿٤٦﴾ ئەگەر پێشیان بگوترێ: لەوەی خوا بژیوی داون، ببەخشن، ئەوانەی بێبڕوان بەوانەی بڕوایان هێناوە، دەڵێن: ئایا خۆراك بدەینە کەسێك، کە ئەگەر خوا ویستبای خۆراکی پێدەدا؟ ئێوە تەنیا لە گومڕاییەکی ئاشکرا دان ﴿٤٧﴾}.

## ڕوونکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(حَبًّا): (الحَبُّ وَالحَبَّةُ: يُقَالُ فِي الحِنْطَةِ وَالشَّعِيرِ ونَحوهِمَا مِنَ المَطْعُومَاتِ، وَالحِبُّ وَالحِبَّةُ فِي بُزُورِ الرَّيَاحِينْ)، وشەی (حَبّ) کە ناوی کۆیە، ناوی (جنس)ە، (حَبَّة) یانی: دەنك بۆ تاکێکە، ئەمە بۆ گەنم و جۆو وێنەی ئەوان، {نیسك، نۆك، ماش هەرزن و برنج و ... هتد} لە خواردەمەنییەکان بەکاردەهێندرێ، وشەی (حِبّ) ناوی کۆیەو (حِبَّة) ناوی تاکێکە، ئەویش هەر بە مانای دەنك دێ، بەڵام بۆ تۆوی سەوزەو گوڵ و گیاکان، بەکاردەهێنرێ.

(نَسْلَخُ): (السَّلْخُ: نَزْعُ جِلْدِ الحَيْوَانِ، وَسَلَخَ الشَّهْرُ وَانْسَلَخَ)، (سَلْخ) بریتیە لە کەوڵکردن، داڕنینی پێستی ئاژەڵ، {جەستەی ئاژەڵ کە لە نێو کەوڵەکەی دەهێنرێتە دەرێ، پێی دەگوترێ: کەوڵ کرا، کەوڵەکەی لێ داڕنرا} هەروەها وشەی (سَلْخُ)، بۆ تێپەڕینی مانگیش دەگوترێ، دەگوترێ (سَلَخَ الشَّهرُ) مانگەکە تێپەڕی، (وَانْسَلَخَ) ئەمیش (مطاوع)ی (سَلَخَ)یە، وەك (كَسَرتُ الزُّجَاجَةَ فَانْكَسَرَ)، شووشەکەم شکاند، شووشەکەش قبووڵی شکاندنی کرد، شکا.

(مُظْلِمُونَ): (أَظْلَمَ فُلَانٌ، حَصَلَ فِي ظُلْمَةٍ) فلانکەس چووە نێو تاریکیی، کەواتە: (مُظْلِمُونَ)، دەچنە نێو تاریکیی و تاریکییتان بەسەردا دێت.

(لِمُسْتَقَرٍّ لَّهَا): بەرەو شوێنێك کە لێی سەقامگیر دەبێ، دەگوترێ: (إِسْتَقَرَّ فُلَانٌ، إِذَا تَحَرَّى القَرَارَ، وَالمُسْتَقَرُّ: مَكَانُ القَرَارِ أَو زَمَانُهُ)، (إِسْتَقَرَّ فُلَانٌ)، کەسێك بخەفتێ لە شوێنێك کە لێی نیشتەجێ بێ، (مُسْتَقَرّ)، هەم بۆ شوێنی تێدا سەقامگیر بوون و، هەم بۆ کاتی تێدا سەقامگیر بوون و ڕاوەستان، بەکاردەهێنرێ.

(مَنَازِلَ): (جَمْعُ مَنْزِلَةٍ وَمَنْزِلٍ، وَالمَنْزِلَةُ: الرُّتْبَةُ، وَالمَنْزِلُ: المَسَارُ وَالمَدَارُ لِلْقَمَرِ)، (مَنَازِل) کۆی (مَنْزِلَة)یە یانی: پلەو پێگە، هەروەها کۆی (مَنْزِل)یشە، کە

بەکاردەهێنرێ بۆ ئەو قۆناغانەی مانگ پێیاندا تێدەپەڕێ، لە ماوەی مانگێکدا، واتە: (قَمَر) لە ماوەی مانگ (شهر)ێك دا پێیاندا تێپەڕ دەبێ.

کەواتە: (مَنْزِلَة) بەمانای پێگەو پلە دێ و (مَنْزِل)یش بە مانای ئەو سوڕگەیە دێ، یان ئەو شوێنانە دێ مانگ لە کاتی سووڕانەوەی خۆی بە دەوری زەویدا، کە بە مانگێك تەواوی دەکات، پێیاندا ڕەت دەبێ.

(كَٱلْعُرْجُونِ ): (وَالْعُرْجُونُ: الْعُودُ الَّذِي تُخْرِجُهُ النَّخْلَةُ فَيَكُونُ الثَّمَرُ فِي مُنْتَهَاهِ، وَهُوَ الَّذِي يَبْقَى مُتَّصِلًا بِالنَّخْلَةِ بَعْدَ قَطْعِ الْكِبَاسَةِ مِنْهُ، وَهِيَ مُجْتَمَعُ أَعْوَادِ التَّمْرِ)، (عُرْجُونٌ) واتە: لقە دارخورما، ئەوەی کە دارخورما دەری دەکات و هێشووە خورمایەکە لە کۆتاییەکەیدا دەبێ، دوای ئەوەی (كِباسة)ی لێ دەبڕدرێ، (كِباسة)ش ئەو بنك و شوێنەیەکە هێشووە خورمایەکانی پێوە پەیوەستن و لێی کۆدەبنەوە. واتە: (كِباسة) بریتیە لەو شوێنەی کە دوایی هێشووەکان لێی جیادەبنەوەو، ئەو هەر بە دارخورمایەکەوە دەمێنێتەوە.

(ٱلْقَدِيمِ ): (الْبَالِي)، کۆن، شتێك کاتی بەسەردا تێپەڕیبێ.

(تُدْرِكَ ): بیگاتێ، پێی بگات، (الإِدْرَاكُ وَاللَّحَاقُ: الْوُصُولُ إِلَى الْبُغْيَةِ)، (إِدْرَاك ولِحاق) بریتیە لە گەیشتن بەو شتەی بە نامانج گیراوە.

(فَلَكٍ ): (الْفَلَكُ: الدَّائِرَةُ الْمَفْرُوضَةُ فِي الْخَلَاءِ الْجَوِّيِّ لِسَيْرِ أَحَدِ الْكَوَاكِبِ، سَيْرًا مُطَّرِدًا لَا يَحِيدُ عَنْهُ)، وشەی: (فَلَك) بریتیە لەو بازنەیەی کە گریمانە کراوە [ئەگەرنا لە فەزادا سوڕگەکان شتێکی بەرجەستە نین، بەڵکو بە گریمانە دادەنرێن] لەو بازنە گریمانەیەی لە بۆشایی هەوادا دانراوەو گریمانە کراوە، بۆ ڕۆیشتنی یەکێك لە خڕۆکەکان بە شێوەیەکی بەردەوام کە لەو شوێنە لانەدات.

واتە: بۆ وێنە کە زەوی بە دەوری خۆردا دەخولێتەوە، ڕێو شوێنێك گریمانە کراوە، هەروەها مانگ کە بەدەوری زەویدا دەخولێتەوە، هەروەها خۆر کە بەدەوری دالی ڕاوەستاودا، دەخولێتەوەو هەتا کۆتایی.

(يَسْبَحُونَ): واتە: مەلە دەکەن، (سَبَحَ فِي الْمَاءِ، وَالْهَوَاءِ: جرى) (سَبَحَ) هەم بۆ نێو هەوا، هەم بۆ نێو ئاو، شتێك پێیدا بڕوا، پێی دەگوترێ (سَبَحَ)، واتە: ڕۆیشت.

(ذُرِّيَّتَهُمْ): ڕۆڵەکانیان، وەچەکەیان، (الذُّرِّيَّةُ: النَّسْل) وەچە، تۆرەمە.

یانی: ئەوانەی دوایی وەچەی مرۆڤایەتییان لێ پەیدابووە.

(ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ): (السَّفِينَة المَمْلُوئَة، وَالمَقْصُودُ بِهَا سفينة نُوحٍ)، کەشتییە پڕەکە، کە مەبەست پێی کەشتیی نووحە.

(صَرِيخَ): (وَالصَّرِيخُ: الصَّارِخُ وَهُوَ الْمُسْتَغِيثُ الْمُسْتَنجِدُ، جَاءَهُمُ الصَّرِيخُ، أَيِ الْمَنْكُوبُ الْمُسْتَنْجِدُ)[1]، (صَارِخٌ) کەسێکە هاوار دەکا، خەڵك لە فریای بێ و داوای یارمەتیی دەکا، هەروەها (صَرِيخٌ)یش بە هەمان شێوە، (فعيل و فاعل)، هەردووکیان یەك واتایان هەیە، (الْمَنْكُوبُ الْمُسْتَنْجِدُ)، بەڵالێدراوێکی هاوارکەر، کەواتە: ﴿فَلَا صَرِيخَ لَهُمْ﴾، کەسێك نیە هاواریان بۆ بکا، بۆ ئەوەی کەسێك لە فریایان بێ.

(يُنقَذُونَ): واتە: ڕزگار ناکرێن، دەرباز ناکرێن، (وَالْإِنْقَاذُ: الإِنْتِشَالُ مِنَ الْمَاءِ)[2] لێرەدا مەبەست پێی دەرهێنانەوەیە لە ناو، بۆ ئەوەی ئەو کەسە نەخنکێ.

---

(١) التحرير والتنوير: ج٢٢، ص٢٩.

(٢) هەمان سەرچاوە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خوا ﷻ لەم پازدە (١٥) ئایەتەی سوورەتی (یس)دا، ئایەتەکانی (٣٣- ٤٧)، لە زۆربەیاندا چەند بەڵگەو نیشانەیەکی دیکە، کە لە هەمان کاتدا نیعمەت و چاکەی خواشن لە ژیانی مرۆڤدا، وەك بەڵگە لەسەر یەکتایی و لەسەر سیفەت بەرزیی و پەروەردگارێتیی و مشوورخۆرێتیی خۆی، لە ژیانی مرۆڤدا، دەخاتە ڕوو.

سەرەتا باسی نشینگەکەمان (زەوی) دەکات و دەفەرموێ:

﴿ وَءَايَةٌ لَّهُمُ ٱلْأَرْضُ ٱلْمَيْتَةُ ﴾، نیشانەیەکی دیکە بۆ ئەوان، زەوی مردوویە، واتە: زەوییەکی وشك، زەوییەکی بێ ڕووەك، کە هیچ شیناوردی لەسەر نەماوە، ﴿ أَحْيَيْنَٰهَا ﴾، کە ئێمە ئەو زەوییە مردووە، ئەو زەوییە بێ شینایی و سەوزاییەمان زیندوو کردەوە، بە تەئکید بەوە کە خوا ﷻ لە ئاسمانەوە ئاوی دابەزاندۆتە سەری، لەشێوەی بەفرو باران و تەزرەدا، ﴿ وَأَخْرَجْنَا مِنْهَا حَبًّا فَمِنْهُ يَأْكُلُونَ ﴾، هەروەها دانەوێڵەیەکمان تێدا دەرهێناوە، کە لێی دەخۆن، وشەی (حبّ) دانەوێڵە، (حَبّ) ناوی کۆیە، تاکەکەی (حَبَّة)یە، واتە: دەنك، بەکوردیی دانەوێڵە دەگوترێ، ئنجا گەنمە، جۆیە، نیسکە، ماشە بە هەردوو جۆری سپیی و ڕەشیەوە، برنجە، هەرزنە، هەموو ئەو شتانەی دیکەیە کە مرۆڤ دەیانچێنێ، دوایی وەك زادو زەخیرە لێیان بەهرەمەند دەبێ، بۆیەش دەفەرموێ: ﴿ فَمِنْهُ يَأْكُلُونَ ﴾، لەو دانەوێڵەیە دەخۆن، ﴿ وَجَعَلْنَا فِيهَا جَنَّٰتٍ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَٰبٍ ﴾، هەروەها لە زەوییدا چەندان باخ لە دارخورماو ترێمان تێدا گێڕاون، ﴿ وَفَجَّرْنَا فِيهَا مِنَ ٱلْعُيُونِ ﴾، دیسان لە چەندان کانیی و سەرچاوەمان تێدا تەقاندوونەوە.

وشەی (تَفْجِير) لە قورئاندا کە بەکارهاتوە، کە لە سوورەتی (الإنسان)یشدا هاتوە، لە ئایەتی (٦)دا دەفەرموێ: ﴿ يُفَجِّرُونَهَا تَفْجِيرًا ﴾، بریتییە لە دەرقوڵینی ئاو

بە تەکان، کەواتە: ﴿وَفَجَّرْنَا فِيهَا مِنَ ٱلْعُيُونِ﴾، چەندان کانیی و سەرچاوەمان تێدا دەرقوڵاندوون لە زەوییدا، بۆچی؟

﴿لِيَأْكُلُواْ مِن ثَمَرِهِۦ وَمَا عَمِلَتْهُ أَيْدِيهِمْ﴾، ئەم (ل)ە دەگونجێ لامی هۆکار (لام العِلَة) بێ، یانی: بۆیە وامانکردوە، تاکو لە بەرو میوەکەی بخۆن و، لەوەی دەستەکانیشیان دروستی دەکەن، لە بەرهەمی ئەو دانەوێڵەو میوەجاتانە بخۆن، ﴿أَفَلَا يَشْكُرُونَ﴾، ئایا سوپاسگوزاریی ناکەن!

دەشگونجێ ئەم (ل)ە، (لام العَاقِبَة) لامی سەرەنجام، بێ، وەك لە سوورەتی (القصص)، خوا دەفەرموێ: ﴿فَٱلْتَقَطَهُۥٓ ءَالُ فِرْعَوْنَ لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوًّا وَحَزَنًا ⁽٨⁾﴾، دارو دەستەی فیرعەون و شوێنکەوتووانی ئەو تابووت و صندووقەی مووسای کۆرپەلەی تێدابوو، هەڵیانگرتەوە، تاکو سەرەنجام بۆیان ببێ بە دوژمن و مایەی خەم و خەفەت، بۆیەش دەگوترێ: (ل)ی (ليكون لهم عدواً وحزناً) (لام العَاقِبَة)یە، چونکە بە تەنکید فیرعەون و دارو دەستەکەی بۆ ئەوە هەڵیان نەگرتەوە، وای لێبێ، بەڵام سەرەنجامەکەی وای لێهات.

ئنجا لێرەش دیسان:

أ- دەگونجێ بڵێین: خوای پەروەردگار بۆیە ئەو شتانەی لە زەوییدا ڕواندن، تاکو خەڵك لێیان بخۆن، ڕاستەوخۆ لێیان بخۆن و، ئەوەی دەستیشیان دەستکاریی دەکات، لە بەرهەمی دانەوێڵەو میوەکان بخۆن.

ب- یاخود کە سەرەنجام وایان لێ دێ، سەرەنجام دەبنە شوێنی لێخواردن و لێ بەهرەمەند بوونی مرۆڤەکان، کە دەفەرموێ: ﴿مِن ثَمَرِهِۦ﴾، ڕاناوی (هـ)ی (ثمره) بۆ هەمووی دەگەڕێتەوە، چونکە (ثَمَر) واتە: بەرهەم و بەروبووم، هەم هی دانەوێڵە، هەم هی درەختەکانی میوە، هەر لە دارخورماوە بگرە تاکو ترێ، دارخورما بەرزترین درەختی میوەدارە، ترێش (مێویش) نزمترینیەتی، بۆیە بە زۆریی خوا ﷻ باسی خورما و ترێ دەکات، یانی: هەر لە بەرزترینیەوە تاکو نزمترینی و، ئەوەش کە لەو نێوانەدایە، وەك هەنارو خۆخ و قەیسی و هەنجیرو ... هتد.

﴿وَمَا عَمِلَتْهُ أَيْدِيهِمْ﴾، بە دوو شێوە مانا کراوە:

أ- ئەگەر (ما) (موصولة) بێ، واتە: ئەوەش کە بە دەستیان دروستی دەکەن، لە بەروبوومی دانەوێڵەو میوەکان، کە لە بەروبوومی دانەوێڵە، چەندان جۆرە کێك و شیرینیی دروست دەکرێ و، لە بەروبوومی میوەکانیش، دۆشاوە، سرکەیە، باسووقە، سجووقە، مێوژە، بە زۆر شێوە مرۆڤەکان دەستکاریی دەکەن و، بۆخۆشیان شتی لێ بەرهەم دێنن.

ب- ئەگەر (ما) لابەرە (نافیة) بێ، یانی: دەستەکانی خۆیشیان بەرهەمیان نەهێناوە.

﴿أَفَلَا يَشْكُرُونَ﴾، ئایا سوپاسگوزاریی ناکەن؟ واتە: ئەو هەموو چاکەو نیعمەتانەی خوا، خوازیاری ئەوەن کە مرۆڤەکان سوپاسگوزاریی بکەن بۆ خوا، نەك سپڵەو پێ نەزان بن بەرانبەر نیعمەتەکانی، سوپاسگوزارییش بۆ چاکەکانی خوا، بریتیە لە سێ شتان:

١- ئەو پەروەردگارە بپەرستن و، هاوبەشی بۆ دانەنێن.

٢- ئەو نیعمەتانەو چاکانە لەو بزانن.

٣- ئەو چاکانەو نیعمەتانە لە ڕەزامەندیی خواداو لە بەرژەوەندیی مرۆڤەکاندا، بەکاربێنن ڕەزامەندیی خواش لە خزمەتکردنی خەڵك دایە، بەڵام بە نیەتی ڕازیکردنی خواوە.

﴿سُبْحَانَ الَّذِي خَلَقَ الْأَزْوَاجَ كُلَّهَا﴾، پاکیی و بێ خەوشیی بۆ ئەو زاتەی، هەموو جووتەکانی دروستکردوون، وشەی (الْأَزْوَاجَ) کۆی (زَوْج)ە، بە مانای جووت، (زَوْج)یش هەر شتێکە لە وێنەی خۆی بەرانبەرێکی هەبێ، بۆیە بە جووتە پێڵاوێکیش دەگوترێ: (زَوْج)، هەر کامیان پێی دەگوترێ: (زَوْج)، بە ژن و پیاو بە هەرکامێکیان دەگوترێ (زَوْج)، هەروەها دەشگونجێ وشەی (أَزْوَاج)، بە مانای (أَصْنَاف) بێ، کە کۆی (صِنْف)ە، یانی: جۆر، واتە: پاکیی بۆ ئەو زاتەی جۆرەکانی دروستکردوون، هەموو جۆرەکان، ﴿مِمَّا تُنبِتُ الْأَرْضُ﴾، لەوەی زەوی دەیڕوێنێ، واتە: لە جۆری دانەوێڵەو، میوەو، سەوزەو، تەڕەکارو، هەموو

ئەوانەی کە زەوی دەیانڕوێنێ، ﴿ وَمِنْ أَنفُسِهِمْ ﴾، هەروەها لە خۆشیان، نێرو مێیان هەیە، مرۆڤەکان، ﴿ وَمِمَّا لَا يَعْلَمُونَ ﴾، دیسان لەوەش کە نایزانن، کە وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەکان دا باسی دەکەین، دەگونجێ ئاماژە بێ بۆ ساردیی و گەرمیی نێو گەردیلەو، دەگونجێ ئاماژە بێ بۆ زۆر شتی دیکە، کە لە داهاتوودا مرۆڤ کەشفیان بکات، وەك پێشتر نەشدەزانرا، لە نێو خشتی یەکەمی ماددەدا، کە گەردیلە (Atom)یە، بارگەی موجیب و سالیب، واتە: گەرم و سارد هەیە، کە بارگە گەرمەکە بریتیە لە پرۆتۆن(Proton)، لە نێوکی گەردیلەدا، هەڵبەتە نیوترۆنیش (Neutron) هەر لە نێوکی گەردیلەدایەو، بە هەردووکیان نێوك پێك دێنن، بەڵام نیوترۆن بێبارگە (مُحَايد)یە، بارگە سالیب و ساردەکەش بریتیە لە ئەلیکترۆن (Electron)، کە بە دەوری نێوکدا دەخولێتەوە، پێشتر ئەوە نەدەزانرا، ئێستا لە گەردیلەش دا جووت دۆزراوەتەوە، بەس خوا دەزانێ لە چەند جۆرەشتی دیکەش دا جووت هەیە، کە وەك خوا فەرموویەتی، ئەگەر زانست بەرەو پێشەوە بچێ، شتی دیکەش بدۆزنەوە، کە ئێستا مرۆڤەکان نایزانن، هەروەها ئەگەر تەماشای دروستکراوەکانی خواش بکەین، هەموویان جووتن: ساردو گەرم، تاریکیی و ڕووناکیی، سەرماو گەرما، ئاسمان و زەوی، هاوین و زستان، چاك و خراپ، شەڕو خێر، ڕاست و درۆ، زیانبەخش و سوودبەخش، دنیاو دواڕۆژ، بەهەشت و دۆزەخ، هەموو شتەکان بەرانبەر یەکن و جووتن، تەنیا خوا ﷻ تاکەو بێ هاوەڵ و بێ وێنەیە.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَءَايَةٌ لَّهُمُ ٱلَّيْلُ نَسْلَخُ مِنْهُ ٱلنَّهَارَ ﴾، نیشانەیەکی دیکە بۆ ئەوان، لەسەر پەروەردگارێتیی و مشورخۆرێتیی و یەکتایی خوا، بریتیە لە شەوگار کە ڕۆژگاری لێ دادەڕنین، واتە: شەوگار وەك کەوڵێکە کە ڕۆژگاری لێ دەردێنین، وەك چۆن جەستەی ئاژەڵێك لە دوای سەربڕینی، لە کەوڵەکەی دەردەهێنرێ، ئاوا ئێمەش ڕۆژگار لە شەوگار دەردەهێنین، ﴿ فَإِذَا هُم مُّظْلِمُونَ ﴾، شەوگار کە ڕۆژگاری لێ دەرهێنرا، ئەوان یەکسەر دەکەونە نێو تاریکیی، ئەمەش ئاماژەیەکی

زۆر زەقە، بەوە کە زەوی خڕو هێلکەییەو، شەوو ڕۆژ بەدوای یەکدا دێن لەسەر گۆی زەوی، شوێنێك کە ڕۆژی بێتێ، شەوی لێ لادەچێ و، شوێنێك کە شەوگاری بێتێ، ڕۆژگاری لێ لادەچێ، کە لێرەدا مەبەست لەوەیە، ڕۆژگار لادەبەین و شەوگار دێ و، دەکەونە نێو تاریکییەوە.

﴿ وَٱلشَّمۡسُ تَجۡرِي لِمُسۡتَقَرّٖ لَّهَاۚ ﴾، هەروەها نیشانەیەکی دیکە بۆ ئەوان بریتیە لە خۆر، کە دەڕوا بۆ نشینگەیەکی خۆی، بۆ شوێنێك کە لێی سەقامگیر دەبێ، یان کاتێك لێی سەقامگیر دەبێ، یان بۆ سەقامگیر بوون، یانی: وشەی (مُسْتَقَرّ)، دەگونجێ ناوی شوێن، یان ناوی کات بێ، دەشگونجێ چاوگ بێ، ﴿ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ﴾، ئا ئەوە ئەندازەگیریی کردنی (خوایەکی) باڵادەستی زانایە.

﴿ وَٱلۡقَمَرَ قَدَّرۡنَٰهُ مَنَازِلَ ﴾، هەروەها مانگیش یەکێکی دیکەیە لە نیشانەکانی خوا، کە چەند قۆناغمان بۆ ئەندازەگیریی کردوون، ﴿ حَتَّىٰ عَادَ كَٱلۡعُرۡجُونِ ٱلۡقَدِيمِ ﴾، تاکو لە کۆتایی مانگدا، وەك لقە دارخورمای وشکی لێهاتوە، کە کاتی بەسەردا چووە، یان وەك دەڵێن: (وەك دەمە داسێکی لێ دێتەوە)، ﴿ لَا ٱلشَّمۡسُ يَنۢبَغِي لَهَآ أَن تُدۡرِكَ ٱلۡقَمَرَ ﴾، نە خۆر بۆی هەیە بگاتە مانگ، ﴿ وَلَا ٱلَّيۡلُ سَابِقُ ٱلنَّهَارِۚ ﴾، نە شەوگاریش بۆی هەیە، پێش ڕۆژگار بکەوێتەوە، ﴿ وَكُلّٞ فِي فَلَكٖ يَسۡبَحُونَ ﴾، هەر کامیان لە سوڕگەیەکی تایبەتی خۆیدا مەلە دەکات، دێت و دەچێ، لێرەدا خوا ﷻ بە کۆ هێناویەتی، بەڵام تەنیا باسی دووانی کردوە: خۆرو مانگ، بەڵام لە میان دا (ضمناً) باسی زەوی کردوە، چونکە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا ٱلَّيۡلُ سَابِقُ ٱلنَّهَارِۚ ﴾، چونکە شەوگارو ڕۆژگار بەسەر زەویدا دێن، ئەمە ئاماژەیەکی پەنهانە بۆ زەویش، کە هەر کام لە خۆرو مانگ و زەوی، لە سوڕگەی تایبەتی خۆیاندا دەخولێنەوەو دێن و دەچن.

﴿ وَءَايَةٞ لَّهُمۡ أَنَّا حَمَلۡنَا ذُرِّيَّتَهُمۡ فِي ٱلۡفُلۡكِ ٱلۡمَشۡحُونِ ﴾، نیشانەیەکی دیکە بۆ ئەوان ئەوەیە، ئێمە کاتی خۆی وەچەی مرۆڤمان هەڵگرت، لە کەشتییە پڕەکەدا، (ذریتهم) وەچەی مرۆڤان، یانی: ئەوانەی دوایی وەچەی مرۆڤیان درێژە پێداو،

گەشەی مرۆڤیان لێکەوتەوە، چونکە وەك پێشتر باسمان کردوە، تۆفانەکەی نووح، یان هەموو دنیای گرتۆتەوە، یاخود ئەو شوێنەی کە مرۆڤی لێبوون، بەس لەو شوێنە مرۆڤ، هەبوون، هەمووی گرتۆتەوە، چونکە خوا ﷻ لە سوورەتی (الصَّافَات) ئایەتی (٧٧)دا دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُۥ هُمُ ٱلْبَاقِينَ ﴾، تەنیا وەچەکەی نووحمان هێشتەوە، کە دوایی لە تەفسیری سوورەتی (الصَّافَات)دا پێی دەگەین، چەمك و واتای ئەم ئایەتە ڕوون دەکەینەوە، گرنگ ئەوەیە تەنیا وەچەی نووح ماوەتەوە، کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿ حَمَلْنَا ذُرِّيَّتَهُمْ ﴾، واتە: ئەوانەی کە دوایی وەچەی مرۆڤیان لێ وەپاش کەوتوە، لە کەشتییە پڕەکدا هەڵمان گرتن، کە هەر ئەوانیش دوایی بوونە باب و باپیرانی ئەو مرۆڤانەی کە ئێستا لەسەر زەوین، چونکە خوا ﷻ بە تۆفانەکەی نووح، مرۆڤە بێبڕوایەکانی قڕەبڕ کردن و، تەنیا ئەوانە دەرباز بوون، کە لەگەڵ نووحدا سواری کەشتییەکەی بوون، ئەوانیش بڕواداران بوون.

﴿ وَخَلَقْنَا لَهُم مِّن مِّثْلِهِۦ مَا يَرْكَبُونَ ﴾، هەروەها لە وێنەی ئەویش [ئەو کەشتییەش] بۆمان دروستکردوون شتێك کە سواری بن، چ لە وشکانیی سواری بن، چ لە دەریادا، چ لە هەوادا، هەموویان دەگرێتەوە، چونکە هەندێك لە زانایان گوتوویانە: مەبەست پێی حوشترە، بە حوشتر گوتراوە: (سَفِينَةُ الصَّحـرَاء)، کەشتیی بیابان، بەڵام خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَخَلَقْنَا لَهُم مِّن مِّثْلِهِۦ ﴾، لە شێوەی ئەو کەشتییەدا، شتی دیکەشمان بۆ دروستکردوون، واتە: ئیلهاممان کردوون و یارمەتییمان داون و کەرەستەمان بۆ ڕەخساندوون، شتانێك کە سواریان بن، لە هەوادا سواریان بن، وەك جۆرەکانی فڕۆکەکان، لە دەریادا سواریان بن، وەك جۆرەکانی پاپۆڕەکان، پاپۆڕی ژێر دەریایی، پاپۆڕی سەر دەریایی، بەلەمەکان، هی گچکە، هی گەورە، هەروەها لەسەر زەوی و لە وشکانیی سواریان بن، وەك جۆرەکانی سەیارەو شەمەندەفەرو، هەموو ئەو ئامرازانەی کە مرۆڤ لێیان بەهرەمەند دەبێ، وێڕای ئەو ئاژەڵانەش کە هەن، وەك فیل و حوشتر و هێسترو کەر، هەموو ئەوانەی خەڵك بارو سواریان پێ دەکات.

﴿ وَإِن نَّشَأْ نُغْرِقْهُمْ فَلَا صَرِيخَ لَهُمْ وَلَا هُمْ يُنقَذُونَ ﴾، هەروەها ئەگەر بمانەوێ دەیانخنکێنین، نغرۆیان دەکەین، ﴿ فَلَا صَرِيخَ لَهُمْ ﴾، ئنجا کەس نیە هاواریان بۆ بکا، کەس نیە کە داوای یارمەتییان بۆ بکات، ﴿ وَلَا هُمْ يُنقَذُونَ ﴾، دەربازیش ناکرێن، واتە: نە کەس لە فریایان دێ و، نە کەس هاواریان بۆ دەکات و داوای یارمەتییان بۆ دەکات و، نە قوتاریش دەکرێن، ﴿ إِلَّا رَحْمَةً مِّنَّا وَمَتَاعًا إِلَىٰ حِينٍ ﴾، مەگەر بە هۆی بەزەییەکەوە لە ئێمەوەو، بەهرەمەند کردنێک تاکو کاتێکی دیاریکراو، کە بریتیە لەو ماوەیەی لە ژیانی دنیادا دەیگوزەرێنن، واتە: مەگەر بەهۆی بەزەیی ئێمەوە، بۆ ئەوەی ماوەی ژیانی دنیایان تێپەڕێنن، بە کارەساتی نێو دەریا، ژیانیان کۆتایی پێ نەیەت.

﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّقُوا مَا بَيْنَ أَيْدِيكُمْ وَمَا خَلْفَكُمْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴾، هەروەها ئەگەر پێیان بگوترێ: پارێز لەوە بکەن کە لە پێش دەستەکانتانەوەیەو، لە دواتانەوەیە، بەڵکو بەزەییتان لەگەڵ بنوێندرێ.

لە پێش دەستەکانتانەوەیە واتە: ئەوەی کە بەرەو رووی دەچن، کە ڕۆژی دواییەو، ئەوەی کە بەجێتان هێشتوە، ژیانی دنیایە، پارێزیان بکەن.

یاخود: بە پێچەوانەوە، ئەوەی لە دواتانەوەیە کە ڕۆژی دواییەو، ئەوەی لە پێش دەستتانەوەیە، کە ژیانی دنیایەو دەیدەنە بەر، پارێزی تێدا بکەن، هەم بۆ ڕۆژی دوایی، خۆتان ئامادە بکەن و پارێز بکەن، هەم بۆ ژیانی دنیا پارێز بکەن و بزانن چۆن دەژین، یاخود پارێز بکەن لەوەدا، کە لە پێشتانەو لە پشتتانەوە، واتە: لەو ژیانە دنیایەتان کە دەوری گرتوون، بەڵام پێش و دوای باسکردوە، ئەگەرنا ژیانی دنیا، مرۆڤ لە نێوی دایەو هەرچوار دەوری مرۆڤی گرتوە، بۆ ئەوەی بەزەییتان لەگەڵ دا بنوێنرێ، ئەگەر وایان پێ بگوترێ، وەڵامەکەی فرتێنراوە، لەبەرئەوەی بە سیاق دیارە، بابای بێبڕوا، کاتێ وای پێ بگوترێ، دیارە کەمتەرخەمیی دەکات و گوێ نادات و ڕەنگە گاڵتەش بکات.

﴿ وَمَا تَأْتِيهِم مِّنْ ءَايَةٍ مِّنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِمْ إِلَّا كَانُواْ عَنْهَا مُعْرِضِينَ ﴾، ئەمە وەڵامی ڕستەکەی پێشووشی تێدایە، دەفەرموێ: هیچ نیشانەیەك لە نیشانەکانی پەروەردگاریان بۆ نایەت، مەگەر پشتی تێدەکەن، ڕووی لێ وەردەگێرن، ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ أَنفِقُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ ﴾، هەروەها ئەگەر پێیان بگوترێ: لەوەی خوا وەك بژیو بە ئێوەی داوە، ببەخشن، واتە: بە هەژارو نەدارو خەڵکی ئاتاج، ﴿ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾، ئەوانەی بێبڕوان، بەوانە دەڵێن کە بڕوایان هێناوە، چونکە ئەوانەی پێیان دەڵێن: لە ڕێی خوادا، لەوەی خوا پێیداون ببەخشن، دیارە بڕوادارانن ئامۆژگارییان دەکەن، ئەوانەی بێبڕوان، بەوانەی بڕوادارن دەڵێن: ﴿ أَنُطْعِمُ مَن لَّوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ أَطْعَمَهُۥٓ ﴾، ئایا خواردن بدەین بە کەسێك، کە ئەگەر خوا ویستبای، خواردنی پێدەدا، ﴿ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴾، ئێوە تەنیا لە گومڕاییەکی ئاشکرا دان، یانی: ئەوە کاری خوایە، ئێمەی تێر کردووەو خەڵکێکیشی برسی کردوە، ئێمەی پڕ کردووەو، خەڵکێکیشی قڕ کردوە!!

بەڵام بەدڵنیایی ئەمە بوختانێکی گەورەیە بە خوا ﷻ بکرێ، کە بەداخەوە، وەك بیروبۆچوونێکی ئەفسانەیی، ئەو جۆرە بیرۆکانە لەنێو خەڵکدا هەن، کاتێك بنەماڵەیەك، حیزبێك، خەڵکێك خۆی دەسەپێنێ، بگوترێ: بڵێین چی؟ ئەوە قەدەری خوایە! یاخود: خوا بەردی گەورەو گچکەشی دروستکردوە! نایگێڕنەوە بۆ هەڵەو پەڵەی مرۆڤەکان، خوا ﷻ دەستی مرۆڤی لەسەر زەوی ئاوەڵا کردوە، دەستی مرۆڤی کردۆتەوە، چاکە دەکات، یان خراپە دەکات، ئایا چاکەو نیعمەتەکانی خوا، مرۆڤەکان بە یەکسانیی لێیان بەهرەمەند دەبن، یاخود قۆرخکاریی و گەندەڵییان تێدا دەکرێ، خوا ﷻ بە ئیرادەی تەکوینیی خۆی، دەستی مرۆڤی ئاوەڵا کردۆتەوە، بەڵام ئیرادە تەشریعییەکەی خوا وایە، کە دەبێ نیعمەتەکانی خوا هەموو مرۆڤەکان لێیان بەهرەمەند بن و، قۆرخکاریی و گەندەڵییان تێدا نەکرێ، خۆسەپاندن نەکرێ، خوا بە شەریعەتی خۆی ئەوەی ڕوونکردۆتەوە، بەڵام کاتێ مرۆڤ گوێ ناداتە شەریعەتی خواو، بەپێی تەبیعەتی لادەرانەی خۆی، بە پێی هەواو ئارەزووی خۆی، بەڕێوەدەچێ، نەك بەپێی هوداو بەرنامەی خوا، ئەو حاڵەتە نائاساییە لە کۆمەڵگادا دەبێ، کە هەندێك تێرو پڕو، ئەوانی دیکەش برسیی و قڕ دەبن.

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

**بەڵگەو نیشانەبوونی زیندووکرانەوەی زەوی وشك و ڕووتەن، بە ڕووەك و درەخت و، تەقاندنەوەی کانیی و سەرچاوەکان، کە دانەوێڵەو میوەو بەرهەمی جۆراوجۆریان لێ بەرهەم دێ، لەسەر پەروەردگاریێتیی و یەکتایی خوا لە پەرستراویی دا:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَءَايَةٌ لَّهُمُ ٱلْأَرْضُ ٱلْمَيْتَةُ أَحْيَيْنَٰهَا وَأَخْرَجْنَا مِنْهَا حَبًّا فَمِنْهُ يَأْكُلُونَ ﴿٣٣﴾ وَجَعَلْنَا فِيهَا جَنَّٰتٍ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَٰبٍ وَفَجَّرْنَا فِيهَا مِنَ ٱلْعُيُونِ ﴿٣٤﴾ لِيَأْكُلُوا۟ مِن ثَمَرِهِۦ وَمَا عَمِلَتْهُ أَيْدِيهِمْ ۖ أَفَلَا يَشْكُرُونَ ﴿٣٥﴾ سُبْحَٰنَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَزْوَٰجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلْأَرْضُ وَمِنْ أَنفُسِهِمْ وَمِمَّا لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە سێزدە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَءَايَةٌ لَّهُمُ ﴾ هەروەها نیشانەیەك بۆ وان (لە سەر پەروەردگاریێتیی و یەکتایی خوا). ئەم (و)ە، واوی بادانەوەو گێڕانەوە (عَاطفة)یە، ئەو شتانەی ئێستا باس دەکرێن، دەیانگێڕێتەوەو بایاندەداتەوە، بۆ سەر ئەو بەسەرهاتەی پێشتر باسکرا، بەسەرهاتی ئاوەدانییەکە، ﴿وَٱضْرِبْ لَهُم مَّثَلًا أَصْحَٰبَ ٱلْقَرْيَةِ ﴿١٣﴾ ﴾، واتە: وێڕای ئەو بەسەرهاتە، نیشانەیەکی دیکەش بۆ ئەوان هەیە، وەك چۆن دەستەڵاتی خوا، لە ناردنی ئەو سێ پێغەمبەرەدا، بۆ ئەو ئاوەدانییە، بەرجەستە بوو، کە دوایی خوا ﷻ خەڵکی ئەو شارو ئاوەدانییەی سزادا، لەسەر ئەوەی بەدەم بانگەوازی پێغەمبەرەکانیەوە نەچوون، بە هەمان شێوە نیشانەیەکی دیکە بۆ مرۆڤان، لەسەر ئەوە کە دنیا شاری بێ خاوەن نیەو، خوا ﷻ پەروەردگارو مشورخۆری ژیانی مرۆڤە، نیشانەیەکی دیکە بۆ ئەوان، بریتیە لە:

٢)- ﴿ٱلۡأَرۡضُ ٱلۡمَيۡتَةُ﴾، زەوی مردوو.

وشەی (ٱلۡمَيِّتَةُ) بە گیرە (شدّة)ش خوێندراوەتەوە، کە مەبەست لە مردنی زەوی، وشک هەڵاتنی زەوی و، ڕووتەن بوونیەتی، واتە: ڕووتەن بوونیەتی لە کشتوکاڵ و بەروبووم، ئایا خوا ئەو زەوییە مردووە چی لێ دەکات؟

٣)- ﴿أَحۡيَيۡنَٰهَا﴾، ژیاندمانەوە. مەبەست لە زیندووکردنەوەی زەوی، دەرهێنانی ڕووەك و شینا وردو، دارو درەخت و میوەجات و، هەموو ئەو شتانەیە کە لە زەوی دا دەڕوێن، ئایا خوای پەروەردگار زەوی بەچی زیندوو کردۆتەوە؟ لە شوێنی دیکەدا دەفەرموێ: ئاومان لەسەرێوە دابەزاندە سەری، لە شێوەی باران و بەفرو تەزرەداو، ئەو زەوییە قاقڕ و دێمەکارو وشك و ڕووتەنە، دوای ئەو ئاو داباراندنە، دەبینیی سەوز هەڵدەگەڕێ و بە پێی سروشتی ئەو زەوییە، هەموو جۆرەکانی سەوزەو دانەوێڵەو میوە، لەوێ دەڕوێن.

٤)- ﴿وَأَخۡرَجۡنَا مِنۡهَا حَبّٗا فَمِنۡهُ يَأۡكُلُونَ﴾، هەروەها دانەوێڵەیەکمان لێ دەرهێناوە، کە لێی دەخۆن، پێشتریش گوتمان: (حَبّ) ناوی کۆیەو تاکەکەی بریتیە لە (حَبَّة)، کە بۆ گەنم و جۆو هاووێنەکانیان بەکاردێ، یانی: دانەوێڵە، وەك: نیسك و نۆك و ماش و برنج و هەرزن و زوڕات، بۆ هەموو ئەوانە بەکاردێ، بەڵام تۆوی سەوزەو گوڵەکان و گیایەکان، (بذور الرّياحين) (حِبّ)ی بۆ بەکاردێ بۆ ناوی کۆی و بۆ تاکەکەشی (حِبَّة).

﴿فَمِنۡهُ يَأۡكُلُونَ﴾، لێرەدا (مِنۡهُ) کە (الجارّ والمجرور)ە و، پێش (يَأۡكُلُون) خراوە، لە ئەسڵ دا: (يَأۡكُلُون مِنۡهُ)یە، ئەمە بۆ گرنگیی پێدانە، واتە: مرۆڤەکان لە هەموو جۆرەکانی دانەوێڵە، دەخۆن، زانایانی ڕووەکناس دەڵێن: تەنیا گەنم سێهەزارو پێنجسەد (٣٥٠٠) جۆری هەیە، هەروەها (د. محمد راتب النابلسي) لە تەفسیرەکەی خۆی دا[1] دەڵێ:

مـن بە چاوی خۆم، دەنکە تۆیەکم بینیوە ڕواوەو، سی و پێنج (٣٥) گوڵە گەنمی دەرکردوە، لە هەر گوڵە گەنمێکدا (٥٠) دەنکی تێدا بووە، واتە: لە یەك دەنك گەنم (١٧٥٠) دەنك گەنم پەیدا بووە.

---

(١) تفسير النابلسي، ج٧، ص٤٧٢.

٥)- ﴿ وَجَعَلْنَا فِيهَا جَنَّٰتٍ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَٰبٍ ﴾، هەروەها لە زەوییدا چەندان باخمان داناون، لە دارخورمایەکان و ترێیەکان، (نخِيل) کۆی (نخلة)یەو (أَعْنَاب) کۆی (عِنَب)، بە مانای ترێ دێ، بەڵام بە مەعنای درەختەکەشی دێ، واتە: مێو، دارخورماو دارمێوەکانیشمان لە زەوییدا داناون، وەك پێشتر گوتمان، واتە: لە بەرزترین جۆری میوە، کە دارخورمایە، تاکو نزمترین جۆری، کە دارمێوەو لەسەر زەوی ڕادەخرێ، ڕواندوومانە.

٦)- ﴿ وَفَجَّرْنَا فِيهَا مِنَ ٱلْعُيُونِ ﴾، هەروەها لە زەوییدا لە کانیی و سەرچاوەکانیشمان تەقاندوونەوە، ڕاناوی (ها) کە لە: (فِيهَا)دایە:

أ- دەگونجێ بگەڕێتەوە بۆ (جَنَّات)، واتە: لەنێو ئەو باخی دارخورماو دار ترێیانەدا، کانیی و سەرچاوەکانیمان تەقاندوونەوە.

ب- دەشگونجێ بگەڕێتەوە بۆ زەوی (الأَرْض)، کە ئەوەی دووەمیان ڕاستترە، چونکە باس باسی زەوییە، لە زەوییدا کانیی و سەرچاوەکانیشمان تەقاندوونەوە.

٧)- ﴿ لِيَأْكُلُوا۟ مِن ثَمَرِهِۦ ﴾، تاکو لە میوەو بەرەکەی بخۆن، پێشتریش گوتمان: (ل)ی (ليأكلوا) یان بۆ هۆکارە، یان بۆ سەرەنجامە، واتە:

أ- بۆیە وامانکرد تاکو، لە بەرو میوەکەی بخۆن.

ب- یاخود بۆیە ئەوەمان ڕەخساند، تاکو سەرەنجام مرۆڤەکان لە بەرو میوەکەی بخۆن، واتە: لە بەرهەم و بەری ئەوەی باسمان کرد، لە بەرو میوەی ئەوەی پێشتر باسکراوە، بۆیەش دەفەرموێ: ﴿ ثَمَرِهِۦ ﴾، (أي: مِنْ ثَمَرِ المَذْكُورِ سَابِقاً)، کە هەم جۆرەکانی دانەوێڵە، هەم جۆرەکانی درەختی میوە، بە تایبەت دارخورما و ترێ، دەگرێتەوە.

٨)- ﴿ وَمَا عَمِلَتْهُ أَيْدِيهِمْ ﴾، هەروەها تاکو لە بەرهەمی ئەوەش بخۆن کە دەستەکانیان کردوویانەو، ئەنجامیان داوە.

﴿ وَمَا عَمِلَتْهُ أَيْدِيهِمْ ﴾، خوێنراویشەتەوە: (وَمَا عَمِلَتْ أَيْدِيهِم)، واتە: بەبێ ڕاناوی (ه)، ئەم ڕستەیەش دوو واتای هەن:

أ- وشەی (مَا) لێردا (إسم الموصول)ە، یانی: لەوەی کە دەستیشیان کردوویەتی، ئنجا لە دانەوێڵە دروستی دەکا، وەك جۆرەکانی کێك و شیرینیی، هەروەها لە میوەکان دروست دەکا، وەك: دۆشاوو سرکەو باسووق و سجووق و، هەموو ئەو شتانەی دیکە کە دروست دەکرێن، بە تایبەت لە خورماو ترێ.

ب- دەشگونجێ (مَا) لە: ﴿وَمَا عَمِلَتْهُ أَيْدِيهِمْ﴾، یانی: دەستەکانیان ئەوەیان بۆ نەهێنابوونە دی و ئەوەیان دروستنەکردوە، بەڵکو ئەوە خواپسکەو خوا بۆی دروست کردوون، بۆیە دەفەرموێ:

٩)- ﴿أَفَلَا يَشْكُرُونَ﴾، ئایا سوپاسگوزاریی ناکەن.

هەمزە (أ)ی سەر: ﴿أَفَلَا يَشْكُرُونَ﴾، هەمزەی پرسیارکردن (هَمْزَة الإِسْتِفْهَام)ە، بەلام پرسیارکردنی نکووڵییلێکەرانەیە، واتە: دەبووایە سوپاسگوزاریی بکەن، یانی: شتێکی بێ جێیە، کە سوپاسگوزاریی ناکەن، بۆیەش (يَشْكُرُونَ) ی بە (فِعْل المُضَارِع) هێناوە، چونکە دەلالەت لەسەر ئێستاو داهاتوو و لەسەر تازەبوونەوە دەکات، دیارە ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (النَّحل)دا، بە درێژیی لە بارەی خورماو ترێ و زەیتوونەوە، قسەمان کردوە، بۆیە لێرە هەروا بە خێرایی بەسەریان دا دەڕۆین، بەڵکو لە سوورەتی (النَّحل)دا، لە بارەی زۆر شتەوە، دواوین، لەبارەی بەرهەم و بەروبوومی ئاژەڵەوە، لە بارەی هەنگ و هەنگوین و باڵندەکان و، هەموو ئەو نازو نیعمەتانەوە کە خوا بۆ مرۆڤ ڕەخساندوونی، دواوین کە سوورەتی (النَّحل) سوورەتی باسکردنی نیعمەتەکانی خوای بەخشەرە، لەوێدا قسەی وردترو ڕوونترمان لەو بارەوە کردوە.

١٠)- ﴿سُبْحَانَ الَّذِي خَلَقَ الْأَزْوَاجَ كُلَّهَا﴾، پاکیی بۆ ئەو زاتەی، هەموو جووتەکانی دروستکردوون، یاخود هەموو جۆرەکانی دروستکردوون، (الْأَزْوَاجَ)، کە کۆی (زوج)ە، دەگونجێ بە مانای جووت بێ، دەشگونجێ بە مانای جۆر (صنف) بێ، لە قورئاندا بە هەردوو مانایەکە هاتوە، بەڵام بە پێی سیاق دیاریی دەکرێ و، لێرە وا پێدەچێ بە مانای جووت بێ.

١١)- ﴿مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلۡأَرۡضُ﴾، لەوەی کە زەوی دەیڕوێنێ، لەو جووتانە کە زەوی دەیانڕوێنێ، ئێستا زانست سەلماندوویەتی، وەك لە سوورەتی (الرّعد)دا باسمان کردوە، کە هەموو ڕووەکەکان جووتن، ئنجا هەیە نێرەو مێیەکەی لێك جیایەو، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَأَرۡسَلۡنَا ٱلرِّيَٰحَ لَوَٰقِحَ ﴿٢٢﴾﴾الحِجر، لە ئەنجامی بایەکان و، جموجۆڵی باڵندان و هەنگ و، مێش و مەگەزو پەپوولەکانەوە، تۆوی نێرەکە دەچێ بۆ سەر مێینەکە، هەشە دەبێ مرۆڤ بۆ خۆی تۆوی نێرینەکەی ببات بۆسەر مێینەکە، وەك دارخورما، بەڵام زۆربەی هەرە زۆری ڕووەکەکان، کە هەموویان جووتیان تێدایە، زۆربەی نێرو مێیەکەی لە نێو خۆیدایەو، پێویست ناکات بۆی بگوازرێتەوە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلۡأَرۡضُ﴾، لەوەی زەوی سەوزی دەکات و دەیڕوێنێ.

١٢)- ﴿وَمِنۡ أَنفُسِهِمۡ﴾، هەروەها لە خودی خۆشیان (نێرو مێیەکەیان دیارە).

١٣)- ﴿وَمِمَّا لَا يَعۡلَمُونَ﴾، هەروەها لەوەش کە نایزانن، کە خوا ﷻ لە سوورەتی (الذاريات) ئایەتی (٤٩)دا، دەفەرموێ: ﴿وَمِن كُلِّ شَيۡءٍ خَلَقۡنَا زَوۡجَيۡنِ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ﴾، لە هەر شتێك جووتمان دروستکردوە، یانی: دوو (زَوْج)مان دروستکردوە، لە زمانی کوردییدا ئەگەر گوتت: (زَوْج) واتە: دووان، بەڵام لە عەرەبییدا (زَوْج) بە مانای یەکە، بەڵام دەبێ لە شێوەی خۆی یەکێکی دیکەی هەبێ، خوا دەفەرموێ: وامانکردوە کە هەموو دروستکراوەکان دووانە بن، واتە: هەر کامێکیان هاوتایەکی دیکەی هەبێ، کە ئەمە - وەك پێشتر باسمان کرد - گەردیلەش دەگرێتەوە کە لە نێویدا بارگەی سالیب هەیە، کە ئەلیکترۆنەکانن و بە دەوری سورگەکەیدا دەخولێنەوەو، بارگەی موجیب هەیە، کە نێوکی گەردیلەیەو پرۆتۆنەو، نیوترۆنیش هەر لەگەڵیدایە، بەڵام بێ بارگەیەو، دەگونجێ ئەویش بڵێی جووتن، دەشگونجێ زانست پتر بەرەو پێشەوە بچێ و، چەندان جۆرە جووتی دیکەش، دووانەی دیکەش لە دروستکراوانی خوادا بدۆزرێنەوە.

شایانی باسە: ئێمە لە سەرەتای سوورەتی (الشُّعَرَاء)دا، بە درێژیی قسەمان لە بارەی جۆرەکانی ڕووەکەوە کردوە، لە زیاتر لە سی (٣٠) بڕگەدا، باسی ڕووەکمان کردوە، دارو درەخت و میوەو سەوزەو، دانەوێڵەو هەتا کۆتایی.

**مەسەلەی دووەم:**

**بەڵگەو نیشانە بوونی: شەوو ڕۆژو، مانگ و زەوی و، پاش و پێش نەکردنیان و، لە سوڕگەی خۆدا خولانەوەی هەر کامیان، لەسەر یەکتایی خواو زیندووکرانەوەی مردووان:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَءَايَةٌ لَّهُمُ ٱلَّيۡلُ نَسۡلَخُ مِنۡهُ ٱلنَّهَارَ فَإِذَا هُم مُّظۡلِمُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱلشَّمۡسُ تَجۡرِي لِمُسۡتَقَرّٖ لَّهَاۚ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ﴿٣٨﴾ وَٱلۡقَمَرَ قَدَّرۡنَٰهُ مَنَازِلَ حَتَّىٰ عَادَ كَٱلۡعُرۡجُونِ ٱلۡقَدِيمِ ﴿٣٩﴾ لَا ٱلشَّمۡسُ يَنۢبَغِي لَهَآ أَن تُدۡرِكَ ٱلۡقَمَرَ وَلَا ٱلَّيۡلُ سَابِقُ ٱلنَّهَارِۚ وَكُلّٞ فِي فَلَكٖ يَسۡبَحُونَ ﴿٤٠﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿ وَءَايَةٌ لَّهُمُ ٱلَّيۡلُ نَسۡلَخُ مِنۡهُ ٱلنَّهَارَ ﴾، نیشانەیەکی دیکەش بۆ ئەوان، شەوگارە ڕۆژگاری لێدادەڕنین، واتە: نیشانەو بەڵگەیەکی دیکەش بۆ وان، شەوە کە ڕۆژگاری لێدادەڕنین و کەوڵی دەکەین و دەیگرووین.

**(نَسۡلَخُ) (السَّلْخُ: نَزعُ جِلدِ الحَيَوَانِ)، (سَلْخ) بریتیە لە داڕنینی پێست لە جەستەی ئاژەڵ، (سِلْخ) یش یانی: (مَسْلوخ)، کەوڵکراو، واتە: نیشانەیەکی دیکە بۆ ئەوانە بریتیە لە شەوگار، لە حاڵێکدا کە ئێمە پەردەی ڕووناکیی لە سەر لادەبەین، دەمێنێتەوە تاریکییەکە، بێگومان ڕۆژگار بەسەر زەویدا دێ، لە ئەنجامی ئەوەدا کە زەوی ئەو ڕووەی دەکەوێتە بەرانبەری خۆرە، ڕووناك دادێ، ئنجا ڕووەکەی دیکەی پێویستیی بە هیچ ناکات و، هەر تیشکی ڕووناکیی نەگاتێ، بۆ خۆی تاریکە، بۆیە کە ڕووناکیی لە سەر لاچوو، بە شێوەیەکی ئاسایی، سەر زەویی تاریکە.**

**٢)-﴿ فَإِذَا هُم مُّظۡلِمُونَ ﴾، ئەوان کتوپڕ دەکەونە نێو تاریکییەوە، (أَظْلَمَ مِثْلُ أَصْبَحَ: أي دَخَلَ فِي الصُّبَاحِ، وَدَخَلَ فِي الظَّلَامِ)، (أَظْلَمَ)، واتە: چووە نێو تاریکییەوە، وەك (أَصْبَحَ) یانی: کەوتە نێو بەرەبەیانەوە.**

٣)- ﴿ وَٱلشَّمۡسُ تَجۡرِي لِمُسۡتَقَرّٖ لَّهَاۚ ﴾، (نیشانەیەکی دیکەش بۆ ئەوان، ئەوەیە کە) خۆریش، دەڕوات بۆ نیشینگەیەك کە بۆی دیارییکراوە (لە ڕووی کاتەوە، یان لە ڕووی شوێنەوە)یان: (مُسْتَقَرْ)، لێرەدا چاوگە، واتە: قەرارگرتنێك، سەقامگیربوونێك.

٤)- ﴿ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ﴾، ئا ئەوەش ئەندازەگیریی کردنی خوای زاڵی زانایە.

٥)- ﴿ وَٱلۡقَمَرَ قَدَّرۡنَٰهُ مَنَازِلَ ﴾، مانگیش چەند مەنزڵ و قۆناغمان بۆ دیارییکردوون، (مَنَازِلَ)، کۆی (منزلة)و (مَنزِلَ)ە، (منزلة) یانی: پلەو پێگە، (منزل)یش، یانی: قۆناغ و ێستگە، مانگ (قمر) بیست و هەشت (٢٨) مەنزڵی هەن، خۆر (شمس)یش دوازدە (١٢) بورجی هەن، لە هەرمانگەی هەر ساڵێکدا، دەکەوێتە نێو کەلوو (برج)ێك لەو دوازدە کەلووەوە، مانگیش (٢٨) مەنزڵی هەیە، لە سووڕانەوەی بە دەوری زەویدا، هەر شەوەی دەچێتە یەکێك لەو مەنزڵانەوەو، شەوێك، دوو شەویش، پەنهان دەبێت، دوایی سەرەتای مانگ دووبارە دەردەکەوێ، وەك دەمە داسێك.

٦)- ﴿ حَتَّىٰ عَادَ كَٱلۡعُرۡجُونِ ٱلۡقَدِيمِ ﴾، تاکو وەك لقە دارخورمای کۆنی لێهاتۆتەوە، لقە دارخورمای کۆن، کە وشك و باریك و کەوانە دەبێ، وەك دەمە داسێك.

٧)- ﴿ لَا ٱلشَّمۡسُ يَنۢبَغِي لَهَآ أَن تُدۡرِكَ ٱلۡقَمَرَ ﴾، نەخۆر بۆی هەیە بگاتەوە مانگ (لە ڕۆیشتن دا).

٨)- ﴿ وَلَا ٱلَّيۡلُ سَابِقُ ٱلنَّهَارِۚ ﴾، نە شەوگاریش پێشکەوتوویە لە ڕۆژگار، شەویش پێش ڕۆژگار ناکەوێتەوە.

٩)- ﴿ وَكُلّٞ فِي فَلَكٖ يَسۡبَحُونَ ﴾، هەرکامێکیان لە سوڕگەیەکی تایبەتی خۆیدا، مەلە دەکات و دەخولێتەوە. پێشتر گوتمان: (الفَلَكُ: الدَّائِرَةُ المفروضة فِي الْخَلَاءِ الْجَوِّيِّ لِسَيْرِ أَحَدِ الْكَوَاكِبِ سَيْرًا مُطَرِدًا)، یاخود (الفَلَك: مَجْرِى الكَواكِبُ)، (فَلَك)، بەو بازنە گریمانەییە دەگوترێ، کە لە بۆشایی هەوادا دیاریی دەکرێ، بۆ ڕۆیشتنی خڕۆکەو ئەستێرەکان، کەواتە: (فَلَك) شوێنی پێدا ڕۆیشتنی خڕۆکەکان و ئەستێرەکانە.

شایانی باسە: لە تەفسیری سوورەتی (یونُس)دا، باسێکی سەربەخۆمان لە بارەی گەردوونەوە کردوە، هەروەها لە سوورەتی (فصلت)یش دا، دیسان لە بارەی هەرکام لە: (خۆر) و (زەوی) و (مانگ)ەوە، باسێکی سەربەخۆو وردمان کردوە، بۆیە لێرە هەروا بە خێرایی بەسەریاندا ڕۆیشتین، بەڵام لێرەدا سەرنجتان بۆ چەند زانیارییەك ڕادەکێشم:

١)- (زەوی):

أ- بە خێرایی (٣٠) کم لە خولەکێکدا بە دەوری خۆیدا دەسووڕێتەوە.

ب- بە خێرایی (٣٠) کم لە چرکەیەکدا بە دەوری خۆردا دەخولێتەوە، واتە: (٦٠) هێندەی خێرایی سووڕانەوەی بەدەوری خۆیدا، بەدەوری خۆردا دەخولێتەوە.

٢)- (خۆر):

أ- بە خێرایی (٢٢٠) کم لە چرکەیەکدا بە دەوری چەقی کەهکەشاندا دەخولێتەوە.

ب- بە دەوری خۆیدا بە (٢٥) ڕۆژ جارێك، بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە، بە خێرایی (٢٠٠) کم لە چرکەیەکدا.

٣)- (کەهکەشان):

خۆری ئێمە بە هەر نۆ خڕۆکەکەیەوە، ئەستێرەیەکە لە ئەستێرەکانی کەهکەشانی (کاکێشان)، کە بە مەزەندە یەك تریلیۆن، واتە: (١٠٠٠) ملیار ئەستێرەی وەك خۆری ئێمە گەورەتر یان گچکەتر لە کەهکەشاندا هەیە، کەهکەشانی کاکێشان، (مجرة درب التبّان)، درێژییەکەی (١٥٠) هەزار ساڵی تیشکییە، کەچی تیشك بە سێزدە (١٣) سەعات ئنجا لە کەهکەشانەکەمانەوە دەگاتە ئێمە، تیشکیش لە هەر چرکەیەکدا (٣٠٠٠٠٠) کم دەبڕێ.

٤)- ئەستێرەیەك بە ناوی: (Vycanis Magoris)، پێنج هەزار (٥٠٠٠) ساڵی تیشکیی لە زەوییەوە دوورە، دوو هەزارو سەد (٢١٠٠) جار لە خۆر گەورەترە.

٥- خۆریش بە مەزەندە تەمەنی پێنج ملیار (٥٠٠٠٠٠٠٠٠٠) ساڵ و، هەندێکیش دەڵێن: (٦) ملیارو (٤٠٠) ملیۆن ساڵەو، ئێستا لە نیوەی تەمەنیدایەو، بە مەزەندە بایی (٥) ملیار ساڵی دیکە، تیشکی پێ ماوە، ئەگەر گریمان خوا بیهێڵێتەوە!

**مەسەلەی سێیەم:**

**هەروەها دەربازکرانی وەچەی ئادەمیش لە کەشتییە پڕەکەی نووح داو، ڕەخسێنرانی هۆکاری دیکەی بارو سواریی بۆ مرۆڤان، دیسان نیشانەی دیکەی گەورەو گرنگن، لەسەر یەکتایی خواو، پەروەردگارێتیی و مشوورخۆرێتیی خوا، هەروەها لەسەر توانادار بوونی خوا، بۆ زیندوو کردنەوەو لێپرسینەوەی مرۆڤەکان:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَءَايَةٌ لَّهُمْ أَنَّا حَمَلْنَا ذُرِّيَّتَهُمْ فِي ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ ﴿٤١﴾ وَخَلَقْنَا لَهُم مِّن مِّثْلِهِۦ مَا يَرْكَبُونَ ﴿٤٢﴾ وَإِن نَّشَأْ نُغْرِقْهُمْ فَلَا صَرِيخَ لَهُمْ وَلَا هُمْ يُنقَذُونَ ﴿٤٣﴾ إِلَّا رَحْمَةً مِّنَّا وَمَتَٰعًا إِلَىٰ حِينٍ ﴿٤٤﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿وَءَايَةٌ لَّهُمْ﴾، نیشانەیەکی دیکەش بۆ ئەوان.

یانی: بۆ مرۆڤەکان، بە مسوڵمان و نامسوڵمانیانەوە، مسوڵمان بۆ ئەوەی بڕوایان زیاتر دابمەزرێ، بە تەئکید مسوڵمانان تاکو زیاتر لە کتێبی بینراوی خوا، تێبگەن و بە نهێنییەکانی ئاشنا بن، خاوەن و بەدیهێنەرو دانەری ئەو کتێبە، کە خوای بەرزی مەزنە، باشتر دەناسن، دیسان نامسوڵمانانیش، ئەگەر بێت و باش سەرنجی کتێبی بینراوی خوا بدەن، وێڕای کتێبی خوێنراوەی، کە قورئانە، بەدڵنیایی لە ڕێی ئەو دوو کتێبەوە {دروستکراوی خواو فەرمایشتەکەی} ئاشنایەتیی زیاترو قووڵترو چاکتر، بە خوای خاوەنی خۆیان پەیدا دەکەن.

٢)- ﴿أَنَّا حَمَلْنَا ذُرِّيَّتَهُمْ فِي ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ﴾، {نیشانەو بەڵگەیەکی دیکە بۆیان} ئەوەیە کە ئێمە وەچەی ئەوانمان، ئەوەی مرۆڤانمان، لە کەشتییە پڕەکەدا هەڵگرت، وشەی: ﴿ذُرِّيَّتَهُمْ﴾، خوێندراویشەتەوە: (ذُرِّيَّاتِهِم)، وەچەکانیان، ئنجا بە مسۆگەرییش -

بەڕای من - مەبەست لە: ﴿ٱلۡفُلۡكِ ٱلۡمَشۡحُونِ﴾، کەشتییە پڕەکە، کەشتیی نووحە ﷺ بەبەڵگەی ئەوە:

أ- کە لە سوورەتی (الشُّعَرَاء) ئایەتی (١١٩)دا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿فَأَنجَيۡنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ فِي ٱلۡفُلۡكِ ٱلۡمَشۡحُونِ﴾، خۆی و ئەوانەی لەگەڵیبوون، {نووح و ئەوانەی لەگەڵیبوون} لە کەشتییە پڕەکەدا هەڵمان گرتن.

ب- هەروەها بەبەڵگەی ئەوەش کە هەڵگیرانی هەمووان بەس لە کەشتییەکەی نووح دابووە، ئەگەرنا زۆر کەس سواریی کەشتیی هەرنەبووە، بەتایبەت دوێنراوانی یەکەم - کە گەلی عەرەبن -.

وەك سەرنجێك دەڵێم: (محمد الطاهر بن عاشور) لە تەفسیرەکەی خۆی (التحرير و التنوير)دا دەڵێ: (وَلَمْ يُوصَفْ غَيْرُ فُلْكِ نُوحٍ بِهَذا الوَصْف)، تەنیا کەشتییەکەی نووح بەو شێوەیە وەسف کراوە: ﴿ٱلۡفُلۡكِ ٱلۡمَشۡحُونِ﴾، بەڵام لەوەدا نەیپێکاوە، چونکە لە سوورەتی (الصَّافَات)دا، ئەو کەشتییەش کە (يونُس) سواریی بووە، هەر بە: ﴿ٱلۡفُلۡكِ ٱلۡمَشۡحُونِ﴾، هاتووە، وەك خوا لە ئایەتی (١٤٠)ی سوورەتی (الصَّافَات)دا دەفەرموێ: ﴿إِذۡ أَبَقَ إِلَى ٱلۡفُلۡكِ ٱلۡمَشۡحُونِ﴾، کاتێك کە دوورکەوتەوە لە خەڵکەکەی و ڕایکرد بۆ نێو کەشتییە پڕەکە.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿أَنَّا حَمَلۡنَا ذُرِّيَّتَهُمۡ فِي ٱلۡفُلۡكِ ٱلۡمَشۡحُونِ﴾، نیشانەیەکی دیکە بۆ ئەوان، ئەوەیەکە وەچەکانی ئەوانمان لە کەشتییە پڕەکەدا هەڵگرتوون.

(جمال الدين القاسمي) لە تەفسیرەکەیدا[1] ئەو ڕستەیەی بە دوو مانایان لێکداوەتەوە:

یەکەم: (حَمَلْنَا أَوْلَادَهُمْ الَّذِيْنَ يُرْسِلُونَهُمْ فِي تِجَارَاتِهِمْ فِي الْفُلْكِ الْمَشْحُونِ)، واتە: ڕۆڵەکانیان کە دەیاننێرن بۆ بازرگانیی و سەوداو مامەڵەکانیان، لە کەشتیی پڕدا، هەڵمانگرتوون.

---

(١) محاسن التأويل: ج١٤، ص٧٥،٧٦.

یانی: مەبەست لە کەشتییە پڕەکە، کەشتیی نووح نیە، بەڵکو: ﴿ ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ ﴾، کە (أل)ی ناساندن (تعریف)ی لە سەرە، ناساندنەکە بۆ تێکڕا (جِنس) یە، یانی: هەموو ئەو کەشتییانەی پڕ دەکرێن لە خەڵك و کەل و پەل و بار.

دووەم: (حَمَلْنَا آبَاءَهم الأَقْدَمِينَ الَّذِيْنَ بِهِمِ بَقَاءُ النَّوْعِ الإِنْسَانِيِّ فِي الْفُلْكِ الْمَشْحُونِ)، واتە: ئەو باب و باپیرانەی کە بە هۆی ئەوانەوە، وەچەی مرۆڤان بەردەوام بووە، لە کەشتییە پڕەکەی نووحدا هەڵمان گرتوون.

ئنجا هەرچەندە مانای یەکەمیشیان تاڕاددەیەك ڕێی تێدەچێ، بەڵام لەبەر ئەو دوو بەڵگەیەی پێشتر هێنامنەوە، مانای دووەمیانم بەلاوە ڕاست و پەسندە.

٣)- ﴿ وَخَلَقْنَا لَهُم مِّن مِّثْلِهِۦ مَا يَرْكَبُونَ ﴾، هەروەها لە وێنەی ئەو (کەشتییە پڕ)ەدا، شتی وامان بۆ ڕەخساندوون کە سواری بن، چ مەبەست پێی کەشتییەکەی نووح بێ، کە ئەو مانایەمان پێ ڕاستە، چ مەبەست ئەو کەشتییانە بێ، کە مرۆڤەکان بارو سواریان پێدەکەن بە دەریادا، لە وێنەی ئەوەش، شتی وامان بۆ ڕەخساندوون، بۆ هێناونە دی، کە سواری بن، زۆربەی مانا لێکدەرەوانی قورئان گوتوویانە: مەبەست لێرەدا حوشترەکانن (الرَّوَاحِل، لأنَّهَا سَفَائِنُ الْبَرِّ)، وەك چۆن کەشتییەکان، هۆکارو ئامرازی بارو سواریین لە دەریادا، وشترەکانیش، هۆکارو ئامرازی بارو سوارییِن لەسەر وشکانیی، بەڵام بێگومان ئەگەر بۆ بابایەکی عەرەب لە بیابانێکدا، ئەو شێوە تێگەیشتنە هەبێ، لەبەر ئەوەی هەر ئەوەندە دەزانێ، دەگونجێ، بەڵام نابێ چەمکی ئایەتەکە، تێگەیشتنێکی جوگرافییانەی تەسکمان بۆی هەبێ و، نابێ تێگەیشتنێکی بیابانییانەمان بۆی هەبێ، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَخَلَقْنَا لَهُم مِّن مِّثْلِهِۦ ﴾، لەوێنەی ئەوەش {کەشتییەك کە لە دەریادا بارو سواری پێدەکەن} شتی وامان بۆ ڕەخساندوون کە سواری بن، ئنجا لە وێنەی ئەوە، چ لە هەوادا، کە جۆرەکانی فڕۆکەو باڵۆن و ... هتد دەگرێتەوە، چ لە دەریادا، کە جۆرەکانی دیکەی کەشتیی و پاپۆڕو غەواصە دەگرێتەوە، چ لەسەر وشکانیی کە ئۆتۆمۆبێل و شەمەندەفەرو، هەموو ئەو هۆکارانەی دیکەی بارو سواریی دەگرێتەوە.

٤)- ﴿وَإِن نَّشَأْ نُغْرِقْهُمْ﴾، ئەگەر بشمانەوێ نغرۆیان دەکەین، دەیانخنکێنین لە دەریادا.

٥)- ﴿فَلَا صَرِيخَ لَهُمْ﴾، هیچکەس لە فریایان نایەت، یاخود هیچکەس هاواریان بۆ ناکات.

وشەی (صَرِيخَ)، توێژەرەوانی قورئان هەندێکیان دەڵێن: (فَعِيْل)ی بە مانای (فاعل)ە، یانی (الصَارِخ: وَهُوَ المُستَغِيثُ المُستَنجِد)، (صارخ) بریتیە لە کەسێك کە هاوار دەکات و، داوای یارمەتیی و کۆمەك لە کەسێکی دیکە دەکات، بەڵام وشەی (صَرِيخَ)، وەك لێکۆڵەرەوان و قووڵبووەوان لە زمانی عەرەبییدا گوتوویانە: سێ واتایان هەڵدەگرێ:

١- بە مانای (مُغِيْث) دێ، واتە: کەسێك کە دەفریای کەسێك دێ، واتە: فریادڕەس، دەفریاکەوتوو.

٢- بە مانای (مُسْتَغِيْث)یش دێ، واتە: داوای یارمەتییکردوو، هاوارکەر لە خەڵك بۆ کۆمەکیی.

٣- بە مانای خودی هاوارکردن و هاوار تێبەستنیش دێ.

کەواتە: ﴿فَلَا صَرِيخَ لَهُمْ﴾، (أي: لَا مُغِيْثَ لَهُمْ أولاً، ولَا مُسْتَغِيثَ لَهُم، ثانياً، ولَا إسْتِغَاثة لهم ثالثاً) واتە: نەهاوارکەریان هەیەو، نە لەفریاهاتوویان هەیەو، نە هاوار تێبەستنیشیان هەیە، چونکە وشەی (صَرِيخ)، وەك چۆن بەمانای (مُغِيْث ومُستَغيث) دێ، بەمانای (صُراخ)یش دێ، کە چاوگ (مصدر)ە، یانی: هاوار تێبەستن.

٦)- ﴿وَلَا هُمْ يُنقَذُونَ﴾، هەروەها ئەوان قوتاریش ناکرێن. یانی: نە کەس لە فریایان دێ، نە کەس هاواریان بۆ دەکات، نە هاوار کردن و هاوار تێبەستنیان بۆ هەیەو، دەربازیش ناکرێن.

٧)- ﴿إِلَّا رَحْمَةً مِّنَّا﴾، مەگەر بەزەییەك لە لایەنی ئێمەوە، زانایان دەڵێن: ئەم هەڵاواردن (إستثناء)ە، لە جۆری دابڕاو (مُنقَطِع)ە، چونکە: (فَإِنَّ الرَّحْمَةَ لَيْسَ مِنَ الصَّرِيْخِ، وَلَا مِنَ المُنْقِذِ، وَإِنَّمَا هِيَ إسْعَافُ اللهِ تَعَالَى إِيَّاهُمْ بِسُكُون البَحْر)، چونکە بەزەیی خوا بەشێك

نیە لە فریاهاتن و، بەشێك نیە لە هاوار تێبەستن {یاخود دەرباز کردن} بەڵکو ئەوە لە فریاکەوتنی خوای بەرزە بۆ ئەوان، کە دەریایەکە ڕابگرێ و، تۆفانی دەریا بوەستێنێ و دەرباز بن.

٨)- ﴿ وَمَتَٰعًا إِلَىٰ حِينٍ ﴾، هەروەها بەهرەمەند کردنێك تاکو کاتێکی دیارییکراو، کە مەبەست پێی بەهرەمەند کردنیانە لە ژیانی دنیا، تاکو ئەوەندە ژیانە ئاساییەی ماویانە، لەسەر زەوی دەیگوزەرێنن، نەك لە دەریادا بخنکێنن، ﴿ وَمَتَٰعًا إِلَىٰ حِينٍ ﴾، (أي: **تَمْتِيعاً إِلى أَجَلٍ مَعْلُوم**)، بەهرەمەند کردنیان تاکو کاتێکی دیارییکراوو زانراو، کە تەواوکردنی تەمەنی ئاساییانە.

کەواتـە: ﴿ إِلَّا رَحْمَةً مِّنَّا وَمَتَٰعًا إِلَىٰ حِينٍ ﴾، (أي: **وَلَاهُـمْ يُنقَـذُونَ، لَكِـنْ رَحِمْنَاهُـمْ، وَمَتَّعْنَاهُـمْ إِلى زَمَـن قُـدِّرَ لَهُمْ**)، یـانی: دەربازیـش ناکرێـن، بـەڵام ئێمـە بەزەییـمان پێیان دا دێ و، تاکـو کاتـێ کـە بۆیـان ئەندازەگیریـی کـراوە، ژیانـە دنیاییـەکان بگوزەرێـنـن.

**مەسەلەی چوارەم و کۆتایی:**

**بێباکیی بێبڕوایان لە سزاو جەزرەبەکانی خواو، پشت هەڵکردنیان لە ئایەتەکانی خواو، سەفسەتەکردنیان لە کاتی ئامۆژگاریی کرانیاندا، کە هاوکاریی ناتاجان بکەن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّقُوا مَا بَيْنَ أَيْدِيكُمْ وَمَا خَلْفَكُمْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٤٥﴾ وَمَا تَأْتِيهِم مِّنْ آيَةٍ مِّنْ آيَاتِ رَبِّهِمْ إِلَّا كَانُوا عَنْهَا مُعْرِضِينَ ﴿٤٦﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ أَنفِقُوا مِمَّا رَزَقَكُمُ اللَّهُ قَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِلَّذِينَ آمَنُوا أَنُطْعِمُ مَن لَّوْ يَشَاءُ اللَّهُ أَطْعَمَهُ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴿٤٧﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّقُوا مَا بَيْنَ أَيْدِيكُمْ وَمَا خَلْفَكُمْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴾، هەروەها ئەگەر پێیان بگوترێ: پارێز لەوە بکەن، کە لە پێش دەستەکانتانەوەیەو لە دواتانەوەیە، بەڵکو بەزەییتان لەگەڵ دا بنوێنرێ.

وەڵامەکەی قرتێنراوە، واتە: ئەگەر وایان پێ بگوترێ، پشت هەڵدەکەن و لاملێی و سەرپێچیی دەکەن، یاخود گاڵتە دەکەن بە کەسێك، کە ئاوایان پێ بڵێ.

ڕستەی: ﴿ مَا بَيْنَ أَيْدِيكُمْ وَمَا خَلْفَكُمْ ﴾، زانایان چەند واتایەکیان بۆ لێکداونەوە:

یەکەم: ﴿ مَا بَيْنَ أَيْدِيكُمْ ﴾ ئەو سزادانانەی ڕابردوون بۆ کۆمەڵە بەدرۆ دانەرەکانی پێغەمبەران ﷺ، ﴿ وَمَا خَلْفَكُمْ ﴾، ئەوەی لە پشتتانەوەیەو چاوەڕێتان دەکات، لە سزای ئامادەکراوی ڕۆژی دوایی.

دووەم: ﴿ مَا بَيْنَ أَيْدِيكُمْ ﴾، ئەوەی لە سزای دنیا لە پێشتانەوەیە، ﴿ وَمَا خَلْفَكُمْ ﴾، ئەوەی لە سزای ڕۆژی دوایی کە لە دواتانەوەیە، یاخود بە پێچەوانەوە: ﴿ مَا بَيْنَ

أَيْدِيكُمْ ﴾، ئەوەی کە لە پێشتانەوەیە لە سزای ڕۆژی دوایی و بەرەو ڕووی دەچن، ﴿ وَمَا خَلْفَكُمْ ﴾، سزای دنیا کە لە پشتتانەوەیە.

سێیەم: ﴿ مَا بَيْنَ أَيْدِيكُمْ ﴾، لەو گوناهانەتان کە پێشتانخستوون، ﴿ وَمَا خَلْفَكُمْ ﴾ ئەو گوناهانەتان کە دواتانخستوون، واتە: سەرپێچیی و گوناهەکانتان کە پێشتانخستوون و، ئەو ئەرکە شەرعییانەی کە دواتانخستوون و ئەنجامتان نەداون.

﴿ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴾، (تَسْتَحِقُّون الرَّحْمَةَ بِسَبَبِ التَّقْوَى)، کە بەزەییتان لەگەڵ بنوێندرێ، واتە: شایستەی ئەوە بن کە خوا بەزەییتان لەگەڵ بنوێنێ، بە هۆی پارێزکارییەوە، کە وەڵامەکەی قرتێنراوە، لەبەر ئەوەی ڕەوتەکە دەیگەیەنێ، زۆرجاران خوا ﷻ وەڵامی قسەیەك دەقرتێنێ، لەبەر ئەوەی بە سەلیقەو سیاق دیارە، یان لەبەر ئەوەی زەین بۆ زۆر شت بچێ و، ماناو چەمکەکەی فراوانتر بێ.

٢)- ﴿ وَمَا تَأْتِيهِم مِّنْ ءَايَةٍ مِّنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِمْ إِلَّا كَانُوا۟ عَنْهَا مُعْرِضِينَ ﴾، هیچ نیشانەیەك لە نیشانەکانی پەروەردگاریشیان بۆ نایەت، مەگەر ئەوان پشتی تێدەکن و، ڕووی لێ وەردەچەرخێنن.

ئەم ڕستەیە، وەڵامی ئەوەی پێشێشی تێدایە، کەواتە: ئەگەر پێشیان بگوترێ: پارێز بکەن لەوەی لە پێش دەستتان و لە دواتانەوەیە، هەر هەڵوێستەکەیان بریتییە لە پشتهەڵکردن و، ڕوو لێ وەچەرخاندن.

وشەی: (آیة) کە بە (آیات) کۆدەکرێتەوە، پێشتریش زۆر جاران گوتوومانە: لە قورئاندا بە سێ مانایان دێ:

أ- بە مانای ڕستەکانی قورئان، یان: ڕستەکانی فەرمایشتەکانی خوا قورئان و کتێبەکانی دیکەش.

ب- بە مانای ئەو موعجیزە دەستەوسانکەرانەی کە بە پێغەمبەران دراون.

ج- بە مانای دیمەن و دیاردە سروشتییەکان، بەڵام لێرە وا پێدەچێ، مەبەست پێی فەرمایشتی خوا بێ، ڕستەکانی قورئان.

﴿ إِلَّا كَانُوا۟ عَنْهَا مُعْرِضِينَ ﴾، (الإِسْتِثْنَاءُ مِنْ أَحْوَالٍ مَحْذُوفَةٍ، أَيْ: مَا تَأْتِيهِمْ آيَةٌ فِي حَالٍ مِنْ أَحْوَالِهِمْ إِلَّا كَانُوا عَنْهَا مُعْرِضِينَ)، هەڵاواردنەکە لە حاڵە فڕتێنراوەکانە، یانی: هیچ نیشانەیەك لە نیشانەکانی خوایان، لە هیچ حاڵێك لە حاڵەکانیاندا بۆ نایەت، مەگەر ڕووی لێ وەردەچەرخێنن و پشتی تێدەکەن.

کەواتە: ﴿ إِلَّا كَانُوا۟ عَنْهَا مُعْرِضِينَ ﴾، هەم وەڵامی ڕستەکەی پێشییە: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّقُوا۟ مَا بَيْنَ أَيْدِيكُمْ وَمَا خَلْفَكُمْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴾، واتە: هەڵوێستەکەیان پشتتێکردنە، هەروەها وەڵامی ئەو ڕستەیەشە: ﴿ وَمَا تَأْتِيهِم مِّنْ ءَايَةٍ مِّنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِمْ ﴾، وەڵامی هەردووکیانە پێکەوە.

٣)- ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ أَنفِقُوا۟ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ ﴾، ئەگەر پێشیان بگوترێ: لەوەی خوا وەك بژێو داویە بە ئێوە، ببەخشن، خەرج بکەن، هاوکاریی خەڵکی نەدارو ئاتاج بکەن.

٤)- ﴿ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ ﴾، ئەوانەی بێبڕوان {بێبڕوا بوون بە هەموو ئەو شتانەی کە دەبووایە بڕوایان پێبێنن، بەڵام ئەوان بێبڕوابوون} بەوانەیان گوت کە بڕوایان هێناوە {بەهەموو ئەو شتانەی دەبێ بڕوایان پێ بهێنرێ}.

٥)- ﴿ أَنُطْعِمُ مَن لَّوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ أَطْعَمَهُۥٓ ﴾، ئایا خواردن بدەین بە کەسێك، ئەگەر خوا بیەوێ خواردنی پێ بدات، پێیدەدا؟ هەمزە (أ) بۆ پرسیارکردنی نکووڵیلێکەرانەیە، کە هەمیشە پرسیارکردنی نکووڵیلێکەرانە بە مانای لابردن (نفي)ە، (أي: لاَ نُطْعِمُ مَنْ لَوْ يَشَاءُ أَللَّه أَطْعَمَه)، یانی: خواردن نادەینە کەسێك کە ئەگەر خوا ویستبای خواردنی دەدایە. بەڵام کە بەشێوەی پرسیارکردنی نکووڵیلێکەرانە، عیبارەتێك دێ، ئەوە بە نەزان و نەفام دانانی تەرەفی بەرانبەرو دوێندراوە، واتە: ئێوە نەفامن و نەزانن، چۆن ئێمە خواردن دەدەین بە کەسێك و، هاوکاریی کەسێك دەکەین، کە ئەگەر خوا ویستبای هاوکاریی دەکرد؟!

٦)- ﴿إِنْ أَنتُمْ إِلَّا فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ﴾، ئێوە تەنیا لە گومڕاییەکی ئاشکرا دان.

یەکێك لە توێژەرەوانی قورئان لێرەدا عیبارەتێکی جوان دێنێ، دەڵێ:

(سُئِلُوا الإِنْفَاقَ العَامَ، فَأَجَابُوا بِإِمْسَاكِ الطَّعَامِ، وَهُوَ أَيْسَرُ أَنْوَاعِ الإِنْفَاقِ)، ئەوان داوایان لێکرا، بە گشتیی هاوکاریی بکەن و ماڵی خۆیان خەرج بکەن، بەڵام ئەوان وەڵامیان دایەوە، بەوە کە خواردن نابەخشن، کە ئەمە ئاسانترین جۆرەکانی بەخشینە، خواردنێك کە تۆ تازە سازت کردوە، ڕەنگە ئەوەی بۆت نەخورا، دوایی بیڕێژی، ئەوە لە هەموو شتێك ئاسانترە، بیبەخشی.

(القرطبي) لێرەدا لە تەفسیرەکەیدا[1]، قسەیەك دێنێتەوە بەڵام سەنەدەکەی باس نەکردوە، دەڵێ:

{وَقِيلَ: أَنْ أَبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقَ ﷺ، كَانَ يُطْعِمُ مَسَاكِينَ الْمُسْلِمِينَ، فَلَقِيَهُ أَبُو جَهْلٍ فَقَالَ: يَا أَبَا بَكْرٍ! أَتَزْعُمُ أَنَّ اللهَ قَادِرٌ عَلَى إِطْعَامِ هَؤُلَاءِ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَمَا بَالُهُ لَمْ يُطْعِمْهُمْ؟ قَالَ: ابْتَلَى قَوْمًا بِالْفَقْرِ، وَقَوْمًا بِالْغِنَى، وَأَمَرَ الْفُقَرَاءَ بِالصَّبْرِ، وَأَمَرَ الْأَغْنِيَاءَ بِالْإِعْطَاءِ، فَقَالَ: وَاللهِ يَا أَبَا بَكْرٍ مَا أَنْتَ إِلَّا فِي ضَلَالٍ، أَتَزْعُمُ أَنَّ اللهَ قَادِرٌ عَلَى إِطْعَامِ هَؤُلَاءِ وَهُوَ لَا يُطْعِمُهُمْ، ثُمَّ تُطْعِمُهُمْ أَنْتَ؟ فَنَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ}.

واتە: گوتراوە: ئەبوو بەکری صیددیق ﷺ، یارمەتیی ئەدارە مسوڵمانەکانی دەدا، ڕۆژێك ئەبوو جەهل پێگەیشت، گوتی: ئەی ئەبوو بەکر! ئایا پێت وایە خوا دەتوانێ خواردن بدات بەوانە؟

گوتی: بەڵێ.

گوتی: ئەدی بۆچی خواردنیان پێ نادات؟!

---

(١) الجامع لأحكام القرآن، ج١٥، ص٣١.

ئەبوو بەکر گوتی: خوا کەسانێکی بە هەژاریی تاقیکردۆتەوەو، کەسانێکیش بە دەوڵەمەندیی، ئنجا فەرمانی بە هەژارەکان کردوە خۆڕاگر بن و، فەرمانیشی بە دەوڵەمەندەکان کردوە ببەخشن.

ئەبوو جەهل گوتی: بەخوا ئەی ئەبوو بەکر! تۆ هەر لە گومڕاییدای، ئایا پێت وایە خوا دەتوانێ خواردن بدات بەوانەو، خواردنیان پێ نادات، ئنجا تۆ خواردنیان پێ دەدەی؟! ئیدی لەو بارەوە ئەم ئایەتە هاتە خوار.

بێگومان ئەو جۆرە قسانە جۆرێکن لە سەفسەتە، چونکە: ئەوەکە خوا ئەگەر ویستبای خەڵك هەژار و نەدار نەدەبوو، ئەوە بێگومان ڕاستە، ئەگەر خوا ویستبای، وانەبێ، وانەدەبوو، بەڵام خوا ویستوویەتی مرۆڤەکان ئازاد بکات و تاقییان بکاتەوە، خوا ﷻ نەیویستوە تۆبزیی لە مرۆڤەکان بکات، لەسەر ئەوەی بۆ خۆی پێیخۆشە، بەڵکو ویستوویەتی مرۆڤەکان دەستکراوەبن، تاکو بە کەڵکی تاقیکردنەوە بێن، بۆیە دەستی کردوونەوە، دەتوانن چاکە بکەن و دەتوانن خراپە بکەن، دەتوانن ببەخشن و دەتوانن نەبەخشن، بەڵام ئەوەی کە وا دەکات، لە کۆمەڵگایەکدا خەڵك هەندێکی پڕ بێ و زۆربەی قڕ بێ، هەندێکی تێر بێ، زۆربەی برسیی بێ، لە ڕاستییدا ئەوە خوای پەروەردگار نیە وایفەرموو بێ، بەڵێ، هیچ شتێك بەبێ ویستی خوا نابێ، بەڵام خوا ﷻ ئەو دۆخەی پێناخۆشە، هەر بۆیەش، خوا ﷻ ڕەخنە دەگرێ، لەوانەی خۆیان دەسەپێنن و لەوانەی قۆرخکاریی دەکەن، لەوانەی بژیو لە خەڵك زەوت دەکەن، هەروەها خوا ﷻ ڕایگەیاندوە: ئەو چاکەو نیعمەتانەی داناون بۆ هەمووان:

أ- دەفەرموێ: ﴿وَٱلۡأَرۡضَ وَضَعَهَا لِلۡأَنَامِ ١٠﴾ الرحمن، خوا زەوی داناوە بۆ خەڵك.

ب- هەروەها لە سوورەتی (البَقَرة)دا فەرموویەتی: ﴿هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا ٢٩﴾، ئەو (خوا) ئەوەی لە زەویدایە، بۆ هەمووانتانی هێناوەتەدی، نەك بۆ هەندێکتان.

ج- هەروەها لە سوورەتی (الحَشر)دا دەفەرمویٚ: ﴿كَيْ لَا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ ٱلْأَغْنِيَآءِ مِنكُمْ ﴿٧﴾﴾، با ماڵ و سامان لە دەستی دەوڵەمەندەکانتاندا کورت هەڵنەیەت، هەندێك ببنە ملیاردێرو، ئەوی دیکەش ئاتاج بن بۆ نانی شەوێ، یان ڕۆژێ!

کەواتـە: ئـەوە حوکمڕانـە ستەمکارو خۆسـەپێنەکانن و، ئەوە سیسـتمی نەفامییانەو زاڵمانـەی کۆمەڵگایـە، وادەکات ئـەو قڕیـی و پڕییـە هەبـێ، ئـەو سیسـتمە زاڵمانەیـەو ئـەو شـێوە حوکمڕانییـەش، لـە ویسـتی مرۆڤەکانـەوە سـەرچاوە دەگـرێ، بـەڵام لـە ئایینـی خـوادا قەدەغەیـەو، خـواش پێـی ناخۆشـە، هەرچەندە بەویسـتی و یشـە، بەڵام تاقیکردنەوەیـە بـۆ ئـەوان، تاکـو بزانـێ چـی دەکـەن بـەو دەسـەڵاتە، ئایا گەندەڵیـی و خۆسـەپاندنی پـێ دەکـەن؟ دیسـان تاقیکردنەوەشـە بـۆ خەڵـك و جەمـاوەر، ئایـا چ هەڵوێسـتێکیان دەبـێ، ئایـا تێوەڕادەمێنـن و سـەر سـواڵکەرانە دەژیـن و، هـەر بـەدوای سـتەمکارەکان دەکـەون و، بەرمـاوی سـفرەکانیان دەخـۆن، یاخـود لەسـەر مـاف و بژێـوی خۆیـان وەدەنـگ دێـن، لەسـەر حورمەتـی خۆیـان وەدەنـگ دێـن؟ وەك خـوای پـەروەردگار لـە سـوورەتی (محمـد)دا دەفەرمـوێ: ﴿وَلَوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَٱنتَصَرَ مِنْهُمْ وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَا۟ بَعْضَكُم بِبَعْضٍ ﴿٤﴾﴾، واتـە: ئەگـەر خـوا ویسـتبای، تۆڵـەی لێدەسـتاندنەوە {لـە سـتەمکارو خۆسـەپێنەکان، بەسـەر خەڵکـداو لـە قۆرخکەرەکانـی نـازو نیعمەتـەکان} بـەڵام دەیـەوێ هەندێکتـان بـە هەندێکتـان تاقیبکاتـەوە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە (٢١) ئایەت پێك دێ: (٤٨- ٦٨)، كە تەوەری بنەڕەتییان باسی قیامەت و زیندووكرانەوەیە، دواتر باسی نازو نیعمەتی بەهەشت بۆ بڕواداران و، سڵاولێكرانیان لە لایەن خوای پەروەردگارەوە، ئنجا باسی نازارو مەینەتییەكانی بێبڕوایان لە دۆزەخداو، سەرزەنشت كرانیان لە لایەن خوای دادگەرەوەو، مۆر بەسەر زارو زمانیانەوە نران و، هێنانە گۆی دەست و لاقیان، بۆ شایەدیی پێ لەسەر خۆیان دانیان.

لە كۆتاییشدا خوای باڵادەست، هەڕەشەی لە بێبڕوایان كردوە، كە دەتوانێ كوێریان بكات، هەروەها دەتوانێ مەسخیان بكات و بیانكاتە پەیكەرێك، پاشان ڕایدەگەیەنێ، كە هەر كەس خوا تەمەنی درێژ بكات، لە ڕووی جەستەییەوە، پێچەوانەی دەكاتەوەو، بەرەو دواوەی دەباتەوە.

﴿ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٤٨﴾ مَا يَنظُرُونَ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً تَأْخُذُهُمْ وَهُمْ يَخِصِّمُونَ ﴿٤٩﴾ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ تَوْصِيَةً وَلَآ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمْ يَرْجِعُونَ ﴿٥٠﴾ وَنُفِخَ فِى ٱلصُّورِ فَإِذَا هُم مِّنَ ٱلْأَجْدَاثِ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يَنسِلُونَ ﴿٥١﴾ قَالُوا۟ يَٰوَيْلَنَا مَنۢ بَعَثَنَا مِن مَّرْقَدِنَا ۜ هَٰذَا مَا وَعَدَ ٱلرَّحْمَٰنُ وَصَدَقَ ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿٥٢﴾ إِن كَانَتْ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً فَإِذَا هُمْ جَمِيعٌ لَّدَيْنَا مُحْضَرُونَ ﴿٥٣﴾ فَٱلْيَوْمَ لَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا وَلَا تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٥٤﴾ إِنَّ أَصْحَٰبَ ٱلْجَنَّةِ ٱلْيَوْمَ فِى شُغُلٍ فَٰكِهُونَ ﴿٥٥﴾ هُمْ وَأَزْوَٰجُهُمْ فِى ظِلَٰلٍ عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ مُتَّكِـُٔونَ ﴿٥٦﴾ لَهُمْ فِيهَا فَٰكِهَةٌ وَلَهُم مَّا يَدَّعُونَ ﴿٥٧﴾ سَلَٰمٌ قَوْلًا مِّن رَّبٍّ رَّحِيمٍ ﴿٥٨﴾ وَٱمْتَٰزُوا۟ ٱلْيَوْمَ أَيُّهَا ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٥٩﴾ ۞ أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعْبُدُوا۟ ٱلشَّيْطَٰنَ ۖ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ

﴿وَأَنِ اعْبُدُونِي هَذَا صِرَاطٌ مُسْتَقِيمٌ ﴿٦١﴾ وَلَقَدْ أَضَلَّ مِنكُمْ جِبِلًّا كَثِيرًا أَفَلَمْ تَكُونُوا تَعْقِلُونَ ﴿٦٢﴾ هَذِهِ جَهَنَّمُ الَّتِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿٦٣﴾ اصْلَوْهَا الْيَوْمَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿٦٤﴾ الْيَوْمَ نَخْتِمُ عَلَى أَفْوَاهِهِمْ وَتُكَلِّمُنَا أَيْدِيهِمْ وَتَشْهَدُ أَرْجُلُهُم بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿٦٥﴾ وَلَوْ نَشَاءُ لَطَمَسْنَا عَلَى أَعْيُنِهِمْ فَاسْتَبَقُوا الصِّرَاطَ فَأَنَّى يُبْصِرُونَ ﴿٦٦﴾ وَلَوْ نَشَاءُ لَمَسَخْنَاهُمْ عَلَى مَكَانَتِهِمْ فَمَا اسْتَطَاعُوا مُضِيًّا وَلَا يَرْجِعُونَ ﴿٦٧﴾ وَمَن نُّعَمِّرْهُ نُنَكِّسْهُ فِي الْخَلْقِ أَفَلَا يَعْقِلُونَ ﴿٦٨﴾﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{هەروەها (بێبڕوایـەکان) دەڵێـن: ئـەو بەڵێنـە (کـە قیامـەت دێ) کەیـە؟ ئەگـەر ئێـوە لـە ڕاسـتانن {لـە قسـەکانتان دا، هەواڵـمان بدەنێ} ﴿٤٨﴾ (بـۆ هاتنی ئـەو بەڵێنە)، جگـە لـە یـەك چریكـەو هـاڕژن {دوای فووكردنـی یەكـەم بـە كەڕەنـادا} چیدیكـە چاوەڕێ ناكـەن لـە حاڵێكـدا دەیانگرێ، كـە لـە گەرمـەی مشـتومڕو ناكۆكییـدان ﴿٤٩﴾ (هێنـدە كتوپـڕ دێ)، نـە هیـچ ڕاسـپاردەیەكیان بـۆ دەكـرێ و، نـە دەگەڕێنـەوە بـۆ لای كـەس و كاریشـیان ﴿٥٠﴾ (دوایـی بـۆ جـاری دووەم) فـوو بـە كەڕەنـادا كـراو، یەكسـەر بەخێرایـی لـە گۆڕەكانیانـەوە بـەرەو لای (شـوێنی دیاریكـراوی) پەروەردگاریان دەچن ﴿٥١﴾ گوتیـان: ئـەی هـاوار بـۆ ئێمـە! كـێ لـە گۆڕەكەمـان (دەریهێنایـن)و زینـدووی كردینـەوە؟ (پێیـان دەگوتـرێ): ئەمـە ئەوەبـوو كـە خـوای بەبەزەیـی بەڵێنـی دابـوو، ڕەوانەكراوانیـش ڕاسـتیان كـرد، (لـەوەدا كـە پێیـان ڕاگەیانـدن) ﴿٥٢﴾ (زیندووكرانـەوەو كۆكرانـەوەی مـردووان)، هۆكارەكـەی تەنیـا یـەك چریكـەو هـاڕژن بـوو، (دوای فـووی دووەم بـە كەڕەنـادا)، یەكسـەر ئـەوان هەمـوو وێكـڕا لامـان ئامادەكـراو بـوون ﴿٥٣﴾ (پێیـان دەگوتـرێ): ئەمـڕۆ هیـچ كـەس تـۆزێ سـتەمی لێناكـرێ و، تەنیـا بەپێـی

ئـەوەی کردووتانـە، سـزاو پاداشـت دەدرێنـەوە ﴿٥٤﴾ بـە دڵنیایـی ئەمـڕۆ هاوەڵانـی بەهەشـت، شـادمانانە (بـە نـازو نیعمەتانـەوە) سـەرقاڵ و سـەرگەرمن ﴿٥٥﴾ خۆیـان و هاوسـەرانیان لـە سـێبەراندا، لەسـەر تەختـان پاڵیـان داوەتـەوەو، شـانیان داداوە ﴿٥٦﴾ لەوێـدا (هەمـوو جۆرەکانـی) میوەیـان هەیـە و هەرچـی بیخـوازن هەیانـە ﴿٥٧﴾ (لـە هەمووشـی باشـتر) گوتنـی سـەلامە، لـە پـەروەردگاری میهرەبانـەوە ﴿٥٨﴾ (بێبڕوایانیـش پێیـان دەگوتـرێ): ئـەی تاوانبارینـە! ئێـوە ئەمـڕۆ جیابنـەوە (لـە بـڕواداران) ﴿٥٩﴾ ئـەی نـەوەی ئـادەم! ئایـا پێـم ڕانەگەیانـدن کـە شـەیتان نەپەرسـتن، بـە دڵنیایـی ئـەو بـۆ ئێـوە دوژمنێکـی ئاشـکرایە؟ ﴿٦٠﴾ هەروەهـا (پێمڕاگەیانـدن)، کـە مـن بپەرسـتن، ئەمەیـە ڕێـی ڕاسـت و ڕێـك ﴿٦١﴾ بێگومانیـش (شـەیتان) کۆمەڵێکـی زۆری لـێ گومڕاکـردن، ئایـا ئێـوە نەتاندەفامـی! (کـە ئـەوە دوژمنتانـەو شـوێنی نەکـەون) ﴿٦٢﴾ ئەمـە ئـەو دۆزەخەیـە کـە هەڕەشـەتان پێـی لێدەکـرا ﴿٦٣﴾ ئەمـڕۆ بچنـە نێـوی و، پـێ ببرژێـن، بەهـۆی ئـەوەوە کـە بێبـڕوا بـوون ﴿٦٤﴾ ئەمـڕۆ زاریـان مـۆر دەکەیـن و، دەسـتەکانیان دەماندوێنـن و، لاقەکانیـان شـایەدیی لەسـەر ئـەوە دەدەن کـە دەیانکـرد ﴿٦٥﴾ ئەگـەر ویستباشـمان چاوەکانیانمـان دەسـڕیەوە (کوێرمـان دەکـردن)، ئنجـا بـەرەو ڕێ پێشـبڕکێیان کردبایـە، بـەڵام چـۆن ببینـن (بەبـێ چـاو)! ﴿٦٦﴾ هەروەها ئەگـەر ویسـتبامان لـە جێـی خۆیـان شـێوەیانمان دەگـۆڕی (دەمانکردنـە پەیکـەر)، کـە سـەرەنجام نـە بتوانـن بـڕۆن، نـە بشـگەڕێنەوە ﴿٦٧﴾ هـەر کەسـێکیش تەمەنـداری بکەیـن {لـە ڕووی جەسـتەییەوە} پێچەوانـەی دەکەینـەوە، ئایـا نافامـن! ﴿٦٨﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(يَخِصِّمُونَ): (الخَصْمُ: مَصْدَرُ خَصَمْتُهُ: نَازَعْتُهُ خَصْماً، وَالخُصْمُ: الجَانِبُ)، وشەی (خَصْم) چاوگی (خَصَمتُهُ)یە، واتە: لەگەڵیدا ناکۆك بووم، دووبەرەکییم بوو، (خُصْم)، بە لایەکی کراسی مرۆڤ دەگوترێ، بۆیە (مُخَاصَمَة)، واتە: هەرکامێکیان لایەکی کراسی ئەوی دیکە دەگرێ.

(ٱلْأَجْدَاثِ): (جَمْعُ الجَدَث، وَهُوَ القَبْر)، (جَدَثٌ) بە (أجْدَاث) کۆ دەکرێتەوە، واتە: گۆڕ.

(يَنسِلُونَ): (نَسَلَ، يَنْسِلُ نَسَلاَنَاً: أَسْرَع) (نَسَلَ) واتە: (أَسْرَعَ) بەخێرایی ڕۆیشت، (يَنْسِلُ نَسَلاَنَاً) واتە: بەخێرایی دەڕوا، بەخێرایی ڕۆیشتن.

(مَّرْقَدِنَا): (مَرْقَد) واتە: شوێنی تێدا نیشتەجێبوون، (الرُّقَادُ: المُسْتَطَابُ مِنَ النَّوْمِ القَلِيْلِ، المَرْقَدُ: القَبْرُ)، (رُقَاد) خەوێکی خۆشە، کەمێك مرۆڤ بخەوێ، پشووی پێبدا، (مَرْقَد)یش، شوێنی (رُقُود)ە، شوێنی تێدا پشوودان، بۆیەش خوا ﷻ ئەو وشەیەی بەکارهێناوە، چونکە کە مرۆڤ دەخرێتە گۆڕەوە، وە نەبێ بە هەمیشەیی لەوێدا بێ، بەڵکو ماوەیەکە، کە بریتیە لە قۆناغی بەرزەخ، جەستەکەی لەوێدا دەبێ، دوایی لە ڕۆژی قیامەتدا، زیندوو دەکرێتەوەو دەهێنرێتەوە دەر.

(شُغُلٍ): (الشُّغُلُ: العَارِضُ الَّذِي يُذْهِلُ الإنْسَانَ)، (شُغُل) بریتیە لەو سەرقاڵییە، کە مرۆڤ سەرقاڵ و سەرگەرم دەکات و بێ ئاگای دەکات لە شتی دیکە.

(فَٰكِهُونَ): (الفُكَاهَةُ: حَدِيْثٌ ذَوِي الأُنْس، فَكِهَ، أي: مَزَحَ وَسُرَّ)، (فاكهون) هەندێك گوتوویانە: یانی: (مُتَلَذِّذون)، چێژوەرگران، بەڵام وانیەو (فاكهون) لە (فُكَاهَة)ەوە هاتوە، کە بریتیە لە قسەی ئەوانەی هۆگری یەکدین، پێکەوە دادەنیشن و

قسەی خۆش دەكەن، دەگوترێ: (فَكِهَ)، واتە: گاڵتەی كردو دڵخۆش بوو، كەواتە: ﴿ فَـٰكِهُونَ ﴾، واتە: شادمانانە قسەی خۆش پێكەوە دەكەن.

(ٱلۡأَرَآئِكِ ): (جَمْعُ أَرِيكَةٍ، وَالأَرِيكَةُ: اسْمٌ لِمَجْمُوعِ السَّرِيرِ وَالحَجَلَةِ، مِثْلِ المَائِدَةِ اسْمٌ لِلخِوَانِ الَّذِي عَلَيْهِ طَعَامٌ)، ﴿ ٱلۡأَرَآئِكِ ﴾، كۆی (أَرِيكَة)یە، بە كۆی تەخت و ئەو پەردەیەكە بەدەوریدا دەدرێ، تەخت كە سەراپەردەی بۆ دەكرێ، بەهەمووی دەگوترێ: (أَرِيكَة)، كە خەڵكی خۆشگوزەران لەسەری پاڵ دەدەنەوەو شان دادەدەن، هەروەك ئەو سفرەیەی خواردنی لەسەرە، پێی دەگوترێ: (مائدة)، ئەگەر خواردنی لەسەر نەبێ، پێی دەڵێن: (خِوان).

(مُتَّكِئُونَ ): واتە: شانیانداداوە، پاڵیانداوەتەوە، (وَالإِتِّكَاءُ: هَيْئَةٌ بَيْنَ الإِضْطِجَاعِ وَالجُلُوسِ، وَهُوَ اضْطِجَاعٌ عَلَى جَنْبٍ دُونَ وَضْعِ الرَّأْسِ وَالكَتِفِ عَلَى الفِرَاشِ)، (إتِّكَاء) كە بە كوردیی پاڵدانەوەی پێ دەڵێن، شان دادانی پێ دەڵێن، بریتیە لە دانیشتنێك لە نێوان ڕاكشان و دانیشتندا، كە بریتیە لەوەی مرۆڤ لەسەر تەنیشت بێ، بێ ئەوەی سەری بخاتە سەر زەوی و بخەوێ، بەڵكو شان دادەدات.

(أَلَمۡ أَعۡهَدۡ إِلَيۡكُمۡ ): ئایا پێم ڕانەگەیاندن؟ (وَالعَهْدُ: الوَصَايَةُ، عَهِدَ إِلى فُلَانٍ، أَلْقَى إِلَيْهِ العَهْدَ، وَأَوْصَاهُ بِحِفْظِهِ)، (عَهِدَ إِلى فُلَانٍ)، واتە: ئامۆژگاریی كردو، پێیگوت ئەو پەیمان و ئامۆژگارییەی بپارێزێ.

(جِبِلًّا ): (جِبِلاً: جَمَاعَةً، تَشْبِيهاً بِالجَبَلِ فِي العِظَمِ والكثرة)، كۆمەڵێكی زۆر، كە بە چیا دەچوێنرێن لە مەزنییداو لە زۆرییدا.

(ٱصۡلَوۡهَا ): واتە: پێی ببرژێنرێن، (أَصْلُ الصَّلِي: الإِيقَادُ بِالنَّارِ، صَلِيَ بِالنَّارِ: بُلِيَ بِهَا، صَلَيْتُ الشَّاةَ: شَوَيْتُهَا)، وشەی ﴿ ٱصۡلَوۡهَا ﴾، بە مانای (ادْخُلوها) نایەت، (صَلِي) بریتیە لەوەی شتێك بخرێتە نێو ئاگرو لە هەر چواردەورەوە ئاگری لێ بدا، یاخود: لە هەر چواردەورەوە ئاگر تینی بۆ بێنێ، بێ ئەوەی بیبرژێنێ، واتە: بپیشێندرێ، نەك بكوڵێندرێ، ئەوەی پێی دەگوترێ: (صَلِي)، عەرەب دەڵێن: (شَاةٌ

مَصْلِيَّةٌ)، مەڕی پیشێنراو، کاتێك لە فڕنی دەهاوێژرێ و لە هەر چواردەورەوە دەپیشێنرێ، نەك ببرژێنرێ و هەندێکی لێ بسووتێ، ئاوە پێیدەگوترێ: (مَصْلِيَّة).

(نَخْتِمُ عَلَىٰٓ أَفْوَٰهِهِمْ): مۆر بەسەر زارەکانیانەوە دەنێین، (تمْنَعُهُمْ مِنَ الكَلَام)، واتە: ڕێیان لێ دەگرین قسە بکەن.

(لَطَمَسْنَا عَلَىٰٓ أَعْيُنِهِمْ): چاویان دەسڕینەوە، (الطَّمْسُ: إِزَالَةُ الأَثَرِ بِالْمَحْوِ)، (طَمْس) بریتیە لەوەی شوێنەواری شتێك نەمێنێ و بسڕێتەوە لێرەدا مەبەست: کوێر کردنیانە.

(لَمَسَخْنَٰهُمْ): واتە: مەسخیان دەکەینەوە، (الْمَسْخُ: تَشْوِيهُ الخَلْقِ وَالخُلُقِ، وَتَحْوِيلُهُمَا مِنَ صورةٍ إِلى صورة أخرى)، (مَسْخ) بریتیە لە گۆڕینی جەستەی مرۆڤ و گۆڕینی دیوی نێوەوەشی، لە حاڵەتێکەوە بیگۆڕی بۆ حاڵەتێکی دیکە.

کە لێرەدا مەبەست لە: ﴿لَمَسَخْنَٰهُمْ عَلَىٰ مَكَانَتِهِمْ﴾: یانی: لە شوێنی خۆیان، وشکمان دەکردن وەك پەیکەرێك، کە نە بتوانن بچنە پێش و نە بتوانن بێنەوە دوا.

(مَكَانَتِهِمْ): (المَكَانُ: المَوْضِعُ الحَاوِي الشَّيْءِ) (مکان)، ئەو شوێنەیە کە مرۆڤ دەگرێتە خۆی.

(نُنَكِّسْهُ): (النَّكْسُ: قَلْبُ شَيْءٍ عَلَى رَأْسِهِ)، شتێك کە سەرو بن بکرێ و هەڵبگێڕدرێتەوە، پێی دەگوترێ: (نَکْس)، خوا دەفەرموێ: ﴿نُنَكِّسْهُ فِي ٱلْخَلْقِ﴾، ئەوەی تەمەنداری بکەین، لە ڕووی جەستەییەوە، پێچەوانەی دەکەینەوە، واتە: ئەگەر تاکو ئێستا بەهێز بووە، بێهێزی دەکەین و، ئەگەر تاکو ئێستا لە ڕووی ئاکارو ڕەوشتەوە حەوصەڵەو خۆڕاگریی هەبووە، خۆڕانەگرو بێ حەوسەڵەی دەکەین و، لە سیفەتە جەستەییەکانیدا پێچەوانەی دەکەینەوە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

بەڕێــــزان!

ئـەم بیسـت و یـەك (٢١) ئایەتـە، تـەوەری سـەرەکییان بریتیـە لـە ڕۆژی دوایـی، چ ئاخیـر زەمـان، چ قیامـەت و زیندووکرانـەوەو لێپرسـینەوە.

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾، هەروەهـا دەڵێن: ئـەو بەڵێنـە کەینێیـە؟ ئەگـەر ئێـوە لـە ڕاسـتانن، واتـە: هاتنـەدی ئـەو بەڵێنـە، کەیـە؟ ئـەو بەڵێنـەش بریتیـە لـە: هاتنـی قیامـەت، یاخـود: هاتنـی ئاخـر زەمـان، بـەڵام بەپێی سـیاق وادەردەکـەوێ، کـە مەبەسـتیان پێـی ئاخیـر زەمـان بـووە، کۆتایـی هاتنـی ژیانـی دنیـا، چونکـە دەفەرمـوێ: ﴿ مَا يَنظُرُونَ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً ﴾، چاوەڕوانیـی ناکـەن، جگـە لـە یـەك هـاڕژن، چریکـەو دەنگـی قەبـەو بـەرز ﴿ تَأْخُذُهُمْ وَهُمْ يَخِصِّمُونَ ﴾، ئـەو چریکـەو هاڕژنـە گەورەیـە، دەیانگـرێ لـە کاتێکـدا، ئـەوان خەریکـی مشـتومڕو دەمەقاڵـێ و، خەریکـی سـەوداو مامەڵـەو، کڕیـن و فرۆشـتنن و، لـە گەرمـەی ژیانـی ڕۆژانەیـان دان، بۆیـە مەبەسـت لـە (وعـد) ﴿ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ ﴾، بەڵێنـی هاتنـی ئاخـر زەمـان و تێکچوونـی ژیانـی دنیایـە، چونکـە خـوای بەرزومـەزن باسـی ئـەوە دەکات، کـە یـەك چریکـە، یـەك هـاڕژن دێ، لـە حاڵێکـدا ئـەوان سـەرگەرمی مشـتومڕن، کەواتـە: مەبەسـت پێـی هـاڕژن و چریکـەی یەکەمـە، کـە بەهـۆی فـووی یەکەمـی کەڕەنـاوە دەبـێ و، ژیـانی دنیـای پـێ کۆتایـی دێ و گەردوونـی پـێ تێـك دەچـێ، ﴿ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ تَوْصِيَةً ﴾، ئنجا ناتوانـن هیـچ ڕاسـپاردەیەك بکـەن، بـۆ یەکـدی، ﴿ وَلَآ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمْ يَرْجِعُونَ ﴾، هەروەهـا ناشـتوانن بگەڕێنـەوە بـۆ لای کـەس و کارو، مـاڵ و خێزانیشـیان، جـاری یەکـەم کـە فـوو بـە کەڕەنـادا دەکـرێ، ئـەوە دەقەومـێ.

ئنجـا دێتـە سـەر بـاسی فـووی جـاری دووەم، دەفەرمـوێ: ﴿ وَنُفِخَ فِى ٱلصُّورِ ﴾، فـووش بـە کەڕەنـادا کـرا، (مەبەسـت پێـی فـووی دووەمـە) ﴿ فَإِذَا هُم مِّنَ ٱلْأَجْدَاثِ

إِلَىٰ رَبِّهِمْ يَنسِلُونَ ﴾، یەکسەر کتوپڕ ئەوان لە گۆڕەکانیانەوە، بەرەو لای پەروەردگاریان، بەرەو شوێنی دیاریکراوی پەروەردگاریان بە خێرایی دەڕۆن، ﴿ قَالُوا۟ يَـٰوَيْلَنَا مَنۢ بَعَثَنَا مِن مَّرْقَدِنَا ﴾، گوتیان: ئەی هاوار بۆ ئێمە! سزای سەخت بۆ ئێمە، کێ ئێمەی لە شوێنی پشوودانمان، لە گۆڕەکانمان کە پشوومان تێدا دابوون و تێیان دا ڕاکشابووین، کێ ئێمەی دەرهێنایەوە؟ ﴿ هَـٰذَا مَا وَعَدَ ٱلرَّحْمَـٰنُ وَصَدَقَ ٱلْمُرْسَلُونَ ﴾، پێیان دەگوترێ: ئەمە ئەوەیە، کە {خوای} بە بەزەیی بەڵێنی دابوو، ڕەوانەکراوەکان، پێغەمبەرەکانیش ڕاستیان کرد، کە گوتیان: ژیانی مرۆڤ لەم چوار پێنج ڕۆژی ژیانی دنیادا، خوڵاصە نابێتەوە، ئێرە تەنیا قۆناغێکەو قۆناغی دیکەی بەدوادا دێن، ﴿ إِن كَانَتْ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً ﴾، ئەو زیندوو کرانەوەیەی ئەوان، یاخود ئەو ڕووداوو کارەساتە مەزنە، کە بریتیە لە هەڵستێندرانەوەیان لە گۆڕەکان، تەنیا یەك هاڕژن و چریکە بوو، ﴿ فَإِذَا هُمْ جَمِيعٌ لَّدَيْنَا مُحْضَرُونَ ﴾، یەکسەر کتوپڕ هەموویان، وێکڕا لەلامان نامادەکراو بوون، وێکڕاو تێکڕا، لە لای ئێمە نامادەبوون.

﴿ فَٱلْيَوْمَ لَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا ﴾، ئەمڕۆ هیچکەس هیچ ستەمێکی لێ ناکرێ، ﴿ وَلَا تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾، قەرەبووشتان نادرێتەوە، بەرانبەرتان نادرێتەوە، مەگەر بەپێی ئەوە کە دەتانکرد، ئنجا ئەوەی چاکەکار بووبێ، پاداشت و، ئەوەی خراپەکار بووبێ، سزا، تەنیا بە ئەندازەی کردەوەکانی خۆتان، بەرانبەرتان دەدرێتەوە، ئنجا سزایە، یاخود پاداشت.

ئنجا خوا ﷻ باسی ئەو سزاو پاداشتە دەکات، چۆنە؟ ﴿ إِنَّ أَصْحَـٰبَ ٱلْجَنَّةِ ٱلْيَوْمَ فِى شُغُلٍ فَـٰكِهُونَ ﴾، خاوەنانی بەهەشت، یان هاوەڵانی بەهەشت، ئەمڕۆ لە سەرگەرمییدا خەریکی شادمانیین، یاخود: شادمانانە سەرگەرمی نازو نیعمەتەکانن، ﴿ هُمْ وَأَزْوَٰجُهُمْ فِى ظِلَـٰلٍ عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ مُتَّكِـُٔونَ ﴾، خۆیان و هاوسەرەکانیان لە سێبەراندا، لە سێبەری دارو درەختەکاندا، لەسەر کەناری ڕووبارەکان، لەسەر تەختان، شانیان داداوە، پاڵیانداوەتەوە ﴿ لَهُمْ فِيهَا فَـٰكِهَةٌ وَلَهُم مَّا يَدَّعُونَ ﴾، بۆ ئەوان

هەیە میوە، {هەموو جۆرەکانی میوە}و بۆ ئەوان هەیە، هەر شتێك بیخوازن و داوای بکەن، ﴿ سَلَٰمٞ قَوۡلٗا مِّن رَّبّٖ رَّحِيمٖ ﴾، سەرباری هەموو شتێك و لەهەمووی گەورەترو گرنگتریش: سەلام لێکردن، فەرمایشتێکە لە پەروەردگاری میهرەبانەوە.

ئەوە بە نسبەت بڕوادارانەوە، هاوەڵان و خاوەنانی بەهەشت، ئەوە سەرەنجامیانە.

ئنجا دێتە سەر باسی بێبڕوایان و دەفەرموێ: ﴿ وَٱمۡتَٰزُواْ ٱلۡيَوۡمَ أَيُّهَا ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴾، {بێبڕوایەکان پێیان دەگوترێ:} ئەی تاوانبارینە! ئەمڕۆ جیابنەوە، ﴿ أَلَمۡ أَعۡهَدۡ إِلَيۡكُمۡ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعۡبُدُواْ ٱلشَّيۡطَٰنَ ﴾، ئەی وەچەی ئادەم! ئایا پێمڕانەگەیاندن کە شەیتان مەپەرستن! بەندایەتیی بۆ مەکەن و شوێنی مەکەون؟ ﴿ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ﴾، بە دڵنیایی ئەو بۆ ئێوە، دوژمنێکی ئاشکرایە، (ٱلشَّيۡطَٰنَ)، مەبەست پێی تەنیا ئیبلیس نیە، بەڵکو (شیطان) هەر کەسێکە خەڵك لە خوا دووربخاتەوە، چ جند بێ لە وەچەی ئیبلیس، چ مرۆڤی وەچەی ئادەم و حەووا بێ علیهما السلام، بەڵێ لە (ئیبلیس)ەوە ئەو دژایەتیی و دوژمنایەتییەی نێوان ئەوو ئادەم و وەچەکەی دا کەوتوە، بەڵام ئیبلیسیش هەم لە وەچەکەی خۆی و، هەم لە وەچەی ئادەمیش، ئەوانەی هەڵیخەڵەتاندوون، شوێنکەوتووی بۆخۆی زۆر کردوون، ﴿ وَأَنِ ٱعۡبُدُونِيۚ هَٰذَا صِرَٰطٞ مُّسۡتَقِيمٞ ﴾ {ئایا پێمڕانەگەیاندن کە تەنیا بەندایەتیی بۆ من بکەن} ئا ئەوە ڕاستە شەقامە، ئەوە ڕێی ڕاستە؟!

﴿ وَلَقَدۡ أَضَلَّ مِنكُمۡ جِبِلّٗا كَثِيرًا ﴾، بە دڵنیایی ئەو خەڵکێکی زۆری لێ گومڕا کردوون، یان: لێ ون کردوون، ﴿ أَفَلَمۡ تَكُونُواْ تَعۡقِلُونَ ﴾، ئایا ئێوە وانەبوو، عەقڵ و هۆشتان هەبێ، بەدوای دوژمنی خۆتان نەکەون؟ ﴿ هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ ٱلَّتِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ ﴾، ئا ئەمە ئەو دۆزەخەیە، کە ئێوە هەڕەشەتان پێی لێ دەکرا، یان: بەڵێنتان پێ دەدرا، ﴿ ٱصۡلَوۡهَا ٱلۡيَوۡمَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡفُرُونَ ﴾، ئەمڕۆ بیچنە نێو، پێی ببرژێندرێن، تێیدابپیشێنرێن، بەهۆی ئەوەوە کە بێبڕوا بوون، یاخود بەهۆی ئەوەوە کە سپڵەو ناسپاس بوون، بەرانبەر بە نیعمەتی پێغەمبەرایەتیی پێغەمبەران،

بەرانبەر بە نیعمەتی پەیامی خوا، ﴿ ٱلْيَوْمَ نَخْتِمُ عَلَىٰٓ أَفْوَٰهِهِمْ ﴾، ئەمڕۆ مۆر بەسەر زاریانەوە دەنێین، واتە: بێ قسەیان دەکەین، ﴿ وَتُكَلِّمُنَآ أَيْدِيهِمْ وَتَشْهَدُ أَرْجُلُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴾، دەستەکانیان دەماندوێنن و لاقەکانیشیان، شایەدییان لەسەر دەدەن، بەوەی کە وەدەستیان دەهێناو دەیانکرد.

﴿ وَلَوْ نَشَآءُ لَطَمَسْنَا عَلَىٰٓ أَعْيُنِهِمْ ﴾، ئەگەر ویستباشمان، چاوەکانیانمان دەسڕینەوە، ﴿ فَٱسْتَبَقُوا۟ ٱلصِّرَٰطَ فَأَنَّىٰ يُبْصِرُونَ ﴾ ئنجا پێشبڕکێیان دەکرد، بۆ ئەوەی بەڕێیەکەدا بڕۆن، بەڵام چۆن ببینن بەبێ چاو؟ ﴿ وَلَوْ نَشَآءُ لَمَسَخْنَٰهُمْ عَلَىٰ مَكَانَتِهِمْ ﴾، هەروەها ئەگەر ویستبامان، لە شوێنی خۆیان دەمانکردنە پەیکەر، مەسخمان دەکردنەوە، ﴿ فَمَا ٱسْتَطَٰعُوا۟ مُضِيًّا وَلَا يَرْجِعُونَ ﴾، ئنجا نە دەیانتوانی بڕۆن و تێپەڕن و، نە دەشیانتوانی بگەڕێنەوە، یانی: وشك دەبوون لە جێی خۆیان، واتە: دەتوانین ئاواشیان لێ بکەین، ئنجا ئەمە دەگونجێ، مەبەست پێی دنیا بێ و، دەشگونجێ مەبەست پێی ڕۆژی دوایی بێ، بەڵام واپێدەچێ زیاتر، مەبەست پێی دنیا بێ، وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەکان دا تیشکی زیاتری دەخەینە سەر.

﴿ وَمَن نُّعَمِّرْهُ نُنَكِّسْهُ فِى ٱلْخَلْقِ أَفَلَا يَعْقِلُونَ ﴾، هەر کەسێك تەمەنداری بکەین، یان: هەر کەسێك بیژیەنین، لە جەستەدا پێچەوانەی دەکەینەوە، ئایا نافامن! واتە: ئایا نافامن، کە هەر نەبێ بە هۆی کەوتنە تەمەن و پیرییەوە، وردە وردە ئەو هەستەوەرانەی هەتانن و، ئەو توانایانەی هەتانن، لە دەستیان دەدەن؟!

کەواتە: تاکو لە دەستتان نەچوون، چ بەهۆی مردنەوە بەیەکجاریی، چ بەهۆی کەوتنە تەمەنەوە، ئەو هەستەوەرو توانایانەتان لە دۆزینەوەی هەق و، لە شوێنکەوتنی هەقدا بەکار بێنن.

## مەسەلە گرنگەكان

**مەسەلەی یەكەم:**

**پرسیاركردنی نكوولّیلێكەرانەی بێبڕوایان، لە هاتنی ئاخیر زەمان و ڕۆژی دوایی بە گشتیی و، وەڵامدرانەوەیان، كە ئەوە تەنیا بە چریكەو هاڕژنێكی بێبڕەزا دێتە دی، لە ئەنجامی فوو بە كەڕەنادا كردنی یەكەمدا، لە لایەن ئیسرافیلەوە، كە كت و پڕ، لە گەرمەی ژیان و هەڵسوكەوت و مشتومڕیاندا، ئەو هاڕژنە دێ و دەفریای هیچ ناكەون:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ۝٤٨ مَا يَنظُرُونَ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً تَأْخُذُهُمْ وَهُمْ يَخِصِّمُونَ ۝٤٩ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ تَوْصِيَةً وَلَآ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمْ يَرْجِعُونَ ۝٥٠ ﴾.

### شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾ دەشڵێن: ئەگەر ئێوە لە ڕاستانن، ئەو بەڵێنە كەیە؟ بە پێی سیاق دیارە ئەوانەی وا دەڵێن، كێن؟ بێبڕوایانی ڕۆژگاری پێغەمبەری خاتەمن ﷺ، كە یەكەمجار ئەوان مەبەستن و، لە دوای ئەوانیشەوە هەموو بێبڕوایانی دیكە، دەڵێن: ئەو بەڵێنە كەیە؟

﴿ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾، ئەگەر ئێوە لە ڕاستانن، (**أُطْلِقَ الوَعْدُ عَلَى الإِنْذَارِ وَالتَّهْدِيْدِ بِشَرٍّ، لأَنَّ الوَعْدَ عَامٌّ، وَيَتَعَيَّنُ لِلشَّرِّ أو الخَيْرِ بِقَرِيْنَةٍ**)، كە گوتوویانە: ﴿ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ ﴾، ئەو بەڵێنە كەیە؟ وشەی (وَعْد) لێرەدا بۆ وشیاركردنەوەو، هەڕەشەكردن بە خراپە، {شتێك كە بۆ ئەوان خراپە} بەكارهێنراوە، چونكە وشەی (وَعْد) چەمكەكەی گشتییە، بەڵام ئایا ئەو بەڵێنە بۆ خێرە یان بۆ شەڕ؟ هەڕەشەیە یاخود مۆژدە؟ ئەوە بەپێی ڕەوت دەزانرێ و دەبێ نیشانەیەك هەبێ، داخۆ

کامیان مەبەستە؟ ئەگەرنا وشەی (وَعْد) هەم بە مانای گفت و بەڵێنی چاك دێ، هەم بە مانای هەڕەشەو ترساندن بە سزادان و، شتی خراپ بەسەرهاتنیش، دێ.

٣)- ﴿ مَا يَنظُرُونَ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً ﴾ تەنیا یەك هاڕژن چاوەڕێ دەکەن. [خوا ﷻ وەڵامیان دەداتەوەو دەفەرموێ:] (مَا يَنظُرُونَ)، یانی: (مَا يَنْتَظِرُونَ)، (يَنْظُرُونَ مُشْتَقٌّ مِنْ نَظِرَة، وَهُوَ التَّرَقُّبُ)، لە (نَظِرَة)ەوە هاتوە، چاوەڕێکردن، یانی: چاوەڕێناکەن جگە لە یەك دەنگی گەورە، ﴿ صَيْحَةً ﴾، بە مانای نەعرەتە، چریکەو دەنگێکی گەورە، دێ، تەنیا یەك هاڕژنی گەورە چاوەڕێ دەکەن.

٤)- ﴿ تَأْخُذُهُمْ وَهُمْ يَخِصِّمُونَ ﴾، ئەو هاڕژنە دەیانگرێ و بەسەریان دێ، لەو کاتەدا کە ئەوان خەریکی مشتومڕن، ﴿ يَخِصِّمُونَ ﴾، واتە: (يَخْتَصِمُون)، دەمەقاڵێیانە، لەو کاتەدا خەریکی مشتومڕو ناکۆکیین، چونکە وشەی (خُصُومَة) و (خِصَام)، بە مانای موناقەشەو شەڕەقسەو، بگرەو بەردە دێ.

﴿ يَخِصِّمُونَ ﴾ بە: (يَخَصِّمُون)، هەروەها بە: (يَخْصِمُون)یش خوێنراوەتەوە، بە سێ جۆر خوێنراوەتەوە.

کە دەفەرموێ: ﴿ تَأْخُذُهُمْ ﴾، دەیانگرێ، بێگومان هاڕژنەکە نایانگرێ، بەڵام (أخذ) واتە: گرتن، یانی: وەك چۆن دڕندەیەك پەلاماری کەسێك بداو بیگرێ، یاخود دوژمنێك بەسەر کەسێك دابدات و بیگرێ، ئەو هاڕژن و چریکەو نەعرەتە گەورەیەش، وا وێنا کراوە، ئەگەرنا لە ڕاستییدا ﴿ تَأْخُذُهُمْ ﴾، واتە: (تُهلِكُهُم)، لە بەینیان دەبات، لە حاڵێکدا کە ئەوان لە گەرمەی مشتومڕ دان.

٥)- ﴿ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ تَوْصِيَةً ﴾ ئنجا ناتوانن هیچ ڕاسپاردنێك بکەن، (تَوْصِيَة: مَصْدَرُ وَصَّى وَتَنْكِيرهَا للتَقْلِيْلِ، أي: لَا يَسْتَطِيْعُونَ تَوْصِيَةً مَا)، وشەی ﴿ تَوْصِيَةً ﴾، چاوگە، چاوگی (وَصَّى، يُوَصِّي، تَوْصِيَةً)، کە بە نەزانراو (نَكِرة)یش هاتوەو بەزانراو (مَعرِفة) نەهاتوە، نە (أل)ی ناساندنی لەسەرە، نە بەپاڵدان (إضَافَة)، ناسێنراوە، ئەوە بۆ کەم پێشاندانە، (للتَقْلِيْل)، واتە: پێڕاناگەن هیچ جۆرە ڕاسپاردنێك بکەن و، هیچ شتێك بۆ لای ماڵێ ڕاسپێرن!

٦)- ﴿ وَلَآ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمْ يَرْجِعُونَ ﴾، هەروەها بۆ لای ماڵ و منداڵیشیان ناگەڕێنەوە، بۆ لای کەس و کاریان ناگەڕێنەوە.

فەرمایشتێکی پێغەمبەر ﷺ ئەم دیمەنەی هاتنی ئاخیر زەمان، وێنادەکات، کە کت و پڕو لەناکاو، دێ، دوای فووی یەکەم کردن بە کەڕەنادا، لە لایەن ئیسرافیلەوە، کە ئەمە دەقەکەیەتی، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:

**{تَقُومُ السَّاعَةُ وَالرَّجُلاَنِ قَدْ نَشَرَا ثَوْبَهُمَا يَتَبَايَعَانِهِ، فَلَا يَطْوِيَانِهِ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ، وَالرَّجُلُ يَلِيطُ، حَوْضَهُ لِيَسْقِيَ مَاشِيَتَهُ، فَمَا يَسْقِيهَا حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ، وَالرَّجُلُ يَخْفِضُ مِيزَانَهُ، فَمَا يَرْفَعُهُ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ، وَالرَّجُلُ يَرْفَعُ أُكْلَتَهُ إِلَى فِيهِ، فَمَا يَتَبَلَّعُهَا حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ} (أخرجه البخاري: ٦٥٠٦، ومسلم: ٢١٥٤).**

واتە: ئاخیر زەمان دێ، لە حاڵێکدا کە دوو پیاو، قوماشێك کە بڵاویان کردۆتەوە، پۆشاکێك، دەیانەوێ کڕین و فرۆشتنی لەسەر بکەن، کڕین و فرۆشتنەکە ئەنجام نادرێ، کە ئاخیر زەمان دێ، (واتە: کتوپڕ دێ، نەك وردە وردە بێ)، هەروەها پیاوێك حەوزەکەی خۆی سواغ کردوە، ئاژەڵەکانی تێدا ئاو نادات، کە ئاخیر زەمان دێت، دیسان پیاوێك تەرازووەکەی نزمکردوە {بۆ ئەوەی شتی پێ بکێشێ} بەرزی ناکاتەوە کە ئاخیر زەمان دێ، هەروەها پیاوێکی دیکە پارووکەی بەرز کردۆتەوە بۆ زاری، نایخاتە نێو زاری و قووتی نادات، کە ئاخیر زەمان دێ.

ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (الأعرف)دا، لە کاتی قسە پێکردنی ئەو ئایەتە موبارەکەدا کە دەفەرموێ: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ رَبِّى ۖ لَا يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَآ إِلَّا هُوَ ۚ ثَقُلَتْ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ لَا تَأْتِيكُمْ إِلَّا بَغْتَةً ۗ يَسْـَٔلُونَكَ كَأَنَّكَ حَفِىٌّ عَنْهَا ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ ٱللَّهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨٧﴾ ﴾، باسێکی سەر بەخۆمان لەو بارەوە کردوە، ئەو فەرمایشتەشمان بە درێژیی هێناوە، وێڕای فەرمایشتی دیکەش، بۆیە لێرەدا تەنیا بە هێنانی ئەو فەرموودەیە وازی لێ دێنین.

کورتەی مانای ئەم سێ ئایەتە، ئاوایە:

بێبڕوایەکان وەك عادەتی خۆیان بە تۆمەتبار کردن و بە نکوولّیلێکردنەوە، دەپرسن: ئایا بەڵێن و ژوانگەی، هاتنی ئەو ڕووداوە گەورەیەی ئاخیر زەمان کەیە؟

خواش ﷻ بەوە وەڵامیان دەداتەوە: ئەوە تەنیا یەك هاڕژنی گەورەی دەوێ، کە لەدوای فووی یەکەم پەیدا دەبێ، ئەویش کتوپڕ و لە حاڵێکدا دێ، کە ئەوان لە گەرمەی مشتومڕی ژیانی دنیا دان، هێندەش کت و پڕو لە ناکاوو، هێندە بە خێرایی تێدەپەڕێ، ئەو ئاخیر زەمان و کۆتایی هاتنی ژیانی دنیایە، کە تەنانەت ئەوانەی لە بازاڕن، فریای ئەوە ناکەون بچنەوە لای کەس و کاریان، نەك هەر فریای چوونەوە لای کەس و کارو خاوو خێزانیان ناکەون، بەڵکو فریای ئەوە ناکەون، قسەیەکیش ڕاسپێرنەوە بۆ ماڵێ.

**مەسەلەی دووەم:**

**هاتنی قیامەت دوای فووی دووەم بە کەڕەنادا، لە لایەن ئیسرافیلەوە، زیندوو بوونەوەی مردووان و بەخێرایی هاتنەدەریان لە گۆڕەکانیان و، سەرسوڕمانیان لەوەی کێ ژیاندوونیەوە؟ وەڵامدەرانەوەشیان کە ئەوە بەڵێنی خوا بوو، ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییەش، کە هیچ کەس یەك تۆز ستەمی لێ ناکرێ و، بە گوێرەی کردەوەکانیان، پاداشت و سزا دەدرێنەوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَإِذَا هُم مِّنَ ٱلۡأَجۡدَاثِ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ يَنسِلُونَ ﴿٥١﴾ قَالُواْ يَٰوَيۡلَنَا مَنۢ بَعَثَنَا مِن مَّرۡقَدِنَاۜۗ هَٰذَا مَا وَعَدَ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَصَدَقَ ٱلۡمُرۡسَلُونَ ﴿٥٢﴾ إِن كَانَتۡ إِلَّا صَيۡحَةٗ وَٰحِدَةٗ فَإِذَا هُمۡ جَمِيعٞ لَّدَيۡنَا مُحۡضَرُونَ ﴿٥٣﴾ فَٱلۡيَوۡمَ لَا تُظۡلَمُ نَفۡسٞ شَيۡـٔٗا وَلَا تُجۡزَوۡنَ إِلَّا مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٥٤﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ﴾، فووش بە کەڕەنادا کرا، لە فەرمایشتی پێغەمبەری خوادا ﷺ هاتوە، کە ئیسرافیل دوو جاران فوو بە کەڕەنا (ٱلصُّورِ)دا دەکات و شەیپوور لێ دەدات، هەرچەندە لە هەندێك فەرمووداندا هاتوە کە سێ جارە، بەڵام لە ڕاستییدا ئەوەی قورئان زۆر بە ڕوونیی دەیگەیەنێ و، فەرمایشتی پێغەمبەریش ﷺ، هەر ئەوە جەخت دەکاتەوە، کە دووجاران فوو بە کەڕەنادا دەکرێ، جاری یەکەمیان، لە دوای فوو پێداکردنی یەکەم، هاڕژن و دەنگێکی زۆر گەورە پەیدا دەبێ، دەبێتە هۆی ئاخیر زەمان و، کۆتایی هاتنی ژیانی دنیا، ئنجا دوای ماوەیەك، کە بەس خوا دەزانێ چەندی پێدەچێ، - وەك دوایی باسی دەکەین، لە هەندێك فەرمووداندا هاتوە، کە چل (٤٠) یان دەکەوێتە نێوان، ئنجا ئایا ئەو (٤٠)ە، ساڵی هێندەی ساڵی ئێمەن، یان زیاترن؟ - ماوەیەکیان دەکەوێتە بەین، ئنجا بۆ جاری دووەم، فوو بە کەڕەنادا دەکرێ، لە لایەن ئیسرافیلەوە، ئەمجارە دەبێتە هۆی پەیدابوونی قیامەت، هەڵسانەوەو زیندووبوونەوە.

ئنجا ئەمەیان باسی فووی دووەمە، چونکە هی یەکەم ئەوەبوو، کە فەرمووی: ﴿ مَا يَنظُرُونَ إِلَّا صَيْحَةً وَاحِدَةً تَأْخُذُهُمْ وَهُمْ يَخِصِّمُونَ ﴾، چونکە ئەوان لە بارەی ئاخیر زەمانەوە پرسیاریان کردو، خواش ﷺ وەڵامی دانەوە: کە تەنیا چاوەڕێی یەك هاڕژن و دەنگی گەورە دەکەن، دەیانگرێ لە حاڵێکدا، کە ئەوان لە گەرمەی مشتومڕی ژیانی دنیا دان.

بەڵام ئەمەیان بۆ جاری دووەمە فوو بە کەڕەنادا بکرێ.

٢)- ﴿ فَإِذَا هُم مِّنَ الْأَجْدَاثِ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يَنسِلُونَ ﴾، کتوپڕ ئەوانە، لە گۆڕەکانیانەوە بەرەو پەروەردگاریان بە خێرایی دەڕۆن، بەرەو پەروەردگاریان، واتە: بەرەو ئەو شوێنەی پەروەردگاریان بۆی دیاریکردوون، ئەو گۆڕەپانەی کە حەشرو حیسابی لێدەکرێ، حەشر واتە: کۆکردنەوەی خەڵك و، حیساب واتە: لێپرسینەوە، وشەی **(أجداث)**یش کۆی **(جَدَث)**ەو بە مانای گۆڕ دێ.

﴿ يَنسِلُونَ ﴾، **(نَسَلَ، يَنْسِل، نَسَلاَنَاً، أي مَشَى، مَشْيَاً سَرِيْعَاً)**، بەڕۆیشتنێکی خێرا ڕۆیشت. یانی: بە خێرایی دەڕۆن، بەبێ وەخران، لەوەوەش دەزانین کە ئەم فووە فووی دووەمە، بە کەڕەنادا دەکرێ، چونکە دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا هُم مِّنَ الْأَجْدَاثِ إِلَىٰ رَبِّهِمْ يَنسِلُونَ ﴾، لە گۆڕەکانیانەوە بە خێرایی بەرەولای پەروەردگاریان دەڕۆن، ئاشکراشە لە دوای فووی دووەم، هەستانەوەو زیندووکرانەوە **(القيامة والبعث)** دێ، وەك لە سوورەتی **(الزمر)**دا دەفەرموێ: ﴿ وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الْأَرْضِ إِلَّا مَن شَاءَ اللَّهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ ﴿٦٨﴾ ﴾، واتە: فوو بە کەڕەنادا کرا، هەرکەس لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، بێهۆش بوو، (یاخود مرد)، مەگەر ئەوەی خوا بیەوێ، دوایی جارێکی دیکە فووی پێدا کرا، یەکسەر کتوپڕ هەموویان هەڵسانە پێ، چاوەڕێ بوون.

٣)- ﴿ قَالُوا يَا وَيْلَنَا مَن بَعَثَنَا مِن مَّرْقَدِنَا ﴾، گوتیان: ئەی هاوار بۆ ئێمە! یان حاڵ خراپیی بۆ ئێمە، کێ ئێمەی لە گۆڕەکەمان دەرهێنا؟ ئەم وشەیە: ﴿ يَا وَيْلَنَا ﴾ هی بابایەکە، کەوتۆتە

نێو بەڵاو گرفتارنییەکەوە، وەك پەشێمانیی کێشان و ژیوان بوونەوەو، خەفەت خواردن دەیلێن، ئەی هاوار بۆ ئێمە، کێ ئێمەی لە گۆڕەکانمان دەرهێنایەوەو زیندوو کردەوە؟ وشەی ﴿مَنۡ﴾یش بۆ پرسیارکردنە، بەڵام لێرەدا بە مانای سەرسوڕماندن و خەفەت خواردنە (مُسْتَعْمَلٌ فِي التَّعَجُّبِ والتحسّر).

﴿مَنۢ بَعَثَنَا مِن مَّرۡقَدِنَاۜ﴾، (مَرْقَدْ) شوێنی خەوتنە، بۆیە وشەی (مَرْقَد) بەکارهێنراوە، چونکە (رُقَاد): بریتیە لە خەوێکی سووك، دیارە قۆناغی بەرزەخیش لە چاو قیامەت، ماوەیەك و پشوودانێکی کەمە، دوایی ئەو قۆناغە بەسەر دەچێ و، بەرەو قۆناغی قیامەت دەچن، کە قۆناغی قیامەت کۆتایی پێ نایەت، ئنجا کە ئەوان دەپرسن: کێ ئێمەی لە گۆڕەکانمان دەرهێنایەوە؟

وەڵام دەدرێنەوە:

٤)- ﴿هَٰذَا مَا وَعَدَ ٱلرَّحۡمَٰنُ﴾، ئەمە ئەوەبوو کە (خوای) بەبەزەیی بەڵێنی دابوو.

٥)- ﴿وَصَدَقَ ٱلۡمُرۡسَلُونَ﴾، پێغەمبەرەکانیش، ڕەوانەکراوەکانیش ڕاستیان کرد، کە دەیانگوت: زیندووکرانەوە هەیەو لێپرسینەوەو سزاو پاداشت هەیە، ئنجا ئایا ئەمە قسەی کێیە؟

أ- دەگونجێ قسەی خۆیان بێ، پێشێ دەڵێن: کێ ئێمەی زیندوو کردەوە، کە لە حاڵەتی سەرسوڕمان و شڵەژان دان، دوایی بیریان دەکەوێتەوەو دەڵێن: ئەمە ئەوەبوو کە (خوای) بەبەزەیی بەڵێنی دابوو، ڕەوانەکراوەکانی خواش ڕاستیان کرد.

ب- دەشگونجێ قسەی فریشتەکان بێ، واتە: فریشتەکان پێیان دەڵێن: ئەمە ئەوەیە کە (خوای) بەبەزەیی بەڵێنی پێدابوون و، پێغەمبەرانیش ڕاستیان فەرموو.

ج- یاخود لە بەینی خۆیاندا ئەم قسەیە لەگەڵ یەکدیدا دەکەن.

کە دەڵێن: ﴿وَصَدَقَ ٱلۡمُرۡسَلُونَ﴾، ئەوە سێ ڕاستیی گرنگی تێدان:

## سێ ڕاستیی گرنگ

یەکەم: ئەم گەردوونە، ئەم ژیان و دنیاو مرۆڤ و دەوروبەرە، خاوەنێکی هەیە، کە خوایە ﷻ.

دووەم: ئەم ژیانی دنیایە، قۆناغێکە لە قۆناغەکان، قۆناغێکی ڕاگوزەرەو قۆناغی دیکەی بەدوادا دێن.

سێیەم: خوا ﷻ، مرۆڤەکانی وێڵ نەکردوە، وەك چۆن سیستم و بەرنامەی بۆ هەموو شتێك داناوە، بە پێغەمبەرانیشدا (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، پەیام و بەرنامەی خۆی بۆ مرۆڤەکان ناردوە.

٦)- ﴿ إِن كَانَتْ إِلَّا صَيْحَةً وَاحِدَةً ﴾، ئەو فووی دووەمە، یاخود ئەو زیندووکرانەوەو هەڵسێنرانەوەیە، تەنیا یەك هاڕژن بوو، یەك دەنگی گەورە بوو.

٧)- ﴿ فَإِذَا هُمْ جَمِيعٌ لَّدَيْنَا مُحْضَرُونَ ﴾، کتوپڕ هەموویان، واتە: مرۆڤەکان هەموویان، وێکڕا لە لای ئێمە ئامادەکراو بوون، (إذا): (إذا الفُجَائِيَة)یە، یانی: بێ وەخران، (تنوین)ی سەر ﴿ جَمِيعٌ ﴾، قەرەبووی پاڵوەلادراو (مُضاف إليه) دەکاتەوە، واتە: (جَمِيْعُهُم)، هەموو مرۆڤەکان، یان هەموو ئەوانەی نکووڵییان دەکرد، لە هاتنی ڕۆژی دوایی، بە هەردوو قۆناغی ئاخیر زەمان و زیندوو کرانەوەوە، هەموویان وێکڕاو تێکڕا، لە لامان ئامادە کراوبوون.

٨)- ﴿ فَالْيَوْمَ لَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئًا ﴾، ئەمڕۆ هیچ کەسێك، هیچ ستەمێکی لێ ناکرێ.

وشەی (اليَوْم) (ظَرْف)ە و (أل)ەکە، کە لەسەریەتی بۆ ناساندنە، واتە: ئەمڕۆ ئەو ڕۆژەیە، کە بەڵێن درابوو، ﴿ نَفْسٌ ﴾ یانی: هیچ کەسێك، کە بە نەزانراو (نَكِرة) هاتوە، هەروەها ﴿ شَيْئًا ﴾یش، هەر بە نەزانراو (نَكِرة) هاتوە، واتە:

هەمـوو جـۆرە سـتەمێك، كـەم و زۆری لـە هەمـوو جـۆرە كەسـێك لاچـووە، ئـەو كەسـانەی كـە شایسـتەی سـزادران بـوون، هیـچ جـۆرە سـتەمێكیان لێناكـرێ، هیـچ جـۆرە سـتەمێك لـە هیـچ جـۆرە كەسـێك ناكـرێ، ئـەم مانایـەش بەهـۆی ئەوەوەیـە، كـە هـەم ﴿نَفۡسٞ﴾، بـە (نَكِـرة) هاتـوە، هـەم ﴿شَيۡـًٔا﴾ش بـە (نَكِـرة) هاتـوە.

٩)- ﴿وَلَا تُجۡزَوۡنَ إِلَّا مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾، {خوای پەروەردگار دەفەرموێ:} سزاش نادرێن، مەگەر بە ئەندازەی ئەوە كە كردووتانە، یاخود وشەی ﴿تُجۡزَوۡنَ﴾، (جَزَاء) هەم بۆ پاداشت (ثَوَاب) بەكاردێ، هەم بۆ سزا (عِقَاب)یش، واتە: بەرانبەرتان نادرێتەوە، مەگەر بەپێی ئەوە كە كردووتانە، ئنجا ئەوەی چاكی كردبێ، پاداشتی چاكی دەدرێتەوە، بە ئەندازەی كردەوەكەی و، ئەوەی خراپەی كردبێ، سزای خراپەكەی، دیسان بە ئەندازەی كردەوەكەی، دەبێ، ﴿إِلَّا مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾، واتە: (إلاَّ مَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَه)، مەگەر بە ئەندازەی ئەوە كە دەتانكردو ئەنجامتان دەدا، بەڵام ڕاناوی (ه)ی سەر (تَعْمَلُونَه) فڕتێنراوە، چونكە بەڕەوت و سەلیقە زانراوە.

**مەسەلەی سێیەم:**

**باسی پاداشتی بەهەشتیان، کە شادمانانە سەرگەرمی خۆشیی و لەززەتن و، خۆیان و هاوسەرانیان لەسەر تەختان، لە سێبەران دا پاڵیان داوەتەوەو، هەرچی دڵیان بیخوازێ، هەیانەو، خواش ﷻ سەلامیان لێ دەکات:**

خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ أَصْحَٰبَ ٱلْجَنَّةِ ٱلْيَوْمَ فِى شُغُلٍ فَٰكِهُونَ ﴿٥٥﴾ هُمْ وَأَزْوَٰجُهُمْ فِى ظِلَٰلٍ عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ مُتَّكِـُٔونَ ﴿٥٦﴾ لَهُمْ فِيهَا فَٰكِهَةٌ وَلَهُم مَّا يَدَّعُونَ ﴿٥٧﴾ سَلَٰمٌ قَوْلًا مِّن رَّبٍّ رَّحِيمٍ ﴿٥٨﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿إِنَّ أَصْحَٰبَ ٱلْجَنَّةِ ٱلْيَوْمَ فِى شُغُلٍ فَٰكِهُونَ﴾، بە دڵنیایی هاوەڵانی بەهەشت، ئەمڕۆ [لە ڕۆژی دواییدا] شادمانانە سەرگەرم و سەرقاڵن، ﴿شُغُلٍ﴾، خوێندراویشەتەوە: (شُغْل)، هەم بە بۆر (ضَمّ) هەم بە زەنە (سكون)، خوێنراوەتەوە، (شغل) واتە: سەرگەرمیی و، سەرقاڵ بوون و خەریك بوون، ﴿فَٰكِهُونَ﴾، کە خوێنراویشەتەوە: (فَكِهون)، کەواتە: تاکەکەیان (فَاكِه) و (فَكِه)ن، (الفَاكِهُ ذُو الفُكَاهَة، وَهِيَ المِزاحُ بِالْكَلَامِ، المُسِرُّ المُضْحِك)، (فاكِه) واتە: خاوەن (فُكَاهَة)، ئەویش بریتیە لە گاڵتە کردن بە قسە، قسەیەك کە مرۆڤ دڵخۆش بکات و، مرۆڤ بێنێتە پێکەنین و خەندەی بخاتە سەر زار، کەواتە: هاوەڵان خاوەنانی بەهەشت، ئەمڕۆ شادمانانە و دڵخۆشانە سەرگەرمن، بێگومان سەرگەرمی لەززەت و شادیی و ڕابواردنن.

٢)- ﴿هُمْ وَأَزْوَٰجُهُمْ فِى ظِلَٰلٍ عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ مُتَّكِـُٔونَ﴾، خۆیان و هاوسەرانیان، لە سێبەراندا، لەسەر تەختان، پاڵیان داوەتەوە، شانیان داداوە، ﴿ٱلْأَرَآئِكِ﴾، کۆی (أَرِيكَة)یە، بەو تەختە دەگوترێ، کە سەراپەردەی هەیە، ﴿مُتَّكِـُٔونَ﴾، پاڵدراوەن، شان دادەرن، پێشتر لە شیکردنەوەی وشەکاندا، باسی حاڵەتی (إتِّكَاء)مان کرد، کە ئەوەیە ئینسان ئانیشك دابدات و سەری و شانی نەکەوێتە سەر جێگا، لەسەر تەنیشتێکی شان دابدات.

وشـەی ﴿ فِي ظِلَٰلٍ ﴾، کـۆی (ظِـلّ)ە، واتـە: لـە سـێبەران دا، ئەمـە بـە جۆرێکـی دیکـەش خوێندراوەتـەو: (فِي ظُلَلٍ)، کـە کـۆی (ظُلَّه)یـە، (وهِـيَ مَـا يُظِـلُّ كَالْقُبَّـة)، هـەر شـتێکە کـە سـێبەرت لێبـکات وەك قوببـە، وەك گومبەزێـك، یـان شـتێك لەسـەرتەوە بـێ، کەواتـە: بەهەشـتییەکان خۆیـان و هاوسـەرانیان، لـە سـێبەراندا، لەسـەر تەختـان، شـانیان داداوەو پاڵیـان داوەتـەوە.

٣)- ﴿ لَهُمْ فِيهَا فَٰكِهَةٌ ﴾، ئەوان میوەیان بۆ هەیە، (فَاكِهَة: مَا يُؤْكَلُ للتَلَذُّذِ)، ئەوەی کە بۆ لەززەت وەرگرتن، دەخورێ، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ لَهُمْ فِيهَا فَٰكِهَةٌ ﴾، دیسان ئەویش بە نەناسراو (نَكِرة) هاتوە، واتە: میوەیەکی زۆرو جۆراو جۆر، هەموو جۆرەکانی میوە.

٤)- ﴿ وَلَهُم مَّا يَدَّعُونَ ﴾، هەروەها بۆ ئەوان هەیە، هەرچی بیخوازن، وشەی ﴿ يَدَّعُونَ ﴾، یان لە (دُعَاء)ەوە هاتوە، (وَالإفْتِعَالُ هُنَا يَجْعَلُ فِعْلَ الدُّعَاءِ هُنَا قَاصِرَاً أي: مَا يَدْعُونَ لأنْفُسِهِمْ)، یانی: ڕێژگەی (إفْتِعَال) مانای کرداری (يَدْعُونَ) دەکاتە کورتکەرەوە (لازم)، ئەوەی بانگی دەکەن بۆخۆیان، یاخود ﴿ مَّا يَدَّعُونَ ﴾ (مِنَ الإدِّعَاءِ أي: يَدْعُونَ ذَلِكَ حَقّاً لَهُمْ)، واتە: ئەوەی وەك مافێکی خۆیان داوای دەکەن، وەك لە سووڕەتی (فصلت)دا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِيٓ أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ ﴿٣١﴾ ﴾، بۆ ئێوە لەوێدا هەیە هەر شتێك دەروونتان بیخوازێ و، بۆ ئێوە تێدایە هەر شتێك داوای بکەن.

٥)- ﴿ سَلَٰمٌ قَوْلًا مِّن رَّبٍّ رَّحِيمٍ ﴾ سڵاو گوتنێك لە پەروەردگارێکی بەبەزەییەوە، واتە: ئەمەشیان بۆ هەیە، وشەی: ﴿ سَلَٰمٌ ﴾، یانی: (يُقَالُ لَهُم سلام قولاً مِنْ الله)، سەلامیان پێدەگوترێ لە خواوە، ﴿ سَلَٰمٌ ﴾، دەگونجێ نیهاد (مُبْتَدَأ) بێ، ئایا گوزارە (خَبَر)ەکەی چییە؟ بەرکاری ڕەها (مَفْعُول مُطْلَق)یەو، لە شوێنی گوزارە دانیشتوە، ﴿ سَلَٰمٌ قَوْلًا ﴾، (سَلَامٌ يُقَالُ لَهُم قَوْلَا)، سڵاوکردنیان پێ دەگوترێ، ﴿ مِّن رَّبٍّ رَّحِيمٍ ﴾، لە پەروەردگارێکی میهرەبانەوە.

ئـەو مەسـەلەیە فەرمایشـتێکی پێغەمبـەر ﷺ هەیـە زیاتـر ڕوونـی دەکاتـەوە، کـە دوایـی دەیهێنیـن، ئـەم ئایەتانـەش مەبەسـت پێیـان ئەوەیـە، کـە وێـڕای ئـەوەی

ئەوانە هەرچی نەفسیان بیخوازێ هەیانە، لە بەهەشتداو، خۆیان و هاوسەرانیان، لە سێبەراندا پاڵیان داوەتەوەو، شانیان داداوەو، قسەی خۆش دەکەن، شادمانانە دڵخۆشن، پێدەکەنن، وێڕای ئەوە: هەرچی داواشی بکەن بۆیان دەبێ و، هەرچی بیخوازن لەلایان هەیەو، ئەو نیعمەتانەی هەشیانن، تەنیا بۆ لەززەت وەرگرتنن، بۆیەش زیاتر وشەی ﴿ فَٰكِهَةٞ ﴾، بەکارهێنراوە لە قورئاندا، چونکە ﴿ فَٰكِهَةٞ ﴾، بریتیە لەوەی مرۆڤ دەیخوا، بۆ لەززەت وەرگرتن و چێژ وەرگرتن، نەك بۆ ئەوەی لە برسێتیی خۆی پێ تێر بکات و، لە تینوێتیی خۆی پێ تێر ئاو بکات.

ئەو فەرمایشتەش کە زیاتر تیشکمان بۆ دەخاتەسەر، چۆنیەتیی ئەو سەلام لێکردنەی خوا ﷻ، بۆ ئەهلی بەهەشت، ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:

{بَيْنَا أَهْلُ الْجَنَّةِ فِي نَعِيمِهِمْ إِذْ سَطَعَ لَهُمْ نُورٌ، فَرَفَعُوا رُءُوسَهُمْ فَإِذَا الرَّبُّ تَبَارَكَ وَتَعَالَى قَدْ أَشْرَفَ عَلَيْهِمْ مِنْ فَوْقِهِمْ، فَقَالَ السَّلَامُ عَلَيْكُمْ يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ! قَالَ وَذَلِكَ قَوْلُهُ تَعَالَى: ﴿ سَلَٰمٞ قَوۡلٗا مِّن رَّبّٖ رَّحِيمٖ ﴾، فَيَنْظُرُ إِلَيْهِمْ وَيَنْظُرُونَ إِلَيْهِ، فَلَا يَلْتَفِتُونَ إِلَى شَيْءٍ مِنَ النَّعِيمِ مَا دَامُوا يَنْظُرُونَ إِلَيْهِ، حَتَّى يَحْتَجِبَ عَنْهُمْ وَيَبْقَى نُورُهُ وَبَرَكَتُهُ عَلَيْهِمْ فِي دِيَارِهِمْ} (أخرجه ابن ماجه: ١٨٤، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، ضَعَّفَهُ الألباني).

واتە: لە کاتێکدا کە ئەهلی بەهەشت، لە نێو نازو نیعمەتی خۆیان دان، ڕووناکییەکی زۆر لێیان دەردەکەوێ، ڕووناکییەك لێیان دەدا، سەر بەرز دەکەنەوە تەماشا دەکەن، خوا (تَبَارَكَ وَتَعَالَى) تەماشایان دەکات، لە سەروویانەوە، دەفەرموێ: سەلامتان لێبێ ئەی خەڵکی بەهەشت! فەرمووی: ئەوە فەرمایشتەکەیە کە دەفەرموێ: ﴿ سَلَٰمٞ قَوۡلٗا مِّن رَّبّٖ رَّحِيمٖ ﴾، خوا ﷻ تەماشای بەهەشتییان دەکات و ئەوانیش تەماشای خوا ﷻ دەکەن، هەتا خوا ببینن، ئاوڕ لە هیچ شتێکی دیکە نادەنەوە، تاکو خۆییان لێ پەردەپۆش دەکا، بەڵام ڕووناکیی و پیت و پێزەکەی، لە مەنزڵگاکانیاندا هەر لەسەریان دەمێنێ.

**(القُرطبي)** لێرەدا لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1] دەڵێ: **(ذَكَرَهُ الثَّعْلَبِيُّ وَالقُشَيْرِيُّ، وَمَعْنَاهُ ثَابِتٌ فِي صَحِيحِ مُسْلِمٍ وَقَدْ بَيَّنَاهُ فِي يُونُس عِنْدَ قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿لِّلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ ٱلۡحُسۡنَىٰ وَزِيَادَةٞ﴾)**.

واتە: مانای ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ، هەم **(ثَعْلبي)** باسی کردوە، هەم **(قُشَيْري)**یش باسی کردوەو، مانایەکەیشی چەسپاوە لە **(صحيح مُسلم)**دا هاتوە، کە پێشتر لە سوورەتی **(یونُس)**دا، لەلای قسەی خوای بەرز، کە دەفەرموێ: ﴿لِّلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ ٱلۡحُسۡنَىٰ وَزِيَادَةٞ﴾، لەوێ ڕوونمان کردۆتەوە.

دیارە ئێمەش بەهەمان شێوەو لە تەفسیری سوورەتی **(یونُس)**داو لە کاتی تەفسیرکردنی ئەم ئایەتە موبارەکەدا: ﴿لِّلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ ٱلۡحُسۡنَىٰ وَزِيَادَةٞۖ وَلَا يَرۡهَقُ وُجُوهَهُمۡ قَتَرٞ وَلَا ذِلَّةٌۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ۝٢٦﴾یونس، باسێکی تایبەتم لەبارەی دیتنی خوای پەروەردگارەوە، لەلایەن ئەهلی بەهەشتەوە کردوە.

هەروەها لە تەفسیری سوورەتی **(الأنعام)**دا، لەوبارەوە لە ژێر تیشکی ئەم ئایەتە موبارەکەدا کە دەفەرموێ: ﴿لَّا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَهُوَ يُدۡرِكُ ٱلۡأَبۡصَٰرَۖ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلۡخَبِيرُ ۝١٠٣﴾، باسێکی تێرو تەسەل و سەربەخۆمان لەوبارەوە کردوە، کە وەك نامیلکەیەك بە جیاش چاپ کراوە، لە ژێر ناوونیشانی: (بینینی خوای بەرز لە دنیاو دواڕۆژدا)، لە حاڵەتی خەوندا لە دنیاداو، لە حاڵەتی بێدارییدا، بە چاوی سەر لە بەهەشت دا بۆ بڕواداران.

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج١٥، ص٤٥.

## مەسەلەی چوارەم:

**فەرمانکردنی خوا بە هەڵاوێردرانی تاوانباران و، سەرزەنشتکردنی خوا، بۆ گومڕایانی نەوەی ئادەم، کە هەرچەندە ئاگاداری کردبوونەوەو هۆشیاریی پێدابوون، لە نەپەرستنی شەیتان و، گرتنەبەری ڕاستە ڕێی خواپەرستیی، کەچی شەیتان زەفەری پێبردوون و، کۆمەڵێکی زۆری لێ گومڕا کردوون، ئێستاش دەبێ، لەو دۆزەخەدا کە بەدرۆیان دادەنا، سزا بدرێن و، بپێشێنرێن و، ببرژێنرێن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱمۡتَٰزُواْ ٱلۡيَوۡمَ أَيُّهَا ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴿٥٩﴾ أَلَمۡ أَعۡهَدۡ إِلَيۡكُمۡ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعۡبُدُواْ ٱلشَّيۡطَٰنَۖ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٦٠﴾ وَأَنِ ٱعۡبُدُونِيۚ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسۡتَقِيمٌ ﴿٦١﴾ وَلَقَدۡ أَضَلَّ مِنكُمۡ جِبِلّٗا كَثِيرًاۖ أَفَلَمۡ تَكُونُواْ تَعۡقِلُونَ ﴿٦٢﴾ هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ ٱلَّتِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ ﴿٦٣﴾ ٱصۡلَوۡهَا ٱلۡيَوۡمَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡفُرُونَ ﴿٦٤﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿ وَٱمۡتَٰزُواْ ٱلۡيَوۡمَ أَيُّهَا ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴾، (و)ی سەر (وامتازوا) بۆ بادانەوەو گێڕانەوەیەو ئەم ڕستەیەو ئەم باس و خواسە، دەگێڕێتەوە سەر: ﴿ سَلَٰمٞ قَوۡلٗا مِّن رَّبّٖ رَّحِيمٖ ﴾، کە خوا سەلام لە بڕواداران دەکات، واتە: خوا وەك چۆن ئەوە بە بەهەشتییان دەفەرموێ: بە دۆزەخییانیش دەفەرموێ: ﴿ وَٱمۡتَٰزُواْ ٱلۡيَوۡمَ أَيُّهَا ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴾، ئەمڕۆ جیابنەوە ئەی تاوانباران! یاخود، ئەم ڕستانە دەگێڕدرێنەوە سەر: ﴿ إِنَّ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ ٱلۡيَوۡمَ فِي شُغُلٖ فَٰكِهُونَ ﴾، بێگومان خاوەنانی بەهەشت، هاوەڵانی بەهەشت، ئاوا لە لەززەت و ڕابواردن و خۆشییدا، شادمانانە دەیگوزەرێنن، بەڵام کافرەکان پێیان دەگوترێ: ئەی تاوانبارینە! ئەمڕۆ جیابنەوە، ﴿ وَٱمۡتَٰزُواْ ٱلۡيَوۡمَ ﴾، واتە: ئەمڕۆ کە ڕۆژی دواییە، جیابنەوە، ﴿ أَيُّهَا ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴾، ئەی تاوانباران! (إِمْتَازُوا، مُطَاوِعُ مَازَهُ) واتە: جیای کردەوە (إِذَا أَفْرَدَهُ عَمَّا كَانَ مُخْتَلِطًا مَعَهُ)، شتێك جیا بکرێتەوەو تاك بکرێتەوە لە شتێك کە لەگەڵیدا تێکەڵە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱمۡتَٰزُواْ ﴾، جیابنەوە، ئەم فەرمانە، فەرمانی تەکوینییەو ئەوە نیە خوا

ﷺ، لە قیامەت پێیان بفەرموێ: جیاببنەوە، بەڵکو مەبەست ئەوەیە، کە زۆر بە خێرایی، تاوانباران لە بڕواداران جیادەکرێنەوەو هەڵداوێردرێن، هەرکەسە و بە پێی سزاو، شوێنی پڕ بەپێست و شایستەی خۆی بەڕێ دەکرێ، وەك لە کۆتایی سوورەتی (الزمر) ئایەتی ژمارە (٧١)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿وَسِيقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ زُمَرًا﴾، ئەوانەی بێبڕوابوون کۆمەڵ کۆمەڵ بەرەو دۆزەخێ بەڕێکران. دواییش لە ئایەتی ژمارە (٧٣)دا دەفەرموێ: ﴿وَسِيقَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ رَبَّهُمۡ إِلَى ٱلۡجَنَّةِ زُمَرًا﴾، ئەو کەسانەش کە پارێزیان لە لە پەروەردگاریان کردوە، پۆل پۆل و کۆمەڵ کۆمەڵ، بەرەو بەهەشتێ بەڕێکران.

٢)- ﴿أَلَمۡ أَعۡهَدۡ إِلَيۡكُمۡ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعۡبُدُواْ ٱلشَّيۡطَٰنَ﴾، ئەی ئەوەی ئادەم! ئایا پێم ڕانەگەیاندبوون، ئاگادارم نەکردبوونەوە، کە شەیتان نەپەرستن؟ دەڵێ: (العَهْدُ: الوِصَايَة)، (عهد) بریتیە لە ڕاسپاردن و، ڕاسپاردنیش ئەوەیە، کە بە گرنگیی پێدانەوە ئامۆژگاریی بکرێ، ئایا ئامۆژگارییم نەکردبوون و ڕام نەسپاردبوون، ئەی وەچەی ئادەم، کە شەیتان نەپەرستن و بۆی ملکەچ نەبن، فەرمانبەریی نەکەن؟! دیارە پەرستنی شەیتان، وەك جاری دیکەش باسمان کردوە، ئەوە نیە کەسێك ڕکووع و کڕنووش بۆ شەیتان بەرێ، هەرچەندە ئەوەش هەر هەیە، ئێستا لە لایەن کەسانێکەوە، کە ڕاستەوخۆ شەیتان دەپەرستن، بەڵکو مەبەست لە پەرستنی شەیتان: فەرمانبەریی کردن و بە قسەکردنیەتی لەو شتانەدا، کە بە تاوان و سەرپێچیی لە قەڵەم دەدرێن.

٣)- ﴿إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ﴾، بە دڵنیایی ئەو بۆ ئێوە دوژمنێکی ئاشکرایە، وشەی ﴿مُّبِينٞ﴾، لێرەدا لە (أَبَانَ)ی (لازم)ەوە هاتوە، (أبان: ظهر) دەرکەوت ﴿مُّبِينٞ﴾، واتە: ئاشکراو ڕوون، چونکە (أَبَانَ)، وەك پێشتر زۆر جار گوتوومانە: کرداری ڕابردوویە، هەم حاڵەتی (لازم)ی هەیە، وەك: (أَبَانَ القَمَرُ)، مانگەکە دەرکەوت، کە لێرەدا بەمانا لازیمەکەی هاتوەو، جاری واش هەیە (أَبَانَ) (متعدّي) دەبێ و بە مانای (بَيَّنَ) دێ، (أَبَانَ المُدَرِّسُ الدَرسَ)، وانەبێژەکە وانەکەی ڕوونکردەوە، بەڵێ ﴿مُّبِينٞ﴾ دەگونجێ لە (أَبَانَ) ی (لازم)ەوە بێ، یاخود لە (أَبَانَ)ی (مُتَعَدّي)یەوە بێ و، بەپێی سیاقەکە دیاریی دەکرێ کامیانە؟ جاری واش هەیە هەردووکیان گونجاون، بۆ وێنە: ﴿تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ

(١) ﴿یوسف، ﴿ مُّبِينٌ ﴾، دەگونجێ بە مانای ڕوونکەرەوە بێ و، دەشگونجێ بە مانای ڕوون و ئاشکرا بێ.

٤)- ﴿ وَأَنِ ٱعْبُدُونِىۚ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴾، هەروەها {ئایا پێم ڕانەگەیاندبوون} کە تەنیا بەندایەتیی بۆ من بکەن، ئا ئەمە ڕاستە ڕێیە، وشەی: (أَن)، لێرەدا (أن التفسيريّة) ی پێ دەڵێن، ئایا وەك چۆن پێمگوتن: بەندایەتیی و، پەرستن بۆ شەیتان مەکەن، پێشم نەگوتبوون: کە تەنیا من بپەرستن، ئا ئەوە ڕاستە شەقامە؟!

٥)- ﴿ وَلَقَدْ أَضَلَّ مِنكُمْ جِبِلًّا كَثِيرًا ﴾، بەدڵنیایی کۆمەڵێکی زۆری لێ گومڕا کردوون، ﴿ جِبِلًّا ﴾، بە دوو جۆری دیکەش خوێندراوەتەوە: أ- (جُبْلاً)، ب- (جَبْلاً)، کە هەردووکیان بە مانای کۆمەڵێکی زۆرن و، لە وشەی (جَبَل)ەوە هاتوون، وەك چۆن (جَبَل) چیا، گەورەو زەبەلاحە، ئەو کۆمەڵە خەڵکە زۆرەش، لە زۆریی و لە مەزنییدا، وەك چیایەك بوون، زۆری لێ گومڕا کردن و زۆری هەتڵە کردن، لە ڕاستە شەقام.

٦)- ﴿ أَفَلَمْ تَكُونُوا۟ تَعْقِلُونَ ﴾، ئایا وانەبوو کە بفامن؟ لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ أَفَلَمْ تَكُونُوا۟ تَعْقِلُونَ ﴾، (زِيَادَةُ فِعْلِ الكَوْنِ إِيمَاءٌ إلى أَنَّ العَقْلَ لَمْ يَتَكَوَّنْ لَدَيْهِمْ)، زێدە کردنی کرداری ﴿ تَكُونُوا۟ ﴾ ئاماژەیە بۆ ئەوە کە عەقڵ لەلایان هەر دروست نەبووە.

بێگومانیش ئەو پرسیار کردنە، پرسیارکردنی نکووڵیلێکەرانەیە، واتە: هۆشتان بەکارنەهێنا، خوا عەقڵی پێدابوون، بەڵام بەکارتان نەهێنا، ئنجا شتێك بەکارنەهێنرێ، لە حوکمی نەبوون دایە، وەك خوا لە سوورەتی (الأعراف) ئایەتی ژمارە (١٧٩)دا دەفەرموێ: ﴿ لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ ءَاذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَآ ﴾، واتە: دڵیان هەیە پێیان تێناگەن، چاویان هەیە پێیان نابینن و، گوێشیان هەیە، بەڵام پێیان نابیستن.

٧)- ﴿ هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴾، ئەمە ئەو دۆزەخەیە، کە ئێوە بەڵێنتان پێ دەدرا، بەڵام لێرەدا ﴿ تُوعَدُونَ ﴾، یانی: هەڕەشەتان پێی لێدەکرا.

٨)- ﴿ ٱصۡلَوۡهَا ٱلۡيَوۡمَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡفُرُونَ ﴾، ئەمڕۆ بیچنە نێو، تێیدا بپیشێنرێن و ببرژێنرێن، بە سووتاندنێکی تایبەت بەهۆی بێبڕواییتانەوە، یان: بەهۆی سپڵەییتانەوە.

﴿ ٱلۡيَوۡمَ ﴾، ناساندنەکەی بۆ (عَهْد)ە، واتە: ئەمڕۆ ڕۆژەکەیە، کە لە دۆزەخدا دەپیشێنرێن.

چونکە دەگونجێ (کفر) لێرەدا بە مانای بێبڕوایی بێ و، دەشگونجێ بە مانای کوفرانی نیعمەت بێ، یانی: ئێوە بەرانبەر بە چاکەکانی خوا سپڵەو پێ نەزان بوون.

کەواتە: ئەمە حاڵ و باڵی بێبڕوایانێکە، کە لە دنیادا خۆیان لە ئیمانداره‌کان بە زیاد دەگرت و، لافیان بەسەردا لێ دەدان، ئیمتیازی ماددیی و مەعنەوییان بۆ خۆیان بڕیار دەدا، بەسەر بڕواداراندا، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱمۡتَٰزُواْ ٱلۡيَوۡمَ ﴾، ئەمڕۆش جیابنەوە، لە دنیادا خۆتان لە بڕواداران جیادەکردەوە، خۆتان لە خەڵك جیادەکردەوە، چ لە سەروەت و سامان وەسەریەکنان دا، چ لە خۆسەپاندنی سیاسییدا، چ لە چەواشەکردندا، چ لە شێوازی ژیان و گوزەران و بواری کۆمەڵایەتییتاندا، لە هەموو شتێك دا خۆتان لە خەڵك جیادەکردەوە، ئەمڕۆش جیابنەوە، کاتی خۆی لە دنیادا ئیمتیازتان بۆ خۆتان بڕیار دەدا، ئیمتیازی ناشەرعیی، ئەمڕۆش با ئەو ئیمتیازەتان هەبێ، بەو شێوەیە ژیان بگوزەرێنن لە دۆزەخدا، بە هۆی بێبڕوایی یان بە هۆی سپڵەیی و پێ نەزانییتانەوە.

**مەسەلەی پێنجەم و کۆتایی:**

**مۆر بەسەر زارەوەنرانی کافران و، وەگۆهێنانی دەستیان و، شایەدیی دانی لاقیان و، هەڕەشە لێکرانیان، بە سڕینەوەی چاویان و مەسخ کردنیان و، ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە، کە هەر کەسێك زۆر بە تەمەندا بچێ، لە ڕووی جەستەییەوە، پێچەوانەو بەراوەژوو دەبێتەوە، بەرەو دوا دەگەڕێتەوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱلْيَوْمَ نَخْتِمُ عَلَىٰٓ أَفْوَٰهِهِمْ وَتُكَلِّمُنَآ أَيْدِيهِمْ وَتَشْهَدُ أَرْجُلُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٦٥﴾ وَلَوْ نَشَآءُ لَطَمَسْنَا عَلَىٰٓ أَعْيُنِهِمْ فَٱسْتَبَقُوا۟ ٱلصِّرَٰطَ فَأَنَّىٰ يُبْصِرُونَ ﴿٦٦﴾ وَلَوْ نَشَآءُ لَمَسَخْنَٰهُمْ عَلَىٰ مَكَانَتِهِمْ فَمَا ٱسْتَطَٰعُوا۟ مُضِيًّا وَلَا يَرْجِعُونَ ﴿٦٧﴾ وَمَن نُّعَمِّرْهُ نُنَكِّسْهُ فِى ٱلْخَلْقِ ۖ أَفَلَا يَعْقِلُونَ ﴿٦٨﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئایەتەکان، لە دە بڕگەدا:

۱)- ﴿ ٱلْيَوْمَ نَخْتِمُ عَلَىٰٓ أَفْوَٰهِهِمْ ﴾، ئەمڕۆ مۆر بەسەر زاریانەوە دەنێین، وشەی: ﴿ ٱلْيَوْمَ ﴾، لەم چەند ئایەتەدا، چوار جاران دووبارە بۆتەوە، دوویان بۆ ئیمانداران و، پاداشتیان لە ڕۆژی دواییداو، دووشیان بۆ بێبڕوایان و، سزایان لە ڕۆژی دواییدا، ﴿ ٱلْيَوْمَ ﴾، (أل)ەکە، دیسان بۆ (عَهْد)ە، واتە: ئەمڕۆ ڕۆژەکەیە، کە مۆر بەسەر زاریانەوە دەنێین، مۆر بەسەر زارەوە نران، واتە: زاریان دادەخەین و وادەکەین زمانیان گۆ نەکات، زاریان قسەی پێ نەکرێ.

۲)- ﴿ وَتُكَلِّمُنَآ أَيْدِيهِمْ ﴾، دەستەکانیان دەماندوێنن، واتە: دەستەکانیان دەماندوێنن، لە بارەی کردەوەکانیانەوە.

۳)- ﴿ وَتَشْهَدُ أَرْجُلُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴾، لاقەکانیشیان شایەدیی دەدەن، کە چییان کردوەو چییان وەدەست هێناوە؟ زانایانی ڕەوانبێژیی گوتوویانە: ئەمە جۆرێك لە چنین و تێکهەڵکیشیی (إحْتِبَاك)ی تێدایە، کە ئاوای لێدێتەوە:

(تُكَلِّمُنَا أَيْدِيهِمْ وَتَشْهَدُ، وتشهد أرْجُلُهُم فتتكلم)، یانی: دەستەکانیان دەماندوێنن و شایەدیی دەدەن و، لاقەکانیان شایەدیی دەدەن و دەماندوێنن.

﴿بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ﴾، ئەمە لەسەر شێوەی (تَنَازع)ەو هەردووکیان داوای دەکەن، هەم (تُكَلِّمُنَا) هەم (تَشْهَدُ)، هەردووکیان شەڕیان دەبێ لەسەر ﴿بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ﴾، واتە: هەم دەستەکانیان دەماندوێنن و، لاقەکانیشیان شایەدیی دەدەن، لەسەر ئەوەی دەیانکرد، ﴿بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ﴾، کە ئەسڵ دا: (بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَهُ) بووە، بە هەردووکیانەوە پەیوەستە.

٤)- ﴿وَلَوْ نَشَآءُ لَطَمَسْنَا عَلَىٰٓ أَعْيُنِهِمْ فَأَنَّىٰ يُبْصِرُونَ﴾، ئەگەر ویستباشمان، چاویانمان دەسڕیەوە، ئنجا ئایا چۆن دەیاندی؟ وشەی (لَوْ: حَرْفُ امْتِنَاعٌ لامْتِنَاع)، (لو) پیتێکە بەکارهێنراوە بۆ نەکردنی شتێك، لەبەر نەکردنی شتێك، واتە: ئەگەر ویستبامان چاویانمان دەسڕیەوە، بەڵام نەمانویستوە، بۆیە چاومان نەسڕینەوە.

٥)- ﴿وَلَوْ نَشَآءُ لَمَسَخْنَٰهُمْ عَلَىٰ مَكَانَتِهِمْ﴾، هەروەها ئەگەر ویستبامان، لە شوێنی خۆیان وشکمان دەکردن، یاخود: دەمانگۆڕین، دەمانکردنە پەیکەرێك.

٦)- ﴿فَمَا ٱسْتَطَٰعُوا۟ مُضِيًّا وَلَا يَرْجِعُونَ﴾، ئەو کاتە نە دەیانتوانی بڕۆن، نە دەشیانتوانی بگەڕێنەوە.

ڕوونکەرەوانی قورئان (ڕەحمەتی خوایان لێبێ)، بە نسبەت ئەم دوو ئایەتە موبارەکەوە: ﴿وَلَوْ نَشَآءُ لَطَمَسْنَا عَلَىٰٓ أَعْيُنِهِمْ فَٱسْتَبَقُوا۟ ٱلصِّرَٰطَ فَأَنَّىٰ يُبْصِرُونَ ﴿٦٦﴾ وَلَوْ نَشَآءُ لَمَسَخْنَٰهُمْ عَلَىٰ مَكَانَتِهِمْ فَمَا ٱسْتَطَٰعُوا۟ مُضِيًّا وَلَا يَرْجِعُونَ ﴿٦٧﴾﴾،

دوو ڕایان هەن:

یەکەم: هەندێکیان گوتوویانە: مەبەست پێیان قیامەتە، یانی: لە ڕۆژی دواییدا، ئەگەر بمانەوێ ئاوایان لێ دەکەین.

دووەم: هەندێکیش گوتوویانە: مەبەست پێیان دنیایە.

بەڵام مـن پێـم وایـە بەڵنیایـی مەبەسـت پێـی دنیایـە، ئەگەرنـا لـە قیامـەت دا، هـەر خـوا دەزانـێ، چـۆن سـزایان دەدا و، چییـان لـێ دەکات، واتـە: ئەگـەر ویسـتبامان، وامـان لێدەکـردن، هـەر لـە دنیـادا چاویانمـان دەسـڕیەوە، ئـەو کاتـە چۆن دەیانبینـی! ﴿فَأَنَّىٰ﴾، یانـی: (كَيْـفَ) چۆن؟ ئەگـەر ویستباشـمان، لـە شـوێنی خۆیـان وشـکمان دەکـردن و دەمانکردنـە پەیکـەر، ئـەو کاتـە نەیاندەتوانـی، تێپەڕن بـڕۆن و بشـگەڕێنەوە، لـە جێـی خۆیـان وشـك دەبـوون، وشـەی (مَكَانَـة: تَأنِيـثُ المكان، عَلَى تأويلـه بالبُقْعَـة)، وشـەی (مَكَانَـة)، هـەر بـە مانـای (مَـكَان)ە، شـوێن، بـەڵام لـەو ڕووەوە، کـە بـە (بُقْعَـة)، مانـا کـراوە، بۆیـە بـە (مَكَانَـة) هاتـوە، وشـەی (طَمْـس) بـە مانـای سـڕینەوە (مَحْـو) دێ، وشـەی (مَسْـخ)یش بەمانـای ئـەوە دێ، جەسـتەی مـرۆڤ لـە حاڵێکـەوە بگـۆڕێ بـۆ حاڵێکـی دیکـە.

٧)- ﴿وَمَن نُّعَمِّرْهُ نُنَكِّسْهُ فِى ٱلْخَلْقِ أَفَلَا يَعْقِلُونَ﴾، هەر کەسێك تەمەنداریشی بکەین، لە جەستەیدا هەڵیدەگێڕینەوە، بەراوەژووی دەکەینەوە، ئایا نافامن؟! ﴿نُنَكِّسْهُ﴾، خوێندراویشەتەوە: (نُنْكِسْهُ)، هەر یەك واتایان هەیە.

﴿أَفَلَا يَعْقِلُونَ﴾، خوێنراویشـەتەوە: (أفَـلَا تَعْقِلُـون)، هـەر کەسـێك تەمەنـداری بکەیـن لـە جەسـتەیدا، هەڵیدەگێڕێنـەوە، سـەروبنی دەکەینـەوە، ئایـا نافامـن!

ئەمە زانایان بە دوو شێوە لێکیان داوەتەوە:

**یەکەم:** هەر کەس تەمەنداری بکەین، پێچەوانەی دەکەینەوە لە ڕووی پێکهاتەکەیەوە، عەقڵی کەم دەبێ، جەستەی ناسك دەبێ، ئێسکی باریك دبێ، پێستی تەنك دەبێ، تەبیعەتی دەگۆڕێ، بەهۆی کەوتنە تەمەنەوە.

**دووەم:** هەر کەسێك بیهێڵین، لە نێو خەڵکدا زەبوونی دەکەین، هەر کەسێك لە تەمەن دا بیهێڵینەوەو نەیمرێنین، زەبوونی دەکەین.

منیش پێـم وایـە یـانی: هەرکەسـێك بیهێڵینـەوە، ئەگەر بەو شـتانەی گوتراشـن سـزای نەدەیـن، ئـەوە هـەر نەبـێ بەهـۆی پیرییـەوە، کەنەفـت و بـۆ دواوە گـەڕاوەی دەکەین.

کۆتایی ئەم دەرسەشمان بەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ دێنین:

{عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ، قَالَ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَضَحِكَ فَقَالَ: «هَلْ تَدْرُونَ مِمَّ أَضْحَكُ»؟ قَالَ: قُلْنَا اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: «مِنْ مُخَاطَبَةِ الْعَبْدِ رَبَّهُ يَقُولُ: يَا رَبِّ أَلَمْ تُجِرْنِي مِنَ الظُّلْمِ؟ قَالَ: يَقُولُ بَلَى، قَالَ فَيَقُولُ: فَإِنِّي لا أُجِيزُ عَلَى نَفْسِي إِلاَّ شَاهِدًا مِنِّي، قَالَ فَيَقُولُ: كَفَى بِنَفْسِكَ الْيَوْمَ عَلَيْكَ شَهِيدًا، وَبِالْكِرَامِ الْكَاتِبِينَ شُهُودًا، قَالَ: فَيُخْتَمُ عَلَى فِيهِ، فَيُقَالُ لأَرْكَانِهِ انْطِقِي، قَالَ: فَتَنْطِقُ بِأَعْمَالِهِ، قَالَ: ثُمَّ يُخَلَّى بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْكَلاَمِ، قَالَ: فَيَقُولُ بُعْدًا لَكُنَّ وَسُحْقًا، فَعَنْكُنَّ كُنْتُ أُنَاضِلُ»} (أخرجه مسلم: ٢٩٦٩، وابن حبان: ٨٣٥٨، وأبو يعلى: ٩٠٧٧، والحاكم: ٨٧٨٧).

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بووین پێکەنی، دوایی هەر خۆی فەرمووی: دەزانن بە چی پێدەکەنم؟ گوتمان: خواو پێغەمبەرەکەی زاناترن، فەرمووی: بەهۆی ئەوەوە پێدەکەنم، کە بەندە لە ڕۆژی دواییدا، پەروەردگاری دەدوێنێ، دەڵێ: ئەی پەروەردگارم! ئایا تۆ منت پەنا نەداوە، لەوەی ستەمم لێ بکەی؟ فەرمووی: خوا دەفەرموێ: با، دەڵێ: من ڕێگاو مۆڵەت نادەم شایەدییم لەسەر بدرێ، مەگەر خۆم شایەدیی لەسەر خۆم بدەم، پێغەمبەر فەرمووی: خوا دەفەرموێ: باشە، ئەمڕۆ تەنیا خۆت شایەدیی لەسەر خۆت بدەو، فریشتە بەڕێزەکان با لەسەرت شایەد بن، ئنجا مۆری بەسەر زارەوە دەنرێ و، بە ئەندامەکانی دەگوترێ: قسە بکەن، ئەندامەکانیشی لە بارەی کردەوەکانیەوە قسە دەکەن، (شایەدیی لەسەر دەدەن)، دوایی جارێکی دیکە، زارو زمانی بۆ قسەکردن دەکرێتەوە، (ئەو مرۆڤەش) بە ئەندامەکانی دەڵێ: دووریی بۆ ئێوە، من بەرگرییم لە ئێوە دەکرد {بۆیە نکوولییم دەکرد لە کردەوەکان، کەچی خۆتان شایەدییتان لەسەر خۆتاندا}، دەبڕۆن با جێگەتان دۆزەخ بێ.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی، لەو کەسانەمان بگێڕێ، کە ئەگەر ئەندامەکانمان شایەدییان لەسەر داین، شایەدیی چاکەکاریمان بۆ بدەن، نەك شایەدیی کردەوە خراپەکانمان لە سەرمان بدەن.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

## پێناسەی ئەم دەرسە

لەم دەرسەماندا پازدە (١٥) ئایەتی کۆتایی، کە ئایەتەکانی: (٦٩ - ٨٣)ن، تەفسیر دەکەین، کە تێیاندا چوار بابەتی سەرەکیی خراونەڕوو:

یەکەم: موحەممەد ﷺ پێغەمبەری کۆتایی، نە شیعری فێرکراوەو، نە بۆشی گونجاوە، شیعر بفەرموێ، بەڵکو قورئان بیرخەرەوەیەکی ڕوونە، بۆ هۆشیارکردنەوەی کەسانێکی دڵ و ویژدان زیندوو.

دووەم: ئاژەڵانێك کە خوا ڕەخساندوونی و، ڕام و دەستەمۆ کراون، هەم بۆ بارو سواریی، هەم بۆ گۆشتیان و، هەم بۆ سوودو بەرهەمی دیکەیان، ئەم ئاژەڵانە مایەی سوپاسگوزاریی مرۆڤانن، بۆ خوای بەرزی بێ وێنە.

سێیەم: ئەوانەی جگە لە خوا دەپەرستن، بە هەموو جۆرەکانی پەرستراوەکانەوە، نەك هەر پەرستراوەکانیان هیچیان بۆ ناکەن، بگرە پەرستەرەکان وەك سەربازی بەردەست و ئامادەی، پەرستراوەکان وان! خواش ئاگاداری ئاشکراو پەنهانی هەموو لایەکیانە.

چوارەم: وەڵامدانەوەی پرسیارو نکووڵییلێکردنی بابای بێبڕوا، کە دەڵێ: کێ ئێسکی پڕتووکاو زیندوو دەکاتەوە؟ خواش ﷻ بە شەش بەڵگەی ڕوون و بێ چەندو چوون، وەڵامی ئەو پرسیارو نکووڵییلێکردنەی بابای بێبڕوا دەداتەوە.

### شەش بەڵگەی ڕوون و بەهێز:

١- مادام خوا یەکەمجار دروستیکردوون، دەشتوانێ زیندوویان بکاتەوە.

٢- خوا بە هەموو شتێك زانا و شارەزایە، کەواتە: دەزانێ گۆشتی ئەو جەستەیە، کە بۆتەوە بە خاك و، ئێسکەکانی کە پڕتووکاون، بەشەکانی ئەو جەستەیە، بە گۆشت و ئێسکەوە، چییان لێ هاتوەو بۆ کوێ چوون؟

٣- خوا لە درەختی تەڕو سەوز، ئاگری پەیداکردوە، کەواتە: دەتوانێ جارێکی دیکە ژیانیش لە مردووەوە، پەیدا بکاتەوە.

٤- خوا ﷻ بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوییەو، ناگونجێ دروستکردنەوەی مرۆڤی لەبەر عاسێ بێ و پێی زەحمەت بێ.

٥- خوا توانای بێ سنوورەو بەچاوتروکان و بە: ببەو دەبێ (كُنْ فَيَكُون)ێك کاروبارەکانی دەکات، بۆیە زیندووکردنەوەی مردووانی بۆ ئاسانە.

٦- خوا خاوەنی موڵکی فراوانی هەموو شتێکەو، هەموو شتێکی لەبەر دەست دایە، بۆیە زیندووکردنەوەی مردووانیش هەر لە ژێر ڕکێفی خۆیدایە.

﴿ وَمَا عَلَّمْنَٰهُ ٱلشِّعْرَ وَمَا يَنۢبَغِى لَهُۥٓ ۚ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ وَقُرْءَانٌ مُّبِينٌ ﴿٦٩﴾ لِّيُنذِرَ مَن كَانَ حَيًّا وَيَحِقَّ ٱلْقَوْلُ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٧٠﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّا خَلَقْنَا لَهُم مِّمَّا عَمِلَتْ أَيْدِينَآ أَنْعَٰمًا فَهُمْ لَهَا مَٰلِكُونَ ﴿٧١﴾ وَذَلَّلْنَٰهَا لَهُمْ فَمِنْهَا رَكُوبُهُمْ وَمِنْهَا يَأْكُلُونَ ﴿٧٢﴾ وَلَهُمْ فِيهَا مَنَٰفِعُ وَمَشَارِبُ ۖ أَفَلَا يَشْكُرُونَ ﴿٧٣﴾ وَٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ ءَالِهَةً لَّعَلَّهُمْ يُنصَرُونَ ﴿٧٤﴾ لَا يَسْتَطِيعُونَ نَصْرَهُمْ وَهُمْ لَهُمْ جُندٌ مُّحْضَرُونَ ﴿٧٥﴾ فَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ ۘ إِنَّا نَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴿٧٦﴾ أَوَلَمْ يَرَ ٱلْإِنسَٰنُ أَنَّا خَلَقْنَٰهُ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ﴿٧٧﴾ وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِىَ خَلْقَهُۥ ۖ قَالَ مَن يُحْىِ ٱلْعِظَٰمَ وَهِىَ رَمِيمٌ ﴿٧٨﴾ قُلْ يُحْيِيهَا ٱلَّذِىٓ أَنشَأَهَآ أَوَّلَ مَرَّةٍ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ ﴿٧٩﴾ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلشَّجَرِ ٱلْأَخْضَرِ نَارًا فَإِذَآ أَنتُم مِّنْهُ تُوقِدُونَ ﴿٨٠﴾ أَوَلَيْسَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُم ۚ بَلَىٰ وَهُوَ ٱلْخَلَّٰقُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٨١﴾ إِنَّمَآ أَمْرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيْـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٨٢﴾ فَسُبْحَٰنَ ٱلَّذِى بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَىْءٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٨٣﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{هەروەها (ئەوەی موحەممەد ﷺ پێتان ڕادەگەیەنێ، شیعری زادەی خەیاڵ و عاتیفە نیە)، نە شیعرمان فێرکردوەو نە شایستەشیەتی، بەڵکو ئەو (پەیامە) تەنیا بیرخەرەوەو، قورئانێکی ڕۆشنە ﴿٦٩﴾ بەڵکو (قورئان دابەزێندراوە) تاکو کەسێك، کە (خاوەنی دڵ و ویژدانێکی) زیندوویە، هۆشیاری بکاتەوەو، قسە (وبڕیاری خوا)ش لەسەر بێ بڕوایان بچەسپێ، (کە دەبێ سزا بدرێن) ﴿٧٠﴾ ئایا نەیاندیوە (بە چاوی عەقڵ و دڵ)، کە ئێمە لەوەی دەستەکانمان ئەنجامیان داوە، ئاژەڵانێکمان بۆ دروستکردوون، ئەوان بوونە خاوەنیان {کەوتوونە ژێر ڕکێفیان}؟ ﴿٧١﴾ بۆشیانمان دەستەمۆ کردوون، هەم هۆکاری بارو سواریان لەواندا هەیەو، هەم لێشیان دەخۆن (لە گۆشتەکانیان) ﴿٧٢﴾ هەروەها سوودگەل و، خواردنەوەگەلی جۆراوجۆریان لەواندا هەیە، ئایا سوپاسگوزاریی بۆ خوا ناکەن؟ ﴿٧٣﴾ (خوا ئەو هەموو چاکانەی لەگەڵ دا کردوون)، کەچی ئەوان (هاوبەشدانەرەکان)، جگە لە خوا پەرستراوانێکیان هەڵبژاردوون، (بە خەیاڵی خۆیان)، بەڵکو (لە لایەن ئەوانەوە) پشتیوانیی بکرێن ﴿٧٤﴾ (بەڵام بێگومان) پشتیوانییکردنیانیان لە توانادا نیە، لە حاڵێکدا کە ئەوان (پەرستەرەکان)، سەربازانی ئامادەکراون بۆیان[1] ﴿٧٥﴾ ئنجا (ئەی موحەممەد! ﷺ)، با قسەی وان، (لە شیرك و کوفرو نکووڵییکردن لە قیامەت)، دڵتەنگت نەکات، چونکە ئێمە هەرچی پەنهانی دەکەن و هەرچی ئاشکرای دەکەن دەیزانین ﴿٧٦﴾ ئایا مرۆڤ (ی بێبڕوا) نەیدیوە، کە ئێمە لە نوتفەیەك دروستمان کردوە، ئنجا (کتوپڕ) بۆتە مشتومڕکەرێکی ئاشکرا؟ ﴿٧٧﴾ (مرۆڤی بێبڕوا) وێنەیەکیشی بۆ هێنایەوەو دروستکرانی خۆی لە بیرچووەوە، گوتی: کێ ئێسکانێك، کە پرتووکاون زیندوو دەکاتەوە؟ ﴿٧٨﴾ بڵێ ئەو کەسەی

---

(١) یاخود لە حاڵێکدا کە پەرستراوەکان، وەك سەربازانی ئامادەکراون بۆ پەرستەرەکان.

یەکەمجار پێیگەیاندوون، زیندوویان دەکاتەوەو، بە هەموو دروستکراوێکیش زانایە ﴿٧٩﴾ ئەو کەسەی لە درەختی (تەڕو) سەوز ئاگری بۆ ڕەخساندوون، ئنجا ئێوە کتوپڕ ئاگری لێ دادەگیرسێنن ﴿٨٠﴾ (بەڵگەیەکی دیکە)، ئایا کەسێك کە ئاسمانەکان و زەوی دروستکردوون، بە توانا نیە کە وێنەی وان دروست بکات؟ با، چونکە ئەو بەدیهێنەری ئەوپەڕی زانایە ﴿٨١﴾ فەرمانیشی هەرکات شتێکی ویست، بەس بفەرموێ: ببە، یەکسەر دەبێ ﴿٨٢﴾ ئنجا پاکیی ڕەها (لە هەرچی بێبڕوایان دەیلێن) بۆ ئەو کەسەی، موڵکی فراوانی ئاشکراو پەنهانی هەموو شتێکی بەدەستەو، تەنها بۆلای ویش دەگێڕدرێنەوە ﴿٨٣﴾ ].

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(وَمَا عَلَّمۡنَٰهُ ٱلشِّعۡرَ وَمَا يَنۢبَغِي لَهُۥٓ): نە شیعرمان فێرکردوەو، نە بۆشی شایستەیە، (يَنْبَغِي: مُطَاوِعُ بَغَى، أي: طَلَبَ) داوای کرد، ﴿ يَنۢبَغِي ﴾، واتە: بۆی دەبێ، (لاَ يَنْبَغِي)، واتە: بۆی نابێ، بۆی ناگونجێ، چونکە ﴿ يَنۢبَغِي ﴾، (أي يَسْتَجِيبُ لِلْبَغِي، أَي: الطَّلَبِ، الملحّ، ثُمَّ غُلِبَ فِي مَعْنَى يَتَأَتَّى، وَيَسْتَقِيْم)، واتە: وەڵامی داواکردن دەداتەوە داواکردنی مکوڕ، دوایی بە مانای: دەبێ و ڕێك دەبێ بەکارهاتوە.

(ذِكۡرٞ): (مَصْدَرٌ يُوصَفُ بِهِ الكِتَابُ للمبالغة)، (ذکر) چاوگە کتێبی (خوای) پێ وەسف کراوە، بۆ زێدەڕۆییکردن، (أي: مُذَكِّرٌ للنَاسِ بِمَا نَسُوهُ أو جَهِلُوه)، واتە: بیرخەرەوەیە بۆ خەڵك، شتانێك کە زانیویانن و لەبیریان چوون، یاخود کە هەر نەیانزانیون، بیریان بخاتەوەو فێریان دەکات، هەروەها ﴿ ذِكۡرٞ ﴾، دەگونجێ بە مانای ناوبانگ و پایەبەرزیی و شەڕەف بێ.

(أَنۡعَٰمٗا): (الأَنْعَامُ: الإِبِلُ وَالبَقَرُ وَالغَنَمُ وَالمَعْزُ) (أنعام)، ئەو چوارەن: وشتر و ڕەشەوڵاخ و مەڕو بزن، دەشگونجێ (أَنْعَام)، بە هەموو ئەو ئاژەڵانە بگوترێ،

کەماڵیین و ڕامکراون، بەڵام کە لە سوورەتی (الأنعَام)دا، کە هەر بەو ناوەوە هاتوە، خوا دەفەرموێ: ﴿ثَمَٰنِيَةَ أَزْوَٰجٍ مِّنَ ٱلضَّأْنِ ٱثْنَيْنِ وَمِنَ ٱلْمَعْزِ ٱثْنَيْنِ ۝١٤٣﴾، دوایی دەفەرموێ: ﴿وَمِنَ ٱلْإِبِلِ ٱثْنَيْنِ وَمِنَ ٱلْبَقَرِ ٱثْنَيْنِ ۝١٤٤﴾، ئەمە ئەوە پشت ڕاست دەکاتەوە، کە (أنْعَام)، زیاتر مەبەست پێی ئەو چوار جۆرە ئاژەڵەن.

(وَذَلَّلْنَٰهَا لَهُمْ): واتە: بۆیانمان دەستەمۆ کردوون، (أي: جَعَلْنَاهَا ذَلُولَةً لَهُمْ)، (ذَلُول) دەستەمۆ، ڕامکراو، ملکەچ.

(رَكُوبُهُمْ): (الرَّكُوبُ: مَا يُرْكَبُ مِثْلُ حَلُوب، مَا يُحْلَبُ)، (حَلُوب) واتە: دۆشراو، (رَكُوب)یش واتە: ئەو ئاژەڵەی کە خەڵك سواری دەبێ، یاخود بۆ بارو سوار بەکاری دێنن، کەواتە: (رَكُوب) (فعول)ە، بە واتای (مَرْكُوبُهُمْ) سواربووەکەیان.

(وَمَشَارِبُ): (جَمْعُ مَشْرَب، مَصْدَرٌ مِيمِيٌّ، وشُرْب، أي: مَشْرُوب)، (مَشَارِب) کۆی (مَشْرَب)ە، چاوگێکی میمییە، بە مانای خواردنەوەو، کۆی (شُرْب)ە، بە مانای (مَشْرُوب) خوراوە، شتێك بخورێتەوە، هەروەها دەشگونجێ (مَشَارِب) کۆی (مَشْرَب) بێ، کە مەبەست پێی قاپ و قاچاخە، کە شلەمەنییان تێدا دەخورێتەوە، یانی: پێخوراوەکان.

(خَصِيمٌ مُّبِينٌ): (خَصِيم) لەسەر کێشی (فَعِيل)ە، زێدەڕۆییە لە مانای (مُفَاعِل)دا، واتە: (مُخَاصِم أي: شَدِيدُ الخِصَام)، کەسێك زۆر مشتومڕکەرو، شەڕە قسەکەر بێ، ﴿مُّبِينٌ﴾، بە مانای ڕوون و ئاشکرایە، لە (أبَان)ەوە هاتوە، لە (أبَانَ)ی (لازم)، بە مانای (بَانَ) واتە: (ظَهَرَ).

(رَمِيمٌ): واتە: پرتووکاو، ڕزیو، دەگوترێ: (رَمَّ العَظْمُ، أرَمَّ: بَلِيَ، فَعِيل بِمَعْنَى المَصْدَرِ، فَهُوَ خَبَرٌ بِمَصْدَرٍ، رَمَّ العَظْمُ رَمِيماً)، (رَمَّ العَظْمُ) یان (أرَمَّ)، واتە: ئێسکەکە ڕزیی، پرتووکا، کەواتە: لێرەدا ﴿رَمِيمٌ﴾، لەسەر کێشی (فعیل)ە، بەڵام بە مانای چاوگەو هەواڵە بە چاوگ، دەگوترێ: (رَمَّ العَظْمُ رَمِيماً)، ئێسکەکە ڕزیی، بوو بە ڕزیو، بوو بە پرتووکاو.

(أَنشَأَهَا): (الإنشَاءُ: التَّرْبِيَةُ المُسْتَدْرَجَة، أو المُتَدَرِّجَة)، (إنْشَاء) بریتیە لە پێگەیاندنێکی پلە پلەیی.

(مَلَكُوتُ): (المَلَكُوتُ: مُبَالَغَةٌ فِي المِلْكِ، مِثْلُ رَهَبُوت وَرَحَمُوت، وَقَدْ قِيلَ: رَهَبُوت خَيْرٌ مِنْ رَحَمُوت)، (مَلَكُوت): زێدەڕۆییە لە (مِلْكِ)دا، واتە: خاوەندارێتیی، وەك (رَهَبُوت، رَحَمُوت)، کە زێدەڕۆیین لە (رَهبة، ورحمة)دا، گوتراوە: (رَهَبُوت خَيْرٌ مِنْ رَحَمُوت)، واتە: باشترە خەڵك لێت بترسێ، لەوەی بەزەیی پێتدا بێ.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

بۆیە ئاماژەیان پێدەدەم، چونکە لە تەفسیرەکاندا، چەند بەسەرهاتێك گێڕدراونەوە، بۆ هۆی دابەزینی ئەو ئایەتانەی کە لەسەرەوە باسمان کردن:

١- ﴿ أَوَلَمْ يَرَ ٱلْإِنسَـٰنُ أَنَّا خَلَقْنَـٰهُ مِن نُّطْفَةٍ ... ﴿٧٧﴾ ﴾ سوودیی و قەتادە، لە موجاهیدو عیکرمەو ئیبنو ززوبەیرەوە هێناویانە، کە گوایە لە بارەی ئومەییەی کوڕی خەڵەفەوە دابەزیون، ئەو کەسەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەنگی ئوحوددا بە دەستی خۆی کوشتی، دوای ئەوەی ئەو هەڕەشەی لە پێغەمبەر ﷺ کرد، گوتی: (لَا نَجَوتُ إِنْ نَجَوتَ)، من دەربازم نەبێ، ئەگەر تۆ دەربازت بوو، ڕمەکەی بۆ پێغەمبەر ﷺ هەڵدا، پێغەمبەری خواش ﷺ هەر ڕمەکەی خۆی تێگرتەوەو، بریندار بوو، دوایی هەر بەو برینە مرد، هەندێك دەڵێن: لە بارەی ئەوەوە هاتوەتە خوار، ڕۆژێك ئێسکانێکی پرتووکاوو ڕزیو دێنێت، لەبەرچاوی پێغەمبەر ﷺ دەیانپروێنێ، دەڵێ: ئایا پەروەردگارت دەتوانێ ئەوە زیندوو بکاتەوە؟!

٢- هەندێك دەڵێن: ئەم ئایەتانە لە بارەی عاصی کوڕی وائیلەوە هاتوونە خوار، کە لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازیبێ)، گێڕدراوەتەوە، کە ئەویش بەهەمان شێوە، ئێسقانێك دێنێ و دەیپروێنێ، لە پێش چاوی پێغەمبەر ﷺ، لە هەندێك ڕیوایەتاندا

هاتوه، كه فووشی لێكردوه وەك تۆزو خۆڵ، گوتوویەتی: خوا دەتوانێ ئائەوه زیندوو بكاتەوه؟

٣- ڕیوایەتێكی دیكه هەیه دەڵێ: (نَزَلَتْ فِي عَبْدِ اللهِ بْنِ أُبَيٍّ بْنِ سَلُولٍ) ئەویش هەر دەیگێڕنەوه بۆ عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس، بەڵام به تەئكید ئەگەر ئەوەی یەكەم و دووەم ڕێیان تێبچێ، كه (أمية بن خلف والعاص بن وائل) له مەككه دژایەتیی پێغەمبەریان ﷺ كردوه، بەڵام ئەوەی سێیەم كه (عَبْدُ اللهِ بْنِ أُبَيٍّ بْنِ سَلُولٍ) بێ، ئەوه هەر ڕێی تێناچێ، بۆیه (إبن كثير) له تەفسیرەكەی خۆیدا[1]، دەڵێ: (هَذَا مُنْكَرٌ، لأَنَّ السُّورَةَ مَكِّيَّةٌ، وَعَبْدُالله بن أُبَي بنُ سَلُول كَانَ فِي المَدِيْنَةِ). واته: ئەم ڕیوایەته شتێكی نكوولّیلێكراوەو هەڵەیه، چونكه سوورەتەكه مەككەییەو (عَبْدُ الله بْن أُبَيٍّ بْن سَلُول) له مەدینه بووه.

هەردووك دانەری:

(الإستيعاب فِي بيان الأسباب)[2] ئاوا حوكمیان بەسەر ئەو ڕیوایەتانەدا داوه، دەڵێن: (كُلُّ الرِّوَايَات ضَعِيْفَةُ السَّنَد)، هەموو گێڕدراوەكان له ڕووی سەنەدەوه بێ هێزن، دەشگونجێ ڕاست بن و وابووبن، بەڵام لەڕووی سەنەدەوه بێ هێزن.

---

(١) تفسير القرآن العظيم: ج٣، ص٥٨١.

(٢) الإستيعاب في بيان الأسباب: ج٣، ص١٥٤-١٥٧.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

لە دەستپێکی ئەم پازدە ئایەتەدا، کە ئایەتەکانی کۆتایی سوورەتی (یس) ن، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَمَا عَلَّمْنَٰهُ ٱلشِّعْرَ وَمَا يَنۢبَغِى لَهُۥٓ ﴾، ئێمە نە شیعرمان فێرکردووەو، نەبۆشی دەگونجێ، ﴿ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ وَقُرْءَانٌ مُّبِينٌ ﴾، ئەوەی دەیڵێ {بە ناوی خواوە} تەنیا بیرخەرەوەیەو، قورئانێکی ڕوون و ئاشکرایە، یاخود قورئانێکی ڕوونکەرەوەو ئاشکراکەرە بۆ ڕاستییەکان، ئنجا بۆچی خوا ئەم قورئانەی دابەزاندوە؟ ﴿ لِّيُنذِرَ مَن كَانَ حَيًّا ﴾، تاکو (قورئان) ئەو کەسە بترسێنێ کە زیندوویە، وریاو هۆشیاری بکاتەوە، یاخود موحەممەد ﷺ بەهۆی قورئانەوە، ئەوانەی کە زیندوون، واتە: عەقڵ و ویژدانی زیندوویان هەیە، بێدارو هۆشیاریان بکاتەوە، ﴿ وَيَحِقَّ ٱلْقَوْلُ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾، بۆ ئەوەش قسە لەسەر بێبڕوایان بچەسپێ، واتە: هەڕەشەی خوا، فەرمایشتی خوا، کە دەفەرموێ: هەر کەس بڕوا بە قورئان نەهێنێ سزا دەدرێ، ئەو بڕیارو فەرمایشتەیان لەسەر بچەسپێ.

هەڵبەتە ئێمە لە دواییدا، لە مەسەلە گرنگەکان باسێکی سەربەخۆ، لەو بارەوە دەکەین، کە موحەممەد ﷺ نە شاعیر بووەو نە شیعریشی بۆ گوتراوە، بۆیەش خوا ﷻ ئەو توانایەی لە پێغەمبەر ﷺ گرتۆتەوە، تاکو کافرەکان دەرفەتی ئەو تۆمەتەیان نەبێ، بڵێن: قورئان شیعرە.

هەروەك پێغەمبەری خاتەم خوێندن و نووسینی نەبووە، تاکو بواری ئەو گومانەیان نەبێ کە خۆی قورئان فێربووە، یان نووسیویەتی، وەك فەرموویەتی: ﴿ وَمَا كُنتَ تَتْلُوا۟ مِن قَبْلِهِۦ مِن كِتَٰبٍ وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَ ۖ إِذًا لَّٱرْتَابَ ٱلْمُبْطِلُونَ ۝٤٨ ﴾ العنكبوت:-٤٨-.

ئنجا خوای کاربەجێ دەگوازێتەوە بۆ بابەتێکی دیکە، چونکە وەك گوتمان: ئەم سوورەتە موبارەکە، هەر سێك مەبەستی سەرەکیی تیمان، کە بریتین لە: خواناسیی

و، یەکتایی خوا لە پەرستراندا، ئنجا پێغەمبەرایەتیی و وەحیی، پاشان ڕۆژی دوایی، لەم سووڕەتە موبارەکەدا هاتوون، بەڵام پانتاییەکی زیاتر بۆ ڕۆژی دوایی، بەهەردوو قۆناغی ئاخیر زەمان و، زیندووکرانەوەو هەڵسانەوەوە، تەرخانکراوە.

دەفەرموێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا خَلَقْنَا لَهُم مِّمَّا عَمِلَتْ أَيْدِينَآ أَنْعَـٰمًا فَهُمْ لَهَا مَـٰلِكُونَ﴾، ئایا نەیانبینیوە، کە ئێمە لەوەی دەستەکانمان کردوویانە، ئاژەڵانێکمان بۆ دروستکردوون کە ئەوان خاوەنیانن.

دەگونجێ مەبەست لە دیتن دیتنی چاو بێ، یاخود: یانی: بە چاوی عەقڵ و دڵ نەیانبینیوە، یاخود: ئایا سەرنجیان نەداوەتە، ئەوەی کە ئێمە بە دەستەکانمان ئاژەڵانێکمان بۆ هێناونە دی، کە ئەوان بوونە خاوەنیان، واتە: ئەو ئاژەڵانە کەوتوونە ژێر ڕکێفی ئەوان، لە حاڵێکدا، هەندێک لەو جۆرە ئاژەڵانە، بۆ نموونە: گایەك، حوشترێك، گامێشێك، کەڵێك، ئەگەر لە خەڵکی عاسێ بێ، زۆر بە زەحمەت بۆیان بەردەست و، مەرزەم دەکرێ، ﴿وَذَلَّلْنَـٰهَا لَهُمْ﴾، ئەو ئاژەڵانەمان بۆیان دەستەمۆو ڕام کردوون، ﴿فَمِنْهَا رَكُوبُهُمْ وَمِنْهَا يَأْكُلُونَ﴾، هەر لەو ئاژەڵانە سوارییان هەیەو لێشیان دەخۆن، بەکاریان دێنن بۆ سواریی، بەتایبەت حوشتر، لە هەندێك شوێن کەڵ و گاش، بۆ ئەوە بەکاردەهێنن، ﴿وَمِنْهَا يَأْكُلُونَ﴾، هەروەها لەو ئاژەڵانە دەشخۆن، لە گۆشتەکانیان، ﴿وَلَهُمْ فِيهَا مَنَـٰفِعُ﴾، هەروەها چەندان جۆرە سوودو کەڵك، لەو ئاژەڵانەدا بۆ وان هەیە، ﴿وَمَشَارِبُ﴾، هەروەها چەندان جۆرە خواردنەوە، یاخود دەفری تێدا خواردنەوە، لە چەرم و پێستەکەیان دروست دەکەن، ﴿أَفَلَا يَشْكُرُونَ﴾، ئایا سوپاسگوزاریی ناکەن؟ لە بەرانبەر نیعمەتی دەستەمۆکرانی ئەو ئاژەڵانەدا کە سوود لە هەموو شتێکیان دەبینن، کە لێرەدا باس نەکراون، بەڵام تەنانەت لە قشپل و ڕیخ و شیاکەکەشیان، بەهرەمەند دەبن، بۆ بە پیتکردنی زەوی، واتە: تەنانەت پاشەڕۆکیشیان خوا وای دروستکردوە، کە بەکاربێ و بەکەڵك بێ، بۆ بە پیتکردنی زەوی و، کشتوکاڵی خۆیانی پێ بە پیت بکەن، وێڕای: پێست و تووك و موو و قۆچ و ئێسقانەکانیان.

﴿ وَاتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ ءَالِهَةً ﴾، هەروەها جگە لە خوا پەرستراوانێکی دیکەیان هەڵبژاردن، بە خەیاڵی خۆیان، پەرستراو بوون، ﴿ ءَالِهَةً ﴾، کۆی (إلە)ە، پەرستراوەکان، کە لەڕاستییدا پەرستراو نین، بەڵام بە خەیاڵی ئەوان پەرستراو بوون، ﴿ لَعَلَّهُمْ يُنصَرُونَ ﴾، بەڵکو یارمەتیی بدرێن و سەربخرێن، بەهۆی ئەو پەرستراوانەوە، ﴿ لَا يَسْتَطِيعُونَ نَصْرَهُمْ وَهُمْ لَهُمْ جُندٌ مُّحْضَرُونَ ﴾، ئەو پەرستراوانە ناتوانن یارمەتییان بدەن و سەریان بخەن، ﴿ وَهُمْ لَهُمْ جُندٌ مُّحْضَرُونَ ﴾، بە پێچەوانەوە: ئەو پەرستەرانە، بۆ پەرستراوانی خۆیان سەربازانێکی ئامادەن، واتە: پەرستەرەکان لە خزمەتی پەرستراوەکان دان، وەك سەرباز لەبەردەستیانن و خزمەتیان دەکەن و دەیانپارێزن، بۆنخۆشیان دەکەن، خواردنیان بۆ دادەنێن، وەك ئێستاشی لەگەڵدا بێ، بتپەرستەکان بەو جۆرە، مامەڵە لەگەڵ بت و پەرستراوەکانی خۆیان دا دەکەن.

دەشگونجێ مەبەست ئەوەبێ، کە پەرستراوەکان وەك سەربازی ئامادەکراو وان بۆ پەرستەرەکان، واتە: داندراون وەك پەیکەرێك، کە هیچیان لە دەست نایەت، وەك چۆن سەربازێك خۆی ناجووڵێنێ لە بەرانبەر فەرماندەکەیدا، ئەوانیش خۆیان ناجووڵێنن و مێش لە خۆیان دەرناکەن. هەردوو واتایەکەی هەن.

﴿ فَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ ﴾، ئنجا با قسەی ئەوان تۆ دڵتەنگ نەکات [ئەی موحەممەد! ﷺ]، سەغڵەت مەبەو دڵتەنگ مەبە بە قسەی وان، قسەی وان چییە؟ قسەی وان بریتییە لە:

أ- هاوبەش بۆ خوا دانان.

ب- نکووڵییکردن لە ڕۆژی قیامەت،

ج- بە جادووگەرو بە شاعیرو بە کاهین، لە قەڵەم دانی موحەممەد ﷺ،

د- بە شیعر لە قەڵەم دان و، بە سەجعی کاهینەکان لە قەڵەم دانی قورئان، با ئەو جۆرە قسانە تۆ دڵتەنگ نەکەن، ﴿ إِنَّا نَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴾، بەدڵنیایی ئێمە ئەوەی

پەنهانی دەکەن و ئەوەی ئاشکرای دەکەن، دەیزانین، واتە: پەنهان و ئاشکرای ئەوان بۆ ئێمە زانراوەو بۆیان هەڵدەگرین، لە نێو دوو نانی گەرمدا، دوایی ئەو قسانەو ئەو کردەوانەیان دێنەوە ڕێ.

﴿ أَوَلَمْ يَرَ ٱلْإِنسَٰنُ أَنَّا خَلَقْنَٰهُ مِن نُّطْفَةٍ ﴾، ئایا مرۆڤ نەیبینیوە، سەرنجی نەداوە، کە ئێمە ئەومان لە نوتفەیەك، لە تۆویلکەیەك، هێناوەتە دی، ﴿ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ﴾، کتوپڕ لە حاڵەتی نوتفەوە، دوایی تەماشا دەکەی، بۆتە مشتومڕکەرێکی ڕوون و ئاشکرا، یان مشتومڕکەرێك، کە مەبەستەکانی خۆی بە باشی ڕوون دەکاتەوەو، ئاشکرا دەکات، کە بە تەئکید لێرەدا مەبەست لە ئینسان، ئینسانی بێبڕوایە، یان: ئەو ئینسانەی دەستی هیدایەتی نەگەیوەتێ.

﴿ وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِيَ خَلْقَهُۥ ﴾، ئەو مرۆڤە بێبڕوایە، وێنەیەکی بۆ ئێمە هێنایەوەو، دروستکرانی خۆی لەبیر چۆوە، ﴿ قَالَ مَن يُحْيِ ٱلْعِظَٰمَ وَهِيَ رَمِيمٌ ﴾، گوتی: کێ ئێسقان دەژێنێتەوە، لە کاتێکدا پڕتووکاوەو ڕزیوە؟ ﴿ قُلْ يُحْيِيهَا ٱلَّذِىٓ أَنشَأَهَآ أَوَّلَ مَرَّةٍ ﴾، بڵێ: ئەو کەسە دەیژیەنێتەوە، کە یەکەمجار پێیگەیاندوە، قۆناغ بە قۆناغ پێیگەیاندوە، دەشتوانێ دوای ئەوەی دەبێتەوە شتێکی پڕتووکاوو، دەڕزێ، زیندووی بکاتەوە، ﴿ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ ﴾، ئەویش (خوا ﷻ) بە هەموو دروستکراوێك زانایە، وەك جاری دیکەش گوتوومانە: گۆزەکەرێك کە گۆزەکەی لێ دەشکێ، دەتوانێ هەر ئەو سواڵەتانەی گۆزەکەی، لەتکەکانی، بیانهاڕێ و، بیانکاتەوە قوڕ، گۆزەیەکی وەك جاران و بگرە باشتریان لێ بکاتەوە، ئنجا ئەوەی لە گۆزەکەرێك عاسێ نەبێ، یان دروستکەرێکی دیکە، خوای بەدیهێنەری ڕەها، چۆن شتی لێ عاسێ دەبێ؟!

﴿ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلشَّجَرِ ٱلْأَخْضَرِ نَارًا ﴾، ئەو (خوای)ەی کە لە درەختی سەوز، ئاگری بۆ ڕەخساندوون، درەختی سەوز، هەم دەگونجێ مەبەست پێی درەختی (مَرْخ وعَفَار) بێ، کە بە سەوزیی لێك دەدرێن، ئاگر پەیدادەبێ،

وەك بـەردو ئەسـتێ، دەشـگونجێ مەبەسـت پێـی كـۆی درەختـەكان بـێ، كـە لـە ئەنجامـی ئـەوەدا بەهـۆی تیشـكەپێكهاتنەوە، دووەم ئۆكسـیدی كاربـۆن لـە خۆیانـدا كـۆ دەكەنـەوەو، ماددەی سـووتێنەر لـە خۆیانـدا كۆدەكەنـەوە، وزەی خـۆر، دوایـی كاتێـك وشـك دەبـن، - زۆرجـار بەتەڕییـش - دەسـووتێن، ﴿ فَإِذَآ أَنتُم مِّنْهُ تُوقِدُونَ ﴾، ئنجـا ئێـوە لـەو درەختـە سـەوزە، دوایـی كـە وشـك دەبـێ، ئاگـری پـێ دادەگیرسـێنن.

كەواتـە: ئـەو زاتـەی كـە لـە درەختـی سـەوز ئاگـر پەیـدا دەكات، ئاگـری خسـتۆتە نێـو درەختـی سـەوزەوە، دەشـتوانێ لـە مـردووش، جارێكـی دیكـە ژیـان دەربێنێتـەوەو، یەكەمجاریـش بـە تەئكیـد، ئـەو پێكهاتانـەی نوتفـە بـێ ژیـان بـوون، بـەڵام خـوا ﷻ، ژیانـی تێـدا پەیـدا كـردن، دوای ئـەوەی بـوو بـە كۆرپەلـە و گەیشـتە قۆناغـی چـوار مانـگ و بـەرەو سـەر، ڕووحیشـی بەبـەردا كـرد، پێشـێ بـێ ژیـان بـوو، دوایـی بـوو بـە ژیانـدار، ئنجـا وێـڕای ژیـان، ڕووحیشـی وەبەرنـا، كەواتـە: خـوا ﷻ، ئـەو شـتە بـێ ژیانانـەی پێكـەوە كۆكردۆتـەوە، ئاگرێكـی گـەرم و درەختێكـی سـەوزی پێكـەوە كۆكردۆتـەوە، هـەر ئەویـش دەتوانـێ لـەو مـاددە بـێ ژیانـەدا كـە ژیانـی تێـدا نەمـاوەو، گیانیشـی تێـدا نەمـاوە، دەتوانـێ هـەم ژیـان و هـەم گیانـی بێنێتـەوە بـەرێ.

﴿ أَوَلَيْسَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُم بَلَىٰ وَهُوَ ٱلْخَلَّٰقُ ٱلْعَلِيمُ ﴾، ئایـا ئـەو كەسـەی ئاسـمانەكان و زەوی هێناونـە دی، توانـادار نیـە لەسـەر ئـەوە كـە هـی وەك ئـەوان دروسـت بـكات؟ بـا، بەڵكـو ئـەو زۆریـش بەدیهێنـەری زانایـە، ﴿ إِنَّمَآ أَمْرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيْـًٔا ﴾، فەرمانـی ئـەو كاتێـك شـتێكی ویسـت، واتـە: شـتێكی ویسـت دروسـتیبكات، ﴿ أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴾، ئەوەیـە پێـی بڵـێ: ببـە، یەكسـەر دەبـێ.

﴿ فَسُبْحَٰنَ ٱلَّذِى بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَىْءٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴾، ئنجـا پاكیـی بـۆ ئـەو زاتـەی، موڵكـی فراوانـی ئاشـكراو پەنهانـی هەمـوو شـتێكی بەدەسـتە، ﴿ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴾، هـەر

بـۆلای ویـش دەگێردرێنـەوە، بـۆ لای و یـش دەچنـەوە، بۆیـە بـاش سـەرنجبدەن! بزانـن چـۆن دەچنـەوە خزمـەت خـوا، بـە چ چاوەڕوویـەك و، بـەچ هەگبەیەكـەوە، دەچنـەوە بـۆ لای خـوا، ئایـا بـە هەگبـەی پـڕ لـە تـاوان و سـەرپێچیی و نكووڵییكـردن و، نەزانیـی؟ یاخـود: بـە هەگبـەی ئیمان و تەقـواو تاعـەت و چاكەكاریـی؟

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**خوا دەفەرموێ: (موحەممەد ﷺ) ئێمە شیعرمان فێر نەکردووە، شایستەشی نیەو، بۆشی نالوێ، ئەو پەیامەی کە خوا پێیدا ناردوە، بیرخەرەوەو قورئانێکی ڕوونە، کە ویژدان زیندووانی پێ هۆشیار بکاتەوە، بێبڕوایانی دڵ و عەقڵ مردووش، بەهۆی ڕەفزکردنی پەیامی خواوە، سزایان لەسەر بچەسپێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَا عَلَّمْنَٰهُ ٱلشِّعْرَ وَمَا يَنۢبَغِى لَهُۥٓ ۚ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ وَقُرْءَانٌ مُّبِينٌ ﴿٦٩﴾ لِّيُنذِرَ مَن كَانَ حَيًّا وَيَحِقَّ ٱلْقَوْلُ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٧٠﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

**١)- ﴿وَمَا عَلَّمْنَٰهُ ٱلشِّعْرَ﴾، ئێمە شیعرمان فێر نەکردوە، بە سیاق دیارە، کە مەبەست پێی موحەممەدە ﷺ، چونکە کافرەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺو، هی ڕۆژگارەکانی دیکەش، موحەممەدیان ﷺ بە چەند شتێك تۆمەتبار دەکرد، یەکێك لەوانە ئەوەبوو، کە دەیانگوت: شاعیرەو، ئەو قسەیەی دەیڵێ: شیعرە، هەروەها وێڕای ئەوە دەشیانگوت: جادووگەرە، کاهینە، فاڵچییە، لێرەدا تەنیا باسی ڕەتکردنەوەی تۆمەتی شاعیریی و شیعرە کوتنە، دەفەرموێ: ئێمە شیعرمان فێر نەکردوە.**

**٢)- ﴿وَمَا يَنۢبَغِى لَهُۥٓ﴾، بۆیشی شایستە نیەو ناگونجێ.**

**٣)- ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ وَقُرْءَانٌ مُّبِينٌ﴾، ئەوەی دەیڵێ تەنیا بیرخەرەوەیەو، قورئانێکی ڕوون و ئاشکرایە، یان: قورئانێکی ڕوونکەرەوەیە، کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا عَلَّمْنَٰهُ ٱلشِّعْرَ﴾، ڕاناوەکەی بۆ موحەممەد ﷺ دەگەڕێتەوە، یانی: ئەوەی کە (موحەممەد) دەیڵێ،**

شیعرێك نیە ئێمە فێرمان کردبێ، بەڵکو یادخەرەوەیەو قورئانێکە، بۆمان ناردوەو فێرمان کردوە، ئەوەی کە بۆمان سروشکردوە، شیعر نیە، چونکە بۆی ناگونجێ، نە ئەوەی کە دەیڵێ شیعرە، فێرمان کردبێ، نە شیعریشی بۆ دەگونجێ، ڕاناوی ﴿هُوَ﴾، (**عائِدٌ إلى القُرْآنِ المَفْهُوم من السياق**)، (**هو**) دەگەڕێتەوە بۆ قورئان، کە لە ڕەوت (**سیاق**) دەفامرێتەوە، (إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ) ئەوەی فێرمان کردوە، تەنیا بیرخەرەوەیە، یاخود: ناوبانگ و شەڕەفێکە بۆ هەر کەسێك بیگرێتە بەر، واتە: بیرخەرەوەیە بۆ مرۆڤەکان، چ ئەوەی کە زانیویانە، بیریان بێنێتەوە، ئەوەی لە بیریان چووبێتەوە، چ ئەوەی کە نایزانن، فێریان بکا و بیخاتە دڵ و هۆشیانەوە، ﴿وَقُرْءَانٌ مُّبِينٌ﴾، قورئانێکی ئاشکراشە، یاخود قورئانێکی ڕوونکەرەوەشە.

﴿وَقُرْءَانٌ مُّبِينٌ﴾، هەردوولایەکەی تێدا ڕەوان، دەگونجێ لە (**أَبَانَ**)وە هاتبێ، (**أَبَانَ**)ی (**لاَزِم**) قورئانێکی ڕوون و ئاشکرا، دەشگونجێ لە (**أَبَانَ**)ی (**مُتَعَدِّي**) وە هاتبێ، واتە: قورئانێکی ڕوونکەرەوەیە، بۆ ئەو ڕاستییانەی مرۆڤەکان ئاتاجیانن.

٤)- ﴿لِّيُنذِرَ مَن كَانَ حَيًّا﴾، تاکو هەرکەس زیندوویە هوشیاری بکاتەوە. (**لینذر**) خوێندراویشتەوە: (**لِتُنْذِرَ**)، ئەگەر (**لِتُنْذِرَ**) بێ، واتە: ئەی موحەممەد! ﷺ، تۆ هۆشیارو وریا بکەیەوە ﴿مَن كَانَ حَيًّا﴾، کەسێك کە زیندوویە.

ئەگەر ﴿لِّيُنذِرَ﴾ ش بێ، واتە: بۆ ئەوەی موحەممەد ﷺ کەسێك کە زیندوویە هۆشیاری بکاتەوە.

دەشگونجێ ﴿لِّيُنذِرَ﴾، بگەڕێتەوە بۆ خودی قورئان، واتە: قورئان بترسێنێ و هۆشیار بکاتەوە، کەسێك کە زیندوویە، واتە: ویژدانی زیندوویە، زگماکی زیندوویە، عەقڵی زیندوویە، چونکە بابای نەفام و نەزان، کە عەقڵی بەکارناهێنێ، لە حوکمی مردوو دایە.

٥)- ﴿وَيَحِقَّ الْقَوْلُ عَلَى الْكَافِرِينَ﴾، بۆ ئەوەی قسەش لەسەر بێبڕوایان بچەسپێ.

(القَولُ: الكَلَامُ الَّذِي جَاءَ بِالوَعِيدِ لِمَنْ لَم يَنْتَفِعْ بِإنذَارِ الرَّسُولِ ﷺ)، مەبەست لە قسە، کە دەفەرموێ: قسە لەسەر بێبڕوایان بچەسپێ، واتە: ئەو قسەیەی کە هەڕەشەی تێدایە، بۆ ئەو کەسانەی بەهرەمەند نابن لە ئاگادارکردنەوەو ترساندنی پێغەمبەر ﷺ، لە سەریان بچەسپێ.

دەگونجێ مەبەست لە وشەی ﴿ٱلْقَوْلُ﴾، ئەو فەرمایشتەی خوا بێ کە لە سوورەتی (هود) لە ئایەتی (١١٩)دا، دەفەرموێ: ﴿وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ﴾، واتە: فەرمایشتی پەروەردگارت تەواو بووە {بڕیاری تەواو بووە} کە دۆزەخ لە جند و خەڵك تێکڕایان پڕدەکەم، ئەو جند و مرۆڤەی، گوێ بە بانگەوازی خوا نادەن و ڕەفزی ئەو هەق و ڕاستییانە دەکەن، کە خوا پێغەمبەری خاتەمدا، بە پێغەمبەری ئیسلامداو، بە سەرجەم پێغەمبەراندا، بە نسبەت مرۆڤایەتییەوە، ناردوونی، کەواتە: بڕیارو، وشەی پەروەردگار کە لەسەر کافران دەچەسپێ، ئەوەیە کە کەسێ بڕوا نەهێنێ، دەبێ سزا بدرێ، نەك بەو واتایە: کە خوا بڕیاری داوە، دۆزەخ لە جند لە مرۆڤان پڕ بکات، ئنجا دەبێ دۆزەخ هەر پڕ ببێ، چونکە خوا بڕیاری داوە! بەڵکو بەو واتایە، کە خوا ﷻ بڕیاری داوە، دۆزەخ لە بێبڕوایان پڕ بکات (کە بە (گافِر) کە بە (گافِرێن وگافِرُون وکفرة)، کۆدەکرێتەوە، لەسەر کێشی (فَاعِل)ەو، ناوی بکەر (إسْم فَاعِل)ە، واتە: ئەوانەی هەقیان داپۆشیوە، کەواتە: ئەوانەی بێبڕوا بوون، بە ویستی خۆیان بێبڕوا بوون و هەقیان ڕەفز کردوە، خوا بڕیاری داوە، دۆزەخ لەوانە پڕ بکا، چ مرۆڤ بن، چ جند بن، نەك خوا بڕیاری دابێ، دۆزەخ هەر پڕ بکات، ئنجا خەڵك بێبڕوا بکات، بۆ ئەوەی دۆزەخ پڕ بێ! بەڵکو خوا بڕیاری داوە، دۆزەخ لە کەسانێك، کە هەق ڕەفز دەکەن، پڕ بکات، بڕیارەکەی خوا ئەوەیە، ئەوانە سزا بدات، کە بە ویستی ئازادانەی خۆیان، بێبڕوایی هەڵدەبژێرن.

## کورتە باسێک لە بارەی

## شیعرنەبوونی قورئان و شاعیرنەبوونی موحەممەدەوە

ئەم کورتە باسە لە حەوت بڕگەدا دەخەینە ڕوو:

١- یەکێك لە تۆمەتەکانی کافران، بریتی بووە لە شعیر بوونی قورئان، دەیانگوت: قورئان شیعرە، وەك لە سوورەتی (الأنبیاء) ئایەتی (٥)دا دەفەرموێ: ﴿ بَلْ قَالُوٓاْ أَضْغَٰثُ أَحْلَٰمٍۭ بَلِ ٱفْتَرَىٰهُ بَلْ هُوَ شَاعِرٌ فَلْيَأْتِنَا بِـَٔايَةٍ كَمَآ أُرْسِلَ ٱلْأَوَّلُونَ ﴾، واتە: بەڵکو (بێبڕوایەکان) گوتیان: ئەوە وڕێنەی نێو خەونانە[1]. ﴿ بَلِ ٱفْتَرَىٰهُ ﴾، بەڵکو گوتیان: بۆ خۆی هەڵیبەستوە، ﴿ بَلْ هُوَ شَاعِرٌ ﴾، بەڵکو ئەو شاعیرە، واتە: هەرکام لەو سێ قسانەیان کردوون لە کاتی جیا جیادا، نەك لە یەك کاتدا هەرسێکیان گوتبن، بەڵکو هەندێکیان گوتوویانە: ئەوە وڕێنەی بابای خەواڵوویە، لە نێو خەوندا هەندێك شتی هاتۆتە بەرچاو، هەندێك گوتوویانە: نەخێر هەڵیبەستوە، هەندێکیان گوتوویانە: شاعیرەو ئەو قسەیەی دەیڵێ شیعرە، ﴿ فَلْيَأْتِنَا بِـَٔايَةٍ كَمَآ أُرْسِلَ ٱلْأَوَّلُونَ ﴾، با نیشانەیەکمان بۆ بێنێ، وەك ئەوانەی پێشێ کە ڕەوانەکراون، وەك چۆن ئەوان موعجیزەی بەرهەستیان هێناوە، وەك: گۆچانەکەی مووساو، مردوو زیندووکردنەوەکەی عیساو، حوشترەکەی صالح (عَلَيْهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، کەواتە: یەکێك لە تۆمەتەکانی کافران، ئەوە بووە کە قورئان شیعرەو، موحەممەد ﷺ شاعیرەو، شیعر دەڵێ.

٢- ئەو تۆمەتە، پسپۆڕان و شارەزایانی عەرەب، کاتی خۆی بەرپەرچیان داوەتەوە، واتە: بەرپەرچی ئەوەیان داوەتەوە، کە قورئان شیعر بێت و، موحەممەد ﷺ شاعیر بێ، با لەو بارەوە دوو بەسەرهاتان بێنین:

یەکەم: {عَنْ عَبدِ اللهِ بْن الصَامِتِ وَابْنِ عَبّاسٍ، قَالَا: بَلَغَ أَبَا ذَرٍّ مَبْعَثُ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ لأخِيهِ (أُنيس): ارْكَبْ إِلَى هذَا الوَادِي، فَاعْلَمْ لِي عِلمَ هذَا الرَّجُلِ الَّذِي يَزْعُمُ أَنَّهُ نَبِيٌّ يَأْتِيهِ الخَبَرُ مِنَ

---

(١) ﴿ أَضْغَٰثُ ﴾، کۆی (ضِغث)ە، ﴿ أَحْلَٰمٍ ﴾، کۆی (حُلم)ە، واتە: وڕێنەکانی نێو خەونانن، ئەو قورئانە.

**السماءِ، وَاسْمَعْ مِنْ قَوْلِهِ ثُمَّ ائْتِنِي، فَانْطَلَقَ أَخُوهُ حَتَّى قَدِمَهُ، وَسَمِعَ مِنْ قَوْلِهِ، ثُمَّ رَجَعَ إِلَى أَبِي ذَرٍّ، فَقَالَ لَهُ: رَأَيْتُهُ يَأْمُرُ بِمَكَارِمِ الأخْلاقِ، وَكَلاَمَاً، مَا هُوَ بِالشِّعْرِ، قَالَ أَبُو ذَرٍ: فَمَا يَقُولُ: النَّاسُ قَالَ يَقُولُونَ: شَاعِرٌ كَاهِنٌ سَاحِرٌ، وَكَانَ أُنَيْسٌ أَحَدَ الشُّعَرَاءِ، قَالَ أُنَيْسٌ: لَقَدْ سَمِعْتُ قَوْلَ الْكَهَنَةِ فَمَا هُوَ بِقَوْلِهِمْ، وَلَقَدْ وَضَعْتُ قَوْلَهُ عَلَى أَقْرَاءِ الشِّعْرِ، فَمَا يَلْتَئِمُ عَلَى لِسَانِ أَحَدٍ بَعْدِي أَنَّهُ شِعْرٌ، وَاللهِ إِنَّهُ لَصَادِقٌ، وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ} (أخرجه البُخاري: ٣٦٤٨، وَمُسلِم: ٦٥١٦).**

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی صامیـت و عەبدوڵـڵای کـوڕی عەببـاس، (خـوا لێیـان ڕازیبـێ)، هەردووکیـان دەڵێـن: (أبـو ذر) بـە برایەکـەی خـۆی گـوت، کـە نـاوی ئونەیسـی کـوڕی جەنـاددەی غیفاریـی بـوو، سـوار بـە بـۆ ئـەو دۆڵـە بچـۆ، {واتـە: دۆڵـی مەککـە} هەواڵـی ئـەو پیـاوەم بـۆ بێنـەو بـۆ بزانـە، کـە پێـی وایـە پێغەمبـەرەو، لـە ئاسـمانەوە هەواڵـی بـۆ دێ، گـوێ بـۆ قسـەکەی هەڵبخـەو، دوایـی وەرەوە بـۆ لام، ڕۆیشـت هەتـا چـوو، گوێـی لـە پێغەمبـەر ﷺ گـرت، دوایـی گەڕایـەوە بـۆ لای (أبـو ذر)، پێـی گـوت: بینیـم فەرمـان دەکات بـە ڕەوشـتە بـەرزەکان، قسـەیەکیش دەڵێ: کە شـیعر نیـە، (أبـو ذر) گوتـی: ئـەدی خەڵـك چـی دەڵێـن؟ گوتـی: هەندێکیـان دەڵێـن: شـاعیرە، هەندێکیـان دەڵێـن: کاهینـە، هەندێکیـان، دەڵێـن: جادووگـەرە، ئونەیـس بـۆ خـۆی یەکێـك بـووە لـە شـاعیرەکان، ئونەیـس دەڵـێ: مـن گوێـم لـە قسـەی کاهینـان بـووە {کاهیـن واتـە: فاڵچیـی، ئەوانـەی هەواڵیـان داوە بـە شـتی نادیـار} قسـەکەی قسـەی کاهینـان نیـە، هەروەهـا ئـەوەی کـە دەیڵـێ[1]، بـە پێـوەری شـیعر پێـوام، لەگـەڵ شـیعردا ناگونجـێ، سـوێند بەخـوا، ئـەو ڕاسـت دەکات و، نەیارەکانیشـی درۆ دەکـەن.

دووەم: (إبن هشام) لە سیرەکەی خۆیدا لە (إبن إسحاق)ەوە دەیهێنێ، هەروەها (البیهقي)ش لە (الدلائل)[2] هێناویەتی، بەسەرهاتێکە درێژەیەکی هەیە، کورتەکەی ئەوەیە، کە:

---

(١) ئەو گوتوویەتی: (قَوْلَهُ)، واتە: دەیڵێ: کە مەبەستی پێی قورئان بووە.

(٢) دلائل النبوة رقم: ٥٠٦، والسيرة النبوية لابن هشام: ج٢، ص٢٦٩.

(الوَلِيدُ بْنُ المُغيرَة) بە نوێنەری قورەیش دەچێ، بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و گوێی بۆ دەگرێ، دوایی کە دەگەڕێتەوە، لێی دەپرسن، ئەویش دەڵێ:

(مَا هُوَ بِشَاعِرٍ، لَقَدْ عَرَفْنَا الشِّعْرَ كُلَّهُ: رَجَزَهُ، وَهَزَجَهُ، وَقَرِيضَهُ، وَمَقْبُوضَهُ، وَمَبْسُوطَهُ) دەڵێ: ئەو (موحەممەد) ﷺ شاعیر نیە، شیعر هەمووی دەزانم، هەموو جۆرەکانی، (رَجَزَهُ، وَهَزَجَهُ، وَقَرِيضَهُ، وَمَقْبُوضَهُ، وَمَبْسُوطَهُ)، ئەوانە چەند جۆرێکی شیعرن، وەلیدی کوڕی موغەیرەش، بۆ خۆی یەکێك بووە، لە ڕەوانبێژەکانی عەرەب و قسەزانەکان و زۆر شارەزایەکانیان.

٣- کە خوا ﷻ پێغەمبەری خۆی موحەممەد ﷺ لە گوتنی شیعر پاراستوە، پێش پێغەمبەرایەتییش، ئەوە بۆ دووربینیی (إحتياط)ی موعجیزە بوونی قورئان بووەو، بۆ دووربینیی بووە، بۆ پاراستنی پێگەی پێغەمبەرایەتیی موحەممەد ﷺ بووە، بۆ ئەوەی بواری گومانی خراپ پێبردنی، نەبێ، هەروەك چۆن خوا ﷻ پێغەمبەری خۆی ﷺ، وا هەڵخستوە، کە خوێندنەوەو نووسینیش نەزانێ، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كُنتَ تَتْلُوا۟ مِن قَبْلِهِۦ مِن كِتَـٰبٍ وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَ ۖ إِذًا لَّٱرْتَابَ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾العنكبوت، واتە: تۆ پێشتر وی {پێش قورئان} هیچ کتێبێکت نەخوێندۆتەوەو، بەدەستی ڕاستیشت، هیچ شتیشت نەنووسیوە، ئەگەر خوێندنەوەو نووسینت هەبووایە، ئەوانەی لەسەر ناهەقن، دەکەوتنە دوو دڵییەوە.

یانی: بەڵام خوا تۆی پاراستوە، لەوەی خوێندنەوە بزانی، یاخود نووسین بزانی، بۆیە پێغەمبەر نە خوێندەوار بووە نە نووسەریش بووە، نە خوێندوویەتەوەو نە نووسیویشیەتی، تاکو بواری ئەو تۆمەتە نەبێ.

٤- ئەوەش کە پێغەمبەر ﷺ وەك شیعر فەرموویەتی، وەڵامی هەیە، بۆ نموونە:

فەرموودەی یەکەم: {أَنَا النَّبِيُّ لاَ كَذِبْ أَنَا ابْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبْ} (أخرجه البخاري: ٢٨٦٤، ومسلم: ٧٨)، واتە: من پێغەمبەرم و قسەکەم درۆ نیە، من کوڕی عەبدولموتتەلیبم.

فەرموودەی دووەم: {هَلْ أَنْتِ إِلاَّ إِصْبَعٌ دَمِيتِ، وَفِي سَبِيلِ اللهِ مَا لَقِيتِ} (أخرجه البخاري: ٢٨٠٢، ومسلم: ١١٢)، واتە: ئایا تۆ جگە لە پەنجەیەك، كە بریندار بووی چیدیكەی و، لە ڕێی خوادا، ئەوەی بەسەرت هاتوە، بەسەرت هاتوە!

ئەم دووانە هەردووكیان شیعرن، بەڵام زانایان دەڵێن: (فَهوَ مِمَّا اتَّفَقَ وَزنهُ بِغَيْرِ قَصْدٍ)، ئەوە هەر كێش و سەروایەكەی واهاتوە، بێ ئەوەی پێغەمبەر ﷺ مەبەستی شیعر گوتن بووبێ، هەموو زانایانیش لەسەر ئەوە یەكدەنگن، كە یەك دێڕ هەرچەندە كێش و سەرواى هەبێ، پێی ناگوترێ شیعر، بەڵكو وێڕای ئەوەی كێش و سەرواى هەیە، دەبێ لانی كەم سێ چوار دێڕیش ببێ، ئنجا پێی دەگوترێ: شیعر.

٥- (فخرالدين الرازي) لە تەفسیرەكەی خۆی دا[1] دەڵێ: (خَصَّ الشِّعْرَ بِنَفْيِ التَّعْلِيمِ، مَعَ أَنَّ الكُفَّارَ كَانُوا يَنْسِبُونَ إِلى النَّبِيِّ ﷺ أَشْيَاءَ مِنْ جُمْلَتِهَا السِّحْرُ، وَالكَهَانَةُ، وَأَمَّا الشِّعْرُ: فَكَانُوا يَنْسبونَهُ إِلَيْهِ، عِنْدَمَا كَانَ يَتْلُوا القُرآنَ عَلَيْهِم، لَكِنَّهُ ﷺ مَا كَانَ يَتَحَدَّى إِلاَّ بالقُرْآن).

واتە: تەنیا شیعر لێرەدا تایبەت كراوە بەوەی، خوا ﷻ فێركردنەكەی لە لایەن خۆیەوە، بۆ پێغەمبەر ﷺ لابەرێ، واتە: تەنیا ئەوە لابراوە كە پێغەمبەر ﷺ خوا شیعری فێرنەكردوە، هەرچەندە كافرەكان، هەندێ شتی دیكەشیان پاڵداوەتە لای پێغەمبەر ﷺ، وەك جادوو، كەهانە، بەڵام كاتێ شیعریان پاڵداوەتە لای، كە قورئانی بۆ دەخوێندنەوەو لەسەر دەخوێندنەوە، بۆیەش خوا ﷻ گوتنی شیعرو بۆ گونجانی شیعری لە پێغەمبەر لابردوە، چونكە پێغەمبەر ﷺ تەنیا قورئانی وەك موعجیزە دەخستەڕوو، بۆ نیسپاتی پێغەمبەرایەتیی خۆی.

٦- قسەیەك لە (القرطبي)ەوە دێنین، كە لە تەفسیرەكەی خۆی دا[2]، دەڵێ: (لَمْ تَكُنِ الأُمِّيَّةُ مِنْ عَيْبِ الخَطِّ: ﴿وَمَا كُنتَ تَتْلُوا۟ مِن قَبْلِهِۦ مِن كِتَٰبٍ وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَ ۖ إِذًا لَّٱرْتَابَ

---

(١) التفسير الكبير، ج٢٦، ص٩٧،٩٨.

(٢) الجامع لأحكام القرآن، ج١٥، ص٤٥.

ٱلۡمُبۡطِلُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾العنكبوت، وَكَذَلِكَ لَا يَكُونُ نَفْيُ النَّظْمِ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ مِنْ عَيْبِ الشِّعْرِ، رُوِيَ أَنَّ الْمَأْمُونَ قَالَ لأَبِي عَلِيٍّ الْمِنْقَرِيِّ: بَلَغَنِي أَنَّكَ أُمِّيٌّ، وَأَنَّكَ لَا تُقِيمُ الشِّعْرَ، وَأَنَّكَ تَلْحَنُ، فَقَالَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، أَمَّا اللَّحْنُ فَرُبَّمَا سَبَقَ لِسَانِي مِنْهُ بِشَيْءٍ، وَأَمَّا الأُمِّيَّةُ وَكَسْرُ الشِّعْرِ، فَقَدْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَا يَكْتُبُ وَلَا يُقِيمُ الشِّعْرَ. فَقَالَ لَهُ: سَأَلْتُكَ عَنْ ثَلَاثَةِ عُيُوبٍ فِيكَ، فَزِدْتَنِي رَابِعاً، وَهُوَ الْجَهْلُ، يَا جَاهِلُ! إِنَّ ذَلِكَ كَانَ لِلنَّبِيِّ ﷺ فَضِيلَةً، وَهُوَ فِيكَ وَفِي أَمْثَالِكَ نَقِيصَةٌ، وَإِنَّمَا مُنِعَ النَّبِيُّ ﷺ ذَلِكَ لِنَفْيِ الظِّنَّةِ عَنْهُ، لَا لِعَيْبٍ فِي الشِّعْرِ وَالْكِتَابَةِ).

واتـە: نەخوێندەواریـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ، بەڵگـەی عەیـب و نوقسـانیی نیـە، لـە خوێندەواریـی و لـە نووسـیندا، کـە خوا بـە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَا كُنتَ تَتۡلُواْ مِن قَبۡلِهِۦ مِن كِتَٰبٖ وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَۖ إِذٗا لَّٱرۡتَابَ ٱلۡمُبۡطِلُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾العنكبـوت، (واتـە: تـۆ پێـش ئـەم قورئانـە هیـچ کتێبـی دیکـەت نەخوێندۆتـەوەو، هیـچ شتێکیشـت بـە دەسـتی ڕاسـتت نەنووسـیوە، ئەگـەر وابـووای، [خوێندنـەوەو نووسـینت هەبووایـە] ئەوانـەی لەسـەر ناهەقـن، بۆیـان هەبـوو بکەونـە دوو دڵییـەوە)، [بۆیـە خـوا ﷻ وایکـردوە، کـە تـۆ نەخوێندنـەوەت هەبـێ، نـە نووسـینت هەبـێ]، ئنجـا وەك چـۆن نەخوێندەواریـی پێغەمبـەر ﷺ و نەنووسـینی [نەبوونـی خوێندنـەوەو نەنووسـین لـە لای پێغەمبـەر ﷺ]، بەڵگـەی ناتەواویـی نیـە لـە خوێندنـەوەو نووسـیندا، بـە هەمـان شـێوەش ئـەوە کـە پێغەمبـەر ﷺ، نەیتوانیـوە شـیعر بهۆنێتـەوە، بەڵگـەی ناتەواویـی شـیعر نیـە، [بەڵکـو حیکمەتەکـەی ئەوەیـە، کـە بـواری گومانـی خـراپ بـە پێغەمبـەر ﷺ بـردن و تۆمەتبـار کردنـی بـەوەی، کـە ئـەو قورئانـەی دەیفەرمـوێ، هەروەهـا فەرمایشـتەکانی شـیعرن، یـان کەهانـەن، ئـەوەی لـێ دووربخرێتـەوە] گێڕدراوەتـەوە: مەئمـوون (کـە یەکێکـە لـە حوکمڕانەکانـی عەبباسـییەکان)، بـە ئەبـی عەلـی مینقەریـی دەڵـێ ڕۆژێـك کـە لـە مەجلیسـەکەی دەبـێ: پێمگەیشـتوە کـە تـۆ نەخوێنـدەواری و شـیعریش دانانێـی و، لـە قسەکردنێشـدا هەڵە دەکەی [هەڵـەی ڕێزمانیـی، (لَحْن) واتە: هەڵـەی ڕێزمانیـی] ئەویـش دەڵـێ: ئـەی سـەر کـردەی بـڕواداران! هەرچـی هەڵـەی ڕێزمانییـە، بەڵـێ جـاری وا هەیـە زمانـم هەڵەیـەك دەکا [بـۆ وێنـە: (فاعِل) (مَنصوب)

دەکات، یان (مَجرور) (مَنصوب) دەکات و ئەو شێوانە}، بەڵام نەخوێندەواریی و شیعر شکاندن {کە مەبەست پێی ئەوەیە ناتوانێ شیعر بهۆنێتەوە} ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ نە نووسینی هەبووەو، نە شیعریشی هۆنیوەتەوە!

مەئموونیش پێی دەڵێ: من لە بارەی سێ کەم و کورییانەوە لە تۆم پرسی، کە تێتدا هەن، تۆ چوارەمیشت بۆ زیاد کردم، کە بریتیە لە نەزانیی، ئەی نەزان! ئەوە کە پێغەمبەر ﷺ نەخوێندەوار بووەو شیعریشی نەهۆنیوەتەوە، بۆ وی سیفەتێکی بەرزو چاك بووە، بەڵام لە تۆو لە هاووێنەکانتدا، نەخوێندەواریی و شیعر نەزانیی {مەرج نیە هەر هۆنینەوەی شیعر، یانی: سەر دەرنەچوون لە شیعر} نوقصانییە، چونکە پێغەمبەر ﷺ بۆیە پێشگیریی ئەوەی لێکراوەو ڕێی نەدراوە، تاکو گومان و تۆمەتی لێ دوربخرێتەوە، نەك لەبەرئەوەی هۆنینەوەی شیعرو خوێندن و نووسین ناتەواویی بێت.

قسەکەی زۆر جوان و مەنتیقییە، (قُرطبي)یش چاکی کردوە بەڵگەی هێناوەتەوە بەو بەسەرهاتە، بۆ ئیسپاتی قسەکەی خۆی، کە بریتیە لەوەی وەك چۆن پێغەمبەر ﷺ، خوێندنەوەو نووسینی نەبووە، لەبەرئەوە نەبووە کە خوێندنەوەو نووسین خراپ بێ و، ناتەواویی بێ، بە هەمان شێوەش کە شیعریشی نەبووەو، نەیتوانیوە شیر بهۆنێتەوە، دیسان لەبەر ئەوە نیە کە شیعر گوتن و، شیعر هۆنینەوە نوقصانیی بێ، بەڵکو هەم نەبوونی خوێندنەوەو نووسین لە پێغەمبەردا ﷺ هەم نەبوونی شیعر هۆنینەوە، حیکمەتەکەی بواری کەوتنە دوو دڵیی و گومانی بێبڕوایان و کەسانێك کە لە بیانوون، نەبێ.

٧- شاعیر نەبوونی پێغەمبەر ﷺ و شیعر نەگوتنی و شیعر نەهۆنینەوەی، مانای وانیە کە شیعری نەگوتوەو، گوێی بۆ نەگرتوەو، کەیفی بە شیعر نەهاتوەو، بە ڕەهایی شیعری بە شتێکی خراپ داناوە، بەڵکو پێغەمبەر ﷺ جاری وا هەیە، شیعریشی گوتوە، دێڕێك یان زیاترو شیعریشی هەڵسەنگاندوە، ئنجا کە هەڵیسەنگاندوە بەپێی حاڵ و مەقام، بووە، جاری وا هەیە ستایشی شیعری کردوە، هەروەك جاری واش هەبووە زەمی کردوە،

وەك ئێمە لەو بارەوە، لە بارەی هەڵوێستی ئیسلام لە باری شیعرو شاعیریی و شیعر گوتنەوە، لە كۆتایی تەفسیری سوورەتی (الشُّعراء) لە ئایەتی (٢٢٤)دا كە دەفەرمویّ: ﴿وَٱلشُّعَرَآءُ يَتَّبِعُهُمُ ٱلْغَاوُۥنَ﴾، تا كۆتایی ئایەتەكە، لەو بارەوە باسێكی تایبەتمان كردوە، لێرەش ئەوەی لەویّ گوتوومانە: ناگەڕێینەوە سەری، بەڵام ئەوە كە پێغەمبەر ﷺ شاعیر نەبووەو، شیعری نەهۆنیوەتەوە، دەتوانین چەند حیكمەتێكی تێدا بخەینەڕوو، كە سەرەكیترینیان بە بڕوای من، دووانن:

**حیكمەتی یەكەم: شیعر چەند جۆرێكی هەیە:**

١- پێهەڵداگوتنی ئافرەت.

٢- هێرشكردنە سەر ئەم و ئەو (هجو).

٣- ستایشكردنی ئەم و ئەو (المدح).

٤- خۆهەڵكێشان بە ڕەچەڵەك و نەسەب (التفاخر بالأنساب).

٥- خۆهەڵكێشان بە باب و باپیران، ئازایەتیی، سەخاوەت و ... هتد.

ئنجا هەندێك لەو ئامانجانە هەر لە خودی خۆیاندا، ناشەرعیین بۆ نموونە: ئەگەر كەسێك بە ئافرەتێكی دیاریكراو هەڵابڵێ، یاخود بە شێوەیەك باسی ئافرەت بكا، كە وروووژێنەر بێ، یاخود هێرش كردنە سەر خەڵك، بە وشەو تەعبیری ناڕێك، یاخود ستایشكردنی خەڵكێك، بە تایبەت دەستەڵاتداران بە شێوەیەكی هەڵەو ناشەرعیی و زێدەڕۆیی، یاخود خۆهەڵكێشان بە ڕەچەڵەك و نەسەب و بە باب و باپیران و، لە بەرانبەردا زەمكردنی خەڵك، هەموو ئەوانە ناشەرعیین، هەروەها وێڕای ئەوانە، جاری وا هەبووە كە شاعیر، زۆر باسی خۆی كردوە، بە خۆی هەڵاگوتوە، وەك ئازایەتیی خۆی، ڕەچەڵەك بەرزیی خۆی، لە بەرانبەری نەیارەكانی دا، خۆی زۆر هەڵناوەتەوەو بەرانبەرەكانی زۆر شكاندوە، كە هەموو ئەوانەش زۆرجار ناهەقییان تێدایەو بە درۆ دادەنرێن، بەڵام هەندێك جار لە هۆنینەوەی شیعردا، هەندێك لەو شتانە چاوپۆشییان لێدەكرێ.

بەڵام بێگومان ئەگەر بۆ شاعیرێك، بۆ مرۆڤێكی ئاسایی چاوپۆشیی بكرێ، لە هەندێ لەو زێدەڕۆییانە، ئەگەر درۆش نەبن، بەس زێدەڕۆیی و تێپەڕاندن بێ، بە تەئكید ئەوە لە پێگەو پایەی بەرزی پێغەمبەرایەتیی، ناوەشێتەوە، بە تایبەت سەروەری پێغەمبەران موحەممەد ﷺ لێی ناوەشێتەوە، شیعر وەك گوتراوە: (أَعْذَبُهُ أَكْذَبُهُ)، شیرینترینی درۆترینیەتی، واتە: شیعر كاتێك لە لای شاعیران، لە لای پسپۆڕانی شیعرو شاعیران، بەتام و خۆش دەبێ، كە زێدەڕۆییكردن و هەست و نەست جووڵاندن و، جۆرێك لە قسەی ناڕاست و درۆی تێدابێ، ئنجا ئەگەر پێغەمبەر ﷺ شیعری گوتبایە، وەك شایستەیەتی، دەیانگوت: شیعرەكەی ڕەكیكە، بێهێزە، ئەگەر واشی گوتبایە كە ئەوان پێیان چاك بێ، ئەوكاتە دیارە لەگەڵ مەقامی پێغەمبەرایەتیی دا نەدەگونجا، واتە: یان دەبوو زیان بە پێگەی پێغەمبەرایەتیی بگەیەنێ، یان دەبوو شیعرێك بڵێ كە لەلای ئەهلی هونەرو پسپۆڕانی صیناعەتی شیعر، بە بێهێز بێتە بەرچاو، ئەو دووانەش بێگومان هیچ كامیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ ناوەشێنەوە.

**حیكمەتی دووەم:** ئەوە بووە كە لەو ڕۆژگارەدا، شاعیرەكان زۆربەیان لە لای خەڵكی جوامێرو تێگەیشتوو و خاوەن پێگەو شەرەف، خەڵكێكی قورس و سەنگین نەبوون، هەڵبەتە خەڵكی قورس و سەنگینیان تێدا هەبووە، بەڵام زۆربەیان وانەبوون، زۆربەیان خەڵكێك بوون شیعرەكانیان: باسی شەڕاب و ئافرەت و خۆهەڵكێشان بە ڕەچەڵەك و هێرش كردنە سەر خەڵك و، خەڵك شكاندن و خۆهەڵنان، بوون، بەڵكو باسی گەلێك شتی قەدەغەو حەرامیان كردوە، بۆیەش خوا ﷻ لە سوورەتی (الشُّعَرَاء)دا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلشُّعَرَآءُ يَتَّبِعُهُمُ ٱلْغَاوُۥنَ ﴿٢٢٤﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّهُمْ فِى كُلِّ وَادٍ يَهِيمُونَ ﴿٢٢٥﴾ وَأَنَّهُمْ يَقُولُونَ مَا لَا يَفْعَلُونَ ﴿٢٢٦﴾ ﴾.

ئەم ئایەتە پشتڕاستی ئەو قسەیە دەكاتەوە، كە دەفەرموێ: شاعیرەكان، بێمرادەكان، سەرگەردانەكان، شوێنیان دەكەون، بە هەموو شیواندا دەڕۆن، {سەری خۆیان هەڵدەگرن و دەڕۆن، وەك پێشینان گوتوویانە: (لە هەموو دیزان دەبنە ئەسكوێ)} شتی واش دەڵێن كە كاری پێناكەن.

ئەمە حیکمەتی دووەمە، کە خوا ﷻ پێغەمبەری خۆی ﷺ لە شیعر گوتن و هۆنینەوەی شیعر پاراستوە، بۆ وێنە: لە مێژوودا دەڵێ: (إمرؤ القَيس) کە کوڕی (حِجر الكندي) بووە، لەبەر ئەوەی شاعیر بووە، بابی پێی گوتوە: یان دەبێ واز لە شاعیریی بێنی، یان ئەوەتا من (خَلع)ت دەکەم {واتە: لە خۆمت دادەڕنم و دوورت دەخەمەوە} (إمرؤ القَيس)یش کە ناودارترین شاعیری عەرەب بووە لە سەردەمی پێش ئیسلامدا، ئامادە نەبووە واز لە شیعر گوتن بێنێ، بۆیە بابی دووری خستۆتەوەو دەری کردوە، هەڵبەتە دوایی کە ئیسلام هاتوە، شاعیرەکانی وەك: کەعبی کوڕی مالیك و، حەسسانی کوڕی سابیت و، زوهەیری کوڕی ئەبی سەلما، عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە، کە هەندێکیان (مُخَضرَم) بوون، لە سەردەمی نەفامییش دا هەر شاعیر بوون، بە تەئکید ئەوانە حاڵ و حیسابیان جودا بووە، چونکە شیعرەکەیان هەوێنی دینداریی و ئیمانی تێدا بووەو، ئەو کەم و کوڕییانەی لە شیعری پێش ئیسلامدا هەبووە، ئەوان خۆیان لێ پاراستوون[1].

---

(١ ) التحرير والتنوير: ج٢٣، ص٦٤.

**مەسەلەی دووەم:**

**سەرنجڕاکێشانی مرۆڤان بۆ ڕەخسێندرانی ئاژەڵان و، ڕام و دەستەمۆکرانیان بۆ بارو سوارو، بەهرەو سوودی دیکەی جۆراوجۆر.**

خوا دەفەرمووێ: ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا خَلَقْنَا لَهُم مِّمَّا عَمِلَتْ أَيْدِينَا أَنْعَامًا فَهُمْ لَهَا مَالِكُونَ ﴿٧١﴾ وَذَلَّلْنَاهَا لَهُمْ فَمِنْهَا رَكُوبُهُمْ وَمِنْهَا يَأْكُلُونَ ﴿٧٢﴾ وَلَهُمْ فِيهَا مَنَافِعُ وَمَشَارِبُ أَفَلَا يَشْكُرُونَ ﴿٧٣﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا خَلَقْنَا لَهُم مِّمَّا عَمِلَتْ أَيْدِينَا أَنْعَامًا﴾، ئایا سەرنجیان نەداوە، نەیانبینیوە، کە ئێمە لەوەی دەستەکانمان کردوویانە، ئاژەڵانێکمان بۆ هێناونەدی؟ ئەو بینینە دەگونجێ بەچاوی سەر بێ، دەشگونجێ بەچاوی عەقڵ و دڵ بێ، واتە: بینین لێرەدا بینینی چاوە، یاخود بینینی عەقڵ و دڵە، ئایا بەچاوی سەر نەیانبینیوە، یان: بە چاوی عەقڵ و دڵ سەرنجیان نەداوە، کە ئێمە لەوەی دەستەکانمان ئەنجامیان داوە، ئاژەڵانێکمان بۆ هێناونە دی بێگومان هەمزە (أ)ی ﴿أَوَلَمْ﴾، بۆ پرسیار کردنە، بەڵام لێرەدا بۆ نکووڵییلێکردن و سەرسوڕماندنە، لەوە کە چۆن ئەو چاکەو نیعمەتەی خوای پەروەردگار نابینن؟!

﴿مِّمَّا عَمِلَتْ أَيْدِينَا أَنْعَامًا﴾، لەوەی دەستەکانمان کردوویانە، ئەمە دوایی قسەی لێ دەکەین، بەڵام وێنەی ئەوە لە قورئاندا هاتوە، بۆ وێنە: لە سوورەتی (الذّاريات) خوا دەفەرمووێ: ﴿وَالسَّمَاءَ بَنَيْنَاهَا بِأَيْيدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ﴿٤٧﴾﴾، ئاسمانمان بە دەستەکان دروستکردوون و، ئێمە فراوانکەریانین، هەروەها لە سوورەتی (ص) ئایەتی (٧٥) دا، خوا ﷻ بە ئیبلیس دەفەرمووێ: بۆچی کڕنووشت نەبرد بۆ کەسێك کە من بە هەردوو دەستی خۆم دروستم کردوە ﴿مَا مَنَعَكَ أَن تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَيَّ﴾.

کەواتە: لە سوورەتی (یس)دا بە (أيدي) دەیهێنێ واتە: دەستەکان، هەروەها لە سوورەتی (الذّاريات)یش دا بە (أيدي) دەیهێنێ، بەڵام لە سوورەتی (ص)دا بە هەردوو

دەستم (بیدیّ) دەیهێنێ و، لە سوورەتی (الفتح)یش ئایەتی (١٠)دا بە دەست (یَد) دەیهێنێ: ﴿ يَدُ ٱللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ ﴾، بە تاك دەیهێنێ، بۆیە بە ئاشکرا دەزانین کە ئەوە تەعبیرێکی مەجازییە، ئەگەرنا دەبێ بڵێی: خوا دەستێکی هەیەو، دووانیشی هەن و، زۆریشی هەن!! هەڵبەتە لەو بارەیەوە زانایان مشتومڕیان زۆر بووە، بەڵام ئەوەی گرنگە لێرەداو سەرنجمان ڕادەکێشێ، ئەوەیە کە خوا ﷻ دەفەرمویّ: ئەو ئاژەڵانەم بە شێوەیەکی تایبەت بۆ دروستکردوون، هەروەك چۆن کە خوا ڕەخنە لە ئیبلیس دەگریّ: ﴿ قَالَ يَٰٓإِبۡلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَن تَسۡجُدَ لِمَا خَلَقۡتُ بِيَدَيَّۖ ﴿٧٥﴾ ﴾ص، واتە: بە شێوەی تایبەت دروستم کردوە، ئەگەرنا هەموو شتێك هەر خوا دروستی دەکا، بە دەسەڵاتی خۆی، بەزانیاریی خۆی، بە ویستی ڕەهای خۆی.

وشەی (أنعام)یش چوار جۆرە ئاژەڵ دەگرێتەوە، لە سوورەتی (الأنعام) ئایەتەکانی (١٤٣ و ١٤٤)دا کە هەر سوورەتەکە بەو ناوەوەیە، خوا باسیکردوون: ﴿ ثَمَٰنِيَةَ أَزۡوَٰجٖۖ مِّنَ ٱلضَّأۡنِ ٱثۡنَيۡنِ وَمِنَ ٱلۡمَعۡزِ ٱثۡنَيۡنِۗ ﴾، دواییش دەفەرمویّ: ﴿ وَمِنَ ٱلۡإِبِلِ ٱثۡنَيۡنِ وَمِنَ ٱلۡبَقَرِ ٱثۡنَيۡنِۗ ﴾، کەواتە: جووتێك لە حەیوانی سپیی کە مەڕو بەران و، جووتێك لە حەیوانی ڕەشی گچکە، کە بزن و نێرین و، جووتێك لە حوشتر: نێرو مێ، (جَمَل) حوشتری نێرو (ناقة) حوشتری مێ، جووتێك لە ڕەشەوڵاخ کە: گاو مانگان، هەروەها کەڵ و گامێشیش.

٢)- ﴿ فَهُمۡ لَهَا مَٰلِكُونَ ﴾، ئنجا ئەوان خاوەنی ئەوان (ئاژەڵان)ن. لە جیاتی ئەوەی بفەرمویّ: (فَهُم مَالِكُوهَا)، دەفەرمویّ: ﴿ فَهُمۡ لَهَا مَٰلِكُونَ ﴾، ئەم تەعبیرە: (يُفِيدُ تَعْظِيمَ المالِكيَةِ لِلأَنْعَام)، بە مەزنگرتنی خاوەنداربوونی ئەو ئاژەڵانەیە، واتە: موڵکێکی گەورەمان پێداون، ﴿ مَٰلِكُونَ ﴾، (أي: ضَابِطُونَ، قَاهِرونَ، تَتَصَرَّفُونَ فيها كَيْفَ تَشَاءُون)، واتە: کۆنترۆڵیان دەکەن و ملکەچیان دەکەن، چۆنی بیانەوێ مامەڵەیان پێ دەکەن.

٣)- ﴿ وَذَلَّلۡنَٰهَا لَهُمۡ ﴾، هەروەها ئەو ئاژەڵانەمان بۆ ئەوان دەستەمۆو ملکەچ کردوون، (ذَلَّ، يَذِلُّ، ذِلاً، وذَلَّتِ الدابةُ فَهِيَ ذلولٌ: لَيسَتْ بِصَعبَةٍ، ذَلَّ، يَذُلُّ، ذُلاً: مَا كَانَ عَنْ قَهرٍ)، (ذَلَّ): ملکەچ بوو، (يَذِلُّ): ملکەچ دەبێ، (ذِلاً) واتە: دەستەمۆ بوون، ملکەچ بوون،

بەڵام (ذَلّ يَذُلّ ذُلاً)، ئەوەیە کە کەسی بەرانبەر خۆی فەرز بکات، بەڵام (ذَلَّت الدابة ذِلاً فَهِيَ ذلولٌ: لَيسَتْ بِصَعبَةٍ)، واتە: وڵاخەکە چەمووش نیە، جەنە ناگرێ، یاخیی نابێ، بەڵکو دەستەمۆیە و ملکەچە، حوشترێکی گەورە منداڵێکی گچکە دەتوانێ یەخی بدات، یان گایەك ئەگەر لە خەڵك هار بێ، سەد کەس دەرۆستی نایەن، کەچی تەماشا دەکەی جووتیارێك دوو گا جووتیان پێدەکات، هەشت نۆ دە گاو مانگا، گاگێرەیان پێدەکات.

٤)- ﴿فَمِنْهَا رَكُوبُهُمْ وَمِنْهَا يَأْكُلُونَ﴾، لەو ئاژەڵانەدا سواربوویان هەیەو لێشیان دەخۆن. (رَكُوب: أي: مَرْكُوب، مِثْلُ الحَلُوب) (حَلُوب) واتە: دۆشراو، ئاژەڵێك کە شیری لێ دەدۆشرێ، (ناقةٌ حَلُوب)، یان (بَقَرةٌ حَلُوب)و، (رَكُوب)یش ئەو ئاژەڵەیە مرۆڤ سواری دەبێ، یان باری لێ دەنێ، ﴿فَمِنْهَا رَكُوبُهُمْ﴾، (رَكُوب) سواربوو هەیە بۆ ئەوان، بۆ مرۆڤەکان، ﴿وَمِنْهَا يَأْكُلُونَ﴾، هەروەها لێشی دەخۆن، هەر لەو ئاژەڵانە لە شیرو گۆشتەکەیان دەخۆن.

٥)- ﴿وَلَهُمْ فِيهَا مَنَافِعُ وَمَشَارِبُ﴾، هەروەها بۆ ئەوان لەو ئاژەڵانەدا هەیە سوودگەلی زۆرو خواردنەوەو پێخۆرەوەکان، (مَنافِع) کۆی (مَنْفَعة)یە یانی: سوود، (مَشارِب) کۆی (مَشْرَب)ە، (مَشارِب) کە چاوگێکی میمییە، أ- یان بە مانای (شُرْب)ە، واتە: خواردنەوە (شُروب)، خواردنەوەکان. ب- دەشگونجێ (مشارب) کۆی (مشرب) بێ و (إسمُ المكان) ناوی شوێن، بێ، یانی: لە چەرم و کەوڵی ئەو ئاژەڵانە، دەفران دروستدەکەن، وەك مەشکەو کوندەو ... هتد، کە شیرو رۆن و ماست و دۆ، ئاو یان شلەمەنییەکانی بە گشتیی تێدا دەخۆنەوە، کەواتە: (مَشارِب) واتە:

أ- خواردنەوەکان،

ب- دەفرەکانی تێدا خواردنەوە.

٦)- ﴿أَفَلَا يَشْكُرُونَ﴾، ئایا سوپاسگوزاریی ناکەن؟ لێرەدا دیسان هەمزە (أ) بۆ پرسیارکردنی نکوولیلێکەرانەیە، واتە: چۆن سوپاسگوزاریی ناکەن، کە خوا ئەو نیعمەتانەی بۆ رەخساندوون؟ لە سوورەتی (النّحل)، دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ لَكُمْ فِي الْأَنْعَامِ لَعِبْرَةً نُسْقِيكُمْ مِمَّا فِي

بُطُونِهِۦ مِنۢ بَيۡنِ فَرۡثٖ وَدَمٖ لَّبَنًا خَالِصٗا سَآئِغٗا لِّلشَّٰرِبِينَ ﴿٦٦﴾ ﴾، کە لەوێ لە تەفسیری سوورەتی (النّحل)دا باسێکی سەربەخۆمان لە بارەی شیرو ماستەوە کردوە.

لە بارەی ئەو تەعبیرەوە کە دەفەرموێ: ﴿مِّمَّا عَمِلَتۡ أَيۡدِينَآ﴾، لەوە کە دەستەکانمان کردوویانە، بە چاکی دەزانین تیشکی زیاتری بخەینە سەرو، قسەی دوو لە زانایان لەو بارەوە دێنم:

یەك: (محمد الطاهر بن عاشور)[1] لە تەفسیرەکەی خۆیدا[2] دەڵێ:

(وَاسْتُعِيرَ عَمَلُ الأَيْدِي الَّذِي هُوَ الْمُتَعَارَفُ فِي الصُّنْعِ، لإِيجَادِ أُصُولِ الأجناسِ بِدُونِ سَابِقِ مَنْشَإٍ مِنْ تَوَالُدٍ أَوْ نَحْوِهِ، فَأَسْنَدَ ذَلِكَ إِلَى أَيْدِي اللهِ تَعَالَى لِظُهُورِ أَنَّ تِلْكَ الأُصُولَ لَمْ تَتَوَلَّدْ عَنْ سَبَبٍ كَقَوْلِهِ: ﴿وَٱلسَّمَآءَ بَنَيۡنَٰهَا بِأَيۡيْدٖ ﴿٤٧﴾ ﴾الذاريات، فَ «مِنْ» فِي قَوْلِهِ: ﴿مِّمَّا عَمِلَتۡ أَيۡدِينَآ﴾ ابْتِدَائِيَّةٌ لأَنَّ الأَنْعَامَ الَّتِي لَهُمْ مُتَوَلِّدَةٌ مِنْ أُصُولٍ حَتَّى تَنْتَهِيَ إِلَى أُصُولِهَا الأَصْلِيَّةِ الَّتِي خَلَقَهَا اللهُ كَمَا خَلَقَ آدَمَ، فَعَبَّرَ عَنْ ذَلِكَ الْخَلْقِ بِأَنَّهُ بِيَدِ اللهِ، اسْتِعَارَةٌ تَمْثِيلِيَّةٌ لِتَقْرِيبِ شَأْنِ الْخَلْقِ الْخَفِيِّ الْبَدِيعِ).

واتە: (عَمَلُ الأيدي)، کە دەفەرموێ: ﴿مِّمَّا عَمِلَتۡ أَيۡدِينَآ﴾، کاری دەستان، زیاتر بۆ دروستکردنی شتی ورد ئەو تەعبیرە بەکاردێ، لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ هێنانەدی بنچینەی جۆرەکان، واتە: بنچینەی جۆرەکانی ژیانداران بێ ئەوەی چاوگێکی پێشتریان بووبێ، وەك لە دایك بوون و وێنەی ئەوە، ئنجا بۆیە ئەوە پاڵدراوەتە لای دەستەکانی خوای بەرز، چونکە دیارە کە ئەو بنچینانە، لە هۆکارێك پەیدا نەبوون، وەك چۆن خوا ﷻ لە باسی ئاسمان دا دەفەرموێ: ﴿وَٱلسَّمَآءَ بَنَيۡنَٰهَا بِأَيۡيْدٖ

---

(١) (محمد الطاهر بن عاشور) ڕوونکەرەوەیەکی باشی قورئانە، لەگەڵ هەندێ وردە تێبینی، کە ئەوەی بە پێویستی بزانین، قسەی لێ دەکەین، لە ڕوونکەرەوانی قورئانی هاوچەرخ دەتوانم بڵێم: نەك لە هەموو شتێکدا، بەڵام بە گشتیی لە هەموویان وردترە، هەروەك زۆریش شارەزای زمانی عەرەبیی بووەو، زۆر شارەزابوونەکەی زمانی عەرەبیی، زۆر هاوکاری بووە، کە باش لە نهێنیی و دیوە پەنهانەکانی ئایەتە موبارەکەکان حاڵیی بێ.

(٢) التحرير والتنوير: ج٢٣، ص٨٨.

﴿(٤٧) الذاریات، ئاسمانمان بە دەستەکانی خۆمان بنیات ناوەو بینا کردوە، ئنجا لێرە کە دەفەرموێ: ﴿مِّمَّا عَمِلَتۡ أَيۡدِينَآ﴾، (مـن) لـە ﴿مِّمَّا عَمِلَتۡ﴾دا، (مـن) ی دەستپێکی پـێ دەگوترێ، چونکـە ئـەو ئاژەڵانـە کـە مرۆڤـەکان هەیانبـوون و خـوا دەیانکاتـە چاکـەو نیعمەتـی خـۆی لەسـەریان، بـە تەئکیـد ئـەو ئاژەڵانـە لـە بنچینانێکـی دیکـە پەیـدا بـوون، [بـۆ وێنـە: ئـەو گاو مانگایـە لـە گاو مانگایەکـی دی و، ئـەو حوشـترە لـەو حوشـترە، هەروەهـا ئـەو مـەڕو بزنـەو ... هتـد] ئـەو لـە دایـك بـوون و پەیدابوونـە تاکـو دەگاتـە سـەر بنچینـە بنەڕەتییـەکان کـە خـوا ﷻ دروستیکردوون، وەك چـۆن ئادەمـی دروستکردوە، [مرۆڤـەکان هەموویـان لـە یـەك پەیـدا دەبـن، هەموویـان دەچنـەوە سـەر بـاب و دایکێـك، ڕەشـە وڵاخەکانیـش گاو مانگایەکانیـش دەچنـەوە سـەر جووتێـك و، مـەڕو بەرانـەکان دەچنـەوە سـەر جووتێك و، بـزن و نێرییـەکان دەچنـەوە سـەر جووتێـك، هەروەهـا حوشـترە نێـرو مێیـەکان، کـە بـە نێرەکـەی (جَمَـل) دەگوتـرێ، بـە مێینەکـەی (نَاقَـة) دەگوتـرێ و، بـە هەردووکیـان دەگوتـرێ (إبِـل) دەچنـەوە سـەر جووتێـك، ئـەو جووتانـەی بنـەڕەت، خـوا ﷻ وەك چـۆن ئـادەم و حـەووای هێناونـە دی و، لەوانـەوە مـرۆڤ پەیـدا بـوون، لـەو جووتـە ئاژەڵانەشـەوە، هەمـوو جۆرەکانـی ئـەو چـوار جـۆرە ئاژەڵـە پەیـدا بـوون][1].

ئنجـا خـوا ﷻ ئـەو جـۆرەی دروسـتکردنەی تەعبیـر کـردوە، کـە بەدەسـتی خـوا بـووە، ﴿مِّمَّا عَمِلَتۡ أَيۡدِينَآ﴾، کـە ئەمـە خوازراوەیەکـی وێنەییـە بـۆ نیزیـك خسـتنەوەی دروسـتکردنی پەنهـان و سەرسـوڕهێنەری خـوا لـە عەقڵـی ئێمـە، کـە خـوا چۆنـی هێناوەتـە دی؟!

دوو: (الشوكاني)[2]، ئەویش لە تەفسیرەکەی خۆی دا[3] دەڵێ:

---

(١) نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە.

(٢) کە ئەویش زانایەکی گەورە بووە، لە تەفسیرو سوننەت و فیقهو ئوصووڵ دا زۆر شارەزابووە.

(٣) فَتْحُ القَدِير: ج٤، ص ٤٦١.

**(أي: مِـمَّا أَبْدَعْنَـاهُ وَعَمِلْنَـاهُ، مِـنْ غَـيْرِ وَاسِـطَةٍ وَلَا شَرِكَـةٍ، وَإِسْـنَادُ الْعَمَـلِ إِلَى الأَيْـدِي مُبَالَغَـةٌ فِي الإِخْتِصَـاصِ، وَالتَّفَـرُّدِ بِالْخَلْـقِ، كَـمَا يَقُـولُ الْوَاحِـدُ مِنَّـا: عَمِلْتُـهُ بِيَـدَيَّ لِلدَّلَالَـةِ عَـلَى تَفَـرُّدِهِ بِعَمَلِـهِ).**

واتــە: کــە دەفەرمــوێ: ﴿ مِّمَّا عَمِلَتۡ أَيۡدِينَآ ﴾، یــانی: لــەوەی کــە دامانهێنــاوەو دروســتمان کــردوە بەبــێ هــۆکارو، بەبــێ هاوبەشــیی، ئنجــا کــە کار لێــرەدا پاڵدراوەتــە لای دەســتەکان، (**عَمِلَتــهُ أيدينــا**) ئەمــە زێدەڕۆییکردنــە، لــە تایبەتمەنــد بــوون و تاکبوونــەوە لــە هێنانــەدی دا، وەك یەکێك لــە ئێمــە دەڵێ: ئــەوەم بــە دەســتی خــۆم دروســتکردوە، بــۆ ئــەوە پێشــانی بــدا کــە خــۆی ئــەو کارەی ئەنجــام داوەو، کەســی دیکــە دەســتی تێیــدا نەبــووە.

**مەسەلەی سێیەم:**

**هاوبەش دانەرەکان شتانێك جگە لە خوا دەپەرستن، کە بە خەیاڵی خۆیان پشتیوانیان بن، بەڵام لە ڕۆژی دواییدا ئەو پەرستەرانە وەك سەربازی ئامادە دەبن و، پەرستراوەکانیش هیچیشیان بۆیان پێ ناکرێ، مادام خواش پەنهان و ئاشکرایان دەزانێ، پێویستە بە قسەی پووچیان دڵتەنگ نەبن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ ءَالِهَةً لَّعَلَّهُمْ يُنصَرُونَ ﴿٧٤﴾ لَا يَسْتَطِيعُونَ نَصْرَهُمْ وَهُمْ لَهُمْ جُندٌ مُّحْضَرُونَ ﴿٧٥﴾ فَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ إِنَّا نَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴿٧٦﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ وَٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ ءَالِهَةً ﴾، هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان جگە لە خوا پەرستراوانێکیان هەڵبژاردن، لێرەدا خوا بەپێی گومان و بۆچوونی ئەوان، ناویان لێدەنێ: ﴿ ءَالِهَةً ﴾ پەرستراوان.

٢)- ﴿ لَّعَلَّهُمْ يُنصَرُونَ ﴾، بەڵکو سەربخرێن، پشتیوانییان لێ بکرێ، واتە: ئەو پەرستەرانە، ئەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانە، گومانیان وایە کە بەهۆی ئەو پەرستراوانەوە، سەردەخرێن و پشتیوانییان لێ دەکرێ.

٣)- ﴿ لَا يَسْتَطِيعُونَ نَصْرَهُمْ ﴾، پەرستراوەکان ناتوانن ئەو پەرستەرانەی خۆیان سەربخەن، ئەمە بە دوو شێوە تەفسیر کراوە:

أ- پەرستراوەکان ناتوانن ئەوانەی کە دەیانپەرستن، سەریان بخەن، هەرچەندە لەلاشیان دەبن وەك سەربازی ئامادە.

ب- یاخود: پەرستەرەکان وەك سەربازی ئامادە دەبن، لە بەردەستی پەرستراوەکاندا، لە جیاتی ئەوەی پەرستراوەکان هاوکاریان بن، ئەوان لە خزمەتی پەرستراوەکان و بت و صەنەمەکان دان، دەیانپارێزن و، خزمەتیان دەکەن.

٤)- ﴿وَهُمْ لَهُمْ جُندٌ مُّحْضَرُونَ﴾، له حاڵێك دا ئەوان بۆیان سەربازانی ئامادەكراون. ئەمە دەگونجێ بۆ پەرستراوەكان بچێتەوە: پەرستراوەكان بۆ پەرستەرەكان، وەك سەربازی ئامادە كراون.

یاخود: پەرستەرەكان بۆ پەرستراوەكان، وەك سەربازی ئامادە كراون، لە جیاتی ئەوەی پەرستراوەكان هاوكاریان بن، كەچی پەرستەرەكان خزمەتی ئەوان دەكەن.

٥)- ﴿فَلَا يَحْزُنكَ قَوْلُهُمْ﴾، ئنجا با قسەی وان خەمبارو دڵتەنگت نەكات، ئەمە خوێندراویشەتەوە: (فَلَا يُحْزِنكَ قَوْلُهُم)، (أَحْزَنَهُ، يُحْزِنُهُ، وَحَزَنَهُ، يَحْزُنُهُ)، هەردووكیان هاتوون، با قسەی وان تۆ دڵتەنگ نەكات، دیارە نەهی كردنی خوا لە دڵتەنگ بوونی پێغەمبەر ﷺ، نەهی كردنیەتی لە هۆكارەكەی، كە بریتیە لەوەی پێغەمبەر ﷺ زۆرخۆییان پێوە سەرقاڵ نەكات و، بە قسەو قاڵی ناحەزانەیانەوە، بۆ ئەوەی نەبێتە هۆكاری دڵتەنگیی و، زۆر گوێ لە قسەو قاڵی پووچ و بێبنەمایان نەگرێ، بۆ ئەوەی نەبێتە هۆی خەمباریی.

٦)- ﴿إِنَّا نَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ﴾، بە دڵنیایی ئێمە دەزانین ئەوەی پەنهانی دەكەن و، ئەوەش كە ئاشكرای دەكەن، ئەمە هۆكار هێنانەوەیە بۆ ڕێلێگرتنەكە، بۆ نەهی لێكردنەكە، واتە: تۆ دڵتەنگ مەبە بە قسەی ئەوان، چونكە قسەی ئەوان و، هەڵسوكەوتی ئەوان و نیازی نێو دڵی ئەوان، هەرچی ئاشكرایەو هەرچی پەنهانە، ئێمە هەمووی دەزانین، دوایی پڕ بە پێستی نیەت و قسەو كردەوەكانیان، سزایان دەدەین.

لە كۆتایی ئەم مەسەلەی سێیەم دا، ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ دێنین، كە دەفەرموێ:

**{يَجْمَعُ النَّاسَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ، ثُمَّ يَطَّلِعُ عَلَيْهِمْ رَبُّ الْعَالَمِينَ، ثُمَّ يُقَالُ: أَلَا يَتَّبِعُ كُلُّ إِنْسَانٍ مَا كَانُوا يَعْبُدُونَ، فَيَتَمَثَّلُ لِصَاحِبِ الصَّلِيبِ صَلِيبُهُ، وَلِصَاحِبِ الصُّوَرِ صُوَرُهُ، وَلِصَاحِبِ النَّارِ نَارُهُ، فَيَتْبَعُونَ مَا كَانُوا يَعْبُدُونَ، وَيَبْقَى الْمُسْلِمُونَ}** (أخرجه أحمد: ٨٨٠٣، تعليق شعيب الأرنؤوط: صحيح، والترمذي: ٢٥٥٧، هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَصَحَّحَهُ الألباني).

واتـە: لـە ڕۆژی قیامەتـدا خـوا خەڵـك كۆدەكاتـەوە لـە یـەك گۆڕەپانـدا، دوایـی پـەروەردگاری جیهانییـان سـەرنجیان دەداو دەفەرمـوێ: بـا هـەر مرۆڤـە {و هـەر كەسـە} بـەدوای ئـەوە بكـەوێ كـە دەیپەرسـت {لـە دنیـادا} ئنجـا بابـای خاچپەرسـت، خاچەكـەی بـۆ بەرجەسـتە دەكـرێ و، بابـای وێنەپەرسـت و پەیكـەر پەرسـت، وێنـەو پەیكەرەكانیـان بـۆ بەرجەسـتە دەكرێـن و، بابـای ئاگـر پەرسـت، ئاگرەكـەی بـۆ بەرجەسـتە دەكـرێ، هـەر كامێـك لەوانـە بـەدوای پەرسـتراوی خۆیـان دەكـەون و، مسـوڵمانان دەمێننـەوە، (لەبـەر ئـەوەی مسـوڵمانان تەنیـا خـوای پەروەردگاریـان پەرسـتووەو، هیـچ كام لـە دروسـتكراوەكانیان بـە شایسـتەی پەرسـتن نەزانیـون و، شـایانی پەرسـترانیش نیـن).

**مەسەلەی چوارەم و کۆتایی:**

**ڕەخنەگرتنی خوا لە مرۆڤی کافر کە وێنەیەکی هێناوەتەوەو، دروستکرانی خۆی لە بیر چووەو گوتوویەتی: کێ ئێسکە پرتووکاوەکان زیندوو دەکاتەوە؟ خوای زاناو کارزانیش بە شەش بەڵگەی بەهێز، وەڵامی ئەو قسەیەی فێری پێغەمبەرەکەی ﷺ کردوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَمْ يَرَ الْإِنسَانُ أَنَّا خَلَقْنَاهُ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ﴿٧٧﴾ وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِيَ خَلْقَهُ قَالَ مَن يُحْيِي الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ ﴿٧٨﴾ قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ ﴿٧٩﴾ الَّذِي جَعَلَ لَكُم مِّنَ الشَّجَرِ الْأَخْضَرِ نَارًا فَإِذَا أَنتُم مِّنْهُ تُوقِدُونَ ﴿٨٠﴾ أَوَلَيْسَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِقَادِرٍ عَلَىٰ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُم بَلَىٰ وَهُوَ الْخَلَّاقُ الْعَلِيمُ ﴿٨١﴾ إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئًا أَن يَقُولَ لَهُ كُن فَيَكُونُ ﴿٨٢﴾ فَسُبْحَانَ الَّذِي بِيَدِهِ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٨٣﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پازدە بڕگەدا:**

**١)-** ﴿ أَوَلَمْ يَرَ الْإِنسَانُ ﴾، ئایا ئینسان نەیبینیوە! بە تەئکید مەبەست لێرەدا لە بینین، بینینی عەقڵ و دڵە، واتە: ئایا مرۆڤ نازانێ، وشەی: ﴿ الْإِنسَانُ ﴾، کە (أل)ی ناساندنی لەسەرە، بۆ (عَهد)ە، واتە: ئایا مرۆڤەکە، ئینسانە کافرەکە نازانێ، چونکە ناگونجێ مەبەست پێی هەموو مرۆڤەکان بن، چونکە مرۆڤە بڕوادارەکان دەزانن: خوا دروستیکردوون لە نوتفەو، دەشزانن کە خوا دەشتوانێ زیندوویان بکاتەوە.

**٢)-** ﴿ أَنَّا خَلَقْنَاهُ مِن نُّطْفَةٍ ﴾ {ئایا مرۆڤە بێبڕوایەکە نازانێ} کە ئێمە ئەومان لە تۆویلکەیەك دروستکردوە؟ ﴿ نُّطْفَةٍ ﴾، بریتیە لە: ژیانداری تۆوی + هێلکۆڵە (حَیمَن + البُوَیضة)، لەو دووانە ﴿ نُّطْفَةٍ ﴾، پەیدا دەبێ، کە هەم (حَیمَن)، (حَیْوَان منوي) زیندەوەری تۆویی پیاو، کە لە دڵۆپەیەکیدا بە ملیۆنان هەن، هەم هێلکۆڵەی ئافرەت کە

ئەویش زیندەوەرێکەو، هەردووکیان ژیاندارن و، یەکدەگرن و ژیاندارێکی سێیەم پێك دێنن، پێی دەگوترێ: ﴿نُّطْفَةٍ﴾، کە ئێمە لە سەرەتای تەفسیری سوورەتی (المؤمنون) دا، بە درێژیی لە بارەی دروستبوونی مرۆڤەوە قسەمان کردوە.

٣)- ﴿فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ﴾، [ئێمە ئەومان لە تۆویلکەیەك دروستکردوە] دوایی یەکسەر بۆتە مشتومڕکەرێکی ڕوونکەرەوە، یانی: مەبەستی خۆ ئاشکراکەر، دەشگونجێ (مبين) بە مانای ڕوون و ئاشکرا بێ، وشەی: ﴿خَصِيمٌ﴾، (فَعِيلٌ مُبَالَغَةٌ فِي مَعْنَى مُفَاعِل: مُخَاصِمٌ شَدِيْد الخِصَام)، (خَصِيم) لەسەر کێشی (فَعِيْلُ)ە، زێدەڕۆییکردنە لەمانای (مُخَاصِمٌ)دا، واتە: (مُجَادِل) شەڕەقسەکەر، مشتومڕکەر، وشەی: ﴿مُّبِينٌ﴾ یش لێرەدا هەم دەگونجێ بەمانای ڕۆشنکەرەوە بێ، هەم دەگونجێ بەمانای ڕۆشن بێ، کەواتە: ﴿مُّبِينٌ﴾، هەم دەگونجێ لە (أَبَانَ)ی (لازم)ەوە هاتبێ، وەك: (أَبَانَ القَمَرُ)، مانگەکە دەرکەوت، دەشگونجێ لە (أَبَانَ) ی (مُتَعَدِّي)ەوە هاتبێ، وەك: (أَبَانَ المُدَرِّسُ الدَّرسَ)، مامۆستایەکە دەرسەکەی ڕوونکردەوە، چونکە ئەو کەسە، ئەو مرۆڤە کە سەرەتای دروستبوون و دەستپێکی خۆی لە بیر دەچێتەوە، دەبێتە مشتومڕکەرێکی ڕوون، هەروەها دەبێتە مشتومڕکەرێکی نیازی خۆ دەرخەر، ئەوەی دەیەوێ ئاشکرای بکات و دەری بخات.

٤)- ﴿وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِيَ خَلْقَهُۥ﴾، وێنەیەکی بۆ ئێمە هێنایەوەو دروستکرانی خۆی لەبیر چۆوە، (مَثَل): بریتیە لەوەی حاڵێك بەراوردی پێبکەی بە حاڵێکی دیکە، کە دەفەرموێ: ﴿وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا﴾، واتە: (أَيْ بِتَشْبِيهِ حَالِ قُدْرَتِنا بِحَالِ عَجْزِ النَّاس) یانی: حاڵی دەسەڵاتی ئێمەی {هی خوای پەروەردگاری} چواندوە بە حاڵی دەستەپاچەیی خەڵك، وەك چۆن خەڵك ناتوانێ ئێسکانی پرتووکاو زیندوو بکاتەوە، دەسەڵاتی خواشی پێوانە (قیاس) کردۆتە سەر ئەوان، کە خواش ناتوانێ، ئەوکارە بکات.

﴿وَنَسِيَ خَلْقَهُۥ﴾، دروستکرانی خۆی لەبیرچۆتەوە، ئەگەر خۆی لە بیری نەچووبایەوە، دەیزانی: خوایەك کە ئەوی لە نوتفەیەك هێناوە، دەشتوانێ دوای ئەوەی دەبێتەوە بە خاك و خۆڵ و ئێسقانی پرتووکاو، دووبارە زیندووی بکاتەوە، بەڵام لەبیری چۆتەوە لە کوێوە هاتوە!

٥)- ﴿قَالَ مَن يُحۡيِ ٱلۡعِظَٰمَ وَهِيَ رَمِيمٞ﴾، گوتی: کێ ئێسکان زیندوو دەکاتەوە، لە حاڵێك دا پرتووکاون و ڕزیون؟ ﴿ٱلۡعِظَٰمَ﴾، کۆی (عَظْم)ە، واتە: ئێسك، کە بە: ئێسکەکان کۆدەکرێتەوە، هەندێك کەس دەڵێن: ئێسقان.

﴿وَهِيَ رَمِيمٞ﴾، دەگوترێ: (رَمَّ، وَأَرَمَّ: بَـلِيَ) (رمَّ وأَرمَّ): ڕزی، پرتـووکاو، کلۆربـوو، گەنـدەڵ بـوو.

٦)- ﴿قُلۡ يُحۡيِيهَا ٱلَّذِيٓ أَنشَأَهَآ أَوَّلَ مَرَّةٖ﴾، بڵێ: ئەو کەسە دەیژیێنێتەوە کە یەکەمجار پێی گەیاندوە، بۆچی دەفەرموێ: ﴿أَنشَأَهَآ﴾؟ چونکە لە ڕاستییدا مرۆڤ کە دروست دەبێ، پلە پلە دروست دەبێ، (الإنْشَاءُ: الخَلْقُ شَيْئاً فَشَيْئاً) واتە: پێگەیاندن قۆناغ بە قۆناغ، کە وەك لە سەرەتای سووڕەتی (المؤمنون)دا باسمان کرد، بەلای کەمەوە مرۆڤ کە لە سکی دایکیدا پێدەگا، بە حەوت قۆناغدا تێدەپەڕێ، بۆیە دەفەرموێ: بڵێ: ئەو کەسە کە یەکەمجار پێی گەیاندوە، قۆناغ بە قۆناغ هێناویەتی، ئەو دەتوانێ زیندووی بکاتەوە.

٧)- ﴿وَهُوَ بِكُلِّ خَلۡقٍ عَلِيمٌ﴾، ئەو (خوا) بە هەموو دروستکردنێکیش زانایە، واتە: هەموو ئامرازەکانی دروستکردن کە ئێمە نایانزانین، هەموویان لەبەردەستی خوا دان.

٨)- ﴿ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلشَّجَرِ ٱلۡأَخۡضَرِ نَارٗا﴾، ئەو کەسەی لە درەختی (تەڕو) سەوز ئاگری گێڕاوە. وەك دوایی باسیان دەکەین، ئەوانە هەموویان بەڵگەن بە دوای یەکدا:

ئـەو زاتـەی کـە لـە درەختـی سـەوز ئاگـری بـۆ ڕەخسـاندوون، کاتـی خـۆی هەمـوو ڕوونکەرەوانـی قورئـان، ئەوەیـان وا لێکداوەتـەوە کـە دوو درەخـت هـەن بەنـاوی (المَـرخ والعَفـار)، کـە یەکێکیـان لـە ئـەوی دیکـە دەخشـێنرێ و، ئاگریـان لـێ پەیدادەبـێ، بـەڵام ئەگـەر ئـەو دوو جـۆرە درەختـە: (اَلمَـرْخ والعَفـار)، لـە هەندێـك شـوێنان هەبـن، لـە شـوێنەکانی دیکـەدا نیـن، بـەڵام چەمکـی ئـەو ئایەتـە موبارەکـە زۆر لـەوە فراوانـترەو، دەتوانیـن بـە دوو شـێوەی دیکـە تەفسـیری بکەیـن:

١- لەو چاخانەدا کە پێیان گوتراوە: چاخە باراناوییەکان (العُصُور المَطِيْرَة)، درەختی زۆر گەورە هەبوون و، ئاژەڵی زۆر قەبارە زل هەبوون، وەك دیناسۆڕەکان، ئەوانە لە ئەنجامی ئەو گۆڕانکارییانەدا کە خوا بەسەر زەویدا هێناون، هەم دارو درەختە زل و زەبەلاحەکان، هەم ئەو ژیاندارو ئاژەڵە زل و زەبەلاحانە، مردوون و کەوتوونە بن چینەکانی زەوی، دوایی هەم دارو درەخت و سەوزاییەکان، هەم ئاژەڵەکانیش کە بە ملیۆنان بوون، هەموویان شی بوونەوە لە نێو زەویداو، بوون بە غازو خەڵووزی بەردو، نەوت.

٢- ڕووەك لە ئەنجامی تیشکە پێکهاتندا، گەرمیی خۆر لە خۆیدا کۆدەکاتەوە، دوایی کە درەخت وشك دەبێ، دەسووتێ و ئەو تیشکە خۆرەی کە لە خۆیدا کۆی کردۆتەوە، دێتەوە دەرێ و هەرچی گەرمیی لەسەر زەوییە، لە تیشکی خۆرەوە دێ، بەشێوازە جۆراوجۆرەکان، کە دوو جۆرو شێوازیان، ئەو دووانەن کە باسمانکردن.

٩)- ﴿فَإِذَآ أَنتُم مِّنْهُ تُوقِدُونَ﴾ {ئەو خوایەی لە درەختی سەوز ئاگری بۆ فەراهەم هێناون} ئنجا ئێوە دایدەگیرسێنن.

وای تێدەگەم کە خوا ﷻ دەیەوێ پێمان بفەرموێ: خوا ئاگرو درەختی سەوزی پێکەوە کۆکردوونەوە، واتە: لە درەختی سەوز، ئاگری پەیدا کردوە، کەواتە: دەشتوانێ لەو ئێسقانە پرتووکاوانە، جارێکی دیکە ژیان دەربێنێتەوە.

١٠)- ﴿أَوَلَيْسَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُم ؟﴾، ئایا ئەو کەسەی کە ئاسمانەکان و زەوی هێناونە دی، بە توانا نیە کە وێنەی ئەوان بەدی بێنێ و دروستبکاتەوە؟ ئاسمان و زەوی، ئەو گەردوونە بەو پان و پۆڕیی و سەرسوڕهێنەرییە، کە ملیاران کەهکەشانی تێدایە، هەر کەهکەشانێك ملیاران ئەستێرەیان تێدان.

١١)- ﴿بَلَىٰ وَهُوَ ٱلْخَلَّٰقُ ٱلْعَلِيمُ﴾، با، ئەو زۆر بەدیهێنەرەو، زۆریش زانایە، ﴿ٱلْخَلَّٰقُ﴾، واتە: زۆر بەدیهێنەرە، یاخود زۆری شت وەدیهێناوەو دروستکردوە، کە بەس خۆی ژمارەیان دەزانێ.

١٢)- ﴿إِنَّمَآ أَمْرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيْـًٔا﴾، فەرمانی وی هەرکات شتێکی ویست، ئەگەر ویستی شتێك بێنێتە دی.

١٣)- ﴿أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ﴾، بەس ئەوەیە پێی بفەرموێ: ببە، یەکسەر دەبێ.

١٤)- ﴿فَسُبْحَـٰنَ ٱلَّذِى بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَىْءٍ﴾، پاکیی بۆ ئەو زاتەی کە موڵکی فراوانی هەموو شتێکی بەدەستە، ﴿مَلَكُوتُ﴾، زێدەڕۆییکردنە لە (مِلْك)دا، وەك (رَحْمَة و رَحَمُوت، رَهْبة و رَهَبُوت)، گوتراوە: (رَهَبُوت خَيْرٌ مِنْ رَحَموت)، خەڵك لێت بترسێ و سامت لێ بکات، باشترە لەوەی بەزەییان پێتدا بێ، خوا دەفەرموێ: پاکیی بۆ ئەو زاتەی کە موڵکی فراوانی هەموو شتێکی بەدەستە.

١٥)- ﴿وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾، تەنیا بۆ لای ویش دەگێڕدرێنەوە.

## کورتە باسێک: شەش بەڵگەی بەهێز، لەسەر زیندوو کرانەوەی مردووان

١- ﴿قُلۡ يُحۡيِيهَا ٱلَّذِيٓ أَنشَأَهَآ أَوَّلَ مَرَّةٖ﴾، بڵێ: ئەو کەسە دەیژیێنێتەوە کە یەکەمجار پێیگەیاندوە، دروستیکردوە، یەکەمجار دروستکردنی هەر شتێك بە زەحمەتترە - بە عەقڵی ئێمە - لە دووبارە کردنەوەی، وەك پێشتریش گوتمان: بابایەك کە شتێك دروست دەکات، ئنجا کۆمپیوتەرێکە، یان: گۆزەیەکە، یان: کتێبێك دەنووسێ، خانوویەك دروستدەکات، وەختێك تێکی دەدا، دەتوانێ چاکتری دروست بکاتەوە، گومانی تێدانیە، ئێمەی بەشەر ئەوە دەتوانین، ئەمە تەنیا بۆ نیزیك خستنەوە لە عەقڵە، ئەگەرنا لە لای خوا ﷻ ئاسان و زەحمەت نیە، هەمووی وەك یەکە.

٢- ﴿وَهُوَ بِكُلِّ خَلۡقٍ عَلِيمٌ﴾، ئەو (خوا) بە هەموو دروستکراوێکیش زانایە، دەزانێ چۆنی دروست بکات، هۆکارەکانی دروستکردنی، هەموو دروستکراوەکان لەبەر دەستی خوای پەروەردگار دان، هەموو ئامرازەکانی دروستکردن، کە ئێمە نایانزانین، لەبەردەستی خوا دان، کەسێك بە هەموو دروستکراوێك زانا بێت، ئامرازەکانی دروستکردنی لەبەر دەست دا بن، زیندووکردنەوەی لێ عاسێ نابێ.

٣- ﴿ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلشَّجَرِ ٱلۡأَخۡضَرِ نَارٗا﴾، ئەو زاتەی کە لە درەختی سەوز، ئاگری بۆ ڕەخساندوون، ئەمە:

أ- چ مەبەست پێی ئەوە بێ کە هەموو دارو درەختەکان، لە ئەنجامی تیشکە پێکهاتندا گەشە دەکەن و، تاکو ئەندازەیەکی زۆر تیشکی خۆر، لە خۆیاندا کۆدەکەنەوە،

ب- چ مەبەست ئەوە بێ، کە خەڵووزی بەردو نەوت و گاز، هەمووی لەو دارو درەخت و سەوزاییە کە لەسەر زەوی بووەو، لە ئەنجامی ئەو گۆڕانکارییانەی بەسەر زەویدا هاتوون، کەوتوونە ژێر زەوی، دوایی گۆڕاون و شیبوونەوە، بوونە نەوت و خەڵووزی بەردو گازو ... هتد.

ج- چ مەبەست ئەو مانا سادەیەی لێکدانی دوو دەرختی (مرخ) و (عفار) بێ کە دادەگیرسێن.

٤- ﴿ أَوَلَيْسَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُم ﴾، ئایا کەسێك کە ئاسمانەکان و زەوی هێناونە دی، بە توانا نیە کە وێنەی ئەوان دروست بکاتەوە؟ یانی: کەسێك شتێکی گەورەی پێ دروستکرابێ، شتێکی گچکەی ئاسانتر پێ دروست دەکرێ، کەسێك شتێکی قورسی دروست کردبێ - بە نسبەت ئێمەوە - دیارە شتێکی ئاسان باشتر دروست دەکات.

٥- ﴿ إِنَّمَآ أَمْرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيْـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴾، فەرمانی خوا کاتێك بیەوێ شتێك بکات، هەر پێی بفەرموێ: ببە، یەکسەر دەبێ، ئەم تەعبیرە کە جاری دیکەش قسەمان لێ کردوە، لە سوورەتی (النّحل)دا لەو بارەوە بە وردیی قسەمان کردوە، ئەم: ﴿ كُن فَيَكُونُ ﴾، ببە، دەبێ، مەبەست ئەوە نیە خوا بفەرموێ: ببەو، ئەویش ببێ، بەڵکو مەبەست پێی وێناکردنی زوو پەیدابوونی هەر شتێکە، کە خوا بیەوێ پەیدای بکات، کە بۆ ئێمە ئاسانترین شێوە ئەوەیە، کە بە شتێك بڵێی: ببە، بە کەسێك بڵێی: بڕۆ، یەکسەر بڕوا، بە کەسێك بڵێی: لابچۆ، یەکسەر لابچێ، ئەوە لە لای ئێمە ئاسانترینە، خوای پەروەردگاریش ئەو ئاسان دروستکردنەی خۆی، دەخاتە قاڵبێکی تەعبیرییەوە، کە بە شتێك بفەرموێ: ببە، یەکسەر ببێ، ئەگەرنا شتێك نەبێ، چۆن خوا دەیدوێنێ؟ بەڵام مەسەلەکە نیزیك خستنەوەیە لە عەقڵی ئێمە.

٦- ﴿ فَسُبْحَٰنَ ٱلَّذِى بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَىْءٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴾، پاکیی بۆ ئەو زاتەی کە موڵکی هەموو شتێکی بەدەستە، کەسێك موڵکی هەموو شتێکی بەدەست بێ، بێگومان، زیندووکردنەوەو ژیاندنەوەی مرۆڤانی لەبەر عاسێ نابێ.

خـوا بـە لوتـف و کەرەمـی خـۆی یارمەتییـمان بـدات، هەرچـی چاکـترو زیاتـر لەگـەڵ کەلامـی خـوادا کارلێـك بکەیـن و، زیاتـر لێیتێبگەیـن و پێیپێبکەین و پـەروەردە بیـن، تاکـو سـەرەنجام زیاتـر لـە خـوا نیزیـك ببینـەوەو، بەندایەتیـی بـۆ خـوا بکەیـن، بێگومـان کاتێـك ئێمـە تـاك تاکـمان بەندایەتیـی باشـتر و چاکـتر بـۆ خـوا دەکەیـن،

**کۆمەڵگایەکی تەندروستترو تۆکمەترو چاکترمان دەبێ، کۆمەڵگایەکی بەختەوەرمان دەبێ لە دنیاداو، کۆمەڵگایەکی سەرفرازمان دەبێ لە ڕۆژی دواییدا، کۆمەڵگایەك ئیسپاتی کردبێ کە لە ژیانی دنیای دا، تەنیا خوای پەرستوەو، شوێن کۆتا ڕەوانەکراوی خوا کەوتوەو، پەیڕەویی لە بەرنامەی خوا کردوە.**

سُبْحَانَك اللّٰهُمّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## دەستپێک

بەڕێـــــزان!

ئەمڕۆ کـە (٩)ی موحەڕڕەمـی سـاڵی (١٤٤١)ی کۆچییـە، بەرانبـەر (٨/ ٩/ ٢٠١٩)ی زایینـی، خـوا پشـتیوان بـێ دەسـت دەکەیـن بـە تەفسـیرکردنی سـوورەتی **(الصافـات)**، سـەرەتاش وەك عادەتـی خۆمـان پێناسـەو نێوەڕۆکـی ئـەم سـوورەتە مـوبارەکە لـە حـەوت (٧) بڕگـەدا دەخەینـە ڕوو:

## پێناسەی سوورەتی (الصافات)و بابەتەکانی

### ا)- ناوی ئەم سوورەتە:

ئـەم سـوورەتە نـاوی سـوورەتی **(الصافـات)**ەو، هیـچ ناوێکـی دیکـەی نیـە، ئەوەنـدە هەیـە **(السـیوطي)** لـە **(الإتقـان فِي علـوم القـرآن)**دا گوتوویەتـی: **(رَأَیـتُ فِي كَلَامِ الجَعْـبَرِي أَنَّ سُـورَةَ الصافـات تُسَـمَّى: سُـورة الذَّبِیـح)** واتـە: بینیومـە لـە قسـەی جەعبەریـی دا (یەکێکـە لـە زانایـان) کـە سـوورەتی **(الصافـات)** پێـی گوتـراوە: **(سُورةُ الذَّبِیـح)** واتـە: سـوورەتی ئـەو پیـاوەی کـە هێنرایـە سـەر سـەربڕان، کـە ئیسـماعیله ﷺ، بـەڵام دوایـی خـوا بەرانێکـی کـردە بەڵاگێڕەوەی، بـەڵام هیـچ بەڵگەیەکـی لـەو بـارەوە نەهێنـاوە.

ئاشکراشـە هـۆی ناونرانـی بـە **(الصافـات)**، هاتنـی وشـەیەی **(الصافـات)**ە لـە سـەرەتایەوە، وەك زۆر لـە سـوورەتەکان ئـەو وشـەیەی کـە لـە سـەرەتایانەوە دێ، بۆیـان دەکـرێ بـە نـاو وەك سـوورەتەکانی: (یـس، طـە، فاطـر، ص).

### ٢)- شوێنی دابەزینی:

ئەم سوورەتە سوورەتێکی مەککەییە بە ڕای تێکڕای زانایان، نەمبینیوە هیچ زانایەك لەو بارەوە ڕاجیایی هەبێ و، مشتومڕیان لەو بارەوە نەبووە.

### ٣)- ڕیزبەندیی لە موصحەف و دابەزیندا:

ئەم سووڕەتە لە ڕیزبەندیی موصحەفدا، ژمارە (٣٧)ەو، لە ڕیزبەندیی دابەزین (ترتیب النزول)دا، ژمارە (٥٦) یان (٥٥)ەو، پێش (لقمان)و پاش (الأنعام) دابەزیوە.

### ٤)- ژمارەی ئایەتەکانی:

ژمارەی ئایەتەکانی ئەم سوورەتە، لە لای زۆربەی هەرە زۆری زانایان، ئەوانەی کە پسپۆڕن لە سەرژمێری ئایەتەکانی سوورەتەکاندا، زۆربەیان سەدو هەشتاو دوو (١٨٢)یان داناوە، هەندێکیش گوتویانە: سەدو هەشتاو یەکە (١٨١)، هەر بۆ جەختکردنەوەش دووبارەی دەکەینەوە، زۆر جاری دیکەش گوتوومانە کە مەبەست لە جیاوازیی ژمارەی ئایەتەکان، ئەوە نیە یەکێکیان بلێ: ئەو ڕستە قورئانییە هەیە لەو سوورەتەداو، ئەوی دیکە بلێ: نیە! بەڵکو درێژیی و کورتیی ڕستەکانە، کە ژمارەی ئایەتەکان کەم و زیاد دەکات، بۆ وێنە: هەندێکیان ڕستەیەك لە نێوەڕاستی دەوەستن و، دەیکەنە سەرە ئایەت، هەندێکی دیکەشیان تاکو کۆتایی ڕستەکە دەچن و دەیکەنە یەك ئایەت، بۆیە ژمارەی ئایەتەکان کەم و زیاد دەکات، نەك لەبەر ئەوەی هەندێکیان بلێن: فلان ڕستە لە قورئاندایە، ئەوانی دیکە بلێن: نیە!

**٥)- نێوەڕۆکی:**

**ئەم سووڕەتەش خاوەنی هەمان نێوەڕۆکی سووڕەتە مەککەییەکانە بە گشتیی و، بە مەبەستی تیشك خستنە سەر جوگرافیای دابەش بوونی ئایەتەکانی بەسەر بابەتەکانیدا دەڵێین: سەدو هەشتاو دوو (١٨٢) ئایەتەکەی ئەم سووڕەتە موبارەکە، ئاوا دابەش بوون: {٧٤ + ٧٤ + ٣٤ = ١٨٢}**

**أ- (٧٤) ئایەتی یەکەم، چواردە (١٤) ئایەتیان لە بارەی خواناسیی و بەڵگەکانییەوەن، شەست (٦٠)یشیان بە گشتیی لە بارەی قیامەتەوەن: زیندوو کرانەوە، سزاو پاداشت، بەهەشت و دۆزەخ ... هتد.**

**ب- (٧٤) ئایەتی دووەمیش لە بارەی بەسەرهاتی نۆ لە پێغەمبەرانەوەن: نووح، ئیبراهیم، ئیسماعیل و ئیسحاق، مووساو هاروون، ئیلیاس، لووط، یونوس (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، ئەوانیش بەم جۆرە ئایەتەکانیان بەسەردا دابەش کراون:**

**١- بەسەرهاتی نووح: (٧٥ - ٨٢) هەشت ئایەت.**

**٢- بەسەرهاتی ئیبراهیم و هەردوو کوڕەکەی (ئیسماعیل و ئیسحاق): (٨٣ - ١١٣) سی و یەك ئایەت.**

**٣- بەسەرهاتی مووساو هاروون: (١١٤ - ١٢٢) نۆ ئایەت.**

**٤- بەسەرهاتی ئیلیاس: (١٢٣ - ١٣٢) دە ئایەت.**

**٥- بەسەرهاتی لووط: (١٣٣ - ١٣٨) شەش ئایەت.**

**٦- بەسەرهاتی یونوس: (١٣٩ - ١٤٨) دە ئایەت.**

**ج- (٣٤) ئایەتی کۆتایی، تەوەری سەرەکییان پووچەڵکردنەوەی هەندێك بیرو بۆچوونی ئەفسانەیی هاوبەشدانەرەکانە، لە بارەی فریشتەکان و جندو، پەیوەندییان لەگەڵ خوای بەرزو بێ وێنەداو، لە کۆتاییش هۆشداریی دراوەتە کافرەکان و هەڕەشەیان لێکراوە،**

کۆتایی ئەم سوورەتە موبارەکەش بە سێ ئایەتی بەهێزو پێزی خوای پەروەردگار هاتوە، کە بریتین لە: ﴿ سُبْحَٰنَ رَبِّكَ رَبِّ ٱلْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٨٠﴾ وَسَلَٰمٌ عَلَى ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٨١﴾ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٨٢﴾ ﴾، کە پاکیی دەربڕینە بۆ خوای پەروەردگاری جیهانییان، سەلام و ئاشتیی و خێرو خۆشیی ناردنە بۆ پێغەمبەران و، ستایشکردنە بۆ خوای پەروەردگاری جیهانییان.

## ٦)- تایبەتمەندییەکانی ئەم سوورەتە:

١- ئەم سوورەتە لە ڕیزبەندیی موصحەفدا، یەکەمین سوورەتە بە سوێند پێخواردنی دروستکراوان دەست پێ بکات: ﴿ وَٱلصَّٰٓفَّٰتِ صَفًّا ﴿١﴾ ﴾، لە ڕیزبەندیی موصحەفدا یەکەمینە کە بەو شێوەیە دەست پێ بکات، ئەگەرنا دوایی سوورەتی دیکە زۆرن، کە سوێند بە دروستکراوان خوراوە.

٢- تەنیا لەم سوورەتەدا لە بەهەشتەوە قسەکردنی برادەرێك لەگەڵ برادەرێکی دۆزەخییدا هاتوە، لە ئایەتەکانی: (٥١ - ٦١) لەو یازدە ئایەتەدا، لە هەموو قورئاندا تەنیا لێرەدا هاتوە کە لە بەهەشتەوە یەکێك قسە بکات، لەگەڵ هاوەڵێکی لە دۆزەخ دا.

٣- درەختی زەققوم تەنیا لەم سوورەتەدا بە وردیی باس و پێناسەی کراوەو، باسی بەرەکەی کراوە، لە کوێ دەڕوێ و، چۆن خوا کردوویەتی بە مایەی سزادان بۆ کافرەکان، ئەویش لە ئایەتەکانی: (٦٢ - ٦٧)دا باسی ئەو درەختە کراوە.

٤- تەنیا لەم سوورەتەدا باسی هەوڵدانی ئیبراهیم بۆ سەربڕینی کوڕەکەی ئیسماعیل (عَلَيْهِما الصَّلاةُ وَالسَّلَام) کراوە، لە ئایەتەکانی: (١٠١ - ١١١).

٥- تەنیا لەم سوورەتەدا باسی ناردنی ئیلیاس کراوە بۆ لای گەلەکەی، کە (بَعْل)یان پەرستوە، لە شوێنی دیکە ناوی ئیلیاس هاتوە، بەڵام تەنیا لێرەدا باسی ناردنی ئیلیاس کراوە بۆ لای گەلەکەی، کە بتێکیان پەرستوە بە ناوی: (بَعْل).

٦- ئەوەی کە خوا ڕووەکی (يَقْطِين)ی لەسەر یونوس ڕواندوە، تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوە، لە ئایەتی (١٤٦)دا، لە شوێنی دیکەدا باسی یونوس ﷺ کراوە، بەڵام تەنیا لێرەدا باسی ڕواندنی (يَقْطِين) واتە: کوولەکە لەسەر یونوس کراوە.

٧- زۆرترین ژمارە لە قورئاندا هاتبێ، کە بریتیە لە سەد هەزار (١٠٠,٠٠٠) تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوە: ﴿ وَأَرْسَلْنَٰهُ إِلَىٰ مِا۟ئَةِ أَلْفٍ أَوْ يَزِيدُونَ ﴿١٤٧﴾ ﴾.

٨- چەند وشەیەکی تایبەت بەم سوورەتەوە:

١- ﴿ طِينٍ لَّازِبٍ ﴾، ٢- ﴿ بَيْضٌ مَّكْنُونٌ ﴾، ٣- ﴿ طَلْعُهَا كَأَنَّهُۥ رُءُوسُ ٱلشَّيَٰطِينِ ﴾، ٤- ﴿ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ﴾، ٥- ﴿ وَتَلَّهُۥ لِلْجَبِينِ ﴾، ٦- ﴿ يَقْطِينٍ ﴾.

## ٧)- دابەش کردنی بۆ چەند دەرسێك:

کۆی ئایەتەکانی ئەم سوورەتە، بۆ شەش دەرسان دابەش دەکەین:

**دەرسی یەکەم:** ئایەتەکانی: (١ - ٢٦) واتە: بیست و شەش ئایەت دەگرێتە خۆی، کە وەك پێشەکییەك وایە بۆ کۆی ئایەتەکانی ئەم سوورەتە، باسی خواناسیی و، بەڵگەکانی خوا ناسیی، باسی ڕۆژی دوایی و، باسی ئەوە کە خوا ﷻ ئاسمانی پاراستوە لەوە کە شەیتانەکان گوێ لە قسەی فریشتان بگرن و ... هتد.

**دەرسی دووەم:** ئایەتەکانی: (٢٧ - ٤٩) واتە: بیست و سێ ئایەت دەگرێتە خۆی، کە تێیان دا مشت و مڕی دەمڕاست و شوێنکەوتووانی دۆزەخیی و، سەرەنجامی شوومیان خراوەتە ڕوو.

**دەرسی سێیەم:** ئایەتەکانی: (٥٠ - ٧٤) کە بیست و پێنج ئایەتە، ئەویش بریتیە لە تەماشا کردنی دۆزەخ و، سزای سەختی دۆزەخییان لە لایەن بەهەشتییانەوە، یان یەکێك لە بەهەشتییانەوە.

**دەرسی چوارەم: ئایەتەکانی:** (٧٥ - ١١٤) چل و یەك ئایەتە، بەسەرهاتی نووح و ئیبراهیم (عَلَيْهِمَا الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، دیارە لە دوو توێی بەسەرهاتی ئیبراهیمدا باسی ئیسماعیل، بەڵام بە بێ ناوهێنان و، باسی ئیسحاقیش، بە ناوهێنان کراوە.

**دەرسی پێنجەم: ئایەتەکانی:** (١١٦ - ١٤٨) کە سی و پێنج ئایەتە، باسی مووساو هارِوون و ئیلیاس و لووط و یونوس، باسی ئەو پێنج پێغەمبەرانە (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) کراوە.

**دەرسی شەشەم و کۆتایی: ئایەتەکانی:** (١٤٩ - ١٨٢) کە سی و چوار ئایەتە، وەك پێشتر گوتمان: هەمووی باسی پووچەڵکردنەوەی چەند بیرۆکەیەکی بت پەرستانە، لەمەڕ فریشتان و جندەکان و، چۆنیەتیی پەیوەندییان لەگەڵ خوادا ﷻ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە بیسـت و شـەش (٢٦) ئایەتی سـەرەتای ئـەم سـوورەتە پێکدێ: (١ - ٢٦)، سـەرەتای ئەم دەرسـە باسـی خواناسـیی و بەڵگەکانی پەروەردگارێتیی خوایە ﷻ، دوایـی باسـی نکووڵییکردنـی بێبڕوایانـە لـە زیندووکرانـەوەو، وەڵامدرانەوەیانـە بـە پێشـاندانی دیمەنـی هاتنی قیامـەت و، فەرمـان کـران بـە خڕکرانـەوەی بێبڕوایـان و ڕاگیرانیـان بـۆ پرسـیارو وەڵام.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿وَالصَّافَّاتِ صَفًّا ﴿١﴾ فَالزَّاجِرَاتِ زَجْرًا ﴿٢﴾ فَالتَّالِيَاتِ ذِكْرًا ﴿٣﴾ إِنَّ إِلَٰهَكُمْ لَوَاحِدٌ ﴿٤﴾ رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَرَبُّ الْمَشَارِقِ ﴿٥﴾ إِنَّا زَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِزِينَةٍ الْكَوَاكِبِ ﴿٦﴾ وَحِفْظًا مِّن كُلِّ شَيْطَانٍ مَّارِدٍ ﴿٧﴾ لَّا يَسَّمَّعُونَ إِلَى الْمَلَإِ الْأَعْلَىٰ وَيُقْذَفُونَ مِن كُلِّ جَانِبٍ ﴿٨﴾ دُحُورًا ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ وَاصِبٌ ﴿٩﴾ إِلَّا مَنْ خَطِفَ الْخَطْفَةَ فَأَتْبَعَهُ شِهَابٌ ثَاقِبٌ ﴿١٠﴾ فَاسْتَفْتِهِمْ أَهُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَم مَّنْ خَلَقْنَا ۚ إِنَّا خَلَقْنَاهُم مِّن طِينٍ لَّازِبٍ ﴿١١﴾ بَلْ عَجِبْتَ وَيَسْخَرُونَ ﴿١٢﴾ وَإِذَا ذُكِّرُوا لَا يَذْكُرُونَ ﴿١٣﴾ وَإِذَا رَأَوْا آيَةً يَسْتَسْخِرُونَ ﴿١٤﴾ وَقَالُوا إِنْ هَٰذَا إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ أَإِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَامًا أَإِنَّا لَمَبْعُوثُونَ ﴿١٦﴾ أَوَآبَاؤُنَا الْأَوَّلُونَ ﴿١٧﴾ قُلْ نَعَمْ وَأَنتُمْ دَاخِرُونَ ﴿١٨﴾ فَإِنَّمَا هِيَ زَجْرَةٌ وَاحِدَةٌ فَإِذَا هُمْ يَنظُرُونَ ﴿١٩﴾ وَقَالُوا يَا وَيْلَنَا هَٰذَا يَوْمُ الدِّينِ ﴿٢٠﴾ هَٰذَا يَوْمُ الْفَصْلِ الَّذِي كُنتُم بِهِ تُكَذِّبُونَ ﴿٢١﴾ ۞ احْشُرُوا الَّذِينَ ظَلَمُوا وَأَزْوَاجَهُمْ وَمَا كَانُوا يَعْبُدُونَ ﴿٢٢﴾ مِن دُونِ اللَّهِ فَاهْدُوهُمْ إِلَىٰ صِرَاطِ الْجَحِيمِ ﴿٢٣﴾ وَقِفُوهُمْ ۖ إِنَّهُم مَّسْئُولُونَ ﴿٢٤﴾ مَا لَكُمْ لَا تَنَاصَرُونَ ﴿٢٥﴾ بَلْ هُمُ الْيَوْمَ مُسْتَسْلِمُونَ ﴿٢٦﴾﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{سوێند بە ڕیزبووان بە ڕێك و پێکیی (١) ئنجا سوێند بە تێوەخوڕان، بە توندیی (٢) ئنجا سوێند بە زیکر خوێنەرەوان (٣) بە دڵنیایی پەرستراوتان تەنیا یەکێکە (٤) پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی نێوانیان و، خاوەنی خۆرهەڵاتەکانە (٥) بێگومان ئێمە ئاسمانی نیزیك (لە ئێوە)مان بە جوانیی ئەستێرەکان ڕازاندۆتەوە (٦) هەروەها بۆ پاراستنیان لە هەر شەیتانێکی یاخیی (٧) (شەیتانەکان لە ترسان) گوێ بۆ (بیستنی قسەی) کۆمەڵی باڵاتر (لە فریشتان) هەڵناخەن و، لە هەموو لایەکەوە بڵێسە باران دەکرێن (٨) (ئەو بڵێسە بارانکردنە) بۆ دوورخستنەوەیان و (لە ڕۆژی دواییش دا) سزاو ئازارێکی بەردەوامیان هەیە (٩) (شەیتانەکان هیچ هەواڵ و زانیارییەکیان چنگ ناکەوێ) مەگەر کەسێك بە پەنهانیی (هەواڵێك) بڕفێنێ، ئەویش بڵێسەیەکی سووتێنەرو کونکەر شوێنی دەکەوێ (١٠) (ئەی موحەممەد ﷺ!) لێیان بپرسە: ئایا جەستەی وان بەهێزترە، یان ئەو دروستکراوانەی دیکە کە دروستمانکردوون؟ ئێمە ئەوانمان لە قوڕێکی پێکەوە چەسپاو دروستکردوە (١١) بەڵکو (تۆ) سەرت سوڕماو ئەوانیش گاڵتە دەکەن (١٢) ئەگەر یادیشیان بخرێتەوەو ئامۆژگاریی بکرێن، پەند وەرناگرن (١٣) هەر کاتێکیش نیشانەیەك (لە نیشانەکانی خوا) بینن، بە خەستیی گاڵتە (ی پێ) دەکەن (١٤) هەروەها گوتیان: ئەمە تەنیا جادوویەکی ئاشکرایە (١٥) ئایا کاتێك مردین و بووینەوە گڵ و ئێسقان (ی پڕتووکاو) ئایا زیندوو دەکرێینەوە؟ (١٦) هەروەها ئایا باب و باپیرانی یەکەمیشمان (زیندوو دەکرێنەوە)؟ (١٧) بڵێ: بەڵێ (زیندوو دەکرێنەوە)، لە حاڵێکدا کە ئێوە ملکەچن و زەبوونیشن (١٨) ئەو (زیندوو کرانەوەیە) تەنیا یەك تێوە خوڕین و دەنگدانە، یەکسەر ئەوان تەماشا دەکەن (١٩) گوتیشیان: ئەی هاوار بۆ ئێمە! ئەمە ڕۆژی سزاو پاداشتە! (٢٠)

(پێیان دەگوترێ:) ئەمە ئەو ڕۆژی لێك هەڵاواردنەیە، کە ئێوە بە درۆتان دادەنا ﴿٢١﴾ (خوا بە فریشتەکانی فەرموو:) ئەوانەی ستەمیان کردووەو هاووێنەکانیان کۆبکەنەوەو، ئەو شتانەش کە دەیانپەرستن ﴿٢٢﴾ لە جیاتی خوا، ئنجا بەرەو ڕێی کڵپەی دۆزەخ ڕێنماییان بکەن ﴿٢٣﴾ (پێش خرانە دۆزەخیش) ڕایانگرن، بێگومان ئەوان پرسیار لێکراون ﴿٢٤﴾ ئەوە چیتانە! بۆچی هاوکاریی یەکدی ناکەن! ﴿٢٥﴾ بەڵکو ئەمڕۆ ئەوان بە تەواویی (بۆ خوا) ملکەچن ﴿٢٦﴾].

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(وَٱلصَّٰٓفَّٰتِ): (الصَّفُّ: أَنْ تَجْعَلَ الشَّيءَ عَلَى خَطٍّ مُسْتَوٍ، صَفَفْتُ كَذَا: جَعَلْتُهُ عَلَى صَفٍّ)، (صَف): ئەوەیە کە شتێك لەسەر هێڵێکی ڕاست دابنێی، (صَفَفْتُ كَذَا) واتە: ئەو شتەم ڕیز کرد، یان لەسەر ڕیزم دانا، (صَافَّات) کۆی (صَافَّة) یە، (صَافَّة)ش کۆی (صَافّ)ە واتە: کۆمەڵە ڕیز بووەکان، کە وەك دوایی باسی دەکەین، مەبەست لەو فریشتانەیە کە ڕیز دەبەستن.

(فَٱلزَّٰجِرَٰتِ): (الزَّجْرُ: طَرْدٌ بِصَوْتٍ، ثُمَّ يُسْتَعْمَلُ فِي الطَّرْدِ تَارَةً وَفِي الصَّوتِ أُخْرَى)، (زَجْر): بریتییە لە دەرکردن و تێوەخوڕین بە دەنگ، دوایی جارێك بۆ دەرکردن بەکاردێ، جارێکیش بۆ دەنگ بەسەردا هەڵێنان و تێوەخوڕین.

(مَّارِدٍ): (المَارِدُ وَالمَرِيدُ مِنْ شَيَاطِينِ الجِنِّ وَالإِنْسِ: المُتَعَرِّي مِنَ الخَيْرَاتِ)، وشەی: (مَارِد) و (مَرِيد) لە شەیتانەکانی جندو مرۆڤ، کەسێکە کە لە هەرچی چاکەیە داڕندرابێ و، خۆی یەکلا کردبێتەوە بۆ خراپەکاریی.

(دُحُورًا): (الدَّحْرُ: الطَّرْدُ وَالإِبْعَادُ)، وشەی: (دَحْر): بریتییە لە دەرکردن و دوورخستنەوە.

(وَاصِبٌ): بـەردەوام (وَاصِـب: دَائِـم، وَصَـبَ وُصُوبَـاً: دَامَ، وَصَـبَ الدِّيْـنُ: وَجَـبَ)، دەگوتـرێ: (وَصَـبَ وُصُوبَـاً أي: دامَ) واتـە: بـەردەوام بـوو، دیسـان دەگوتـرێ: (وَصَـبَ الدِّيْـنُ: وَجَـبَ) واتـە: دینەکـە پێویسـت بـوو، یاخـود: (وَصَـبَ الدِّيْـنُ: وَجَـبَ) واتـە: قەرزەکـە پێویسـت بـوو.

(خَطِفَ): (الخَطْـفُ: الإِخْتِطَـافُ، الإِخْتِـلاَسُ بِسُرْعَـةٍ)، (خَطْـف) و (إِخْتِطَـاف) بریتیـن لـە ڕفاندنـی شـتێك بـە دزیـی، بـە خێرایـی.

(شِهَابٌ): (الشِّـهَابُ: الشُّـعْلَةُ السَّـاطِعَةُ مِـنَ النَّـارِ المُوْقَـدَةِ)، (شِـهَاب): بریتیـە لـە بڵێسـەیەکی تیشـکدەر، لـە ئاگرێـك کـە داگیرسـابێ واتـە: پڕیشـکە ئاگـر.

(ثَاقِبٌ): (الثَّاقِـبُ: المُـضِيءُ الَّـذِي يُثْقِـبُ بِنُـورِهِ وَإِضَائَتِـهِ، مَـا يَقَـعُ عَلَيْـهِ)، (ثَاقِـب): بریتیـە تیشـکدەرێك کـە بـە تیشـکەکەی هـەر شـتێك بیکەوتـە سـەر، کونـی دەکات.

(لَازِبٍ): (الَّـلازِبُ: الثَّابِـتُ الشَّـدِيدُ الثُّبُـوت)، (لاَزِب): شـتێك کـە چەسـپا بـێ بـە شـتێکەوەو، زۆر پێـوە چەسـپاوو مەحکـەم بـێ.

(دَاخِرُونَ): (دَاخِـرْ: ذَلِيـل، أَدْخَرْتُـهُ فَدَخَـرَ: أَذْلَلْتُـهُ فَـذَلَّ)، (دَاخِـرْ) بـە مانـای ملکـەچ دێ، دەگوتـرێ: (أَدْخَرْتُـهُ فَدَخَـرَ) واتـە: ملـم پـێ کەچکـرد ملـی کـەچ بـوو، وەك (أَذْلَلْتُـهُ فَـذَلَّ) زەبوونـم کـرد، زەبـوون بـوو.

(وَأَزْوَاجَهُمْ): (أَي: أَصْنافَهُـم، أَشْـكَالَهُم وَأَشْـبَاهَهُم) واتـە: ئەوانـەی کـە لەگـەڵ وانـدا هاوپۆلـن، وێنـەی ئەوانـن، شـێوەی ئـەوان دەکـەن، هەندێکیـش گوتوویانـە: (أَزْوَاج) کـۆی (زَوْج)ە، واتـە: ئەوانـەی کـە پێکـەوە جووتـن، واتە: پیاوەکان و هاوسـەرەکانیان، بـەڵام زیاتـر وا پێدەچـێ مەبەسـت پێـی هاوشـێوەکانیان بێـت.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

سەرەتا دەڵێین: لە ئایەتی یەکەم تاکو حەفتاو چوار، وەك پێشتریش باسمان کرد: هەمووی پێکەوە پەیوەستە، چەند ئایەتێکیان لەبارەی خواناسیی و خوا بەیەکگرتنەوەن، ئەوانی دیکە هەموویان لە بارەی قیامەتەوەن، بەڵام ئێمە دابەشمان کردوون بۆ سێ دەرس، بیست و شەش (٢٦)، بە بیست و سێ (٢٣)، بە بیست و پێنج (٢٥)، کە هەمووی دەکاتە حەفتاو چوار (٧٤).

خوا ﷻ دەفەرموێ: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)، بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، واتە: دەست پێ بکەن بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، یاخود دەستپێکردنم بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، زۆر جاران گوتوومانە، بەڵام چەند دووبارەی بکەینەوە، هەر دەیهێنێ، مادام خوا ﷻ لە سەرەتای سەدو سێزدە (١١٣) لە سوورەتەکانی قورئاندا (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)ی کردوەو (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)ێکی زیادیش لە سوورەتی (النمل)دا هاتوە واتە: سەدو چواردە جار (١١٤) ئەم ڕستە موبارەکە دووبارە بۆتەوە، ئێمەش ئەوەی کە پێویست بکات، هەمیشە لە ڕوونکردنەوەی چەمك و واتایەکەی، دووبارەی دەکەینەوە: هەرکات ئەم ڕستە موبارەکە بگوترێ: بەلای کەمەوە، پێویستە چوار واتا لە عەقڵ و دڵ دا ئامادە بکرێن:

١- ئەو کارە کە دەستی پێدەکەم، بە ناوی خوا دەیکەم، نەك بە ناوی خۆم، یان بە ناوی کەسێکی دیکەوە.

٢- ئەو کارە کە دەیکەم، بۆ ڕازیکردنی خوا دەیکەم، نەك بۆ ڕازیکردنی کەسێکی دیکە، یان بۆ بۆ هێنانە دی ئامانجێکی دیکە.

٣- ئەم کارە کە دەیکەم، بە پێی بەرنامەی خواو ئەو ڕێبازەی دایناوە، دەیکەم.

٤- ئەم کارە کە دەیکەم، بە هەوڵ و توانایەك کە خوا بۆی ڕەخساندووم، دەیکەم نەك بە شان و شەوکەتی خۆم.

ئەو چوار واتایە زۆر گەورەو گرنگە، پێویستە مرۆڤ لە دڵی خۆییان بگرێ، کاتێك دەڵێ: (بِسْمِ اللَّـهِ الرَّحْمَـنِ الرَّحِيمِ).

﴿وَٱلصَّٰٓفَّٰتِ صَفّٗا﴾، سوێند بەوانەی کە ڕیز بوون بە ڕێك و پێکیی، بە ڕیز بوون، وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا ڕوونی دەکەینەوە، هەرچەندە توێژەرەوان چەند مانایەکیان بۆ هێناون، بەڵام زۆربەیان لەسەر ئەو ڕایەن کە لێرەدا قسە لە فریشتەکانەو، هەر سێ سوێندەکان مەبەست پێیان فریشتەکانن، هەندێکیشیان گوتوویانە: هی یەکەمیان مەبەست پێی فریشتەکانە، هی دووەم مەبەست پێی کۆمەڵێکی دیکەیە، هی سێیەمیان مەبەست پێی کۆمەڵێکی دیکەیە، بۆ وێنە گوتوویانە: ﴿وَٱلصَّٰٓفَّٰتِ صَفّٗا﴾، واتە: ئەو فریشتانەی کە ڕیز بوون بە ڕیزبوون، ﴿فَٱلزَّٰجِرَٰتِ زَجۡرٗا﴾، مەبەست پێی ئەو جەنگاوەرانەیە کە وڵاخەکان دەنگ دەدەن، یان دوژمن دەنگ دەدەن و تێیانەوە دەخوڕن، ﴿فَٱلتَّٰلِيَٰتِ ذِكۡرًا﴾، ئەوانەی کە قورئان دەخوێنن و، ئایەتەکانی خوای پەروەردگار دەخوێننەوە.

بەڵام وا پێدەچێ ئەو مانایە ڕاستربێ کە: ﴿وَٱلصَّٰٓفَّٰتِ صَفّٗا﴾، ئەو فریشتانەی کە ڕیز بوون بە ڕیز بوونێکی چاك، بە ڕێك و پێکیی، ﴿فَٱلزَّٰجِرَٰتِ زَجۡرٗا﴾، ئەو فریشتانەی کە تێوەدەخوڕن، لە کێوە دەخوڕن؟ لە کافرانەوە دەخوڕن، یان لە شەیتانەکانەوە دەخوڕن، کە گوێ لە قسەی فریشتان بگرن، یاخود لە هەورەکانەوە دەخوڕن، دەنگیان دەدەن، یان لە دروستکراوەکانەوە کە خوا پێی سپاردوون سەرپەرشتییان بکەن، ﴿فَٱلتَّٰلِيَٰتِ ذِكۡرًا﴾، ئەوانەی زیکری خوا، کە قورئانە دەخوێننەوە، یاخود یادی خوا دەکەن و وشە بەرزو بە پێزەکان دەڵێنەوە.

ئەگەر مەبەست پێی ئایەتەکان بێ واتە: ئایەتەکان بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ دێنن و، ئەگەر مەبەست پێ زیکری ڕەها بێ، واتە: وشە بەرزو بە پێزەکان دەڵێن، وەك بە پاككرتنی خوا، ستایشکردنی خوا، بە مەزنگرتنی خوا.

سوێند بەوانە: ﴿ إِنَّ إِلَٰهَكُمْ لَوَٰحِدٌ ﴾، بە دڵنیایی پەرستراوی ئێوە یەکێکە، تەنیا یەك پەرستراوە کە شایستەی پەرستران بێ، ئەویش کێیە؟ ﴿ رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَرَبُّ ٱلْمَشَٰرِقِ ﴾، پەروەردگارو خاوەن و مشوورخۆری ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی دەکەوێتە نێوانیانەوە، هەروەها پەروەردگارو خاوەنی ڕۆژهەڵاتەکانیشە، واتە: هەموو ئەو شوێنانەی کە بە درێژایی ساڵ خۆر لێیانەوە هەڵدێ، لە شوێنی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿ بِرَبِّ ٱلْمَشَٰرِقِ وَٱلْمَغَٰرِبِ ﴿٤٠﴾ ﴾المعارج، پەروەردگاری خۆرهەڵات و خۆرئاوایەکان، هەموو (مَشْرِق)ێك (مَغْرِب)ێکی لە بەرانبەردایە، لە ماوەی ئەو سێ سەدو شەست و پێنج (٣٦٥) ڕۆژەی ساڵدا، بەڵکو لە ماوەی هەر چرکەیەك و هەر خولەکێك دا خۆر خۆرهەڵاتێکی دیاریکراو هەیە، هەروەك خۆرئاوایەکی دیاریکراویش هەیە لە بەرانبەریدا، بەڵام دەتوانین بڵێین: لەسەر مەداری ساڵ، سێسەدو شەست و پێنج (٣٦٥) خۆرهەڵات هەن، لە بەرانبەریشیاندا سێسەدو شەست و پێنج (٣٦٥) خۆرئاوا هەن، بەڵام لێرە خوا ﷻ تەنیا باسی پەروەردگارێتیی خۆی دەکات بۆ خۆرهەڵاتەکان، ئەو شوێنانەی کە خۆریان لێ هەڵدێ، لەبەر ئەوەی سیاقەکە وا دەخوازێ.

﴿ إِنَّا زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِزِينَةٍ ٱلْكَوَاكِبِ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە ئاسمانی نیزیکمان بە جوانیی ئەستێرەکان ڕازاندۆتەوە، ﴿ ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا ﴾، یانی: ئاسمانی نیزیکتر (دُنْيا) (مُؤَنَّث)ی (أَدْنَى)یە، ئەو ئاسمانەی نیزیکترە، لە خەڵکی سەر زەوی نیزیکترە.

﴿ بِزِينَةٍ ٱلْكَوَاكِبِ ﴾، (كَوَاكِب) کۆی (كَوْكَب)ە، هەم بۆ ئەستێرە بە کاردێ، هەم بۆ خڕۆکەکانی دیکەش بە کاردێ، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی ئەستێرەکانن، ئەوانن کە دیارن لە ئێمەوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە هەرچی ئەستێرەیەو

ئێمە دەیبینین، بەڵکو هەرچی کەهکەشان و گەلە کەهکەشانە، کە ئێمە دەیانبینین، هەموویان لە سنووری ئاسمانی یەکەمدان، چونکە خوا دەفەرموێ: ئاسمانی نیزیك لە ئێوەمان (کە ئاسمانی یەکەمە) بە ئەستێرەکان ڕازاندۆتەوە.

﴿ وَحِفْظًا مِّن كُلِّ شَيْطَٰنٍ مَّارِدٍ ﴾، هەروەها ئەو ئەستێرانەمان داناون بۆ پاراستن لە هەر شەیتانێکی هەڵگەڕاوەو یاخیی، کە لەوانەوە بڵێسەی ئاگر دێن و، وا دەکەن ئەو شەیتانانە هەروا بە هەوای باڵ نەتوانن گوێ هەڵبخەن بۆ فریشتان.

﴿ لَّا يَسَّمَّعُونَ إِلَى ٱلْمَلَإِ ٱلْأَعْلَىٰ ﴾، ﴿ لَّا يَسَّمَّعُونَ ﴾، ئەصڵی خۆی (لا يَتَسَمَّعُونَ)یە یانی: ناتوانن گوێ هەڵبخەن بۆ کۆمەڵی باڵا، کۆمەڵی باڵاش فریشتەکانن کە لە سەرێن، بەتایبەت ئەو فریشتانەی زۆر لە خوا نیزیکن، خوا ﷻ هەر فەرمانێکی بێ، پێشێ بەوانی ڕادەگەیەنێ، ﴿ وَيُقْذَفُونَ مِن كُلِّ جَانِبٍ ﴾، لە هەموو لایەکەوەش تیر باران دەکرێن، بڵێسە باران دەکرێن.

﴿ دُحُورًا ﴾، بەدوورخستنەوە دەردەکرێن و دوور دەخرێنەوە، ﴿ وَلَهُمْ عَذَابٌ وَاصِبٌ ﴾، هەروەها سزایەکی بەردەوامیشیان بۆ هەیە، کە مەبەست پێی ڕۆژی دواییە، لە دنیادا دەردەکرێن و ڕێیان نادرێ گوێ هەڵبخەن بۆ قسەی فریشتەکان، لە دواڕۆژیشدا سزایەکی بەردەوامیان هەیە، لەسەر ئەوەی یاخیی دەبن و دەیانەوێ گوێ بۆ قسەی فریشتەکان هەڵبخەن، دوایی هەر زانیارییەکیان چنگ کەوت، بۆ فاڵچیی و کاهینەکانی دێنن و بازرگانیی بەو زانیارییانەوە دەکەن، جادووگەرو فاڵچیەکانیش درۆو دەلەسەی زۆر تێکەڵ بە زانیارییەکی جوزئیی دەکەن، کە لە ڕێی شەیتانەکانەوە دەستیان کەوتووەو، خەڵکی پێ هەڵدەخەڵەتێنن.

شەیتانەکان هەموویان بڵێسە باران دەکرێن و دەر دەکرێن: ﴿ إِلَّا مَنْ خَطِفَ ٱلْخَطْفَةَ ﴾، مەگەر یەکێکیان بە پەلە زانیارییەك بدزێ، ﴿ فَأَتْبَعَهُۥ شِهَابٌ ثَاقِبٌ ﴾، ئەویش بڵێسەیەکی دڕەرو کونکەری، سووتێنەری بە دوا دەکەوێ، ئایا ئەو

بڵێسەیە دەیکوژێ یاخود دەیسووتێنێ و بریندارى دەكات و سەقەتی دەكات؟ وا پێدەچێ هەردووك حاڵەكان ببن و، سەرئنجام بە جۆرێك لە جۆرەكان، هەندێك زانیاریی ئاسمان و فریشتەكان لە ڕێی هەندێك لەو شەیتانانەوە، بگاتە جادووگەرو كاهینەكان، بەڵام شتێكی زۆر كەم كە دوایی درۆو دەلەسەی زۆری تێكەڵ دەكەن، وەك لە تەفسیری سوورەتەكانی: (الحجر والشعراء)دا لەوبارەوە باسێكمان كردوە، دواییش لێرەدا دووبارە باسێك لەو بارەوە دەكەینەوە.

﴿ فَٱسْتَفْتِهِمْ أَهُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَم مَّنْ خَلَقْنَآ ﴾، پرسیاریان لێ بكە، داوای فەتواو زانیارییان لێ بكە، ﴿ أَهُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَم مَّنْ خَلَقْنَآ ﴾، ئایا دروستكردنی وان سەختترە، یاخود ئەو كەس و شتانەی دیكە كە دروستمان كردوون؟ كە لێرەدا ﴿ أَم مَّنْ خَلَقْنَآ ﴾، هەرچەندە (مَنْ) بۆ خاوەن عەقڵ و عاقڵانە، بەڵام زانایان دەڵێن: لێرەدا مەبەست پێی كۆی ئەوانەیە كە خوا دروستیكردوون، بەڵام لێرەدا عاقڵان زاڵكراون، بەسەر ئەو شتانەدا كە عەقڵ و ئیرادەو هەستیان نیە، چونكە هەمیشە ئەگەر كۆمەڵێك خاوەن عەقڵ لەگەڵ شتیانێكی دیكەدا بێن، كە عەقڵ و ئیرادەیان نەبێ، ئەمە بە پێی بنچینەی: (تَغْلِیبُ العُقَلاءِ على غَیْرِهِم) زاڵكردنی عاقڵان بەسەر جگە لە خۆیان دا، وشەیەك بە كاردێ كە بە ڕواڵەت تەنیا خاوەن عەقڵەكان بگرێتەوە، بەڵام ئەوانی دیكەش دەگرێتەوە، ﴿ إِنَّا خَلَقْنَٰهُم مِّن طِينٍ لَّازِبِۭ ﴾، ئێمە ئەوانمان دروستكردوە لە قوڕێكی پێكەوە چەسپاوو پێكەوە لكاو، هەڵبەتە ئەوە یەكێك بووە لە قۆناغەكانی دروستبوونی ئادەم ﷺ، وەك لە تەفسیری سوورەتی (الأعراف)دا بە تەفصیل باسمان كردوە، هەروەها لە سەرەتای تەفسیری سوورەتی (المؤمنون)یشدا باسێكمان لەو بارەوە كردوە، كە خوا ﷻ جارێك دەفەرموێ: لە قوڕ دروستمان كردوون، جارێك دەفەرموێ: لە گڵ، جارێك دەفەرموێ: لە ئاو، جارێك دەفەرموێ: لە قوڕێكی وشك بووەوە، جارێك دەفەرموێ: لە قوڕێكی بۆنكردوو، ئەوانە هەموویان قۆناغەكانی دروستبوونی جەستەی ئادەم ﷺ ن، كە یەكەمین مرۆڤەو بابی مرۆڤایەتییە.

﴿ بَلْ عَجِبْتَ وَيَسْخَرُونَ ﴾، بەڵکـو تـۆ سـەرت سـوڕدەمێنێ لێیـان و ئەوانیـش گاڵتـە دەکـەن، تـۆ سـەرت سـوڕ دەمێنـێ لـە نەفامیـی و کەللەڕەقیـی و عینادیـی ئـەوان، لـە نەدیتنیـان بـۆ ئـەو هەمـوو نیشـانانە، کەچـی ئەوانیـش گاڵتـە دەکـەن، هەمیشـە گاڵتـە کردنـی کەسـێك بـە زۆریـی وایـە، نیشـانەی عەقـڵ سـووکیی خۆیەتی، بـە زۆریـی نیشـانەی ئەوەیـە، کـە وەك پێویسـت شـتەکان دەرك نـاکات، بۆیـە گاڵتـە دەکات.

﴿ وَإِذَا ذُكِّرُوا لَا يَذْكُرُونَ ﴾، هەرکاتیـش بیریـان بخرێتـەوە، بیریـان ناکەوێتـەوە، یاخـود ئەگـەر پەنـد دابدرێـن، پەنـد وەرناگـرن، ئەگـەر ئامۆژگاریـی بکرێـن، ئامۆژگاریـی وەرناگـرن.

﴿ وَإِذَا رَأَوْا آيَةً يَسْتَسْخِرُونَ ﴾، ئەگـەر نیشـانەیەك ببینـن (لـە نیشـانەکانی خـوا) بـە زۆر گاڵتـە دەهێننـە خۆیـان، یاخـود: زۆر بـە خەسـتیی گاڵتـەو جەفەنـگ دەکـەن بـە نیشـانەکانی خـوا.

﴿ وَقَالُوا إِنْ هَٰذَا إِلَّا سِحْرٌ مُبِينٌ ﴾، هەروەهـا (بێبڕوایـەکان گوتیـان): ئەمـە تەنیـا جادوویەکـی ئاشـکرایە، واتـە: ئـەم قورئانـە کـە دەڵـێ: زینـدوو دەبنـەوە، تەنیـا جادوویەکـی ئاشـکرایە موحەممـەد دەیڵـێ، یاخـود ئـەم ئیسـلامە تەنیا جادوویەکـی ئاشـکرایە.

﴿ أَإِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَامًا ﴾، ئایـا کاتێـك مردیـن و بووینەوە گڵ و خـۆڵ و بووینەوە ئێسـقان واتـە: ئێسـقانی پرتـووکاو، ﴿ أَإِنَّا لَمَبْعُوثُونَ ﴾، ئایـا ئێمـە زینـدوو دەکرێینـەوە؟ ئایـا ئێمـە زینـدوو کـراوە دەبیـن؟

﴿ أَوَآبَاؤُنَا الْأَوَّلُونَ ﴾، هەروەهـا بـاب و باپیرانـی یەکەمیشـمان؟ ئایـا ئەوانیـش زینـدوو دەکرێنـەوە؟

﴿ قُلْ نَعَمْ ﴾، بڵـێ: بەڵـێ! زینـدوو دەکرێنـەوە، ﴿ وَأَنتُمْ دَاخِرُونَ ﴾، لـە حاڵێکـدا کـە ئێـوە ملکـەچ و زەبوونیـش دەبـن.

﴿ فَإِنَّمَا هِيَ زَجْرَةٌ وَٰحِدَةٌ ﴾، ئـەو زینـدوو کرانەوەیـە، تەنیـا تێوەخوڕینێکـە، (زَجْـر) بـە مانـای دەنگێکـی بـە هێـز، تێـوە خوڕیـن، نەهیـی لێکـردن، دەنگـدان، دەرکـردن، بـە مانـای ئەوانـە هەموویـان دێ، تەنیـا یـەك دەنگدانـە، یـەك تێوەخوڕینـە، ﴿ فَإِذَا هُمْ يَنظُرُونَ ﴾، یەکسـەر ئـەوان تەماشـا دەکـەن، واتـە: هەڵدەسـتنەوەو تەماشـای بارودۆخێکـی دیکـە دەکـەن، کـە بـازاڕی قیامەتـەو هاتۆتـە گـۆڕێ.

﴿ وَقَالُوا۟ يَٰوَيْلَنَا هَٰذَا يَوْمُ ٱلدِّينِ ﴾، هەروەهـا گوتیـان: ئـەی هـاوار بـۆ ئێمـە! ئەمـە ڕۆژی سـزاو پاداشـتە، ئـەو ڕۆژەیـە کـە بـڕواداران دەیانگـوت: دێتـە پێـش و ئێمـەش نکووڵییمان لێدەکرد، بـەڵام دیارە ڕاسـت بـووە، ئـەوە هاتـە پێـش، پێیان دەگوترێ: ﴿ هَٰذَا يَوْمُ ٱلْفَصْلِ ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴾، ئەمـە ڕۆژی لێکهەڵاوردنـە کـە ئێـوە پێـی بێبـڕوا بـوون، بـە درۆتـان دادەنـا، ئەمـڕۆ لێـك هەڵداوێردرێـن، ئەهلـی ئیـمان و چاکـە بـۆ بەهەشـت و، ئەهلـی کوفـرو خراپـە بـۆ دۆزەخ.

﴿ ٱحْشُرُوا۟ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ وَأَزْوَٰجَهُمْ ﴾، ئەوانـەی سـتەمیان کـردووەو هاووێنەکانیـان، کۆیـان بکەنـەوە ﴿ وَمَا كَانُوا۟ يَعْبُدُونَ ﴿٢٢﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، هەروەهـا ئەوانـەی جگـە لـە خـوا دەیانپەرسـتن، هەموویـان پێکـەوە، سـتەمکارەکان و هاووێنەکانیـان، لێرەدا دەگونجێ مەبەسـت لـە (ظَلَمُوا۟) (أَشْرَكُوا) بـێ: ئەوانـەی هاوبەشـیان بـۆ خـوا دانـاوە: ﴿ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾ ﴾لقـمان، دەشـگونجێ مەبەسـت پێـی بێبڕوایـی بـێ: ﴿ وَٱلْكَٰفِرُونَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٥٤﴾ ﴾البقـرة، یاخـود: مەبەسـت پێـی ئەوانـە بـێ کـە سـتەمیان لـە خەڵـك کـردووە، کـە لـە ڕاسـتییدا شـیرك و کوفـرو دەسـتدرێژیی کـردن بۆ سـەر مافەکانـی ئەوانـی دیکـە، ئەوانـە هەموویـان وشـەی (ظُلْـم) دەیانگرێتـەوە، لـە قورئانـدا بـە هەمـوو ئـەو واتایانـە وشـەی (ظُلْـم) بەکارهاتـوە، کەواتـە: سـتەمکاران بـە هەمـوو واتایەکانـی سـتەم و هاووێنەکانیـان و، ئـەو شـتانەش کـە لـە جیاتـی خـوا دەیانپەرسـتن، جگـە لـە خـوا دەیانپەرسـتن، هەموویـان خـڕ بکەنـەوە، کۆبکەنـەوە، ﴿ فَٱهْدُوهُمْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْجَحِيمِ ﴾، ئنجـا ڕێنماییـان بکـەن بـەرەو ڕێیـی کڵپـەی دۆزەخ، (جَحِیـم) واتـە: ئاگـری بڵێسـەداری دۆزەخ، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ فَٱهْدُوهُمْ ﴾، ئەمـە بـە

تـەوس و توانجـەوە پێیـان دەگوتـرێ، واتـە: لـە دنیـادا هیدایـەت دران و، هیدایەتـی خوایـان قبـووڵ نەکـرد، بـەڵام ئێسـتا هیدایەتیـان بـدەن، ڕێنماییـان بکـەن، بـەرەو ڕێبازێـك کـە دەیانگەیەنـێ بـە کلّپـەی دۆزەخ.

﴿ وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْئُولُونَ ﴾، هەروەهـا ڕایانبگـرن، بیانوەسـتێنن، ئـەوان پرسـیار لێکـراون.

ئایـا چییـان لـێ دەپـرسرێ؟ ﴿ مَا لَكُمْ لَا تَنَاصَرُونَ ﴾، لێیـان دەپرسرێ: بۆچـی هاوکاریی یەکـدی ناکـەن و یەکـدی سـەرناخەن؟ ﴿ بَلْ هُمُ ٱلْيَوْمَ مُسْتَسْلِمُونَ ﴾، بەڵکـو ئەوانـە ئەمـڕۆ بـە تەواویـی تەسـلیمن، ملکەچـن، خـۆ بەدەسـتەوە دەرن، (أَسْـلَمَ) واتـە: ملکـەچ بـووە، بـەڵام (إِسْتَسْـلَمَ) واتـە: زێدەڕۆیـی کـرد لـە ملکەچیـی دا، یاخـود (مُسْتَسْـلِمُون) واتـە: خـۆ بەدەسـتەوەدەرن و بـە تەواویـی تەسـلیم بـوون، دەسـتیان بـە خۆیانـدا بەرداونـەوە، لـە بەرانبـەر سـزاو جەزرەبـەو هەڕەشـەی خـوای دادگـەردا لـە دواڕۆژدا، بـە تەئکیـد هیـچ شـتێکیان لـە دەسـت نایـەت و دەسـتەپاچەن.

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

**سوێند خواردنی خوا ﷻ بە فریشتانی بە ڕیز وەستاوو، تیوەخوڕو دەنگدەرو، خوێنەرەوەی زیکر، لەسەر ئەوە کە مرۆڤەکان یەك تاکە پەرستراویان هەیە، کە پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و، ئەوەی لە نێوانیان و خۆرهەڵاتەکانە:**

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿وَٱلصَّٰٓفَّٰتِ صَفّٗا ١ فَٱلزَّٰجِرَٰتِ زَجۡرٗا ٢ فَٱلتَّٰلِيَٰتِ ذِكۡرًا ٣ إِنَّ إِلَٰهَكُمۡ لَوَٰحِدٞ ٤ رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا وَرَبُّ ٱلۡمَشَٰرِقِ ٥﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:**

١)- ﴿وَٱلصَّٰٓفَّٰتِ صَفّٗا﴾، سوێند بە ڕیزبووەکان کە بە ڕێك و پێکیی ڕیز دەبن.

٢)- ﴿فَٱلزَّٰجِرَٰتِ زَجۡرٗا﴾، سوێند بە دەنگدەرەکان و، تێوەخوڕەکان، کە بە تێوەخوڕین و دەنگدان، دەنگدەدەن.

٣)- ﴿فَٱلتَّٰلِيَٰتِ ذِكۡرًا﴾، هەروەها سوێند بە خوێنەرەوانی زیکر.

ئەم سێیە: ﴿وَٱلصَّٰٓفَّٰتِ صَفّٗا ١ فَٱلزَّٰجِرَٰتِ زَجۡرٗا ٢ فَٱلتَّٰلِيَٰتِ ذِكۡرًا ٣﴾، بە ڕای زۆربەی زانایانی ڕوونکەرەوەی قورئان، خوا ﷻ مەبەستی پێیان فریشتەکانە، ئەو فریشتانەی کە بە ڕێك و پێکیی ڕیز دەبن و، ئەوانەی هەڵدەستن بە تێوەخوڕین و دەنگدان، چ بۆ شەیتانەکان، چ بۆ هەموو ئەو کارانەی کە خوا ﷻ پێیان دەسپێرێ، کە خوا ئەنجامدانی فریشتەکان بۆ کارەکان و سەرەو بەرە کردنیانی، چواندوە بە حاڵەتێکەوە کە کەسێك ئاژەڵێك دەنگدەدات، یاخود شتێك دەنگدەدات و بە پێش خۆی دەدات و بەرەو شوێنی مەبەستی دەبات.

﴿ فَٱلتَّٰلِيَٰتِ ذِكۡرًا ﴾، ئنجا ئەوانەی زیکر دەخوێننەوە، زیکر لێرەدا دەگونجێ مەبەست پێی ئەو وشانە بێ، کە مەدح و ستایشی خوایان پێ دەکرێ وەك: (سُبْحانَ اللّـه، الحَمْدُلِلّـهِ، لا إلـه إلاّ الله، اَللّـهُ أَكْبَر، هتد...)، دەشگونجێ مەبەست پێی ئایەتەکانی قورئان بێ، ئنجا لەو حاڵەتەدا واتە: ئەو فریشتانەی وەحیی خوا دێنن بۆ پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلاَم) و فەرمایشتی خوایان بەسەردا دەخوێننەوە، تاکو ئەوانیش بیگەیەنن بە خەڵك.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلصَّٰٓفَّٰتِ صَفّٗا ﴾، بە تەئکید پیتی (و) لە (وَالصَّافَّات)دا، بۆ سوێندە، چونکە سێ پیت هەن بۆ سوێند بەکار دێن: (و، ت، ب) وەك: (واللـهِ، باللـهِ، تَاللـهِ)، ئنجا ﴿ وَٱلصَّٰٓفَّٰتِ صَفّٗا ﴾، واتە: سوێند بە ڕیزبووەکان کە بە ڕێك و پێکیی دەوەستن، دوایی ئەو دووەی دیکە بە پیتی (ف) گێڕراونەوە: ﴿ فَٱلزَّٰجِرَٰتِ زَجۡرٗا ﴿٢﴾ فَٱلتَّٰلِيَٰتِ ذِكۡرًا ﴿٣﴾ ﴾، ئنجا ئەو دووانەی بە پیتی (ف) بادراونەوەو گێڕدراونەوە بۆ سەر: ﴿ وَٱلصَّٰٓفَّٰتِ صَفّٗا ﴾، خوازیاری ئەوەیە کە ئەو سێ سیفەتە چەسپاین بۆ یەك وەسفکراو، ئنجا کە بە مێینە (مُؤَنَّث) ئەو سیفەتانەی هێناوە، ئەوە لەو ڕووەوەیە کە مانای کۆمەڵ و تائیفە (الجماعة والطائفة) ڕەچاو کراوە، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە مەبەست پێی کۆمەڵەکانی فریشتەکانن، نەك تاك تاکیان، یانی: (صافَّات) کۆی (صافَّة)یە (المَلائِكَةُ الصَّافَّة) (زاجِرات) کۆی (زاجِرَة)یە (الجَماعَةُ الزَّاجِرَة) (تالِيات) کۆی (تالِيَة)یە یانی: (الجَماعَةُ التَّالِيَة) یان (الطَّائِفَةُ التَّالِيَة).

واتە: کۆمەڵە فریشتەیەکن کە پێکەوە وەستاون و ڕیز بوون، ئنجا لێرەشدا ڕێزبوون دوو ئەگەری هەن:

أ- یان مەبەست پێی ڕواڵەتی ڕیز بوونە (الوَصْفُ على الحَقِيقَةِ فَهِيَ مُصْطَفَّةٌ صُفُوفاً) فریشتەکان ڕیزبوون بە چەند ڕیزێك.

ب- یاخود ئەو وشەی ڕیزبوونە، کینایەیە بۆ ئامادەیی جێبەجێ کردنی هەر فەرمانێك کە پێیان دەسپێردرێ، وەك یەکێك دەڵێ: ئەوە لە خزمەتدا وەستاوم، یان ئەوە ڕیز بووین لە

خزمەتتدا، مەرج نیە وەك ڕیز ڕیزبووبن واتە: ئێمە ئامادەین وەك چۆن کۆمەڵە سەربازێك ڕیز دەبن، چاوەڕێی فەرمان دەکەن لە سەرۆکەکەیان کە جێبەجێی بکەن.

هەڵبەتە زانایان مانای دیکەشیان بۆ لێکداوەتەوە:

١- هەندێك گوتوویانە: ﴿وَٱلصَّٰٓفَّٰتِ صَفّٗا﴾، مەبەست پێی ڕیزەکانی جەنگاوەرانە، ﴿فَٱلزَّٰجِرَٰتِ زَجۡرٗا﴾، ئەو موجاهیدانە، ئەو جەنگاوەرانە کە دوژمن دەنگ دەدەن، تێیانەوە دەخوڕن، ﴿فَٱلتَّٰلِيَٰتِ ذِكۡرًا﴾، ئەوانەن کە لە گەرمەی جەنگ وجیهاددا یادی خوا دەکەن.

٢- هەندێکی دیکە گوتوویانە: ﴿وَٱلصَّٰٓفَّٰتِ صَفّٗا﴾، مەبەست پێی فریشتەکانە، بەڵام ﴿فَٱلزَّٰجِرَٰتِ زَجۡرٗا﴾، مەبەست پێی جەنگاوەرانی ڕێی خوایە، ﴿فَٱلتَّٰلِيَٰتِ ذِكۡرًا﴾، مەبەست پێی زانایانن، کە ئایەتەکانی خوا دەخوێننەوە.

کەواتە: دەگونجێ وەسف بن بۆ یەك وەسفکراو (موصوف) کە فریشتەکانن، دەشگونجێ دابەش بن بەسەر چەند وەسفکراوێکدا، بەڵام مانای یەکەمیان زیاتر پێدەچێ و، لەگەڵ ئایەتەکانی دیکەش دا، باشتردێتەوە کە باسی شەیتانەکان دەکەن، کە دەیانەوێ گوێ بگرن بۆ قسەی فریشتەکان، بەڵام ئاگر باران دەکرێن، تیرباران دەکرێن، ئنجا ئایا سوێند لەسەر خوراو (مقسم علیه)ەکە چییە؟

٤)- ﴿إِنَّ إِلَٰهَكُمۡ لَوَٰحِدٞ﴾، بە دڵنیایی پەرستراوی ئێوە یەکە، ئەمە وەڵامی سوێندەکەیە، کە دەفەرموێ: بە دڵنیایی پەرستراوی ئێوە یەکە، کە خوایە ﷻ، ئەمە جەختکردنەوەی تاکیەتیی خوای پەروەردگارەو، بەرپەرچدانەوەی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانیشە، کە هاوبەشیان بۆ خوا داناوە.

ئنجا پێناسەی پەرستراوی تاك (إلهٌ وَاحِد) دەکات:

٥)- ﴿رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا وَرَبُّ ٱلۡمَشَٰرِقِ﴾، پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی نێوانیان و پەروەردگاری ڕۆژهەڵاتەکان. (رَبّ) لە زمانی عەرەبییدا بە مانای: پەروەردگار، بەخێوکەر، مشوورخۆر، خاوەن، سەرپەرشتیار، هەروەها بە مانای

پەرستراویش و بەدیهێنەریش بەکاردێ، بەڵام ئەصڵی مانایەکەی واتە: پەروەردگارو خاوەن و، سەرپەرشتیارو مشوورخۆر زەوی.

﴿ وَرَبُّ ٱلْمَشَـٰرِقِ ﴾، پەروەردگاری ڕۆژهەڵاتەکانیش، وەك پێشتر گوتمان: بۆ هەر ڕۆژێك لە سێسەدو شەست و پێنج ڕۆژەکەی ساڵ، ڕۆژهەڵاتێك هەیەو ڕۆژئاوایەك هەیە، بەڵکو دەتوانین وردتر بڵێین: بۆ هەر چرکەیەك، بۆ هەر تاوێك کە بەسەر شەوو ڕۆژان دادێ، ڕۆژهەڵاتێك هەیەو، ڕۆژئاوایەك لە بەرانبەریدا.

کە دەفەرموێ: ﴿ رَّبُّ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾، ئەمە گوزارەی نیهاد (مُبْتَدأ)ێکی قرتێندراوە، یانی: (هُوَ رَبُّ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُما وَرَبُّ المَشَارِق) واتە: ئەو تاکە پەرستراوە، ئەوە سیفەتیەتی، ئنجا ئەوە کە دەفەرموێ: ﴿ رَّبُّ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَرَبُّ ٱلْمَشَـٰرِقِ ﴾، ئەمە بەڵگەشە بۆ ئەوە، کە بۆچی دەبێ تەنیا ئەو خوایە ﷻ بپەرسترێ و، تەنیا ئەو پەرستراو بێ؟ لەبەر ئەوەی بەس ئەو بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەن و مشوورخۆری ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی نێوانیانە.

لێرەدا خوا ﷻ تەنیا باسی پەروەردگارێتیی و خاوەندارێتیی خۆی دەکات بۆ ڕۆژهەڵاتەکان واتە: ئەو شوێنانەی خۆریان لێوە هەڵدێ، بە نسبەت ئێمەوە، هەڵبەتە ئەوە زەوییە کە بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە، لە بەرانبەر خۆرداو، هەرجارە شوێنێك دەبێتە هەڵاتگە (مَطْلَع) واتە: شوێنی لێوە هەڵهاتنی خۆرو دەرکەوتنی خۆر لە زەوییەوە، یانی: خۆر کە ملیۆنێك و سێسەد هەزار (١,٣٠٠,٠٠٠) جار لە زەوی گەورەترە، بەڵام سەدو پەنجا ملیۆن (١٥٠,٠٠٠,٠٠٠) کلم لێی دوورە، ئنجا زەوی کە دەخولێتەوە بە دەوری خۆیدا، بە خێرایی سی کیلۆمەتر (٣٠ کم) لە خولەکێك دا، دەتوانین بڵێین: لە هەر خولەکێك دا شوێنێکی زەوی دەردەکەوێ و دەبێتە هەڵاتگە (مَطْلَع) خۆرهەڵات، ئەو شوێنەی کە دەکەوێتە دیوی خۆر دەبێتە خۆرهەڵات، ئەو شوێنەی کە لە بەرانبەریدا بە تەواویی پشتی لە خۆر دەبێ، دەبێتە خۆرئاوا.

خـوا لـە سـوورەتی (البقـرة)دا دەفەرمـوێ: ﴿ وَلِلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ ﴿١١٥﴾ ﴾البقـرة، واتە: خۆرهـەڵات و خۆرئـاوا هـی خـوان، ئەمـە لێـرەدا مەبەسـت پـێ جینسـی خۆرهـەڵات و خۆرئاوایـە، لـە سـوورەتی (الرحمـن) دەفەرمـوێ: ﴿ رَبُّ ٱلْمَشْرِقَيْنِ وَرَبُّ ٱلْمَغْرِبَيْنِ ﴿١٧﴾ ﴾، زانایـان گوتوویانـە: (أي: المَـشْرِقِ الشَّـتْوِي وَالصَّيْفِـي، وَالمَغْـرِب الشَّـتْوِي وَالصَّيْفِـي) یـانی: ڕۆژهـەڵاتی زستانەو هاوینـەو، ڕۆژئـاوای زسـتانەو هاوینە. دەشـگونجێ: ﴿ رَبُّ ٱلْمَشْرِقَيْنِ وَرَبُّ ٱلْمَغْرِبَيْنِ ﴿١٧﴾ ﴾الرحمـن، مەبەسـت پێـی دوو خۆرهەڵاتەکـەی خـۆرو مانـگ و دوو خۆرئاوایەکـەی خـۆرو مانـگ (أي الشَّـمْسِ وَالقَمَـرِ) بـێ.

کـە لـە سـوورەتی (المعـارج) دەفەرمـوێ: ﴿ فَلَآ أُقْسِمُ بِرَبِّ ٱلْمَشَٰرِقِ وَٱلْمَغَٰرِبِ ﴿٤٠﴾ ﴾المعـارج، واتــە: نەخێـر سـوێند دەخـۆم بـە پـەروەردگاری خۆرهەڵاتـەکان و خۆرئاوایـەکان، واتـە: هـی هەمـوو ئـەو خاڵانـەی کـە بەسـەر زەویـدا دابـەش دەبـن و، خۆریـان لێـوە هەڵدێ، هەروەهـا هەمـوو ئـەو خاڵانـەی بەسـەر زەویـدا دابـەش دەبـن و، خۆریـان لێـوە ئـاوا دەبـێ، یاخـود: ڕۆژهـەڵات و ڕۆژئـاوای هەمـوو خڕۆکـەکان، هـی هەمـوو ئەوانـەی لـە گەردوونـدا هـەن.

لێـرەش دەفەرمـوێ: ﴿ رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَرَبُّ ٱلْمَشَٰرِقِ ﴾، کـە تەنیـا خۆرهەڵاتـەکان دێنـێ، دیـارە بـۆ هـەر کام لـەو شـوێنانە کـە ئاماژەمـان پێیانـدا، ئـەو سـیاقەو ئـەو بابەتـە، خوازیـاری ئەوەیـە کـە خۆرهـەڵات و خـۆر ئاوایـەکان بـە تێکڕایـی بـاس بکرێـن، یـان: هەردووکیـان بـاس بکرێـن، یاخـود تەنیـا خۆرهەڵاتـەکان بـاس بکرێـن.

**مەسەلەی دووەم:**

**ڕازێنرانـــەوەی ئاســمانی نیزیــك (لــە زەوی) بــە ئەســتێران و گێڕانــی ئەســتێران (ئـەو پارچانـەی لێیـان دەبنـەوە) بـە پارێـزەری ئاسـمان لـە هـەر شـەیتانێکی یاخیـی کـە گـوێ بـۆ قسـەی کۆمەڵـی بـاڵا (لـە فریشـتان) بگـرن و بلێسـە بارانکردنیـان و دەرکردنیـان:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّا زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِزِينَةٍ ٱلْكَوَاكِبِ ﴿٦﴾ وَحِفْظًا مِّن كُلِّ شَيْطَٰنٍ مَّارِدٍ ﴿٧﴾ لَّا يَسَّمَّعُونَ إِلَى ٱلْمَلَإِ ٱلْأَعْلَىٰ وَيُقْذَفُونَ مِن كُلِّ جَانِبٍ ﴿٨﴾ دُحُورًا ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ وَاصِبٌ ﴿٩﴾ إِلَّا مَنْ خَطِفَ ٱلْخَطْفَةَ فَأَتْبَعَهُۥ شِهَابٌ ثَاقِبٌ ﴿١٠﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

**١)- ﴿ إِنَّا زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِزِينَةٍ ٱلْكَوَاكِبِ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە ئاسمانی نیزیکمان ڕازاندۆتەوە، بەجوانیی ئەستێران، وشەی (دُنْيا) (مُؤَنَّث)ی (أَدْنى)یە، (أَدْنى أَي: الأَقْرَبْ) واتە: ئاسمانی نیزیکتر لە ئێوەمان (خەڵکی سەر زەوی) ڕازاندۆتەوە، بە جوانیی ئەستێران؟**

**﴿ بِزِينَةٍ ٱلْكَوَاكِبِ ﴾، ئەمــە بــە دوو جــۆر خوێندراوەتــەوە: أ- (بِزِينَـةِ الكَوَاكِـب) بـە جوانیــی ئەســتێرەکان، ب- ﴿ بِزِينَةٍ ٱلْكَوَاكِبِ ﴾، بــە (تَنْوِيــن) کــە ئــەو کاتــە یــانی: بــە جوانییــەك کــە بریتیــە لــە ئەســتێرەکان، ئــەو کاتــە (كَوَاكِـب) دەبێتــە جێــدار (بَـدَل) بـۆ (زِينَـة)، ئاسـمانی نیزیکـتر واتـە: نیزیکـتر لـە زەوییـمان ڕازاندۆتـەوە بـە جوانیـی، کـە ئـەو جوانییـە بریتیـە لـە ئەسـتێرەکان، ئـەوە ئەگـەر بـە (تَنْوِيـن)ی (زينـة) ﴿ بِزِينَةٍ ٱلْكَوَاكِبِ ﴾، بخوێندرێتـەوە، بـەڵام ئەگـەر بـە (مُضَـافُ ومُضَـافُ إِلَيْـهِ) دابنرێـن (بِزِينَـةِ الكَوَاكِـب) ئـەو کاتـە واتـە: بـە جوانیـی ئەسـتێرەکان.**

**لـە قوڕئـان دا وشـەی (نُجُوم)یـش بەکارهاتـووە، وشـەی (كَوَاكِب)یـش بەکارهاتـوە بـۆ یـەك واتـا، واتـە: بـۆ ئەسـتێرەکان، ئەوەنـدە هەیـە کـە دەگوتـرێ: (كَوَاكِـب)**

ئەستێرەو جگە لە ئەستێرەش دەگرێتەوە، بەڵام کە دەگوترێ: (نُجُوم) تەنیا ئەستێرەکان دەگرێتەوە.

٢)- ﴿ وَحِفْظًا مِّن كُلِّ شَيْطَٰنٍ مَّارِدٍ ﴾، هەروەها بۆ پاراستنیش لە هەر شەیتانێکی یاخیی، لە هەر شەیتانێکی دەرچوو لە فەرمانبەریی خوا، لە هەر شەیتانێك کە خۆی داڕووتاندوە لە چاکە، خۆی یەکلا کردۆتەوە بۆ خراپە، (المارِدُ: الخَارِجُ عَنِ الطَّاعَةِ، المُتَجَرِّدُ لِلشَّر) لە فەرمانبەریی خوا دەرچووەو یاخیی بووە، خۆی ڕووت کردوە لە خێرو چاکەو، خۆی یەکلا کردۆتەوە بۆ شەڕو خراپە.

وشەی (حِفْظاً) بادەدرێتەوە بۆ سەر (زِينَة) بەمجۆرە: (إِنَّا زَيَّنَّا السَّمَآءَ الدُّنْيا بِالكَوَاكِبِ زِينَةً وحفظاً)، واتە: ئێمە ئاسمانی نیزیکترمان بە جوانیی ئەستێران ڕازاندۆتەوە و بۆ پاراستنیش، پاراستنی ئاسمانی نیزیکتر لە ئێوە، بە هۆی ئەو ئەستێرانەوە پاراستنی ئاسمان لە هەر شەیتانێکی یاخیی، کە خۆی بۆ شەڕو خراپە یەکلاکردۆتەوە، دەستە بەرکراوە.

٣)- ﴿ لَّا يَسَّمَّعُونَ إِلَى ٱلْمَلَإِ ٱلْأَعْلَىٰ ﴾، ناتوانن گوێ هەڵبخەن بۆ کۆمەڵی باڵاتر، کۆمەڵی باڵاتر بە تەئکید مەبەست پێی فریشتەکانە (أَي: الجَمَاعَةُ أَهْلُ الشَّأْنِ وَالقَدْرِ وَوَصْفُهُمْ بِالأَعْلَى لِتَشْرِيفِ المَوْصُوفِ) یانی: کۆمەڵی پێگەداو بەرزو بە باڵاترین وەسفکراون بۆ ڕێزدارکردنی وەسفکراو. واتە: فریشتەکانن کە لە سەرەوەی گەردوونن، لە نیزیك عەرش و بارەگای خوای پەروەردگارن. (لَا يَسَّمَّعُون) خوێندراویشەتەوە: (لَا يَسْمَعُون)، (لَا يَسْمَعُون) واتە: نابیستن، بەڵام (لا يَسَّمَّعُون) لە ئەصڵدا (لَا يَتَسَمَّعُون)یە، بەڵام (ت)ەکە لە (س)ەکەدا (دَغْم) دەکرێ، (يَسْمَعُون) واتە: دەبیستن، بەڵام (يَسَّمَّعُون) واتە: بە گرنگیی پێدان و لێخەفتانەوە گوێ هەڵدەخەن.

٤)- ﴿ وَيُقْذَفُونَ مِن كُلِّ جَانِبٍ ﴾، لە هەموو لایانڕا پێیان دادەدرێ، (القَذْفُ: الرَّمْيُ وَالرَّجْمُ)، (قَذْف): بریتیە لە بۆ هاویشتن و پێدادان، چییان پێدا دەدرێ؟ دوایی دەردەکەوێ کە مەبەست پێی ئەو بڵێسەیە، کە لە خڕۆکەو ئەستێرەکانەوە دێ، ئەو پارچانەی لێیان

جیادەبنەوە، دوایی دەبنە بڵێسەیەك و پێیاندا دەدرێ، چونكە مادام ئەستێرەكان هەم بۆ جوانیی ئاسمانی نیزیكتر لە ئێمە بەكار هاتبن، هەم بۆ پاراستنی ئاسمانەكان، كەواتە ئەوەی كە بە شەیتانەكاندا دەدرێ، پەیوەندیی بە ئەستێرەكانەوە هەیە، كە بە تەئكید خودی ئەستێرەكان نین، كەواتە: ئەو پارچانەن كە لێیان جیادەبنەوە، وەك دواتر باس دەكەین.

﴿مِن كُلِّ جَانِبٍ﴾، لە هەر لایەكەوە (مِنْ كُلِّ جِهَةٍ).

٥)- ﴿دُحُورًا وَلَهُمْ عَذَابٌ وَاصِبٌ﴾، بۆ دەركردنیان و بۆ دوورخستنەوەیان و سزایەكی بەردەوامیشیان بۆ هەیە، (وَاصِب) واتە: (دَائِم) بەردەوام، نەبڕاوە، نەپساوە، كە بە تەئكید مەبەست پێی ڕۆژی دواییە، دەشگونجێ مەبەست پێی دنیاش بێ واتە: ئەوانەی كە بەو شێوەیە گوێ هەڵدەخەن بۆ قسەی فریشتە باڵاكان، خوا لە دنیاشدا بە شێوەیەك كە خوا بۆ خۆی دەزانێ چۆنە، سزایان دەدات.

٦)- ﴿إِلَّا مَنْ خَطِفَ الْخَطْفَةَ﴾، مەگەر كەسێكیان لە شەیتانەكان كە شتێك بدزێ بە دزیین و بە پەلە، (الخَطْفُ: ابْتِدَارُ تَدَاوُلِ الشَّيْءِ بِسُرْعَةٍ) (خطف) بریتیە لە خێرایی كردن لە دەستدانە شتێك بە خێرایی، (الْخَطْفَةُ: المَرَّةُ مِنْهُ)، (خَطْفَة)ش جارێكە لە (خَطْف)، مەگەر یەكێكیان لەناكاوو بە پەلە زانیارییەك بدزێ، هەواڵێك بدزێ، ئەویش چی لێ دێ؟

٧)- ﴿فَأَتْبَعَهُ شِهَابٌ ثَاقِبٌ﴾، بڵێسەیەكی كونكەر، بڵێسەیەكی دڕەر شوێنی دەكەوێ، یانی: دەیدرێ و كونی دەكات و دەیسووتێنێ، (الشِّهَابُ: الْقَبَسُ وَالجَمْرُ مِنَ النَّارِ)، (شِهَاب): بریتیە لە بڵێسەیەك و پشكۆیەك لە ئاگر، كە وەك دواتر باسی دەكەین وا پێدەچێ مەبەست ئەو نیازیك و بڵێسانە بن، كە لە ئەستێرەو خڕۆكەكان جیادەبنەوە.

ئـەوەی لێـرەدا بـاس دەكـرێ، بەڵگـەی ئـەوەی پێشــەوەیە كـە خـوا ﷻ فەرمــووی: پەرســتراوی ئێــوە یــەك پەرستراوە، ئەویــش بریتیــە لــە پــەروەردگار و خاوەنــی ئاســمانەكان و زەوی و ئــەوەی نێوانیــان و، هــی ڕۆژهەڵاتەكانیــش، واتــە:

کـە دەفەرمـوێ: ئێمـە ئاسـمانی نیزیکـتر لـە ئێوەمـان ڕازاندۆتـەوە بـە ئەسـتێرەکان، هەروەهـا بـۆ پاراسـتنی ئاسـمانیش لـە هـەر شـەیتانێك، کـە ڕێیـان نـادرێ، گـوێ هەڵبخـەن بـۆ فریشـتە باڵایـەکان و، لـە هەمـوو لایانـڕا بڵێسـە بـاران وتیـر بـاران دەکرێـن و دەردەکرێـن، مەگـەر کەسـێك بـە پەلـە زانیارییـەك بـدزێ، هەواڵێـك بدزێ، ئەویـش بڵێسـەیەکی کونکـەر، بڵێسـەیەکی دڕەرو سـووتێنەر شـوێنی دەکـەوێ. ئەمـە بەڵگـەی ئـەوەی پێشـەوەیە: خوایـەك ﷻ کـە بـەو شـێوەیە گەردوونـی بـە دەسـتە، پەنهـان و ئاشـکرای دروسـتکراوەکان لـە ژێـر کۆنتـڕۆڵ و ڕکێفـی دایـە، تەنیـا ئەویـش شایسـتەی پەرسـتران و بەندایەتیـی بـۆ کرانـە.

## باسێک دەربارەی
## گوێگرتنی شەیتانەکان لە فریشتان و تیربارانکرانیان

شایانی باسە: ئێمە لە دوو شوێنی دیکەدا، لەو بارەوە کورتە باسمان پێشکەش کردوە، یەکەمجار لە تەفسیری سوورەتی (الحجر)دا کە خوا ﷻ لەوێش زۆر بە روونیی باسی هەمان ئەو بابەتە دەکات، کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ جَعَلْنَا فِي السَّمَاءِ بُرُوجًا وَزَيَّنَّاهَا لِلنَّاظِرِينَ ﴿١٦﴾ وَحَفِظْنَاهَا مِن كُلِّ شَيْطَانٍ رَّجِيمٍ ﴿١٧﴾ إِلَّا مَنِ اسْتَرَقَ السَّمْعَ فَأَتْبَعَهُ شِهَابٌ مُّبِينٌ ﴿١٨﴾ ﴾الحجر.

هەروەها کورتە باسێکی دیکەشمان کردوە، هەر لەو بارەوە، لە تەفسیری ئەو ئایەتانەی سوورەتی (الجن)دا کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَنَّا لَمَسْنَا السَّمَاءَ فَوَجَدْنَاهَا مُلِئَتْ حَرَسًا شَدِيدًا وَشُهُبًا ﴿٨﴾ ﴾الجن.

بەڵام لێرەش بە پێویست و باشی دەزانم، ئەم کورتە باسە لە حەوت بڕگەدا پێشکەش بکەم، مادام خوا ﷻ لەو سێ شوێنەی قورئاندا، هەروەها لە سوورەتی (المُلك)یشدا، وەك تۆزێکی دیکە باسی دەکەین، باسی ئەو بابەتەی کردوەو لە چەند شوێنێکی دیکەش دا، هەر ئاماژەیەکی کورتی پێکردوە، دیارە بابەتەکە گرنگە، بایی ئەوەندە گرنگە کە دووبارە بۆتەوە، بۆیە ئێمەش لە هەر شوێنێ بە ئەندازەی بۆ لوان ئاماژەی پێ دەکەین، ئەوەی کە دێتە بەرچاوم و لە یادمە، ئەوەیە کە لە شەش شوێن لە قورئاندا، خوا باسی ئەو بابەتەی کردوە، کە بە پێی ڕیزبەندیی موصحەف، ئەمانەن:

١- سوورەتی (الحجر):

﴿ وَلَقَدْ جَعَلْنَا فِي السَّمَاءِ بُرُوجًا وَزَيَّنَّاهَا لِلنَّاظِرِينَ ﴿١٦﴾ وَحَفِظْنَاهَا مِن كُلِّ شَيْطَانٍ رَّجِيمٍ ﴿١٧﴾ إِلَّا مَنِ اسْتَرَقَ السَّمْعَ فَأَتْبَعَهُ شِهَابٌ مُّبِينٌ ﴿١٨﴾ ﴾، واتە: بە دڵنیاییی ئێمە

بورجەکانمـان لـە ئاسـماندا دانـاون و، جوانمـان کـردوون، ڕازاندوومانەتـەوە بـۆ تەماشـاکەران . هەروەهـا ئاسـمانمان پاراسـتوە لـە هـەر شـەیتانێکی دوورخـراوە . مەگـەر کەسێك بـە دزیـی گـوێ هەڵخـات، ئەویـش بڵێسـەیەکی ڕوونـی ئاگـری بـە دوا دەکـەوێ .

**٢- سوورەتی (الشعراء):**

﴿ وَمَا تَنَزَّلَتْ بِهِ ٱلشَّيَٰطِينُ ﴿٢١٠﴾ وَمَا يَنۢبَغِى لَهُمْ وَمَا يَسْتَطِيعُونَ ﴿٢١١﴾ إِنَّهُمْ عَنِ ٱلسَّمْعِ لَمَعْزُولُونَ ﴿٢١٢﴾ ﴾، واتـە: شـەیتانەکان ئـەم قورئانەیـان دانەبەزانـدوەو بۆیـان ناگونجێ و ناشـتوانن، نـە شایسـتەیانەو نـە تواناشـیان هەیـە، چونکـە ئـەوان لـە گـوێ هەڵخسـتن، دوورخـراوەن، کەنارگیـر کـراون، ناتوانـن گـوێ هەڵبخـەن، چ جـای قورئـان بێنـن! هـەر ناتوانـن گـوێ لـە قسـەی فریشـتەکانیش بگـرن و، هـەر کامێکیـان وابـکات، بڵێسـەیەکی بـۆ دەچـێ.

**٣- سوورەتی (الصافات):**

﴿ إِنَّا زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِزِينَةٍ ٱلْكَوَاكِبِ ﴿٦﴾ وَحِفْظًا مِّن كُلِّ شَيْطَٰنٍ مَّارِدٍ ﴿٧﴾ لَّا يَسَّمَّعُونَ إِلَى ٱلْمَلَإِ ٱلْأَعْلَىٰ وَيُقْذَفُونَ مِن كُلِّ جَانِبٍ ﴿٨﴾ دُحُورًا ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ وَاصِبٌ ﴿٩﴾ إِلَّا مَنْ خَطِفَ ٱلْخَطْفَةَ فَأَتْبَعَهُۥ شِهَابٌ ثَاقِبٌ ﴿١٠﴾ ﴾، کـە تەفسـیرمان کـردن.

**٤- سوورەتی (فصلت):**

﴿ فَقَضَىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَاتٍ فِى يَوْمَيْنِ وَأَوْحَىٰ فِى كُلِّ سَمَآءٍ أَمْرَهَا ۚ وَزَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ وَحِفْظًا ۚ ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ﴿١٢﴾ ﴾، واتـە: خـوا ئاسـمانەکانی تـەواو کـردن لـە دوو ڕۆژانـدا (واتـە: بـە دوو قۆنـاغ) و لـە هـەر ئاسـمانێکدا فەرمانـی ئاڕاسـتە کـرد، (فەرمانـی خـۆی سروشـکرد {بـۆ فریشـتەکانی کـە نیشـتەجێی ئـەو ئاسـمانەن} و ئاسـمانی نیزیکتریشـمان بـە چرایـان ڕازاندۆتـەوە، هەروەهـا ئـەو چرایانـە بـۆ پاراستنیشـن. (واتـە: پاراسـتنی ئاسـمان لـە گـوێ گرتنـی شـەیتانەکان).

**٥- سووڕەتی (الملك):**

﴿ وَلَقَدْ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ وَجَعَلْنَٰهَا رُجُومًا لِّلشَّيَٰطِينِ ۖ وَأَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابَ ٱلسَّعِيرِ ﴿٥﴾ ﴾الملك، بە دڵنیایی ئێمە ئاسمانی نیزیکترمان بە چرایان (مەبەست ئەستێرەکانە) ڕازاندۆتەوەو ئەو چرایانەمان، [ئەو ئەستێرانەمان] کردوون بە مایەی تیرباران کردن بۆ شەیتانەکان و، سزای بڵێسەداری دۆزەخیشمان بۆ ئامادە کردون لە دواڕۆژدا.

**٦- شوێنی شەشەم و کۆتایی، سووڕەتی (الجن):**

خوا لەسەر زاری جند فەرموویەتی: ﴿ وَأَنَّا لَمَسْنَا ٱلسَّمَآءَ فَوَجَدْنَٰهَا مُلِئَتْ حَرَسًا شَدِيدًا وَشُهُبًا ﴿٨﴾ وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَٰعِدَ لِلسَّمْعِ ۖ فَمَن يَسْتَمِعِ ٱلْـَٔانَ يَجِدْ لَهُۥ شِهَابًا رَّصَدًا ﴿٩﴾ ﴾، (جندەکان دەڵێن:) ئێمە ئاسمانمان پشکنی، تەماشامان کرد پڕ کراوە لە پاسەوانانی بەهێزو، پڕکراوە لە بڵێسە، ئێمە پێشتر بۆ گوێ گرتن لێی دادەنیشتین، بەڵام هەر کەسێك ئێستا گوێ هەڵبخات، بڵێسەیەکی لە بۆسەدای لێ هەڵدەکەوێ. واتە: بڵێسەیەکی تێدەگیرێ کە بۆی لە بۆسەدایە.

ئێمە - وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا - هەم لە کاتی تەفسیر کردنی سووڕەتی (الحجر)دا ئەو ئایەتانەی ئاماژەمان پێدان، باسمانکرد، هەروەها لە کاتی تەفسیر کردنی سووڕەتی (الشعراء)دا، ئاماژەیەکمان پێکرد، بۆیە ئەوەی لەوێ گوتوومانە، لێرەدا دووبارەی ناکەینەوە، بەڵام ئێمە لێرەدا وەڵامی چەند پرسیارێك دەدەینەوە کە فەخرەددینی ڕازیی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) لە تەفسیرەکەی خۆیدا: (مفاتیح الغیب) یان (التفسیر الکبیر)[1] ورووژاندوونی، و هەوڵی وەڵام دانەوەشیانی داوە.

هەڵبەتە ئێمە بە تۆزێك دەستکارییکردن و داڕشتنەوەی تایبەتیی خۆمان، ئەوەی (الرازي) گوتوویەتی دەیهێنین، ئەو پرسیارو وەڵامەکانی، واتە: ئیشکالەکان و هەوڵدان بۆ وەڵامەکانیانی، لە حەوت بڕگەدا هێناون:

---

(١) ج ٢٦، ص(٤١٣-٤١٤).

١- خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ وَجَعَلْنَٰهَا رُجُومًا لِّلشَّيَٰطِينِ ﴿٥﴾ ﴾الملك، واتە: ئێمە ئاسمانی نیزیکترمان بە چرایان ڕازاندۆتەوەو، ئەو چرایانەمان (کە مەبەست پێی ئەستێرەکانە) گێڕاون بە تیربارانکردن بۆ شەیتانەکان، پرسیار ئەوەیە: بۆچی ئەستێرەکان ژمارەیان کەم ناکات؟! خوا دەفەرموێ: ئەستێرەکانمان کردوون بە مایەی تیرباران کردن و بڵێسە بارانکردن بۆ شەیتانەکان، کەچی ناشبینین لەبەر چاوی ئێمە ئەستێرەکان کەم بکەن؟

(الرازي) ئاوا وەڵام دەداتەوە:

(شُهُب)یش هەر (مَصابِيح)ن، واتە: کە دەفەرموێ: (شُهُب) یان (شِهَاب) ئەوانیش هەر ئەستێرەکانن، بەڵام لەبەر ئەوەی زۆر زۆرن، کەم ناکەن، یان ئەو دەورەشیان پێ دەبینێ و کەچی هەر دەشمێنن.

دەڵێم: وەڵامە زانستییەکەی ئەوەیە کە (شُهُب)و ئەیزەکەکان پارچەی ئەستێرەکانن، نەك خودی ئەستێرەکان، دیارە ئەو کاتە زانست وەك ئێستا بەرەو پێش نەچووە (گەردوونناسیی و فیزیا)، کە بزانن ئەو ئەستێرانە چەندە گەورەن! بۆ وێنە: کەهکەشانەکەی ئێمە کە کەهکەشانی (ڕێی کاکێشان) (مَجَرَّةُ دَرْبِ التَّبَّان)ی پێدەڵێن، بە مەزەندە یەك تریلیۆن (١,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) ئەستێرەی تێدایە واتە: هەزار ملیار ئەستێرە، کە هەر کام لەو ئەستێرانە وەك خۆرەکەی ئێمە وان، یان گەورەتر یان گچکەتر، خۆری ئێمەش یەکێکە لە ئەستێرەکانی کاکێشان، ئنجا بە مەزەندە هەندێك سەرژمێر دەڵێن: تاکو دوو سەد ملیار (٢٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) کەهکەشان لە گەردووندا دۆزراوەتەوە، هەندێکیش دەڵێن: یەك تریلیۆن (١,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) کەهکەشان دۆزراونەوە، کە هەرکام لەو کەهکەشانانە وەك کە هکەشانەکەی خۆمانە، یان گەورەتر یان گچکەترە، کەواتە: ئەوە پارچەی ئەستێرەکانن، لێیان دەبنەوە، بەڵام کاتێك دەکەونە نێو مەودای بەرگە هەوای زەوییەوە، دادەگیرسێن، لەبەر ئەوەی لە بەرگە هەوادا

هەم ئۆکسجین هەیە، کە یارمەیتی سووتان دەدات، هەم هایدرۆجین هەیە، کە دەسووتێ و، سەرەنجام ئەو پارچەیە کە بەرەو ئاراستەی زەوی دێ، گڕ دەگرێ، سەرەتا ئەیزەکە، بەڵام دوای دەبێتە بڵێسە (شِهاب).

٢- پرسیارو ئیشکالی دووەم: مادام شەیتانەکان دەزانن دەسووتێن، چۆن هەر بەردەوام دەبن، لەسەر ئەو هەوڵدانەی خۆیان بۆ گوێگرتن لە قسەی فریشتەکان؟

(الرازي) ئاوا وەڵام دەداتەوە، دەڵێ: سووتێنرانەکەیان مسۆگەر نیەو، ئەوانیش حەزیان لە موغامەرەیە.

منیش دەڵێم: هەر ئەبێ بە ئەندازەی کابرایەکی قاچاغچیی و، کاروانچیی ئازان، کە دەشزانێ بۆسە لە ڕێدا هەیەو ڕەنگە مەترسیی هەبێ، بەڵام تەماع، یاخود ئاتاجیی و نەداریی پاڵی پێوە دەنێ، کە لەسەر کارەکەی خۆی هەر بەردەوام بێ.

٣- پرسیاری سێیەم: مێژوو پێمان دەڵێ: ئەو حاڵەتە پێش پێغەمبەری خاتەمیش ﷺ هەر هەبووە، وەئەبێ لە دوای پێغەمبەری خاتەمەوە ﷺ پەیدابووبێ؟

وەڵامەکەی ئەوەیە: کە لە دوای هاتنی پێغەمبەر ﷺ ئەو حاڵەتە زیاتر بووە، هەروەك ئایەتەکەی سوورەتی (الجن) دەیگەیەنێ: ﴿وَأَنَّا لَمَسۡنَا ٱلسَّمَآءَ فَوَجَدۡنَٰهَا مُلِئَتۡ حَرَسٗا شَدِيدٗا وَشُهُبٗا ۝٨﴾، واتە: پێشتریش پاسەوانی سەخت و ئەو بڵێسانەی لێبوون، بەڵام ئێستا پڕ کراوە یانی: ڕێژەکەیان زیاتر کراوە.

٤- پرسیاری چوارەم: شەیتان لە ئاگرە، ئەدی چۆن بڵێسەکان شەیتانەکان دەسووتێنن؟

(الرازي) وەڵامەکەی جوانە، دەڵێ:

شەیتان و جند لە ئاگر دروستکراون، بەڵام ئاگریش پلە پلەیە، ئاگری بەهێزتر ئاگری کەمتر دەسووتێنێ، بێگومان وایە بڵێسە ئاگرێکی گەورە لە چرایەك بدات دەیکوژێنێتەوەو لە بەینی دەبات، بە چراوە دەیسووتێنێ.

٥- پرسیاری پێنجەم: ئایا شەیتانەکان دەگەنە کوێ؟ ئایا دەگەنە چ شوێنێك کە گوێبیستی قسەی فریشتەکان بن و سنوورەکەی تاکو کوێیە؟

ئەمەیان خۆم زۆرم لێکۆڵیوەتەوە، پێم وایە هەوڵدەدەن بگەنە ئەو شوێنەی کە گوێبیستی قسەی فریشتان بن، ئنجا ئایا ئەو شوێنە کوێیە؟ ئایا دەرچوونە لە مەداری زەوی، ئایا تەنیا بریتیە لە تێپەڕ بوون لە بەرگە هەوای زەوی، کە هەزار کیلۆمەتر (١٠٠٠کم) بەرزە، یاخود بریتیە لە دەرچوون لە مەودای کەهکەشانی کاکێشان، یاخود هی هەموو کاکێشانەکان، ئەوە هەر زۆر زۆر دوورە، چونکە تیشك بە پازدە ملیار (١٥,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) ساڵی تیشکیی بە مەزەندە، ئنجا ئەمسەرە و ئەمسەری گەردوون دەکات، واتە: تیرەی گەردوون پازدە ملیار (١٥,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) ساڵی تیشکییە، یانی: تیشك پازدە ملیار (١٥,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) ساڵ بڕوات، ئنجا ئەمسەرە و ئەمسەری گەردوون دەکات.

هەڵبەتە من هەوڵمداوە زانیاریی لەو بارەوە پەیدا بکەم، بەڵام نەگەیشتوومە ئەنجامێکی ڕوون، بەڵام ئەوەندە هەیە هیچ گومانی تێدانیە کە دەبێ ئەو شەیتانانە بگەنە شوێنێك کە فریشتەکانی لێن، هەڵبەتە فریشتەکان لە هەموو ئاسمانەکان هەن، بەڵام سنوورەکەی کوێیەو چۆنە؟ نە زانیاریی شتێکی لێ دەرك کردوە، نە لە ئایەتەکاندا شتێکی ڕوون لەو بارەوە - کە سنوورەکەی تاکو ئەوێیە - باسکراوە، مەرجیش نیە ئەوەی زانیاریی گەردووناسیی و فیزیا دەیڵێ، هەمووی لە سەدا سەد بەو شێوەیە بێ، چونکە بێگومان زانیاریی بەشەر هەر چۆن بێ، شتێکی ڕێژەییە، ڕۆژ بە ڕۆژ زانیارییەکان، زانراوەکان گۆڕانیان بەسەردا دێ.

٦- پرسیاری شەشەم: شەیتانەکان زانیاریی و هەواڵ بۆ کاهین و جادووگەرەکان دەبەن، و ئەوانیش بازرگانیی پێوە دەکەن، ئەوە کاتی خۆی بووە، بەڵام ئایا ئێستاش هەر هەیە؟

من پێم وایە ئێستا زۆر سنووردارە، بە پێی پرسیارو وەڵامی بەندە لەگەڵ هەندێك لە جند بە شێوەی ناڕاستەوخۆ، کە دەچنە جەستەی خەڵکەوە، کە لە

نێویانـدا عیفریـت و ماریدیـش هەبـوون، ئەوانـە دەڵێـن: ئـەوە کاتـی خـۆی بـووە، بـەڵام ئێسـتا نەمـاوە، ئنجـا ئایـا ئەوانـەی ئـەو قسـەیە دەکـەن، زانیاریـی هەمـوو شـتێکیان لـە لایـە، یاخـود لـە قـەدەر خۆیـان قسـە دەکـەن؟ ئـەوان دەڵێـن: کاتـی خـۆی بـووە، بـەڵام هەر کەسـێك چـووە سـووتاوەو نەگەڕاوەتـەوە، بۆیە نێسـتانەماوە! بـەڵام مـن پێـم وایـە: کـەم و زۆر ئێسـتاش ئـەو هەوڵانـەی جنـد بەردەوامـن.

٧- چوار وشە هەن مانایان لێك نیزیکە، بەڵام جیاوازیشن، (خَطْف، غَصْب، سَرِقَة، اخْتِلاس)، لێرە لە ئایەتەکەدا خوا ﷻ وشەی (خَطْف) بەکاردێنێ: ﴿ إِلَّا مَنْ خَطِفَ ٱلْخَطْفَةَ ﴾، مەگەر کەسێك زانیارییەك بڕفێنێ بە ڕفاندن، بەڵام خوا ﷻ وشەی (إسترق)ی لە (الحجر)دا هێناوە: ﴿ إِلَّا مَنِ ٱسْتَرَقَ ٱلسَّمْعَ ﴿١٨﴾ ﴾الحجر، مەگەر کەسێك بە دزیی گوێ بگرێ.

١) وشەی (خَطْف) بریتیە لەوەی شتێك لە کەسێك بڕفێنی بە خێرایی، لە کاتێکدا خۆی ناگای لێیەو دەیبینێ و دەبیستێ، بە کوردیی دەڵێن: ڕفاندن.

٢) وشەی (غَصْب) ئەوەیە کەسێك شتێك لە کەسێك زەوتبکات، کە ئەو کەسە بتوانێ بابای لێستێنەر بگرێ، بەڵام کابرای لێستێنەر دەستەڵاتی هەبێ و بەرانبەرەکەی بێچارەو ناچار بکات و، شتەکەی لێ بستێنێ، (غَصْب)یش لە (خَطْف)ەوە نیزیکە، (خَطْف) ئەوەیە کە کاتێ کە دەبینێ و دەبیستێ، بەڵام بە خێرایی، لە ئەنجامی خێراییەکەیدا دەتوانێ لێی بستێنێ، بەڵام (غَصْب) ئەوەیە کە لە ئەنجامی دەستەڵاتەکەیدا دەتوانێ بەرانبەرەکەی ناچار بکات، و شتەکەی لێ بستێنێ.

٣) (سَرِقَة) بە کوردیی پێی دەڵێین: دزیی، بریتیە لە وەرگرتنی شتێك لە کەسێك بە بێ ئەوەی زانیاریی پێی هەبێ، واتە: بردنی شتێك بە پەنهانیی.

٤) (اخْتِلاس) بریتیە لە بردنی شتێك لەلایەن کەسێکەوە، کە ئەو کەسە بۆتە ئەمیندار لەسەر ئەو شتەو لە لای داندراوە.

بێگومـان ئەمانـە هـەر چواریـان لـە ئامـرازە قەدەغـەو حەرامەکانـی پەیداکردنـی شـتن، واتـە: هـەر ماڵێـك بـە هـەر کام لـەو ڕێیانـە کۆبکرێتـەوە، قەدەغـەو حەرامـە، شـەیتانەکانیش هـەم لـە ڕێـی دزیـی و بردنـی پەنهـان و ڕفاندنـەوە، هەوڵـی وەدەسـتهێنانی ئـەو زانیاریيانـە دەدەن، کـە دوایـی دەیبـەن بـۆ کاهیـن و جادووگـەرەکان، ئەوانیـش بازرگانیـی پێـوە دەکـەن بـۆ خەڵـك، کـە پێشـتر باسـمان کـردوە، پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمـوێ: یەکێـك لەوانـە زانیارییەکـی ڕاسـتی پـێ دەگات، بـەڵام نـەوەدو نـۆ درۆی لەگەڵـدا تێکـەڵ دەکات، دوایـی خەڵـك بەهـۆی زانیارییـە ڕاسـتەکەوە، بـڕوا بـە نـەوەدو نـۆ درۆکـەش دەکـەن.

**مەسەلەی سێیەم:**

**بێگومان مرۆڤانێك لە قوڕێكی پێكەوە چەسپاو دروست بووبن، دروستكراوی زۆر لەوان بەهێزتر هەیە، كەچی پێغەمبەری خوا ﷺ سەری سوڕ دەمێنێ، ئەوانیش گاڵتەی پێ دەكەن و، سوود لە ئامۆژگاریی وەرناگرن، هەر كە نیشانەیەكیان دی، زۆر بە خەستیی گاڵتەی پێ دەكەن:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿فَٱسْتَفْتِهِمْ أَهُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَم مَّنْ خَلَقْنَآ ۚ إِنَّا خَلَقْنَٰهُم مِّن طِينٍ لَّازِبٍ ﴿١١﴾ بَلْ عَجِبْتَ وَيَسْخَرُونَ ﴿١٢﴾ وَإِذَا ذُكِّرُوا۟ لَا يَذْكُرُونَ ﴿١٣﴾ وَإِذَا رَأَوْا۟ ءَايَةً يَسْتَسْخِرُونَ ﴿١٤﴾﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿فَٱسْتَفْتِهِمْ﴾، [خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:] پرسیاریان لێ بكە، لە بێبڕواو هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان، لێرەدا (فَاسْتَفْتِهِم) واتە: داوای فەتوایان لێ بكە، پرسیاریان لێ بكە، داوای وەڵامیان لێ بكە، (الإِسْتِفْتَاءُ: طَلَبُ الفَتْوَى وَالفُتْيا، وَهِيَ إِخْبَارٌ عَنْ أَمْرٍ يَخْفَى عَنْ غَيْرِ الخَواصِّ فِي أَمْرٍ مَا)، (إِسْتِفْتَاء) بریتیە لە داواكردنی فەتوا یان فوتیا (بە هەردوو بێژەكە هاتوە)، فەتواو فوتیاش بریتین لە هەواڵدان بە شتێكی پەنهان، كە ئەو شتە لە لای كەسانێك كە پسپۆڕ نەبن پەنهان بێ، لە بارەی هەر شتێكەوە بێ.

٢)- ﴿أَهُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَم مَّنْ خَلَقْنَآ؟﴾، ئایا دروستكردنی وان قورسترە، سەختترە، بەهێزترە، یان ئەو كەسانەی دروستمان كردوون؟ كە دەفەرموێ: (أَشَدُّ) یانی: (أَصْعَبُ وَأَقْوى وَأَعْسَر) واتە: بەهێزتر، یان قورسترو زەحمەتتر.

﴿أَم مَّنْ خَلَقْنَآ﴾، یاخود ئەو كەسانەو، یان ئەوشتانەی دروستمان كردوون؟

پێشتریش گوتمان: ئەم پرسیار كردنە: ﴿أَهُمْ أَشَدُّ خَلْقًا﴾، پرسیار كردنی سەرزەنشتكەرانەیە، واتە: ناگونجێ بڵێن: دروستكردنی ئێمە لە دروستكردنی

شـتەکانی دیکـە کـە خـوا هێناونیـە دی، فورسـترەو سـەختترەو بەهێزتـرە، ﴿ أَم مَّنْ خَلَقْنَآ ﴾، دیـارە (مَـن) بـۆ خـاوەن عەقڵانـە، بـەڵام لێـرەدا تەنیـا مەبەسـت خـاوەن عەقـڵان نیـن، کـە جنـدو فریشـتەکانن، بەڵکـو ئەمـە زاڵکردنـی خـاوەن عەقڵانـە بەسـەر ئەوانـەدا، کـە خـاوەن عەقـڵ و شـعوور نیـن.

کەواتـە: ﴿ أَم مَّنْ خَلَقْنَآ ﴾، یانـی: هـەر شـتێکی دیکـە کـە ئێمـە دروسـتمان کـردوە، چ خـاوەن عەقـڵ بـن، وەك فریشـتەو جنـد، چ خـاوەن عەقـڵ و هەسـت نەبـن، وەك ئاسـمانەکان و هەمـوو ئـەو دروسـتکراوانەی دیکـە کـە خـوا هێناونیـەدی.

ئنجا خوا ﷻ ڕوونی دەکاتەوە کە دروستکردنی ئەوان لە چییە:

٤)- ﴿ إِنَّا خَلَقْنَاهُم مِّن طِينٍ لَّازِبٍ ﴾، ئێمە ئەوانمان لە قوڕێکی پێکەوە چەسپاو، قوڕێکی خەست و خۆڵ دروستکردوە.

یەکێـك لـە قۆناغەکانـی دروسـت بوونـی ئـادەم، قوڕێکـی پێکـەوە چەسـپاوو خەسـت و خـۆڵ بـووە، چونکـە: (الـلَّازِبُ: اللَّاصِـق أي: طِـينٍ عَتِيـقٍ مُتَغَـيِّرٍ) قوڕێکـی کۆنـی گـۆڕاو کـە پێکـەوە چەسـپاو بـووە، خەسـت و خـۆڵ بـووە، بـەڵام بـۆ وێنـە: جنـد لـە ئاگـر دروسـتبوون و، فریشـتەکان لـە ڕووناکیـی (نـور) دروسـتبوون واتـە: جەسـتەکانیان، کـە دیـارە هـەم جنـد و هـەم فریشـتەکان ڕووحیشـیان هەیـە، بـەڵام جەسـتەیان لـە جۆرێـك لـە تیشـك دروسـت بـووە.

٥)- ﴿ بَلْ عَجِبْتَ وَيَسْخَرُونَ ﴾، بەڵکو تۆ سەرت سوڕماو ئەوانیش گاڵتە دەکەن. (عَجِبْتَ) خوێندراویشەتەوە: (عَجِبْتُ)، (عَجِبْتُ) واتە: من سەرم سوڕما، (عَجِبْتَ) واتە: تۆ سەرت سوڕما لەوان، ئەوانیش گاڵتە دەکەن، کە دەفەرمویٚ: (عَجِبْتُ) واتە: من سەرم سوڕما، لە نەزانیی ئەوان، هەروەها دەشگونجێ (عَجِبْتَ) واتە: تۆ سەرت سوڕما لە نەزانیی ئەوان، یاخود سەرت سوڕما لە مەزنیی دروستکراوەکانی خوا، یاخود تۆ سەرت سوڕما لە هێدیی و مەندیی پەروەردگار لە بەرانبەریاندا، کە زوو سزایان نادات، کەواتە: (عَجِبْتَ) بۆ هەرسێ واتایەکە دەچێتەوە.

(عَجِبْتُ) واتـە: مـن سـەرم سـوڕما، بێگومـان سەرسـوڕمان بـۆ خـوای پـەروەدگار بـەكار نایـەت، بـەڵام ئەگـەر بـەو خوێندنەوەیـان مانـا بكـرێ، واتـە: خـوا ﷻ ڕەخنـەی گـرت و ئەوانـی پـێ هەڵەیـە، دەبـێ وشـەكە بـە شـێوەیەك بـۆ خـوای پـەروەردگار مانا بكـرێ، كـە لەگـەڵ مەقامـی بـەرزی خـوادا شایسـتەو گونجـاو بـێ، وەك وشـەكانی: ﴿ وَأَكِيدُ كَيْدًا ﴿١٦﴾ ﴾الطـارق، ﴿ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ اللَّهُ ﴿٣٠﴾ ﴾الأنفـال، ﴿ يُخَٰدِعُونَ اللَّهَ وَهُوَ خَٰدِعُهُمْ ﴿١٤٢﴾ ﴾النسـاء، دەبـێ هەمـوو ئـەو وشـانە بـە شـێوەیەك مانـا بكرێـن، كـە لەگـەڵ مەقامـی بـەرزی خـوادا بگونجـێ، زانایـان دەڵێـن: لەبـەر وەك یـەك لێكـردن (مُشـاكَلَة) خـوا ﷻ ئـەو وشـانە بـەكار دێنـێ، نـەك ئـەو مانایـەی كە بـۆ بەرانبـەرەكان هەیـە، هەمـان مانـاش بـۆ خـوای پـەروەردگار هەبـێ، هـەر كەسـە دەبـێ مانایەكـی بـۆ لەبـەر چـاو بگیـرێ، كـە شایسـتەیەتی.

٦)- ﴿ وَإِذَا ذُكِّرُوا۟ لَا يَذْكُرُونَ ﴾، كاتێك ئەوانە بیریان بخرێتەوە، بیریان ناكەوێتەوە، یاخود كاتێك ئامۆژگاریی بكرێن، ئامۆژگاریی وەرناگرن، (التَّذْكِيرُ: جَعْلُ الطَّرَفِ عَلَى ذِكْرٍ مِنْ شَيْءٍ نَسَاهُ)، (تَذْكِير): بریتیە لەوە كە بەرانبەرەكەت شتێكی یاد بخەیەوە، كە لەبیری چۆتەوە، بەڵام پێم وایە وێڕای ئەو واتایە واتایەكی دیكەشی هەیە، واتە: بەرانبەرەكەت شتێكی فێربكەی، نەیزانیبێ، (تَذْكِير) بەو مانایەش هەر بەكار دێ.

٧)- ﴿ وَإِذَا رَأَوْا۟ ءَايَةً يَسْتَسْخِرُونَ ﴾، كاتێك نیشانەیەك ببینن، زۆر بە خەستیی گاڵتە دەكەن، واتە: گاڵتە بەو نیشانەیەو موعجیزەیە دەكەن، یاخود گاڵتە بەو دیاردە گەردوونیی و سروشتییە دەكەن، (الإِسْتِسْخارُ: مُبالَغَةٌ فِي السُّخْرِيَةِ)، (إِسْتِسْخار): زێدەڕۆییكردنە لە گاڵتە كردندا، واتە: خۆیان بە خەستیی گاڵتە دەكەن، یاخود هاوەڵانیش بۆ خۆ پەیدا دەكەن كە بە كۆمەڵ، بە هەرەوەزیی گاڵتە بەو شتە بكەن، بە زۆریی وایە سەرسوڕمان بەهۆی ئەوەوەیە، كە شتێك زۆر نائاسایی بێ و مرۆڤ ببینێ، گاڵتە كردنیش بە زۆریی لەلایەن خەڵكی نەزان و نەفامەوەیە، بۆیە خوا ﷻ هەم بە وشەی (يَسْخَرُون) هەم (يَسْتَسْخِرُون) كە دیارە زێدەڕۆیی زیاتری تێدایە، بۆ بێبڕوایەكانی بەكار هێناوە، كە لە ئەنجامی نەفامیی و نەزانیی خۆیاندا، ئەوان گاڵتەیان كردوە بە پەیامی خوا، بە

نیشانەکانی خوا، ئنجا نیشانەکانی خوا چ موعجیزەکەی پێغەمبەر بێ ﷺ، کە تەحەددای پێکردوە، کە تەنیا قورئانە، چ دیاردە سروشتییەکان بن، چ هەموو ئەو نیشانانە بن کە خوا لە قورئاندا باسی کردوون، بۆ پێغەمبەرانی دیکە (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ).

**مەسەلەی چوارەم:**

**بە جادوو دانانی بێبڕوایان بۆ قورئان و نکوولّیکردنیان لە زیندوو کرانەوەو، وەڵامدرانەوەیان کە زیندووکرانەوەیان تەنیا دەنگدان و تیخوڕینێکی دەوێ و، دوایی هەموویان بە چاوی سەر دەیبینن و، لە هەموو شتێك حاڵیی دەبن:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَقَالُوٓاْ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ ﴿١٦﴾ أَوَءَابَآؤُنَا ٱلْأَوَّلُونَ ﴿١٧﴾ قُلْ نَعَمْ وَأَنتُمْ دَٰخِرُونَ ﴿١٨﴾ فَإِنَّمَا هِىَ زَجْرَةٌ وَٰحِدَةٌ فَإِذَا هُمْ يَنظُرُونَ ﴿١٩﴾ وَقَالُواْ يَٰوَيْلَنَا هَٰذَا يَوْمُ ٱلدِّينِ ﴿٢٠﴾ هَٰذَا يَوْمُ ٱلْفَصْلِ ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿٢١﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

**١)- ﴿ وَقَالُوٓاْ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴾، (بێبڕوایەکان) گوتیان: ئەمە تەنیا جادوویەکی ئاشکرایە.**

لێرەدا دەگونجێ:

**أ- مەبەستیان پێی قورئان بووبێ، دەشگونجێ مەبەستیان پێی زیندووکرانەوەی مردووان بووبێ، کە دەڵێن: جادوویەکی ئاشکرایە، یانی: ئەو قسەیە کە: مردوو زیندوو دەکرێنەوە، قسەیەکە لە شێوەی جادوودا، خەڵك لێی تێناگات و ناچێتە عەقڵەوە.**

**ب- یاخود قورئانیان بەوە تۆمەتبار کردوە، کە قسەیەکی جادووگەرانەیەو لەگەڵ عەقڵ و لۆژیکدا ناگونجێ، کە بێگومان بوختانێکی زۆر گەورەو درۆیەکی شاخداریان کردوە.**

ئنجا بەردەوام دەبن و دەڵێن:

**٢)- ﴿ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ ﴾، ئایا کە مردین و بووینەوە خۆڵ و ئێسك، ئایا ئێمە هەڵسێنراوەو زیندووکراوە دەبین؟ زۆر جار لە قورئان دا تەعبیری: ﴿ تُرَابًا وَعِظَٰمًا ﴾، هاتوە، چونکە هەتا ئێسك دەپڕتووکێ و کلۆر دەبێ، گۆشت و چەوریی و دەمار لەمێژە**

بوونەوە بە خاك و خۆڵ، واتە: گۆشتەکە بۆتەوە بە خاك و خۆڵ و ئێسقانەکانیش کلۆر بوون و پرتووکاون، ئایا کاتێك گۆشتمان دەبێتەوە بە خۆڵ و ئێسقانمان دەپرتووکێ، ئێمە زیندوو دەکرێینەوە؟

هەردووك وشەی (أإذا) و (أءِنّا) بۆ پرسیار کردنن، هی دووەمیان: ﴿أَءِنَّا لَمَبۡعُوثُونَ﴾، خوێندراویشەتەوە: (إنّا لَمَبْعُوثُون؟) بە شێوەی پرسیار کردن، بەڵام ئەم جۆرە خوێندنەوەی دووەمیان، هەمزەی پرسیارکردنی لەگەڵدا نیە.

٣)- ﴿أَوَءَابَآؤُنَا ٱلۡأَوَّلُونَ﴾، هەروەها ئایا باب و باپیرانی یەکەمیشمان؟ ئەوانیش زیندوو دەکرێنەوە؟ هەروەها خوێندراویشەتەوە: (أَوْ ءَآباؤُنا الأَوَّلون)، هەم بە (أَوَ) هەم بە (أَوْ) کە هەر یەك واتایان هەیە، زۆر بە سەرسوڕمانەوە وایانگوتوە.

خوا ﷻ بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:

٤)- ﴿قُلۡ نَعَمۡ وَأَنتُمۡ دَٰخِرُونَ﴾، بڵێ: بەڵێ، لە حاڵێك دا ئێوە دەستە پاچەو ملکەچیش دەبن. (ئەی موحەممەد!) لە وەڵامی ئەو پرسیار لێکردنە نکووڵیلێکەرانەو سەرسوڕهێنەرانەیاندا بفەرموو: بەڵێ زیندوو دەکرێنەوە، لە حاڵێکیشدا کە ئێوە زۆر زەبوون و زۆر ملکەچن، (وَأَنْتُم) (و) (واو الحالية)یە، یانی: لە حاڵێك دا، (داخِرُون)یش کۆی (داخر)ە (أَي: الصَّاغِر وَالذَّلِيل) یانی: ملکەچ و دەستەپاچە.

٥)- ﴿فَإِنَّمَا هِيَ زَجۡرَةٞ وَٰحِدَةٞ﴾، بێگومان حاڵەتی ژیاندرانەوە تەنیا یەك تێخوڕینە. ڕاناوی (هِيَ) دەچێتەوە بۆ زیندووکرانەوەکە، واتە: ئەو زیندووکرانەوەیە، ئەو حاڵەتەی ئێوە تێیدا زیندوو دەکرێنەوە، تەنیا یەك تێوەخوڕینە، کە مەبەست پێی فووی دووەمە لە لایەن ئیسرافیلەوە، ئیسرافیل دوو جاران فوو بە کەڕەنادا دەکات، (صور) کەڕەنا، بووقی، دووجاران فووی پێدا دەکرێ، وەك لە سووڕەتی (الزمر)دا خوا ﷻ زۆر باش ئەوە ڕووندەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُۖ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخۡرَىٰ فَإِذَا هُمۡ قِيَامٞ يَنظُرُونَ ﴿٦٨﴾﴾، واتە: فوو بە صوردا کرا (بۆ جاری یەکەم) هەر کەس لە ئاسمانەکان و لە زەویدا هەیە، هەموویان مردن، مەگەر

کەسێك خوا بیەوێ (نەمرێ)، دوایی بۆ جارێکی دیکە فووی پێدا کرا، یەکسەر هەموویان هەڵسانەوەو چاوەڕێ دەکەن و تەماشا دەکەن.

هەروەها ئەم دووجار فوو پێداکردنەی ئیسرافیل بە کەڕەنادا، لە سوورەتی (النازعات)یشدا هاتوە کە دەفەرموێ: ﴿ يَوْمَ تَرْجُفُ ٱلرَّاجِفَةُ ﴿٦﴾ تَتْبَعُهَا ٱلرَّادِفَةُ ﴿٧﴾ ﴾، ئەو ڕۆژە کە بۆ جاری یەکەم زەوی (یان: گەردوون) دەلەرزێتەوە (لە ئەنجامی فووی یەکەمدا) دوایی شوێنکەوتووەکەش شوێنی دەکەوێ، واتە: فووی دووەمیشی بەدوا دادێ، کە لە ئەنجامی فووی یەکەمدا گەردوون تێکدەچێ و، لە ئەنجامی فووی دووەمدا بە شێوەیەکی دیکە گەردوونێکی دیکە، یاخود عالەم و واقیعێکی دیکەی نوێ دێتە ئاراوە، وەك لە سوورەتی (إبراهیم)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ ۖ وَبَرَزُوا۟ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴿٤٨﴾ ﴾إبراهيم، ئەو ڕۆژە کە زەوی دەبێتە جگە لەم زەوییەو ئاسمانەکایش دەبن بە جگە لەم ئاسمانانە [ئەم شێوە پێکهاتەیەی گەردوون و واقیعە دەگۆڕێ]و بۆ خوای تاکی مل پێکەچکەر دێنە گۆڕێ، کۆدەکرێنەوە.

لێرە کە دەفەرموێ: ﴿ فَإِنَّمَا هِيَ زَجْرَةٌ وَٰحِدَةٌ ﴾، (زَجْـرَة) واتە: تێخوڕین، کە لە هەندێك شوێن دەفەرموێ: (صَيْحَـة) یانی: چریکە، هاڕژن، دەنگی گەورە، (صَـوْتٌ مُـدَوِّي) دەنگێکی دەنگدەرەوە، (الزَّجْـرَة أي: يُزْجَـرُ بِهَـا كَالزَّجْـرَةِ بِالنَّعَـمِ وَالإِبِـلِ عِنْـدَ الرَّعْـيِ، ثُـمَّ صَـارَتْ بِمَعْنَـى الصَّيْحَـةِ مُطْلَقـاً)، (زَجْـرَة) لەوەوە هاتوە یانی: پێی دەنگ دەدرێ، وەك تێخوڕین و دەنگدانی ئاژەڵ و حوشتران لە کاتی لەوەڕاندن دا، [بابایەکی شوان حوشترەوان و گاوان ئاژەڵەکانی دەنگ دەدات و تێیانەوە دەخوڕێ] دوایی بە مانای دەنگی گەورەو هاڕژن، بەکارهێنراوە.

٦)- ﴿ فَإِذَا هُمْ يَنظُرُونَ ﴾، دوایی یەکسەر ئەوان کتوپڕ چاوەڕێ دەکەن:

أ- (يَنظُرُون) بە مانای (يَنْتَظِرُون) دێ، واتە: چاوەڕێ دەکەن، چاوەڕێ دەکەن داخۆ چییان بەسەر دێ؟ چاوەڕێ دەکەن بۆ کوێ دەبردرێن و چییان لێ دەکرێ؟ چاوەڕێی کاروباری قیامەت دەکەن.

ب- هەروەها (ینظرون) بە مانای (تەماشا دەکەن)یش دێ.

٧)- ﴿ وَقَالُواْ يَٰوَيۡلَنَا هَٰذَا يَوۡمُ ٱلدِّينِ ﴾، هەروەها گوتیان: ئەی هاوار بۆ ئێمە! ئەمە ڕۆژی سزاو پاداشتە، (يَا وَيْلَنَا) ئەی هاوارو ڕۆ بۆ ئێمە! یاخود (وَيْل) بە مانای سزای سەختە، سزای سەخت بۆ ئێمە، ئەمڕۆ ڕۆژی سزاو پاداشتە {کە ئێمە نکوولّییمان لێ دەکرد}.

خواش ﷻ دەفەرموێ، یان فریشتەکان پێیان دەڵێن:

٨)- ﴿ هَٰذَا يَوۡمُ ٱلۡفَصۡلِ ٱلَّذِي كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴾، ئەمە ڕۆژی لێك هەڵاواردنە، کە ئێوە پێی بێبڕوا بوون، بە درۆتان دادەنا، واتە: ڕۆژی لێك جیاکردنەوەیە، (يَوْمُ الفَصْل) واتە: (يَوْمُ التَّمِييز) ئەو ڕۆژەی چاك و خراپ لێك جیادەکرێنەوەو پۆلێن دەکرێن، هەر کەسە بە پێی خۆی، لەگەڵ کۆمەڵی خۆیدا کۆدەکرێتەوە، وەك لە ئایەتی دواتردا خوا ﷻ ئەوە زیاتر ڕووندەکاتەوە.

**مەسەلەی پێنجەم:**

**فەرمانکردنی خوا بە خڕکردنەوە سەر یەکی ستەمکاران و، پەرستراوان و هاوشێوەکانیان و، پاڵەستۆدانیان بەرەو ڕێی دۆزەخ و، ڕاگرتنیان بۆ پرسیار لێکران و، خۆ بەدەستەوەدانیان و دان بە تاوانی خۆداهێنانیان:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ٱحۡشُرُواْ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ وَأَزۡوَٰجَهُمۡ وَمَا كَانُواْ يَعۡبُدُونَ ﴿٢٢﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَٱهۡدُوهُمۡ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡجَحِيمِ ﴿٢٣﴾ وَقِفُوهُمۡۖ إِنَّهُم مَّسۡـُٔولُونَ ﴿٢٤﴾ مَا لَكُمۡ لَا تَنَاصَرُونَ ﴿٢٥﴾ بَلۡ هُمُ ٱلۡيَوۡمَ مُسۡتَسۡلِمُونَ ﴿٢٦﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿ٱحۡشُرُواْ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ وَأَزۡوَٰجَهُمۡ﴾، (دەگوترێ:) ئەوانەی ستەمیان کردوەو هاوشێوەکانیان کۆبکەنەوە، خڕ بکەنەوە، بێگومان (**احْشُرُوا**)، (**مَقُولُ قَوْلٍ مَحْذُوف**) گوتراوی قسەیەکی قرتێنراوە، کە بە سیاق دەزاندرێ، واتە: [(**قِيلَ**) أو (**يُقَالُ**)] گوترا، یان دەگوترێ: ﴿ٱحۡشُرُواْ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ وَأَزۡوَٰجَهُمۡ﴾، ئەوانەی ستەمیان کردوەو هاوشێوەکانیان کۆبکەنەوە، چونکە (**الحَشْرُ: جَمْعُ المُتَفَرِّقِينَ فِي مَكَانٍ وَاحِدٍ**) (حشر) کۆکردنەوەی کەسانێك یان شتانێکی پڕژوبڵاو لەیەك شوێندا، کە دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ﴾، ئەوانەی ستەمیان کردوە، بێگومان مەبەست پێی بێبڕوایەکان و هاوبەش بۆ خوا دانەرانە، خوا لە قورئاندا هەم شیرکی بە (**ظُلْم**) ناوناوە، هەم کوفریش:

أ- بە نسبەت شیرکەوە دەفەرموێ: ﴿يَٰبُنَيَّ لَا تُشۡرِكۡ بِٱللَّهِۖ إِنَّ ٱلشِّرۡكَ لَظُلۡمٌ عَظِيمٞ ﴿١٣﴾﴾ لقمان، لوقمان ئامۆژگاریی کوڕەکەی دەکات دەڵێ: ڕۆڵە گیان! هاوبەش بۆ خوا دامەنێ، چونکە هاوبەشدانان ستەمێکی گەورەیە.

ب- بەنسبەت کوفریشەوە، لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿وَٱلۡكَٰفِرُونَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٥٤﴾﴾، واتە: بێبڕوایەکان هەر ئەوانن ستەمکاران.

ج- جگە لەوەش کەسێك کە دەستدرێژیی دەکاتە سەر مافی ئەوانیدیکە، ئەوەش هەر بە ستەم لە قورئاندا ناوی هاتوە، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى ٱلَّذِينَ يَظْلِمُونَ ٱلنَّاسَ وَيَبْغُونَ فِي ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٤٢﴾ ﴾ الشورى.

کەواتە: ﴿ ٱحْشُرُوا ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا ﴾، هاوبەشدانەرەکان دەگرێتەوەو، بێبڕوایەکان دەگرێتەوەو، دەستدرێژکارەکان بۆ سەر مافی ئەوانی دیکەش هەموویان دەگرێتەوە، (وَأَزْوَاجَهُمْ أَي: وَأَصْنافَهُم وَأَشْكالَهُم) ئەوانەی هاوپۆلیانن و شێوەی ئەوانن، (أَزْواج) وێڕای (أصناف) دەشگونجێ كۆی (زَوْج) بێ، واتە: هاوسەرانیان، چونکە بە هەرکام لە نێرو مێ دەگوترێ: (زَوْج)، (هَـٰذِهِ زَوْجُ هَـٰذَا) بە هەر کامێکیان دەگوترێ: (زوج) نەك بە هەردووکیان بگوترێ (زَوْج)، ئێمە بە کوردیی دەڵێین: جووت واتە: نێرو مێ، بەڵام لە زمانی عەرەبییدا بە نێرەکەش دەگوترێ (زَوْج) و بە مێیەکەش دەگوترێ (زوج)، چ بۆ مرۆڤان، چ بۆ ئاژەڵان، چ بۆ ڕووەکان، چ بۆ تێکرای ژیانداران و بۆ هەموو دروستکراوانی خوا، بۆ وێنە گەردیلەش کە بارگەی (موجیب و سالیب)ی هەیە، ئەویش بە هەرکامێکیان دەگوترێ: (زَوْج)، هەردووکیشیان پێکەوە جووتن، بەڵام بە پێی سیاق وا پێدەچێ مەبەست لە (أَزْوَاجَهُمْ) هاوسەرانیان نەبێ، چونکە جاری وا هەیە کەسێك بۆ خۆی هاوبەش بۆ خوادانەرە، بێبڕوایە، ستەمکارە، بەڵام هاوسەرەکەی خواپەرستە، دیندارە، چاکەکارە، بۆیە وا پێدەچێ زیاتر مەبەست پێی: (أَصْنَافَهُم وَأَشْكَالَهُمْ وَأَمْثَالَهُم) بێ، هەموو ئەوانەی کە هاوپۆل و هاوجۆرو هاوشێوەی یەکن لە کوفردا، لە شیرکدا، لە زوڵمدا، لە خراپەکاریی دا، خڕیان بکەنەوە سەریەك.

٢)- ﴿ وَمَا كَانُوا يَعْبُدُونَ ﴿٢٢﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، هەروەها ئەوەی کە جگە لە خوا دەیانپەرست، واتە: بتەکانیان، پەرستراوەکانیان بە گشتیی، چ بت و پەیکەر بووبن، چ سەرجەم ئەو شتانە بووبن کە پەرستوویانن لە جیاتی خوا، ڕژێم و حیزبی بێ دین، طاغووت، پارەو سامان، شمەك و کەل و پەل، هەواو ئارەزوو ... هتد کە جگە لە خوا پەرستوویانن، ئەوانەشیان لەگەڵ کۆبکەنەوە، هەموویان پێکەوە ڕەپێچەکەن و هەموویان پێکەوە پاڵەستۆ بدەن، بەرەو کوێ؟!

٣)- ﴿ فَٱهۡدُوهُمۡ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡجَحِيمِ ﴾، ڕێنماییان بکەن بەرەو ڕێی کڵپەی دۆزەخ، (**فَاهْدُوهُم**) پیتی (ف) (**فاءُ التَّعْقِيبِ إِشارَةٌ إِلى سُرْعَةِ الأَمْرِ بِهِمْ إِلَى النَّارِ عَقِبَ ذَلِكَ الحَشْرِ**)، (ف) فائی بەدوای یەکدا هاتنی دوو شتان، یان چەند شتێکە، ئاماژەیە بۆ بەخێرایی فەرمانپێکردنیان بەرەو ئاگر، دوای ئەو کۆکردنەوەیە، (**فَاهْدُوهُم**) واتە: دوای ئەوەی کۆتانکردنەوە، یەکسەر بەخێرایی بیانبەن بەرەو ڕێی کڵپەی دۆزەخ، ئەمە بە جۆرێك لە توانج و تەوسەوە پێگوتنیشیانە کە لە ژیانی دنیادا، خوا ڕێنمایی خۆی بە پێغەمبەردا ﷺ بۆ ناردن، بەڵام گوێیان پێ نەدا، ئێستاش ڕێنماییان بکەن بەرەو دۆزەخ، ئەوەی لە دنیادا ڕێنمایی خوا قبووڵ نەکات و وەرنەگرێ بۆ ئەوەی پێی بچێتە بەهەشت، لە دوارۆژدا ڕێنمایی دەکرێ بەرەوە دۆزەخ، چونکە (**الْهِدايَةُ: الدَّلالَةُ عَلَى الطَّرِيقِ لِمَنْ لا يَعْرِفُهُ**) (**هِدَايَة**): بریتیە لە ڕێپیشاندان بۆ یەکێك کە ڕێ پێ نەزانێ.

٤)- ﴿ وَقِفُوهُمۡ ﴾، هەروەها بیانوەستێنن، ڕایانوەستێنن با نەڕۆن.

(**وَقَفَ**) یانی: وەستا، ڕاوەستا.

٥)- ﴿ إِنَّهُم مَّسۡـُٔولُونَ ﴾، بە دڵنیایی لێپرسراوەن، لێیان دەپرسرێتەوە، واتە: پرسیاریان لێ دەکرێ، بێگومان پرسیار لێکران لەو ڕۆژەدا، لە ستەمکاران بە هەموو شێوەکانیانەوە، بە ئەهلی کوفرو شیرك و ئیلحادو، دەستدرێژیی و ... هتدەوە، پرسیارکردنی وەڵام وەرگرتنەوە نیە، ئەرێ فلانکەس! تۆ فلان کارەت کرد، یان نەتکرد؟ لەو بارەوە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَا يُسۡـَٔلُ عَن ذُنُوبِهِمُ ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴿٧٨﴾ ﴾**القصص**، لەو ڕۆژەدا تاوانباران لە گوناهەکانیان لێیان ناپرسرێتەوە، واتە: لێیان ناپرسرێتەوە کە ئایا تۆ فلان کارەت کردوە، یان نەتکردوە؟ بەڵام لێیان دەپرسرێ: پرسیار کردنی سەرزەنشتکردن، پرسیار کردنی نائومێد کردن، پرسیار کردنی قسەی زبر لەگەڵ کردن و ڕیسوا کردن.

کەواتە: دەبێ بزانین کە ئەوە بە هیچ جۆرێك تێکگیران نیە، وەك هەندێك خەڵکی سادەو سەرکێڵ گوتوویانە: لە قورئاندا لە شوێنێك دەفەرموێ: ﴿ وَلَا يُسۡـَٔلُ عَن ذُنُوبِهِمُ ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴿٧٨﴾ ﴾**القصص**، لە شوێنێکیش دەفەرموێ: ﴿ وَقِفُوهُمۡ

﴿إِنَّهُم مَّسْـُٔولُونَ﴾؟ چونکە کە دەفەرموێ: ڕایانگرن، لێیان دەپرسرێتەوە، واتە: پرسیار کردنی سەرزەنشتکردن و، قسەی زبر لەگەڵ کردن و ڕیسوا کردن و شەرمەزار کردن، کە دەشفەرموێ: تاوانباران لە گوناهەکانیان لێیان ناپرسرێتەوە، یانی: لێیان ناپرسرێ: ئایا تۆ ئەو گوناهەت کردوە، یان نەتکردوە؟ چونکە هەموو شتێك تۆمار کراوە، بە دەنگ و وێنەوە تۆمار کراوە، بە هەموو شێوەکانی تۆمار کردن، چ ئەوەی ئێمە ئێستا دەزانین چۆنە، چ ئەوەی کە ناشزانین چۆنە، کارو ڕەفتارەکان بە هەموو شێوەکان تۆمار کراون و، هیچ کەس بواری نکووڵییکردنی نیە.

٦)- ﴿مَا لَكُمْ لَا تَنَاصَرُونَ﴾، (پێیان دەگوترێ:) بۆچی یەکدی سەرناخەن؟ ئەم ڕستەیە گوتراوی قسەیەکی قرتێنراو (**مَقُولُ قَوْلٍ مَحْذُوف**)ە، بۆچی یارمەتی یەکدی نادەن؟ بۆچی پشتگیریی یەکدی ناکەن؟ خوێندراویشەتەوە: (**مَا لَكُمْ لاَ تَنَّاصَرُون**)، (**تَنَّاصَرُون**) یانی: (**تَتَناصَرُون**) کە مانایەکەیان هەر یەکە، بۆچی پشتی یەکدی ناگرن و هاوکاریی یەکدی ناکەن ئەی پەرستراوو پەرستەرەکان؟ یاخود ئەی سەرکردەو شوێنکەوتووە لاساییکەرەوەکان! بۆچی هاوکاری یەکدی ناکەن و بەرگریی لە یەکدی ناکەن؟ ئەم پرسیار کردنەش دیسان پرسیار کردنە، بۆ سەرزەنشتکردن و، سەرچەنگدان و بە چاودادانەوەو، شەرمەزار کردن.

٧)- ﴿بَلْ هُمُ الْيَوْمَ مُسْتَسْلِمُونَ﴾، بەڵکو ئەوان ئەمڕۆ، (کە ڕۆژی سزاو پاداشت و لێپرسینەوەیە) خۆبەدەستەوەدەرن.

(**مُسْلِم**) واتە: ملکەچ، (**مُسْتَسْلِم**) واتە: زۆر خۆملکەچکەرو خۆبەدەستەوەدەر، بە شێوەیەك کە جینگڵ[1] نادەن و موویان لێ نالەخشێ، بە شێوەیەك کە بە تەواویی خۆیان بە دەستەوە داوەو، دەستیان لە هەموو پچکان بڕاوەو، نائومێد بوون.

---

(١) چینگڵ دان: خۆبزاوتن، جووڵەیەکی کەم.

کە دەفەرموێ: ﴿ بَلْ هُمُ ٱلْيَوْمَ ﴾، (إظهار اليَوْم) دەرخستنی ڕۆژەکە، بۆ سەرزەنشتکردنە، ئەمڕۆ ئەو ڕۆژەیە کە نکوولّییان لێدەکرد، بێ، کە بریتیە لە ڕۆژی سزاو پاداشت، ئەوان ئەمڕۆ خۆبەدەستەوەدەرن.

دیارە وشەی (بَلْ) بۆ گواستنەوە (إضْرَاب)یە، لە حاڵێك بۆ حاڵێکی دیکە، واتە: نەك هەر یارمەتیی یەکدی نادەن، نەك هەر ناگونجێ پشتی یەکدی بگرن و، هاوکاریی یەکدی بکەن، چ پەرستەرو پەرستراوەکان، چ سەرکردەو دەمڕاست و شوێنکەوتوە لاساییکەرەوەکان، نەك ناتوانن هاوکاریی یەکدی بکەن، بەڵکو ئەمڕۆ هەموویان خۆ بەدەستەوەدەرن، وەك گوتم: (إسْتِسْلَام)یش زێدەڕۆیی کردنە لە تەسلیم بوون و، ملکەچ بوون و سەرنەوی کردن دا، واتە: بە تەواویی خۆیان بە دەستەوەداوەو، دەستیان لە هەموو پچکان بڕاوەو، ئەژنۆیان شکاوە.

خوا بمانپارێزێ لەوە کە تووشی ئەو ڕۆژە ڕەشەببین، بە نسبەت بێبڕوایانەوە، ئەگەرنا دیارە هەر ئەو ڕۆژە بۆ بڕوادارانی چاکەکار، خۆشترین ڕۆژە، ڕۆژی شادمانیی و دڵخۆشییە، خوا لەو ڕۆژەدا دڵخۆش و شادمانمان بکات بە لوتف و کەرەمی خۆی، ئەویش بەوە دەبێ کە ئێستا خەمی ئەو ڕۆژەمان لەبەر بێ، ئێستا کاری وا بکەین کە لەو ڕۆژەدا، بۆمان ببێ بە مایەی شادمانیی و دڵخۆشیی.

## پێناسەی ئەم دەرسە

بەڕێـــزان!

ئـەم دەرسـەمان لـە بیسـت و سـێ (٢٣) ئایـەت پێکـدێ، کـە بریتیـن لـە ئایەتـەکانی: (٢٧ - ٤٩)، کـە سـەرەتا لـە هەشـت ئایەتـی یەکەمـدا (٢٧ - ٣٤) باسـی قسـەو دەمەقاڵێـی دۆزەخییـان دەکات، کـە شـوێنکەوتووان ڕەخنـە لە سـەرکردەکانیان دەگـرن، کـە گومڕایـان کـردوون و، ئەوانیـش بەرپەرچیـان دەدەنـەوەو، خـوای دادگەریـش ڕایدەگەیەنـێ کـە هەموویـان لـە سـزادا هاوبەشـن و، تاوانبارانیـش هـەر ئەوەیـان لەگـەڵ دەکـرێ، کـە شایسـتەیانە.

دوایـی لـە پێنـج ئایەتـی دوای ئەوانـدا (٣٥ - ٣٩) باسـی هـۆکاری ئـەو جـۆرە سـزادان و سـەرەنجامە شـوومەیان دەکـرێ، کـە بریتـی بـووە لـە خۆبەزلگرییـان لـە بەرانبـەر خـوا بەیەکگرتنـداو، تۆمەتبارکردنـی پێغەمبـەری خـوا موحەممـەد ﷺ بـەوە کـە شـاعیرە.

پاشـان لـە دە ئایەتـی کۆتایـی دا (٤٠ - ٤٩) باسـی پاداشـتی بـەرزو نـاوازەی بـڕواداران کـراوە، کـە بـە بەنـدە سـاغبووەوەکانی خـوا (عِبادُ اللهِ المُخْلَصِين) وەسـف و پێناسـەکراون.

خـوا بـە لوتـف و کەرەمـی خـۆی ئێمـە لـە بەنـدە سـاغبووەوەکانی خـۆی (عِبادُ اللهِ المُخْلَصِين) بکێـڕێ و، ئێمـە لـە بەنـدە خۆسـاغکەرەوەکانی خـۆی (عِبادُ اللهِ المُخْلِصِين) بکێـڕێ.

﴿ وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ ﴿٢٧﴾ قَالُوٓا۟ إِنَّكُمْ كُنتُمْ تَأْتُونَنَا عَنِ ٱلْيَمِينِ ﴿٢٨﴾ قَالُوا۟ بَل لَّمْ تَكُونُوا۟ مُؤْمِنِينَ ﴿٢٩﴾ وَمَا كَانَ لَنَا عَلَيْكُم مِّن سُلْطَـٰنٍۭ ۖ بَلْ كُنتُمْ قَوْمًا طَـٰغِينَ ﴿٣٠﴾ فَحَقَّ عَلَيْنَا قَوْلُ رَبِّنَآ

إِنَّا لَذَآئِقُونَ ﴿٣١﴾ فَأَغْوَيْنَٰكُمْ إِنَّا كُنَّا غَٰوِينَ ﴿٣٢﴾ فَإِنَّهُمْ يَوْمَئِذٍ فِى ٱلْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ ﴿٣٣﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَفْعَلُ بِٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٣٤﴾ إِنَّهُمْ كَانُوٓا۟ إِذَا قِيلَ لَهُمْ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ ﴿٣٥﴾ وَيَقُولُونَ أَئِنَّا لَتَارِكُوٓا۟ ءَالِهَتِنَا لِشَاعِرٍ مَّجْنُونٍۭ ﴿٣٦﴾ بَلْ جَآءَ بِٱلْحَقِّ وَصَدَّقَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٣٧﴾ إِنَّكُمْ لَذَآئِقُوا۟ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَلِيمِ ﴿٣٨﴾ وَمَا تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٣٩﴾ إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٤٠﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ رِزْقٌ مَّعْلُومٌ ﴿٤١﴾ فَوَٰكِهُ وَهُم مُّكْرَمُونَ ﴿٤٢﴾ فِى جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٤٣﴾ عَلَىٰ سُرُرٍ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴿٤٤﴾ يُطَافُ عَلَيْهِم بِكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍۭ ﴿٤٥﴾ بَيْضَآءَ لَذَّةٍ لِّلشَّٰرِبِينَ ﴿٤٦﴾ لَا فِيهَا غَوْلٌ وَلَا هُمْ عَنْهَا يُنزَفُونَ ﴿٤٧﴾ وَعِندَهُمْ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ عِينٌ ﴿٤٨﴾ كَأَنَّهُنَّ بَيْضٌ مَّكْنُونٌ ﴿٤٩﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{(لە نێو دۆزەخ دا بێبڕوایەکان) بە مشت و مڕو پرسیار لە یەکدی کردنەوە، ڕوویان لە یەکدی کرد ﴿٢٧﴾ (شوێنکەوتووەکان) گوتیان: (بەسەرکردەکان) بێگومان ئێوە لە لای ڕاستەوە (بە ناوی دابینکردنی خێرو بەرژەوەندییەوە) دەهاتنە لامان (بۆیە فریومان خوارد بە قسەی ئێوە) ﴿٢٨﴾ (سەرکردەکان) گوتیان: بەڵکو هەر خۆتان بڕوادار نەبوون ﴿٢٩﴾ ئێمە هیچ دەستەڵاتێکمان بەسەرتاندا نەبوو، بەڵکو خۆتان کۆمەڵێکی یاخیی و سەرکەش بوون ﴿٣٠﴾ ئیدی سەرەنجام فەرمایشت (و بڕیار)ی پەروەردگارمان لەسەرمان چەسپا (کە هەر کەس خراپەکاربێ، دەبێ سزا بدرێ)، بۆیە ئێمە چێژەر (ی سزا)ین ﴿٣١﴾ خۆمان بێمرادو سەرگەردان بووین، و ئێوەیشمان بێمراد کرد ﴿٣٢﴾ ئنجا بێگومان ئەوان (شوێنکەوتووان و سەرکردەکان) لەو ڕۆژەدا لە سزاو ئازارەکەدا هاوبەشن ﴿٣٣﴾ ئێمە بەو جۆرە بە تاوانباران دەکەین (و بەو مەرەدەیان دەبەین) ﴿٣٤﴾ ئەوان کاتی خۆی کە دەگوترا: جگە لە خوا هیچ پەرستراوێك (ی شایستەی پەرستران) نیە، خۆیان بەزلدەگرت ﴿٣٥﴾

هەروەها دەیانگوت: ئایا ئێمە وازلێهێنەری پەرستراوەکانمان بین بۆ شاعیرێکی شێت؟ ﴿٣٦﴾ (ڕاست ناکەن) بەڵکو ئەو (موحەممەد ﷺ) هەقی (لە خواوە) هێناوەو گشت پێغەمبەرانی بە ڕاست داناون ﴿٣٧﴾ (ئەی بێبڕواینە!) بە دڵنیایی ئێوە چێژەری ئازاری بە ئێش و ژانن ﴿٣٨﴾ تەنیا سزای ئەوەشتان دەدرێ کە کردووتانە (لە خراپە) ﴿٣٩﴾ (سەرجەم مرۆڤە خراپەکارەکان ئەوە سزایانە) جگە لە بەندە ساغکراوەکانی خوا ﴿٤٠﴾ ئەوانە بژێوێکی زانراویان هەیە (لە ڕووی ئەندازەو چۆنییەتییەوە ناسراوەو ناوداره) ﴿٤١﴾ میوە (جۆراو جۆره)کان (یان هەن)و، ڕێزو حورمەت لێگیراویشن ﴿٤٢﴾ لە بەهەشتە پڕ نازو نیعمەتەکاندا (نیشتەجێن) ﴿٤٣﴾ لەسەر تەختان ڕووبەڕووی یەکدی (پاڵیان داوەتەوە) ﴿٤٤﴾ لە پەرداخی پڕ (لە شەڕاب) لە کانیی و سەرچاوە بەسەریانەوە دەگێردرێ ﴿٤٥﴾ سپیی و ساف و بە تام و چێژە بۆ خۆرەوانی ﴿٤٦﴾ نە ئازارو سەرئێشەی تێدایەو، نە بە هۆیەوە سەرخۆش دەبن ﴿٤٧﴾ ئافرەتانی چاوگەش و جوان و چاو (لەسەر مێردی خۆ) کورتهەڵێنەریان لەلان ﴿٤٨﴾ وەك هێلکەی (سپیی و سافی) شێردراوەن (لە نێو هێلانەدا) ﴿٤٩﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(طَاغِينَ): (طَغَى: تَجَاوَزَ الحَدَّ فِي العِصْيَان)، (طَغَى) واتە: لە سەرپێچیی کردندا لە سنوور دەرچوو.

(غَاوِينَ): (الغَيُّ: جَهْلٌ عَنْ اعْتِقَادٍ فَاسِدٍ، غَوِيَ: خَابَ وَفَسَدَ عَيْشُهُ، غَوِيَ الفَصِيلُ)، (غَاوِين) كۆی (غَاوِي)یە، واتە: سەرگەردان و بێمراد، (الغَيُّ): بریتیە لە نەزانین بە هۆی بڕوا پێبوونێکی خراپەوە، هەروەها (غَيّ): بریتیە لە پەشێمانیی و (غَيّ): بریتیە لە بێمرادیی، دەگوترێ: (غَوِيَ الفَصِيلُ) بەچکە حوشتر کاتێك ژیانی تێکدەچێت، یان شیری دایکی چنگ ناکەوێ، دەگوترێ: (غَوِيَ) واتە: بێمرادو بێبەش و سەر بە هەش بوو.

(سُرُرٍ): (سُرُر وَأَسِرَّة) هەردووکیان کۆی (سَرِير)ن، (السَّرِيرُ: مَا يُجْلَسُ عَلَيْهِ) ئەوەی کە خەڵك لەسەری دادەنیشێ، ئایا فەرقی چییە لەگەڵ کورسی و قەنەفە؟ (سَرِير) ئەوەیە کە بواری شان لەسەر دادان و پاڵکەوتنیشی هەیە، کە کاتی خۆی ئەوە بۆ پادشاو حوکمڕانەکان، بۆ خەڵکی زۆر خۆشگوزەران بووە، ئێستاش هەر وایە، نەك تەنیا جێی دانیشتن بێ، بەڵکو جێی پاڵکەوتن و شان لەسەر دادانیشە.

(بِكَأْسٍ): (الكَأْسُ: الإِنَاءُ بِمَا فِيهِ مِنَ الشَّرَاب)، (كَأْس): بریتیە لە دەفرێك کە شەڕابێکی تێدا بێ، ئنجا پێی دەگوترێ: (كَأْس)، (وَسُمِّيَ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا بِمُفْرَدِهِ، كَأْسًا) هەندێکیش دەڵێن: هەر کامێکیان واتە: بە خاڵییەتییش پێ دەگوترێ: (كَأْس)و شەڕابەکەش کە لە نێو ئەو دەفرەدایە، هەر پێی دەگوترێ: (كَأْس)، بە کوردیی دەگوترێ: پەرداخ، پێك.

(مَعِينٍ): (ظَاهِرٌ لِلْعُيُون) ئاشکرایە، بینراوە بۆ چاوەکان، یاخود (مَعِين أي: عَالِن) واتە: (سَائِل) لەبەرچاوەو دەڕوات، دەڕژێ.

(لَذَّةٍ): (اللَّذَّةُ: إِسْمٌ مَعْنَاهُ إِدْرَاكُ مُلاَئِمٍ لِنَفْسِ المُدْرِكِ) (لَذَّة): نـاوە، مانایەکـەی بریتیـە لـەوەی بابـای چێـژەر تامـی لـێ بـکات، (لَذَّهُ وَلَذَّ بِهِ) واتـە: چێژتـی و پێـی چێـژدار بـوو، (وَالمَصْدَرُ: اللَّذَّةُ وَاللَّذَادَةُ)، (اللَّذَّةُ وَاللَّذَادَة) هەردووکیـان چاوگـن، (لَذَّ وَلَذِيذ): هەردووکیـان نـاون (طَعَامٌ لَذٌّ أَو طَعَامٌ لَذِيذٌ) خواردنێـکی خـۆش و بەتـام، بەچێـژ.

(غَوْلٌ): (الغَوْلُ: مَا يَعْتَرِي شَارِبَ الخَمْرِ مِنَ الصُّدَاعِ وَالأَلَمِ)، (غَـوْل): بابـای شـەڕابخۆر ئـەو سـەر ئێشـەو ئـازارەی تووشـی دێ، پێـی دەگوتـرێ: (غَـوْل)، (وَغَالَهُ: أَهْلَكَهُ) فەوتانـدی، کەواتـە: ﴿ لَا فِيهَا غَوْلٌ ﴾، واتـە: نـە سەرئێشـەو ئـازاری تێدایـە، نـە بەهـۆی ئـەو خواردنـەوەوە، فەوتانیشـی تێدایـە وەك شـەڕابی دنیـا.

(يُنزَفُونَ) بـە: (يُنْزِفُون)یـش خوێندراوەتـەوە، (نُزِفَ الشَّارِبُ، فَهُوَ مَنْزُوفٌ وَنَزِيفٌ) واتـە: سـەرخۆش بـوو، (وَأَنْزَفَ الشَّارِبُ: ذَهَبَ عَقْلُهُ) بێهـۆش بـوو، سـەرخۆش بـوو (صَارَ ذَا نَزْفٍ)، دەگوتـرێ: فڵانکـەس نەزیـف بـوو واتـە: خوێنەکـەی لەبـەر ڕۆیشـتوە، کەواتـە: (وَأَنْزَفَ الشَّارِبُ) وەك چـۆن بابایـەك کـە برینـی تێدەبـێ، خوێنـی لەبـەر دەڕواو خوێنـی تێـدا نامێنـێ، سەرخۆشـیش عەقڵـی تێـدا نامێنـێ و، لـەو کاتـەدا عەقڵەکـەی خـۆی لـە دەسـت دەدات.

(أَنْزَفَ يُنْزِفُ) هـۆش و عەقڵـی نەمـا، عەقـڵ و هـۆشی خـۆی نەهێشـت (أَنزف يُنْزَفُ) عەقـڵ و هـۆشی چـوو، عەقـڵ و هـۆشی نەهێڵـرا.

(قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ): (حَابِسَاتُ أَنْظَارِهِنَّ حَيَاءً وَغَنَجاً) واتـە: چـاوی خۆیـان کـورت کردۆتـەوە لەسـەر هاوسـەرەکانیان، یاخـود زۆر چـاو نابڕنـە پیـاوان وەك شـەرم و شـکۆ، نـاز کـردن، کـە ئـەوە سـیفەتێکی جوانـە لـە ئافرەتانـدا، (طَرْفُ العَيْنِ: جَفْنُهُ، وَالطَّرْفُ: تَحْرِيكُ الجَفْنِ، وَعُبِّرَ بِهِ عَنِ النَّظَرِ)، (طَرْف): لـە ئەصڵـدا بـە مانـای پێڵـووی چـاو دێ، جـاری واش هەیـە بـە مانـای جووڵاندنـی پێڵـووی چـاو، چـاو نووقانـدن و کردنـەوە، دێ، جـاری واش هەیـە وشـەی (طَرْف) بـە مانـای سـەرنجدان و تەماشـا کـردن دێ.

(عِينٌ): (عِينٌ جَمْعُ عَيْنَاءُ: الْمَرْأَةُ الْوَاسِعَةُ الْعَيْنِ) (عَيْنَاءُ) ئافرەتێك، کە چاوی گەش و گەورە و جوان بێ، (عَيناء) بە (عِين) کۆدەکرێتەوە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

شایانی باسە: لە ئایەتی بیست و حەوتەوە کە دەست پێدەکات، تاکو (٤٩) لە بارەی دۆزەخییانەوەیە، دەفەرموێ: ﴿ وَأَقْبَلَ ﴾، بە واوی بادانەوە (واو العطف) دەست پێدەکات، یانی: هەروەها ڕوویان لەیەکدی کرد، ئەوانەی لە دۆزەخدان ڕوویان کردە یەکدی، بۆ یەکدی دواندن، ئەوە بە نسبەت دۆزەخییان، بەڵام لە ئایەتی پەنجا (٥٠) بەرەو ئەولا، کە لە دەرسی دیکەدا دێ، لە بارەی بەهەشتییانەوەیە، لەوێ دەفەرموێ: ﴿ فَأَقْبَلَ ﴾، چونکە لێرەدا دوای حەشرو حیساب و کۆکردنەوە لە دۆزەخدا، ئنجا ئەوانە یەکدی دەدوێنن، واتە: دوای ئەوەی لە دۆزەخدا نیشتەجێ بوون، ماوەیەکی پێدەچێ ئنجا لەو حاڵەدا ئەهلی دۆزەخ ڕوویان لە یەکدی کردو، دەستیان کرد بە یەکدی دواندن، بەڵام بە نسبەت بەهەشتییانەوە، دوای ئەوەی لە بەهەشتدا نیشتەجێ دەبن، بە پیتی (ف) هێناویەتی ﴿ فَأَقْبَلَ ﴾، چونکە ئەوانەی لە خۆشییدا پێکەوە دادەنیشن، یەکسەر دوای پێکەوە دانیشتن، دەست دەکەن بە قسەی خۆش و یەکدی دواندن.

خوا ﷻ لەم بیست و سێ ئایەتەدا سەرەتا باسی سەرەنجامی شوومی ستەمکاران و تاوانباران دەکات، دواییش باسی سەرەنجامی پڕ نازو نیعمەتی چاکەکاران و بڕواداران دەکات، سەرەتا دەفەرموێ: ﴿ وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَآءَلُونَ ﴾، دوای ئەوەی ئەوانە زیندوو کرانەوەو، کۆکرانەوە بۆ سزادران لە دۆزەخداو خرانە دۆزەخەوە، لەو حاڵەدا هەندێکیان ڕوویان لە هەندێکیان کرد، دەستیان کرد بە پرسیار لە یەکدی کردن، بەڵام پرسیار لە یەکدی کردنەکەیان، بۆ سەرزەنشت و ڕەخنە لێکدی گرتنەو، پرتەو بۆڵە پێکەوە کردنە.

﴿ قَالُوٓاْ إِنَّكُمۡ كُنتُمۡ تَأۡتُونَنَا عَنِ ٱلۡيَمِينِ ﴾، گوتیان: بە دڵنیایی ئێوە لە لای ڕاستەوە بۆ ئێمە دەهاتن، ڕوونکەرەوانی قوڕئان چەند واتایەکیان بۆ ئەم قسەیە لێکداوەتەوە:

أ- هەندێکیان گوتوویانە: واتە: ئێوە بە زۆرو بە هێز بۆ ئێمە دەهاتن.

ب- بەڵام هەندێکیان گوتوویانە: واتە: ئێوە بەو ناوەوە کە خێرو خۆشیی و بەرژەوەندیی ئێمەی تێدایە، ئێمەتان دەدواند، بۆیە ئێمە شوێنتان کەوتین لە کوفرو گومڕاییدا، دیارە ئەوە شوێنکەوتووە لاساییکەرەوە هەڵخەڵەتاوەکانن، ڕەخنەی دەگرن لە دەمڕاست و سەرکردەکانیان.

ئەوانیش یەکسەر وەڵام دەدەنەوە: ﴿ قَالُواْ ﴾، واتە: دەمڕاست و سەرکردەکانیان گوتیان: ﴿ بَل لَّمۡ تَكُونُواْ مُؤۡمِنِينَ ﴾، بەڵکو خۆتان بڕوادار نەبوون، واتە: خۆتان دانووتان لەگەڵ کوفرو شیرك دا دەکوڵی و، خۆتان عەوداڵ و تامەزرۆی ئەو ڕێبازی کوفرو شیرکە بوون، کە ئێمە لەسەری بووین، بۆیە ئێوە بەویستی خۆتان شوێنمان کەوتن، ﴿ وَمَا كَانَ لَنَا عَلَيۡكُم مِّن سُلۡطَٰنِۢ ﴾، ئێمە هیچ دەستەڵاتێکمان بەسەر ئێوەدا نەبوو، ﴿ بَلۡ كُنتُمۡ قَوۡمٗا طَٰغِينَ ﴾، بەڵکو خۆتان کۆمەڵێکی یاخیی وسەرکێش بوون، لە بەرانبەر خوادا سەرکێش بوون و، لە سەرپێچییدا سنوورەکانتان هەموو بەزاندبوون.

﴿ فَحَقَّ عَلَيۡنَا قَوۡلُ رَبِّنَآۖ ﴾، فەرمایشتی پەروەردگارمان لەسەرمان چەسپا، کە بریتیە لەوەی هەرکەسێك ئەهلی کوفر بێ، دەبێ سزا بدرێ، هەر کەسێك ئەهلی شیرك بێ دەبێ سزا بدرێ، هەموو تاوانبارو ستەمکاران دەبێ سزا بدرێن، خراپەکاران شوێنیان دۆزەخە، ئەو بڕیارو فەرمایشتەی پەروەردگارمان لەسەرمان چەسپا، لە ئەنجامی ئەوەدا کە بۆخۆمان بە دەستمان هێنا، ئێمەش و ئێوەش، ﴿ إِنَّا لَذَآئِقُونَ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە چێژەرین، واتە: چێژەرین بۆ ئەو سزایەی خوا کە بە دادگەرانەو کاربەجێیانە بڕیاری داوە، کە هەر کەسێك بەو ڕێیەدا بڕوات، ئەوە سزایەتی، ئێمەش و ئێوەش بە دەست خۆمان بوو، ئەو ڕێیەمان

گـرت، ﴿ فَأَغْوَيْنَٰكُمْ إِنَّا كُنَّا غَٰوِينَ ﴾، ئێوەمـان بێمـرادو سـەرگەردان کـرد، خۆشـمان هـەر بێمـرادو سـەرگەردان بووین، هـەر کەسێك گیرفانـی چـی تێدابێ، لـەوە دەبەخشێ، ئێمـە بـەس گومڕایـی و سـەرگەردانییمان پـێ بـوو، ئێـوەش شـوێنمان کەوتـن، بـەڵام بـە ویستی خۆتـان شـوێنمان کەوتـن، دەشـتانتوانی لـە جیاتـی ئـەوەی، شـوێن ئێمەی سـەرگەردان و بێمـرادو بـەڕێ نـەزان و لادەرو تاوانبـار بکـەون، شـوێن کەسـانێك بکـەون کـە ڕێنمایـی خوایـان پێیە، بـەڵام خۆتـان حەزتـان بـەو ڕێبـازەی ئێمـە بـوو، حەزتـان بـە شـوێن کەوتنـی ئێمـە بـوو!

وەڵامێکی ددانشکێنیان دەدەنەوە.

ئنجـا خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ فَإِنَّهُمْ يَوْمَئِذٍ فِي ٱلْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ ﴾، بـە دڵنیایـی ئـەوان لـەو ڕۆژەدا، لـە سـزادا هاوبەشـن، لـە ئازاردرانـدا هاوبەشـن، ﴿ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَفْعَلُ بِٱلْمُجْرِمِينَ ﴾، ئێمـە بـەو شێوەیە لـە تاوانبـاران دەکەیـن، ئـاوا سـزایان دەدەیـن، پێکەوە هاوبەشـیان دەکەیـن لـە سـزادا، چ دەمڕاسـت و پەیڕەویـی لێکـراوەکان، چ شـوێنکەوتوو و لاسـاییکەرەوەکان.

﴿ إِنَّهُمْ كَانُوٓا۟ إِذَا قِيلَ لَهُمْ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ ﴾، بـە دڵنیایـی ئـەوان عادەتیـان وابـوو، ئەگـەر گوترابایـە: بێجگـە لـە خـوا هیـچ پەرسـتراوێك نیـە، خۆیـان بـە زلدەگـرت، خۆیـان لـە بەرانبـەر بەندایەتیـی بـۆ خـوادا بـە زلدەگـرت، کەچـی لـە بەرانبـەر کۆیلایەتیـی بـۆ حوکمڕانـانی زۆردارو خۆسـەپێن دا، تـووك نـەرم و نەرمۆڵـە بـوون، بـەڵام لـە بەرانبـەر خـوادا ﷻ کـە کـەون و کائینـات و، دنیـاو دواڕۆژی بـە دەسته، خۆیـان بـە زلدەگـرت، کەچـی لـە بەرانبـەر تاغـوت و فیرعەونێـك، بەڵکـو لـە بەرانبـەر حیزبێـك و ڕژێمێـك، بەڵکـو لـە بەرانبـەر هـەواو ئارەزووێـك، لـە بەرانبـەر بەرژەوەندییەکـی ناشـەرعیی دا، تەسـلیم دەبـوون، بـۆ زار چەورکردنێـك و چەپڵـەو ئافەرینێـك، ملکـەچ دەبـوون، دەسـتەمۆ دەبـوون، کەچـی بـۆ خـوا ﷻ ملکـەچ نەدەبـوون، کـە هەمـوو خێـرو خۆشـییەکیان و هەمـوو سـەربەرزیی و جوامێریـی و مەردایەتییەکیـان لـەوەدا بـوو، بەنـدەی خـوا بـن و، هەمـوو بەدبەختیـی و

پەشێمانییەکیان لەوەدا بوو کۆیلەی یەکدی بن، کۆیلەی شتەکان بن، کەچی ئەوان دەبوونە کۆیلەی مرۆڤەکان، یاخود کۆیلەو خزمەتکاری هەندێک لە دروستکراوەکانی دیکە، بەڵام لە بەرانبەر خوادا خۆیان بە زلدەگرت!

﴿ وَيَقُولُونَ أَئِنَّا لَتَارِكُوٓاْ ءَالِهَتِنَا لِشَاعِرٍ مَّجْنُونٍۭ ﴾، هیچ کەیفیان بە خوا بە یەکگرتن (توحید الله) نەدەهات و لە بەرانبەر گوتنی: (لاَ إِلـهَ إِلاَّ الله)دا خۆیان بە زلدەگرت، هەروەها لە بەرانبەر پێغەمبەریشدا ﷺ زۆر بێ ئینصاف بوون، دەیانگوت: ئایا ئێمە واز لێهێنەری پەرستراوەکانمان بین بۆ شاعیرێکی شێت؟ واتە: هەندێکیان دەیانگوت: شاعیر، هەندێکیان دەیانگوت: شێت، ئەگەرنا ئەوانەیان کە گوتبێتیان شاعیرە، نەیانگوتوە شێتە، ئەوانەش کە گوتبێتیان شێتە، نەیانگوتوە شاعیرە، بەڵام خوا قسەی هەردووك لایان کۆدەکاتەوە، هەندێکیان تۆمەتباریان کردوە بە شاعیرو، هەندێکیان تۆمەتباریان کردوە بە شێت، ئنجا خوا قسەی هەردووکیان کۆ دەکاتەوە، ئەو دوو قسانەش تێکگیراون، پێکەوە ناکۆکن، کەسێك شاعیر بێ، ناگونجێ شێت بێ و، کەسێکیش شێت بێ، ناگونجێ شاعیر بێ و قسەی بە ڕێ و جێ بکات، واتە: ئەوانە قسەی دژیەك (مُتَناقِض) و پێکەوە ناکۆکیان دەکرد، تۆمەتەکانیان کە بۆ پێغەمبەر ﷺ، بۆ موحەممەدیان ﷺ دەگوتن، یەکدییان هەڵدەوەشاندەوە، ﴿ بَلْ جَآءَ بِٱلْحَقِّ وَصَدَّقَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾، بەڵکو (موحەممەد ﷺ نە شاعیرەو نە شێتیشە) هەقی هێناوەو پێغەمبەران و ڕەوانەکراوانی پێش خۆی بە ڕاست داناوە، هەم خۆیان هەم پەیامەکانیان.

﴿ إِنَّكُمْ لَذَآئِقُواْ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَلِيمِ ﴾، بە دڵنیایی ئێوە چێژەری سزاو ئازاری بەئێشن واتە: ئەی بێبڕوایەکان! ئەی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان! ئەی ستەمکارەکان! بە سەران و شوێنکەوتووانەوە، بە دەمڕاست و لاساییکەرانەوە، بە پەیڕەویی لێکراوان و پەیڕەوییکەرانەوە، هەمووتان چێژەری ئازاری بە ئێشن، ئنجا ئازار بۆ خۆی هەر بە ئێشە، مانای وایە ئازارێکی زۆر زۆر بە ئێش و ژانە، ﴿ وَمَا تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾، بەرانبەریشتان نادرێتەوە، قەرەبووتان نادرێتەوە، مەگەر بە

پێـی ئـەوە کـە دەتانکـرد، واتـە: ئـەو سـزایە پڕ بـە پێسـتی کردەوەکانـی خۆتانـەو سـتەمتان لـێ ناکـرێ.

﴿ إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلۡمُخۡلَصِينَ ﴾، جگـە لـە بەنـدە ساغکراوەکانی خـوا، ئەمـە لـە ڕێزمانـی عەرەبیـی دا پێـی دەگوتـرێ: (إستثناءٌ مُنْقَطِع) هەڵاواردنێکـی دابـڕاو، چونکـە بەنـدە بـۆ خـوا سـاغبووەوەکان، بەنـدە هەڵبژێردراوەکانـی خـوا، بەشـێك نیـن لەسـزادراوان، پاداشـتی ئـەوان جیایـە لـە سـزادانی خراپـەکاران، واتـە: بـەڵام بەنـدە سـاغبووەوەکان، بەنـدە هەڵبژاردەکانـی خـوا، ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ رِزۡقٞ مَّعۡلُومٞ ﴾، ئەوانـە نـەك سـزا نادرێـن، بەڵکـو ئەوانـە بژیوێکـی زانـدراوو ناسراویـان هەیـە، بژیوێـك کـە نـاودارە، نـاسراوە، هەمـوو کـەس دەزانـێ چۆنـە.

ئنجـا ڕوونیدەکاتــەوە ئــەو بژیــوە، ئــەو ڕزق و ڕۆزییــە چۆنــە؟ دەفەرمــوێ: ﴿ فَوَٰكِهُ ﴾، جۆرەکانــی میــوەن، میوەکانــن بــە هەمــوو جۆرەکانیانــەوە، بۆیــەش بــۆ نـازو نیعمەتـی بەهەشـت، خـوا ﷻ بـە زۆریـی باسـی میـوە دەکات، چونکـە میـوە لەبـەر خۆشـیی و لـەززەت و چێـژ وەرگرتـن دەخـورێ، نـەك بـۆ لابردنـی برسـیەتیی، هەروەهــا شــەڕابیش هــەر بــۆ خۆشــیی دەخــورێ، نــەك بــۆ لابردنــی تینوویەتیــی، نیعمەتەکانـی بەهەشـت وەك جـاری دیکـەش گوتوومانـە، بـۆ بابـای لـە برسـان مردوو و لـە تینـوان خنـکاو نیـن.

با لێرەدا قسەیەك بێنم کە لە یاداشت و بیرەوەرییەکانی خۆم دا گێڕاومەتەوە:

کاتــی خــۆی لــە ناوەندیــی، یــان ئامادەیــی پەیمانــگای ئیســلامیی بــووم لــە سـلێمانی، لـە دەرسـی عەقیـدەدا قوتابییـەك پرسـیاری لـە مامۆسـتا کـرد، لـە وەڵامـی قسـەیەکی مامۆسـتادا، کـە باسـی نیعمەتەکانی بەهەشـتی دەکـرد، بـە تایبـەت باسـی حـەوزی کەوسـەر، کـە هـەر کەسـێك لێـی بخواتـەوە، نـە هەرگیـز تینـووی دەبێتـەوە، نـە برسیشـی دەبێتـەوە.

ئەویش گوتی: مامۆستا! کەواتە ئەو نیعمەتانەی لە بەهەشت هەن، ئەو خواردن و خواردنەوانە، مادام ئینسان نە تینووی ببێتەوە، نە برسیشی ببێتەوە، کەواتە دەچنە بەلاشێ و بەخۆڕایی لەوێن!

مامۆستا هەوڵیدا وەڵامی بداتەوە، بەڵام وەڵامەکەی پڕ بە پێست نەبوو.

منیش گوتم: مامۆستا! ئەگەر ئیجازەم بدەی با منیش وەڵامێکی بدەمەوە! گوتی: باشە وەڵام بدەوە، گوتم: کاکە گیان! هیچ جار وا نەبووە کە نانت خواردووەو تێر بووی، بەڵام شتێکیان گێڕاوە وەك شیرینیی و خواردووتە لە دوای نان خواردن؟ گوتی: با، گوتم: کەواتە: شیرینیی یان میوە کە لە دوای نان خواردن دەخورێ، بۆ لابردنی برسیەتیی نیە، بەڵکو تەنیا بۆ چێژو لەززەتە، ئەوە بۆ خواردنەکە.

گوتم: ئەدی هیچ جار وانەبووە تێرئاو بووی و تینوو نەبووی، بەڵام بەلای شەربەتخانەیەکدا تێپەڕیوی و، شەربەتی مێوژ یان هەر شەربەتێکی دیکەی میوەت خواردۆتەوە، بەبێ ئەوەی تینووشت بێ؟ گوتی: با، هەروەها گوتم: جاری وا نەبووە لە کۆڕو مەجلیسدا شتێکیان گێڕاوە، تۆ پێشێ واتزانیوە ئاوە، گوتووتە: تینووم نیە، گوتوویانە: ئەوە ماستاوە، یان شەربەتە، گوتووتە: مادام وایە دەیخۆمەوە؟ گوتی: با، گوتم: نیعمەتەکانی بەهەشت چ خواردنەکانی، چ خوراوەکانی، (شلەمەنییەکان) بۆ خەڵکی برسیی و تینوو نین، بەڵکو تەنیا بۆ ئەوە دەخورێن و دەخورێنەوە، کە چێژیان لێ وەربگرن!

ئیدی ئەو قوتابییەش قەناعەتی هات.

لێرەش کە خوا دەفەرموێ: ئەو بژیوە زاندراوە بۆ بەندە هەڵبژاردەکانی خوا هەیە، بەوە ڕوونی دەکاتەوە دەفەرموێ: ﴿فَوَٰكِهُ﴾، جۆرە میوەکانن، ﴿وَهُم مُّكْرَمُونَ﴾، ئەوان ڕێز لێگیراویشن، واتە: نیعمەتەکان وەك چۆن پەیوەندییان بە جەستەیانەوە هەیە، پەیوەندییان بە ڕووح و ناخیشیانەوە هەیە، واتە: ڕێز لێگیراویشن لە ڕووی مەعنەوییەوە.

﴿ فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴾، لـە نێـو باغـە هەمیشـەییەکاندان، (جَنَّـات) کـۆی (جَنَّـة) واتـە: بـاغ و بێسـتان، گـوڵ و گوڵـزار، دارو درەخـت، کـە پـڕە لـە نـازو نیعمـەت، ﴿ عَلَىٰ سُرُرٍ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴾، لەسـەر تەختـان، ڕووبـەڕووی یەکـدی دانیشـتوون، (سُرُر) کـۆی (سَریـر)ە، ئـەو تەختەیـە خەڵـك لەسـەری دادەنیشـێ و پاڵدەداتـەوە، شـان دادەدات، ﴿ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴾، ڕووبـەڕووی یەکدیـن.

﴿ يُطَافُ عَلَيْهِم بِكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ ﴾، بەسـەریانەوە دەگێـڕدرێ پەرداخێکـی پـڕ لـە خوراوەیـەك لـە کانیـی و سـەرچاوەیە، کانیـی و سـەرچاوەی شـەڕاب، یـان کانیـی و سـەرچاوەی هـەر کام لـە خواردنەوەکانـی دیکـە، بـەڵام لێـرەدا بـە پێـی سیاق دیـارە مەبەسـت پێـی شـەڕابە، دەفەرمـوێ: ﴿ بَيْضَآءَ لَذَّةٍ لِّلشَّٰرِبِينَ ﴾، زۆر سـپییەو زۆر بـە چێـژو بەتامـە بـۆ خۆرەوانـی، کەسـانێك کـە دەیخۆنـەوە، ﴿ لَا فِيهَا غَوْلٌ وَلَا هُمْ عَنْهَا يُنزَفُونَ ﴾، نـە سەرئێشـەو ئـازاری تێدایـەو، نـە بـە هۆشـیەوە سـەرخۆش دەبـن و عەقڵیـان لـە دەسـت دەدەن، بـە پێچەوانـەی شـەڕابی دنیـاوە، کـە هـەم تووشـی شەرئێشـەو نازاریـان دەکات، بەڵکـو جـاری وا تووشـی مـردن و مەرگیـان دەکات، هـەم عەقڵیشـیانی پـێ لـە دەسـت دەدەن و، بـەو شـەڕابە کـە دەیخۆنـەوە، خۆیـان دەبەنـە ڕیـزی ئـاژەڵ، کـە مـرۆڤ بـە عەقـڵ مرۆڤـە، بـەڵام ئـەوان بـە پـارەو ئیمکانیەتـی خۆیـان، شـەڕاب دەکـڕن و خۆیـان دەبەنـە ڕیـزی ئـاژەڵ، ئنجـا ئەفەنـدی خۆشـی بـە ڕۆشـنبیرو شـارەزاو خوێنـدەوار دەزانـێ و، خۆشـی پـێ لـە خەڵکـی دیکـە ئاسـتبەرزترە، لـە حاڵێکـدا کـە بـە دەسـتی خـۆی خـۆی بێعەقـڵ کـردوە، بـە دەسـتی خـۆی ئـەوەی کـە پێـی بۆتـە مـرۆڤ و پێـی لـە ئـاژەڵ جیابۆتـەوە، ئـەو ئیمتیـازەی لـە خۆیـدا نەهێشـتوە!!

ئنجـا خـوا لـە کۆتایـی دا دەفەرمـوێ: ﴿ وَعِندَهُمْ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ عِينٌ ﴾، لـە لای ئـەو بەهەشـتیانە ئافرەتانێـك هـەن کـە چـاوی خۆیـان کـورت کردۆتـەوە، واتـە: چـاوی خۆیـان لەسـەر مێردەکانیان کـورت کردۆتـەوەو، چـاو نابڕنـە پیاوانـی دیکـە، زۆریـش چاویـان گـەش و جوانـن، ﴿ كَأَنَّهُنَّ بَيْضٌ مَّكْنُونٌ ﴾، دەڵێـی هێلکـەی شـێردراوەن، دەڵێن:

هێلکەی حوشترمەل تووکی بۆ ڕادەخات و جوان دەیشارێتەوە، زۆر سپیی و سافە، هیچ تۆزو گەردی پێوە نانیشێ، هەروەها هێلکەی هەموو باڵندەکانی دیکەش بە هەمان شێوەن، هەروەها ئەو ئافرەتانە وەك گەوهەری نێو سەدەفن، وەك دەفەرموێ: ﴿كَأَنَّهُمْ لُؤْلُؤٌ مَّكْنُونٌ ﴿٢٤﴾﴾الطور، وەك هێلکەی پەنهان و گەوهەری نێو سەدەف، ئاوا سپیی و ساف و جوان و بێگەردن.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی لە ئازارو مەینەتییەك کە بۆ دوژمنان و ناحەزانی ئامادەی کردوە لە دۆزەخ دا، بمانپارێزێ و چەپاڵەمان بدات و، لەو نازو نیعمەتانە کە بۆ دۆستانی خۆی و، بۆ خۆشەویستانی خۆی، کە بەندە هەڵبژاردەکانی، ئامادەی کردوون، بەهرەمەندمان بکات.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**دەمەقالێ و پرسیارو وەڵامی شوێنکەوتووان و سەرکردەکانی ئەهلی کوفرو شیرك، لە دۆزەخ داو، سەرەنجام دان بە تاواندا هێنانی دەمڕاستەکان، کە هەموویان خەتابارن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ ﴿٢٧﴾ قَالُوا إِنَّكُمْ كُنتُمْ تَأْتُونَنَا عَنِ الْيَمِينِ ﴿٢٨﴾ قَالُوا بَل لَّمْ تَكُونُوا مُؤْمِنِينَ ﴿٢٩﴾ وَمَا كَانَ لَنَا عَلَيْكُم مِّن سُلْطَانٍ ۖ بَلْ كُنتُمْ قَوْمًا طَاغِينَ ﴿٣٠﴾ فَحَقَّ عَلَيْنَا قَوْلُ رَبِّنَا ۖ إِنَّا لَذَائِقُونَ ﴿٣١﴾ فَأَغْوَيْنَاكُمْ إِنَّا كُنَّا غَاوِينَ ﴿٣٢﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ﴾، هەروەها هەندێکیان ڕوویانکردە هەندێکیان (یەکدییان دواند)، دوای ئەوەی کۆکردنەوەو سزاو پاداشت، دیارییکردن و، لێپرسینەوەی مرۆڤەکان تەواو دەبێ، ئنجا ئەوانەی ستەمکار بوون ڕوولەیەکدی دەکەن و دەست دەکەن بەگلەیی و گازندە لە یەکدی کردن، (و)ی (وَأَقْبَلَ) واوی بادانەوە (**واو العاطفة**)یەو، ئەم بابەتەی ئێرە دەگێڕێتەوە بۆ سەر بابەتی پێشێ واتە: دوای ئەوەی دەچنە دۆزەخەوە، هەندێکیان ڕوو دەکەنە هەندێکیان:

٢)- ﴿ يَتَسَاءَلُونَ ﴾، لە یەکدی دەپرسن، لە یەکدی پرسین واتە: پێکەوە قسە کردن و پرسیارو وەڵام، وتووێژ، بەڵکو جاری واش هەیە مەبەست پێی سەرزەنشت و سەرکۆنەکردنی یەکدییە لەمیانی لە یەکدی پرسین و پرسیارو وەڵامدا، کە لێرەدا وایە، ئنجا کە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ ﴾، یانی: (**وَفِي تِلْكَ الحَالَةِ البَائِسَة** ﴿ وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ

﴿عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَآءَلُونَ﴾) واتە: لەو حاڵەتە گرفتارییەدا، لەو حاڵەتە مەینەتبارەدا، بێبڕوایەکان هەندێکیان ڕوو دەکەنە هەندێك و، لە یەکدی دەپرسن:

٣)- ﴿قَالُوٓاْ إِنَّكُمْ كُنتُمْ تَأْتُونَنَا عَنِ ٱلْيَمِينِ﴾، گوتیان: بەدڵنیایی ئێوە بوون لەلای ڕاستەوە بۆمان دەهاتن. بە پێی سیاق دیارە کە ئەوە شوێنکەوتووەکانن، ئەوانەی پەیڕەوییان کردوە لە سەرانیان، لە دەمڕاستانیان، لە دۆزەخ دا ئەوە بە دەمڕاست و سەرکردەکانی خۆیان دەڵێن. زانایان چەند مانایەکیان بۆ واتای (لە لای ڕاستەوە بۆمان دەهاتن) لێکداونەوە:

١- واتە: بە ناوی خێرو چاکەوە بۆ لامان دەهاتن، چونکە (يُمْن) واتە: (الخَيرُ وَالبَرَكَة)، ئنجا (یمین) لای ڕاست، ڕەمزەکەیەتی، هەروەها (شؤم) لای چەپ، ڕەمزەکەیەتی، بۆیەش عەرەبەکان کاتی خۆی ئەگەر ویستبایان کارێك بکەن، باڵندەیەکیان هەڵدەفڕاند، ئەگەر بە لای ڕاستدا ڕۆیبایە، دەیانگوت: (تَيَامَنُوا) واتە: ئەوە خێرو بەرەکەت و خۆشیی تێدایە، بەڵام ئەگەر بە لای چەپدا ڕۆیبایە، دەیانگوت: (تَشَاءَمُوا) واتە: مادام ئەو باڵندەیە بەلای چەپدا فڕیوە، کەواتە ئەو کارەی دەیکەن: ئەگبەتیی و بێخێرییە!

٢- لەبەر ئەوەی دەستی ڕاست، ڕەمزی تواناو هێزە لە مرۆڤدا، واتە: بە هێزو سەپاندن ئێوە ئێمەتان ناچار دەکرد، بە دوای ئەو ڕێبازە بکەوین، کە ڕێبازی کوفرو شیرکە.

٣- (يَمِين) بە مانای سوێندیش دێ، واتە: بە سوێند خواردنەوە، یاخود: بە داکۆکیکردن و جەختلێکردنەوە، ئێمەتان دڵنیا دەکردەوە، کە ڕێیەکەتان ڕاستە، بۆیە ئێمەتان ناچارو وادار کرد بە دواتان بکەوین.

٤- (تَصُدُّونَنا عَنِ اليُمْنِ وَالخَيْرِ لِإنَّ أَتَى يَتَعَدَّى بِمِنْ، لَكِن هُنَا تعدّى ب (عن) فضُمِّنَ مَعْنى صَدَّ) کە دەفەرموێ: ﴿تَأْتُونَنَا عَنِ ٱلْيَمِينِ﴾، خۆی (أتاهُ من اليمين، مِنَ الشِّمَال، مِنْ فَوْق، مِنْ أَسْفَل)، بەڵام لێرەدا (أتى) بە (عَنْ) تەعەددای پێکراوە: ﴿تَأْتُونَنَا عَنِ ٱلْيَمِينِ﴾، بۆ ئەوەی مانای (صَدَّ) بگەیەنێ، (صَدَّ) واتە: گێڕایەوە، واتە: ئێوە ئێمەتان لە خێرو چاکە دەگێڕایەوە.

٥- (تَأْتُونَنا وَتَصْرِفُونَنا عَنْ طَرِيقِ أَهْلِ اليَمِينِ) واته: ئێمەتان لەوانە دەگێڕایەوە کە دەبنە لای ڕاست، یاخود بە دەستی ڕاست نامەی کردەوەکانیان لە ڕۆژی دوایی دا وەردەگرنەوە.

ئـەوان بـەو شـێوەیە سـەرکردەکانیان تۆمەتبـار دەکـەن، بێگومـان ئەوانیـش بـێ وەڵام نابـن.

٤)- ﴿قَالُوا۟ بَل لَّمْ تَكُونُوا۟ مُؤْمِنِينَ ﴾، دەمڕاست و سەرکردەکانیان بە شوێنکەوتووەکانی خۆیانیان گوت: بەڵکو خۆتان بڕوادار نەبوون.

٥)- ﴿وَمَا كَانَ لَنَا عَلَيْكُم مِّن سُلْطَٰنٍ﴾، {بەڵگەیان بۆ دێننەوە، دەڵێن:} ئێمە هیچ دەستەڵاتێکمان بەسەر ئێوەدا نەبوو.

(سُلْطان: تَسَلُّطٌ وَقَهْـر) (سلطان) یانی: زاڵبـوون و ملپێکەچکـردن، لـە ژێـر ڕکێفـی ئێمـەدا نەبـوون و توانامـان نەبـوو ناچارتـان بکەیـن، قەناعـەت بـەوە بێنـن کـە ڕێبـازی کوفـرو شـیرکە، بـەڵام خۆتـان بـڕوادار نەبـوون، ئەگەرنـا وەنەبـێ ناچـار کرابـن لـە لایـەن ئێمـەوە بـە هـۆی دەسـتەڵاتەوە، چونکـە دەسـتەڵاتمان بەسـەر عەقـڵ و دڵ و دەروونتانـدا نەبـوو، ئـەو قسـەیەش ڕاسـتە بـەو واتایـە، کـە هیـچ کەسـێك ناتوانـێ قەناعەتێکـی نێـو دڵ و عەقـڵ بـە کەسـێك بگـۆڕێ، کەسـێك کەسـێکی خـۆش نـەوێ، هیـچ هێزێـك ناتوانـێ وای لێـکات خۆشـیبوێ، کەسـێك ڕقـی لـە کەسـێك بـێ، هیـچ کەسـێك ناتوانـێ وای لێـکات ڕقـی لێـی نەبـێ، واتـە: دەسـەڵاتمان بەسـەر دڵ و دەروون و عەقڵتانـدا نەبـوو، کـە ئـەوێ کانـگای بـڕوا هێنـان و قەناعـەت پێهێنانـە.

٦)- ﴿بَلْ كُنتُمْ قَوْمًا طَٰغِينَ ﴾، بەڵکو خۆتان کۆمەڵێکی ملهوڕو یاخیی بوون، وشەی (طاغِین) کۆی (طاغي)یە، (الطَّاغِي: المُتَجَاوِزُ لِلْحَدِّ فِي العِصْيَان) (طاغي) کەسێکە لە سنوور دەرچووبێ لە سەرپێچیی کردندا، کە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿طَٰغِينَ ﴾، بە ناوی بکەر (اسم فاعل) هێناویەتی، یانی: (مُخْتارِينَ لِلطُّغْيَان) خۆتان یاخیی بوون و ملهوڕییتان هەڵبژاردوەو تەبەنیی کردوە.

٧)- ﴿فَحَقَّ عَلَيْنَا قَوْلُ رَبِّنَآ﴾، فەرمایشتی پەروەردگاریشمان لەسەرمان چەسپی، ئایا فەرمایشتی پەروەردگار کە لەسەریان چەسپیوە، کامەیە؟ زۆربەی هەرە زۆری ڕوونکەرەوانی قورئان، دەڵێن: مەبەست پێی ئەوەیە کە خوا دەفەرموێ: ﴿لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿١١٩﴾﴾هود، یاخود کە دەفەرموێ: ﴿لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكَ وَمِمَّن تَبِعَكَ مِنْهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٨٥﴾﴾ص، واتە: بە دڵنیایی (ئەی ئیبلیس!) دۆزەخ لە خۆت و لەوانەی کە شوێنتکەوتوون لەوان (لە وەچەی ئادەم) لە تێکڕاتان، پڕدەکەم، هەڵبەتە ئەگەر بگوترێ: ئەوانەی شوێن ئیبلیس کەوتوون، فەرمایشتی خواو بڕیاری خوایان لەسەر چەسپیوە، ئەوە ڕاستە، بەڵام ئەگەر وا لێکبدرێتەوە: خوا بڕیاری داوە دۆزەخ پڕبکات، ئنجا هەر چۆن بێ، دەبێ هێندە لە جندو مرۆڤان بێنێ تاکو دۆزەخیان لێ پڕکات، ئەوە ڕاست نیەو خوا ﷻ مەبەستی پێ ئەوە نیە، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە: خوا بڕیاری داوەو فەرموویەتی هەر کەسێك بێبڕوا یان ئەهلی شیرك بێ و لە تەوحید لامل بێ و بەدەم بانگەوازی خواوە نەچێ، خوا بڕیاری داوە، هەر کەسێك ئاوا بێ، سزا دەدرێ، ئنجا ئەو فەرمایشتەی خوا کە بەسەریاندا چەسپیوە، ئەوەیە کە ئەوانە لە ئەنجامی هەڵبژاردنی بێبڕوایی و شیرك و، هەڵبژاردنی ستەم و خراپەدا، بڕیاری خوایان بەسەردا چەسپیوە، نەك لە ئەنجامی ئەوەدا کە خوا فەرموویەتی: دەبێ دۆزەخ پڕ بێ، ئەوانەش ناچاربن کە هەر دەبێ ڕێی کوفرو شیرك و خراپە بگرن، تاکو دۆزەخ پڕ بێ، نا! بەڵێ خوا ﷻ بە دڵنیایی لە ئەزەلەوە زانیویەتی کە زۆربەی خەڵکەکە لە مرۆڤ و جند ڕێی ناهەق دەگرن، بۆیە دۆزەخی لە قەدەر ئەوانە دروستکردوە، کە لە ئەزەلەوە زانیویەتی ڕێی کوفرو ناهەق دەگرن، بەڵام بە هۆی ڕێی ناهەق گرتنەکەیانەوە بە ویستی ئازادانەی خۆیان، دەچنە دۆزەخ، نەك بەهۆی ئەوەوە کە خوا بڕیاری داوە دەبێ دۆزەخ پڕ بێ!!

٨)- ﴿إِنَّا لَذَآئِقُونَ﴾، بە دڵنیایی ئێمە چێژەرین، واتە: چێژەرین بۆ سزای خوا.

٩)- ﴿فَأَغْوَيْنَٰكُمْ﴾، ئنجا ئێمە ئێوەمان بێمرادو سەرگەردان کرد.

١٠)- ﴿ إِنَّا كُنَّا غَٰوِينَ ﴾، ئێمە خۆشمان سەرگەردان و بێمراد بووین.

لێرەدا ﴿ إِنَّا كُنَّا غَٰوِينَ ﴾، ئەمە هۆكار دۆزیی (تَعْلِيل)ە، واتە: هۆكاری ئەوە كە ئێوەمان سەرگەردان و بێمراد كرد، ئەوە بوو كە خۆمان سەرگەردان و بێمراد بووین، واتە: ئێمە كاتی خۆی لە دنیادا سەرگەردان بووین، ئەم (كُنَّا)یەش بۆ ئەوەیە مانای سەرگەردان و بێمرادیی و چارەڕەشیی، لەواندا چاك خەست و خۆڵ بكاتەوە.

كەواتە: وەك دەبینین شوێنكەوتووانی سەرانی كوفر لە دۆزەخدا، هەر كە بە زمانی سووتاو دەڵێن: ﴿ إِنَّكُمْ كُنتُمْ تَأْتُونَنَا عَنِ ٱلْيَمِينِ ﴾، ئەوان حوكمڕانانی خۆبەزلگر بە یەك كۆمەڵ قسە وەڵامیان دەدەنەوە: ﴿ قَالُواْ بَل لَّمْ تَكُونُواْ مُؤْمِنِينَ ﴿٢٩﴾ وَمَا كَانَ لَنَا عَلَيْكُم مِّن سُلْطَٰنٍۭ ۖ بَلْ كُنتُمْ قَوْمًا طَٰغِينَ ﴿٣٠﴾ فَحَقَّ عَلَيْنَا قَوْلُ رَبِّنَآ ۖ إِنَّا لَذَآئِقُونَ ﴿٣١﴾ فَأَغْوَيْنَٰكُمْ إِنَّا كُنَّا غَٰوِينَ ﴿٣٢﴾ ﴾. زۆری لەسەر دەڕۆن، بۆ پاساو دانەوەی ئەوە كە ئێمە نەبووینە هۆی گومڕا كردن و بێمرادو ڕەنجەڕۆ كردنی ئێوە، بەڵكو هۆكاری ئەوە خۆتان بوون، ئەگەرنا ئێمە نەماندەتوانی زۆرتان لێبكەین.

**مەسەلەی دووەم:**

**ڕاگەیەنرانـی ئـەوە کـە بێبڕوایانـی تاوانبـار لـە سـزای دۆزەخ دا هاوبەشـن و، هـەر ئـەوەش یاسـای خـوا بـووەو، هـۆکاری ئـەو سـزادرانەش، نکوولّییکردنیـان لـە خـوا بەیەکگرتـن و، تۆمەتبـار کردنـی پێغەمبـەر ﷺ بـووە بـە شـاعیریی و شـێتیی:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ فَإِنَّهُمْ يَوْمَئِذٍ فِي ٱلْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ ﴿٣٣﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَفْعَلُ بِٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٣٤﴾ إِنَّهُمْ كَانُوٓاْ إِذَا قِيلَ لَهُمْ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ ﴿٣٥﴾ وَيَقُولُونَ أَئِنَّا لَتَارِكُوٓاْ ءَالِهَتِنَا لِشَاعِرٍ مَّجْنُونٍۭ ﴿٣٦﴾ بَلْ جَآءَ بِٱلْحَقِّ وَصَدَّقَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٣٧﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

**١)**- ﴿ فَإِنَّهُمْ يَوْمَئِذٍ فِي ٱلْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ ﴾، [ئەمە بە تەئکید فەرمایشتی خوایە ﷻ، دەفەرموێ:] بە دڵنیایی ئەوان لەو ڕۆژەدا (لە ڕۆژی دوایی دا) لە سزادران و ئازاردراندا هاوبەشن، یانی: شوێنکەوتووان و دەمڕاستان، لاساییکەرەوان و چاوساغ و سەرکردەکان (الأتباع والمتبوعون)، هەموویان پێکەوە هاوبەشن، هەروەك چۆن لە سەرگەردانیی و بێمرادیی و گومڕاییدا، هاوبەش بوون، دیارە لە سزایەکەشدا هاوبەشن.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ فَإِنَّهُمْ ﴾، ئـەم (ف)ە لـە زمانـی عەرەبییـدا فـائی ڕوونکـەرەوە (**الفـاء الفَصِيْحَـة**)ی پـێ دەگوتـرێ، چونکـە دەلالـەت لەسـەر مەرجێکـی بـە مەزەننـە گیـراو (**شَرْطٍ مُقَـدَّر**) دەکات، واتـە: مـادام حاڵیـان بـەو شـێوەیە بـێ کـە بیسـتتان، کەواتـە: ئـەوان سـەرەنجام لـە سـزادا هاوبەشـن.

**٢)**- ﴿ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَفْعَلُ بِٱلْمُجْرِمِينَ ﴾، ئێمە ئاوا دەکەین لە تاوانباران، کە ئەمە فەرمایشتی خوایە ﷻ، وەك ڕوونکردنەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ و بۆ بڕواداران، بەڵکو بۆ مرۆڤایەتیی بە گشتیی کە کەسانێك کە تاوانبار بن، هەر ئەو سزایە چاوەڕێیان دەکات.

٣)- ﴿ إِنَّهُمْ كَانُوٓاْ إِذَا قِيلَ لَهُمْ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ ﴾، {خوا ﷻ تاوانبارییەکەیان دەخاتە ڕوو و دەفەرموێ:} ئەوان عادەتیان وابوو لە دنیادا، ئەگەر پێیان گوترابایە: بێجگە لە خوا هیچ پەرستراوێك نیە، خۆیان بەزلدەگرت، ئەمە هەم ڕوونکردنەوەی ئەوەی پێشێ و، هەم پاساودانەوەو هۆکار دۆزیی (تعليل)ە بۆ ئەوەی پێشێ، کە بۆیە تووشی ئەو ڕۆژە دێن و ئەو ئەنجامە دێن، چونکە هەڵوێستیان ئەوە بوو، کە تاوانبار بوون و تاوانبارییەکەشیان لەوەدا بەرجەستە بوو بوو، کە ئەگەر پێیان بگوترابایە: بێجگە لە خوا هیچ پەرستراوێك نیە، ئەوان خۆیان بەزلدەگرت لە بەرانبەر بەندایەتیی کردن بۆ خوادا.

٤)- ﴿ وَيَقُولُونَ أَئِنَّا لَتَارِكُوٓاْ ءَالِهَتِنَا لِشَاعِرٍ مَّجْنُونٍۭ ﴾، دەشیانگوت: ئایا ئێمە وازلێهێنەری پەرستراوەکانمان بین، بۆ بابایەکی شاعیری شێت؟

هەمزەی (أَئِنَّا) بۆ پرسیارکردنی نکووڵیلێکەرانە (هَمْزَةُ الإِسْتِفْهامِ الإِنْكارِيِّ)یە، یانی: شتێکی زۆر نالۆژیکییە کە ئێمە دەستبەرداری پەرستراوەکانی خۆمان بین بۆ قسەی بابایەك کە شاعیرو، شێتە؟ گومانی تێدانیە، ئەوانەی کە گوتوویانە: پێغەمبەر موحەممەد ﷺ شاعیرە، نەیانگوتوە: شێتە، چونکە شاعیر ناگونجێ شێت بێ، ئەوانەش کە گوتوویانە: شێتە، نەیانگوتوە: شاعیرە، بەڵام کۆی ئەو دوو قسەیان گوتوون بە هەموویان، بۆیە خوا هەردووك قسەکان کۆدەکاتەوە، ﴿ لِشَاعِرٍ مَّجْنُونٍۭ ﴾، شاعیرێك، هۆنەرێکی شێت، کە کۆی قسەکەش دژیەك (مُتَناقِض)ە، بۆیەش خوا پێکەوەی تاوێتە کردوون، وەك لە شوێنی دیکەش قسەیەکی لەو جۆرەی لێوە هێناون: (وَقَالُوا مُعَلَّمٌ مَّجْنُونٌ) الدخان: ١٤، گوتیان: فێرکراوی شێتە.

ئنجا خوا ﷻ ئەو قسەیان بەرپەرچ دەداتەوەو هەڵدەوەشێنێتەوەو، دەفەرموێ:

٥)- ﴿ بَلْ جَآءَ بِٱلْحَقِّ وَصَدَّقَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾، {یانی: نە شاعیرەو نە شێتە} بەڵکو هەقی هێناوەو، ڕەوانەکراوانیشی بەڕاست داناون، ڕەوانەکراوانێك کە لە پێش ویدا هاتوون، بەڕاستی داناون.

هـەم وشـەی (الحَقّ) ئەلیـف و لامـی ناسـاندنی لەسـەرە، هـەم (المُرْسَلِيْن)یش، کـە هـی هەردووکیـان بـۆ (جِنْس)ە، واتـە: کـۆی هەقـی هێنـاوەو کـۆی ڕەوانەکراوانیشـی بـە ڕاسـت دانـاون، بـە تێکـڕاو بـێ هـەڵاواردن، کەواتـە: ئـەو تۆمەتـەی ئێـوە دەیدەنە پاڵـی، شـتێکی بێبنەمایـە، چونکـە هەقـی هێنـاوە، فەرمـوون لـەو قوڕئانـە ورد بنـەوە، لــە هیــچ ڕووێکــەوە، هەڵەوناهەقیــی تێدانیــە، خــوا دەفەرمــوێ: ﴿ لَّا يَأْتِيهِ ٱلْبَٰطِلُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِۦ ۖ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ ﴿٤٢﴾ ﴾فصلــت، (لــە هیــچ شــوێنێکەوە هەڵـەو کـەم و کوڕیـی ڕووی تێنـاکات، نـە لـە پێشـیەوە، نـە لـە دوایـەوە، لـە هیـچ ڕووێکـەوە)، چونکـە دابەزێندراوە لـە لایـەن پەروەردگارێکی کارزانی ستاییشـکراوەوە. کـە خاوەنــی ئەوپــەڕی حیکمەتــەو، شایســتەی ئەوپــەڕی ستاییشــکرانە، زاتێکــی وا فەرمایشــت بفەرمــوێ، ناگونجــێ ناهەقیــی تێدابــێ، کەواتــە: هەقــی ڕەهــای بــۆ هێنــاون، کـۆی هـەق لـەو قوڕئانەیـەدا کـە بەسـەرتاندا دەخوێندرێتـەوە، هەروەهـا ڕەوانەکراوانــی پێــش خۆیشــی بــە ڕاســت دانــاوە، واتــە: موحەممــەد ﷺ شــتێکی نامـۆو ڕیزپـەڕ نیـە، بەڵکـو لـە پێـش ویـدا پێغەمبەرانـی دیکـە هاتـوون، ئەویـش کۆتایـی پێغەمبەرانـەو بەڕاسـت دانـەری هەموویانـە.

**مەسەلەی سێیەم:**

**هەڕەشەی توند لە بێبڕوایان، بە چێژتنی ئازاری بە ژان بە پێی کردەوەکانیان و، هەڵاواردنی بەندە هەڵبژاردەکانی خوا، کە بژێوێکی زانراو و نایابیان هەیەو، بە ڕێزو حورمەتەوە لە بەهەشتە پڕ نازو نیعمەتەکان دا نیشتەجێ دەبن و، پێکەوە لەسەر تەختان ڕووبەڕوو دادەنیشن و، خزمەتچییەکان بە قاپی شەڕابەوە بەسەریانەوە دەگەڕێن، شەڕابەکەش سپیی و بەچێژەو، ئازارو سەرخۆشیی پێوە نیەو، ئافرەتانی قەشەنگ و چاوگەش و جوان، کە سەرنجی جگە لە هاوسەرانیان نادەن، وەك هێلکەی شێردراوە لە لایان:**

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ إِنَّكُمْ لَذَآئِقُوا۟ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَلِيمِ ﴿٣٨﴾ وَمَا تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٣٩﴾ إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٤٠﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ رِزْقٌ مَّعْلُومٌ ﴿٤١﴾ فَوَٰكِهُ وَهُم مُّكْرَمُونَ ﴿٤٢﴾ فِى جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٤٣﴾ عَلَىٰ سُرُرٍ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴿٤٤﴾ يُطَافُ عَلَيْهِم بِكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍۭ ﴿٤٥﴾ بَيْضَآءَ لَذَّةٍ لِّلشَّٰرِبِينَ ﴿٤٦﴾ لَا فِيهَا غَوْلٌ وَلَا هُمْ عَنْهَا يُنزَفُونَ ﴿٤٧﴾ وَعِندَهُمْ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ عِينٌ ﴿٤٨﴾ كَأَنَّهُنَّ بَيْضٌ مَّكْنُونٌ ﴿٤٩﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چواردە بڕگەدا:

**١)- ﴿ إِنَّكُمْ لَذَآئِقُوا۟ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَلِيمِ ﴾، {ئەمە فەرمایشتی خوایە ﷻ، بێگومان قوڕئان هەمووی فەرمایشتی خوایە، بەڵام ئەوەی پێشێ قسەی ئەوانە خوا دەیگێڕێتەوە، بەڵام ئەمە ڕاستەوخۆ فەرمایشتی خوایە، دەفەرمووێ:} ئێوە چێژەری ئازاری بە ئێش و ژانن، هیچ گومانتان لەوەدا نەبێ کە دەبێ ئەو ئازارو سزا بە ئێش و ژانە بچێژن.**

**٢)- ﴿ وَمَا تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾، تەنیا بەوەش سزا دەدرێن کە دەتانکرد، واتە: تەنیا بە پێی ئەو کردەوە خراپانەی دەتانکردن، سزا دەدرێن و ستەمتان لێ ناکرێ.**

**٣)- ﴿ إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴾، بێجگە لە بەندە هەڵبژاردەکانی خوا ﷻ، ئەمە لە زمانی عەرەبییدا پێی دەگوترێ: (إِسْتِثْنَاءٌ مُنْقَطِع) هەڵاواردنێکی دابڕاو، چونکە بەندە**

هەڵبژاردراوەکانی خوا بەشێك نین لەوانەی کە خوا دەفەرموێ: سزای بە ئازار دەچێژن و، بە پێی کردەوەکانتان سزا دەدرێن، ئەوان لەوان جیان، ئنجا هەر کاتێك هەڵاوێردراو (مُستَثنی) لە لێهەڵاوێردراو (مُستَثنی مِنهُ) جیا بوو، ئەو هەڵاواردن (إستثناء)ە پێی دەگوترێ: (مُنقَطِع) دابڕاو، ئنجا ئەمە لە عەرەبییدا مانای فریاکەوتن (إستِدرَاك) دەگەیەنێ یانی: ئێوە چێژەری سزای بە ئێشن و، هەر بە پێی کردەوەکەی خۆتان سزا دەدرێن، بەڵام جگە بەندە هەڵبژاردەکانی خوا، ئەوان حاڵ و باڵیان جیایەو جۆرێکی دیکەیە.

٤)- ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ رِزۡقٞ مَّعۡلُومٞ ﴾، ئەوانە بژیوێکی زاندراویان هەیە، کە دەفەرموێ: بژیوێکی زاندراو (ناسراو) واتە: لە ڕووی چۆنیەتییەوە، لە ڕووی ئەندازەیەوە، لە ڕووی کاتەکەیەوە، ئەوە نیە کە کتوپڕ ئەو خواردنەیان بۆ بێ، بێ ئەوەی چاوەڕوانیی بکەن، یان نەزانن چییەو چۆنە؟ هەموو شتێك بۆ ئەوان زاندراوە، کە بێگومان کەسێك کە شتێك دەخوات، یان دەخواتەوە، ئەگەر بزانێ چییەو چۆنەو، ئەندازەکەی بە پێی دڵخواستی خۆی بێ، باشتر لەززەتی لێ دەکات.

واتایەکی دیکەی ئەوەیە: کە ئەو بژیوەی خوا بۆی داناون بۆ بەندە هەڵبژاردەکانی، بژیو و ڕزق و ڕۆزییەکی زۆر بەناوبانگە، (مَعلُوم) یانی: (مَشهُورٌ ومَعرُوف) زۆر ناودارو زۆر ناسراوە، ناوبانگی هەیەو نایابە.

ئنجا خوا ﷻ ئەو بژیوە زاندراوە، یاخود ناسراوو بەناوبانگە، شیدەکاتەوە، چۆنە؟:

٥)- ﴿ فَوَٰكِهُ وَهُم مُّكۡرَمُونَ ﴾، {بریتیە لە:} جۆرەکانی میوە، هەموو جۆرەکانی میوە، هەروەها ئەوان لەو بەهەشتانەدا ڕێز لێگیراون، واتە: بە حورمەت و ڕێزو شادمانیی و دڵخۆشییەوە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێ، کە ئەگەر میوە جۆراوجۆرەکان، خواردنی جەستەیان بن، ئەو ڕێزو حورمەتەش، خواردن و خۆراکی ڕووحە، ڕووحیش پێویستی بە تێرکردن هەیە، بە ڕێزو حورمەت و قەدر زانین، ڕووح تێرو تەسەل دەبێ.

کە دەفەرموێ: ﴿ فَوَٰكِهُ وَهُم مُّكۡرَمُونَ ﴾، ئەمە بێگومان بادانەوەی ڕوونکەرەوە (عَطف البَیان)یە بۆ (رِزْق)، واتە: خواردنەکەی ئەوان، بژیوەکەی ئەوان بریتیە

لەو جۆرە خواردنانە، کە تەنیا بۆ لەززەت بەکاردێن، نەك بۆ دوورخستنەوەی برسیەتیی و تینوویەتیی، چونکە (فَوَاكِه) کۆی (فَاكِهَة)یە، (فَاكِهَة) بەڵێ بە میوە دەگوترێ، بەڵام وێڕای میوە، بە هەموو ئەو خۆراك و خواردەمەنیانەش دەگوترێ کە وەك لەززەت لێوەرگرتن و چێژ لێوەرگرتن، خەڵك بەکاریان دەهێنێ، نەك وەك دوورخستنەوەی نێش و ناڕەحەتیی و برسیەتیی و تینوویەتیی، بێگومانیش خواردن و خواردنەوەکانی بەهەشت، وەك پێشتریش باسمان کرد، بۆ کەسانی برسیی و تینوو نین، چونکە لە بەهەشتدا برسیەتیی و تینوویەتیی نیە، بەڵکو تەنیا بۆ لەززەت و چێژوەرگرتن و خۆشیین.

ئنجا دوای ئەوەی کە باسی بژیو و خۆراکەکەیانی کرد، باسی جێگەو ڕێگەشیان دەکات.

٦)- ﴿ فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴾، لە نێو باغە پڕ نیعمەتەکاندا، واتە: لە نێو ئەو باغانەدا کە پڕن لە نازو نیعمەت، لە هەموو ڕوویەکەوە.

{ئنجا شوێنی پشوودانیان باس دەکات:} ٧)- ﴿ عَلَىٰ سُرُرٖ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴾، لەسەر تەختان، ڕووبەڕووی یەکدی دانیشتوون، (سُرُر) کۆی (سَرِير)ە، کە بریتیە لەو شوێنەی مرۆڤ لە سەری دادەنیشێ و پاڵدەکەوێ، شان دادەدات و پشوو دەدات، **(سَرِير هُوَ كَكُرْسِيٍ وَاسِعٍ يُمْكِنُ الإِضْطِجَاعُ عَلَيْهِ، وَالجُلُوسُ عَلَى السَّرِيرِ مِن شِعَارِ المُلُوكِ)**، (سَرِير): وەك کورسییەکی فراوان وایە کە دەگونجێ مرۆڤ لەسەری پاڵبداتەوەو شان دابدات، دانیشتن لەسەر تەخت، لە دروشم و نیشانەکانی پادشایان بووە لە دنیادا، کە بەدڵنیایی ئەهلی بەهەشت هەرکامێکیان زۆر لە حوکمڕانانی خۆشگوزەرانی دنیا، دەستکراوەترەو، هەر بەراوردیش ناکرێ لەگەڵیاندا، لە هەموو ڕوویەکەوە.

ئنجا باسی خواردنەوەکەیان دەکات:

٨)- ﴿ يُطَافُ عَلَيۡهِم بِكَأۡسٖ مِّن مَّعِينِۭ ﴾، بەسەریانەوە دەگێڕدرێ لە کووپی پڕ لە خواردنەوە، لە کانیی و سەرچاوەیەك کە دەبینرێ.

(مَعِين) کـە لـە ئەصڵـدا (مَعْيـوُن)ە، یانـی: (ظَاهِـرٍ لِلعُيُـون) کانیـی و سـەرچاوەکە دیـارە، بێگومـان کەسـێك کـە ئاوێـك دەخواتـەوە، ئەگـەر کانیـی و سـەرچاوەکە، کـە ئـاوی لـێ دەهێنـدرێ، لەبەرچـاوی بـێ، لەززەتـی زیاتـری لـێ دەکات.

لە بارەی (معين)ەوە سێ ڕا هەن:

أ- (معين) ئاوی کانیی و سەرچاوە.

ب- ئاوی دیارو بینراو، دەگوترێ: (عانَ الماء: ظهر جارياً) ئەگەر ئاو بڕواو دیار بێ، پێی دەگوترێ: (عَانَ المَاءُ)، کەواتە (مَعِين) دەگونجێ بە مانای بینراو بێ، دەشگونجێ بە مانای ئاوی کانیی بێ.

ج- (مَعِين مَفْعُـولٌ مِـنَ العَـيْنِ نَحْـوَ مَكِيـل وَمَبِيـع) واتـە: (معـين) (مفعـول)ە لـە (عـين)ەوە هاتـوە، وەك: (مكيـل) و (مبيـع) واتـە: پێـوراو و فـرۆشراو، یاخـود: (مَعِـينٌ فَعِيـلٌ مِـنَ المَعِـنِ، وَهُـوَ المَـاءُ الشَّـدِيدُ الجَـرِي، أَمْعَـنَ فِي المَسـيرِ: اشْـتَدَّ فِيـه)، (مَعِـين) لەسـەر کێشـی (فَعِيـل)ە لـە (مَعِـن)ەوە کـە بریتیـە لـەو ئـاوەی زۆر بـە خێرایـی دەڕوات، دەگوتـرێ: (أَمْعَـنَ فِي المَسـيرِ) مرۆڤەکـە زۆر چـاك ڕۆیـی، کەواتـە (مَعِـين) واتـە: ئاوێکـە کـە بـە خێرایـی دەڕوات.

پێشـتریش باسـمان کـرد: وشـەی (كَأْس) بـە کووپـی پـڕ لـە شـەڕاب، پـڕ لـە مـەی، دەگوتـرێ، بـەڵام ئەگـەر بەتـاڵ بـێ و شـەڕابی تێـدا نەبـێ، پێـی دەگوتـرێ: (قَـدَح)، هەندێکیـش گوتوویانـە: (كَأْس) بـۆ هەردووکیـان بـە پڕیـی و بـە خاڵیـی، بەکاردەهێـنرێ.

٩)- ﴿ بَيۡضَآءَ لَذَّةٖ لِّلشَّٰرِبِينَ ﴾، [ئەو شەڕابە، ئەو خواردنەوەیە کە دەیخۆنەوە] سپییەو، بە چێژە بۆ خۆرەوانی، هەم سپیی و جوان و بێ خڵتەیەو، هەم زۆر چێژ بەخشە بۆ خۆرەوانی.

١٠)- ﴿ لَا فِيهَا غَوۡلٞ ﴾ [ئەو شەڕابە کە دەیخۆنەوە] سەرئێشەی تێدانیە، (غَوْلٌ مَصْدَرُ غَالَهُ: أَهْلَكَهُ) (غَوْل) چاوگی (غَالَه)یە، یانی: فەوتاندی، کەواتە: ئەو مەیەی دەیخۆنەوە سەرئێشەو ئازاری پێوە نیە.

١١)- ﴿ وَلَا هُمْ عَنْهَا يُنزَفُونَ ﴾، بە هۆیەوەش عەقڵیان لە دەست نادەن، دەگوترێ: (نَزَفَ الرَّجُلُ مَاءَ الْبِئْرِ) واتە: پیاوەکە ئاوی بیرەکەی هەڵکێشا، دەشگوترێ: (أَنْزَفَ الشَّارِبُ) واتە: بابای شەڕابخۆرەوە عەقڵ و هۆشەکەی لەدەستدا، یان کەسێك کە خوێنی لەبەر دەڕوا دەڵێن: فڵانکەس نەزیفە، کە ئەمە (فَعِيل)ە بە مانای (مفعول) واتە: (مَنْزُوف)ە، خوێنی لەبەر ڕۆیشتوە، ئنجا بابای سەرخۆشیش کە عەقڵەکەی لە دەست دەدات، وەك چۆن کەسێك کە خوێن لە دەست دەدات، خوێن لە جەستەیدا نامێنێ، بابای سەرخۆشیش عەقڵ لە کەللەیدا نامێنێ، ئنجا شەڕابی بەهەشت نە سەرئێشەو ئازاری پێوەیە، نە لە دەستدانی عەقڵیشی پێوەیە، وەك لە سووڕەتی (الواقعة)ش دا دەفەرموێ: ﴿ لَّا يُصَدَّعُونَ عَنْهَا وَلَا يُنزِفُونَ ﴿١٩﴾ ﴾الواقعة، واتە: سەرئێشەی پێ ناگرن و عەقڵیش لە دەست نادەن، بێگومان لێرەش و لەوێش (يُنْزِفُون) و (يُنْزَفُون) بە هەردووك خوێندراوەکە هاتوون، (أَنْزَفَ الشَّارِبُ) واتە: عەقڵەکەی لە دەستدا، هەروەها (يُنْزَفُون) واتە: عەقڵیان لە دەستدراوە، بە بکەر نادیار (مجهول الفاعل)، (يُنْزِفُون)و بە بکەر دیار (معلوم الفاعل)، هاتوون و واتایان لێك نیزیکە.

١٢)- ﴿ وَعِندَهُمْ قَـٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ ﴾، هەروەها لە لایانن، لە نیزیکیانەوەن ئافرەتانێك کە چاوی خۆیان کورت کردۆتەوە، وشەی (قَاصِرات) سیفەتی وەسفکراو (مَوصُوف)ێکی فرتێنراو (مَحْذُوف)ە، یانی: (نِسَاءٌ قَاصِرَاتُ الطَّرْف) ئافرەتانێك کە نیگای خۆیان کورت کردۆتەوە (حَابِسَاتٌ أَنْظَارَهُنَّ) چاوی خۆیان کورت هەڵێناوە، لەسەر هاوسەرەکانیان، واتە: چاو نابڕنە پیاوانی دیکە، چونکە وشەی (طَرْف) بە مانای پێڵووی چاو دێ و، بە مانای ڕوانینیش دێ و، بە مانای چاویش دێ، کەواتە: (قَاصِرَاتُ الطَّرْف) یانی: کورتکەرەوەی نیگای چاوەکانیانن لەسەر هاوسەرەکانی خۆیان.

١٣)- ﴿ عِينٌ ﴾، ئافرەتانێکی چاوگەش و گەورەو جوانن. (عِيْن) کۆی (عَيْناء)ە واتە: ئافرەتی چاوگەش و جوان.

١٤)- ﴿ كَأَنَّهُنَّ بَيْضٌ مَّكْنُونٌ ﴾، ئەو ئافرەتانە وەك هێلکەی شێردراوە وان، (مَكْنُون): (مَسْتُور) یانی: شێردراوە، (بَيْض)یش کۆی (بَيْضَة)یە واتە: هێلکە، دیارە هەموو هێلکەیەك

باڵندەکان لە هێلانەی خۆیاندا هەڵیدەگرن، پووشی بەسەردا دەدەن و دەیشارنەوە، بە سپیی و جوانیی و بێ ئەوەی تۆزو گەردی لێ بنیشێ دەمێنێتەوە، بەڵام زانایان دەڵێن: ئەمە زیاتر مەبەست پێی هێلکەی حوشترمەلە چونکە (حوشتر مەل) ئەو هێلکەیەی دەیکات، چاڵێکی بۆ هەڵدەکەنێ لە لم، ئنجا دوایی لەو چاڵەدا لە تووکە وردەکەی خۆی لێدەکاتەوەو بۆی ڕادەخات، ئنجا دواییش دایدەپۆشێ، بۆیە هێلکەی نەعامە لە هێلکەی هەموو باڵندەکانی دیکە، سپیترو سافترو جوانترە، ئنجا خوا ﷻ ئەو ئافرەتانەی چواندوون، بە هێلکەی حوشترمەل، یاخود بە هێلکە بە گشتیی.

## کورتە باسێک: چەند نازو نیعمەتێکی بەهەشت

ئەگەر لەو ئایەتانەوە ڕامێنین و جارێکی دیکە سەرنجیان بدەینەوە، دەبینین خوا ﷻ لە هەشت بڕگەدا، باسی ئەو نازو نیعمەتە دەکات کە بۆ بەهەشتییەکان داندراوە:

١- ﴿رِزۡقٞ مَّعۡلُومٞ﴾، بژیوێکی زاندراو، واتە: لە ڕووی چەندێتیی و چۆنیەتیی و، کات و جۆرو ...هتدەوە، یاخود: (مَعْلُوم) بە مانای بژیوێکی زۆر ناودارو، بەناوبانگەو ناسراوە.

٢-﴿فَوَٰكِهُ﴾، (فَوَاكِه) كۆی (فَاكِهَة)یە، کە وەك چۆن بە میوە دەگوترێ، بە هەر خواردنێکی دیکەش دەگوترێ، کە مرۆڤ بەس بۆ لەززەت لێوەرگرتن دەیخوات، نەك بۆ ئەوەی خۆی پێ لە برسیەتیی، یان لە تینوویەتیی دەرباز بکات.

٣- ﴿وَهُم مُّكۡرَمُونَ﴾، ئەگەر بژیوە زاندراوەکە میوەکانن (فَوَاكِه) بۆ جەستەیە، ﴿وَهُم مُّكۡرَمُونَ﴾، بە هەشتییان ڕێز لێگیراون، حورمەتیان لێدەگیرێ، ئەمەش بۆ ڕووحە، لە ڕاستییدا ئەگەر کەسێك لە شوێنێك بانگهێشت بکرێ و باشترین خواردنی بۆ دابنێن، بەڵام ڕێزی لێ نەنێن، ئەگەر چ برجوامێر بێ، وەك کا بخوات پێی وایە، چونکە جەستەکەی تێر دەکرێ، بەڵام ڕووحەکەی تێر نەکراوە، لە تەقدیرو ڕێزو حورمەت، کە مرۆڤیش بەر لەوەی جەستە بێ، ڕووحە، بۆیە خوا ﷻ هەمیشە لە قورئاندا هەم تێرکردنی جەستە، هەم تێرکردنی ڕووح، هەردووکیان بەیان دەکات.

٤-﴿فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ﴾، لە باغە پڕ نیعمەتەکاندان، لە باغ و بێستانە پڕ نازو نیعمەتەکاندان.

٥- ﴿عَلَىٰ سُرُرٖ﴾، لەسەر تەختانن، لەسەر تەختان دانیشتوون، نەك لەسەر کورسیی، کورسیی ئەوەیە کە ئینسان هەر جێی خۆی دەبێتەوە، بەڵام تەخت ئەوەیە کە دەتوانی لەسەریشی پاڵبکەوێ و شان دابدات و جێی کەسانی دیکەش لەسەر دەبێتەوە.

٦- ﴿مُتَقَٰبِلِينَ﴾ ڕووبەڕووی یەکدیین، لە نێو عەوامی خۆماندا زۆرجار گوتراوە: لە بەهەشتێ کەس شوێنی کەس نابینێ، بەڵکو ئەگەر ویستیان سەردانی یەکدی بکەن، دەڕۆن لە نێوە ڕاستی ڕێ دەگەنە یەکدی و دوایی هەر کەسە دەگەڕێتەوە، شوێنی خۆی!! کە ئەو قسەیە هیچ بنەمایەکی نیەو، نازانم ئەو قسەیان لە کوێ هێناوە، لە ڕاستییدا یەکێك لە نیعمەتەکانی بەهەشت، ئەوەیە کە لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە لە لووتکەدایەو، ئەهلی بەهەشت زۆر پێکەوە سەرو ڕووخۆش و، دڵخۆشن و، یادی دنیا دەکەنەوە، بەڵکو لە بەهەشتەوە تەماشای خەڵکی دۆزەخ دەکەن، وەك دوایی دەیگەیێ.

٧- ﴿يُطَافُ عَلَيۡهِم بِكَأۡسٖ﴾، بەسەریانەوە دەگێڕدرێ بە پەرداغێکی پڕ لە شەراب، کە لە کانییەکی بیندراو، یاخود لە کانییەك کە ناوی لەبەر دەڕوات، شەرابەکەی هاتوە.

ئنجا ئەو شەرابە خوا ﷻ بە پێنج سیفەت وەسفی دەکات:

١)- ﴿مِّن مَّعِينٖ﴾، لە کانیی و سەرچاوەیەکە ئاشکراو دیارە، یاخود ئەو شەرابە کە بۆیان دێ، لە کانیی و سەرچاوەیە، یاخود لە ئاوێکی دیارو بەرچاوە کە دەڕوات.

٢)- ﴿بَيۡضَآءَ﴾، زۆر سپیی و ساف و بێگەردە.

٣)- ﴿لَذَّةٖ لِّلشَّٰرِبِينَ﴾، زۆر بەچێژە، بۆ خۆرەوانی لە ئەصڵدا (لَذَّة) یانی: چێژ، بەڵام لێرەدا خوا ﷻ لە جیاتی بفەرموێ: (لَذِيذَةٍ)، هەر بە خودی چێژەکە وەسفی کردوە.

٤)- ﴿لَا فِيهَا غَوۡلٞ﴾، سەرئێشەو ناڕەحەتیی و، ئازاری تێدانیە، وەك شەرابی دنیا، کە دەیخۆنەوە چەندان جۆرە دەرهاویشتەی خراپی هەن، ئازارو نەخۆشیی و سەرئێشەو سەر خۆشبوون.

٥)- ﴿وَلَا هُمۡ عَنۡهَا يُنزَفُونَ﴾، (يُنزَفُون) یاخود (يُنْزِفُون)، هەروەها بە هۆی ئەو شەرابەوە عەقڵیشیان لە دەست نادەن، هۆشیان لە دەست نادەن.

٨- ﴿وَعِندَهُمۡ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرۡفِ﴾، لە نیزیکیانەوە، لە تەنیشتیانەوەن، ئافرەتانێکی نیگای خۆکورتکەرەوە لەسەر مێردەکانیان، هەن، لەبەر ئەوەی پیاوی بە غیرەت پێی خۆشە

هاوسەرەکەی بێجگە لە خۆی تەماشای کەس نەکات و، بە کەسی دیکە سەرسام نەبێ، ئنجا ئافرەتانی بەهەشت وان و، بێجگە لە هاوسەرەکانی خۆیان، بە هیچکەس سەرسام نین، هەڵبەتە پیاوەکانیش بە هەمان شێوە، بەڵام ئەوە زیاتر هەستی پیاوە، کە حەزدەکات ژنەکەی، هاوسەرەکەی وابێ، بۆیە خوا ﷻ باسی ئەوە دەکات.

گوتمان: (طَرْف) یانی: پێڵووی چاو، بە مانای نیگای چاویش دێ، واتە: چاویان کورت کردۆتەوە (حَابِسَاتٍ أَنْظَارَهُنَّ)، لەسەر هاوسەرەکانی خۆیان.

﴿ عِينٌ ﴾، (عِيْن) کۆی (عَيْنَاء)ە، (عَيْنَاء) یانی: ئافرەتی چاوگەش و چاو گەورەو جوان.

﴿ كَأَنَّهُنَّ بَيْضٌ مَّكْنُونٌ ﴾، وەك هێلکەی پەنهان و شێردراوە وان، کە پەڕندە لە هێلانەکەی خۆیدا دەیپارێزێ و سپیی و ساف و بێگەردە.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی لەو نازو نیعمەتەی بەهەشتمان بە قسمەت بکات و، لەو ئازارو مەینەتیی و، ناڕەحەتییانەی کە بۆ دۆزەخییان باسکراون، چەپاڵەمان بدات و بمانپارێزێ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە بیسـت وپێنـج (٢٥) ئایـەت پێکـدێ، ئایەتەکانـی: (٥٠ - ٧٤)، سـەرەتا باسـی یەکێـك لـە بەهەشـتییان دەکات، کـە لەکاتـی دانیشـتن لەگـەڵ کۆڕێـك لـە بەهەشـتییاندا، یـادی هاوەڵێکـی دنیـای دەکاتـەوە، پێیـان دەڵـێ: با سـەرنج بدەین داخـۆ ئـەو ناسـیاوو هاوەڵـەی مـن لـە کوێـی دۆزەخ دایـە؟ سـەرەنجام لـە نێوەڕاسـتی دۆزەخـدا دەیبینـێ و، چەنـد قسـەیەکی بـە سەرزەنشـتەوە لەگەڵـدا دەکات.

دوایـی خـوای زاڵـی پایـەدار باسـی سـزای دۆزەخ دەکات، بـە تایبـەت درەختـی زەققـوم، پاشـان باسـی هـۆکاری ئـەو سـەرەنجامە شـوومەیان دەکات، کـە بریتـی بـووە لـە لاسـاییکردنەوەی کوێرانـەی پێشـینانیان و، گـوێ نـەدان بـە وریاکەرەوانێـك کـە خـوا ﷻ بـۆ لای نـاردوون.

﴿فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَآءَلُونَ ﴿٥٠﴾ قَالَ قَآئِلٌ مِّنْهُمْ إِنِّى كَانَ لِى قَرِينٌ ﴿٥١﴾ يَقُولُ أَءِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُصَدِّقِينَ ﴿٥٢﴾ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَدِينُونَ ﴿٥٣﴾ قَالَ هَلْ أَنتُم مُّطَّلِعُونَ ﴿٥٤﴾ فَٱطَّلَعَ فَرَءَاهُ فِى سَوَآءِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٥٥﴾ قَالَ تَٱللَّهِ إِن كِدتَّ لَتُرْدِينِ ﴿٥٦﴾ وَلَوْلَا نِعْمَةُ رَبِّى لَكُنتُ مِنَ ٱلْمُحْضَرِينَ ﴿٥٧﴾ أَفَمَا نَحْنُ بِمَيِّتِينَ ﴿٥٨﴾ إِلَّا مَوْتَتَنَا ٱلْأُولَىٰ وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴿٥٩﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٦٠﴾ لِمِثْلِ هَٰذَا فَلْيَعْمَلِ ٱلْعَٰمِلُونَ ﴿٦١﴾ أَذَٰلِكَ خَيْرٌ نُّزُلًا أَمْ شَجَرَةُ ٱلزَّقُّومِ ﴿٦٢﴾ إِنَّا جَعَلْنَٰهَا فِتْنَةً لِّلظَّٰلِمِينَ ﴿٦٣﴾ إِنَّهَا شَجَرَةٌ تَخْرُجُ فِىٓ أَصْلِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٦٤﴾ طَلْعُهَا كَأَنَّهُۥ رُءُوسُ ٱلشَّيَٰطِينِ ﴿٦٥﴾ فَإِنَّهُمْ لَءَاكِلُونَ مِنْهَا فَمَالِـُٔونَ مِنْهَا ٱلْبُطُونَ ﴿٦٦﴾ ثُمَّ إِنَّ لَهُمْ عَلَيْهَا لَشَوْبًا مِّنْ حَمِيمٍ ﴿٦٧﴾ ثُمَّ إِنَّ مَرْجِعَهُمْ لَإِلَى ٱلْجَحِيمِ ﴿٦٨﴾ إِنَّهُمْ أَلْفَوْا۟ ءَابَآءَهُمْ ضَآلِّينَ ﴿٦٩﴾ فَهُمْ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِمْ يُهْرَعُونَ ﴿٧٠﴾ وَلَقَدْ ضَلَّ قَبْلَهُمْ

أَكْثَرُ الْأَوَّلِينَ ﴿٧١﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا فِيهِم مُّنذِرِينَ ﴿٧٢﴾ فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُنذَرِينَ ﴿٧٣﴾ إِلَّا عِبَادَ اللَّهِ الْمُخْلَصِينَ ﴿٧٤﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{ئنجا (لە کاتێك دا لە بەهەشت دا شادمانانە پێکەوە دانیشتبوون) ڕوویان کردە یەکدی (پێکەوە گفت و گۆیان دەکرد و) لە نێو خۆیاندا پرسیاریان دەکرد ﴿٥٠﴾ بێژەرێك لەوان گوتی: کاتی خۆی (لە دنیادا) من هاونشینێکم هەبوو (بێبڕوا بوو) ﴿٥١﴾ دەیگوت: ئایا بەڕاستیی تۆ لە بەڕاستدانەرانی (ئەوەی کە زیندوو کرانەوە هەبێ)؟ ﴿٥٢﴾ ئایا کە مردین و بووینە گڵ و ئێسکە (ڕزیوە) کان ئێمە (زیندوو دەکرێینەوەو) سزاو پاداشت دەدرێینەوە؟ ﴿٥٣﴾ (بێژەرە بەهەشتییەکە) گوتی: دەتانەوێ لە هەواڵزانان بن (بزانن ئەو ئاشنایەم هەواڵی چییە)؟! ﴿٥٤﴾ یەکسەر تەماشای کرد، ڕاستەوخۆ لە نێوەڕاستی (کڵپەی) دۆزەخدا بینی ﴿٥٥﴾ گوتی: بە خوا خەریك بوو بمفەوتێنی (بە مەرەدی خۆتم ببەی) ﴿٥٦﴾ ئەگەر چاکەی پەروەردگاریشم (بەسەرمەوە) نەبووایە، منیش لە ئامادەکراوان (ی نێو دۆزەخ) دەبووم ﴿٥٧﴾ (ئەی دۆست و هاوەڵان!) ئایا ئێمە (لە بەهەشتدا) نامرین (و مردن ناچێژین) ﴿٥٨﴾ بێجگە لە مردنەکەی یەکەممان (کە لە دنیادا چێژتمان)و، سزادراویش نابین! ﴿٥٩﴾ بەڕاستیی ئەمە بردنەوەیەکی مەزنە ﴿٦٠﴾ با هەوڵدەران تەنیا بۆ وێنەی ئەمە کار بکەن (و تێبکۆشن) ﴿٦١﴾ ئایا ئەو میوانداریی لێکرانە باشترە، یان درەختی زەققوم (بکرێتە خۆراك)؟ ﴿٦٢﴾ ئێمە ئەو (درەختە) مان گێڕاوە بە مایەی تاقیکردنەوەی ستەمکاران (و هۆکاری سزادرانیان) ﴿٦٣﴾ ئەوە درەختێکە لە بنی (کڵپەی) دۆزەخ دێتە دەرێ ﴿٦٤﴾ میوەو بەرەکەی وەك سەری شەیتانان وایە ﴿٦٥﴾ بێگومان ئەوان (تاوانباران)لێی دەخۆن، ئنجا سکیانی لێ دەئاخن ﴿٦٦﴾ دوایی ئاوی کوڵیو و داغی لەسەر دەخۆنەوەو ئاوێتەی دەکەن ﴿٦٧﴾

پاشـان (دوای ئـەو خواردنەوەیـە) گەڕانەوەیـان بـەرەو لای کڵپـەی (ئاگـری) دۆزەخـە ﴿٦٨﴾ هـۆکاری ئـەو (سـزاو جەزرەبە)یـەش ئەوەیـە کـە ئـەوان بـاب و باپیرانیـان بـە گومڕایـی دیـوە ﴿٦٩﴾ ئەوانیـش بەکسـەر بـە شـوێنەوارەکانیاندا ڕەتێـنراون ﴿٧٠﴾ بـە دڵنیاییـش لـە پێـش وان دا زۆربـەی پێشـووەکان(یان) گومـڕا بـوون ﴿٧١﴾ بێگومـان ئێمـە هۆشـیارکەرەوامان تێـدا ناردبـوون ﴿٧٢﴾ ئنجـا سـەرنج بـدە! سـەرەنجامی هۆشـیارکراوان و ترسـێنراوان (لـە لایـەن پێغەمبەرانـەوە) چـۆن بـوو؟ ﴿٧٣﴾ جگـە لـە بەنـدە سـاغکراوەو هەڵبژاردەکانـی خـوا ﴿٧٤﴾].

## ڕوونکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(قَرِينٌ ): (فُلاَنٌ قَرْنُ فُلاَنٍ فِي الوِلاَدَة، وَقَرِينُـهُ وَقِرْنُـهُ فِي الجِلاَدَة، وَفِي القُـوَّةِ وَفِي غَيْرِهَا مِـنَ الأَحْـوَال)، وشـەی (قَرِيـن): واتـە: هاوتـا، جـووت، دەگوتـرێ: (فُـلاَنٌ قَـرْنُ فُـلاَنٍ فِي الـوِلاَدَة) واتـە: فڵانکـەس لـە لـە دایـك بوونـدا لەگـەڵ فڵانکەسـە، واتـە: پێکـەوە لەدایـك بـوون لـە یـەك کاتـدا، دەگوتـرێ: (وَقَرِينُـهُ وَقِرْنُـهُ فِي الجِلاَدَة) لـە شـەڕو دەبەر یەکڕاچوونیشـدا هاوتایەتـی، هەروەهـا لـە هێـزداو لـە غەیـری ئەوەشـدا لـە حـاڵان، کەواتـە (قَرِيـن) کەسـێکە لەگـەڵ کەسـێك، بـە هۆیەکـەوە لێـی نیزیـك بـێ.

(لَمَدِينُونَ): (مَجْزِيُّون) ئایا ئێمە سزاو پاداشت دەدرێینەوە؟

(هَلْ أَنتُم مُّطَّلِعُونَ ): ئایـا دەتانـەوێ هـەواڵ بزانـن، ئاگاداربـن؟ (طَلَـعَ عَلَيْنَـا فُـلاَنٌ وَاطَّلَـعَ) واتـە: فڵانکـەس ئێمـەی بینـی، یاخـود لـە حاڵـمان ئـاگادار بـوو، (أَطْلَعْتُـكَ عَلَى كَـذَا) ئـەو شـتەم بـە تـۆ ڕاگەیانـدو، ئـاگادارم کردیـەوە.

(سَوَآءِ): شـوێنی تەخـت، (المُسَـاوَاةُ: المُعَادَلَـةُ، مَـكَانٌ سُـوىً، وَسَـوَاء: وَسَـط)، کەواتـە کـە دەفەرمـوێ: ﴿ فِي سَوَآءِ ٱلْجَحِيمِ ﴾، واتـە: لـە نێوەڕاسـتی، لـە تەختایـی دۆزەخـدا، (مَـكَانٌ سُـوىً وَسَـوَاء) شـوێنێکی تەخـت و نێـوە ڕاسـت.

(الْجَحِيمِ ): (الْجَحْمَةُ: شِدَّةُ تَأَجُّجُ النَّار)، (جَحْمَة) بە بڵێسەی ئاگر دەگوترێ، کە زۆر کڵپە بستێنێ، کەواتە (جَحِيم) ئاگرێکی زۆر بە کڵپەو بڵێسە.

(لَتُرْدِينِ ): (التَّرَدِّي: التَّعَرُّضُ لِلْهَلاك)، (تَرَدِّي): بریتییە لەوە کە مرۆڤ خۆی بفەوتێنێ، (الْمِرْدَاةُ: الحَجَرُ تُكْسَرُ بِهَا الْحِجَارَةُ فَتُرْدِيهَا)، (مِرْدَاة): بەو بەردە دەگوترێ کە بەردی دیکەی پێ دەشکێندرێ و، ئەو بەردە شکێنراوە لە بەین دەچێ، کەواتە: (لَتُرْدِينِ) واتە: (لَتُهلِكُنِي)، خەریك بوو بمفەوتێنی، بە مەرەدی خۆتم بەری.

(نُزُلًا ): (النُّزُلُ: مَا يُعَدُّ لِلضَّيْفِ النَّازِلِ مِنَ الزَّاد)، (نُزُل): ئەوەیە کە بۆ میوانێك کە دابەزیوە لەلای خانە خوێ، بۆی ئامادە دەکرێ، ئەو خواردن و خۆراکە پێی دەگوترێ: (نُزُل).

(الزَّقُّومِ ): (الزَّقُّوم: عِبَارَةٌ عَنْ أَطْعِمَةٍ كَرِيهَةٍ فِي النَّارِ، وَمِنْهُ اسْتُعِيرَ: زَقَّمَ فُلانٌ وَتَزَقَّمَ: ابْتَلَعَ شَيْئاً كَرِيهاً)، (زَقُّوم): بریتییە لەو خواردنە ناخۆشانەی کە لە ئاگر داهەن، لەوەوە ئەوە خوازراوە کە دەگوترێ: (زَقَّمَ فُلانٌ وَتَزَقَّمَ) ئەگەر شتێکی ناخۆشی قووتدا، ئەو وشەیەی بۆ بەکار دەهێنرێ.

(طَلْعُهَا ): (مَا طَلَع مِنْها) ئەوەی کە لێی پەیدادەبێ، یانی: بەرەکەی، میوەکەی.

(لَشَوْبًا): (الشَّوْبُ: الخَلْطُ)، (خَلْط): واتە: شتێك کە لەگەڵ شتێك تێکەڵ دەکرێ، (مَا عِنْدَهُ شَوْبٌ وَلا رَوْبٌ: عَسَلٌ وَلَبَنٌ) نە هەنگوینی لەلایە، نە شیر، (شَوْب) یانی: هەنگوین لەبەر ئەوەی لەگەڵ ئاو تێکەڵ دەکرێ، (رَوْب) یانی: شیر.

(حَمِيمٍ ): (الماءُ شَدِيدَةُ الحَرَارَة، الْحَمَّةُ: المَاءُ الحَارُ فِي خُرُوجِهِ مِنْ نَبْعِهِ)، (حَمِيم): ئاوێکە کە زۆر زۆر کوڵاو و داغ بێ، (حَمَّة) بە ئاوێك دەگوترێ لە سەرچاوەکەی دێتە دەرێ، بە گەرمیی.

(أَلْفَوْا): بینیویانە، (أَلْفَيْتُ: وَجَدْتُهُ) لێم هەڵکەوت، دیتم.

(يُهۡرَعُونَ): (هَـرِعَ وَأُهْـرِعَ: سَـاقَهُ سَـوْقاً بِعُنْـفٍ)، (هَـرِعَ وَأُهْـرِعَ) واتـه: لێخـوڕی بـه لێخوڕینێکـی تونـد، بـه ترسـاندنەوە، دیـارە وشـەی (يُهْرَعُـون) واتـە: دەڕێتێنرێـن، ڕاو دەنرێـن، هەڵدەپێچرێـن، هەڵبەتـە خوێندراویشـەتەوە: (يَهْرَعُـون) بەخێرایـی دەڕۆن.

(الۡمُخۡلَصِينَ): هەڵبـژاردەکان، (خَلَّصْتُـهُ فَخَلَـصَ) واتـە: هەڵمبـژارد، سـاغبۆوە، (الْخَالِـصُ: كَالصَّـافِي إِلاَّ أَنَّ الْخَالِـصَ هُـوَ مَـازَالَ عَنْـهُ شَـوْبُهُ بَعْـدَ أَنْ كَانَ فِيْـهِ)، (خَالِـص) و (صَـافِي) وەك یەکـن، بـەڵام (خَالِـص) ئەوەیـە کـە شـتێك لەگەڵـی تێکـەڵ بـووە، لاچووبـێ، دوای ئـەوەی شـتەکەی تێـدا بـووە، بـەڵام (صَـافِي) ئەوەیـە کـە هـەر لـە ئەصڵـدا سـاف و بێخـەوش بووبـێ.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

ئایەتەکانـی پیشـێ لە بـارەی باسـی دۆزەخیيان و مشـتومڕو دەمەقاڵێیـان پێکەوەو، سـەرکۆنە کـردن و سەرزەنشـتکردنی یەکـدی، بـە تایبـەت هـی شـوێنکەوتووان بـۆ دەمڕاسـتان و سـەرکردەکان و، وەڵامدانـەوەی خەسـت و خۆڵـی ئەوانیـش و پاکانـە بـۆ خـۆ کردنیانـەوە، بـوون، دوایـی خـوا باسـی سـزای هـەردووك لایانـی کـرد واتـە: شـوێنکەوتووان و پەیڕەویـی لێکـراوان، یاخـود ئەوانـەی هەڵخەڵەتێـنراون و ئەوانـەی هەڵخەڵەتێنـەرن، دوایـی خـوا باسـی نیعمەتـی بەهەشـتی کـردو باسـی ژیانـی خۆشـی بەهەشـتییەکانی کـرد.

ئنجـا دەفەرمـوێ: ﴿ فَأَقۡبَلَ بَعۡضُهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ يَتَسَآءَلُونَ ﴾، (ف)ی ﴿ فَأَقۡبَلَ ﴾، بـۆ بەدواهاتـن (تعقیـب)ە، لـە عەرەبییـدا (ف) جـاری وایـە بـۆ (تعقیـب)ە، جـاری وایـە بـۆ (جـزاء)ە، جـاری وایـە (فصیحة)یـە، ئـەوە دەگەیەنـێ کـە شـتێکی دیکـە هەیـە، بـەڵام بـاس نەکـراوەو فڕتێـنراوە، لەبـەر ئـەوەی بـە سـیاق و سـەلیقە دەزانـدرێ، ئنجـا لێـرەدا (ف) بـۆ بەدواداهاتـن (تعقیـب)ە، پێشـتریش باسـمان کـرد کـە بـە نسـبەت

دۆزەخییەکانەوە فەرمووی: ﴿ وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَآءَلُونَ ﴾، چونکە ئەوە یەکسەر بە دوای ئەوەدا بوو، کە باسی کۆکردنەوەیان و سزادانیان و، پاڵەستۆدانیان بەرەو دۆزەخ، بوو، ئنجا فەرمووی: ﴿ وَأَقْبَلَ ﴾، واتە: وێڕای ئەو مەینەتییانەی کە لە کاتی حەشرو حیساب و کۆکرانەوەو، ڕەپێچەکدرانیان بەرەو دۆزەخ دا، هەیانن، ئنجا ئەوەشیان خستە پاڵی و، دەستیشیان کرد بە سەرکۆنە کردنی یەکدی و سەرزەنشتکردن و پرسیارو وەڵام لەگەڵ یەکدی دا، ئنجا لەوێ دەفەرموێ: ﴿ وَأَقْبَلَ ﴾، ئەو (و)ە بۆ بادانەوەیە، واتە: ئەو حاڵەتەشیان هەیە، وێڕای مەینەتییەکانی پێشێ، بەڵام لێرە دەفەرموێ: ﴿ فَأَقْبَلَ ﴾، چونکە باسی کۆبوونەوەی بەهەشتییان دەکات کە لە بەهەشتدا، دانیشتوون بۆ ئیسراحەت و پشوودان، بۆیە بە (ف) دەیهێنێ، واتە: یەکسەر دوای ئەوەی دانیشتن و پشوویان دا، دەست دەکەن بە قسەو باسی خۆش و، یاد کردنەوەی ژیانی دنیا، چونکە ئەوە یەکسەر بە دوایدا دێ، ﴿ فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَآءَلُونَ ﴾، بەهەشتییەکان ڕوویان لە یەکدی کرد، یەکسەر دوا بە دوای ئەوەی کە دانیشتبوون لە بەهەشتدا، ڕوویان لە یەکدی کردو، دەستیان کرد بە پرسیار لێکدی کردن و، یەکدی دواندن.

﴿ قَالَ قَآئِلٌ مِّنْهُمْ إِنِّي كَانَ لِي قَرِينٌ ﴾، بێژەرێکیان گوتی: من هاونشینێك نیزیکێك، ئاشنایەکم هەبوو، کە لێمەوە نیزیك بوو، ئنجا بە حوکمی کارو کاسبیی بووە، بە حوکمی پیشەیەك بووە، بە حوکمی خزمایەتیی بووە، بە حوکمی دراوسێیەتیی بووە، بە هۆیەکەوە لێی نیزیك بووە.

﴿ يَقُولُ أَءِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُصَدِّقِينَ ﴾، بە سەرسوڕمان و پرسیار لێکردنی نکووڵیلێکەرانەوە دەیگوت: ئایا تۆ لە بەڕاستدانەرانی؟! ئەوەی کە پێغەمبەران دەیڵێن، لە بەڕاستدانەرانی ئەوەی کە بە ناوی ئایینەوە دەگوترێ؟

﴿ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَـٰمًا أَءِنَّا لَمَدِينُونَ ﴾، هەمووی بە پرسیار کردنی سەرسوڕماندن و نکووڵیلێکەرانە: ئایا کە مردین و بووینەوە خۆڵ و ئێسکە پرتووکاوەکان، ئایا

ئێمە سزا دەدرێین؟ یاخود سزاو پاداشت دەدرێینەوە؟ واتە: زیندوو دەکرێینەوە، بۆ ئەوەی سزاو پاداشت بدرێینەوە؟ (أَئِنَّا لَمَدِينُون) یانی: (أَئِنَّا لَمَجْزِيُّون)؟!

﴿ قَالَ هَلۡ أَنتُم مُّطَّلِعُونَ ﴾، ئەو بێژەرە لە بەهەشتەوە، بە هاونیشینەکانی خۆی، بە ڕەفیقەکانی خۆی کە لە بەهەشتدا پێکەوەدانیشتوون، گوتی: ئایا سەرنج دەدەن و دەتانەوێ هەواڵ بزانن؟ واتە: دەتانەوێ هەواڵ بزانن ئەو نیزیکەی من، ئەو ئاشنایەی من، لە کوێی دۆزەخ دایە؟ چونکە دیارە لە بەهەشتێ نیە.

﴿ فَٱطَّلَعَ ﴾، یەکسەر سەرنجی دا بە (فاء التعقيب) دیسان، واتە: یەکسەر لە بەهەشتەوە تەماشای کرد، ﴿ فَرَءَاهُ فِي سَوَآءِ ٱلۡجَحِيمِ ﴾، یەکسەر بینی لە نێوەڕاستی کڵپەی ئاگری دۆزەخدایە، دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا باس دەکەین، کە دەفەرموێ: ﴿ فَٱطَّلَعَ فَرَءَاهُ فِي سَوَآءِ ٱلۡجَحِيمِ ﴾، یەکسەر سەرنجی داو، یەکسەریش بینی لە نێوەڕاستی کڵپەی دۆزەخدا، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە بەهەشتییەکان ئامڕازو هۆکاری پەیوەندیی و، زانیاریی زۆر پەرەسەندوو و پێشکەوتوویان لەبەر دەست هەن، کە ڕەنگە هەر بە مێشکی ئێمەدا نەیەن و، ڕەنگە ئەو ئینتەرنێت و تەلەفزیۆن و، ئەوەی کە ئێمە ئێستا لەبەر دەستماندان بۆ پەیوەندیی پێکەوە کردن و یەکدیی دواندن، لە شوێنی دوورەدەست، لە چاو ئەوەی بەهەشت دا هەر هیچ نەبێ، بەدڵنیایی ئەوەی خوا بۆ ئەهلی بەهەشتی دەڕەخسێنێ، زۆر پێشکەوتووترە لەوەی کە مرۆڤ لە دنیادا پێیگەیشتوە.

﴿ قَالَ تَٱللَّهِ إِن كِدتَّ لَتُرۡدِينِ ﴾، بەهەشتییەکە بە هاوەڵە دۆزەخییەکەی، بە ئاشنا دۆزەخییەکەی گوت: سوێند بە خوا نیزیک بوو بمفەوتێنی، ﴿ وَلَوۡلَا نِعۡمَةُ رَبِّي لَكُنتُ مِنَ ٱلۡمُحۡضَرِينَ ﴾، ئەگەر چاکەی پەروەردگاریشم بەسەرمەوە نەبووایە، منیش ئێستا لە ئامادەکراوان دەبووم، (مُحْضَر) کەسێکە پەلکێش دەکرێ و دەهێنرێ و ئامادە دەکرێ، بێ ئەوەی خۆی ویستی ئازادی هەبێ لە شتەکەدا واتە: منیش لەگەڵ تۆدا ئێستا پەلکێشی دۆزەخ دەکرام، ئەگەر لوتف و چاکەی پەروەردگارم لەسەرم نەبووایە.

ئنجا واز لەو دێنێ و ڕوو دەکاتەوە هاوەڵ و دۆستەکانی کە لە بەهەشتدا پێکەوە دانیشتوون، دەڵێ: ﴿ أَفَمَا نَحْنُ بِمَيِّتِينَ ﴾، ئایا ئێمە نامرین، ئێمە لە مردووان نابین؟ ﴿ إِلَّا مَوْتَتَنَا الْأُولَىٰ ﴾، جگە لە مردنە یەکەمەکەمان، کە لە دنیادا ئەو مردنەمان چێژت، ﴿ وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴾، هەروەها ئایا ئێمە ئازاردراو و سزادراویش نابین، وەك ئەو دۆزەخییانە؟!

﴿ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴾، بەڕاستیی ئا ئەمەیە بردنەوەو سەرکەوتنی مەزن، بە ئامانج گەیشتن و بە مراد گەیشتنی مەزن ئا ئەوەیە، ﴿ لِمِثْلِ هَٰذَا فَلْيَعْمَلِ الْعَامِلُونَ ﴾، تەنیا با بۆ وێنەی ئەمە، کارکەران کار بکەن، تێکۆشەران هەوڵبدەن، ئەمە ئەوە دێنێ، ئەمە شایستەی ئەوەیە.

ئنجا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أَذَٰلِكَ خَيْرٌ نُّزُلًا أَمْ شَجَرَةُ الزَّقُّومِ ﴾، ئایا ئەو میواندارییە باشترە، یاخود درەختی زەققوم، واتە: ئایا بەو شێوەیە میوانداریی بکرێ لە بڕواداران لە بەهەشتدا، ئەوە باشترە، یاخود درەختی زەققوم، ببێتە ئەو خواردنەی وەك میوان کە تازە دادەبەزێ، خواردنی بۆ دێنن، ئەو خواردنە (زەققوم) بکرێتە خواردنی کەسانێك کە لە دۆزەخدا میوانداریی دەکرێن، بەو شێوەیە میوانداریی‌یان لێ دەکرێ بە درەختی زەققوم، ﴿ إِنَّا جَعَلْنَاهَا فِتْنَةً لِّلظَّالِمِينَ ﴾، ئێمە درەختی زەققومەمان کردوە بە تاقیکردنەوە بۆ ستەمکاران، کە بڵێن: چۆن درەخت لە ئاگردا سەوز دەبێ؟ یاخود: (فِتْنَة) بە مانای سزادان و ئازارە، یانی: کردوومانە بە مایەی ئازارو جەزرەبە بۆ ستەمکاران، کە بەرەکەی زۆر تاڵ و گەرم و، تفت و ناخۆشە.

﴿ إِنَّهَا شَجَرَةٌ تَخْرُجُ فِي أَصْلِ الْجَحِيمِ ﴾، زەققوم درەختێکە لە بنی کڵپەی دۆزەخ دێتە دەرێ، ﴿ طَلْعُهَا كَأَنَّهُ رُءُوسُ الشَّيَاطِينِ ﴾، ئەوەی کە دەری دەکات، (کە لە شوێنی میوەو بەرە) وەك سەری شەیتانان وایە، هەڵبەتە کەس سەری شەیتانانی نەبینیوە، بەڵام هەموو کەس لە خەیاڵ و وەهمیدا، سەری شەیتانان

شـتێکی دزێـوو ناشـیرینە، خـوا ﷻ دەیـەوێ ئێمـە تێبگەیەنێ، ئەگەرنـا ئێمـە نازانیـن سـەری شـەیتانان چۆنـە، بـەڵام بـە گشـتیی دەزانیـن کـە سـەری شـەیتان، شـتێکی دزێـوو قەڵـب و ناقۆڵایـە.

﴿ فَإِنَّهُمْ لَآكِلُونَ مِنْهَا فَمَالِئُونَ مِنْهَا ٱلْبُطُونَ ﴾، بـە دڵنیایـی ئـەوان لـەو درەختـی زەققومـە دەخـۆن و، ورگیانـی لـێ دەئاخنـن، گەدەیانـی لـێ پـڕ دەکـەن واتـە: هـەر ئەوەندەیـە گەدەیـان پـڕ دەبـێ، ئەگەرنـا وانیـە هیـچ لەززەتێکـی تێـدا هەبـێ، یـان برسـیەتییان لە کـۆڵ بخـات، ﴿ ثُمَّ إِنَّ لَهُمْ عَلَيْهَا لَشَوْبًا مِّنْ حَمِيمٍ ﴾، دوایـی بـۆ ئـەوان هەیـە تێکەڵەیـەك لـە ئـاوی کـوڵاو و داغ، یـانی: ئـاوی کـوڵاو و داغ لەگەڵـی دا ئاوێتـە دەبـێ، ﴿ ثُمَّ إِنَّ مَرْجِعَهُمْ لَإِلَى ٱلْجَحِيمِ ﴾، دوای ئـەوەی لـە درەختـی زەققومیـان خـواردو، لـە کانیـاوی کـوڵاوو داغیشـیان خـواردەوەو تێکەڵیـان کـرد لەگـەڵ ئـەو خواردنـەدا، ئنجـا دواییـش گێڕانەوەیـان بـۆ نێـو کڵپـەی دۆزەخـە.

یەکێـك بـۆی هەیـە بپرسـێ: بۆچـی بـەو شـێوەیە جەزرەبـە دەدرێـن؟ خـوا ﷻ بـە زۆریـی لـە قورئانـدا کـە باسـی سـزا دەکات، باسـی پاداشـت دەکات، باسـی هۆکارەکەشـی دەکات، دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّهُمْ أَلْفَوْاْ ءَابَآءَهُمْ ضَآلِّينَ ﴾، ئەوانـە بـاب و باپیرانیـان بـە گومڕایـی لـێ هەڵکەوتبـوو، بینیبوویانـن کـە گومـڕاو سـەرگەردانن، ﴿ فَهُمْ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِمْ يُهْرَعُونَ ﴾، ئەوانیـش یەکسـەر بـە شـوێنەواری وانـدا ڕەتێندرابـوون، (يَهْرَعُون)یـش خوێندراوەتـەوە یـانی: بە خێرایـی ڕۆیشـتبوون، (يُهْرَعُـون) ڕەتێندرابوون، تـاو درابـوون، وەك ویسـت و خواسـتی خۆیـان لـە ئـارادا نەبـێ، یەکسـەر بـە دوای ئـەوان کەوێنرابـوون و ڕەتێنرابـوون.

﴿ وَلَقَدْ ضَلَّ قَبْلَهُمْ أَكْثَرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴾، بـە دڵنیایـی زۆربـەی پێشـووەکانیش گومـڕا بووبـوون، زۆربـەی پێشووەکانیشـیان سـەرگەردان و سەرلێشـێواو بـوون، بـەڵام ئایـا کـە وا بـوون خـوا ﷻ وێڵـی کردبـوون و، لەبـەر ئـەوە بـووە کـە خـوا پەیامـی بـۆ نەناردبـوون؟ نەخێـر! ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا فِيهِم مُّنذِرِينَ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە هۆشیارکەرەوان

و وریاكــەرەوان و ترســێنەرانمان تێــدا ڕەوانــە كردبــوون، كــە پێغەمبەرانــن (**عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم**).

﴿ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴾، تنجا سـەرنج بدە، سـەرەنجامی ترسێنراوان و ئاگادارکــراوان چــۆن بــوو! لــە ئەنجامــی ئــەوەدا كــە بــە دەم بانگــی خــوای پــەروەردگارەوە نەهاتــن و گوێیــان نــەدا بــەو هۆشــیاركەرەوانە كــە پێغەمبەرانــن (**عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم**)و، گوێیــان بــۆ نەگرتــن و ڕێزیــان لــێ نەگرتــن، تەماشــا بكــە ســەرەنجامیان چــۆن بــوو! ﴿ إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴾، جگــە لــە بەنــدە هەڵبژاردەكانی خـوا، بەنـدە هەڵبژاردەكانـی خـوا، كـە بـە دوای پێغەمبـەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم**) كەوتــن و، ڕێــزی پێغەمبەرانیــان گــرت و پەیڕەوییــان لــێ كــردن، ئــەوان دیــارە حــاڵ و حیســابێكی دیكەیــان هەیــە، كــە پێشــتر بــاس كــرا.

## مەسەلە گرنگەکان

**مەسەلەی یەکەم:**

**ڕوو لـە یەکـدی کردنـی بەهەشـتییان و گفتوگـۆ پێکـەوە کردنیـان و، یادکردنەوەی یەکێکیـان بـۆ هاونشـینێکی بێبـڕوای لـە دنیـاداو، پێشـنیار کردنـی بـۆ هاوەڵـە بەهەشـتییەکانی کـە سـۆراغی بکـەن و، سـەرەنجام دیتنـی لـە ناوەڕاسـتی دۆزەخ داو، سەرزەنشـتکردنی کـە خەریـك بـووە گومـڕای بـکات و، ستایشـی خـوا کردنـی کـە پاراسـتوویەتی لـە گومڕابـوون:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ ﴿٥٠﴾ قَالَ قَائِلٌ مِّنْهُمْ إِنِّي كَانَ لِي قَرِينٌ ﴿٥١﴾ يَقُولُ أَئِنَّكَ لَمِنَ الْمُصَدِّقِينَ ﴿٥٢﴾ أَئِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَامًا أَئِنَّا لَمَدِينُونَ ﴿٥٣﴾ قَالَ هَلْ أَنتُم مُّطَّلِعُونَ ﴿٥٤﴾ فَاطَّلَعَ فَرَآهُ فِي سَوَاءِ الْجَحِيمِ ﴿٥٥﴾ قَالَ تَاللَّهِ إِن كِدتَّ لَتُرْدِينِ ﴿٥٦﴾ وَلَوْلَا نِعْمَةُ رَبِّي لَكُنتُ مِنَ الْمُحْضَرِينَ ﴿٥٧﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە یازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَاءَلُونَ ﴾، یەکسەر هەندێکیان (بەهەشتییەکان) ڕوویان کردە هەندێکیان، پرسیاریان لە یەکدی دەکرد. پێشتر گوتمان: بۆچی لێرە بە: (فاء التعقيب) (ف)ی بەدواداهاتن گوتراوەو، لەولاش بە (واو العطف)، چونکە لەوێ بەهۆی (و)وە، یانی: وێڕای ئەو مەینەتییانەی کە لە کاتی لێپرسینەوەدا بوویانن، مەینەتییەکی دیکەشیان ئەوەیە کە لە دۆزەخیشدا سەرزەنشتی یەکدی دەکەن، بەڵام لێرە لەبەر ئەوەی کە بەهەشتییەکان لە بەهەشتدا دانیشتوون لە کۆڕو مەجلیسی خۆیان دا، ئنجا یەکسەر دوا بە دوای ئەوە، پێکەوە قسە دەکەن و دەدوێن دەربارەی حاڵ و باڵی

دنیایان، کە چۆنیان گوزەراندوەو، یەکیان یادی ئاشنایەکی خۆی دەکاتەوەو دەڵێ: با سۆراغی بکەین داخۆ لە کوێیە؟!

﴿ فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ﴾، هەندێکیان ڕوویان لە هەندێکیان کرد، حیکمەتی تێدایە کە بە کرداری ڕابردوو هێناویەتی، ئەگەر نا جارێ بەهەشت نەهاتوەو، ئیمانداران دانەنیشتوون لە بەهەشتدا، تاکو پێکەوە یەکدی بدوێنن، بەڵام بۆیە بە کرداری ڕابردوو هێناویەتی چونکە مسۆگەرە کە بەهەشت دێ و دۆزەخیش دێ، ئەو شتانەش کە خوا ﷻ باسی کردوون، دێن.

﴿ يَتَسَآءَلُونَ ﴾، پرسیار لە یەکدی دەکەن، ڕوویان لە یەکدی کرد، پرسیاریان لە یەکدی کرد، پرسیار لە یەکدی کردنە، کە نەیفەرموە لە بارەی چییەوە، (**حُذِفَ الْمُتَسَاءَلُ عَنْهُ لِدِلالَةِ مَا بَعْدَهُ عَلَيْهِ**) پرسیار لەبارەوە کراو قرتێنراوە چونکە ئەوەی دوایی دێ، دەیگەیەنێ، چونکە خوا ﷻ دوایی باسی دەکات.

٢)- ﴿ قَالَ قَآئِلٌ مِّنْهُمْ ﴾، قسەکەرێك لەوان گوتی، بەهەشتییەکان، کە پێکەوە دانیشتوون، بێژەرێکیان گوتی.

٣)- ﴿ إِنِّي كَانَ لِي قَرِينٌ ﴾ بەدڵنیایی من نیزیکێکم هەبوو، هاونشینێکم هەبوو، (**القَرِينُ: المُصَاحِبُ اللَّازِم، شُبِّه المُلَازَمَةُ الغَالِبَةُ بِالْقَرْنِ بَيْنَ شَيْئَيْنِ، بِحَيْثُ لا يَنْفَصِلان**)، (**قَرِين**) واتە: کەسێك، هاوەڵێکی نیزیك کە پێوەی پەیوەست بێ، ئنجا ئەم پێکەوە پەیوەست بوونە، چوێندراوە بە دوو شتانەوە کە لێك جیا نابنەوە.

٤)- ﴿ يَقُولُ أَءِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُصَدِّقِينَ ﴾، دەیگوت: ئایا تۆ لە بەڕاستدانەرانی؟ خوێندراویشەتەوە: (**إِنَّكَ**) واتە: بە بێ (**هَمْزَة الإستفهام**)، کە هەر یەك واتایان هەیە، ئایا تۆ لە بەڕاستدانەرانی؟ بە تەئکید (**أَءِنَّكَ**) یان (**إِنَّكَ**) پرسیار کردنە بۆ نکووڵیلێکردن، واتە: نەدەبوو ئەوە بە ڕاست دابنێی، نەدەبوو بڕوات بە شتی وا هەبێ، کە چییە؟

٥)- ﴿ أَءِذَا مِتۡنَا وَكُنَّا تُرَابٗا وَعِظَٰمًا ﴾، ئایا ئەگەر مردین و بووینەوە خۆڵ و، ئێسکەکان واتە: ئێسقانی پرتووکاو، ئەمیش دیسان (أَءِذَا)، خوێندراویشەتەوە: (إِذَا)، بەڵام بە شێوەی پرسیار کردن.

٦)- ﴿أَءِنَّا لَمَدِينُونَ ﴾، ئایا ئێمە سزاو پاداشتمان دەبێ، واتە: زیندوو دەکرێینەوەو، لێپرسینەوەمان لەگەڵ دا دەکرێ و، سەرەنجام بە پێی کردەوەکانمان سزاو پاداشتمان دەبێ، هەروەها (أَءِنَّا) خوێندراویشەتەوە: (إِنَّا).

(المَدِينُ: المُجَازُ، دَانَهُ، يَدِينُهُ: جَازَاهُ)، (مَدِين) واتە: سزا دراو، یان پاداشتدراوە، چونکە (دَانَهُ، يَدِينُهُ) واتە: سزای دا، یان پاداشتی دایەوە، کەواتە دەڵێ: ئایا ئێمە سزا یان پاداشت دەدرێینەوە؟

ئەو سێ وشەیە: (أَءِنَّكَ)، (أَءِذَا)، (أَءِنَّا)، هەرسێکیان بە هەمزەی پرسیارکردن (هَمْزَةُ الإِسْتِفْهَامِ)و بەبێ (هَمْزَةُ الإِستفهام)یش خوێندراونەوە، کە واتایان هەر یەکێکە.

٧)- ﴿ قَالَ هَلۡ أَنتُم مُّطَّلِعُونَ ﴾[ئەو بێژەرە کە لە کۆڕی بەهەشتییەکان دا قسەی کرد] گوتی: ئایا ئێوە دەتانەوێ هەواڵ بزانن؟ ئەم پرسیار کردنە: ﴿ هَلۡ أَنتُم مُّطَّلِعُونَ ﴾، بەکارهێنراوە لە پێشنیار کردندا، واتە: ئایا دێن سۆراخی ئەهلی دۆزەخ بکەین، تاکو بزانن داخۆ ئەو ئاشنایەی من لە کوێیە؟ لە کوێی دۆزەخییانەو لە کوێدا سەقامگیر بووە؟!

٨)- ﴿ فَٱطَّلَعَ فَرَءَاهُ فِي سَوَآءِ ٱلۡجَحِيمِ ﴾، [ئنجا ئایا ئەوانیش لەگەڵیدا سەرنجیان داوە یان نا، گرنگ ئەوەیە] بۆ خۆی یەکسەر سەرنجیداو یەکسەریش بینی لە نێوەڕاستی کڵپەی دۆزەخدایە، هەڵبەتە کە دەفەرموێ: ﴿ فَٱطَّلَعَ فَرَءَاهُ ﴾، خوای پەروەردگار کورتی کردۆتەوە، ئەگەرنا یانی: (فَاطَّلَعَ وَاطَّلَعُوا فَرَآهُ وَرَأَوْهُ) یانی: سەرنجیداو سەرنجیان دا، ئنجا دیتی و دیتیان، بەڵام بۆ کورتکردنەوە خوا ﷻ تەنیا ئەوی باس کردوە، (وَاقْتَصَرَ عَلَى ذِكْرِ اطِّلَاعِهِ هُوَ دُونَ ذِكْرِ اطِّلَاعِ رُفَقَائِهِ، لأَنَّهُ ابْتَدَأَ بِالإِطِّلَاعِ لِيُمَيِّزَ قَرِينَهُ فَيُرِيهِ أَصْحَابَهُ)

بۆیەش تەنیا خوا ﷻ باسی تەماشا کردن و سەرنجدانی بێژەرەکەی کردوە، نەك هی هاوەڵەکانی، چونکە ئەو پێشێ تەماشای کردوە، تاکو بیدۆزێتەوە، ئەوان چووزانن ئەو ئاشنایەی ئەو کێیە؟ دەبووایە ئەو بیدۆزێتەوە، ئنجا دوایی پیشانیان بدات و بڵێ: ئەوەتا ئەها ئەو کەسە بوو کە مەبەستم بوو، کە لە دنیادا لێم نیزیك بوو، هاونشینم بوو، ئاشنام بوو، قسەی ئاوا بوو، ئێستاش ئەوە سەرەنجامی ئاوایە، بە پێی ئەو قسەو ئیعتیقادە هەڵەو پووچەی کە هەیبوو.

٩)- ﴿ قَالَ تَٱللَّهِ إِن كِدتَّ لَتُرۡدِينِ ﴾، بەهەشتییەکە بە دۆزەخییەکەی گوت: سوێند بە خوا نیزیك بوو بمفەوتێنی، (لَتُرْدِين) هەم بە ژێریش (كَسْرَة) خوێندراوەتەوە، هەم بە (ي)یش (لَتُرْدِيني)، ئەگەر بە ژێر (كَسْرَة)ش بێ، ژێرەکە لە شوێنی (ي) کە دادەنیشێ.

١٠)- ﴿ وَلَوۡلَا نِعۡمَةُ رَبِّي ﴾، ئەگەر چاکەی پەروەردگاریشم بە سەرمەوە نەبووایە.

١١)- ﴿ لَكُنتُ مِنَ ٱلۡمُحۡضَرِينَ ﴾، منیش لە ئامادەکراوان دەبووم، (مُحْضَرِين: الْمَجْلُوبِيْنَ إِلى جَهَنَّم) واتە: لە پەلکێش کراوان بۆ دۆزەخ دەبووم.

واتـە: پاراسـتنی خـواو، پارمەتـی خـوا کـە دەسـتم بـە ئیسـلامەوە گـرت، خـوا پارمەتیـی دام دەسـت بـە ئیسـلامەوە بگـرم، ئـەوە وای لێکـردم کـە مـن پارێـزراو بـم، ئـەوە چاکـەی پـەروەردگارم بـوو لەسـەرم، ئەگەرنـا منیـش ئێسـتا لەگـەڵ تـۆ لـە ئامادەکـراوان دەبـووم.

## چوار کورتە سەرنج

**١- کردنی پیتی (ت) بەئامرازی سوێند خواردن (تَالله):**

بەکارهێنانی پیتی (ت) بۆ سوێند خواردن، لە قورئاندا بە زۆریی وا هاتووە، کە لە وەڵامی سوێندێك دادێ، کە سوێندەکە سەیرو نامۆ بێ، بۆ نموونە:

أ- لە سوورەتی (یوسف)دا دەفەرمویٚ: ﴿ قَالُوا۟ تَٱللَّهِ لَقَدْ عَلِمْتُم مَّا جِئْنَا لِنُفْسِدَ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا كُنَّا سَـٰرِقِينَ ﴿٧٣﴾ ﴾، (برایەکانی یوسوف بە جارچییەکە) دەڵێن: سوێند بە خوا ئێوە زانیوتانە کە ئێمە نەهاتووین خراپەکاریی بکەین و، ئێمە کاتی خۆیشی دز نەبووین.

تۆمەتبارکرانیان بەدزیی شتێکی سەیرە، بۆیە بە (ت) هێناویەتی.

ب- لە سوورەتی (الأنبیاء)دا کە ئیبراهیم ﷺ دوای ئەوەی بابی و خەڵکەکەی دەچنە دەر، ئەویش دەڵێ: ﴿ وَتَٱللَّهِ لَأَكِيدَنَّ أَصْنَـٰمَكُم ﴿٥٧﴾ ﴾، واتە: سوێند بە خوا، دەبێ فێڵێك لە بتەکانتان بکەم، واتە: بیانشکێنم، هەڵبەتە شکێنرانی بتەکانیان بۆ ئەو خەڵکە شتێکی سیرو نامۆ بووە.

ج- لێرەش کە دەفەرمویٚ: ﴿ تَٱللَّهِ إِن كِدتَّ لَتُرْدِينِ ﴾، واتە: سوێند بە خوا نیزیك بوو منیش بفەوتێنی.

کە بێگومان شتێکی نامۆو جێی عاجباتیی دەبوو توانیبای بیفەوتێنێ.

هەرسێکیان شتی غەریب و سەیرن، بۆیە پیتی (ت) بەکار هاتووە، کەواتە دیارە لە قورئاندا خوا ﷻ وەختێ (ت)ی بۆ سوێند بە کارهێناوە، کە ئەو شتە شتێکی سەیرو نامۆ بێ.

٢- وشەی (لَتُرْدِينِ) یانی: (لَتُهْلِكُنِي) بمفەوتێنی، چونكە (الرَّدَى: الهَلاك)، (رَدَى) بە مانای فەوتانە، ﴿ إِن كِدتَّ لَتُرۡدِينِ ﴾، نیزیك بوو منیش بفەوتێنی، وەك خۆتم لێبكەی و بە مەرەدی خۆتم بەری.

٣- كە دەفەرموێ: ﴿ إِن كِدتَّ لَتُرۡدِينِ ﴾، نیزیك بوو من بفەوتێنی، ئەم (ل)ی سەر (لَتُرْدِينِ) كە چۆتە سەر (خَبَر كَادَ) ئەم (ل)ە جیاكەرەوەی نێوان (إن)ی (المُخَفَّفَة)یە، كە بۆ جەختكردنەوەیە، لەگەڵ (إن)ی (النافية) كە بۆ لابردنە، لێرەدا ئەگەر گوترابا: (إِنْ كِدْتَّ) یانی: (مَا كُنْتَ)، بەڵام كە گوتراوە: ﴿ إِن كِدتَّ لَتُرۡدِينِ ﴾، ئەم (ل)ە بۆ ئەوەیە كە بزاندرێ، (ن)ی جەختكردنەوەو تەئكیدە، یانی: (إن المُخَفَّفَة) لە (المُثَقَّلَة) نەك (إِنْ النافِيَة)، ئەگەر لابەرە (نافية) بووایە، دەیفەرموو: (إِنْ كِدْتَّ تُرْدِينِ) تۆ خەریك نەبوو من بفەوتێنی، بەڵام لێرە بە عەكسەوە: بە دڵنیایی تۆ نیزیك بوو من بفەوتێنی.

زانایـان ئاوایـان تەعبیـر كـردوە: (قَارَبْـتَ أَنْ تُفْـضِيَ بِي إِلَى حَـالِ الـرَّدَى بِإِلْحَاحِـكَ فِي صَرْفِي عَنِ الإِيمَـان) واتـە: نیزیـك بـوو منیـش بخەیـە نێـو حاڵەتـی فەوتانـەوە، بـە هـۆی ئـەوەوە كـە تـۆ سـوور بـووی و زۆر داكۆكییـت لـێ دەكـردم، مـن لـە ئیمان لابـدەی.

٤- ئەم ئایەتە موبارەكانە ئەو ڕاستییەیان لێ دەفامرێتەوە، كە دەبێ مرۆڤ زۆر وریاو هۆشیار بێ، لە هاوەڵ و هاونشینی خراپ، ئەگەر لێی وریا نەبی ڕەفیقی خراپ وەك پێشینان دەڵێن: {برادەر دین دەرەو دین بەرە} بێگومان برادەری چاك زۆر چاكەو، هاوەڵی خراپیش زۆر خراپە.

**مەسەلەی دووەم:**

**خۆشحاڵیی دەربڕینی بەهەشتییان کە لە بەهەشتیدا مردنیان بەسەردا نایەت، جگە لە مردنی یەکەمی دنیاو، ئازار نابینن، ئەوەش بە بردنەوەی مەزن دادەنێن و دەڵێن: هەر ئەو سەرەنجامە شایستەی تێکۆشان و ڕەنج بۆ دانە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أَفَمَا نَحْنُ بِمَيِّتِينَ ﴿٥٨﴾ إِلَّا مَوْتَتَنَا الْأُولَىٰ وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴿٥٩﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴿٦٠﴾ لِمِثْلِ هَٰذَا فَلْيَعْمَلِ الْعَامِلُونَ ﴿٦١﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ أَفَمَا نَحْنُ بِمَيِّتِينَ ﴿٥٨﴾ إِلَّا مَوْتَتَنَا الْأُولَىٰ ﴾، ئایا ئێمە لە مردووان نابین، جگە لە مردنە یەکەمەکەمان، واتە: ئەو مردنەی لە دنیادا چێژتمان؟ بەهەشتییان لە نێو خۆیاندا ئەو قسانە دەکەن: ئایا ئێمە نامرین! جگە لەو مردنەی یەکەمجار! بە سەرسوڕمانەوە، ﴿ أَفَمَا نَحْنُ بِمَيِّتِينَ ﴾، ئەم پرسیار لێکردنە هەر لە بێژەرەکەوەیە کە لەگەڵ هاوەڵەکانی دەپرسێ، بەڵام لە پرسیار کردنەکەیدا، مەبەستێ ئەوە نیە وەڵامی دەست بکەوێ، بەڵکو بۆ سەرسوڕماندنە، یانی: بە ڕاستیی شتێکی زۆر باش و جێی سەرسوڕمان و دڵخۆشبوونە، کە ئێمە جارێکی دیکە نامرین جگە لە مردنی یەکەم.

﴿ إِلَّا مَوْتَتَنَا الْأُولَىٰ ﴾، ئەم هەڵاواردنەش هەڵاواردنێکی دابڕاوەو بە مانای (لکن)ە، یانی: بەڵام مردنی یەکەم ئەوە دیارە تێپەڕیوە.

٢)- ﴿ وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴾، ئایا ئێمە لە سزادراوان و ئازاردراوانیش نابین؟

٣)- ﴿ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴾، بە دڵنیایی هەر ئەمە بردنەوەو سەرکەوتنی مەزنە، (الْفَوزُ: الظَّفَرُ بِالْمَطْلُوب) (فوز) بریتیە لە بە مراد گەیشتن و بەدەستهێنانی ئامانج.

٤)- ﴿ لِمِثْلِ هَٰذَا فَلْيَعْمَلِ الْعَامِلُونَ ﴾، با تەنیا بۆ وێنەی ئەمە، تێکۆشەران تێبکۆشن، هەوڵدەران هەوڵبدەن، کارکەران کار بکەن واتە: بەس ئەوە شایستەی بۆ تێکۆشانە،

(ل)ی (لِمِثْلِ هَذَا)، (لام لِلتَّعلِيلِ، وَتَقْدِيمِ المَجْرُورِ عَلى عَامِلِهِ لإفادَةِ القَصْرِ، أي لا لِعَمَلِ غَيْرِهِ والْمَعْنَى: لِنَوالِ مِثْلِ هَذا)، کە دەفەرموێ: ﴿لِمِثْلِ هَٰذَا فَلْيَعْمَلِ ٱلْعَٰمِلُونَ﴾،(ل) بۆ هۆکار دۆزییەو پێشخستنی ژێردار کراو لەسەر کردارەکەی، ئەمە کورتهەڵێنان (قَصْر) دەگەیەنێ واتە: تەنیا بۆ ئەوەو ئەو ئامانجە شایستەیە خەڵك کاری بۆ بکات و با بۆ گەیشتن بەو ئامانجە، خەڵك کار بکات.

(الطبري) لە تەفسیرەکەی خۆی دا[1] دەڵێ: {يَقُول تَعَالَى ذِكْره: لِمِثْلِ هَذَا الَّذِي أَعْطَيْت هَؤُلَاءِ الْمُؤْمِنِينَ مِنْ الْكَرَامَة فِي الْآخِرَة، فَلْيَعْمَلْ فِي الدُّنْيَا لِأَنْفُسِهِمْ الْعَامِلُونَ، لِيُدْرِكُوا مَا أَدْرَكَ هَؤُلَاءِ بِطَاعَةِ رَبّهمْ}واتە: خوا ناوی بەرز بێ، دەفەرموێ: با بۆ وێنەی ئەوە کە داومە بەو بڕوادارانە، لە ڕێز لێگرتن لە ڕۆژی دواییدا، با ئەوانەی لە دنیادان کار دەکەن بۆ خۆیان، ئەوە بکەن، تاکو ئەوەی ئەوانە پێیگەیشتوون، بە فەرمانبەریی بۆ پەروەردگاریان، ئەوانیش پێی بگەن.

---

(١) جامع البيان: ج٢٣، ص٦٥.

**مەسەلەی سێیەم:**

**بەراوردکردنـی جێـگاو ڕێـگای بـڕواداران لـە بەهەشـتدا، لەگـەڵ شـێوەی میوانداریـی کـردن لـە ستەمکاران کـە بـەری درەختـی زەققـوم خۆراکیانـەو، ئـاوی کوڵیـوو داغ خواردنەوەیانـە، لـە برسـان ورگیانـی لـێ دەئاخنـن، پاشـان دەبرێنـەوە نێـو کڵپـەی ئاگـری دۆزەخ:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿أَذَٰلِكَ خَيْرٌ نُّزُلًا أَمْ شَجَرَةُ ٱلزَّقُّومِ ﴿٦٢﴾ إِنَّا جَعَلْنَٰهَا فِتْنَةً لِّلظَّٰلِمِينَ ﴿٦٣﴾ إِنَّهَا شَجَرَةٌ تَخْرُجُ فِىٓ أَصْلِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٦٤﴾ طَلْعُهَا كَأَنَّهُۥ رُءُوسُ ٱلشَّيَٰطِينِ ﴿٦٥﴾ فَإِنَّهُمْ لَءَاكِلُونَ مِنْهَا فَمَالِـُٔونَ مِنْهَا ٱلْبُطُونَ ﴿٦٦﴾ ثُمَّ إِنَّ لَهُمْ عَلَيْهَا لَشَوْبًا مِّنْ حَمِيمٍ ﴿٦٧﴾ ثُمَّ إِنَّ مَرْجِعَهُمْ لَإِلَى ٱلْجَحِيمِ ﴿٦٨﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿أَذَٰلِكَ خَيْرٌ نُّزُلًا أَمْ شَجَرَةُ ٱلزَّقُّومِ﴾، ئایا ئەو بەهەشتەی باسکرا، باشترە بۆ میوانداریی لێکردن، وەك خۆراکێك کە بۆ میوان دادەنرێ، یان درەختی زەققووم؟! (**النُّزْل وَالنُّزُل**) بە بۆر (**ضَمَّة**) و بە زەنە (**سُكُون**): (**الْمَكَانُ الَّذِي يَنْزِلُ فِيهِ النَّازِلُ، وَأُطْلِقَ عَلَى الطَّعَامِ الْمُهَيَّإِ لِلضَّيْفِ**)، (**نُزْل ونُزُل**) هەم بە شوێنێك کە میوان لێی دادەنرێ، دەگوترێ و، هەم بە خواردنێکیش کە ئامادە دەکرێ بۆ میوان، کە دەفەرموێ: (**أَذَٰلِكَ**) ئەم پرسیار کردنە پرسیار کردنێکە بۆ سەرسوڕماندن، واتە: ئایا ئەو شێوە میواندارییکردنە کە بۆ بەهەشتییان دەکرێ، هەم بە نسبەت جێگاو ڕێگایانەوە، هەم بە نسبەت خواردن و خۆراکیانەوە، باشترە، یان درەختی زەققووم؟!

ئنجـا خـوا ﷻ باسـی درەختـی زەققـووم دەکات، کـە درەختـی زەققـووم خـوا لـە چەنـد شـوێنێکی قورئانـدا، باسـی کـردوە، بـۆ وێنـە:

أ- لە سووڕەتی (**الواقعة**)دا دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ إِنَّكُمْ أَيُّهَا ٱلضَّآلُّونَ ٱلْمُكَذِّبُونَ ﴿٥١﴾ لَءَاكِلُونَ مِن شَجَرٍ مِّن زَقُّومٍ ﴿٥٢﴾ فَمَالِـُٔونَ مِنْهَا ٱلْبُطُونَ ﴿٥٣﴾ فَشَٰرِبُونَ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْحَمِيمِ ﴿٥٤﴾ فَشَٰرِبُونَ شُرْبَ ٱلْهِيمِ ﴿٥٥﴾ هَٰذَا

نُزُلُهُمْ يَوْمَ الدِّينِ ﴿٥٦﴾، واتە: ئنجا ئێوە ئەی گومڕا بووە بە درۆدانەرەکان! لە درەختی زەققووم دەخۆن. سکتانی لێ پڕ دەکەن . ئاوی کوڵیوو داغی وەسەر دەکەن (لەسەر دەخۆنەوە). وەك حوشترانێك کە تووشی نەخۆشیی تێرئاونەبوون (هیام) بوون {حوشتر تووشی نەخۆشییەك دێ، بە هیچ شێوەیەك تێراو نابێ، ئێوەش هێندە دەخۆنەوە} ئەمە شێوەی میوانداریی لێکردنی بێبڕوایانە لە ڕۆژی دوایی دا.

ب- هەروەها لە سووڕەتی (الدخان)یشدا، خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ شَجَرَتَ الزَّقُّومِ ﴿٤٣﴾ طَعَامُ الْأَثِيمِ ﴿٤٤﴾ كَالْمُهْلِ يَغْلِي فِي الْبُطُونِ ﴿٤٥﴾ كَغَلْيِ الْحَمِيمِ ﴿٤٦﴾ ﴾، واتە: بە دڵنیایی درەختی زەققووم، خۆراکی گوناهبارو تاوانبارە. وەك مسی تواوە (گەرمە) لە سکەکاندا دەکوڵێ، وەك کوڵینی ئاوی داغ دەکوڵێ، {ئاوا لە سکیان دا دەکوڵێ}.

ج- لێرەش دەفەرموێ:

٣)- ﴿ إِنَّا جَعَلْنَاهَا فِتْنَةً لِّلظَّالِمِينَ ﴾، ئێمە کردوومانە بە فیتنە بۆ ستەمکاران، واتە: هەواڵی ئەو درەختەمان کردوە بە تاقیکردنەوە بۆ ستەمکاران، یاخود (فِتْنَة) بە مانای سزاو ئازار دێ، یانی: کردوومانە بە بەڵاو سزاو مەینەتیی بۆ ستەمکاران، خودی زەققووم و بەرەکەی مایەی پێ ئازارو ئەشکەنجەدرانیانە.

٤)- ﴿ إِنَّهَا شَجَرَةٌ تَخْرُجُ فِي أَصْلِ الْجَحِيمِ ﴾، {ئەو زەققووم}ە، درەختێکە لە بنی ئاگری دۆزەخ دێتە دەرێ.

٥)- ﴿ طَلْعُهَا كَأَنَّهُ رُءُوسُ الشَّيَاطِينِ ﴾، دەرکردووەکەی، بەرەکەی، وەك سەری شەیتانان وایە، (الطَّلْعُ إِسْمٌ لِثَمَرِ النَّخْلِ) (طَلْع) بە کیفی هێشووە خورما دەگوترێ، بەڵام لێرەدا بەکارهێنراوە، بۆ ئەو بەرەی زەققووم دەری دەکات.

زانایان گوتوویانە: کە دەفەرموێ: وەك سەری شەیتانان وایە، عەرەب عادەتیان وابووە، ئەگەر ویستبایان شتێك ناقۆڵاو دزێو پێشاندەن، دەیانگوت: (كَأَنَّهُ رَأْسُ الشَّيْطَان) دەڵێی سەری شەیتانە، با کەسیش سەری شەیتانی نەدیبێ، بەڵام لە

خەیاڵدان (مُخَيِّلَة)ی هەموو کەس دا وایە، کە شەیتان بۆ خۆی دزێوو ناقۆڵایەو سەلك و سەرەکەشی دزێوو ناقۆڵاو ناشیرینە.

هەندێکیش گوتوویانە: (شَيطان: رَأسُ حَيَّةٍ مَعْرُوفَةٍ عِنْدَ الْعَرَبِ تُسَمَّى شَيْطَاناً) کە دەفەرموێ: بەرەکەی وەك سەری شەیتانە، شەیتان جۆرە مارێکە، لە نێو عەرەباندا ناسراوە، کە پۆپەی هەیەو، زۆر دزێوو ناشیرین و قەڵبە.

٦)- ﴿ فَإِنَّهُمْ لَآكِلُونَ مِنْهَا ﴾، بە دڵنیایی ئەوان لێی دەخۆن (لەو بەرە).

٧)- ﴿ فَمَالِئُونَ مِنْهَا ٱلْبُطُونَ ﴾، ئنجا ورگانی لێ پڕ دەکەن، واتە: برسییەتییان لانابات، تەنیا گەدە پڕ بوونەو ورگیانی لێ دەئاخنن.

یاخود کە دەفەرموێ: ﴿ فَمَالِئُونَ مِنْهَا ٱلْبُطُونَ ﴾، واتە: زۆر بە خێرایی قووتی دەدەن و دەیخۆن، چونکە زۆر تاڵ و گەرم و ناخۆشە، خوا خوایانە زوو لە زاریان ئاودیو بێ و، بە گەروویاندا بچێتە گەدەیانەوە.

٨)- ﴿ ثُمَّ إِنَّ لَهُمْ عَلَيْهَا لَشَوْبًا مِّنْ حَمِيمٍ ﴾، دوایی بۆ ئەوان هەیە لەسەر ئەو خواردنی زەققوومە، تێکەڵەیەك لە ئاوی کوڵیوو داغ، هەروەك لە سوورەتی (الواقعة)دا دەفەرموێ: ﴿ فَشَٰرِبُونَ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْحَمِيمِ ۝٥٤ فَشَٰرِبُونَ شُرْبَ ٱلْهِيمِ ۝٥٥ ﴾، واتە: لە ئاوی کوڵاو داغی بەسەردا دەخۆنەوە، کە خواردنەوەکەشیان وەك خواردنەوەی حوشترانێکە کە تووشی نەخۆشیی تێر ئاو نەبوون بوون.

(حَمِيم)یش ئەو ئاوەیە کە دەگاتە ئەوپەڕی پلەی گەرمیی، کە لەوە گەرمتر نەبێ.

وشەی (شَوْب) یانی: (خَلْط، مَزْج) کە لێرەدا چاوگەو بە مانای (مفعول)ە، وەك (خَلق) بە مانای (مَخْلُوق)، (لَشَوْباً) یانی: (لَخَلْطاً) بە مانای (مَخْلُوط)ە یانی: تێکەڵەیەك لە ئاوی کوڵاو بۆ ئەوان هەیە، ئنجا تێکەڵەیەك لە ئاوی کوڵاو ئەوە دەگەیەنێ کە ئاوە داغ و کوڵاوەکە شتی دیکەشی ئاوێتەکرابێ، وەك کێم و زووخاو.

٩)- ﴿ ثُمَّ إِنَّ مَرْجِعَهُمْ لَإِلَى ٱلْجَحِيمِ ﴾، لە دوای ئەو هەموو مەینەتییەش کە درەختی زەققووم دەخۆن و ئاوی کوڵیوو داغی لەسەر دەخۆنەوە بەو ناڕەحەتییە، دواییش گێڕانەوەیان بۆ نێو کڵپەی دۆزەخە، واتە: دووبارە دەچنەوە بۆ ئەوێ.

هەردووك وشەی (ثُمَّ): ﴿ ثُمَّ إِنَّ لَهُمْ عَلَيْهَا لَشَوْبًا مِّنْ حَمِيمٍ ﴿٦٧﴾ ثُمَّ إِنَّ مَرْجِعَهُمْ لَإِلَى ٱلْجَحِيمِ ﴿٦٨﴾ ﴾، بۆ پلە بەندیی (الترتيب)ن، نەك بۆ هەواڵ پێدان واتە: دوای ئەوەی لە درەختی زەققووم ورگی خۆیان ئاخنیوە، ئنجا پلەیەکی دیکە لەوە پێهەڵاتر ئەوەیە کە ئاوی داغیشی لەسەر دەخۆنەوە، دوایی پلەیەکی دیکە لەوەش پێهەڵاتر ئەوەیە، کە دەبرێنەوە نێو کڵپەی ئاگریش، یانی: هەر جارە ئەوەی دوایی لەوەی پێشێ ناخۆشترە.

**مەسەلەی چوارەم و کۆتایی:**

**خستنە ڕووی هۆکاری ئەو سەرەنجامە شوومەی بێبڕوایان، کە بریتیە لە لاسایکردنەوەی کوێرانەی پێشینانیان و، گوێنەدان بە هۆشیارکرنەوەی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ):**

خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُمْ أَلْفَوْا آبَاءَهُمْ ضَالِّينَ ﴿٦٩﴾ فَهُمْ عَلَىٰ آثَارِهِمْ يُهْرَعُونَ ﴿٧٠﴾ وَلَقَدْ ضَلَّ قَبْلَهُمْ أَكْثَرُ الْأَوَّلِينَ ﴿٧١﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا فِيهِم مُّنذِرِينَ ﴿٧٢﴾ فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُنذَرِينَ ﴿٧٣﴾ إِلَّا عِبَادَ اللَّهِ الْمُخْلَصِينَ ﴿٧٤﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

دوای ئەوەی خوا ﷻ باسی سزادران و ئەشکەنجەو، جەزرەبەدرانی بێبڕوایان دەکات، پرسیارێك لە مێشکدا دەورووژێ: ئایا خوا ﷻ بۆچی وا بەو شێوەیە سزایان دەدات و هۆکاری چییە؟ سزایەکەیان زۆر سەختەو زۆر نارەحەتە، دەبێ چییان کردبێ؟ خوا ﷻ ڕوونی دەکاتەوە هۆکاری ئەو سزادرانەیان چییە؟ دەفەرموێ:

١)- ﴿إِنَّهُمْ أَلْفَوْا آبَاءَهُمْ ضَالِّينَ﴾، بەدڵنیایی ئەوان باب و باپیرانی خۆیانیان بە گومڕایی دیوە، ئەمە (تعليل) هۆکاردۆزییە، ئەوانە کە تووشی ئەو ئەنجامە سەخت و تاڵ و دژوارە بوون، بە هۆی ئەوەوەیە کە ئەوانە باب و باپیرانی خۆیانیان بە گومڕایی بینیوە، بە گومڕایی لێ هەڵکەوتوە، (أَلْفَوا) یانی: (وَجَدُوا)، باب و باپیرانی خۆیانیان بینیوەو لێ هەڵکەوتوە، کە گومڕا بوون.

٢)- ﴿فَهُمْ عَلَىٰ آثَارِهِمْ يُهْرَعُونَ﴾، ئنجا یەکسەر ئەوانیش بە دوای واندا، بە شوێنەواری ئەواندا ڕەتێندراون، (يُهْرَعُون) خوێندراویشەتەوە: (يَهْرَعُون)، چونکە (هَرِعَ، يَهْرَعُ، أَهْرَعَ، يُهْرِعُ) هەم بە (ثُلاثِي) هاتوە، هەم بە (رُباعي) واتە: بە خێرایی ڕۆیشت، (يُهْرَعُون) یانی: ڕەتێندراون، بکەرەکەی نادیارە، ناچار کراون بڕۆن، وەك ویست و ئیرادەی ئازادانەی

خۆیان لە دەست دابێ، یەکسەر بە دوای باب و باپیرانیاندا ڕەتێندراون و ڕایانکردوە، لە حاڵێکدا کە زانیویشیانە باب و باپیرانیان گومڕاو سەرگەردانن، یان: لە حاڵێکدا کە باب و باپیرانیان سەرگەردان و گومڕا بوون، دەبوایە پەندیان لێ وەربگرن، نەك بە دوایان بکەون.

ئنجا ئەم (ف)ە کە دەفەرموێ: ﴿ فَهُمْ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِمْ يُهْرَعُونَ ﴾، فائی لقلێکردنەوەو بوونە هۆکارە، (فَاءٌ لِلتفْرِيعِ وَالتَّسَبُّب) واتە: یەکسەر بە هۆی ئەوەوە کە باب و باپیرانیان گومڕا بوون، ئەوانیش یەکسەر کەوتنە شوێن ئەوان، (آثَار)یش کۆی (أَثَر)ەو ئەو شوێنەیە کاتێك کەسانێك کە دەڕۆن، جێ پێیەکانیان شوێنەوارێك بەجێ دێڵن، پێی دەگوترێ: (أَثَر)، کە بە (آثَار) کۆ دەکرێتەوە، واتە: یەکسەر بە شوێن پێی ئەواندا ئەوانیش ڕۆیشتوون و ڕایانکردوە.

(يُهْرَعُون مُضَارِعُ أُهْرَعَهُ، جَعَلَهُ هَارِعَاً)، (يُهْرَعُون) (مُضَارِع)ی (أُهْرَعَهُ)یە واتە: وای لێکرد بە خێرایی بڕوات.

٣)- ﴿ وَلَقَدْ ضَلَّ قَبْلَهُمْ أَكْثَرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴾، بە دڵنیایی لە پێش واندا زۆربەی پێشووانیشیان هەر گومڕا بوون، سەرگەردان بوون.

٤)- ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا فِيهِم مُّنذِرِينَ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە لە نێو واندا وریاکەرەوان و ترسێنەران و، هۆشیارکراوانێکمان ڕەوان کردبوون {ئەوە نەبووە کە بێئاگا بن}.

٥)- ﴿ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴾، بەڵام سەرنج بدە! سەرەنجامی ئاگادار کراوان و ترسێنراوان چۆن بوو! (أل)ی سەر (الْمُنْذَرِين) بۆ ناساندنە، بەڵام بۆ ناساندنی (عَهد)ە واتە: سەرنج بدە ئاگادار کراوەکان، ترسێنراوەکان سەرەنجامیان چەند تاڵ و دژوارو ناخۆش بوو، لەبەر چی؟ لەبەر ئەوەی گوێیان نەدایە ئەو ترساندن و هۆشیار کردنەوەیەی، خوا ﷻ لە ڕێی پێغەمبەرانەوە (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) بۆی ناردبوون.

٦)- ﴿ إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴾، جگە لە بەندە هەڵبژاردەکانی خوا.

هـەم لێـرە هـەم لـە شـوێنەکانی دیکـەش (مُخْلَصِـينَ) خوێندراویشـەتەوە: (مُخْلِصِينَ)، (مُخْلَـص) واتـە: هەڵبژێـردراو، (مُخْلِـص) واتـە: خـۆ سـاغکەرەوە، (مُخْلَـص) ساغکراوە، واتـە: خڵتـەی پێـوە نەهێڵـدراوە، خـۆ سـاغکەرەوە واتـە: خـۆی وا لێکـردوە خڵتـە بـە خۆیـەوە نەهێڵـێ، ژەنـگ و ژاری کوفـرو شـیرك و، نیفـاق و گوناهـو تـاوان بـە خۆیـەوە نەهێڵـێ، خـۆی سـاغ و صـاف بکاتـەوە بـۆ خـوا ﷻ.

واتـە: سـەرنج بـدە! سـەرەنجامیان چـۆن بوو، ئەوانـەی ئـاگادار کرابوونـەوە، ئاگادار کـراوەکان، جگـە لـە بەنـدە هەڵبژاردەکانـی خـوا، کـە ئـەوان سـەرەنجامیان بـاش بـوو، کـە دیـارە ئەمـە هەڵاواردنێکـی پەیوەسـتە (إِسْـتِثْنَاءٌ مُتَّصِـل) چونکـە هەڵاوێـردراو (مُستثنى)و لێهەڵاوێـردراو (مُستثنى منه) لـە ورووەوە کـە ئاگادارکراونـەوە، ئەوانـەی ئـاگادار کراونـەوەو ترسـێنراون، ئەوانەیـان کـە بێبـڕوا بـوون و گوێیـان نـەداوە بـە ئـاگادار کـردن و ترسـاندنی خـوا، سـەرەنجامیان خـراپ بـووە، بـەڵام ئەوانەیـان کـە گوێیـان گرتـوە بـۆ ئـاگادار کردنـەوەو ترسـاندنی خـوا، سـەرەنجامیان بـاش بـووە، کـە بەنـدە هەڵبژاردەکانـی خـوان، بـەڵام هەموویـان هـەر ئـاگادار کراونـەوەو ترسـێنراون.

بۆیـە ئینسـان دەبـێ وریـا بـێ و لـە ژیانیـدا، تەماشـای کەمیـی و زۆریـی خەڵـك نـەکات، بـە زۆرو بـۆر هەڵنەخەڵەتـێ، زانایـان قسـەیەکی جوانیـان هەیـە، دەڵێـن: {عَلَيْكَ بِطَرِيقِ الْحَقِّ وَلا تَسْتَوْحِشْ مِنْ قِلَّةِ السَّالِكِينْ، وَإِيَّاكَ وَطَرِيقِ الْبَاطِلِ وَلا تَغْتَرَّ بِكَثْرَةِ الْهَالِكِينْ}، واتـە: ڕێـی هـەق بگـرەو، هەسـت بـە نامۆیـی و، بـە کەمیـی مەکـە بـە هـۆی ئـەوەوە کـە کەمـی پێـدا دەڕۆن و، خۆشـت لـە ڕێـی ناهـەق بپارێـزەو، فریـو مەخـۆ بـەوەی کـە زۆری تێـدا فەوتـاون، ڕێـی ناهـەق زۆر کـەس تێیـدا سـەریان بـە فەتـارەت چـووە، بـەڵام خۆتـی لـێ دوور بگـرە، ڕێـی هەقیـش کەمـی پێـدا دەڕۆن، بـەڵام هەسـت بـە نامۆیـی و کەمیـی ڕێبـوارانی مەکـە، چونکـە هـەق هـەر هەقـە کەمیـش پێیـدا بـڕۆن و، ناهەقیـش هـەر ناهەقـە، بـا خەڵکـی زۆریـش پێیـدا بـڕوات و، قەڵەباڵغـی زۆریشـی تێـدا بـێ.

لـە خـوای پـەروەردگار داواکاریـن، بـە لوتـف و کەرەمـی خـۆی یارمەتییـمان بـدات، کـە وەك پێویسـت لـەو هەقـەی کـە لـە قورئـان و، لـە ڕێبـازی پێغەمبـەردا ﷺ بەرجەسـتەیە، تێبیگەیـن و پێـی ئاشـنا بیـن، پاشـان ئـەو تێگەیشـتنە لـە خۆمانـدا بکەینـە پێگەیشـتن، ئـەو ئاشـنا بوونـە لـە خۆمانـدا بکەینـە مایـەی کارا بـوون، بێگومان هـەر زانیاریـی و شـارەزاییەك مـرۆڤ لـە خـودی خۆیـدا چـاك نـەکات، خاوەنەکـەی لـە خۆیـدا چـاك نـەکات، لەسـەری قـەرزدارەو، ناشـتوانێ خەڵکـی دیکـەی لـێ بەهرەمەنـد بـکات، چونکـە خەڵـك پێـش ئـەوەی گـوێ لـە قسـە بگـرێ، تەماشـای کـردەوە دەکات، زمانـی کردەوانیـش زمانێکـی زۆر ڕوون و گۆیایـە، هەمـوو کـەس لێـی تێـدەگات، وەك لـە کتێبـی: (بـەرەو بانگەوازێکـی ڕاسـت و ڕەسـەن) کـە کتێبێك و ئەڵقەیـەك دەبـێ لـە مەوسـووعەی: (مسـوڵمانینە! بـا باشـتر تێبگەیـن و پێبگەیـن)[1]، لەوێـدا بـە تەفصیـل باسـم کـردووە، زۆر جەختـم لـەوە کردۆتـەوە، کـە هەمـوو ئەوانـەی دەیانـەوێ خەڵـك بـۆ لای خـواو بـۆ لای دینـی خـوا بانگبکـەن، دەبـێ ئـەوەی دەیڵێـن، لـە خۆیانـدا پراکتیـزەو بەرجەسـتەی بکـەن، خەڵـك لەوانـدا بـە جەرسـتەکراویی ببینـێ، پێغەمبـەری خاتـەم موحەممـەد ﷺ و هەمـوو پێغەمبـەران (عَلَيْهِـمُ الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَامُ) نموونـەی لـە خـۆدا بەرجەسـتەکردنی قسـەکانیان و مەبدەئەکانیـان بـوون، بۆیـە باشـترین سەرمەشـق بـوون بـۆ مرۆڤایەتیـی و، توانیویانـە بەڵگـەی خـوا لەسـەر خەڵـك تـەواو بکـەن.

خـوا بـە لوتـف و کەرەمـی خـۆی یارمەتیـی ئێمـەش بـدات، کـە ئێمـەش لـە قەدەر خۆمـان، بەڵگـە لەسـەر خەڵکـی ڕۆژگاری خۆمـان تـەواو بکەیـن و، وا بیـن ئـەوەی دەیڵێیـن، بیکەیـن و، کردەوەمـان ئەگـەر لـە قسـەمان جوانـترو باشـتریش نەبـێ، لانـی کـەم کـردەوەو قسـەمان پێکـەوە یـەك بـن.

---

(١) ئـەو زنجیرەیـە یـان مەوسـووعەیە، ئێسـتا لـە ژێـر چاپـەو، لـە دوازدە کتێـب پێکهاتـووەو ناوەکەیـشی گـۆڕاوە بـۆ: (بـەرەو باشـتر تێگەیشـتن و پێگەیشـتن).

خـوا بـە لوتـف و کەرەمـی خـۆی دەروونیشـمان پـاك و خاوێـن و، بـێ خـەوش بـكات، کـە دەروونیشـمان ئەگـەر لـە دەرو ڕووالّەتمـان جوانـتر نەبـێ، لانـی کـەم دەروونیشـمان وەك ڕوالّـەت و دەرمـان، چـاك و پـاك و ڕێـك بـێ و پابەنـد بـێ بـە شـەریعەتەوە.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان سـی و نـۆ (٣٩) ئایـەت دەگرێتـە خـۆی، ئایەتـەکانی: (٧٥ - ١١٣)، هەشـت (٨) ئایەتـی سـەرەتای بـۆ پوختەیـەك لـە بەسـەرهاتی نـووح ﷺ تەرخانکراون، کـە ئایەتەکانـی: (٧٥ - ٨٢)ن و، سـی و یـەك (٣١) ئایەتەکـەی دیکـەش بـۆ بەسـەرهاتی ئیبراهیـم ﷺ تەرخانکـراون: (٨٣ - ١١٣).

شـایانی باسیشـە: لـە گێڕانـەوەی بەسـەرهاتی نووحـدا ﷺ، زیاتـر ئـەوە بەرجەسـتەکراوە، کـە نـووح ﷺ بـۆ دەربازبوونـی خـۆی و شـوێنکەوتووانی لـە خـوا پاڕاوەتـەوەو، خـواش بـە دەنگیانـەوە هاتـوەو، دەربـازی کـردوون (بـە سـواری کەشـتیی).

لـە بەسـەرهاتی ئیبراهیمیشـدا ﷺ دوای خسـتنەڕووی وتووێـژی لەگـەڵ بابـی و گەلەکەیـدا، لـە بـارەی پووچیـی بتپەرسـتییەوەو، شـکاندنی بتـەکان، مەسـەلەی پێدرانـی کوڕێکـی هێدیـی و مەنـدو، پاشـان لـە خەونـدا فەرمـان پێکرانـی ئیبراهیـم ﷺ بـە سـەربڕینی و، ملکەچبوونـی هەردووکیـان بـۆ فەرمانـی خـواو، دواتـر کردنـی بەرانێکـی مـەزن بـە بەلاگێـڕەوەو قەرەبـووی، تیشـکێکی باشـی خراوەتـە سـەر.

لـە کۆتاییشـدا باسـی پێبەخشرانـی ئیسـحاق ﷺ بـە ئیبراهیـم ﷺ وەك پێغەمبەرێـك کـراوە، کـە ئـەوەش بەڵگەیەکـی پتـەوە بۆ ئیسـپاتی ئەوە، کە ئیسـماعیل ئـەو کوڕەیـان بـووە کـە هێنراوەتـە سـەر سـەربڕان، نـەك ئیسـحاق وەك ژمارەیـەك لـە زانایـان گوتوویانـە.

﴿ وَلَقَدْ نَادَىٰنَا نُوحٌ فَلَنِعْمَ ٱلْمُجِيبُونَ ﴿٧٥﴾ وَنَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥ مِنَ ٱلْكَرْبِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٧٦﴾ وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُۥ هُمُ ٱلْبَاقِينَ ﴿٧٧﴾ وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِى ٱلْءَاخِرِينَ ﴿٧٨﴾ سَلَٰمٌ عَلَىٰ نُوحٍ فِى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٧٩﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى

ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٨٠﴾ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٨١﴾ ثُمَّ أَغْرَقْنَا ٱلْـَٔاخَرِينَ ﴿٨٢﴾ ۞ وَإِنَّ مِن شِيعَتِهِۦ لَإِبْرَٰهِيمَ ﴿٨٣﴾ إِذْ جَآءَ رَبَّهُۥ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴿٨٤﴾ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَاذَا تَعْبُدُونَ ﴿٨٥﴾ أَئِفْكًا ءَالِهَةً دُونَ ٱللَّهِ تُرِيدُونَ ﴿٨٦﴾ فَمَا ظَنُّكُم بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٧﴾ فَنَظَرَ نَظْرَةً فِى ٱلنُّجُومِ ﴿٨٨﴾ فَقَالَ إِنِّى سَقِيمٌ ﴿٨٩﴾ فَتَوَلَّوْا۟ عَنْهُ مُدْبِرِينَ ﴿٩٠﴾ فَرَاغَ إِلَىٰٓ ءَالِهَتِهِمْ فَقَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ ﴿٩١﴾ مَا لَكُمْ لَا تَنطِقُونَ ﴿٩٢﴾ فَرَاغَ عَلَيْهِمْ ضَرْبًۢا بِٱلْيَمِينِ ﴿٩٣﴾ فَأَقْبَلُوٓا۟ إِلَيْهِ يَزِفُّونَ ﴿٩٤﴾ قَالَ أَتَعْبُدُونَ مَا تَنْحِتُونَ ﴿٩٥﴾ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾ قَالُوا۟ ٱبْنُوا۟ لَهُۥ بُنْيَٰنًا فَأَلْقُوهُ فِى ٱلْجَحِيمِ ﴿٩٧﴾ فَأَرَادُوا۟ بِهِۦ كَيْدًا فَجَعَلْنَٰهُمُ ٱلْأَسْفَلِينَ ﴿٩٨﴾ وَقَالَ إِنِّى ذَاهِبٌ إِلَىٰ رَبِّى سَيَهْدِينِ ﴿٩٩﴾ رَبِّ هَبْ لِى مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٠٠﴾ فَبَشَّرْنَٰهُ بِغُلَٰمٍ حَلِيمٍ ﴿١٠١﴾ فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ ٱلسَّعْىَ قَالَ يَٰبُنَىَّ إِنِّىٓ أَرَىٰ فِى ٱلْمَنَامِ أَنِّىٓ أَذْبَحُكَ فَٱنظُرْ مَاذَا تَرَىٰ ۚ قَالَ يَٰٓأَبَتِ ٱفْعَلْ مَا تُؤْمَرُ ۖ سَتَجِدُنِىٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٠٢﴾ فَلَمَّآ أَسْلَمَا وَتَلَّهُۥ لِلْجَبِينِ ﴿١٠٣﴾ وَنَٰدَيْنَٰهُ أَن يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ ﴿١٠٤﴾ قَدْ صَدَّقْتَ ٱلرُّءْيَآ ۚ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٠٥﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْبَلَٰٓؤُا۟ ٱلْمُبِينُ ﴿١٠٦﴾ وَفَدَيْنَٰهُ بِذِبْحٍ عَظِيمٍ ﴿١٠٧﴾ وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِى ٱلْـَٔاخِرِينَ ﴿١٠٨﴾ سَلَٰمٌ عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ ﴿١٠٩﴾ كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١١٠﴾ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١١١﴾ وَبَشَّرْنَٰهُ بِإِسْحَٰقَ نَبِيًّا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١١٢﴾ وَبَٰرَكْنَا عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ إِسْحَٰقَ ۚ وَمِن ذُرِّيَّتِهِمَا مُحْسِنٌ وَظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ مُبِينٌ ﴿١١٣﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە دڵنیایشەوە نووح بانگی کردین (هاواری تێبەستین)، ئنجا (ئێمەش) باشترین وەڵامدەرەوە (و بە دەنگەوە هاتوو) بووین (بۆی) ﴿٧٥﴾ خۆی و خێزان و نیزیکانیشیمان لە خەم و پەژارەیەکی مەزن دەربازکردن ﴿٧٦﴾ وەچەکەیشیمان (دوای تۆفان) گێڕا بە تەنیا کۆمەڵە مرۆڤی ماو (لەسەر زەوی) ﴿٧٧﴾ لە نێو ئەوانی دیکەش (گەلانی دنیا)دا، هەرچی (ستایش و باس و خواسی چاك) ە بۆیمان جێهێشت ﴿٧٨﴾ سەلام (ی خوا) لەسەر نووح بێ لە نێو جیهانییاندا ﴿٧٩﴾ ئێمە هەر بەو جۆرە پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە ﴿٨٠﴾ بێگومان ئەو (نووح) لە بەندە بڕوادارەکانمان بوو ﴿٨١﴾ دوایی ئەوانی دیکە (بێبڕوایەکان) مان نغرۆ کردن ﴿٨٢﴾ بە دڵنیایی ئیبراهیمیش لە کۆمەڵ و شوێنکەوتووانی وی بوو ﴿٨٣﴾ کاتێك بە دڵێکی ساغەوە (بۆ لای خوا گەڕایەوەو) هاتە لای پەروەردگاری ﴿٨٤﴾ کاتێك بە بابی و گەلەکەی گوت: چی دەپەرستن؟ ﴿٨٥﴾ ئایا بە درۆ هەڵبەستن، جگە لە خوا پەرستراوانێك دەخوازن (کە هیچ بەڵگەیەکیان لەسەر نیە)؟ ﴿٨٦﴾ ئایا گومانتان بەرانبەر پەروەردگاری جیهانییان چییە؟ ﴿٨٧﴾ ئنجا تەماشایەکی ئەستێرانی کردو سەرنجێکی لێدان ﴿٨٨﴾ گوتی: من نەساغم ﴿٨٩﴾ ئنجا (خەڵکەکەش) بە پشتتێکردنەوە ڕوویان لێوەرگێڕا (ڕۆیشتن) ﴿٩٠﴾ ئنجا بە پەنهانیی چووە لای پەرستراوەکانیان، گوتی: ئایا (لەو خواردنانەی دانراون) ناخۆن؟ ﴿٩١﴾ چیتانە (بۆچی) نادوێن؟ ﴿٩٢﴾ ئنجا بە نهێنیی بەهێز (بە دەستی ڕاستی، بە تەور) لێیدان (و وردو خاشی کردن) ﴿٩٣﴾ خەڵکەکەش (دوای زانینی ئەو هەواڵە) یەکسەر بە خێرایی بۆی هاتن (کە بۆچی وایکردوە؟) ﴿٩٤﴾ گوتی: ئایا ئەوەی دایدەتاشن دەیپەرستن؟ ﴿٩٥﴾ لە حاڵێکدا کە خوا خۆتانیشی دروستکردوەو، ئەوەش کە دەیکەن (لە تاشینی پەیکەرەکان) ﴿٩٦﴾ (خەڵکەکەی) گوتیان: بینایەکی بۆ دروستبکەن (پڕی بکەن لە سووتەمەنیی و دایگیرسێنن)،

ئنجا فڕێیدەنە (نێو) کڵپە (ی ئاگرەکە)وە ﴿٩٧﴾ ئەوان پیلانێکیان لە دژی گێڕا (و زیانیان بۆی خواست)، بەڵام ئێمە خستماننە بنەوە (نەیارەکانیمان ژێر خستن) ﴿٩٨﴾ هەروەها (دوای دەربازبوونی لە ئاگر) (ئیبراهیم) گوتی: من بەرەو (ڕەزامەندیی) پەروەردگارم دەچم، مسۆگەر ڕێنماییم دەکات ﴿٩٩﴾ (گوتی:) پەروەردگارم! (کوڕێك) لە چاکانم پێ ببەخشە ﴿١٠٠﴾ ئێمەش مۆژدەی کوڕێکی هێدیی و مەندمان پێدا ﴿١٠١﴾ ئنجا کاتێك لەگەڵی گەیشتە (ڕاددەی) کۆششکردن (بوو بە وەرگێڕکە) (ئیبراهیم) گوتی: ئەی کوڕە خۆشەویستەکەم! (خەونێکم دی بەو جۆرە بوو:) لە خەودا دەبینم کە سەرت دەبڕم، ئنجا سەرنج بدە، داخۆ ڕات چییە؟ (کوڕەکە) گوتی: ئەی بابی خۆم! هەرچی فەرمانت پێدەکرێ، بیکە، ئەگەر خوا بیەوێ لە خۆڕاگرانم دەبینی ﴿١٠٢﴾ ئنجا کاتێك هەردووکیان (بۆ خوا ملکەچ بوون)و خستیە سەر لاتەنیشتی سەری (بۆ سەربڕین) ﴿١٠٣﴾ (بەزەییمان پێیان دا هات و) بانگیشمان کرد: ئەی ئیبراهیم! ﴿١٠٤﴾ بێگومان خەونەکەت بە ڕاست دانا (جێبەجێت کرد)، ئێمە بەو جۆرە پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە ﴿١٠٥﴾ بە دڵنیایی ئەمە تاقیکردنەوەیەکی ئاشکرایە ﴿١٠٦﴾ سەربڕاوێکی مەزنیشمان کردە قەرەبووی ﴿١٠٧﴾ لە نێو ئەوانی دیکە (گەلانی دنیا)ش دا (هەرچی مەدح و ستایشە) بۆیمان جێهێشت ﴿١٠٨﴾ سەلام (ی خوا) لەسەر ئیبراهیم بێ ﴿١٠٩﴾ بەو شێوەیەش پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە ﴿١١٠﴾ مسۆگەر ئەو (ئیبراهیم) لە بەندە بڕوادارەکانمان بوو ﴿١١١﴾ هەروەها مۆژدەشمان پێدا بە (لە دایك بوونی) ئیسحاق، کە پێغەمبەرێك بێ لە چاکان ﴿١١٢﴾ پیت و پێزیشمان خستەسەر ئەویش و ئیسحاقیش و، لە وەچەکەشیان: چاکەکارو ستەم لە خۆکەری ڕوونیش دەبن ﴿١١٣﴾].

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(ٱلْكَرْبِ: الغم الشديد) خەفەت و مەینەتییەکی سەخت و توند.

(وَأَهْلَهُۥ): (أَهْلُ الرَّجُلِ مَنْ يَجْمَعُهُ وَإِيَّاهُمْ نَسَبٌ أَوْ دِينٌ أَوْ مَا يَجْرِي مَجْرَاهُمَا، مِنْ صِنَاعَةٍ وَبَيْتٍ وَبَلَدٍ، وَأَهْلُ الرَّجُلِ فِي الأَصْلِ: مَنْ يَجْمَعُهُ وَإِيَّاهُمْ مَسْكَنٌ وَاحِدٌ)، (أَهْلُهُ) واتە: نیزیکانی، خزمانی، کەسوکاری، ئەهلی پیاو ئەوەیە کە ئەوو ئەوان ڕەچەڵەکێک، یاخود دینێك کۆیانبکاتەوە، یاخود ئەوەی کە شێوەی ئەوانە وەك پیشەیەك، ماڵێك، وڵاتێك، ئەهلی پیاو لە بنەڕەتدا بریتیە لەو کەسانەی ئەوو ئەوان خانوویەك، نشینگەیەك کۆیان بکاتەوە.

(شِيعَتِهِۦ): کۆمەڵەکەی (الشِّيعَةُ: مَنْ يَتَقَوَّى بِهِمُ الإِنْسَانُ وَيَنْتَشِرُونَ عَنْهُ)، (شِيعَة): بریتیە لە کۆمەڵە خەڵکێك کە مرۆڤ بەهۆیانەوە بەهێز دەبێ و لەوەوە بڵاو دەبنەوە، بەڵام لێرەدا واتە: ئەو خەڵکەی (مُشَايَعة)ی نووحیان کرد ، ئیبڕاهیم یەکێك بوو لەوان، واتە: ئیبڕاهیم یەکێك لە شوێنکەوتووان و کۆمەڵی نووح  بوو، هەرچەندە چەندان سەدەیان کەوتوونە بەین، بەڵام لەسەر هەمان ڕێباز نووح  ڕۆیشتوە، کە ڕێبازی خوا بەیەککرتن و تەنیا بەندایەتیی بۆ خوا کردن، و پەیڕەویی کردن لە وەحیی و پەیامی خوایە، ئیبڕاهیمیش هەر لەسەر ئەو ڕێبازە ڕۆیشتوە.

(بِقَلْبٍ سَلِيمٍ): (قَلْبٍ مُتَعَرٍّ مِنَ الدَّغَلِ) دڵێك کە پاك بووبێتەوە، بێخەوش کرا بێ لە دەغەڵ، (دغل) بریتیە لە هەر شتێکی لاوەکیی کە دەکەوێتە گەڵ شتێکی دیکەی ئەصڵ، وەك خڵتە، وەك پووش و پەڵاش، وەك ماددەیەکی نامۆ کە دەکەوێتە گەڵ شتێکی دی.

(أَئِفْكًا): هەمزەکە بۆ پرسیار کردنە، (إِفْك: كُلُّ مَصْرُوفٍ عَنْ وَجْهِهِ الَّذِي يَحِقُّ أَنْ يَكُونَ عَلَيْهِ) (إفك) بریتیە لە هەر شتێك لەو ڕووەی کە پێویستە لەسەری

بێ، لادرابێ، هەروەها (إفك) بە مانای درۆش دێ، چونکە درۆش بریتیە لە پێچەوانەی ئەو شتە کە لە واقیعدا هەیە.

(سَقِيمٌ): (السَّقَمُ وَالسُّقْمُ: الْمَرَضُ الْمُخْتَصُّ بِالْبَدَنِ)، (سَقَمٌ وَسُقْم): ئەو نەخۆشییەیە کە تایبەتە بە جەستەوە، کەواتە کە دەڵێ: ﴿إِنِّي سَقِيمٌ﴾، واتە: من نەخۆشم، لە ڕووی جەستەوە نەخۆشم.

(فَرَاغَ): بە پەنهانیی ڕۆیشت، (الرَّوْغُ: الْمَيْلُ عَلَى سَبِيلِ الإحْتِيالِ، رَاغَ الثَّعْلَبُ رَوْغَاناً، وَطَرِيقٌ رَائِغ: إذَا لَمْ يَكُنْ مُسْتَقِيماً)، (رَوْغ): بریتیە لە لادان لە شێوەی فێڵ دا، دەگوترێ: (رَاغَ الثَّعْلَبُ رَوْغَاناً) ڕێوی کە لە کاتی ڕاکردندا قۆرت و پێچ دەکات، بۆ ئەوەی نەگیرێ، لە کاتێکدا دڕەندەیەك ڕاوی دەنێ، (وَطَرِيقٌ رَائِغ) واتە: ڕێیەك کە ڕاست نەبێ، پێچەڵ پێچ و، قۆرت و پێچی هەبێ.

(يَزِفُّونَ): بە خێرایی بۆی دەهاتن، (الزَّفِيفُ: هُبُوبُ الرِّيحِ وَسُرْعَةُ النَّعَامِ الَّتِي تَخْلِطُ الطَّيرانَ بِالمَشْيِ، زَفَّ الإبِلُ يَزِفُّ زَفّاً وَزَفِيفَاً وَأَزَفَّها سَائِقُهَا)، (زَفِيف): بریتیە لە هەڵکردنی با، هەروەها بریتیە لە بە خێرایی ڕۆیشتنی حوشترمەل کە فڕین و ڕۆیشتن تێکەڵ دەکات، دەگوترێ: (زَفَّ الإبِلُ يَزِفُّ زَفّاً وَزَفِيفاً) حوشترەکە بە خێرایی ڕۆیشت، بە خێرایی دەڕوات، بە خێرایی ڕۆیشتن، (وَأَزَفَّها سَائِقُها) واتە: لێخوڕەکە یان، ئەوکەسەی حوشترەکان دەنگدەدات، وایکرد بە خێرایی بڕوات.

(تَنْحِتُونَ): دادەتاشن، (نَحْتُ الخَشَبِ وَالْحَجَرِ وَنَحْوِهِمَا مِنَ الأَجْسَامِ الصُّلْبَةِ)، (نَحت): بریتیە لەوەی تەختە، دار، یاخود بەرد یان وێنەی ئەوان بە تەشوێ، یان بە هەرشتێك دابتاشرێ و پارچەی لێبکرێتەوەو، شێوەیەکی دیکەی پێ بدرێ.

(بِغُلَامٍ): (الغُلامُ: الطَّارُ الشَّارِبُ، طَرَّ الشَّارِبُ: نَبَتَ وَ طَلَعَ، وَالجَمْعُ: غِلْمَةٌ وَغِلْمَان)، (غُلام): واتە: کوڕێك کە سمێڵی بۆر کردبن، هەرزەکار، (طَرَّ الشَّارِبُ: نَبَتَ وَ طَلَعَ) واتە: سمێڵی بۆر بوون و دەرچوون، کۆی (غُلام) (غِلْمَةٌ وَغِلْمَان)ە، بە هەردووکیان کۆدەکرێتەوە.

(حَلِيمٍ): (**الحِلْـمُ: ضَبْـطُ النَّفْـسِ وَالطَّبْـعِ عَـنْ هَيَجَـانِ الْغَضَـبِ، وَلَيْـسَ الحِلْـمُ هُـوَ العَقْـلُ، وَلَكِنَّـهُ مِـنْ مُسَـبِّبَاتِ العَقْـلِ**)، (حِلْـم): بریتیـە لـە خـۆ کۆنتـڕۆڵ کـردن و مەرزەمکردنـی سروشـت لـە کاتـی هەڵچوونـی تووڕەییـدا، بـەڵام لێرەدا (حِلْـم) بـە مانـای عەقـڵ نیـە، بـەڵام لـە پەیداکراوەکانـی عەقڵـە، واتـە: بـە هـۆی عەقڵـەوە (حِلْم) پەیدادەبـێ، چونکـە هەندێکیـان وشـەی (حِلْم)یـان بـە عەقـڵ لێکداوەتـەوە، بـەڵام لـە ڕاسـتییدا (حِلْـم) واتـە: هێدیـی و مەندیـی، کـە لـە بەرهـەم و پەیداکراوەکانـی عەقڵـە.

(بَلَغَ مَعَهُ ٱلسَّعْىَ): (**أي: بَلَـغَ أَنْ يَسْـعَى مَـعَ أَبِيـهِ**) وای لێهات کـە لەگـەڵ باوکیـدا نیـش و کار بـکات، بـە کوردیـی پێـی دەڵێـن: وەرگێڕکـە، منـداڵ کـە گـەورە دەبـێ، وای لێـدێ هاوکاریـی بابـی بـکات.

(وَتَلَّهُۥ): (**التَّـلُّ: الْمَـكَانُ الْمُرْتَفِـعُ، وَالتَّلِيـلُ: الْعُنُـقُ، وَتَلَّـهُ لِلْجَبِـينِ: أَسْـقَطَهُ عَـلَى التَّـلِّ مِثْـلَ تَرَبَـهُ: أَسْـقَطَهُ عَـلَى الـتُّرَابِ، أَوْ أَسْـقَطَهُ عَـلَى التَّلِيـلِ**)، وشـەی (تَـل): بـە شـوێنێکی بـەرز دەگوتـرێ، بـە کوردیـی دەڵێـن: گـرد، تەپۆلکـە، (تَلِيـل) واتـە: مـل، لامـل، کـە خـوا دەفەرمـوێ: (**وَتَلَّـهُ لِلْجَبِـينِ**) واتـە: لەسـەر لا تەنیشـتی خسـتی، هەرچەنـدە هەندێکیـان (جَبِين)یـان بـە نێوچـاوان لێکداوەتـەوە، لـە کتێبـی (**أحمدي**)یشـدا هاتـوە: [(**مَكْـر و كَيْـد و حِيلَـة**) فێڵـە، (**جَبِـين وجَبْهَـة**) تەوێڵـە] تەوێـڵ واتـە: نێوچـاوان، کـە لـە ڕاسـتییدا (**جَبْهَـة**) واتـە: نێوچـاوان، بـەڵام (**جَبِـين**) واتـە: لاتەنیشـت، لاجاینـگ، کـە هـەر (**جَبْهَة**)یـەك دوو (**جَبِـين**)ی لـەولا لـەولان، کەواتـە (**وَتَلَّـهُ لِلْجَبِـينِ**) واتـە: بەسـەر لا تەنیشـتی سـەریدا، خسـتی، وەك (**تَرَبَـهُ**) واتـە: خسـتیە سـەر گڵ، یاخـود خسـتیە سـەر (**تَلِيـل**) کـە بـە مانـای مـل، گـەردن دێ.

(لِلْجَبِينِ): (**الْجَبِينَـانِ جَانِبَـا الْجَبْهَـة**)، ئـەولاو ئـەولای نێوچـاوان، پێیـان دەگوتـرێ: (**جَبِـين**).

(ٱلْبَلَٰٓؤُاْ): (**المِنْحَـةُ أَوِ المِحْنَـة، الإِخْتِبَـارُ أَوِ النِّعْمَـة**)، وشـەی (بَـلاء): لـە قورئانـدا هـەم بـە مانـای بەخـشران هاتـوە، شـتێك کـە ببەخـشرێ، بەخـشراو، هـەم بـە مانـای بـەڵاو

گرفتارییش هاتوە، کەواتە هەم بە مانای تاقیکردنەوە، هەم بە مانای چاکەو بەخشش، دێ، کە لەو سیاقەی سوورەتی (الصافات)دا ئەو وشەیەیە، هەردوو واتایەکان هەڵدەگرێ، وەك دوایی دەیکەینێ.

(وَفَدَيْنَٰهُ): کردمانە بەلاگێری، (**الْفِدَى وَالْفِدَاء: حِفْظُ الإِنْسانِ عَنِ النَّائِبَةِ بِمَا يُبْذَلُ عَنْهُ، فَدَيْتُهُ بِمَالٍ، وَفَدَيْتُهُ بِنَفْسِي، وَفَادَيْتُهُ بِكَذا، افْتَدَى: إِذَا بَذَلَ ذَلِكَ عَنْ نَفْسِهِ**)، (**فِدى**) و (**فِدَاء**): بریتیە لە پاراستنی مرۆڤ لە بەلایەك بە هۆی ئەوەوە کە لە جیاتی وی دەبەخشرێ، دەگوترێ: (**فَدَيْتُهُ بِمَالٍ**) واتە: ماڵم کردە قەرەبوو بۆی، (**وَفَدَيْتُهُ بِنَفْسِي**) واتە: خۆمم کردە بەلاگێری، (**وَفَادَيْتُهُ بِكَذا**) فلانشتم کردە قەرەبووی، (**افْتَدى**) ئەگەر کەسێك شتێك بکاتە قەرەبوو لە جیاتی خۆی، پێی دەگوترێ: (**افْتَدى**)، بەلام (**فَدَاهُ**) واتە: غەیری خۆی شتێکی بۆ کردە بەلاگێرو قەرەبوو، بۆیە خوا دەفەرموێ: (**وَفَدَيْنَاهُ**) کردمانە قەرەبوو و بەلاگێری، ﴿بِذِبْحٍ عَظِيمٍ﴾، واتە: سەربڕاوێکی مەزن، کە مەبەست پێی بەرانێکی قەبەیە.

(بِذِبْحٍ): (**الذِّبْحُ: الْمَذْبُوحُ**) واتە: ئەوەی کە دەویسترێ سەر ببڕدرێ، واتە: قوربانیی، یاخود ئاژەڵێکی قەڵەو.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

بەڕێـــــزان!

ئێمـە بەسـەرهاتی نووحـمان ﷺ لـە سـوورەتی (هود)دا بـە تەفصیل باسـکردووەو، بەسـەرهاتی ئیبراهیمیشـمان ﷺ لـە سـوورەتی (إبراهیـم)دا بـە درێژیی باسـکردووەو توێژینەوەمـان لەسـەر کـردوون، شـایانی باسـە: لـەم سـی و نـۆ (٣٩) ئایەتـەدا باسـی هــەر کام لـە نـووح ﷺ و ئیبراهیـم ﷺ و هــەردوو کوڕەکــەی: ئیسـماعیل و ئیسـحاق (سـەلامی خوایـان لێبـێ) کـراوە، لـە ئایەتەکانـی دەرسـی داهاتووشـدا، پێنج لـە پێغەمبەرانـی دیکـە (عَلَيْهِـمُ الصَّـلاَةُ وَالسَّلاَم) بـاس دەکرێـن، کـە هەموویـان دەبـن بـە نـۆ، واتـە: نـووح و ئیبراهیـم، لەگـەڵ ئیسـماعیل و ئیسـحاقی کـوڕی، پاشـان مووسـاو هاروونـی بـرای، دوایـی ئیلیـاس، ئنجـا لـووط و یونـوس، سـەرجەم دەبـن بـە نـۆ لـە پێغەمبەرانـی پایـە بـەرز (عَلَيْهِـمُ الصَّـلاَةُ وَالسَّلاَم)، خـوا ﷻ وەك دڵدانـەوەی پێغەمبـەری خاتـەم ﷺو، بـڕواداران کـە لـە کاتێکـدا سـوورەتی (الصافات) و هاووێنەکانـی بـۆ پێغەمبـەری خـوا ﷺ دابەزیـون، ئـەوان لـە باردودۆخێکـی یەکجـار سـەخت و دژوارو، لـە مەینەتییەکـی گـەورەدا بـوون، خـوا ﷻ بەسـەرهاتی ئـەو پێغەمبەرانـە (عَلَيْهِـمُ الصَّـلاَةُ وَالسَّلاَم) بـە کورتیـی و پوختیـی لێـرەو، لـە هەندێـك شـوێنی دیکـەی قورئانـدا، هەندێکیـان بـە تەفصیـل بەسـەرهاتەکانیان دەگێڕێتـەوە، بـۆ دڵدانـەوەو بەرچاوڕوونیـی بـۆ مسـوڵمانان و دڵ بەهێزکردنیـان.

خـوا ﷻ لـە بـارەی بەسـەرهاتی نووحـەوە ﷺ دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَقَدْ نَادَىٰنَا نُوحٌ فَلَنِعْمَ ٱلْمُجِيبُونَ ﴾، بـە دڵنیایـی نـووح بانگـی کردیـن، هـاواری تێبەسـتین، ئێمــەش باشـترین وەڵامــدەرەوە بوویــن، باشـترین بـە دەنگــەوە هاتـوو بوویـن بـۆ نـووح ﷺ، ئایـا کەنگـێ بـووە نـووح هـاواری لـە خـوای پـەروەردگار بەسـتووەو، بانگـی کـردوە، کـە لەفریـای بـێ؟ بـە تەنکیـد ئـەو کاتـە بـوو کـە لەگـەڵ گەلەکەیـدا گەیشـتە

بنبەست و، هیچی لێ هەڵنەکراندن، دوای ئەوەی کە لێیان نائومێد بوو، ئنجا هاواری کردە خوای پەروەردگار، وەك لە سووڕەتی (القمر)دا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ فَكَذَّبُوا عَبْدَنَا وَقَالُوا مَجْنُونٌ وَازْدُجِرَ ﴿٩﴾ ﴾، واتە: لە پێش وان دا (پێش خەڵکە بێبڕوایەکەی ڕۆژگاری پێغەمبەر موحەممەد ﷺ) گەلی نووح ﷺ پێغەمبەرانیان بە درۆ دانا، بەندەی ئێمە نووحیان بە درۆ دانا، گوتیان: شێتەو تێیەوە خوڕا، تێیانەوە خوڕی و لێی تووڕە بوون، قسەیان پێکوت، ﴿ فَدَعَا رَبَّهُ أَنِّي مَغْلُوبٌ فَانْتَصِرْ ﴿١٠﴾ ﴾القمر، ئەویش لە پەروەردگاری پاڕایەوە کە من بێدەسەڵاتم، یان ئەوان بەسەرمدا زاڵ بوون، پێیان ناوێرم، تۆ یارمەتییم بدەو سەرم بخە، ئنجا دوایی خوا ﷻ باسی هەڵسانی تۆفان دەکات، دوایی باسی سوارکردنی نووح و شوێنکەوتووانی دەکات لە کەشتییەکەدا، دەفەرموێ: ﴿ فَفَتَحْنَا أَبْوَابَ السَّمَاءِ بِمَاءٍ مُنْهَمِرٍ ﴿١١﴾ وَفَجَّرْنَا الْأَرْضَ عُيُونًا فَالْتَقَى الْمَاءُ عَلَى أَمْرٍ قَدْ قُدِرَ ﴿١٢﴾ وَحَمَلْنَاهُ عَلَى ذَاتِ أَلْوَاحٍ وَدُسُرٍ ﴿١٣﴾ تَجْرِي بِأَعْيُنِنَا جَزَاءً لِمَنْ كَانَ كُفِرَ ﴿١٤﴾ وَلَقَدْ تَرَكْنَاهَا آيَةً فَهَلْ مِنْ مُدَّكِرٍ ﴿١٥﴾ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿١٦﴾ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِنْ مُدَّكِرٍ ﴿١٧﴾ ﴾القمر، واتە: ئێمە دەروازەکانی ئاسمانمان کردنەوە بە ئاوێکی هەڵڕژاو، زەوییشمان تەقاندەوە بە کانیی و سەرچاوان، ئاوەکە (ئاوی دابەزێنراوی ئاسمان و ئاوی دەرقوڵێندراوی زەوی) پێکگەیشتن بە ئەندازەیەکی دیاریکراو، نووحیشمان هەڵگرت لەسەر شتێك کە خاوەنی تەختان و بزماران بوو (واتە: کەشتیی)، لە ژێر چاودێریی ئێمەدا دەڕۆیشت، وەك پاداشت بۆ کەسێك کە سپڵەیی بەرانبەر کرابوو، دوایی کەشتییەکەمان وەك نیشانەیەك بەجێهێشت، ئایا کەس نیە پەندی لێ وەربگرێ، ئنجا ئایا ئازاردان و سزاو ئاگادار کردن و ترساندنی من چۆن بوو؟ قوڕئانیشمان بۆ لەبەر کردن و تێگەیشتن ئاسانکردوە، ئایا کەس نیە لێی تێبگات؟

کەواتە: لەو بارودۆخ و هەلومەرجەدا بوو، کە نووح ﷺ هاواری کردە خوا.

﴿ وَنَجَّيْنَاهُ وَأَهْلَهُ مِنَ الْكَرْبِ الْعَظِيمِ ﴾، خۆی و نیزیکەکانیمان لە بەڵامەینەتییەکی مەزن دەربازکردن. ئەهلی هەر کەسێك، ئەوانەن کە بە ڕەچەڵەك پێی بگەنەوە،

یـان لـە دینـدا پێـی بگەنـەوە، یـان لـە پیشـەیەکدا، لـە کارێکـدا، کـە دیـارە لێـرەدا هـەم بنەماڵەکـەی دەگرێتـەوە (خێزانەکـەی)، هـەم ئەوانـەش کـە لـە دینـدا شـوێنی کەوتبوون.

﴿ وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُۥ هُمُ ٱلْبَاقِينَ ﴾، تەنیـا وەچەکەیشـیمان کـرد بـە مـاوە، واتـە: تەنیـا وەچەکـەی نـووح ﷺ بـوون، کـە بوونـە مرۆڤـی مـاوو بـەردەوام لـە ژیانـدا لەسـەر زەوی.

﴿ وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِى ٱلْـَٔاخِرِينَ ﴾، لـە نێـو ئەوانیدیکـەش دا لەسـەریمان بەجێهێشـت، چیـمان بەجێهێشـت؟ واتـە: ناوبانگـی چاکـمان بڵاوکـردەوە بـە نێـو گەلانـی دنیـادا.

﴿ سَلَٰمٌ عَلَىٰ نُوحٍ فِى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، سـەلام لەسـەر نـووح بـێ لـە نێـو هەمـوو جیهانییانـدا، سـەلام و ئاشـتیی و بێمزەڕەتیـی لەسـەر نـووح بـێ، ﴿ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾، ئێمـە هـەر بـەو شـێوەیە پاداشـتی چاکـەکاران دەدەینـەوە، واتـە: هـەر لـە فریـای نـووح نەهاتوویـن، لـە دوای نووحیـش هـەر کەسـێکی دیکـە وەك نـووح هاوارمـان تێبەسـتێ و بانگـمان بـکات، وەڵامـی دەدەینـەوە، هـەر کەسـێك وەك نـووح خـۆی بـۆ ئێمـە یـەکلا بکاتـەوەو چاکـەکار بـێ، ئێمـەش پاداشـتی دەدەینـەوە لـە دنیـاو لـە دواڕۆژدا.

﴿ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، بـە دڵنیایـی نـووح لـە بەنـدە بڕوادارەکانمـان بـوو، ﴿ ثُمَّ أَغْرَقْنَا ٱلْـَٔاخَرِينَ ﴾، دوایـی ئەوانیدیکەمـان نغرۆکـردن. واتـە: ئەوانـەی کـە بڕوایـان پـێ نەهێنـاو لەگەڵیـدا سـواری کەشـتییەکە نەبـوون، ئەوانمـان نغـرۆ کـرد، خنکاندمانـن لـە تۆفانـدا، کـە لـە نێویانـدا ژنەکەشـی هەبـوو، هەروەهـا کوڕەکەشـی هەبـوو، کـە هەندێـك دەڵێـن: کوڕەکـەی نـاوی کەنعـان بـووە.

گوتمـان: ئێمـە بەسـەرهاتی نووحـمان ﷺ لـە سـوورەتی (هـود)دا بـە تەفصیـڵ باسـکردوە، بۆیـە لێـرە هـەروا بـە خێرایـی بەسـەریدا دەڕۆیـن، لـە هـەر جێیەکـی دیکـەش بەسـەرهاتی پێغەمبـەران بێنـەوە ڕێـمان، تەنیـا بـە ئەنـدازەی ڕوونکردنـەوەی

چەمك و واتای ئایەتەكان، باسی ئەو بەسەرهاتانە دەكەین، ئەگەرنا بینەرو بیسەرو خوێنەرانی بەڕێز، حەواڵەی ئەو شوێنانە دەكەین كە تەرخانمان كردوون بۆ توێژینەوەی تێرو تەسەل لە بارەی بەسەرهات و چیرۆكی ئەو پێغەمبەرانە (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم).

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر باسی ئیبراهیم ؑ، دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّ مِن شِيعَتِهِۦ لَإِبْرَٰهِيمَ ﴾، بە دڵنیایی ئیبراهیم لە كۆمەڵەكەی نووح بوو، (شِيعَة) واتە: كۆمەڵێك كە بە دوای كەسێك دەكەون، (شِيعَةُ فُلان) واتە: كۆمەڵی فلانكەس، كەسانێك كە شوێنی دەكەون و ڕێبازەكەی دەگرن، واتە: ئیبراهیمیش لە پەیڕەوان و لە كۆمەڵەكەی نووح بوو.

﴿ إِذْ جَآءَ رَبَّهُۥ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴾، یاد بكەوە كاتێك بە دڵێكی ساغەوە هاتە لای پەروەردگاری، بەرەو پەروەردگاری چوو، بۆ فەرمانبەریی پەروەردگاری كەوتە حەرەكەت، بە دڵێكی ساغ و سەلیم و بێ خلتەوە، بە دڵێكی پاك و بێخەوشەوە، كە بەرانبەر بەخوا تەنیا خوا بەیەكگرتنی تێدا بوو تەنیا خوای بە پەرستراوی خۆی دەزانی، بە مانای فراوانی پەرستن و، بەرانبەر بەندەكانی خواش، پڕ بوو لە شەفەقەت و بەزەیی و، خێرخوازیی و بە تەنگەوە بوون، بە دڵێكی تاواوە بەرەو پەروەردگاری حەرەكەتی كرد.

﴿ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَاذَا تَعْبُدُونَ ﴾، یاد بكەوە كاتێك بە بابی و بە گەلەكەی خۆی گوت: چی دەپەرستن؟ ئەوە چییە دەیپەرستن؟ ﴿ أَئِفْكًا ءَالِهَةً دُونَ ٱللَّهِ تُرِيدُونَ ﴾، ئایا بە درۆ پەرستراوانێك جگە لە خوا دەخوازن؟

﴿ فَمَا ظَنُّكُم بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، گومانتان چییە بەرانبەر بە پەروەردگاری جیهانییان؟ پەروەردگارو بەخێوكەرو، مشوورخۆرو هەمەكارەی جیهانییان لەوێ بێ، ئەو شڕو شاڵاتە چین دەیانپەرستن؟ دیارە گومانتان بەرانبەر بە پەروەردگارتان خراپە، پێتان وایە پەروەردگارتان زانیاریی بێ سنوورو، بەزەیی بێ سنوورو، حیكمەتی

بێ سنوورو، دەسەڵاتی بێ سنووری نیە، پێتان وایە کە بۆ دەرباز بوون لە هەندێك گرفت و کێشان، بۆ چارەسەر کردنی هەندێك ناڕەحەتیانتان، بۆ بەدەست هێنانی هەندێك قازانج و بەرژەوەندیانتان، پێویستییتان بە جگە لە خوا هەیە، بۆیە دەیانپەرستن، بۆیە دەیانکەنە هاوبەشی خوا؟!! بۆیە دەفەرموێ: ﴿ فَمَا ظَنُّكُم بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، چونکە کەسێك بەڕاستیی خوای پەروەردگاری بناسێ ﷻ، ئەو چاك ناسینەی خوا، وای لێدەکات چاکی بپەرستێ، بەڵام کەسێك کە چاك خوا نەناسێ، هەندێك لە دروستکراوەکان لەگەڵ خوادا دەخاتە تەرازوو، دەیانهێنێتە ئاستی خوا، کە ئەوە بنك و ڕیشەی هاوبەش بۆ خوا دانان (شرك)ە، وەك لە سووڕەتی (الشعراء)دا کە کاتی خۆی تەفسیرمان کرد، کافرەکان دەڵێن: ﴿ تَٱللَّهِ إِن كُنَّا لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٩٧﴾ إِذْ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٨﴾ ﴾، سوێند بە خوا ئێمە لە گومڕاییەکی ڕوون و ئاشکرادا بووین، کە ئێوەمان (ئەی پەرستراوەکان!) لەگەڵ پەروەردگاری جیهانییاندا یەکسان دەکرد.

﴿ فَنَظَرَ نَظْرَةً فِى ٱلنُّجُومِ ﴾، ئنجا سەرنجێکی دایە ئەستێرەکان، تێیانەوە ڕاما، ﴿ فَقَالَ إِنِّى سَقِيمٌ ﴾، یەکسەر دوای ئەوەی سەرنجی ئەستێرەکانیدا، گوتی: من نەخۆشم، ئەمە دوو واتای هەن:

أ- ئیبراهیم ﷺ تەماشای ئەستێرانی کردوە، بۆ ئەوەی بەرزیی و مەزنیی خوا لە گەردووندا زیاتر بەدیی بکات.

ب- خەڵکەکە کۆمەڵگایەکەی ئیبراهیم بڕوایان وابووە: ئەستێرەکان دەبنە هۆی ساغیی و نەخۆشیی مرۆڤەکان، ئەویش بە پێی عەقڵی خۆیان دواندوونی.

گرنگ ئەوەیە سەرنجێکیدا ئەستێرەکان و گوتی: من نەخۆشم، واتە: لە ڕووی جەستەوە نەخۆشم.

﴿ فَتَوَلَّوْا۟ عَنْهُ مُدْبِرِينَ ﴾، ئەوانیش بە پشتتێکردنەوە ڕوویان لێوەرگێڕا، واتە: زۆر بە خێرایی، چونکە بە فای بە دواداهاتن (فاء التعقیب) هێناویەتی، ڕەنگە

وایانزانیبێ و وای لێ حاڵیی بووبن کە ئیبراهیم ﷺ نەخۆشییەکی درم (مُعْدي) یەتی، نەخۆشییەك کە ئەوان لێی بگرنەوە، بۆیە گوتوویانە: با لێی نیزیك نەبینەوەو، بە خێرایی پشتیان تێکردوەو روویان لێ وەرگێڕاوە.

﴿ فَرَاغَ إِلَىٰٓ ءَالِهَتِهِمْ ﴾، ئەویش بە شێوەیەکی پەنهان چوو بۆ لای پەرستراوەکانیان، خوا کە وشەی (آلِهَة)ی بۆ بەکار هێناون، بە پێی عەقڵی ئەوان ئەو وشەیە بەکاردێنێ، یانی: ئەوشتانەی ئەوان بە پەرستراویان زانیون، ئەگەرنا هیچ کامیان (إِلَه) نەبوون، تاکو بە (آلِهَة) کۆبکرێنەوە، بەڵکو بە نسبەت ئەوانەوە، یان خۆرو مانگ و ئەستێرە بوون، یان پەیکەر بوون، ﴿ فَقَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ ﴾، ئیبراهیم ﷺ گوتی: ئایا ناخۆن؟ ئەوانە عادەتیان وابووە، خواردنیان لە بەردەم پەرستراوەکانیان داناوە، نەك بۆ ئەوەی بیخۆن، بەڵکو بۆ ئەوە موبارەك و بە پێزبێ و بەرەکەتی بکەوێتێ و ببێتە متفەرك، ئنجا ئیبراهیم ﷺ بە تەوسەوە، بە توانجەوە گوتوویەتی: ئەرێ ئەو خواردنانەی دانراون ناخۆن؟ ﴿ مَا لَكُمْ لَا تَنطِقُونَ ﴾، چیتانە، بۆچی نادوێن و قسە ناکەن؟ ئەی پەرستراوەکان!

﴿ فَرَاغَ عَلَيْهِمْ ضَرْبًۢا بِٱلْيَمِينِ ﴾، بە شێوەیەکی پەنهان، بە پەنهانکاریی دەستیکرد بە لێدانیان بە دەستی ڕاستی، کە لە سوورەتی (الأنبياء)دا دەفەرموێ: ﴿ فَجَعَلَهُمْ جُذَٰذًا إِلَّا كَبِيرًا لَّهُمْ ﴿٥٨﴾ ﴾الأنبياء، وردو خاشی کردن جگە لە پەرستراوە گەورەکەیان.

﴿ فَأَقْبَلُوٓا۟ إِلَيْهِ يَزِفُّونَ ﴾، ئنجا ئەوانیش بە خێرایی روویان تێکردو هاتن بۆ لای، واتە: دوای ئەوەی هەواڵەکەیان بیست، گەڕانەوە، وەك لە سوورەتی (الأنبياء)دا بەسەرهاتەکە بە تەفصیل گێڕراوەتەوە، کە ئەوان لێیان پرسی: ئایا تۆ واتکردوە؟ ئەویش دەڵێ: بتە گەورەکەیان وایکردوە، لێیان بپرسن ئەگەر قسان دەکەن، ئەوانیش بە خۆیاندا دەچنەوەو، لە دواییدا دووبارە هەڵدەگەڕێنەوەو، سەرەنجام ئیبراهیم ﷺ دەفەرموێ: ﴿ قَالَ أَتَعْبُدُونَ مَا تَنْحِتُونَ ﴾، ئایا شتێك دەپەرستن کە خۆتان دایدەتاشن، ئەو پەیکەرانە خۆتان دروستیان دەکەن؟ ﴿ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا

تَعْمَلُونَ ﴾، خـواش خۆتـان و ئـەوەش کـە دروسـتتان کـردوە، هێناونیـە دی، خۆتـان و ئـەوەی کـە کردووتانـە، کـە بریتیـە لـە دروسـتکردنی بـت و سـەنەمەکان؟! نـەك وەك دوایـی کـە جەبرییـەو موعتەزیلـەو ئەشاعیرەو ...هتـد پەیـدا بـوون، هەندێـك لـە زانایـان ئـەم ئایەتەیـان بەمجـۆرە تەفسـیر کـردوە: (وَاللـهُ خَلَقَكُـمْ وَعَمَلَكُـم أَو وَأَعْمَالَكُـم) خـوا خۆتـان و کردەوەکانیشـتانی خوڵقانـدوە! بـەڵام بێگومـان لێـرەدا مەبەسـت ئـەوە نیـە، بەڵکـو یانـی: خـوا خۆشـتان و ئـەوەش کـە دەیکـەن یانـی: (وَمَـا تَصْنَعُـون) ئـەوەی دروسـتیدەکەن، دروسـتتانکردوە، خۆشـتان و پەیکەرەکانیـش، بەدیهێـنراوی خـوان.

﴿ قَالُوا ابْنُوا لَهُ بُنْيَانًا ﴾، خەڵکەکـەی گوتیـان: بینایـەك، خانوویـەك دروسـتبکەن (پـڕی بکـەن لـە دارو ئاگـری تێبـەردەن، ئاگرێکـی نێڵـدراو، ئاگرێکـی بڵێسـەداری تێـدا بکەنـەوە) ﴿ فَأَلْقُوهُ فِي الْجَحِيمِ ﴾، ئنجـا ئیبراهیـم فڕێدەنـە نێـو کڵپـەی ئاگرەکـە (جَحِيـمْ) بریتیـە لـە کڵپـەی شـینی ئاگـر، ئاگرێـك کـە بڵێسـەی چـاك بـەرز بۆتـەوە، فڕێیدەنـە نێـوی.

﴿ فَأَرَادُوا بِهِۦ كَيْدًا فَجَعَلْنَاهُمُ الْأَسْفَلِينَ ﴾، خـوا لێـرە تەنیـا ئەوەنـدە دەفەرمـوێ: پیلانیـان بـۆی ویسـت، بـەڵام ئێمـە ئەوانمـان ژێرخسـت، بـەڵام لـە سـوورەتی (الأنبياء) دا بـە تەفصیـڵ باسـی ئـەوە دەکات، کـە چـۆن بـە مەنجەنیـق ئیبراهیمیـان ﷺ هەڵداوەتـە نێـو بڵێسـەی بـەرزی ئاگرەکـە، بـەڵام خـوا فەرمانـی بـە ئاگرەکـە کـردوە، سـارد بێتـەوە، فەرموویـەتی: ﴿ قُلْنَا يَا نَارُ كُونِي بَرْدًا وَسَلَامًا عَلَىٰ إِبْرَاهِيمَ ﴿٦٩﴾ وَأَرَادُوا بِهِۦ كَيْدًا فَجَعَلْنَاهُمُ الْأَخْسَرِينَ ﴿٧٠﴾ ﴾، بـەڵام لێـرە دەفەرمـوێ: ئەوانمـان زیانبـار کـرد، فێـڵ و پیلانەکەیـان دادی نـەدان، زیانـی بـە ئیبراهیـم نەگەیانـد، ئەوانیـش ڕەنـج بـە خەسـار چـوون.

ئنجـا دێتـە سـەر وێسـتگەیەکی دیکـەی ژیـانی ئیبراهیـم ﷺ، دوای ئـەوەی لـە سـووتێنران خـوا دەربـازی دەکات، دەیـەوێ قەومەکـەی کـە کلدانییـەکان بـوون، لـە باشـووری عێـراق، لـە ئـووری کلدانیـی، بەجێیـان بێڵـێ: ﴿ وَقَالَ إِنِّي ذَاهِبٌ إِلَىٰ

رَبِّي سَيَهْدِينِ ﴾، گوتـی: مـن بـەرەو پـەروەردگارم دەچـم، بـە دڵنیاییـەوە ڕێنماییـم دەكات، ڕێـم پیشـان دەدات چـی بكـەم و چـۆن بكـەم! واتـە: بـەرەو ڕەزامەندیـی پـەروەردگارم دەچـم، دەچـم بـۆ شـوێنێك كـە لـەوێ بتوانـم بەندایەتیـی بـۆ خـوا بكـەم، فەرمانبەریـی خـوا بكـەم، خەڵـك بـۆ لای خـوا بانـگ بكـەم، دوای ئـەوەی لەگەڵ خەڵكەكـەی خۆیـدا گەیشـتۆتە بنبەسـت، ئایـا لـەوە زیاتـر كـە خستوویانەتە نێـو ئاگـری سـوورەوە، بـەڵام خـوا دەربـازی كـردوە؟!

﴿ رَبِّ هَبْ لِي مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾، (پاڕایـەوە گوتـی:) پـەروەردگارم! لـە چاكانـم پـێ ببەخشـە، واتـە: لـە منداڵـی چـاك پێـم ببەخشـە، لـە كوڕانـی چاكـم پـێ ببەخشـە، ﴿ فَبَشَّرْنَٰهُ بِغُلَٰمٍ حَلِيمٍ ﴾، ئێمـەش موژدەمـان پێـدا بـە كـوڕە گەنجێكـی هێدیـی و مەنـد، هەڵبەتـە كـە دەبـێ یەكسـەر گەنـج نیـە، چونكـە (غُـلام) وەك باسـمان كـرد واتـە: مێردمنداڵێـك كـە سـمێڵی بـۆر بووبـن، دیـارە ئـەو كاتـە كـە لـە دایـك دەبـێ، وانیـە، بـەڵام یانـی: كـە لـە داهاتـوودا ببێتـە مێردمنـداڵ، ئەگەرنـا پێشـێ كـە دەبـێ كۆرپـە دەبـێ، بـەڵام ئەمـە یـانی: لـە كاتێكـدا خـوا مـوژدەی پێـداوە كـە كوڕێكتـان دەبـێ، هـاوكات موژدەشـی پێـداوە كـە ئـەو كـوڕە گـەورەش دەبـێ و، دەچێتـە قۆناغـی گەنجیەتییشـەوەو بـە منداڵیـی نامـرێ.

﴿ فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ ٱلسَّعْيَ ﴾، ئنجـا كاتێـك لەگەڵـی گەیشـتە قۆناغـی كاركـردن، بـە كوردیـی دەڵێـن: وەرگێڕكـە واتـە: گەیشـتە قۆناغێـك: (أَنْ يَسْـعَى مَـعَ أَبِيـهِ) لەگەڵ بابی دا كۆشـش بـكات، یـان: (أَنْ يَسْـعَى مَـعَ سَـعْيِ أَبِيـهِ) لەگـەڵ كۆششـی بابیـدا ئەویـش كۆشـش و كار بـكات، یارمەتیـی بابـی بـدات و هـاوكاری بـێ، ببێتـە وەرگێڕكـە، كـە لـەو كاتـەدا كـوڕ زۆر خۆشەویسـتە، هەروەهـا كچیـش زۆر خۆشەویسـتە، لـە كاتێكـدا دەگەنـە قۆناغێـك، كـوڕ یارمەتیـی بابـی بـدات و، كـچ یارمەتیـی دایكـی بـدات، ڕۆڵـە لەوكاتـەدا خۆشەویسـترە لـەوەی كاتێـك بچووكـەو هیچـی لەدەسـت نایـەت، كاتێـك لەگەڵـی گەیشـتە قۆناغـی كۆشـش كـردن و هەوڵـدان و هاوكاریـی كـردن، ﴿ قَالَ يَٰبُنَيَّ إِنِّيٓ أَرَىٰ فِي ٱلْمَنَامِ أَنِّيٓ أَذْبَحُكَ ﴾، (ئیبراهیـم) گوتـی: ئـەی ڕۆڵـە گیـان! مـن لـە

خـەودا بینیـم کـە تـۆم سـەردەبڕی، لـە خـەودا بینیـم واتـە: کاتێـك کـە خەوتبـووم، (مَنـام) واتـە: خەوتـن، خەونـم بینـی، کـە تـۆم سـەردەبڕی، ﴿ فَٱنظُرْ مَاذَا تَرَىٰ ﴾، تـۆش سـەرنج بـدە! بزانـە چـی دەبینـی، ڕات چییـە؟ ﴿ قَالَ يَٰٓأَبَتِ ٱفْعَلْ مَا تُؤْمَرُ ﴾، گوتـی: ئـەی بابـە گیـان! ئـەوەی فەرمانـت پێکـراوە ئەنجامـی بـدە، ﴿ سَتَجِدُنِىٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴾، ئەگـەر خـوا بیـەوێ، مـن لـە خۆڕاگـران دەبینـی، منـت لـێ هەڵدەکـەوێ کـە خۆڕاگـرم.

﴿ فَلَمَّآ أَسْلَمَا ﴾، کاتێـك ملکـەچ بـوون، ملکـەچ بـوون بـۆ ئـەو فەرمانـەی خـوا، ﴿ وَتَلَّهُۥ لِلْجَبِينِ ﴾ لەسـەر لاتەنیشـتی سـەریشی پاڵیخسـت، (تَلَّـهُ: أَسْـقَطَهُ أَو أَضْجَعَـهُ)، خسـتی، کەوانـدی، (لِلْجَبِين) یـانی: لەسـەر لاتەنیشـتی سـەری خسـتی، بـۆ ئـەوەی چەقۆیەکـەی لـە مـل بنـێ، هەندێـك دەڵێـن: چەقۆشـی لـە مـل نـاوە، بـەڵام نەیبڕیوە.

﴿ وَنَٰدَيْنَٰهُ أَن يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ ﴾، بانگیشـمان کـرد: ئـەی ئیبراهیـم! ﴿ قَدْ صَدَّقْتَ ٱلرُّءْيَآ ﴾، بـە دڵنیایـی تـۆ خەونەکـەت بـە ڕاسـت دانـا، واتـە: خەونەکـەت جێبەجـێ کـرد، ئـەوەی کـە پێـمان گوتبـووی، ئیسـماعیلت هێنایـە سـەر سـەربڕین، عەزمـت لەسـەر جـەزم کـردوەو، ئیماعیلیـش تـەواو ملکـەچ بـووەو خـۆی بـە دەسـتەوە داوە، هەردووکتـان لـە تاقیکردنەوەکـە دەرچـوون، ﴿ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾ ئێمـە بـەو شـێوەیە پاداشـتی چاکـەکاران دەدەینـەوە، واتـە: خـوا ﷻ نەیویسـتبوو، ئیسـماعیل سـەرببڕدرێ، ویسـتبووی: بزانـرێ کـە ئیبراهیـم ئامادەیـە ئـەو فەرمانـەی خـوا جێبەجـێ بـکات، هەروەهـا ئیسـماعیلیش ئامادەیـەو، دایکـی ئیسـماعیلیش هاجەریـش ئامادەیـە، هەرچەنـدە لێـرەدا بـەس باسـی هەردووکیـان دەکات ﴿ فَلَمَّآ أَسْلَمَا ﴾، کاتێـك هەردووکیـان بـۆ خـوا ملکـەچ بـوون، وا پێدەچـێ هاجـەر لـەوێ نەبووبـێ لـەو کاتـەدا، ئایا دەبـێ هاجـەر نەمابـێ؟ یاخود لـەو کاتـەدا هاجـەر لـەوێ نەبووبـێ (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، لەبـەر ئـەوەی ئافـرەت زۆر ڕەحـم و شـەفەقەت و سـۆزی هەیـە، یـان ڕەنگـە گوتبێتـی: بـا مـن چـاوم لـێ نەبـێ، گرنـگ ئەوەیـە هەموویـان لـە تاقیکردنـەوەی خـوا دەرچـوون، خـواش ﷻ حیکمەتەکـەی هـەر

ئەوەنـدە بـوو، تاقیـان بکاتـەوە[1]، داخـۆ دەردەچـن یـان دەرناچـن؟ کـە دەرچـوون مانـای وایـە حیکمەتـی فەرمانەکـە هاتـەدی، بۆیـە دەفەرمـوێ: ئێمـە بـەو شـێوەیە پاداشـتی چاکـەکاران دەدەینــەوە.

﴿ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْبَلَٰٓؤُا۟ ٱلْمُبِينُ ﴾، بـە دڵنیایـی ئـا ئەمـە تاقیکردنەوەیەکـی ڕوون بـوو، یاخـود ئـا ئـەوە چاکەیەکـی ڕوون بـوو، چونکـە وشـەی (بَلاء) هـەم بـە مانـای (مِنْحَة) دێ، واتـە: بەخـشراو، نیعمـەت، هـەم بـە مانـای (مِحْنَة)یـش دێ واتـە: بـەڵاو مەینەتیـی و ناڕەحەتیـی، کـە ئـەو مەسـەلەیەش هەردووکیـان بـوو:

أ- بێگومان فەرمانی سەربڕانەکە، بەڵا بوو.

ب- ئەوەش کە خوا دوایی قەرەبووی بۆ نارد، نیعمەت بوو واتە: ئەم تاقیکردنەوە دوو دیوی هەبوون، دیوێکی بریتی بوو لە سەختیی و دژواریی، دیوێکیشی بریتی بوو لە خۆشیی و نیعمەت.

﴿ وَفَدَيْنَٰهُ بِذِبْحٍ عَظِيمٍ ﴾، (ذِبْـح) واتـە: (مَذْبُـوح)، کردمانـە بەڵاگێـڕو قەرەبـووی، سـەربڕاوێکی مـەزن، کـە زۆربـەی زانایـان دەڵێـن: بـەران (کبش)ێـك بـوو، بەرانێکـی قەبـەو مـەزن بـووە.

﴿ وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِى ٱلْءَاخِرِينَ ﴾، نـاوی چـاك و ناوبانگـی چاکـمان لـە نێـو ئەوانـی دیکـەدا بـۆ ئیبراهیـم بەجێهێشـت، واتـە: ناوبانگـی چاکـیمان بڵاوکـردەوە، وەك چـۆن نووحیـش ﷺ هـەروا، ئیبراهیمیـش ﷺ هـەروا، هیـچ خـاوەن دینێکـی ئاسـمانیی نیـە، هیـچ خـاوەن بەرنامەیەکـی ئاسـمانیی نیـە، کـە ڕێـزی نەبـێ بـۆ هـەر کام لـە نـووح و ئیبراهیـم (عَلَيْهِـمَا الصَّـلاةُ وَالسَّـلام)، بۆیـە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِى ٱلْءَاخِرِينَ ﴾، هـەم بـۆ نووحیـش وا دەفەرمـوێ، هـەم بـۆ ئیبراهیمیـش، ناوبانگـی چاکـمان بـۆی بـە نێـو ئەوانیدیکـەدا، بـە نێـو جیهانییانـدا بڵاوکردنـەوە.

---

(١) هەڵبەتـە خـوا بـەر لـە تاقیکردنـەوەش زانیویـەتی، بـەڵام ویسـتوویەتی: بزانرێ و لەسـەر ئەرزی واقیـع بەرجەسـتە ببێ.

﴿ سَلَٰمٌ عَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ ﴾، ئاشتیی و سەلامەتیی لەسەر ئیبراهیم بێ، لە دنیاو دوارۆژدا سەلامەت و بێمەزەڕەت بێ، ﴿ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾، بەو شێوەیەش پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە، ﴿ إِنَّهُۥ مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾، بە دڵنیایی ئەو لە بەندە بڕوادارەکانمان بوو.

﴿ وَبَشَّرۡنَٰهُ بِإِسۡحَٰقَ نَبِيّٗا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾، هەروەها موژدەشمان پێدا بە ئیسحاق، کە پێغەمبەرێك بێ لە چاکان، ئەمە بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرایە لەسەر ئەوەیە کە ئەوەی پێشێ هێنراوەتە سەر سەربڕان، ئیسماعیل بووە ﷺ، چونکە لێرە خوا دەفەرموێ: دوایی موژدەشمان پێدا بە ئیسحاق، کە پێغەمبەرێك بێ لە چاکان، لە بەندە چاکەکان، مانای وایە ئەوەی کە هێنراوەتە سەر سەربڕان، بریتی بووە لە ئیسماعیل ﷺ، چونکە جارێ ئیسحاق هەر لە دایك نەبووە، دوایی خوا ﷻ موژدە دەدات بە ئیبراهیم کە ئیسحاقیشی دەبێ، کە یەکێك دەبێ لە بەندە چاکەکان و شایستەکانی خوا.

﴿ وَبَٰرَكۡنَا عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ إِسۡحَٰقَ ﴾، پیت و پێزیشمان خستە سەر ئەوو سەر ئیسحاقیش، واتە: هەم ئیبراهیم، هەم ئیسحاقیشمان پێزدارو بەرەکەتدار کردن، ئنجا خۆیان بەرەکەتدارو پێزدار کراون، ئەدی وەچەکانیان؟ ئەدی کوڕو کچەکانیان کە لێیانەوە پەیدادەبن؟ ﴿ وَمِن ذُرِّيَّتِهِمَا ﴾، هەروەها لە وەچەکەیشیان، وەچەی هەردووکیان: ﴿ مُحۡسِنٞ وَظَالِمٞ لِّنَفۡسِهِۦ مُبِينٞ ﴾، هەم چاکەکار هەیەو، هەم ستەمکار لە خۆی، کە زۆر ڕوون و ئاشکرایە، ستەمی لە خۆی کردوە واتە: لە وەچەکەیان هەم چاك هەیە، هەم خراپ هەیە، هەم چاکەکار هەیە، هەم خراپەکار هەیە، یاخود هەم ڕێی ڕاستگرتوو هەیەو، هەم لادەرو ستەمکاریش هەیە، کەسێك کە لادەدات، بە تەئکید پێش خەڵك ستەم لە خۆی دەکات و، ستەمەکەشی ستەمێکی ڕوون و ئاشکرایە.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**بانگکــردن و پاڕانــەوەی نــووح و، وەڵامدانــەوەی خــوا بــۆی و، دەربازکردنــی خۆی و نیزیکانــی لــە خــەم و پــەژارەی مــەزن و، هێشــتنەوەی وەچەکــەی لەســەر زەوی و، بڵاوکردنــەوەی ســتایش و مەدحکردنــی لــە نێــو جیهانییانــداو، نغرۆکردنــی بێبڕوایــان و، ڕاگەیاندنــی ئــەو ڕاســتییە، کــە هــەر ئەوەیــە مامەڵــە کردنــی خــوا لەگــەڵ چاکــەکاران دا:**

خــوا ﷻ دەفەرمــوێ: ﴿ وَلَقَدْ نَادَىٰنَا نُوحٌ فَلَنِعْمَ ٱلْمُجِيبُونَ ﴿٧٥﴾ وَنَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥ مِنَ ٱلْكَرْبِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٧٦﴾ وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُۥ هُمُ ٱلْبَاقِينَ ﴿٧٧﴾ وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِى ٱلْءَاخِرِينَ ﴿٧٨﴾ سَلَٰمٌ عَلَىٰ نُوحٍ فِى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٧٩﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٨٠﴾ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٨١﴾ ثُمَّ أَغْرَقْنَا ٱلْءَاخَرِينَ ﴿٨٢﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿ وَلَقَدْ نَادَىٰنَا نُوحٌ ﴾، بە دڵنیایی نووح لێمان پاڕایەوە، دیارە (و)ە کە بۆ بادانەوەو گێڕانەوەی ئەم قسانەو ئەم بەسەرهاتەیە، بۆ سەر باسەکانی پێشێ، واتە: وێڕای ئەو باس و خواسانەی پێشێ، بە دڵنیایی نووحیش بانگی کردین و لێمان پاڕایەوە، کە دەفەرموێ: (لَقَدْ) کە هەم بە (ل)ی سوێند خواردن، هەم بە (قَدْ)ی ساغکردنەوە (تحقیق)و دڵنیاکردنەوە، هاتوە، هەم هۆشداریی پێدانی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانە، مامەڵە لەگەڵ کردنیانە، وەك کەسێك کە نکووڵیی بکات لەوەی نووح ﷺ پێغەمبەری خوا بووەو، هاواری کردۆتە خواو، خوا وەڵامی داوەتەوە، بۆیە وا خوا بە دڵنیاکردنەوەو

بە جەختکردنەوەوە دەفەرمویّ: ﴿ وَلَقَدْ نَادَىٰنَا نُوحٌ ﴾، بە دڵنیایی نووح لێمان پاڕایەوەو هاواری تێبەستین.

٢)- ﴿ فَلَنِعْمَ ٱلْمُجِيبُونَ ﴾، ئێمەش باشترین وەڵامدەرەوە بووین، واتە: باشترین وەڵامدەرەوە بووین بۆ نووح ﷺ وەڵامدانەوەش یانی: بە کردەوە بە دەنگیەوە هاتین و دەفریای هاتین، دوایی خوا ﷻ باسی چۆنیەتیی وەڵامدانەوەکەو، دەفریا هاتن و وەدەنگ هاتنەکە دەکات.

دیارە هەمیشە کە: (نِعْمَ) یان (بِئْسَ) دێ، دەبێ تایبەتکراو بە مەدح یان بەسەرزەنشت (مَخْصُوص بِالْمَدْح أو بالذم) هەبێ، بەڵام لێرە: ﴿ فَلَنِعْمَ ٱلْمُجِيبُونَ ﴾، (الْمَخْصُوصُ بِالْمَدْحِ مَحْذُوفٌ: فَلَنِعْمَ الْمُجِيبُونَ، نَحْنُ) تایبەتکراو بەستایش و مەدح قرتێنراوە، ئێمە باشترین وەڵامدەرەوە بووین بۆ نووح.

٣)- ﴿ وَنَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥ مِنَ ٱلْكَرْبِ ٱلْعَظِيمِ ﴾، خۆی و نیزیکانیمان لە خەفەت و مەینەتییە مەزنەکە دەرباز کردن، (التَّنْجِيَةُ: الإِنْجَاءُ، وَهُوَ جَعْلُ الْغَيْرِ نَاجِياً، وَهُوَ الْخَلَاصُ مِنْ ضُرٍّ وَاقِعٍ)، (تَنْجِيَة): بریتیە لە دەرباز کردن، ئەوەیە وا بکەی ئەو کەسە لە زیانێك كە بۆی هاتۆتە پێشێ، دەربازو قوتاری بکەی.

کە دەفەرمویّ: (وَأَهْلَهُ) واتە: خێزانەکەی، یاخود ئەوانەی کە لێی نیزیك بوون، چ لە ڕووی ڕەچەڵەکەوە، چ لە ڕووی دینەوە، هەردووکیان دەگرێتەوە، ئەوانەی لێی نیزیك بوون: هەم ماڵ و خێزانەکەی کە لەسەر پەیڕەوو ڕێبازی ئەو بوون، هەم ئەو بڕوادارانەی کە لەگەڵیدا بوون و لێی نیزیك بوون.

(الْكَرْبُ الْعَظِيم: الْحُزْنُ الشَّدِيد) یانی: خەم و مەینەتییەکی سەخت و مەزن، کە مەبەست پێی تۆفانە.

٤)- ﴿ وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُۥ هُمُ ٱلْبَاقِينَ ﴾، تەنیا وەچەکەی ئەویشمان هێشتەوە، وشەی (هُمُ الْبَاقِين) کە بە (ضمير الفصل) ڕاناوی جیاکردنەوە، هاتوە، واتە: تەنیا وەچەکەی ئەومان

هێشتنەوە لەسەر زەوی، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە مرۆڤایەتیی لە دوای نووح ﷺ هەمووی وەچەی ئەو بووبێ، بۆیە هەندێك لە مێژوونووسەکان گوتوویانە: (نُوح أَبُو الْبَشَرِ الثَّانِي) نووح بابی دووەمی مرۆڤایەتییە، وەك چۆن وەچەی مرۆڤان هەموویان لە ئادەمن لە سەرەتاوە، دواییش هەموویان لە نووحن.

بەڵام لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشێ، چونکە لە سووڕەتی (هود)دا، هەروەها لە سووڕەتی (المؤمنون)یشدا هەمان شت هاتوە، کە خوا دەفەرموێ: ﴿قُلْنَا ٱحْمِلْ فِيهَا مِن كُلٍّ زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ وَأَهْلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيْهِ ٱلْقَوْلُ وَمَنْ ءَامَنَ وَمَآ ءَامَنَ مَعَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلٌ ﴿٤٠﴾﴾هود، واتە: گوتمان: لە هەر ژیاندارێك جووتێك، دووان (نێرو مێیەك) سواربکە، هەروەها ماڵ و خێزانەکەشت، جگە لەوەی پێشتر بڕیاری لەسەر دراوە [کە خێزانەکەی و کوڕەکەی بوون و، هەر کەسێك کە بڕوای نەهێناوە] کەمێك نەبێ بڕوایان پێ نەهێنا.

کەواتە: وێڕای ماڵ و خێزانەکەی، کەسانێکی دیکەش کە بڕوایان پێ هێناوە، دەرباز بوون، ئنجا ئایا ئەمە چۆنە؟

ئەمە بە دوو جۆر وەڵام دراوەتەوە:

أ- وەڵامێکیان ئەوەیە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ) گوتوویەتی: (لَمَّا خَرَجَ نُوحٌ مِنَ السَّفِينَةِ، مَاتَ مَنْ مَعَهُ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ إِلاَّ وَلَدَهُ وَنِسَاءَهُ) واتە: دوای ئەوەی نووح و ئەوانەی لەگەڵی بوون، لە کەشتییەکە چوونە دەرێ، هەموو ئەو پیاوو ئافرەتانە (ی بڕواداران) کە لەگەڵی بوون، مردن [وەچەیان لێ نەکەوتەوە] تەنیا ڕۆڵەکانی، کوڕو کچەکانی و هاوسەرەکانی مانەوە.

ب- وەڵامێکی دیکە ئەوەیە:

سەرجەم سواربووانی کەشتییەکە لە وەچەی نووح بوون، واتە: هەموو ئەوانەی کە لەگەڵی سوار بوون، بەڵێ هەندێکیان کوڕو کچی بوون، نیزیك

بوون، ئەوەی بوون، بەڵام ئەوانەی دیکەش هەموویان بە ڕەچەڵەك هەر دەچوونەوە سەر ئەو، چونكە نووح ؏ تەمەنێكی درێژی هەبووە.

كەواتە: كە دەفەرمووێ: ﴿ وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُۥ هُمُ ٱلْبَاقِينَ ﴾، چونكە ئەوانی دیكەش هەرچەند دووریش كەوتبنەوە، بەڵام لە ئەصڵدا هەر وەچەی ئەو بوون و، جگە لەوەچەی نووح هیچكەس لە سەر زەوی نەما.

لەو بارەوە كە مرۆڤەكان تەنیا لە وەچەی نووح ؏ ماون، ئەم شوێنەوارە هاتوە، با لە ڕووی سەنەدیشەوە زۆر بەهێز نەبێ، بەڵام تیشكێكمان بۆ دەخاتە سەر ئەو بابەتە: {عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ «فِي قَوْلِهِ: ﴿ وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُۥ هُمُ ٱلْبَاقِينَ ﴾ قَالَ: حَامٌ وَسَامٌ وَيَافِثُ»} (أخرجه الترمذي: ٣٢٣٠، وَحَسَّنَهُ، الطبري: ٢٩٤١٩، وسنده ضعيف).

سەمورەی كوڕی جوندوب لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتەوە: لە بارەی فەرمایشتی خواوە كە دەفەرمووێ: ﴿ وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُۥ هُمُ ٱلْبَاقِينَ ﴾، فەرموویەتی: وەچەی نووح لەو سێ كوڕەیەوە بووە: (حَامٌ وَسَامٌ وَيَافِثُ).

ئنجا گوتوویانە:

١- ئەوانەی كە ڕەش پێستەكانن و زەرد پێستەكانن، هەموویان دەچنەوە سەر (حام).

٢- عەرەب و فارس و ئەوانەی كە پێیان دەگوترێ هیندو ئەورووپیی، ئەوانیش هەموویان لە (سام)ن.

٣- تورك و تەتەرو مەغۆل و، یابانیی و ئەوانەی دیكەش، هەموویان دەچنەوە سەر (یافث).

بە هەرحاڵ كە خوا دەفەرمووێ: تەنیا وەچەی ئەومان هێشتەوە، وایە، بەڵام وردەكارییەكەی چۆنە؟ ئەگەر شتێك، چ لە ڕووی لێكۆڵینەوەی مێژوویییەوە ببێ بە حەقیقەتێكی زانستیی، چ لە ڕووی هەواڵ پێدانی وەحییەوە سەنەدێكی ڕاست و دروستی هەبێ، ئەوە دیارە شتەكە یەكلایی دەكاتەوە، ئەگەرنا مشتومڕی هەر تێدا دەمێنێ، وەك ئەم بابەتە وایە، تاكو ئێستا.

شایانی باسە: وەك ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (هود)یش دا کە بەسەرهاتی نووحمان لەوێدا بە تەفصیل هێناوە گوتوومانە، ئەو ڕایەمان پێ بەهێزترە کە ئەو تۆفانە سەرزەوی گرتۆتەوە، ئەگەر هەموو سەر زەویشی نەگرتبێتەوە، ئەو شوێنەی کە مرۆڤی لێ هەبوون، هەمووی گرتۆتەوە، واتە: یان هەموو سەر زەوی گرتۆتەوە، کە (پەیمانی کۆن)یش ئەوە دەگەیەنێ و، کتێبە مێژوویەکانیش ئەوە دەگەیەنن و، لە مێژووی هەموو گەلاندا نووسراوە، لە مێژووی چینییەکان، یابانییەکان، میسرییەکان، لە هەموویاندا نووسراوە کە تۆفانێك بووە هەموو سەر زەوی گرتۆتەوە، یاخود بە لای کەمەوە، ئەگەر هەموو سەر زەویشی نەگرتبێتەوە، ئەو شوێنەی هەموو گرتۆتەوە کە مرۆڤ تەنیا لەوێ هەبوون.

٥)- ﴿ وَتَرَكۡنَا عَلَيۡهِ فِي ٱلۡأٓخِرِينَ ﴾، هەروەها لە نێو ئەوانی دیکەدا لەسەریمان بەجێهێشت.

یەکێك لە ڕوونکەرەوانی قورئان لێرەدا گوتوویەتی: (أي تَرَكْنَا ثَنَاءً حَسَناً، وَضُمِّنَ (تَرَكْنـا) مَعْنَـى (أَنْعَمْنـا) إِذْ كَانَ «وَتَرَكْنـا عَلَيْـهِ ثَنَـاءً حَسَـناً وَأَنْعَمْنـا عَلَيْـهِ»، فَحَصَـلَ فِي قَوْلِـهِ (وَتَرَكْنـا عَلَيْـهِ) حَـذْفُ خَمْـسِ كَلِـماتٍ، وَحَسْـبَ قَاعِـدَةِ التَّضْمِـينِ يُفِيـدُ الْمُضَمَّـنُ مَفَـادَ كَلِمَتَيْنِ)، واتـە: کـە دەفەرموێ: ﴿ وَتَرَكۡنَا عَلَيۡهِ فِي ٱلۡأٓخِرِينَ ﴾، وشەی (تَرَكْنـا) مانـای (أَنْعَمْنا)شی خراوەتە نێو، ئەگەرنا بە (عَلى) بەرکاری نەدەخواست: (وَتَرَكْنـا عَلَيْـهِ)، دەیفەرموو: (وَتَرَكْنَا لَـهُ)، بەڵام بۆ ئەوەی (تَرَكْنَا) بەجێمان هێشت، مانای: چاکەمان لەگەڵدا کرد، ئەوەشی بخرێتە نێو، خوا وشەی (تَرَكْنَا)ی بە (عَلى) تەعەددا پێکردوە بۆ بەرکار (مفعول بە) کە لە ئەصڵدا ناوا بووە: (تَرَكْنَا لَـهُ ثَنَاءً حَسَـناً وَأَنْعَمْنـا عَلَيْـهِ) ناوبانگێکی چاکمان بۆ بەجێهێشت و چاکەشمان لەگەڵدا کرد، کەواتە: بەڕستەی: (وَتَرَكْنَا عَلَيْـهِ) پێنج وشە قرتێندراون، بەڵام (وَتَرَكْنـا عَلَيْـهِ) دەلالەت لەسەر ئەو پێنجانەش دەکات، چونکە بە پێی بنچینەی خرانە نێو (تضمين)، ئەو وشەیەی کە مانایەکی دیکەی خراوەتە نێو، بە هۆی ئەوەوە بە پیتێك کە عادەت نیە بەرکاری پێ بخوازێ، بەرکاری پێ دەخوازێ، مانای دوو وشان دەگەیەنێ.

٦)- ﴿ سَلَٰمٌ عَلَىٰ نُوحٍ فِى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، سەلام لەسەر نووح بێ لە نێو هەموو جیهانییاندا، ئەم ڕستەیە:

أ- دەگونجێ بەرکار (مفعول به) بێ بۆ (تَرَكْنا) یانی: (وَتَرَكْنا عَلَيْهِ فِي الأَخِرِينَ: سَلامٌ عَلَى نُوحٍ فِي العَالَمِينَ)، لە نێو ئەوانی دیکەدا لەسەرمان جێهێشت: سەلام لەسەر نووح بێ لە نێو هەموو جیهانییاندا.

ب- دەشگونجێ کە ئەمە ڕستەیەکی دەست پێکردن (جملة ابتدائية) بێ و سەربەخۆ بێ و ئەوەی پێشێ تێپەڕ بوو، ئنجا خوا دەفەرموێ: سەلام لەسەر نووح بێ، ئاشتیی و سەلامەتیی لەسەر نووح ﷺ بێ لە نێو هەموو جیهانییاندا، بۆیەش دەفەرموێ: (فِي العَالَمِينَ) کە ئەمە لەم سووڕەتەدا، تایبەتە بە نووحەوە ﷺ و بۆ ئەوانی دیکە هەموویان، فەرموویەتی: ﴿ وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِى ٱلْءَاخِرِينَ ﴾، هەروەها بۆ سەلامەکەش ئەمە لێرەدا تایبەتە نووحەوە ﷺ و تەنانەت بۆ ئیبراهیم ﷺ یش وای نەفەرموە، چونکە نووح ﷺ بابی دووەمی مرۆڤایەتیی بووەو، لە نێو هەموو خاوەن بەرنامە ئاسمانییەکاندا، یەکدەنگیی لەسەر بووە.

٧)- ﴿ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾، ئێمە بەو شێوەیە پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە، ئاوا دەربازیان دەکەین لە تەنگانەداو بە دەنگیانەوە دێین.

٨)- ﴿ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، بە دڵنیایی نووح لە بەندە بڕوادارەکانمان بوو، کەواتە: بە هۆی ئیمانەوە چاکەکار بوو، بە هۆی ئیمانەوەش خوا بە دەنگیەوە هات.

ئنجا کە دەفەرموێ: (إِنَّا كَذَٰلِكَ) [ئێمە بەوجۆرە] خوا ﷻ دەیەوێ پێمان بفەرموێ: ئەوە بناغەی مامەڵەی خوایە لەگەڵ چاکەکاراندا‌و، ئەوە بەس بۆ نووح ﷺ نەبووە، بەڵکو هەر کەسێکی دیکەش بەو شێوەیە بێ، ئەهلی ئیمان بێ و چاکەکار بێ، بۆ خوا ساغ و یەکلابووەوە بێ، بێگومان خوای موتەعال، خوای میهرەبان هەر بەو شێوەیە مامەڵەی لەگەڵدا دەکات

٩)- ﴿ ثُمَّ أَغْرَقْنَا ٱلْءَاخَرِينَ ﴾، دوایی ئەوانی دیکەمان نغرۆ کردن، فەوتاندمانن، وشەی (الآخَرِينَ) یانی: ئەوانی دیکەی جگە لە کەسوکارەکەی کە لەگەڵیدا سواری کەشتییەکە

بوون، واتە: هەموو ئەو خەڵکەی دیکە کە گەلی نووح ﷺ بوون و، لەگەڵ نووحدا ﷺ دەژیان، بەڵام بڕوایان پێ نەهێنا، هەموویانمان فەوتاندن.

وشەی (ثُمَّ) لێرەدا: (لِلتَّرْتِيبِ وَالتَّرَاخِي الرُّتْبِيَّيْنِ) هەم بۆ ڕیزبەندیی، هەم بۆ بە دوای یەکدا هاتنی پلەبەندییە، واتە: دوای ئەوەی نووح و ئەوانمان دەربازکردن، ئنجا ئەوەش پلەیەکی بەرزترە کە نەیارەکانیشیانمان فەوتاندن.

**مەسەلەی دووەم:**

**ئیبراهیم ﷺ لە شوێنکەوتووانی نووح ﷺ بوو، بە دڵێکی ساغەوە بەرەو لای پەروەردگاری چوو، بە بابی و گەلەکەی گوت: ئەوە چی دەپەرستن؟ ئایا بە درۆ لە جیاتی خوا پەرستراوان دەخوازن؟ ئایا گومانتان بەرانبەر بە پەروەردگاری جیهانییان چۆنە؟**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ مِن شِيعَتِهِۦ لَإِبْرَٰهِيمَ ﴿٨٣﴾ إِذْ جَآءَ رَبَّهُۥ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴿٨٤﴾ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَاذَا تَعْبُدُونَ ﴿٨٥﴾ أَئِفْكًا ءَالِهَةً دُونَ ٱللَّهِ تُرِيدُونَ ﴿٨٦﴾ فَمَا ظَنُّكُم بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٧﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿وَإِنَّ مِن شِيعَتِهِۦ لَإِبْرَٰهِيمَ﴾، بە دڵنیایی لە کۆمەڵەکەی، لە پەیڕەوانی و شوێنکەوتووانی نووح ﷺ ئیبراهیم بوو ﷺ، پێشتریش گوتوومانە: (**الشِّيعَةُ: اسْمٌ لِمَنْ يُنَاصِرُ الرَّجُلَ وَ أَتْبَاعَهُ وَيَتَعَصَّبُ لَهُ، فَيَقَعُ عَلى الْمُفْرَدِ وَالْجَمْعِ، وَالْجَمْعُ: أَشْيَاع وَشِيَع**)، (**شِيعَة**): ناوە بۆ هەر کەسێك کە پیاوێك، یان کەسێك سەردەخات، شوێنکەوتووەکانی سەردەخات و، بۆی دەمارگیر دەبێ، وشەی (**شِيعَة**) هەم بۆ تاك بەکاردێ، بۆ وێنە: (**فُلان شَيعَةُ فُلان**)، هەم بۆ کۆ بەکاردێ، وشەی (**شِيعَة**) بە (**أَشْيَاع**) کۆدەکرێتەوەو بە (**شِيَع**)یش کۆدەکرێتەوە، هەردووکیشیان لە قورئاندا هاتوون: ﴿فِى شِيَعِ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٠﴾﴾**الحجر**، هەروەها (**أَشْيَاع**) یش هاتوە: ﴿وَلَقَدْ أَهْلَكْنَآ أَشْيَاعَكُمْ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ﴾ **القمر** -٥١-.

**ئیبراهیم ﷺ لە کۆمەڵ و لە شوێنکەوتووانی نووح ﷺ بوو، ئنجا کە ئەوە جەخت کراوەتەوە، هەم بە (إِنَّ)، هەم بە (ل)، (لَإِبْرَاهِيم) بۆ بەرپەرچدانەوەی هاوبەش بۆ خوا دانەرانە، کە خۆیان بە شوێنکەوتووی ئیبراهیم ﷺ دەزانی و، خۆیان پاڵدەدایە لای ئیبراهیم ﷺ، نەخێر! ئیبراهیم ﷺ شوێنکەوتووی نووح ﷺ بوو، نووحیش ئەهلی تەوحید بووە، ئیبراهیمیش بە هەمان شێوە ئەهلی خوا بەیەکگرتن بووە.**

کەواتـە: ئێـوە ڕاسـت ناکـەن ئـەی هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەکان! کـە خۆتـان پاڵدەدەنـە لای نـووح و لای ئیبراهیـم (صـەڵات و سـەلامی خوایـان لەسـەر بـێ)، لـە حاڵێکـدا ئێـوە چەنـد پەرسـتراوێك دەکەنـە هاوبەشـی خـوا، بـەڵام ئـەوان تەنیا خوایـان بـە پەرسـتراو زانیـوەو، تەنیـا پەرسـتراوی ڕاسـتەقینەیان پەرسـتوە کـە خوایـە.

٢)- ﴿ إِذْ جَآءَ رَبَّهُۥ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴾، یاد بکەوە! کاتێك کە بە دڵێکی ساغ و پاکەوە هاتە لای پەروەردگاری، وشەی (سَلِيم: **صِفَةٌ مُشَبَّهَةٌ مُشْتَقَّةٌ مِنَ السَّلامَةِ، وَهِيَ الْخَلاصُ مِنَ الْعِلَلِ وَالأَدْواءِ**)، (سَلِيم) سیفەتی (**مُشَبَّهَة**)یە، دەشوبهێتە (**فعل**)ەوەو، لە وشەی (**سلامة**)وە داتاشراوە، سەلامەتییش بریتیە لە دەرباز بوون لە نەخۆشیی و، لە دەردو نارەحەتییان.

مانـای: [هاتـە لای پـەروەردگاری] (**أُطْلِـقَ الْمَجِـيءُ عَـلى مُعَامَلَتِـهِ نَفْسَـهُ بِمَـا يُـرْضِي رَبَّهُ، عَـلى وَجْـهِ التَّمْثِيـلِ بِحَـالِ مَـنْ يَجِيـئُ أَحَـدَاً مُلْقِيـاً إِلَيْـهِ مَـا طَلَبَـهُ مِـنْ سِـلاَحٍ أَو تُحَـفٍ**)، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ إِذْ جَآءَ رَبَّهُۥ ﴾، هاتـە لای پـەروەردگاری، وشـەی هاتـن بـە کارهێـنراوە بـۆ مامەڵـە کردنـی لەگـەڵ خـۆی دا، بـە شـێوەیەك کـە پـەروەردگاری ڕازی بـکات، ئەمـەش بـە شـێوەی نوانـدن و چوانـدن بـە حاڵـی کەسـێك کـە دەچـێ بـۆ لای کەسـێك، هەرچـی کـە داوای لێکـردوە، ئەگـەر چەکـە، ئەگـەر شـتێکی گرانبەهایـە، بـۆی دێنـێ و دەڵـێ: فەرمـوو، واتـە: ئەویـش تـا بـەو شـێوەیە هاتـە خزمـەت پـەروەردگاری و گوتـی: فەرمـوو پـەروەردگارم! لـە خزمەتتـدام، هەرچـی تـۆ پێـت خـۆش بـێ، مـن وادەکـەم.

٣)- ﴿ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَاذَا تَعْبُدُونَ ﴾ [ئنجا چۆنیەتیی هاتنی بۆ لای پەروەردگاری باس دەکات] کاتێك کە بە بابی و بە خەڵکەکەی گوت، بە کۆمەڵگاکەی خۆی گوت: چی دەپەرستن؟ بێگومان ئەوە پرسیار لێکردنی نکووڵیلێکەرانەیە.

وشـەی (**مَـاذَا**)ش وشـەیەکی لێکـدراوە، (**مَـا**) بـۆ پرسـیارە، (**ذا**) بـە مانـای (**الَّـذِي**) یانـی: (**مَـا الَّـذِي تَعْبُدُونَـهُ**) ئـەوە چییـە کـە دەپەرسـتن؟

٤)- ﴿ أَئِفْكًا ءَالِهَةً دُونَ ٱللَّهِ تُرِيدُونَ ﴾، ئایا بە درۆ پەرستراوانێك جگە لە خوا دەخوازن، (**تُرِيدُون: إِرَادَةُ الشَّيءِ: ابْتِغَاؤُهُ وَالْعَزْمُ عَلى حُصُولِهِ**) ویستنی شتێك، بریتیە لەوە کە ئەو

شتە بخوازێ و دڵی خۆشی بچەسپێنێ لەسەر ئەوەی پەیدای بکات، ئایا ئێوە بە درۆ پەرستراوانێك جگە لە خوا داوا دەکەن؟

(أَئِفْكًا) هەمزەکە بۆ پرسیار لێکردنی نکووڵییلێکەرانەیە، یانی: (كَيْفَ تُرِيدُونَ آلِهَةً إِفْكًا) چۆن پەرستراوانێك بە درۆ دەخوازن و داوا دەکەن؟

ئەم ڕستەیە: ﴿ أَئِفْكًا ءَالِهَةً دُونَ ٱللَّهِ تُرِيدُونَ ﴾ زانایان چەند واتایەکیان بۆ داناون:

١- ﴿ أَئِفْكًا ءَالِهَةً دُونَ ٱللَّهِ ﴾، دەبێتە حاڵ بۆ (تُرِيدُون) یانی: ئایا لە حاڵێك دا دەخوازن پەرستراوانی درۆوساختە دەخوازن؟!

٢- یاخود یانی: (آلِهَةً مَكْذُوبَةً ترِيدُون؟) ئایا پەرستراوانی درۆ دەخوازن؟ ئەو کاتە (إفكاً) دەبێتە حاڵ لە (آلِهَةً) یانی: ئایا پەرستراوانێکی بە درۆ دەخوازن؟

٣- یاخود یانی: (أَتُرِيدُونَ إِفْكاً وَهُوَ آلِهَةٌ غَيْرُ الله) ئایا درۆ دەخوازن کە بریتیە لە پەرستراوانێك جگە لە خوا؟ کە ئەو کاتە (إِفْكاً) دەبێتە (بَدَل)ی (آلهة).

٤- یاخود یانی: (أَتُرِيدُونَ آلِهَةً لِلإِفْكِ) ئایا بۆ درۆ کردن پەرستراوانێکی دیکە دەخوازن، کە ئەوکاتە (إفكاً) دەبێتە (مفعول له) یان (مفعول من أجله).

ئەوە هەندێك وردەکاریی ڕێزمانی عەرەبییە، کە مانای ئایەتەکان فراوانتر دەکات، پاکیی بۆ ئەو خوایەی کە فەرمایشتی خۆی بە جۆرێك فەرمووە، لە یەك کاتدا بە پێی ڕێزمانی عەرەبیی، چەندان واتا هەڵبگرێ، هەمووشیان گونجاوبن، بەڵام دیارە هەندێك لە زانایان مانایەکیان پێ بەهێزترە، هەندێکی دیکە مانایەکی دیکەیان پێ بەهێزترە، بەڵام لە ڕووی بنچینەکانی ڕێزمانی عەرەبییەوە، هەموو مانایەکان دەگونجێن لەگەڵ ڕستەکەدا.

٥)- ﴿ فَمَا ظَنُّكُم بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، ئنجا گومانتان بەرانبەر بە پەروەردگاری جیهانییان چۆنە؟

ئەم ڕستەیەش بەلای کەمەوە، سێ واتایان هەڵدەگرێ:

أ- ئێوە گومانێکی زۆر خراپ بە پەروەردگارتان دەبەن، کە جگە لەو دەپەرستن، مانای وایە گومانی خراپ بە پەروەردگارتان دەبەن.

ب- گومانتان بەرانبەر بە پەروەردگارتان چییە؟ چۆنتان مامەڵە لەگەڵدا دەکات، لە کاتێکدا جگە لەو دەپەرستن؟

ج- گومانتان چییە بە پەروەردگارتان، کاتێك بە دیداری دەگەن؟ بە چ چاوو ڕوویێکەوە دەچنەوە خزمەتی، کە هەندێك لە دروستکراوەکانیتان کردوون بە هاوبەشی؟!

کۆتایی ئەم مەسەلەیە بەوە دێنین کە خوا ﷻ لێرەدا باسی (قلبٍ سلیم) دەکات و، لە چەند شوێنێك لە قورئانیشدا باسی دڵی نەخۆش دەکات بۆ نموونە: (**فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ**) البقرة -١٠- دڵیان نەخۆشیی تێدایە، ئاشکرایە (القلبُ السلیم) ڕێك دژو پێچەوانەی دڵی نەخۆش (القلبُ المریض)ە، دڵی ساغ و بێخەوش و پاك ئەو دڵەیە کە تەنیا ئیمانی تێدا بێ و، دوور بێ لە کوفر، تەنیا تەوحیدو خوا بەیەکگرتن و، تەنیا خواپەرستیی تێدا بێ و، دوور بێ لە شیرك، تەنیا خێرخوازیی و چاکەخوازیی و چاکەکاریی و دڵسۆزیی و بەزەیی و پەرۆشی تێدا بێ بۆ خەڵك و، دوور بێ لە بوغزو کینە غەرەزو، نیەت و نیازی خراپ.

بە پێچەوانەوەش دڵی نەخۆش ئەو دڵەیە پێچەوانەی هەموو ئەوانەی تێدا بێ، واتە: لە جیاتی ئیمان، کوفری تێدا بێ، لە جیاتی تەوحید، شیرکی تێدا بێ، لە جیاتی دڵسۆزیی و پەرۆش و بەزەیی بۆ خەڵك، بوغزو کینەو غەرەزو، نیازو مەبەستی خراپی تێدا بێ.

هیچ گومانی تێدانیە کە دڵ لە ئەنجامی پەیوەندیی لەگەڵ خواداو بەندایەتیی بۆ خوادا، ساغ دەبێ و چاك دەبێ و پاك دەبێ و، لە ئەنجامی دوور کەوتنەوەش لە خوادا، دڵ پیس دەبێ و نەخۆش دەبێ، دەبێتە هێلانەی تێدا ترووکانی گەرای وەسوەسەکانی شەیتان.

خـوا بـە لوتـف و کەرەمـی خـۆی لـەو کەسـانەمان بگێـڕێ کـە یارمەتییـان دەدات، دڵـی خۆیـان پـاك و چـاك ڕابگـرن، سـاغ و باشـی بکـەن، بەهـۆی پەیوەندیـی ڕاسـت و دروسـتەوە لەگـەڵ خـواو، بـە هـۆی بەندایەتیـی چاکـەوە بـۆ خـواو، بـە هـۆی خـۆ پاراسـتنەوە لـە هەمـوو ئـەو شـتانەی کـە پێچەوانـەو دژی بەندایەتییـن بـۆ خـواو، لـە هەمـوو ئـەو شـتانەی پێچەوانـەی ئیـمان و، پێچەوانـەی تەوحیـدو، پێچەوانـەی دڵسـۆزیی و بەزەیـی و پەرۆشـن، بەرانبـەر بـە خەڵکـی خـوا.

**مەسەلەی سێیەم:**

**سەرنجدانی ئیبراهیم عليه السلام لە ئەستێران و، خۆ بە نەساغ پێشاندانی بە مەبەستی بەجێمان لە پەرستگای گەلەکەیداو، تێکشکاندنی بتەکانیان و، بە توانجەوە قسەکردن لەگەڵ بتەکانداو، وردوخاش کردنییان و، بە خێرایی هاتنیان بۆ لای و، سەرزەنشتکردنی بۆیان کە چۆن شتێك خۆیان دایدەتاشن و دروستی دەکەن دەیپەرستن؟ پیلانگێڕانی گەلەکەی بۆ سووتاندنی و، دەربازکرانی و پووچەڵکرانەوەی پیلانەکەیان:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَنَظَرَ نَظْرَةً فِي النُّجُومِ (٨٨) فَقَالَ إِنِّي سَقِيمٌ (٨٩) فَتَوَلَّوْا عَنْهُ مُدْبِرِينَ (٩٠) فَرَاغَ إِلَىٰ آلِهَتِهِمْ فَقَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ (٩١) مَا لَكُمْ لَا تَنطِقُونَ (٩٢) فَرَاغَ عَلَيْهِمْ ضَرْبًا بِالْيَمِينِ (٩٣) فَأَقْبَلُوا إِلَيْهِ يَزِفُّونَ (٩٤) قَالَ أَتَعْبُدُونَ مَا تَنْحِتُونَ (٩٥) وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ (٩٦) قَالُوا ابْنُوا لَهُ بُنْيَانًا فَأَلْقُوهُ فِي الْجَحِيمِ (٩٧) فَأَرَادُوا بِهِ كَيْدًا فَجَعَلْنَاهُمُ الْأَسْفَلِينَ (٩٨) ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چواردە بڕگەدا:

**١)- ﴿ فَنَظَرَ نَظْرَةً فِي النُّجُومِ ﴾، تەماشای کردو سەرنجێکی دایە ئەستێران.**

**زانایان چەند واتایەمیان بۆ ئەو ڕستەیە لێکداونەوە، بەڵام لە هەموویان باشتر - بەڕای بەندە - دووانن:**

**١- هەندێك لە زانایان گوتوویانە: (نَظَرَ فِي النُّجُومِ، لأَنَّهُم كَانُوا أَهْلَ التَّنْجِيم) بۆ سەرنجی ئەستێرانی داوە، چونکە خەڵکەکە بڕوایان بە ئەستێرە گرتنەوە هەبووەو ئەستێرەگرەوە بوون، یانی: پێیان وابوو جموجۆڵی ئەستێرەکان و هاتن و چوونیان، کاریگەریی ڕاستەوخۆی هەیە لەسەر سەرەنجامی مرۆڤەکان و کاروکردەوەیان، بۆیە ئەویش بە پێی عەقڵی خۆیان دواندوونی، تەماشای ئەستێرانی کردوە، نەیگوتوە ئەوەی ئێوە بڕواتان پێی هەیە، منیش بڕوام وایە، بەڵام ئەوانی وا تێگەیاندوە، وا ئیخفاڵ کردوە کەوابزانن**

و لە دڵی خۆیان دا بڵێن: ڕەنگە ئەویش وەك ئێمە بڕوای بە جموجۆڵی ئەستێرەكان بێ، چونكە جارێ ئیبراهیمیان نەناسیوە داخۆ كێیەو چۆنە؟ ئەویش مەبەستی ئەوە بووە لێی گەڕێن و بەجێی بهێڵن، لە پەرستگاكەیان دا بەتەنێ بمێنێتەوە، ئەوان دیارە بۆنەیەكیان هەبووە، بڕۆن بۆ دەرێ و، ئیبراهیم عليه السلام بە تەنیا بمێنێتەوە، تاكو بتوانێ ئەو بتانە بشكێنێ.

٢- هەندێكی دیكەش گوتوویانە: (تَفَكَّرَ مَلِيّاً فِي الأَمْرِ، بِحَيْثُ يَجِدُ حِيلَةً يَخْلُو بِأَصْنَامِهِمْ كَيْ يَكْسِرَهَا) واتە: ئیبراهیم عليه السلام كە تەماشای ئەستێرانی كردوە، یانی بیری كردۆتەوە، جاری وایە ئینسان كە تەماشای ئاسمان دەكات، یان تەماشای شتێك دەكات و لێی ورد دەبێتەوە، بیر دەكاتەوە، بیری كردۆتەوە زۆر بە جیددیی، كە نەخشەیەك دابنێ چۆن بە تەنیا لەگەڵ ئەو بت و پەیكەرانەدا بمێنێتەوە، تاكو زەفەریان پێ بەرێ و تێكیان بشكێنێ.

ئـەو دوو واتایـە لـە هەمـوو ئەوانـدی دیكـە زیاتـر دەچنـە عەقڵـەوە، ئەگەرنـا زانایـان قسـەی دیكەشـیان لـەو بـارەوە كـردوون.

٢)- ﴿ فَقَالَ إِنِّي سَقِيمٌ ﴾، یەكسەر گوتی: من نەخۆشم، پێشتر گوتمان: وشەی: (سَقَم وسُقْم) بە نەخۆشیی جەستەیی دەگوترێ، (سَقِيم)یش سیفەتی بە كردار چوێنراو (مُشَبَّهَة بِالفِعل)ە، هەروەك (سليم)یش هەروایە، زانایان دەڵێن: ئەمە پاساوێك بووە ئیبراهیم عليه السلام هێناویەتەوە، تاكو لێیگەڕێن، بە تەنیا لەو شوێنە كە پەیكەرو صەنەمەكانی تێدا دانراون، بمێنێتەوە، تاكو بتوانێ تێكیانبشكێنێ و، ئەو خەڵكە بتپەرستە لە خەوی بێئاگایی وەخەبەر بێنێ، كە ئەوانە ئەگەر پەرستراو بوونایە، لای كەم، دەبوو توانیبایان بەرگریی لە خۆیان بكەن.

هەندێـك لـە زانایانیـش وایـان لێكداوەتـەوە كـە گوتوویەتـی: مـن نەخۆشـم واتـە: حاڵـم تـەواو نیـە، بـەو واتایـە كاتێـك ئـەو بـت و صەنەمانـە دەبینـم، سـەرو دڵـم دەگـرن و تێكدەچـم، ئـەوان ڕەنگـە وا حاڵیـی بووبـن كـە نەخۆشـییەكی درمیەتـی و

نەخۆشـیيەکی خراپیەتـی، بـۆ ئـەوەی لێـی نەگرنـەوە، بالێـی دوور بکەونـەوە، بـەڵام ئـەو مەبەسـتی ئـەوە بـووە کـە مـن حاڵـم بـاش نیـە، لەبـەر ئـەوەی ئـەو بـت و صەنەمانـە ئـاوا دەبینـم دەپەرسـترێن، میزاجـم تێکچـووە.

ڕسـتەی: (إِنِّي سـقيم) أ- دەگونجـێ مەبەسـت پێـی ئـەوە بـێ نەخۆشـیيەکی وامگرتـوە، کـە ئـەوان وا حاڵێـی بـن نەخۆشـیيەکی درمیەتـی، ئنجـا بـۆ ئـەوەی لێـی نەگرنـەوە، زوو لێـی دوورکەوتوونـەوە.

ب- دەشـگونجێ ئیبراهیـم ﷵ مەبەسـتی ئـەوە بووبـێ کـە مـن نەخۆشـم و بـە کـردەوەش نەخـۆش و نەسـاغ بووبـێ، لـە ئەنجامـی ئـەو بارودۆخـەدا کـە بینیویەتـی ئـەو بتانـە دەپەرسـترێن لـە جیاتـی خـوا، جـاری وایـە کـە ئینسـان خەفەتێکـی زۆری دەبـێ، بـە کـردەوە میزاجـی تێکدەچـێ و نەخـۆش دەبـێ.

چونکـە لـە فەرمایشـتی پێغەمبـەردا ﷺ هاتـوە، کـە ئیبراهیـم ﷵ سـێ جـار قسـەی وای کـردوە، کـە لـە شـێوەی درۆدابـێ لـە پێنـاوی خـوادا، یەکیـان ئەمەیـە، ئـەوی دیکـە نەوەیـە کاتـێ کـە بتەکانـی تێکشـکاندوون، گوتوویەتـی: گەورەکەیـان وایکـردوە، ئـەوی دیکەشـیان ئـەوە بـووە کـە چـووە بـۆ میسـر، پادشـای میسـر سـارا خانـی بینیـوە، گوتوویەتـی: ئـەوە خوشـکمە واتـە: لـە ڕووی ئیمانییـەوە خوشـکمە، چونکـە هـەر ئـەو دووە ئیمانـدار بـوون، بـە هەرحـاڵ ئەگـەر فەرموودەکـە لـە ڕووی سـەنەدەوە ڕاسـتبێ واتـە: ئیبراهیـم ﷵ سـێ قسـەی کـردوون لـە شـێوەی درۆدان، نەگەرنـا درۆ نەبـوون، ئـەوە پێـی دەگوترێ: دەبەرڕاهاویشـتن، کنـارە (کِنايـة)، بـەڵام ئایـا سـەنەدەکەی چۆنـە؟! لـە بەسـەرهاتی ئیبراهیمـدا ﷵ لـە تەفسـیری سـوورەتی (إبراهیـم)دا، باسـی ئـەو بابەتەشـم کـردوە.

٣)- ﴿ فَتَوَلَّوۡاْ عَنۡهُ مُدۡبِرِينَ ﴾، یەکسەر کە وایگوت، ئەوانیش پشتیان تێکردو، بە پشتتێکردنەوە ڕوویان لێ وەرگێڕا، (أي ذَهَبُوا وَخَلَّفُوهُ وَرَاءَ ظُهُورِهِم بِحَيْثُ لايَنْظُرُونَهُ) ڕۆیشتن و لە پشت خۆیان بەجێیانهێشت، بە جۆرێك کە نەیبینن.

٤)- ﴿ فَرَاغَ إِلَىٰٓ ءَالِهَتِهِمْ ﴾، ئەویش بە پەنهانیی چوو بۆ لای پەرستراوەکانیان، (أي: ذَهَبَ خُفْيَةً)، (رَاغَ: حَادَ وَمَالَ) واتە: بە قۆرت و پێچەوە، بە شێوەیەکی پەنهان چوو بۆ لای پەرستراوەکانیان.

٥)- ﴿ فَقَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ ﴾، گوتی: ئایا ناخۆن؟

٦)- ﴿ مَا لَكُمْ لَا تَنطِقُونَ ﴾، چیتانە بۆچی نادوێن، قسە ناکەن؟

هیچ گومانی تێدانییە کە ئیبراهیم فەرموویەتی: بۆچی ناخۆن، دیارە خواردنێکیان داناوە لە لای پەرستراوەکانیان، کە بە حیساب ئەوانە پەرستراون، بۆ ئەوەی خواردنەکە پیت و پێزی بچێتێ، ئەگەرنا زانیویانە جارێک نەیانخواردو دووجار نەیانخوارد، کەواتە: خواردن ناخۆن، بەڵام ڕەنگە چۆن وەک هەندێک خەڵک دەچن پەڕۆ بە دارو درەختی سەر گۆڕی پیاو چاکێک هەڵدەواسن و، دوایی دەڵێن: بۆتە متفەڕك، یان پەڕۆیەك كە لە قوڕئانی دەپێچن، پێیان وایە بۆتە متفەڕك، كە لە ڕاستییدا ئەوشتانە مادام بەڵگەی شەرعییان لەسەر نەبێ، ڕاست نین و نابێ بکرێن، دیارە ئەوانیش بەو شێوەیە مامەڵەیان لەگەڵ پەرستراوەکانی خۆیاندا کردوە، بۆیە ئیبراهیمیش ﷺ بە گاڵتە پێکردن و بە توانجەوە دەڵێ: ئایا ناخۆن؟ چیتانە نادوێن و قسە ناکەن؟

٧)- ﴿ فَرَاغَ عَلَيْهِمْ ضَرْبًۢا بِٱلْيَمِينِ ﴾، ئنجا بە شێوەیەکی پەنهان، ڕووی تێکردن و بەهێز لێیدان، (ضُمِّنَ رَاغَ مَعْنى أَقْبَلَ) (راغ) مانای (أقبل) ڕووی تێکردی خراوەتە نێو، ڕووی تێکردن و بە دەستی ڕاست لێیدان، (بِالْيَمِينِ):

أ- دەگونجێ مەبەست دەستی ڕاست، بێ، بێگومان تەنیا بە دەست لێی نەداون و، تەورێك، تەشوێیەك، چەکوشێکی پێبووە.

ب- یاخود (بِالْيَمِينِ) مەبەست پێی هێزە، واتە: بەهێز لێیدان.

هەڵبەتە ئەوە لێرەدا قرتێنـدراوە، کە لە سوورەتی (الأنبیاء)دا باس دەکات: کە دێنەوە تەماشا دەکەن پەیکەرەکان وردوخاش کراون، دەپرسن: کێ وای لێ

کـردوون؟ دەڵێـن: گەنجێکـە باسـی دەکـردن نـاوی ئیبراهیـم بـوو، دەڵێـن: ئیبراهیـم بێنـن، ئیبراهیـم دێنـن و گفتوگـۆی لەگەڵـدا دەکـەن، ئـەوە هەمـووی قرتێنـدراوە، لێرەدا یەکسـەر دەفەرمـوێ:

٨)- ﴿ فَأَقْبَلُوٓا۟ إِلَيْهِ يَزِفُّونَ ﴾، بە خێرایی ڕوویان تێکرد، بە خێرایی هاتن، (يَزِفُّون) خوێندراویشەتەوە: (يُزَفُّون أي: يُسْرَعُون)، هەروەها بە: (يُزِفُّون)یش خوێندراوەتەوە، (زَفَّ يَزِفُّ، وَأَزَفَّ يُزِفُّ) هەم بە سێ پیتیی، هەم بە چوار پیتیی، واتە: بە خێرایی دەهاتن. (يَزِفُّون ويُزِفُّون): بەخێرایی دەهاتن، (يُزَفُّون) بەخێرایی دەهێنران.

٩)- ﴿ قَالَ أَتَعْبُدُونَ مَا تَنْحِتُونَ ﴾، [بە سەرزەنشتکردنەوە] پێی گوتن: ئایا شتێك دەپەرستن کە خۆتان دایدەتاشن؟ (النَّحْتُ: بَرِي العُودِ لِيَصِيرَ عَلَى شَكلٍ يُرَاد)، (نَحْت): بریتیە لە دارێك [یان بەردێك] کە بتاشرێ تاکو بە شێوەیەك بێ کە دەویسترێ واتە: تەشوێکاریی.

دیـارە پرسـیار کردنەکـەی کـە دەفەرمـوێ: ﴿ أَتَعْبُدُونَ مَا تَنْحِتُونَ ﴾، پرسـیار لێکردنـی نکوولّیلێکردنە.

١٠)- ﴿ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ﴾، لە حاڵێك دا خوا خۆتان و ئەوەش کە دەیکەن، دروستیکردوون، (و)ی (وَاللهُ) (واو الحالية)یە، لە حاڵێکدا کە خوا ئێوەش و ئەوەش کە ئەنجامی دەدەن دروستیدەکەن لە پەیکەرەکان، خۆتان و پەیکەرەکانیش خوا دروستیکردوون، (أي: وَمَا تَعْمَلُونَها أي: تَصْنَعُون وَالْمَقْصُودُ خَلْقُ اللهِ مَادَّتُهُ) مەبەست ئەوەیە کە ماددەکەو کەرەستەکەی خوا خوڵقاندوویەتی، بەڵام ئەوە کە (ما) لێرەدا چاوگیی (مصدرية) بێ و، بە بەڵگە بهێنرێتەوە لەسەر ئەوە کە کردەوەکانی مرۆڤەکان دروستکراوی خوان، وەك جەبرییەکان و ئەشعەرییەکان وایانگوتوە! لە ڕاستییدا قورئان زۆر لەوە بەرزترە کە بە پێی قسەی موعتەزیلەو ئەشاعیرەو، ماتوردییەو جەبرییە، تەفسیر بکرێ، ئەو قوتابخانەو ڕەوتانە دوایی پەیدا بوون، وەك لە مەوسووعەی: (بیرکردنەوەی ئیسلامیی لە نێوان وەحیی و واقیعدا) لە کتێبی سێیەمدا: [تەوژمە فیکرییەکانی مێژووی مسوڵمانان] بە درێژیی ڕوونم کردۆتەوەو باسم کردوە، کە ئەو ڕەوت و قوتابخانە

فیکرییانە دوایی پەیدا بوون، بۆیە بە بەڵگە هێنانەوەی ئەم ئایەتە، لەسەر ئەوەی کە خوا کردوەکانی مرۆڤان دەخوڵقێنێ، وەك جەبرییەکان و دوایی ئەشعەرییەکانیش گوتوویانە، هیچ بنەمایەکی نیەو، لێرەش دا مەبەست ئەوە نیە کە خوا کردەوەکانتان دەخوڵقێنێ، بەڵکو وەك (الطبري) پێشەوای توێژەرەوانی قورئان گوتوویەتی: (أي: وَاللهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَهُ أي: وَمَا تَصْنَعُونَهُ) خوا دروستیکردوون و ئەوەی دروستیشی دەکەن، ئەویش هەر دروستکراوی خوایە.

١١)- ﴿ قَالُوا۟ ٱبْنُوا۟ لَهُۥ بُنْيَـٰنًا ﴾، گوتیان: بینایەکی بۆ دروستبکەن، واتە: خانووێکی بۆ دروستبکەن و پڕی بکەن لە ئاگرو، دوایی ئاگری تێبەردەن و دایگیرسێنن، بەبەڵگەی ڕستەی دوایی (فَأَلْقُوهُ فِى ٱلْجَحِيمِ).

١٢)- ﴿ فَأَلْقُوهُ فِى ٱلْجَحِيمِ ﴾، فڕێدەنە نێو بڵێسەی ئاگرەکە، یانی: ئەو بینایە پڕ بکەن لە ئاگرو با بڵێسەی بەرز بێتەوە، ئنجا ئیبراهیم فڕێدەنە نێو بڵێسەی ئاگرەکە، بێگومان ئیبراهیم ﷺ بە مەنجەنیق فڕێدراوەتە نێو ئەو ئاگرە زەبەلاح و بەرزە، چونکە هەر نیزیکی بوونایە، خۆشیانی دەسووتاند، نەك هەر ئیبراهیم ﷺ.

(جحیم)یش بریتیە لە ئاگرێك زۆر چاك داگیرسابێ، (الزجاج) گوتوویەتی: (كُلُّ نَارٍ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ فَهِيَ جَحِيم)[1] هەر ئاگرێك کە لەسەر یەك کەڵەکە بێ، ئەوە پێی دەگوترێ: (جَحيم)، (أل)ی (الجحيم)یش قەرەبووی پاڵوەلادراو (مضاف إليه)، واتە: فڕێدەنە نێو ئاگری بڵێسەداری ئەو خانووەوە، کە داروبارتان زۆر تێدا کۆکردۆتەوە.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی ئێمە لەو کەسانە بگێڕێ، کە وەك چۆن پشتی ئیبراهیمی گرت، ئێمەش لەو کەسانە بگێڕێ کە پشتمان بگرێ لە بەرانبەر نەیارانمان و، لە تەنگانەو مەینەتییەکانداو، خوا بەبەزەیی خۆی دەربازمان بکات و ڕزگارمان بکات، وەك چۆن ئیبراهیمی لە ئاگری سووردا پاراست و دەربازی کرد.

---

(١) فتح القدير للشوكاني: ج٤، ص٤٨٦.

١٣)- ﴿ فَأَرَادُوا۟ بِهِۦ كَيْدًا ﴾، ئنجا ئەوان پیلانیان لە دژ گێڕا.

١٤)- ﴿ فَجَعَلْنَـٰهُمُ ٱلْأَسْفَلِينَ ﴾، ئێمەش ئەوانمان خستە بنەوە، لە سوورەتی (الأنبياء)دا دەفەرموێ: ﴿ وَأَرَادُوا۟ بِهِۦ كَيْدًا فَجَعَلْنَـٰهُمُ ٱلْأَخْسَرِينَ ﴿٧٠﴾ ﴾الأنبياء، فێڵ و پیلانیان بۆی ویست ئێمەش ئەوانمان کردە زیانبارترین، کەسێك لە بنەوە بێ، مانای ئەوەیە زیانی کردووە، کەسێك زیانبار بێ، مانای وایە ژێر کەوتوە.

**مەسەلەی چوارەم وکۆتایی:**

**کۆچکردنی ئیبراهیم ﷺ بەرەو خواو، پاڕانەوەو داواکردنی لە خواو، پێبەخشرانی کوڕێکی هێدیی و مەندو، لە خەوندا دیتنی سەربڕینی و، ئامادەیی دەربڕینی کوڕەکەی و تەسلیم بوونیان و پاڵخستنی و، بەرانێکی مەزن کردنە بەلاگێڕو قەرەبووی و، سەلام لێکردنی خواو مەدحکردنی و، دواتر مژدەی ئیسحاق پێدرانی کە پێغەمبەرێک بێ لە چاکان و، ستایشکرانی لە لایەن خواوەو، چاکەکارو ستەمکار پەیدابوون لە نێو وەچەکەیدا:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ إِنِّي ذَاهِبٌ إِلَىٰ رَبِّي سَيَهْدِينِ (٩٩) رَبِّ هَبْ لِي مِنَ الصَّالِحِينَ (١٠٠) فَبَشَّرْنَاهُ بِغُلَامٍ حَلِيمٍ (١٠١) فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ السَّعْيَ قَالَ يَا بُنَيَّ إِنِّي أَرَىٰ فِي الْمَنَامِ أَنِّي أَذْبَحُكَ فَانظُرْ مَاذَا تَرَىٰ ۚ قَالَ يَا أَبَتِ افْعَلْ مَا تُؤْمَرُ ۖ سَتَجِدُنِي إِن شَاءَ اللَّهُ مِنَ الصَّابِرِينَ (١٠٢) فَلَمَّا أَسْلَمَا وَتَلَّهُ لِلْجَبِينِ (١٠٣) وَنَادَيْنَاهُ أَن يَا إِبْرَاهِيمُ (١٠٤) قَدْ صَدَّقْتَ الرُّؤْيَا ۚ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ (١٠٥) إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ الْبَلَاءُ الْمُبِينُ (١٠٦) وَفَدَيْنَاهُ بِذِبْحٍ عَظِيمٍ (١٠٧) وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي الْآخِرِينَ (١٠٨) سَلَامٌ عَلَىٰ إِبْرَاهِيمَ (١٠٩) كَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ (١١٠) إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُؤْمِنِينَ (١١١) وَبَشَّرْنَاهُ بِإِسْحَاقَ نَبِيًّا مِّنَ الصَّالِحِينَ (١١٢) وَبَارَكْنَا عَلَيْهِ وَعَلَىٰ إِسْحَاقَ ۚ وَمِن ذُرِّيَّتِهِمَا مُحْسِنٌ وَظَالِمٌ لِّنَفْسِهِ مُبِينٌ (١١٣)﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە بیست (٢٠) بڕگەدا:

١)- ﴿وَقَالَ إِنِّي ذَاهِبٌ إِلَىٰ رَبِّي سَيَهْدِينِ﴾، [بە پێی سیاق دەزانین کە قسە هەر لەسەر ئیبراهیمە ﷺ] [ئیبراهیم] فەرمووی: من بەرەو پەروەردگارم دەڕۆم و، بە دڵنیایی ڕێنماییم دەکات.

**مەبەست لە ڕێنمایی لێرەدا:**

أ- دەگونجێ ڕێنمایی مەعنەویی بێ واتە: ڕێی بەندایەتیی خۆیم پێشان دەدات، پێشانم دەدات چۆن بەندایەتیی بۆ بکەم، بەرنامەم بۆ دەنێرێ، پەیامم بۆ دەنێرێ، ئیبراهیم نەك هەر گومانی چاك بەڵکو یەقینی چاکی هەبووە بە پەروەردگاری، پەروەردگاریش بەو شێوەیە کە بەندە لێی چاوەڕێ دەکات، مامەڵەی لەگەڵدا دەکات.

ب- دەشگونجێ (سَيَهْدِينِ) لێرەدا ڕێنماییم دەکات، یانی: بەرەو ئەو شوێنەی ئامانجمە، ئەو شوێنەی تێیدا ئازادبم و، جارێکی دیکە ئەمخەنە مەنجەنیقەوەو فڕێمنەدەنە نێو ئاگری سوورەوە، لەبەر ئەوەی دژی بتپەرستیی و هاوبەش بۆ خوا دانانم، هەردوو واتایەکە دەگونجێن.

هەڵبەتـە کـە دەفەرمـوێ: ﴿ إِنِّي ذَاهِبٌ إِلَىٰ رَبِّي ﴾، مەبەسـت ئەوەیـە: مـن بـەرەو ڕەزامەندیـی خـوا دەڕۆم، یـان بـەرەو ئـەو شـوێنەی دەمـەوێ ئەرکـی بەندایەتیـی بەرانبـەر بـە پـەروەردگارم تێـدا جێبەجـێ بکـەم، ئنجـا لـە عێراقـەوە دەچـێ بـۆ شـام، وەك کتێبەکانـی مێـژوو دەڵێـن[1]، لـە ئـووری کلدانیـی دەچـێ بـۆ شـام بـۆ ناوچـەی حـەڕان، دواتریـش لووطـی برازاشـی لەگەڵیـدا دەبـێ، دوایـی شـۆڕ دەبێتـەوە بـەرەو ناوچەکانـی شـام و فەڵەسـتین واتـە: سـووریای ئێسـتاو فەڵەسـتین و ئـوردون و لوبنان، لـە (پەیمانـی کـۆن)دا بـە تەفصیـڵ باسـکراوە، ئێمـەش کاتـی خـۆی لـە سـوورەتی (إبراهیـم)دا، بـە درێژیـی باسـی بەسـەرهاتی ئیبراهیمـمان کـردوە ﷺ.

٢)- ﴿ رَبِّ هَبْ لِي مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾ (گوتی:) پەروەردگارم! لە چاکانم پێببەخشە، لە کوڕانی چاکم پێ ببەخشە، واتە: منداڵ و کوڕێکی چاك لە چاکان، هێندە چاك بێ، چووبێتە نێو جەرگەی چاکانەوە.

٣)- ﴿ فَبَشَّرْنَٰهُ بِغُلَٰمٍ حَلِيمٍ ﴾، ئێمەش موژدەمان پێدا بە کوڕێکی هێدیی و مەند، پێشتریش باسمان کرد کە (غُلام) گەنجێکە سمێڵی بۆر بووبن، باڵغ بووبێ و نەبووبێ، لەو نێوانە دابێ، بێگومان ئەو کوڕەی کە خوا موژدەی بە ئیبراهیم ﷺ داوە پەیدایان

---

(١) مفصل تأريخ العرب واليهود: أحمد سوسة، ص ٥٠٥ ، ٥٠٦.

ببێ، لە هاجەرە خان، وا پێدەچێ مەبەست پێی ئیسماعیل ﷺ بێ، کە لە هاجەرە پەیدابووە، ئەو ڕایە بەهێزترە، ئنجا بێگومان یەکسەر کە بووە، نەوجەوان (غُلام) نەبووەو نەیگەیشتۆتە تەمەنێ سمێڵی بۆر بووبێ، یاخود خەتی سمێڵانی دابێ، بەڵکو گچکە بووە، بەڵام ئەوە موژدەیە، واتە: موژدەی پێ دەدەین کە کوڕێکیان ببێ، ئەو کوڕە بگاتە تەمەنی گەنجیەتییش، بەڵام بۆیە نەگوتراوە دەگاتە تەمەنی هەڵکشیوتر، چونکە خوا ﷻ دوایی فەرمانی پێ دەکات کە سەری ببڕێ، ئنجا ئەگەر پێی فەرمووبایە: ئەو کوڕەت گەورە دەبێ و، دەبێتە پیاوو ژن و ماڵیشی دەبێ، مانای وایە ئیبراهیم ﷺ دەیزانی ئەو فەرمانەی خوا پێی دەکات لە خەوندا، کە سەری بڕێ، هەر بۆ تاقیکردنەوەیە، بۆیە تەنیا فەرموویەتی: تاکو ئەو کاتەی خەتی سمێڵان دەدات، یاخود دەبێتە وەرگێڕکە، تاکو ئەو تەمەنە دێ.

(غُـلام) کوڕیژگـە کەسـێکە بووبێتـە وەرگێڕکـەو گەیشـتبێتە تەمەنێـك، بتوانـێ یارمەتیـی بابـی بـدات، وەك دوایـی خـوای پـەروەردگار بـاس دەکات: ﴿ فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ ٱلسَّعْىَ ﴾.

(الحِلمُ: ضَبْطُ النَّفْسِ)، (حِلم): بریتیـە لـەوە کـە ئینسـان خـۆی مـەرزەم بـکات، (الحَليمُ: الضَّابِطُ لِنَفْسِهِ، الرَّزِينُ الهَادِئُ)، (حلیم) کەسـێکە کـە خـۆ مەلزەمکـەر بـێ، هێدیـی و مەنـدو، قـورس و بـە ویقـار بـێ.

٤)- ﴿ فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ ٱلسَّعْىَ ﴾، کاتێك لەگەڵیدا گەیشتە ئەندازەی کارکردن، کۆششکردن، شارەزایان گوتوویانە: (فِي الكَلامِ حَذْفٌ تُشْعِرُ بِهِ الفَاءُ الفَصِيحَةُ: فَوَهَبْنَا لَهُ الغُلَامَ، فَنَشَأَ وَبَلَغَ الحَدَّ الَّذِي يَسْعى فِيهِ مَعَهُ)، کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ ٱلسَّعْىَ ﴾، ئەم (ف)ە (فاء الفصيحة)یە یانی: فائی ڕوونکەرەوە، دەلالەت لەسەر شتێك دەکات کە قرتێندراوە، بەڵام بە سیاق و سەلیقە دەزاندرێ، ئەویش بەمجۆرەیە: کوڕەکەمان پێ بەخشی و پێگەیشت، گەیشتە ئەو ئەندازەیەی کە لەگەڵ بابیدا ئیش و کار بکات، ﴿ فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ ٱلسَّعْىَ ﴾، (أَي بَلَغَ سَعْيُهُ سَعْيَ إِبْرَاهِم)، کۆششکردنی ویش گەیشتە کۆششکردنی ئیبراهیم ﷺ

واتە: گەیشتە ئەندازەیەك كە بتوانێ لەگەڵ بابیدا كار بكات و هاوكاری بێ، بە كوردیی پێی دەگوترێ: وەرگێڕكە، واتە: كوڕێك كە یارمەتیی بابی دەدات، هەروەها بە كچیش دەگوترێ، كچێك كە یارمەتیی دایكی دەدات بۆ كابانێتیی لە ماڵێدا.

ئنجا كاتێك گەیشتە ئەو تەمەنە:

٥)- ﴿قَالَ يَٰبُنَيَّ إِنِّيٓ أَرَىٰ فِي ٱلۡمَنَامِ أَنِّيٓ أَذۡبَحُكَ﴾، گوتی: ئەی ڕۆڵە گیان! بە دڵنیایی من لە خەودا بینیم كە تۆم سەردەبڕی، واتە: خەوتم، لە خەودا خەونم بینی، لە خەونەكەمدا تۆم سەردەبڕی.

٦)- ﴿فَٱنظُرۡ مَاذَا تَرَىٰ﴾، ئنجا سەرنج بدە! بزانە ڕات چییە؟ (مَاذَا تَرَى) خوێندراویشەتەوە: (مَاذَا تُرِي) واتە: چیم پێشان دەدەی، بۆچوونت چۆنە؟

دیارە ئیبراهیم ﷺ كە لە خەونـدا ئـەو كـوڕەی خـۆی سـەر بڕیـوە، بـە فەرمانێكی پابەندكەری زانیوە لە لایەن خواوە، ئنجا ئایا هەر كەسێك خەونێكی بینی، دەبێ پێی وابێ كە فەرمانێكی پابەندكەرەو ئەركێكی شەرعییەو دەبێ جێبەجێی بكات؟ بێگومان نەخێر! بەڵام ئەوە بە نسبەت پێغەمبەرانەوە (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ)، وایە: {رُؤْيـا الأَنبياءِ وَحـيٌ} (أخرجه البخاري: ١٣٨)، واتە: خەونی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ)، بەشێكە لە وەحیی.

ئنجا دوای ئەوەی ئیبراهیم ﷺ دەڵێ: ڕۆڵە! من خەوتم و لە خەونمدا دیتم كە تۆم سەردەبڕی، ئنجا ڕای خۆتم پێ بڵێ، بزانە چی دەڵێی، یان بزانە چیم پێشان دەدەی؟!

ئیسماعیل وەڵام دەداتەوە:

٧)- ﴿قَالَ يَٰٓأَبَتِ ٱفۡعَلۡ مَا تُؤۡمَرُ﴾، گوتی: ئەی بابە (گیان)! ئەوەی فەرمانت پێ دەكرێ، ئەنجامی بدە، (مَا تُؤْمَر)، (مَا مَوْصُولَةٌ) یانی: (الَّذِي تُؤْمَرُ بِهِ) ئەوەی تۆ فەرمانت پێ دەكرێ، ئەنجامی بدە، دەشكونجێ (مَا مَصْدَرِيَّة) بێ یانی: ئەوە ئەنجام بدە كە فەرمانت پێكراوە، فەرمان پێكراوەكەت ئەنجام بدە، (اِفْعَلِ الْمَأْمُورَ بِهِ).

ئایا بۆچی ئەو کوڕە صاڵحەکە - کە وەك دوایی باسی دەکەین ئیسماعیلە ﷺ و ڕای بەهێزتر بەڵکو ڕای بەڵگەدار هەر ئەوەیە - بۆچی نەیفەرموە: (إِذْبَحْنِي) بۆچی گوتوویەتی: ئەوەی فەرمانت پێکراوە، یان فەرمان پێکراوەکەت ئەنجام بدە؟

وەڵام: بۆ ئەوەی دوو شتان پێکەوە کۆبکاتەوە:

١- مۆڵەتی بدات کە سەری بڕێ.

٢- هۆکاری ئەنجامدانی کارەکەشی بخاتەڕوو، کە بریتیە لەوەی فەرمانی خوایە.

ئەگەر گوتبای: بابە سەرم ببڕە، بەس ئەوەی دەگەیاند کە مۆڵەتی داوەو تەسلیم بووە بە فەرمانی خوا، بەلام کە دەڵێ: (إِفْعَلْ مَا تُؤْمَر) ئەوەی کە فەرمانت پێدەکرێ ئەنجامی بدە، واتە: لەبەر ئەوەی ئەرکێکی شەرعییەو، فەرمانێکی خواییە، تۆ فەرمانی خوا جێبەجێ بکە.

٨)- ﴿ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴾، ئەگەر خوا بیەوێ، لە خۆڕاگرانم دەبینی، منت لێ هەڵدەکەوێ، منت دەکەوێتە بەرچاو، کە لە خۆڕاگران دەبم.

٩)- ﴿ فَلَمَّآ أَسْلَمَا وَتَلَّهُۥ لِلْجَبِينِ ﴾، ئنجا کاتێك هەردووکیان بۆ خوا ملکەچ بوون و بەسەر لاتەنیشتی سەریداخستی، ئیبراهیم ﷺ کە دەستی بچێتە جگەرگۆشەی خۆی و، ئیسماعیل ﷺ کە ئامادەبێ ملی بخاتە بەر چەقۆی بابی.

(فَلَمَّا أَسْلَمَا) خوێندراویشەتەوە: (فَلَمَّا سَلَّمَا) واتە: فەرمانی خوایان سەلماند، بەلام (أَسْلَمَا) واتە: ملکەچ بوون بۆ فەرمانی خوا.

(وَتَلَّهُ) دەڵێ: (التَّلُّ: الصَّرْعُ وَالدَّفْعُ) (تل) بریتیە لە خستن و پاڵخستن و پاڵپێوەنان، دەگوترێ: (تَلَلْتُ الرَّجُلَ: أَضْجَعْتُهُ عَلى جَبِينِهِ عَلَى الأَرْض) پیاوەکەم لەسەر لاجاینگی، لەسەر لاتەنیشتی سەری، خستە سەر زەوی، (وَتَلَلْتُ الرَّجُلَ: أَلْقَيْتُهُ) پیاوەکەم خست: کەواندم.

١٠)- ﴿ وَنَٰدَيۡنَٰهُ أَن يَٰٓإِبۡرَٰهِيمُ قَدۡ صَدَّقۡتَ ٱلرُّءۡيَآۚ ﴾، بانگمان کرد: ئەی ئیبراهیم! بێگومان خەونەکەت بەڕاست دانا، (أل)ی (الرُّؤیا) بۆ ناساندنەو ناساندنی (عهد) واتە: خەونەکەت ئەوەی بینیبووت، بەڕاستت دانا، یانی: جێبەجێت کرد (أي: عَزَمْتَ عَلَى الإِتْيانِ بِمَا رَأَيْتَهُ فِي المَنَام) ئەوەی لە خەودا بینیوتە، دڵت لەسەر چەسپاند کە جێبەجێی بکەی، تۆ لە تاقیکردنەوەی خوا دەرچووی، هەم تۆ، هەم کوڕەکەت، کە فەرمانی خواتان هێنایە سەر جێبەجێ کردن، تەنیا ئەنجامدانی کارەکە مابوو.

١١)- ﴿ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾، ئێمە بەو شێوەیە پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە، واتە: لە سەختیی و ناڕەحەتییان دەربازیان دەکەین.

جارێ پێش ئەوەی خوا ﷻ باس بکات کە بەرانێکی مەزنی کردۆتە بەلاگێڕی ئەو کوڕە، خوا عزَّ وجل ئەوە ڕادەگەیەنێ کە ئەوە تەنیا بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل (عَلَيْهِمَا الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) نیە، کە لە سۆنگەی ئەوەی چاکەکار بوون، لە فریایان هاتووەو دەربازی کردوون، بەڵکو بۆ هەموو کەسی دیکەش، ئەوە یاسای خوایە، هەر کەسێك چاکەکار بێ، خوا پاداشتی دەداتەوە:

١- بە دەربازکردن لە ناڕەحەتیی.

٢- پاداشتی دەداتەوە بەوە کە ملکەچ بێ بۆ فەرمانی خوا، چونکە فەرمانبەریی بۆ خوا، لە خودی خۆیدا چاکەو پاداشتی خوایە!

هەرچەندە ڕوونکەرەوانی قورئان، زیاتر ئەو مانایەیان لێگرتووە (نَجْزِي المُحْسِنِين) واتە: دەربازیان دەکەین، بۆ وێنە گوتوویانە: (نَجْزِيهِمْ بِالْخَلاصِ مِنَ الشَّدَائِد) پاداشتیان دەدەینەوە بەوە کە لە سەغڵەتییان دەربازیان بکەین، بەڵام من پێموایە ئەو واتایەش هەڵدەگرێ، کە: ئاوا پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە کە ملکەچ و فەرمانبەر بن بۆ فەرمانی خوا، با لەسەر دڵیشیان قورس بێ، بەڵام مادام لە خواوەیە، هەر چی لە دۆستەوە بێ، شیرینەو خۆشەویستە.

١٢)- ﴿ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْبَلَٰٓؤُاْ ٱلْمُبِينُ ﴾، بێگومان ئەمە تاقیکردنەوەیەکی ڕوونە، (بَلاء) بە مانای تاقیکردنەوە دێ، هەروەها بە مانای نیعمەتیش دێ.

ئەو ڕووداوەش دیوێکی بەڵاو تاقیکردنەوە بووەو، دیوێکیشی چاکەو نیعمەت بووە:

أ- ئەو دیوەی کە: ئەی ئیبراهیم! دەبێ ئەو تاقە جگەرگۆشەیەی خۆت سەربڕی! بە تەئکید بەڵاو تاقیکردنەوە بووە، تاقیکردنەوەیەکی سەختیش بووە.

ب- دیوەکەی دیکەشی کە دەرباز کراوەو قوربانییەك، سەربڕاوێك کراوەتە فەرەبووی، بە تەئکید ئەوەش نیعمەت و چاکەیەك بووە، بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْبَلَٰٓؤُاْ ٱلْمُبِينُ ﴾، ئەگەر فەرمووبای: (لَهُوَ الإِخْتِبارُ الْمُبِين) یان (الإِمتِحانُ الْمُبِين) ئەوە بەس یەك واتای دەگەیاند، یان ئەگەر فەرمووبای: (إِنَّ هَذَا لَهِيَ النِّعْمَةُ الْمُبِينة) ئەو کاتە بەس یەك واتای دەگەیاند، بەڵام کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْبَلَٰٓؤُاْ ٱلْمُبِينُ ﴾، (بَلَاء): هەم بە مانای تاقیکردنەوەو گرفتاریی دێ، هەم بە مانای خۆشیی و نیعمەتیش دێ، ئەو مەسەلەیەش دیوێکی گرفتاریی و ناڕەحەتیی بووە، دیوێکیشی خۆشیی و نیعمەت بووە.

١٣)- ﴿ وَفَدَيْنَٰهُ بِذِبْحٍ عَظِيمٍ ﴾، کردیشمانە بەلاگێڕو فەرەبووی، سەربڕاوێکی مەزن، (عَظِيم: كَبِيرُ الْجُثَّة، أَوْ عَظِيمُ الْقَدْر)، کە دەفەرموێ: سەربڕاوێکی مەزن، دەگونجێ لە ڕووی قەبارەوە زۆر تێرو تەواو و گەورە بووبێ، یاخود لە ڕووی مەعنەوییەوە، مادام بۆتە بەلاگێڕەوەی ئیسماعیل عليه السلام دیارە ئەو بەرانە، بەرانێکی خاوەن پێگەو بە قەدر بووە، چونکە ئەرکێکی زۆر گەورەی پێ ئەنجامدراوە.

وشەی (ذِبْح) بە مانای (مَذبوح)ە، (وَجمعُهُ ذُبُوح، كَالطِّحْنِ اسْمٌ لِلْمَطْحُون)، (ذِبْح) بە مانای (مَذبوح)ە، سەربڕاو، یانی: ئەوەی دەویسترێ سەربڕێ، کە بە (ذُبُوح) کۆدەکرێتەوە، وەك (طِحْن) واتە: هاڕین، کە ناوە بۆ (مَطْحُون) هاڕدراو.

هەڵبەتە زۆربەی زانایان دەڵێن: ئەو سەربڕاوە بەرانێك بووە، بەڵام ئایەتەکە ئەوە بە ڕوون و ڕاشکاویی ناڵێ، دیارە ئەگەر لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ

هاتبێ، یان لە ڕێیەکی متمانە پێکراوەوە پێمان گەیبێ، ئەوە شتەکە یەکلایی دەکاتەوە، ئەگەرنا هەر دەتوانین بڵێین: بە گومانێکی زاڵ، دەگونجێ بەرانێک بووبێ، ئەگەر نا دەشگونجێ ئاژەڵێکی دیکە بووبێ.

١٤)- ﴿ وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي الْآخِرِينَ ﴾، لە نێو ئەوانی دیکەدا لەسەریمان بەجێهێشت، بۆیمان بڵاو کردەوە، ستایشکران و ناوبانگی باش، (تَرَكْنَا عَلَيْهِ: الثَّناءَ الْحَسَنَ وَالذِّكْرَ الْجَمِيلَ) واتە: ناوبانگی چاك و باس و خواسی باش و، مەدح و ستایش لە لایەنی خەڵکەوە بۆ ئیبراهیممان بڵاو کردەوە.

یاخود: ﴿ وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي الْآخِرِينَ ﴿١٠٨﴾ سَلَامٌ عَلَىٰ إِبْرَاهِيمَ ﴾، ئەم ﴿ سَلَامٌ عَلَىٰ إِبْرَاهِيمَ ﴾، (في محل النصب) دەبێتە بەرکار (مفعول بە) بۆ (ترکنا) واتە: لە نێو ئەوانی دیکەدا بڵاومان کردەوە: سەلام لەسەر ئیبراهیم.

١٥)- ﴿ سَلَامٌ عَلَىٰ إِبْرَاهِيمَ ﴾، سەلامیش لەسەر ئیبراهیم بێ، وێڕای ئەوەی کە ناوبانگی چاکیشی بۆ بڵاوکراوەتەوە، لە نێو خەڵکدا.

ئەمە وا ڕاستترە ڕستەیەکی دەستپێکەر (جملة إبتدالیة) بێ، هەر چەندە دەشگونجێ لە شوێنی (نصب)دا بێ و، بەرکاری (ترکنا علیە) بێ.

١٦)- ﴿ كَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ ﴾، ئا بەو شێوەیە پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە، ئەوەی پێشێ کە فەرمووی: ﴿ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ ﴾، بۆیە بە (إنَّ) جەختی لەسەر کراوەتەوە، چونکە بۆ دەربازکرانی ئیسماعیل ﷺ بوو لە سەربڕان و، ئیبراهیمیش ﷺ لەوەی جگەر گۆشەی خۆی سەرببڕێ، هەروەها هاجەر (خوا لێی ڕازی بێ) کە تاقە جگەر گۆشەکەی سەرببڕدرێ، بۆیە بە (إنَّ) تەئکید کراوەتەوە، بەڵام ئەمەیان بۆ ئەوەیە کە ناوبانگی باشمان بۆ بڵاو کردەوەو سەلاممان لێ کرد، سەلامی خواش ﷻ، هێنانەدی نێوەڕۆکی سەلامە بۆ ئیبراهیم ﷺ کە ئاشتیی و سەلامەتیی و خێرو خۆشییە، لێرەدا پێویستیی بە تەئکید کردنەوە نەکردوە، بۆیە دەفەرموێ: ئا بەو شێوەیە پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە، واتە: خەڵکی دیکەش کە وەك ئیبراهیم بکەن، ئەوانیش

لە قەدەر خۆیان خوا سەلامیان لێ دەكات و، لە قەدەر خۆیان ناوو ناوبانگی چاكیان بڵاو دەكاتەوە.

زانایـان ئاوایـان لێكداوەتـەوە: (**أي مِثْـلَ هَـذَا الْجَـزَاءِ الْعَظِيـم، نَجْـزِي مَـنِ انْقَـادَ لأَمْـرِ اللـه**) وێنـەی ئـەو پاداشـتە مەزنـە، پاداشـتی هـەر كەسێك دەبـێ، كـە ملكـەچ بـێ بـۆ فەرمانـی خـوا، بـە گشـتیی چاكـەكار بـێ، هـەم لـە بەندایەتیـی كردنـی دا بـۆ خـوا، چاكـەكار بـێ، هـەم لـە مامەڵـە كردنـی لەگـەڵ بەندەكانـی خـوادا، چاكـەكار بـێ.

١٧)- ﴿ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، بە دڵنیایی ئیبراهیم لە بەندە بروادارەكانمان بوو، واتە: لەو بەندانە بوو كە بەڕاستیی بەندایەتیی بۆ خوا دەكردو بەڕاستیش بڕوادار بوو، نەیفەرمووە: (**إِنَّهُ كان عَبْداً مُؤْمِناً**)! چونكە تەعبیرەكەی قورئان، یانی: هێندە بەندایەتیی چاك بۆ خوا دەكردو، هێندە ئیمان و بڕوای باشی هەبوو، چووبووە نێو جەرگەی بەندە بۆ خوا صوڵحاوەكان و، بەندە بڕوادارەكانەوە.

١٨)- ﴿ وَبَشَّرْنَٰهُ بِإِسْحَٰقَ نَبِيًّا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾، موژدەشمان پێدا، بە ئیسحاق (ئیسحاقیان دەبێ) كە پێغەمبەرێك بێ لە چاكان، (**أي بَشَّرْنا إبْرَاهِيمَ بِوَلَدٍ يُولَدُ لَهُ، وَيَصِيرُ نَبِيّاً، بَعْدَ أَنْ يَبْلُغَ سِنَّ الَّتِي يَتَأَهَّبُ فيها لِذَلِك**) واتە: موژدەمان بە ئیبراهیمدا كە كوڕێك دەبێ، دواییش دەبێتە پێغەمبەر، دوای ئەوەی دەگاتە ئەو تەمەنەی كە تێیدا ئامادە دەبێ بۆ وەرگرتنی پلەی پێغەمبەرایەتیی.

ئەگەرنـا هـەر بـە منداڵیـی پێغەمبـەر نەبـووە، بـەڵام خـوا ﷻ وەك زۆرجـاران گوتوومانـە: فەرمایشـتی خـۆی زۆر كـورت و پوخـت كردۆتـەوە، لەوپـەڕی كورتیـی و پوختییـدا، هیـچ وشـەیەك و هیـچ پیتێكـی زیادیشـی تێدانیـە.

ئنجـا وەك چـۆن ئـەوەی پێشـێ خـوا فەرمـووی: ﴿ فَبَشَّرْنَٰهُ بِغُلَٰمٍ حَلِيمٍ ﴾، لێـرەش دا دەفەرمـوێ: ﴿ وَبَشَّرْنَٰهُ بِإِسْحَٰقَ نَبِيًّا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾، وەك دوایـی زیاتـر باسـی دەكەیـن، كەواتـە: ئەوانـە دوو مـوژدەن و، نابـێ ئـەو دوو موژدەیـە هەردووكیـان بـۆ ئیسـحاق بـن، چونكـە ڕاجیاییـەك هەیـە لـە نێـوان زانایـان دا، كـە ئایـا ئـەوەی

ویستراوە سەرببڕدرێ، ئیسماعیل بووە، یان ئیسحاق بووە؟ بەڵام وەك دواییش باسی دەکەین، زۆر ڕوونە کە ئەوەی هێنراوەتە سەر سەربڕان، ئیسماعیل بووە، بەبەڵگەی زۆر، کە یەکیان ئەم دوو ئایەتەن: هی یەکەمیان: ﴿ فَبَشَّرْنَٰهُ بِغُلَٰمٍ حَلِيمٍ ﴾، موژدەمان پێدا بە کوڕێکی هێدیی و مەند، لێرەش دەفەرموێ: ﴿ وَبَشَّرْنَٰهُ بِإِسْحَٰقَ نَبِيًّا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾، موژدەمان پێدا بە ئیسحاق، کە پێغەمبەرێك دەبێ لە صاڵحان، ئنجا ئەوەی یەکەم، دەبێ جیا بێ لە هی دووەم، لێرە دوای ئەوەی ڕووداوی هێنانە سەر سەربڕانی ئیسماعیل ﷺ تێپەڕیوەو، خوا ﷻ ئاژەڵێکی مەزنی کردۆتە قەرەبوو و بەڵاگێڕی، ئنجا دوایی دەفەرموێ: موژدەشمان پێدا بەوە کە ئیسحاقیان دەبێ، وەك پێغەمبەرێك لە چاکان.

لێرە کە دەفەرموێ: ﴿ وَبَشَّرْنَٰهُ بِإِسْحَٰقَ نَبِيًّا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾، ئەمەش سێ موژدەی گرتوونە خۆی:

أ- موژدەی پێداوە کە ئیسحاقی دەبێ.

ب- دوایی ئیسحاق دەبێتە پێغەمبەر، (واتە: گەورە دەبێ و دەبێتە پێغەمبەرو وەحییشی بۆ دێ).

٣- لە پێغەمبەرانی چاکیش دەبێ، پێغەمبەران هەموویان چاك بوون، بەڵام یانی: زۆر چاك دەبێ و دەچێتە نێو جەرگەی چاکانەوە، ئەگەرنا پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) هەموویان لە لووتکەدا بوون، بەڵام لووتکەکانیش هەندێکیان لە هەندێکیان بڵندترن، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ فَضَّلْنَا بَعْضَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ عَلَىٰ بَعْضٍ ﴿٥٥﴾ ﴾الإسراء، هەندێك لە پێغەمبەرانمان هەڵبژاردوە بەسەر هەندێکیاندا، واتە: هەموویان لە لووتکەدان، بەڵام هەندێك لە لووتکەکان لە هەندێکیان بڵندترن.

هەروەها ئەوەی پێشێش کە فەرموویی: ﴿ فَبَشَّرْنَٰهُ بِغُلَٰمٍ حَلِيمٍ ﴾، ئەویش دیسان موژدەیەکە سێ موژدەی گرتوونە خۆی:

١- موژدەکە ئەوە دەگەیەنێ کە ئەوەی دەیانبێ، کوڕ دەبێ، نێرینە دەبێ.

٢- ئەوەش دەگەیەنێ کە ئەو منداڵە دەگاتە تەمەنی باڵغ بوون.

**٣- ئەو منداڵە منداڵێکی هێدیی و مەندو، ئارام دەبێ.**

(سبحان الله) خوا ﷻ لە یەك ڕستەدا چەندان مەبەستی گەورەو گرنگ کۆدەکاتەوە: ﴿ فَبَشَّرْنَٰهُ بِغُلَٰمٍ حَلِيمٍ ﴾، لە جیاتی ئەوەی بفەرموێ: موژدەمان پێدا بە منداڵێك، منداڵەکەش کوڕ بێ و، پاشان ئەو کوڕە گەورە ببێ، تاکو دەگاتە ئەو ئەندازەیەی، ببێتە وەرگێڕکەو، سیفەتی ئارامیی و هێدیی و مەندیشی هەبێ، هەموو ئەوەی خستۆتە دوو توێی دوو وشەوە، لێرەش بە هەمان شێوە: ﴿ وَبَشَّرْنَٰهُ بِإِسْحَٰقَ نَبِيًّا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾.

**١٩)- ﴿ وَبَٰرَكْنَا عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ إِسْحَٰقَ ﴾، پیت و پێزیشمان خستە سەرخۆی {ئیبراهیم ﷺ}و سەر ئیسحاقیش، واتە: بەرەکەتدارمان کردن، بەرهەمدارمان کردن، کە تەمەنەکەیان پڕ بەرەکەت بێ، هەروەها وەچەی باشیان لێ پەیدابێ، دەنگ و باس و خواسی پەیامی خواش، کە دەیگەیەنن، بە نێو خەڵکدا باش بڵاو بێتەوە.**

ئەوە وەك خۆیان، بەوجۆرەن.

**٢٠)- ﴿ وَمِن ذُرِّيَّتِهِمَا مُحْسِنٌ وَظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ مُبِينٌ ﴾، هەروەها لە وەچەکەشیان، {وەچەی ئیبراهیم و ئیسحاق (عَلَيْهِمَا الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)} هەم چاکەکار دەبێ و، هەم ستەمکار لە نەفسی خۆیشی، زۆر ڕوون و ئاشکرایە {کە ستەم لە خۆی دەکات}.**

ئەمە ئاگادار کردنەوەیە بۆ ئەوە کە پیسیی و پاکیی، چاکیی و خراپیی، بە پێی ڕەچەڵەك و نەسەب نین، یانی: کچ و کوڕی پێغەمبەران هەر چاك بن و، کچ و کوڕی بابایەکی ستەمکارو کافر، هەر خراپ بن، یان کەسێك کە چاکە، کچ و کوڕەکانی چاك بن و، ئەگەر خراپە، کوڕو کچەکانی خراپ بن، مەرج نیە وابێ، ئەوەتا خوا دەفەرموێ: لە وەچەی ئیبراهیم و ئیسحاق (عَلَيْهِمَا الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، هەم چاکەکار هەیە، هەم کەسێك کە ستەم لە خۆی دەکات و زۆر ئاشکراشە، ستەمەکەی لە خۆی ئاشکرایە، یاخود ستەم لەخۆکردنەکەی، کە ستەمی لە خۆی کردوە، ئاشکراو ڕوونە، هیچ مشتومڕو بکرەو بەردە هەڵناگرێ.

## کورتە باسێک لە بارەی
## ئەو کوڕەوە کە ویستراوە سەرببڕدرێ

زانایـان زۆر لـەو بـارەوە مشـتومڕیان بـووەو، ئێسـتاش لەگەڵـدا بـێ ئـەو مشـتومڕە هـەر هەیـە، دیـارە لـە تەفسـیرەکاندا لـە ژێـر ناوونیشـانی: **(أَيُّهُمَا الذَّبِيح؟ إِسْحاق أو إِسْماعِيل)** کامیـان ویسـتراون سـەربـبڕدرێن، ئیسـحاق یـان ئیسـماعیل؟ **(ذَبِيح)** یـانی: **(مَذبُوح)** سـەربڕدراو واتـە: کـە ویسـتراوە بکرێتـە سـەربڕدراو، تەگەرنـا دیـارە ئیسـماعیلیش سـەرنەبڕدراوە، واتـە: کامیـان ویسـتراوە سـەربـبڕدرێ و، هێنراوەتـە سـەر سـەربڕان؟ وەك گوتـم: زانایـان لـەو بـارەوە زۆر قسـەیان کـردوە، ئـەوەی جێـی سەرسـوڕمانە هـەر کام لـە **(الطبري والشوكاني ومحمد الطاهر بن عاشور)** و ژمارەیـەك لـە ڕوونکەرەوانـی بەرجەسـتەی قوڕئـان، ئـەو ڕایەیـان زاڵکـردوە، یـان بـە لای کەمەوە گوتوویانـە: ڕایـەکان، بەڵگەکانیـان یەکسـانن، یـان ئەوەیـان زاڵکـردوە کـە ئـەوەی ویسـتراوە سـەربـبڕدرێ، ئیسـحاق بـووە!

بـەڵام بۆیـە دەڵێـم: بـۆ مـن جێـی سەرسـوڕمانە، چونکـە زۆر لـەو بابەتـەم کۆڵیوەتـەوەو، کاتـی خۆشـی لـە گێڕانـەوەی بەسـەرهاتی ئیبراهیمـدا ﷺ لـە کاتـی تەفسـیر کردنـی سـوورەتی (إبراهيم)دا باسـم کـردوە، پێشـم وایـە ئـەو شـەش بەڵگانـەی ئێسـتا دەیانخەمـەڕوو، بەڵگـەی مشـتومڕ نەهێڵـن و، یەکلاییکـەرەوەو، هەڵبـڕەرن، لـە سـەر ئـەوە کـە: ئـەوەی ویسـتراوە سـەربـبڕدرێ، ئیسـماعیل بـووە، نـەك ئیسـحاق صـەڵات و سـەلامی خـوا لەسـەر هەردووکیـان بـێ، پێـش وانیـش لەسـەر بابیـان بـێ (خليل الله ئیبراهیـم ﷺ)، لەوبـارەوە شـەش بەڵـگان دێنمـەوە:

١- دوای ئەوەی ئیبراهیم فەرمووی: ﴿ وَقَالَ إِنِّي ذَاهِبٌ إِلَىٰ رَبِّي سَيَهْدِينِ ﴿٩٩﴾ رَبِّ هَبْ لِي مِنَ الصَّالِحِينَ ﴾، خوا دەفەرموێ: ﴿ فَبَشَّرْنَاهُ بِغُلَامٍ حَلِيمٍ ﴾، موژدەمان پێدا بە کوڕێکی

هێدیی و مەند، بەڵام ئەگەر تەماشا بکەین، بۆ ئیسحاق ﷺ، خوا ﷻ لە سوورەتی (الذاريات)دا دەفەرموێ: ﴿ قَالُواْ لَا تَخَفْ وَبَشَّرُوهُ بِغُلَٰمٍ عَلِيمٍ ٢٨ ﴾، (فریشتەکان) گوتیان: مەترسێ و موژدەیان پێدا بە منداڵێکی زانا، واتە: ئیسحاق ﷺ بە زانیاریی مەدح کراوە، بەڵام ئیسماعیل ﷺ بە هێدیی و مەندیی، ئنجا ئەوە مانای وانیە کە ئیسماعیلیش زانیاریی نەبووەو، ئیسحاقیش هێدیی و مەند نەبووە، بەڵام ئەو هەڵوێستەی کە زیاتر لە ئیسماعیلدا بەرجەستە بووە، بریتی بووە لە هێدیی و مەندیی و خۆڕاگریی، ئەوەش کە لە ئیسحاقدا بەرجەستە بووە، بریتی بووە لە زانیاریی، ئەگەرنا پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) خاوەنی هەموو بەهاو ئەدەب و، ڕەوشتە جوانەکان بوون.

مەبەست لێرەدا ئەوەیە کە دەفەرموێ: ﴿ فَبَشَّرْنَٰهُ بِغُلَٰمٍ حَلِيمٍ ﴾ الصافات، ئەمە جیایە لەوەی کە دەفەرموێ: ﴿ وَبَشَّرُوهُ بِغُلَٰمٍ عَلِيمٍ ٢٨ ﴾الذاريات، ئەوەی (علیم)ە، ئیسحاقە ﷺ، کە لە سوورەتی (الذاريات)دا ئەوە زۆر ڕوونە، چونکە لە سوورەتی (الذاريات)دا باس باسی سارە خاتوونە، ئایەتەکان بەم شێوەیەن، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ضَيْفِ إِبْرَٰهِيمَ ٱلْمُكْرَمِينَ ٢٤ إِذْ دَخَلُواْ عَلَيْهِ فَقَالُواْ سَلَٰمًا قَالَ سَلَٰمٌ قَوْمٌ مُّنكَرُونَ ٢٥ فَرَاغَ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ فَجَآءَ بِعِجْلٍ سَمِينٍ ٢٦ فَقَرَّبَهُۥٓ إِلَيْهِمْ قَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ ٢٧ فَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً قَالُواْ لَا تَخَفْ وَبَشَّرُوهُ بِغُلَٰمٍ عَلِيمٍ ٢٨ فَأَقْبَلَتِ ٱمْرَأَتُهُۥ فِى صَرَّةٍ فَصَكَّتْ وَجْهَهَا وَقَالَتْ عَجُوزٌ عَقِيمٌ ٢٩ قَالُواْ كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْعَلِيمُ ٣٠ ﴾الذاريات.

کە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ فَأَقْبَلَتِ ٱمْرَأَتُهُۥ فِى صَرَّةٍ ﴾، هاوسەرەکەی هات، ئافرەتەکەی هات بە هاوار کردنەوە، (فَصَكَّتْ وَجْهَهَا وَقَالَتْ: إني عجوز عقيم)، لە دەم و چاوی خۆیدا {وەك سەرسوڕمان و سەرسامیی دەربڕین} گوتی: من پیرەژنێکی نەزۆکم.

ئنجا ئەوەی کە کەوتۆتە تەمەنەوەو نەزۆك بووە، سارە بووە، ئەگەرنا هاجەر کەنیزەکێك بووە، کە پادشای میسر داویەتی بە ئیبراهیم ﷺو کەنجیش بووە، کەواتە: ئەمە سارە خاتوون بووە، ئەوەش کە موژدەی پێدراوە بە کوڕێکی زانا،

کە ئیبراهیم بووە، لەو سارە خاتوونە بووە، کە گوتوویەتی: من پیرەژنی نەزۆکم (إني عجوز عقیم)!

هەروەها لە سوورەتی (هود)یشدا کە پێشتر تەفسیرمان کردوە هاتوە: ﴿ وَٱمۡرَأَتُهُۥ قَآئِمَةٞ فَضَحِكَتۡ فَبَشَّرۡنَٰهَا بِإِسۡحَٰقَ وَمِن وَرَآءِ إِسۡحَٰقَ يَعۡقُوبَ ﴿٧١﴾ قَالَتۡ يَٰوَيۡلَتَىٰٓ ءَأَلِدُ وَأَنَا۠ عَجُوزٞ وَهَٰذَا بَعۡلِي شَيۡخًاۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٌ عَجِيبٞ ﴿٧٢﴾ ﴾، واتە: ژنەکەی وەستابوو، پێکەنی، ئێمەش موژدەمان پێدا بە ئیسحاق و، لە دوای ئیسحاقیش یەعقووب (عَلَيْهِمَا الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ) {واتە: ئیسحاق دەمێنێ، تاکو یەعقووبیشی دەبێ} ئافرەتەکە گوتی: هەی هاوار بۆ من! ئایا من منداڵم دەبێ لە حاڵێکدا کە من پیرەژنم کەوتوومە تەمەنەوە؟ ئەمەش هاوسەرەکەمە ئەویش پیر بووە؟ بەڕاستیی ئەمە شتێکی سەیرە!

ئنجا بێگومان ئەمەیان کاتێك بووە کە فریشتەکان چوون قەومی لووط بفەوتێنن، ئەوکاتە موژدە دراوە بە ئیبراهیم کە ئیسحاقیان دەبێ، ئەوەش دوای ماوەیەك لەوە بووە کە چوونە شام، بەڵام یەکەم کوڕی ئیبراهیم ﷺ، ئیسماعیل بووە ﷺ، لە (پەیمانی کۆن)دا دەڵێ: تاکە کوڕەکەی خۆت سەربڕە، هەر لە (پەیمانی کۆن)دا دەڵێ: ئیسماعیل گاڵتەی بە ئیسحاق (عَلَيْهِمَا الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ)، کردوە، ئەوەش هۆکاری دوورخستنەوەی ئیبراهیم بووە بۆ هاجەرو ئیسماعیلی کوڕی[1].

٢- لە سوورەتی (الصافات)دا دەفەرموێ: ﴿ وَبَشَّرۡنَٰهُ بِإِسۡحَٰقَ نَبِيّٗا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١١٢﴾ ﴾، دوای ئەوەی باسی ئەوە دەکات: موژدەی کوڕێکی هێدیی و مەندیی دراوەتێ، کەواتە: ئەوەی کە دواتر موژدەی پێدراوە کە ئیسحاقە، جیابووە لەوەی، پێشتر موژدەی پێدراوە، کە ئیسماعیلە.

---

(١) بڕوانە: التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر التكوين، الإصحاح: ٢١ص٥٦، کە ئەمە دەقەکەیەتی: (ولأت سارة أنّ ابن هاجر المصرية الذي أنجَبَتْهُ لإبراهيم يسخر من ابنها إسحاق، فقالت لإبراهيم: اطرد هذه الجارية وابنها...).

٣- ئەوەی لە تەورات دەیهێنم، ئەمە دەقەکەیەتی: {خُذْ ابْنَكَ وَحِيدَكَ الَّذِي تُحِبُّهُ إِسْحَاق وَاذْهَبْ إِلَى الأَرْضِ الْمَرِيا}[1] واتە: کوڕەکەت تاقانەکەت کە زۆرت خۆشدەوێ ئیسحاق، ببە بۆ سەر زەمینی مەڕیا.

ئەمە بێگومان لەو دەستکارییکردن و گۆڕینانەیە کە لە پەیمانی کۆندا کراوە، چونکە ئەو کاتە تاکە کوڕەکەی ئیبراهیم ﷺ بریتی بووە لە ئیسماعیل، هەر ئیسماعیلی هەبووە، ئەگەرنا دوایی کە ئیسحاقیان پەیدابوو، ئیسماعیلیشیان هەبووە واتە: تاقانە ئیسماعیل بووە، کەواتە: ناگونجێ بگوترێتە ئیسحاق (ابْنَكَ وَحِيدَكَ)، بەڵام ئەوان ڕێك لە جێی ئیسماعیل، ئیسحاقیان داناوە، چونکە هەر لە (پەیمانی کۆن)دا دەڵێ: ئیسماعیل گاڵتەی بە ئیسحاق کردوە، وەك پێشتریش هێنامان، بێگومانیش - ئەگەر ڕاست بێ - کوڕی گەورە گاڵتە بە هی گچکە دەکات!

٤- هەندێك ڕیوایەت هەن لەبارەی حیکمەتی وردە بەرد هاویشتنەکان، کە ئەگەر لە ڕووی سەنەدیشەوە تەواو جێی دڵنیایی نەبن، بەڵام دیارە ئەو ڕیوایەتانە لە خۆوە نەهاتوون، نە یەکەو نە دووەو نە سێیە، پوختەکەشیان ئەوەیە: کە لە لای ئەوەی ئێستا پێی دەڵێن: جەمرەی گەورەتر (الجمرة الكبرى) ئیبلیس هاتۆتە پێش ئیبراهیم ﷺ لە شێوەی پیاوێکداو گوتوویەتی: چۆن ئەو کوڕەی خۆت سەردەبڕی؟ ئەویش حەوت وردکە بەردی پێداداون، دوایی لە لای جەمرەی نێوەڕاست (الجمرة الوسطى) دووبارە هاتۆتە پێشی و، حەوتی دیکەی پێداداون و، لە لای جەمرەی گچکەتر (الجمرة الصغرى) دووبارە هاتۆتە پێشی، حەوتی دیکەی پێداداون، چونکە جەمرەی گەورەتر دەکەوێتە لای مەککە، ئنجا هی نێوەڕاست لە نێواندایەو، هی گچکەتر دەکەوێتە لای مینا، ئنجا ئەو وردکە بەرد هاویشتنانە، دەڵێن: لەو شوێنانەدا بووە، کە ئیبلیس هاتۆتە پێش ئیبراهیم ﷺ.

---

(١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر التكوين، الإصحاح: ٢٢ص٥٨.

لـە هەندێـك ڕیوایەتـان دا دەڵـێ: لـە لای جەمـرەی گەورەتـر هاتۆتـە پێـش ئیبراهیـم ، لـەلای هــی نێوەنجیـی، هاتۆتـە پێـش هاجـەرو، لـەلای جەمـرەی گچکـەش هاتۆتـە پێـش ئیسـماعیل و، هەرسـێکیان یـەکی حـەوت وردکـە بەردیان پێـداداون، بۆیـە ئێمـەش ئێسـتا ئـەو هەڵوێسـتەی ئـەوان دووبـارە دەکەینـەوە، کـە ئێمـەش دەبـێ قسـە کردنـی شـەیتان ڕەفـز بکەیـن، لـە کاتێکـدا دەیـەوێ ڕێـی بەندایەتییـمان بـۆ خـوا لـێ بگـرێ.

٥- لە سووڕەتی (هود)دا کە پێشتریش خوێندمانەوە خوا دەفەرموێ: ﴿فَبَشَّرْنَٰهَا بِإِسْحَٰقَ وَمِن وَرَآءِ إِسْحَٰقَ يَعْقُوبَ ﴿٧١﴾﴾، واتە: موژدەمان دا بە هاوسەری ئیبراهیم، بە ئیسحاق و لە دوای ئیسحاقیش موژدەی یەعقووبیشمان پێدا، واتە: کە ئیسحاق یەعقووبیشی دەبێ، ئنجا ئەگەر ئەوەی کە ویستراوە سەربپردرێ، ئیسحاق بووایە، ئەو کاتە فەرمان کردن بە سەربڕینی ئیسحاق، شتێکی ڕووکەشیی دەبوو، یانی: ئەو کاتە ئیبراهیم دەیزانی کە بە جیددیی نیەو، ئەو کاتەش بە تاقیکردنەوە دانەدەنرا، هەروەها سارە خاتوونیش دەیزانی کە هەروا شتێکی ڕووکەشییەو، ئیسحاقیش هەر وایدەزانی، وەك هەندێك خەڵکی سەرلێشێواو لە کوردو غەیری کورد، بە حیساب خۆیان پێ بە ڕەحمترە لە خوا (پاکیی بۆ خوا)، دەڵێن: ئەوە هەر سیناریۆ بووە، ئەگەرنا خوا لەوە بە ڕەحمترە، فەرمان بە پێغەمبەرێکی خۆی بکات، کوڕێکی خۆی سەربڕێ!! ئەوانە کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی سیکۆلاریزم و لیبرالیزم و کاپیتالیزم و، ئەو شتە ئیزمدارانە، ئەو کەوتنە ژێر کاریگەرییەش، بۆتە پەردەیەك لەبەردەمیاندا، کە وەك پێویست لە نهێنییەکانی شەریعەت و بەندایەتیی بۆ خوا حاڵیی نەبن، وا دەزانن، ژیان بەس ئەم ژیانەیە! بەڵام ئەم ژیانە شوێنی تێدا تاقیکرانەوەیە، خواش ﷻ ئیبراهیمی بەوە تاقیکردۆتەوە: فەرموو دەبێ بچیە نێو ئاگری سوور، ئنجا ئەوە بە پێی پێودانگی ئەو جۆرە کەسانە بێ، دەڵێن: ئیبراهیم نەدەبوو، بچێتە نێو ئاگر، چۆن دەبێ ئینسان خۆی بەرێتە نێو ئاگری سوور: ﴿وَلَا تُلْقُوا۟ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى ٱلتَّهْلُكَةِ ﴿١٩٥﴾﴾البقرة، بەڵام نا! ئەوەی خوا ﷻ بەندەکانی پێ تاقیی دەکاتەوە، خوا خوایە، جاری وایە فەرمانی خوا لە عەقڵی تۆوە دەچێ و، جاری وایە لە عەقڵی تۆوە ناچێ، بەڵام بەندایەتیی بۆ خوا یانی: تۆ عەقڵ و دڵ و، کەینوونەو بوونت

هەمووی تەسلیمی فەرمانی خوا بکەی، دوای ئەوەی کە دڵنیابووی ئەوە فەرمانی خوایە، تەواو دەبێ دەمارت تێدا نەجووڵێ و، مووت لێ نەلەخشێ، لە بەردەم فەرمانی خوادا.

ئنجا ئەگەر ئەوەی کە ویستراوە سەربِبڕێ، ئیسحاق بووایە، لە حاڵێکدا پێش ئەوەی ئیسحاق لەدایك بێ، خوا مژدەی داوە بە هاوسەری ئیبراهیم ﷺ ئیسحاق یەعقووبیشی دەبێ، مانای وایە دەیانزانی کە ئیسحاق سەرنابڕدرێ، کەواتە: ئەوە شتێکی ڕواڵەتیی و ڕووکەشیی دەبوو، کە هێنراوەتە سەر سەربڕان، بەڵام ئیسماعیل ﷺ خوا ﷻ هەر ئەوەندەی بە ئیبراهیم فەرمووە: ﴿ فَبَشَّرْنَٰهُ بِغُلَٰمٍ حَلِيمٍ ﴾، واتە: ئیسماعیل دەبێتە مێردمنداڵێك، هێدیی و مەند دەبێ، بەڵام نەیفەرمووە: دواتر دەبێتە پیاو، بۆیە ئەگەری هەبووە، سەربِبڕدرێ و، هەر بە مێرمنداڵیی، تەمەنەکەی کۆتایی بێ.

٦- ئەم ڕیوایەتە کە لە ڕووی سەنەدەوە بێهێزە، لەوبارەوە هاتوە: (عَنْ مُعَاوِيَةَ ﷺ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَأَتَاهُ الْأَعْرَابِيُّ ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، خَلَّفْتُ الْبِلَادَ يَابِسَةً، وَالْمَاءَ يَابِسًا، هَلَكَ الْمَالُ وَضَاعَ الْعِيَالُ، فَعُدْ عَلَيَّ بِمَا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَيْكَ يَا ابْنَ الذَّبِيحَيْنِ! فَتَبَسَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَلَمْ يُنْكِرْ عَلَيْهِ) (أخرجه الحاكم في المستدرك ٤٠٣٦، تعليق الذهبي في التلخيص: إِسْنَادُهُ وَاهٍ).

واتە: موعاویە ﷺ دەڵێ: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبووین یەکێك لە عەرەبە خێڵەکییەکان هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! وڵاتم جێهێشت وشك و برینگ بوو ئاویش وشك بووە، ماڵ فەوتاو خێزان زایە بوو، ئنجا ئەی کوڕی دوو سەر بڕاوەکان! لەوەی خوا پێداوی، هاوکاریم بکە! پێغەمبەری خواش زەردەخەنەی کردو نکووڵیی لێنەکرد.

واتە: نکووڵی نەکرد کە کوڕی دوو پیاوە هێنراوە سەر بڕانەکەبێ، کە ئیسماعیل و (عبداللە) باوکییەتی.

لە (سیرة ابن هشام)دا، کە لە ئیبنو ئیسحاقی وەرگرتووەو، خۆشی زیادەی خستۆتە سەری، ئەو بەسەرهاتە بە تەفصیل دێنێ، کە عەبدولموتەڵیب نەزر

دەکات، کاتێـك بیـری زەمـزەم لێـدەدات، هەڵبەتـە ئـاوی زەمـزەم هـەر هەبـووە، بـەڵام پەنهانکـراوەو کوێـر کراوەتـەوەو، ئەویـش دەیـەوێ بیکاتـە بیرێـك، دوای ئـەوەی چەنـد جارێـك خـەون دەبینـێ و پێـی دەگوتـرێ: ئـەو بیـرە لێبداتـەوە، ئیـدی سـەرچاوەی زەمزەمـی هەڵکەنـدوەو، نـەزری لەسـەرخۆی کـردوە نـەك بـۆ ئاوەکـە، بەڵکـو گوتوویـەتی: خوایـە! ئەگـەر دە (١٠) کوڕانـم بدەیـە، بـۆ ئـەوەی بەرگرییـم لـێ بکـەن، پشـت و قـوەت بـن بـۆم، یەکێکیـان بـۆ تـۆ سـەردەبڕم، ئنجـا دیـارە عەبدولموتتەڵیـب دە کـوڕی دەبـن، بابـی پێغەمبـەر موحەممـەد ﷺ کـە عەبدوڵڵایـە، کـوڕی گچکـەی بـووە، بـە زۆرییـش وایـە کـە کـوڕی گچکـە خۆشەویسترێشـە، لەبـەر ئـەوەی پێویسـتیی بـە ڕەچاوکـردن هەیـە، کـە کوڕەکانـی دەبـن، دیـارە دەبـێ وەفـا بـە نەزرەکـەی خـۆی بـکات، تیروپشـك دەکات، عەبدوڵـڵا دەردەچـێ، جارێـك، سـێ جـاران، هەندێکیـان دەڵێـن: دە جـاران هـەر دەکەوێتـە سـەر ئـەو، ئەویـش ڕاوێـژ دەکات کـە مولزەمـە بـەوەی ئـەو کـوڕە سـەربڕێ و زۆریشـی خۆشـدەوێ؟ ڕیـش سـپییەکانی قوڕەیـش دەڵێـن: نەخێـر! بـۆت هەیـە کـە هەرجارێـك لـە تیروپشـکدا کەوتـە سـەر عەبدوڵـڵا، دە (١٠) حوشـترانی لـە جیاتـی سـەربڕی، ئیـدی جـاری یەکـەم دە حوشـتر، جـاری دووەم دە، هەتـا دەگاتە سـەد حوشـتر، سـەرەنجام عەبدولموتتەڵیب سـەد (١٠٠) حوشـتری دەکەونـە سـەر و، سـەریان دەبـڕێ، وەك بەلاگێـڕەوەو فەرەبـوو بـۆ عەبدوڵـڵا، حاڵـی عەبدوڵـڵا بـەو شـێوەیە بـووە[1].

ئیسـماعیلیش کاتـی خـۆی کـە خـوا هێناویەتـە سـەر سـەربڕان، خـوا ئاژەڵێکـی گـەورەی مەزنـی کردۆتـە بەلاگێـڕی، مانـای وایـە پێغەمبـەری ئێمـە موحەممـەد ﷺ هـەم باپیـرە گـەورەی ئیسـماعیل عليه السلام هێنراوەتـە سـەر سـەربڕان، هـەم عەبدوڵـڵای بابیشـی هێنراوەتـە سـەر سـەربڕان، بۆیـەش کـە پێیگوتـراوە: (ابْنُ الذَّبِيحَيْنِ) کـوڕی دوو سـەربڕاوەکان واتـە: کـوڕی ئـەو دوو پیـاوەی کـە هێندراونـە سـەر سـەربڕان، قسـەیەکی ڕاسـت و بـە جـێ بـووە، ئەمـەش بەسـەر ئیسـماعیلدا دەچەسـپێ،

---

(١) بڕوانە: السيرة النبوية لابن هشام، ج١ ص٨٠-٨٢، دار ابن الهيثم،ط٢٠٠٦م.

چونکـە پێغەمبـەری ئێمـە ﷺ دەچێتـەوە سـەر ئیسـماعیل، نـەك ئیسـحاق، ئنجـا کاتێـك پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ دەبێتـە کـوڕی دوو سـەربڕاوەکە، ئـەو دوو پیـاوەی کـە هێنراونەتـە سـەر سـەربڕان و نیەتـی سـەربڕانیان لـێ هێنـدراوە، کـە یەکیـان عەبدوڵڵایـەو، ئـەوی دیکـەش دەبـێ ئیسـماعیل بـێ، ئـەوەش بەڵگەیەکـی دیکەیـە.

واش هەسـت دەکـەم توێژەرەوانـی قورئـان، ڕوونکەرەوانـی قورئـان، هەندێکیـان زۆر کەوتوونـە ژێـر کاریگەریـی ئیسـرائیلیات و قسـەکانی ئەهلـی کتێبـەوە، لـە حاڵێکـدا کـە پێغەمبـەر ﷺ فەرموویەتـی: {لا تُصَدِّقُـوا أَهْـلَ الْكِتَـابِ وَلا تُكَذِّبُوهُـمْ} (أخرجه البخاري: ٤٢١٥)، واتـە: خـاوەن کتێبـەکان بـە ڕاسـت دامەنیـن و بـە درۆشـیان دامەنیـن، بـە ڕاسـتیان دامەنێـن نـەوەك درۆ بکـەن و، بـە درۆشیان دامەنێـن نـەوەك ڕاسـت بکـەن، بێگومـان لـە شـتێکدا کـە بـۆ ئێمـە نادیـار بـێ، بـەڵام لـە شـتێکدا کـە لەگـەڵ قورئـان دا تێکبگیـرێ و، لەگـەڵ عەقـڵ و واقیعـدا تێکبگیـرێ و، لەگـەڵ زانسـتدا تێکبگیـرێ، بـە تەئکیـد دەبـێ بـە درۆیـان دابنێیـن.

هەسـت دەکـەم بـە تایبـەت (محمـد الطاهـر بـن عاشـور) ڕەحمەتـی خـوای لـێ بـێ، زۆر کارتێکـراو بـووە بـە (پەیمانـی کـۆن)، وەك پێشـتریش باسـم کـردوەو ئێسـتاش باسـی دەکـەم، کـە هەندێـك شـت ڕێـك لـە (پەیمانـی کـۆن)ەوە دێنـێ، دەسـت و پێـی خـۆی پـێ دەبەسـتێ و، ئایەتـەکان وا تەفسـیر دەکات کـە لەگـەڵ ئـەوەی (پەیمانـی کـۆن)دا بگونجـێ، وەك (پەیمانـی کـۆن) وەحیـی دابەزێـنراو (الوحـي المنـزل)ی خـوا بـێ و، پارێـزراو بـێ و دەسـکاریی نەکرابـێ! لـە حاڵێکـدا خـوا هەواڵـی پێداویـن: ﴿يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ ﴿١٣﴾﴾المائدة، وشـەکان لـە شـوێنی خۆیـان لادەدەن، هەروەهـا خـوا هەواڵـی پێداویـن: ﴿وَنَسُوا۟ حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ ﴿١٣﴾﴾المائـدة، بەشـێك لـەوەی کـە پـێ ئامۆژگاریـی کرابـوون لـە بیریـان کـرد، هەندێکیـان خۆیـان گۆڕییـان و، هەندێکیـان فەرامـۆش کـردوە، هـەر دیاریشـە تـەورات بەشـێکی (پەیمانـی کـۆن)ە، چونکـە پەیمانـی کـۆن سـی و نـۆ (٣٩) سـیفرە

واتـە: سـی و نـۆ کتێبـە، پێنـج سـیفری تـەوڕات پێکدێنـن[1]، هـەر دیـارە کـە چـۆن کۆکراوەتـەوەو، چـۆن جوولەکـەکان کاتـی خـۆی دەر بـەدەر کـراون و، هـەم لـە سـەردەمی کلدانییـەکان و ئاشـوورییەکان دا، بوختەنئەصـڕ لـە فەڵەسـتینەوە هێناونـی و، ئـاوارەی عێـڕاق و وڵاتانـی دیکـە بـوون، ئنجـا نوسـخەی ئەصڵیـی تـەوڕات لەبـەر دەسـتدا نەمـاوەو، ئـەو کتێبانـەی دیکـەش کـە خراونـە گـەڵ تـەوڕات، هـەر کەسـێك بیانخوێنێتـەوە، کـە مـن بـە وردیی پەیمانی کۆنم دیراسـە کـردوەو، هەڵمسـەنگاندوەو، لـە کتێبـی پێنجەمـی مەوسـووعەی: (**الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله**) کـە تەرخانـم کـردوە بـۆ هەڵسـەنگاندنی کتێبەکانـی خـوا، لەوێـدا (پەیمانـی کـۆن)م بـە تەوڕاتیەوە، بـە ئینجیلیـەوە، بـە زەبووریـەوە، بـە ئەناشـیدی سـولیەمانیەوە، هەڵسـەنگاندوە، هەر کەسـێك تەماشـای بـکات، زۆر چـاك دڵنیـا دەبـێ کـە ناگونجـێ ئـەو کتێبانـە وەحیـی خـوای پـەروەردگار بـن، بەڵـێ ڕەنگـە لـە چەنـد شـوێنێك وەحیـی خوایـان تێـدا بـێ، بـە تایبەتـی لـە پێنـج سـیفرەکاندا، بـەڵام بـە تەئکیـد دەسـکاریی زۆریـش کـراون.

---

(١) پێنـج سـیفرەکە ئەمانـەن: ١- سـفر التكويـن، ٢- سـفر الخـروج، ٣- سـفر اللاويـين، ٤- سـفر العـدد، ٥- سـفر التثنيـة.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە سی و پێنج (٣٥) ئایەت پێکدێ: (١١٤ - ١٤٨)و، بەسەرهاتی پێنج لە پێغەمبەرانی پایە بەرزی خوای گرتۆتە خۆی، کە: (مووساو هاڕوونی برای و، ئیلیاس و لووط و یونوس)ن (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، ئایەتەکانیش بەم جۆرە بەسەریاندا دابەش بوون:

مووساو هاڕوونی برای (عَلَيْهِمَا الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم): نۆ (٩) ئایەت.

ئیلیاس عليه السلام: دە (١٠) ئایەت.

لووط عليه السلام: شەش (٦) ئایەت.

یونوس عليه السلام: دە (١٠) ئایەت.

هەڵبەتە هەرکام لەم بەسەرهاتانە، زۆر بە پوختیی و گوشراویی خراونەڕوو، لەبەر ئەوەی هەموویان جگە لە ئیلیاس کە لە ڕابردوودا، تەنیا ناوی هێنراوە، لە چەند سوورەتێکی پێشتردا، بەسەرهاتەکانیان خراونەڕوو.

﴿ وَلَقَدْ مَنَنَّا عَلَىٰ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿١١٤﴾ وَنَجَّيْنَٰهُمَا وَقَوْمَهُمَا مِنَ ٱلْكَرْبِ ٱلْعَظِيمِ ﴿١١٥﴾ وَنَصَرْنَٰهُمْ فَكَانُوا۟ هُمُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴿١١٦﴾ وَءَاتَيْنَٰهُمَا ٱلْكِتَٰبَ ٱلْمُسْتَبِينَ ﴿١١٧﴾ وَهَدَيْنَٰهُمَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴿١١٨﴾ وَتَرَكْنَا عَلَيْهِمَا فِى ٱلْءَاخِرِينَ ﴿١١٩﴾ سَلَٰمٌ عَلَىٰ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿١٢٠﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٢١﴾ إِنَّهُمَا مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٢٢﴾ وَإِنَّ إِلْيَاسَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٢٣﴾ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٢٤﴾ أَتَدْعُونَ بَعْلًا وَتَذَرُونَ أَحْسَنَ ٱلْخَٰلِقِينَ ﴿١٢٥﴾ ٱللَّهَ رَبَّكُمْ وَرَبَّ ءَابَآئِكُمُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٢٦﴾ فَكَذَّبُوهُ فَإِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ ﴿١٢٧﴾ إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ

﴿وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي الْآخِرِينَ (١٢٩) سَلَامٌ عَلَىٰ إِلْ يَاسِينَ (١٣٠) إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ (١٣١) إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُؤْمِنِينَ (١٣٢) وَإِنَّ لُوطًا لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ (١٣٣) إِذْ نَجَّيْنَاهُ وَأَهْلَهُ أَجْمَعِينَ (١٣٤) إِلَّا عَجُوزًا فِي الْغَابِرِينَ (١٣٥) ثُمَّ دَمَّرْنَا الْآخَرِينَ (١٣٦) وَإِنَّكُمْ لَتَمُرُّونَ عَلَيْهِم مُّصْبِحِينَ (١٣٧) وَبِاللَّيْلِ أَفَلَا تَعْقِلُونَ (١٣٨) وَإِنَّ يُونُسَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ (١٣٩) إِذْ أَبَقَ إِلَى الْفُلْكِ الْمَشْحُونِ (١٤٠) فَسَاهَمَ فَكَانَ مِنَ الْمُدْحَضِينَ (١٤١) فَالْتَقَمَهُ الْحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٌ (١٤٢) فَلَوْلَا أَنَّهُ كَانَ مِنَ الْمُسَبِّحِينَ (١٤٣) لَلَبِثَ فِي بَطْنِهِ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ (١٤٤) فَنَبَذْنَاهُ بِالْعَرَاءِ وَهُوَ سَقِيمٌ (١٤٥) وَأَنبَتْنَا عَلَيْهِ شَجَرَةً مِّن يَقْطِينٍ (١٤٦) وَأَرْسَلْنَاهُ إِلَىٰ مِائَةِ أَلْفٍ أَوْ يَزِيدُونَ (١٤٧) فَآمَنُوا فَمَتَّعْنَاهُمْ إِلَىٰ حِينٍ (١٤٨)﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بـە دڵنیاییشـەوە (ئێمـە) چاکەمـان لەگـەڵ مووسـاو هـاڕوون دا کـرد (کـە کردماننـە پێغەمبـەر) (١١٤) خۆیـان و گەلەکەشیانمان لـە خـەم و پەژارەیەکـی مـەزن قوتـار کـرد (١١٥) پشتگیرییشـمان کـردن (لـە بەرانبـەر فیرعـەون و دارو دەسـتەکەیدا) و، هـەر ئـەوان زاڵ و سـەرکەوتوو بـوون (لـە سـەرەتا تاکـو ئەنجام) (١١٦) کتێبـە زۆر ڕۆشنەکەشـمان پێیـان دا (١١٧) خستیشـماننە سـەر ڕاسـتە ڕێ (١١٨) لـە نێـو گەلانـی دیکـەش دا (بڵاومـان کـردەوەو) بۆیانمـان جێهێشـت (سـتایش و مەدحـی زۆر) (١١٩) سـەلام لەسـەر مووسـاو هـاڕوون بـێ (١٢٠) ئێمـە بەمجـۆرە پاداشـتی چاکـەکاران دەدەینـەوە (١٢١) بێگومـان ئـەوان لـە بەنـدە بڕوادارەکانمـان بـوون (١٢٢) هەروەهـا ئیلیاسـیش لـە نێـردراوان (ی خـوا) بـوو (١٢٣) کاتێـك بـە کۆمەڵـگای خـۆی گـوت: ئایـا پارێـز (لـە خـواو سـزایەکەی) ناکـەن! (١٢٤) ئایـا لـە بەعـل دەپاڕێنـەوەو، واز دێنـن لـە (لێ پاڕانـەوەو پەرستنی) باشـترینی بەدیهێنـەران؟ (١٢٥) خـوا پـەروەردگاری خۆتـان و بـاب و باپیرانـی یەکەمتـان؟ (١٢٦) کەچـی (خەڵکەکـەی) بـە درۆیـان

داناو، بە دڵنیاییش ئەوان (بۆ دۆزەخ) ئامادەکراو دەبن ﴿١٢٧﴾ بێجگە لە بەندە ساغکراوەو هەڵبژاردەکانی خوا ﴿١٢٨﴾ لە نێو گەلانی دیکەشدا (بڵاومان کردەوەو) بۆیمان جێهێشت (ستایش و مەدحی زۆر) ﴿١٢٩﴾ سەلام لە ئیلیاسین بێ ﴿١٣٠﴾ ئێمە بەمجۆرە پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە ﴿١٣١﴾ بێگومان ئەو (ئیلیاس) لە بڕواداران بوو ﴿١٣٢﴾ هەروەها لووطیش لە نێردراوان (ی خوا) بوو ﴿١٣٣﴾ (یاد بکەوە!) کاتێك خۆی و تێکڕای خێزانەکەیمان (لە سزای خوا کە بۆ خەڵکەکەی هات) دەربازکرد ﴿١٣٤﴾ بێجگە لە پیرەژنێك لە فەوتاوان (و بەجێماوان لە سزادا) ﴿١٣٥﴾ دوایی ئەوانی دیکەمان وێران کردن (و لە نێو بردن) ﴿١٣٦﴾ بێگومان ئێوەش (ئەی خەڵکی مەککەو دەوروبەری! لە کاتی سەفەر کردنتاندا بەرەو شام) بەیانیان بەلا (ی شارە وێرانکراوەکان)یاندا گوزەر دەکەن ﴿١٣٧﴾ هەروەها بە شەویش، ئایا نافامن (تاکو پەندیان لێوەربگرن)؟ ﴿١٣٨﴾ هەروەها یونوسیش لە نێردراوان (ی خوا) بوو ﴿١٣٩﴾ (یاد بکەوە!) کاتێك (لە خەڵکەکەی تووڕەبوو و لێیان) دوور کەوتەوە بەرەو کەشتییە پڕەکە (و سواری بوو) ﴿١٤٠﴾ ئنجا (قورعەی کێشا) (لەگەڵ سواربووانی کەشتییەکەدا، چونکە بارەکەی قورس بوو، داخۆ کێ لێی دابەزێنرێ؟) بەڵام لە دۆڕاوان بوو (تیروپشکەکە بە زیانی وی بوو) ﴿١٤١﴾ (سەرەنجام فڕێدرایە دەریاو) یەکسەر نەهەنگ قووتی دا، لە کاتێکدا لەوانە بوو کە شیاوی ڕەخنەو لۆمەن ﴿١٤٢﴾ ئنجا ئەگەر لە (خوا) بە پاکگران نەبووایە (لە سکی نەهەنگەکەدا) ﴿١٤٣﴾ هەتا ئەو ڕۆژەی (مردووان) تێیدا زیندوو دەکرێنەوە، لە سکیدا دەمایەوە ﴿١٤٤﴾ ئنجا فڕێماندایە ڕووتەنێك لە حاڵێکدا کە نەساغ بوو ﴿١٤٥﴾ بڕکە کوولەکەیەکیشمان لەسەر ڕواند ﴿١٤٦﴾ (پاش چاکبوونەوەی) ناردیشمان بۆ لای (خەڵکێك) سەد هەزار، یان زیاتریش بوون ﴿١٤٧﴾ ئەوانیش بڕوایان هێناو، ئێمەش تاکو ماوەیەك (کە ژیانی دنیایانە) بەهرەمەندمان کردن (لە ژیان و گوزەران)﴿١٤٨﴾].

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(مَنَنَّا ): چاکەمان کرد، (الْمِنَّةُ: النِّعْمَةُ الثَّقِيلَةُ)، (مِنَّة) واتە: چاکەیەکی قورس، (مَنَّ عَلَى فُلاَنٍ: أَثْقَلَهُ بِالنِّعْمَةِ) واتە: بە چاکە لەگەڵ کردن، باری سەرشانی گران کردوە.

(ٱلْمُسْتَبِينَ ): (بَانَ وَاسْتَبَانَ وَتَبَيَّنَ: وَضَحَ)، (الْمُسْتَبِينُ: الْبَيِّنُ شَدِيدُ الْبَيَانِ)، وشەی (بَانَ وَاسْتَبَانَ وَتَبَيَّنَ) هەرسێکیان یانی: ئاشکرابوو، ڕوون بوو، (الْمُسْتَبِين) واتە: ڕوونێکی زۆر ڕوون، ئاشکرایەکی زۆر ئاشکرا.

(بَعْلًا): (الْبَعْلُ: الذَّكَرُ مِنَ الزَّوْجَيْنِ)، (بَعْل): بە مانای نێر دێ، واتە: ئەوەی نێرە لە جووتەکان، لە دوو هاوسەرەکە کە ژن ومێردن، (بَعْل) یانی: مێرد، بە (بُعُولَة) کۆ دەکرێتەوە، هەورەها (بَعْل: كُلُّ مُسْتَعْلٍ عَلَى غَيْرِهِ) بە هەر خۆ بەرزکەرەوەیەك بەسەر غەیری خۆیدا، دەگوترێ، بەڵام دیارە لێرە ناو بووە بۆ صەنەمێك، کە قەومەکەی ئیلیاس ﷺ، پەرستوویانە.

(عَجُوزًا): (الْعَجُوزُ: سُمِّيت بِذلِك لِعَجْزِهَا عَنْ كَثِيرٍ مِنَ الأُمُور)، (عَجُوز): واتە: پیرەژن، بۆیە وای پێ گوتراوە، چونکە گەلێك لە کارەکانی بۆ ئەنجام نادرێن.

(ٱلْغَـٰبِرِينَ ): (جَمْعُ غَابِر وَهُوَ الْمَاكِثُ بَعْدَ مُضِيِّ مَا هُوَ مَعَهُ، أَوِ الْبَاقِي مَعَ الْهَالِكِين)، (غَابِر): بە مانای (مَاكِث) دێ واتە: ماوە، دوای ئەوەی کە ئەوانەی لەگەڵیدا بوون، ڕۆیشتن، ئەو ماوەتەوە، یاخود بە مانای تیێەڕیو دێ (الْمَاضِي مَعَ الذَّاهِبِين) ئەوەی لەگەڵ ئەواندا ڕۆیشتوە، یانی: وشەی (غَابِر): هەم بە مانای کەسێك دێ کە ماوەتەوە، هەم بە مانای کەسێکیش دێ کە ڕۆیشتوە.

دیارە بە نسبەت ژنەکەی لووطیش ﷺ هەردوو واتایەکە ڕاستن، دەگونجێ بڵێی: ژنەکەی مایەوە لەگەڵ ئەوانەدا کە سزا دران، لە سزایەکەدا مایەوە،

دەشگونجێ بڵێی: لەگەڵ ئەوانەدا کە ڕۆیشتن و ناوا بوون، ئەویش لەگەڵ واندا ڕۆیشت و سەری ناوا بوو.

(دَمَّرْنَا): (التَّدْمِيرُ: إِدْخَالُ الْهَلَاكِ عَلَى الشَّيْءِ)، (تدمیر) ئەوەیە شتێك فەوتاندنی بخرێتە نێو، یانی: لە بەین ببردرێ، وێران کردن و تەخت کردن.

(أَبَقَ): (هَرَبَ)، (آبِق جُمْعُهُ أُبَّاق) (آبق) کۆیلەیەك کە لە خاوەنەکەی ڕایکردوە، (أُبَّاق) کۆیلە ڕاکردووەکان.

(فَسَاهَمَ): (أَي: قَارَعَ، وَالْمُسَاهَمَةُ: الْمُقَارَعَةُ) (قرعة) تیروپشك، (قارع) قورعەی کێشا.

(الْمُدْحَضِينَ): لە تێشکاوان بوو، لە دۆڕاوان بوو، (دَاحِضَةٌ: بَاطِلَةٌ، زَائِلَةٌ، الْمُدْحَضِينَ: الْمَغْلُوبِينَ فِي الْقُرْعَةِ)، (دَاحِضَة) واتە: پووچ و ڕۆیشتوو، ئنجا (مُدْحَضِين) واتە: لە تێشکاوان، لە دۆڕاوان لە تیروپشکەکەدا، بە زیانی وی تەواو بووە.

(فَٱلْتَقَمَهُ): دەگوترێ: (لَقِمْتُ الطَّعَامَ أَلْقَمُهُ وَتَلَقَّمْتُهُ) واتە: قووتمدا، وەك پارووم لێکرد، ﴿ فَٱلْتَقَمَهُ ٱلْحُوتُ ﴾، واتە: نەهەنگ بە دەمیەوە گرت، وەك لوقمەیەك، پاروویەك، کە دوایی باس دەکەین بۆچی خوا ﷻ ئەو تەعبیرەی بەکارهێناوە، کاتی خۆشی لە تەفسیری سوورەتی (یونس)دا، لە بەسەرهاتی یونوسدا باسمان کردوە.

(ٱلْحُوتُ): (السَّمَكُ الْعَظِيم) (حوت) ماسیی گەورە، بە کوردیی نەهەنگی پێ دەڵێن، هەندێکجار حووتیشی بۆ بەکاردێنن.

(مُلِيمٌ): (إِسْمُ فَاعِلٍ مِنْ أَلَامَ إِذَا فَعَلَ مَا يَلُومُهُ عَلَيْهِ النَّاسُ، لِأَنَّهُ جَعَلَهُمْ لَائِمِينَ لَهُ، وَالْمُلِيمُ مُكْتَسِبُ اللَّوْمِ (أَلَامَ الرَّجُلُ) أَتَى مَا يُلَامُ عَلَيْهِ مِنَ الْأَمْرِ، وَإِنْ لَمْ يُلَم)، (مُلِيم) ناوی بکەر (اسم فاعل)ە لە (أَلَامَ)، (أَلَامَ يُلِيمُ فَهُوَ مُلِيم) کەسێك شتێك بکات کە خەڵك لەسەر وی ڕەخنەی لێ بگرن، چونکە ئەو وایان لێ دەکات ڕەخنەی

لێ بگرن، (مُلِيم) واتە: سەرکۆنەو ڕەخنە بۆ خۆ پەیداکەر (مُكْتَسِبُ اللَّوْمِ)، (أَلامَ الرَّجُلُ) واتە: پیاوەکە کارێکی کرد لۆمە و، سەرکۆنە بکرێ، ئەگەر سەرکۆنەش نەکرێ لە واقیعدا، بەڵام کارێکی وایکردوە کە مایەی سەرکۆنەو ڕەخنە لێگرتنە.

(بِٱلْعَرَآءِ): (العَرَاءُ: الأَرْضُ الجَرْدَاءُ لاَ نَبَاتَ عَلَيْهِ وَلا شَيْء)، (عَرَاء): واتە: سەرزەمینێکی ڕووتەن، کە مەبەستی پێ هەر زەوییەکە ڕووەکی لێ نەبێ و هیچ شتێکی لێ نەبێ واتە: بیابان یاخود دەشت و سارایەکی ڕووتەن.

(يَقْطِينٍ): بە مانای کوولەکە دێ یان کدوو، دەڵێ: (كُلُّ شَجَرَةٍ لا تَقُومُ عَلَى سَاقٍ كَالدُّبَّاءِ وَالْبِطِّيخِ وَالْحَنْظَلِ) هەر جۆرە ڕووەکێکە کە لەسەر قەد ڕاناوەستێ، بەڵکو پان دەبێتەوە بە زەویدا، وەك کوولەکە، کاڵەك و شووتیی و (حَنْظَل) گوژاڵك.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

سەرەتا دەڵێین: ئەم دەرسەممان سی و پێنج (٣٥) ئایەتەو، بەسەرهاتی پێنج لە پێغەمبەرانی گرتۆتە خۆی: یەکەم و دووەم: مووساو هاڕوونی برای (عَلَيْهِمَا الصَّلاةُ وَالسَّلاَم)، سێیەم: ئیلیاس ﷺ، چوارەم: لووط ﷺ، پێنجەم: یونوس ﷺ.

شایانی باسە: ئێمە بەسەرهاتی مووساو هاڕوونی برای و گەلەکەیان، لەگەڵ فیرعەون و دارودەستەکەیدا، لە سوورەتەکانی: (الأعراف) و (القصص)دا خستوومانەتەڕوو، کە بەسەرهاتی مووساو هاڕوونی برای و بەنوو ئیسرائیل و، بەرانبەرەکانیان، کە فیرعەون و دارو دەستەکەینی، لە سێزدە ئاڵقەدا خستوومانەتە ڕوو، پێنج ئاڵقەی یەکەمی لە سەرەتای سوورەتی (القصص)دا، کە ئایەتەکانی: (١ - ٤٢) گرتوویەتەوەو بە تەفصیل باسمان کردوەو، پەندو عیبرەتی زۆریشمان لێ دەرهێناوە، هەشت ئاڵقەکانی دواییش: (٦ - ١٣) لە سوورەتی (الأعراف)دا، ئەویش ئایەتەکانی: (١٠٣ - ١٧٩) واتە: شەست و نۆ (٦٩) ئایەتی گرتۆتەوە.

بەسەرهاتی ئیلیاسیشمان لە سوورەتی (الأنبیاء)دا باس کردووەو، بەسەرهاتی لووطیشمان لە سوورەتی (هود)دا توێژیوەتەوە بە وردیی، بەسەرهاتی یونوسیشمان لە سوورەتی (یونس)دا خستۆتەڕوو، بۆیە ئێمە لێرە تەنیا بە ئەندازەی ڕوونکردنەوەی چەمك و واتای ئایەتەکان، قسە لە بارەی ئەو بەسەرهاتانەوە دەکەین، هەر کەسیش درێژەی بەسەرهاتەکانیانی بوێ، دەبێ لەو جێیانەدا کە باسمان کردن، لێیان بخەفتێ، بۆ ئەوەی پێویست نەکات شتێك کە پێشتر گوتوومانە، لە شوێنەکانی دیکەدا دووبارەی بکەینەوە، بە تایبەتی بەسەرهاتی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، کە پانتاییەکی زۆری لە قورئاندا گرتوە، ئەگەر بێت و لە هەر شوێنێك بەسەرهاتی هەر پێغەمبەرێك هاتوە، دووبارەی بکەینەوە، قەبارەی تەفسیرەکەی ئێمە زۆر گەورە دەبێ، خواش ﷻ کە بەسەرهاتی پێغەمبەرانی (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) هێناوە، لە هەر شوێنێك جێی مەبەستی هێناوە، نەك هەموو بەسەرهاتەکە بێنێ، بۆیە ئێمە بۆ هەر کام لە بەسەرهاتی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) واتە: ئەو بیست و پێنج پێغەمبەرە کە ناویان هاتوە لە قورئاندا، جگە لە موحەممەد ﷺ کە کتێبێکی تایبەتمان بۆ تەرخانکردوە، بە ناوی: (پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا ﷺ)، بیست و چوار پێغەمبەرەکەی دیکە، بۆ هەر کامێکیان لە شوێنێکدا هەرچی ئایەت لە بارەیەوە هاتوە، هێناومانە، هەروەها گەڕاوینەوە بۆ سەرچاوەکانی مێژوو، ئەوەی دەستمان کەوتبێ، بەسەرهاتی ئەو پێغەمبەرەمان لەو شوێنەدا بە تایبەت هێناوە، کە وەك پێشتریش گوتوومانە: دەگونجێ دوایی بەسەرهاتی ئەو بیست و چوار پێغەمبەرە کە ناویان هاتوە لە قورئاندا لە ئادەمەوە تاکو عیسا (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) لە چەند بەرگێکدا لەم تەفسیرە دەربهێندرێن، چونکە بەو شێوەیە کە من توێژینەوەم کردوە، لە بارەی پێغەمبەرانەوە (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، ڕەنگە کەمتر کرابێ، چونکە باسی هەر پێغەمبەرێکم کردوە، لە هەر شوێنێك کە بۆ ئەوێ گونجاو بووە، بۆ وێنە: ئیبراهیم عليه السلام لە سوورەتی

(إبراهیم)دا، یونوس ﷺ لە سوورەتی (یونس)دا، صالح ﷺ لە سوورەتی (الحجر)دا، هەروەها یوسوف ﷺ لە سوورەتی (یوسف)داو، ئەوانی دیکەش هەر کامیان لە شوێنی تایبەتی خۆی، هەڵساوم هەرچی ئایەت هەیە لەو بارەوە هێناومە، چونکە بە هەموو ئایەتە پەیوەندییدارەکان، هەموو گۆشەکانی ئەو بەسەرهاتە تەواو دەکەن، پاشان گەڕاومەوە بۆ دەقەکانی سوننەت و سەرچاوە مێژوویییەکان و لێکۆڵینەوەی وردم کردوە، بەو ئەندازەیەی کە لە توانامدا هەبووەو، لەگەڵ سروشتی تەفسیرەکەش دا گونجاوە، بەڵام هەر سوورەتێك کە پێیدا ڕەت دەبین، هەر گۆشەیەکی لە ژیانی هەر پێغەمبەرێکی باس کردبێ (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، ئێمە بە ئەندازەی تیشك خستنە سەر ئەو گۆشەیەو، بە ئەندازەی تیشك خستنە سەر چەمك و واتای ئایەتەکان، قسەی لێ دەکەین، ئەگەرنا بەسەرهاتە تێرو تەسەلەکەمان لە شوێنی دیارییکراودا کردوەو، لە شوێنەکانی دیکەدا دووبارەی ناکەینەوە.

لێرەدا خوا ﷻ دوای ئەوەی لە ئایەتەکانی پێشوودا، باسی چوار لە پێغەمبەرانی کرد: نووح و ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاقی کوڕی (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، ئنجا باسی پێنجی دیکە دەکات، کە لەم سوورەتەدا باسی نۆ (٩) لە پێغەمبەران کراوە، هەروەك لە سوورەتی (ص)یشدا کە دوایی دەیگەینێ، لەوێش دا دیسان هەر باسی نۆ (٩) لە پێغەمبەران کراوە، کە ئەوە خاڵی هاوبەشی نێوان ئەو دوو سوورەتەیە، ئەو پێنج پێغەمبەرەش کە ماون، لەم سی و پێنج (٣٥) ئایەتەدا، خوا ﷻ باسی گۆشەیەك لە ژیان و بەسەرهاتیان دەکات.

سەرەتا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ مَنَنَّا عَلَىٰ مُوسَىٰ وَهَـٰرُونَ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە چاکەمان کرد لەگەڵ مووساو هارووندا، مووساو هاروون (عَلَيْهِمَا الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) برابوون هاروون لەسەر داواو پێشنیاری مووسا خوا ﷻ کردوویەتی بە وەزیری و کردووشیەتی بە پێغەمبەر، وەك لە سوورەتی (مریم)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱذْكُرْ

﴿فِي ٱلۡكِتَٰبِ مُوسَىٰٓۚ إِنَّهُۥ كَانَ مُخۡلَصٗا وَكَانَ رَسُولٗا نَّبِيّٗا ۝٥١ وَنَٰدَيۡنَٰهُ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ ٱلۡأَيۡمَنِ وَقَرَّبۡنَٰهُ نَجِيّٗا ۝٥٢ وَوَهَبۡنَا لَهُۥ مِن رَّحۡمَتِنَآ أَخَاهُ هَٰرُونَ نَبِيّٗا ۝٥٣﴾.

﴿وَنَجَّيۡنَٰهُمَا وَقَوۡمَهُمَا مِنَ ٱلۡكَرۡبِ ٱلۡعَظِيمِ﴾، خـوا دەفەرمـوێ: هەردووکیانمـان دەرباز کـردو گەلەکەشیان، لـە خەفەتـی و مەینەتیی مـەزن، ئـەو مەینەتییە مەزنـە، دیـارە ئـەو واقیعـە سـەخت و دژوارە بـووە، کـە لـە میسـڕ لێیـان گـوزەراوە، لـە ژێـر سـایەی شـوومی حوکمڕانیـی فیرعـەون و دارو دەسـتەکەیدا، کـە پێشـتر باسـمان کـردوە چـۆن سـۆغرەو بێـگاری پێکـردوون و، نێرینەکانـی سـەربڕیون، مێینەکانـی هێشـتوونەوە و چەوسـاندوونیەوە و بـە کۆیلـەی دانـاون.

﴿وَنَصَرۡنَٰهُمۡ فَكَانُواْ هُمُ ٱلۡغَٰلِبِينَ﴾، هەروەهـا ئێمـە ئەوانمـان سەرخسـت و پشـتمان گرتـن و، بـەس ئـەوان زاڵ بـوون واتـە: لـە سـەرەتا تاکـو کۆتایـی هـەر ئـەوان زاڵ بـوون، خـوا پشـتی گرتـن، هـەر کەسـێك خـوا لـە پشـتی بـێ، بێگومـان سـەرکەوتوو دەبـێ و پشـتی بـە زەوی ناکـەوێ.

﴿وَءَاتَيۡنَٰهُمَا ٱلۡكِتَٰبَ ٱلۡمُسۡتَبِينَ﴾، کتێبـە زۆر ڕۆشنەکەشـمان پێـدان، کـە مەبەسـت پێـی تەوڕاتـە، ﴿وَهَدَيۡنَٰهُمَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾، ڕێیـە ڕاستەکەشـمان پێشـاندان، کـە ئـەو شـەقامە ڕێیـە کـە هەمـوو پێغەمبـەران (عَلَيۡهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) پێیدا ڕۆیشـتوون، کـە بەندایەتییـە بـۆ خـواو، گرتنـی بەرنامـەی خوایـەو، ژیانـە بـەو شـێوەیەی کـە جێـی پەسـەند و جێـی ڕەزامەندیـی خـوای پـەروەردگارە لـە دنیـادا.

﴿وَتَرَكۡنَا عَلَيۡهِمَا فِي ٱلۡأٓخِرِينَ﴾، لـە نێـو ئەوانـی دیکەش دا لەسـەرمان بەجێهێشـتن، سـتایش و مـەدح و سـەنا، زیکـری خێرمـان لـە نێـو گەلانـی دیکەدا لەسـەر بەجێهێشـتن، نـاوو ناوبانگـی چاکـمان بـڵاو کردنـەوە، ﴿سَلَٰمٌ عَلَىٰ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ﴾، سـەلام لەسـەر مووسـاو لەسـەر هـاڕوون بـێ، وەك پێشـتریش گوتمـان: دەشـگونجێ ئەمـە بـەرکار (مفعول بـە)ی ڕسـتەی پێشـەوە بـێ، واتـە: لـە نێـو خەڵکـی دیکـەدا لەسـەرمان بەجێهێشـتن، سـەلام لەسـەر مووسـاو هـاڕوون.

﴿ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِي ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾، ئێمە بەو شێوەیە پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە، کەواتە هەر کەسێکی دیکەش وەك مووساو هارون (عَلَيْهِمَا الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، خۆڕاگر بێ و چاکەکار بێ، بەندایەتیی پاك و پوخت بۆ خوا بکات، وەك چۆن خوا مووساو هارون و گەلەکەیانی دەرباز کردوون، هەر کەسێکی دیکەش وەك وان بکات، هەر دەربازی دەکات و سەرفرازی دەکات، پشتی دەگرێ و سەریدەخات، ﴿ إِنَّهُمَا مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، بێگومان ئەوان لە بەندە بڕوادارەکانی ئێمە بوون، کەواتە بە هۆی ئیمانیانەوە بەندایەتییان بۆ خوا کردو، بەهۆی بەندایەتیی بۆ خوا کردنیانەوەش چاکەکار بوون، بە هۆی چاکەکارییشیانەوە، شایستەی ئەوە بوون کە خوا ﷻ بەو شێوەیە مامەڵەیان لەگەڵدا بکات و پاداشتیان بداتەوە، لە دنیاداو، پاداشتی دوارۆژیش دیارە لە چاو هی دنیا هەر باس ناکرێ و پێوانە ناکرێ، ئەمە بەسەرهاتی مووساو هارون (عَلَيْهِمَا الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم).

﴿ وَإِنَّ إِلْيَاسَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾، بە دڵنیایی ئیلیاسیش لە ڕەوانەکراوان بوو، لەوانە بوو کە خوا ناردبوونی، بۆ ڕێنمایی کردنی خەڵك، دیارە ئیلیاسیش بۆ لای خەڵك و کۆمەڵگایەکەی خۆی نێردراوە، ﴿ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ أَلَا تَتَّقُونَ ﴾، یاد بکەوە کاتێ (ئیلیاس) بە خەڵکەکەی خۆی گوت: ئایا پارێز ناکەن؟ لە چی پارێز ناکەن؟ یانی: ئایا خۆتان ناپارێزن لە تووڕەبوونی خوا؟ خۆتان ناپارێزن لە شیرك و کوفرو گوناهو تاوان و، لە ستەم و لادان، کە هۆکاری سزادرانتانن لە لایەن خوای دادگەرەوە؟!

﴿ أَتَدْعُونَ بَعْلًا ﴾، ئایا لە بەعل دەپاڕێنەوەو بەندایەتیی بۆ بەعل دەکەن، دیارە بەعل پەرستراوێکی ئەوان بووەو، وا پێدەچێ شاری (بەعلەبەگ) بەو ناوەوە ناونرابێ، ﴿ وَتَذَرُونَ أَحْسَنَ ٱلْخَٰلِقِينَ ﴾، وازیش دێنن لە باشترینی بەدیهێنەرەکان {کە خوایە ﷻ} چونکە دوایی دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهَ رَبَّكُمْ وَرَبَّ ءَابَآئِكُمُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴾، خوا پەروەردگارو خاوەنی خۆتان و، خاوەن و پەروەردگاری باب و باپیرانی

یەكەمیشتان، واتە: ئایا واز لە خوا دێنن و، دەست لە پەرستنی خوا هەڵدەگرن بۆ بەعل، كە صەنەمێكەو پەیكەرێكە؟ شتێكی زۆر بێ جێ دەكەن.

﴿ فَكَذَّبُوهُ فَإِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ ﴾، ئنجا ئەوان بە درۆیان داناو، بە دڵنیاییش ئەوان لە ئامادەكراوان دەبن، واتە: لە ئامادەكراوان و پەلكێش كراوان دەبن بۆ سزای دۆزەخ، ﴿ إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴾، جگە لە بەندە هەڵبژێردراوەكان و ساغكراوەكانی خوا، ئەوان پەلكێش ناكرێن بۆ دۆزەخ، بۆیە ئەم (إلاَّ)یە بە مانای (لكنَّ)یە، بەڵام بەندە هەڵبژێردراوەكانی خوا، نەك ئامادە ناكرێن بۆ دۆزەخ، بەڵكو ئەوان پێشوازیی دەكرێن لە بەهەشتدا.

﴿ وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِى ٱلْءَاخِرِينَ ﴾، هەروەها لە نێو ئەوانی دیكەش دا لەسەریمان بەجێهێشت {مەدح و ستایش و ناوی چاك، ناوبانگی باشمان بۆ بڵاوكردەوە} یاخود نەوەمان بۆ بەجێهێشت: ﴿ سَلَٰمٌ عَلَىٰٓ إِلْ يَاسِينَ ﴾، سەلام لەسەر ئیلیاسین بێ، نەوەمان لە نێو گەلانی دیكەدا، لە نێو خەڵكی دیكەدا، بۆ بەجێهێشت، ﴿ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾، ئێمە بەو شێوەیە پاداشتی چاكەكاران دەدەینەوە، ﴿ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، بە دڵنیایی ئەو لە بەندە بروادارەكانی ئێمە بوو.

ئنجا كە خوا ﷻ بۆ هەموویان هەر دەفەرموێ: ﴿ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، بۆ پێغەمبەرانی كە ڕابردوون، هەم بۆ مووساو هارِوون وایفەرموو، هەم بۆ ئیبراهیم وایفەرموو، هەروەها بۆ نووح وایفەرموو (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلَام)، مانای وایە بەندایەتیی بۆ خواو بڕوا بە خوا، سەرچاوەی هەموو سیفەتە بەرزەكانن و، سەرچاوەی هەموو خێرو خۆشییەكن، هەروەها مایەو هۆكاری پشتیوانییكردن و مشوور لێ خواردنی خوای پەروەردگارن بۆ مرۆڤ.

ئنجا دێتە سەر باسی بەسەرهاتی پێغەمبەرێكی دیكە، كە لووطە عليه السلام و لەم دەرسەماندا پێغەمبەری چوارەمەو، لە ڕیزبەندیی كۆی ئەم سوورەتەدا، پێغەمبەری هەشتەمە، دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّ لُوطًا لَّمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾، بە دڵنیایی لووطیش

لە ڕەوانەکراوان بوو، لەوانە بوو خوا ڕەوانی کردبوون، کە پەیامی خوا بە خەڵك بگەیەنن، فێری بەندایەتیی و ژیانێکیان بکەن، کە هەر ئەو ژیانە شایستەی مرۆڤە، ئەویش ئەوەیە مرۆڤ تەنیا بەندەی خوا بێ و، پابەندی شەریعەت و بەرنامەکەی بێ، پابەندی هودای خوا بێ، نەك شوێنکەوتووی هەوای خۆی، یان هەوای غەیری خۆی!

بەسەرهاتەکەی لووط ؈ خوا ﷻ تەنیا ئەو گۆشەیەی لێ دێنێ کە ئەو دەرباز کراوەو، نەیارەکانیشی لە بەین براون، دەنا بەسەرهاتی لووط لە زۆر لە ئایەتەکانی قورئاندا وردەکاریی دیکەی هەیە، ﴿ إِذْ نَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ أَجْمَعِينَ ﴾، یاد بکەوە کاتێك خۆی و خێزانەکەیمان تێکڕا دەرباز کرد، یان: ﴿ وَأَهْلَهُۥٓ ﴾، یانی: ئەوانەی نیزیکی بوون، تێکڕا دەربازمان کردن، چونکە وشەی (أَهْل) پسپۆڕانی زمان گوتوویانە: هەر کەسێکە کە بە هۆی دینەوە، یان ڕەچەڵەکەوە، یان بە هۆی پیشەیەکەوە، یان بە هۆی وڵات و شوێنێکەوە، یان بە هۆی خانوو و شوێنی تێدا نیشتەجێ بوونەوە، لەگەڵ مرۆڤدا یەکبکەونەوە، کەواتە ئەهلی ئینسان دەگونجێ بڵێی: خێزانی، دەگونجێ بڵێی: شوێنکەوتووانی، دەگونجێ بڵێی: هاونیشتیمانییانی، دەگونجێ بڵێی: هاوپیشەکانی، یان ئەوانەی کە لێی نیزیکن بە شێوەیەك لە شێوەکانی نیزیکیی، لێرەش واتە: ماڵ و خێزانەکەی و شوێنکەوتووەکانیمان هەموویان دەرباز کردن.

﴿ إِلَّا عَجُوزًا فِى ٱلْغَٰبِرِينَ ﴾، جگە لە پیرەژنێك لە فەوتاوان، لە تێپەڕیوان، ئەوانەی ڕۆیشتن و ڕابردن، یاخود ﴿ فِى ٱلْغَٰبِرِينَ ﴾، واتە: لەوانەی مابوونەوە لە سزادا، چونکە (غَابِر) هەم بە مانای ماوە (مَاكِث) دێ، هەم بە مانای ڕابردوو (مَاضِي) دێ، ﴿ ثُمَّ دَمَّرْنَا ٱلْءَاخَرِينَ ﴾، دوایی ئەوانی دیکەمان فەوتاندن، وشەی (تَدْمِير) شارەزایانی زمان بە: (إِدْخَالُ الْهَلَاكِ عَلى الشَّيْءِ) مانایانکردوە: هێنانی لە بەین بردن بۆ شتێك، کە وێران بکرێ، وەك چۆن خانووبەرەیەك کاول دەکرێ، ئەوانی دیکەمان کاول کردن.

﴿وَإِنَّكُمْ لَتَمُرُّونَ عَلَيْهِم مُّصْبِحِينَ﴾، بە دڵنیایی ئێوەش بەرەبەیانان بە لایاندا ڕەت دەبن، بە لای شارەکانیاندا، بە لای شوێنەوارەکانیان دا، واتە: دەریاچەی مردوو، بە وێدا ڕەت دەبن، ﴿وَبِاللَّيْلِ﴾، هەروەها بە شەوگاریش بە لایاندا ڕەت دەبن، هەم بەیانیان و هەم شەوانیش بە لایاندا ڕەت دەبن، ﴿أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾، ئایا نافامن و پەند وەرناگرن؟ کە ئێوەش وەك وان نەکەن، بۆ ئەوەی بە مەرەدی وان نەچن، دەبوو پەند وەربگرن، ئەمە دیارە پرسیار کردنی نکوولیلێکەرانەیە: ﴿أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾، ئایا نافامن و عەقڵتان نیەو هۆشتان بەکار ناهێنن؟

ئنجا دێتە سەر باسی نۆیەمین پێغەمبەر لەم سوورەتەدا:

﴿وَإِنَّ يُونُسَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ﴾، بە دڵنیایی یونوسیش لە ڕەوانەکراوان بوو، بە پێی کتێبە مێژووییەکان و لە فەرمایشتی پێغەمبەریشدا هاتوە ﷺ کە یونوس ﵇ بۆ لای خەڵکی نەینەوا (موسڵی ئێستا) ڕەوانکراوە.

﴿إِذْ أَبَقَ إِلَى الْفُلْكِ الْمَشْحُونِ﴾، کاتێك کە هەڵات بەرەو کەشتییە پڕەکە، (أَبَقَ) بە مانای دوورکەوتەوەش دێ، یانی: (إبتعَدَ) واتە: لە خەڵکەکەی دوور کەوتەوە لەبەر ئەوەی لێیان تووڕە بوو، ئنجا سواری کەشتییە پڕەکە بوو، یاخود (أَبَقَ) واتە: ڕایکرد، وەك چۆن کۆیلەیەك لە دەست خاوەنەکەی خۆی ڕادەکات، یان: غوڵامێك لە دەست سەرپەرشتیارەکەی خۆی ڕادەکات، ئەویش وەك کۆیلەیەکی ڕاکردوو بوو، لەو شوێنەی خوا بۆی دیارییکردبوو، لەوێ ڕۆیشت و سواری کەشتییە پڕەکە بوو.

﴿فَسَاهَمَ فَكَانَ مِنَ الْمُدْحَضِينَ﴾، تیروپشکی کرد، بەشداریی قورعە کێشانی کرد، بەڵام لە دۆڕاوان بوو، لەوانە بوو کە تیروپشکەکە بە زیانی تەواو بوو، ئنجا تیروپشکەکە بۆچی کراوە، بۆچی قورعە کێشراوە؟ دوایی باسی دەکەین لە مەسەلە گرنگەکاندا، پێشتریش لە بەسەرهاتی یونوسدا ﵇ هەر باسمان کردوە لە تەفسیری سوورەتی (یونس)دا، وا پێدەچێ کەشتییەکە بارەکەی گران بووبێ،

یاخــود جوولّــە جوولّێکــی نــا ئاســایی کردبــێ، خەڵکەکــەش نەرێــت و عادەتیــان وابــووە، کــە ئەگــەر کەشــتیی لــە دەریــادا جوولّــە جوولّــی کــردو خەریــك بــوو غــەرق بــێ، کردوویانــە بــە نیشــانەی ئــەوە کــە بابایەکــی گوناهباریــان لەگەڵــدا هەیــە، ئنجــا کێیــە ئــەو گوناهبــارە؟ تیروپشــکیان کــردوە، هــەر کەســێك بــۆی دەرچووبــێ گوتوویانــە: دیــارە گوناهبارەکــە ئــەو کەســەیەو، فڕێیانداوەتــە نێــو ئاوەکــە بــۆ ئــەوەی ئەوانــی دیکــە ســەلامەت بــن، چەنــد ڕیوایەتێــك هــەن لــەو بــارەوە، بــەڵام ئــەوە لــە ئایەتەکــەدا دەرنەخــراوە، گرنــگ ئەوەیــە لــە تیروپشــکەکەدا دۆڕاندوویەتــی و، کــە دۆڕاندوویەتــی مانــای وایــە قســمەتی وابــووە، کــە دەبــێ بچێتــە نێــو دەریــا.

﴿ فَٱلۡتَقَمَهُ ٱلۡحُوتُ ﴾، نەهەنــگ بــە دەمیــەوە گــرت، ﴿ وَهُوَ مُلِيمٞ ﴾، لــە حاڵێکــدا کــە کارێکــی وای کردبــوو، خەڵــك ڕەخنــەی لــێ بگــرێ و ســەرکۆنەی بــکات، کــە کارەکــەی ئــەوە بــوو بــە بــێ ڕێپێــدان و مۆڵەتدانــی خــوا، کۆمەڵگایەکــەی خــۆی بەجێهێشــت، وەك لــە ســوورەتی (الأنبیــاء)دا خــوا ﷻ دەفەرمــوێ: ﴿ وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَٰضِبٗا ﴿٨٧﴾ ﴾الأنبیــاء، یــادی (ذا النــون) بکــەوە[1]، خاوەنــی نەهەنگەکــە یــان هاوەڵــی نەهەنگەکــە، ﴿ وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَٰضِبٗا ﴿٨٧﴾ ﴾الأنبیــاء، یــادی هاوەڵــی ماســییەکە بکــەوە، کاتێــك بــە تووڕەیــی ڕۆیــی، لــە خەڵکەکــە تــووڕە بــوو ڕۆیــی، ﴿ فَظَنَّ أَن لَّن نَّقۡدِرَ عَلَيۡهِ ﴿٨٧﴾ ﴾الأنبیــاء، پێــی وابــوو کــە ئێمــە وڵاتــی لــێ وەتەنــگ ناهێنیــن (أي: لَـن نُضَيِّـقَ عَلَيْـه) لێـمان وەتەنــگ نەهێنــاوە کــە دەبــێ هــەر لــەو شــارە، لــەو وڵاتــە کــە بۆمــان نــاردوە، بانگــەواز بــکات، بــۆی هەیــە بچــێ بــۆ شــوێنێکی دیکــەش، خەڵــك بــۆ لای خــوا بانگبــکات، ئــەوە مانــا ڕاســتەکەی ئــەو ئایەتــە موبارەکەیــە، وەك لــە شــوێنی خــۆی لــە ســوورەتی (الأنبیــاء)دا باســمان کــردوە، نــەك وەك هەندێــك گوتوویانــە: ﴿ فَظَنَّ أَن لَّن نَّقۡدِرَ عَلَيۡهِ ﴿٨٧﴾ ﴾الأنبیــاء، پێــی وابــوو پێــی ناوێریــن و

---

(١) (نــون) واتــە: ماســیی، (ذا) یانــی: هــاوەڵ، خــاوەن (صاحــب النــون)، وەك لــە شــوێنی دیکــەدا دەفەرمــوێ: (صاحــب الحــوت) هاوەڵــی نەهەنــگ، لــە ســوورەتی (القلــم) دا دەفەرمــوێ: (صاحــب الحــوت).

توانامان بەسەریدا ناشكێ!! مسوڵمانێكی عەوامیش ئەو جۆرە بیركردنەوەی نیە، چ جای پێغەمبەرێكی پایەبەرزی وەك یونوس ؑ! (فظن أن لن نقدر علیه) یانی: پێی وابووە ئێمە لەسەرمان نەكردۆتە مەرج، كە دەبێ هەر ئەو خەڵكە بۆ لای خوا بانگبكات و، پەیامی خوا بەس بەو خەڵكە بگەیەنێ و، بچێ بۆ هەر شوێنێكی دیكەش، هەر تەواوە، لەسەر ئەوە خوا ﷻ سزای دا، بۆیە خوا وشەی (أَبَقَ)شی بۆ بەكار هێناوە: ﴿ إِذْ أَبَقَ إِلَى ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ ﴾، یانی: ڕایكرد لە فەرمانی خواو سەرپێچیی كرد، بەرەو كەشتییە پڕەكە ڕۆیی ﴿ فَسَاهَمَ فَكَانَ مِنَ ٱلْمُدْحَضِينَ ﴾، تیروپشكی كردو لە دۆڕاوان بوو، ﴿ فَٱلْتَقَمَهُ ٱلْحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٌ ﴾، نەهەنگ بە دەمیەوە گرت، لە حاڵێكدا كە كارێكی كردبوو، ڕەخنەی لێ بگیرێ.

﴿ فَلَوْلَآ أَنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُسَبِّحِينَ ﴾، ئنجا ئەگەر لە (خوا) بە پاككران نەبووایە، (سبحان الله)ی نەكردبایە، كە لە سوورەتی (الأنبیاء)دا چۆنیەتیی تەسبیحەكەی هاتووە، كە فەرموویەتی: ﴿ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبْحَٰنَكَ إِنِّى كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٧﴾ ﴾الأنبیاء، {بێجگە لە تۆ هیچ پەرستراوێك نیە، پاكیی بۆ تۆ، من لە ستەمكاران بووم} ئەگەر ئەو زیكرەی نەخوێندبایە، ﴿ لَلَبِثَ فِى بَطْنِهِۦٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴾، لە سكی نەهەنگەكەدا دەمایەوە، تاكو ئەو ڕۆژەی مرۆڤەكان تێیدا زیندوو دەكرێنەوە، واتە: تاكو ژیانی بە كۆتا دەهات لەوێداو، سكی نەهەنگەكە بۆی دەبوو بە گۆڕ.

﴿ فَنَبَذْنَٰهُ بِٱلْعَرَآءِ وَهُوَ سَقِيمٌ ﴾، بەڵام ئێمە دوای ئەو خوا یاد كردن و خوا بە پاككرتنەی، فڕێماندایە ڕووتەنێك، لە حاڵێكدا كە ئەو نەخۆش بوو، (فَنَبَذْنَاهُ: فَطَرَحْنَاهُ) فڕێماندا، هاویشتمانە دەشت و سارایەكی ڕووتەن، كە هیچ درەخت و پەناوسێبەرێكی لێ نەبوو، لە حاڵێكدا كە ئەویش نەخۆش بوو، ئنجا ئایا چەند لە زاری ماسییەكەدا ماوەتەوە؟ یان بە پێی ڕای زۆرێك زانایان لە سكی ماسییەكەدا ماوەتەوە؟ كە من پێم وانیە چووبێتە نێو سكی ماسییەكەوە، هەرچەندە ئەگەر چووبێتە نێو سكیشی، خوا هەر دەتوانێ بیپارێزێ و لە

زاری نەهەنگەکەدا پاراستنیشی، هەر موعجیزە بووە، بەڵام بۆیە ناڵێم: چۆتە نێو سکی، چونکە خوا بە خۆڕایی وشەی (إِلْتَقَمَ)ی بەکار نەهێناوە: ﴿ فَٱلْتَقَمَهُ ٱلْحُوتُ ﴾، (إِلْتَقَمَهُ) واتە: کردیە لوقمەو بە دەمیەوە گرت، بە زاری خۆیەوە گرت، وەك لە کاتی گێڕانەوەی بەسەرهاتی یونوسیشدا ﷺ باسمان کردوە.

﴿ وَأَنۢبَتْنَا عَلَيْهِ شَجَرَةً مِّن يَقْطِينٍ ﴾، {لەبەر ئەوەی نەخۆش بوو} درەختێکی، بڕکە کوولەکەیەکمان لەسەر ڕواند، ﴿ وَأَرْسَلْنَٰهُ إِلَىٰ مِاْئَةِ أَلْفٍ أَوْ يَزِيدُونَ ﴾، دوای ئەوەی چاك بۆوەش، ناردمان بۆ لای سەد هەزار (١٠٠,٠٠٠) کەس یاخود لەوەش زیاتر بوون، ئنجا یەکێك بۆی هەیە بڵێ: باشە خوا ﷻ نەیدەزانی چەندە زیاد بوون؟ یان چەند بوون بە وردیی؟ وەڵامەکەی ئەوەیە کە: ئەو سەد هەزارە بەردەوام لێیان مردوەو لێیان زیاد بووە، بەڵام دیارە هاوکۆ (معدل)ی گشتیی مرۆڤەکان، بەرەو زیاد بوونە، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ مِاْئَةِ أَلْفٍ أَوْ يَزِيدُونَ ﴾. سەد هەزار بەڵکو زیاتریش دەبوون.

﴿ فَـَٔامَنُوا۟ ﴾، ئەوانیش بڕوایان پێهێنا، ﴿ فَمَتَّعْنَٰهُمْ إِلَىٰ حِينٍ ﴾، ئێمەش بەهرەمەندمان کردن، تاکو کاتێکی دیاریکراو، واتە: ژیاندمانن و لە ژیاندا هێشتماننەوە تاکو ماوەیەك، واتە: ئەو کاتەی کە بە شێوەی مردنی ئاسایی ئەو خەڵکە، ئەو جیلە لە بەشەر بڕاوەتەوە، نەك بە بەڵایەکی ناگاهان و، سزایەکی کتوپڕ بیانفەوتێنین.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**چاکەکردنی خوا لەگەڵ مووساو هاروونی برای (عَلَيْهِمَا الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)و گەلەکەیان دا و، کتێب پێدانیان و دەربازکرانیان لە فیرعەون و، ناوبانگی باش بڵاوکردنەوەیان، بە چاکەکارو بڕوادار ناوزەند کردنیان:**

خوا ﷻ دەفەرمویٚ: ﴿ وَلَقَدْ مَنَنَّا عَلَىٰ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿١١٤﴾ وَنَجَّيْنَٰهُمَا وَقَوْمَهُمَا مِنَ ٱلْكَرْبِ ٱلْعَظِيمِ ﴿١١٥﴾ وَنَصَرْنَٰهُمْ فَكَانُوا۟ هُمُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴿١١٦﴾ وَءَاتَيْنَٰهُمَا ٱلْكِتَٰبَ ٱلْمُسْتَبِينَ ﴿١١٧﴾ وَهَدَيْنَٰهُمَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴿١١٨﴾ وَتَرَكْنَا عَلَيْهِمَا فِى ٱلْءَاخِرِينَ ﴿١١٩﴾ سَلَٰمٌ عَلَىٰ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿١٢٠﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٢١﴾ إِنَّهُمَا مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٢٢﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە بڕگەدا:

**١)- ﴿ وَلَقَدْ مَنَنَّا عَلَىٰ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴾، بە دڵنیاییش چاکەمان لەگەڵ مووساو هاروون** دا کرد، (و)ی (ولقد) بۆ بادانەوەو گێڕانەوەیە، ئەم بەسەرهاتە دەگێڕێتەوە بۆ سەر باس و خواسەکانی کە ڕابردوون، وەك پێشتریش زۆرجار گوتوومانە: (لَقَد) بە (ل)ی سوێند خواردن و (قد)ی دڵنیاکردنەوە، یانی: بە جەختکردنەوەو بە دڵنیاکردنەوە، ئێمە چاکەمان لەگەڵ مووساو هاروون دا کرد، ئەمە بۆ بە درۆخستنەوەی کەسانێکە کە بڕوایان بە پێغەمبەرایەتیی مووساو هاروونی برای (عَلَيْهِمَا الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، نەبووە، بۆیە خوا دەفەرمویٚ: بە دڵنیایی و بە جەختکردنەوە، ئێمە چاکەیەکی گەورەمان لەگەڵ مووساو هارووندا کرد {کە پلەی پێغەمبەرایەتییمان پێدان} چونکە: (الْمِنَّةُ: النِّعْمَةُ الثَّقِيلَة) میننەت واتە: چاکەیەکی قورس، ئنجا چاکەی گەورەو گرانیش بە ڕەهایی پێغەمبەرایەتییەو، هیچ چاکەو نیعمەتێك لەوە گەورەو قورسترو گرنگترنیە لە ژیانی بە

شەردا، زانایانیش وەك بنەمایەك گوتوویانە: **(المتبادِرُ إلى الذهن عند الإطلاق هو الفرد الكامل)** ئەوەی لە كاتی باسكردنی ڕەهادا دێتە زەینەوە، تاكی تێرو تەواوی ئەو ڕەهایەیە.

٢)- ﴿وَنَجَّيْنَٰهُمَا وَقَوْمَهُمَا مِنَ ٱلْكَرْبِ ٱلْعَظِيمِ﴾، هەروەها خۆیان و گەلەكەیانمان دەرباز كرد لە مەینەتییەكی گەورە، لە خەم و خەفەتێكی مەزن، لە كارەساتێك كە پێشترە باسمان كرد لە ژێر سایەی شوومی حوكمڕانیی فیرعەوندا، بەنوو ئیسرائیل كۆیلە ئاسا ژیاون و، خاوەن هیچ شتێكی خۆیان نەبوون.

٣)- ﴿وَنَصَرْنَٰهُمْ﴾، سەریشمانخستن، بەسەر فیرعەون و دارودەستەكەیدا سەرمان خستن و پشتمان گرتن و هاوكاریان بووین.

٤)- ﴿فَكَانُواْ هُمُ ٱلْغَٰلِبِينَ﴾، ئنجا سەرەنجام هەر ئەوان (مووساو هاروون و گەلەكەیان) زاڵبوون، چونكە (هُم) كە پێی دەگوترێ: ڕاناوی جیاكردنەوە **(ضمير الفصل)** بۆ كورتهەڵێنانی مانایە لەوەدا كە باسكراوە، **(أَي: الغَالِبُون كَانُوا هُم فَقَط فِي كُلِّ الأَحْيَانِ، إِذِ الغَالِبُ قَدْ يُغلَبُ فِي بَعْضِ الجولات)** بۆیە دەفەرموێ: ﴿فَكَانُواْ هُمُ ٱلْغَٰلِبِينَ﴾، چونكە لە سەرەتا تاكو كۆتایی هەر ئەوان زاڵبوون، چونكە جاری وایە كەسێك كە زاڵ دەبێ لە جەنگێكدا، بەڵام پێشتر ڕەنگە لە هەندێك لە قۆناغاندا تێشكابێ، بەڵام سەرەنجام سەركەوتووبێ، بەڵام ئەوان لە سەرەتا تاكو سەرەنجام، هەر سەركەوتوو بوون بەسەر دوژمن و نەیارەكانیاندا.

٥)- ﴿وَءَاتَيْنَٰهُمَا ٱلْكِتَٰبَ ٱلْمُسْتَبِينَ﴾، هەروەها كتێبی زۆر ڕوون و ڕۆشنمان پێدان، كتێبە زۆر ڕۆشن و ڕوونەكەش تەوڕات بووە، چونكە **(المُستَبِين: القَوِيُّ الوضوح، فالسِّينُ وَالتَّاءُ لِلمُبالَغة، اسْتَبانَ الشَّيءُ: ظَهَرَ ظُهُوراً شَدِيدَاً)**، **(المُستَبِين)** واتە: زۆر ڕوون و ئاشكرا، چونكە **(سين و تاء)** بۆ زێدەڕۆیین، دەگوترێ: **(بانَ الشَّيءُ وَتَبَيَّنَ وَاسْتَبانَ)**، **(اسْتَبانَ)** واتە: زۆر بە چاكیی دەركەوت.

٦)- ﴿وَهَدَيْنَٰهُمَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ﴾، ڕێنماییشمان كردن بۆ ڕاستە شەقام، كە مەبەست پێی ئەو ئایین و بەرنامە هەقەیە، كە خوا ﷻ هەم بۆ ئەوانی ناردوە، هەم بۆ سەرجەم

پێغەمبەرانی (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، ناردوە کە لە بەندایەتیی کردن بۆ خواو، ملکەچ بوون بۆ خواو، گرتنی ڕێبازو بەرنامەی خوادا ﷻ، بەرجەستە دەبێ.

٧)- ﴿ وَتَرَكْنَا عَلَيْهِمَا فِي الْآخِرِينَ ﴾، لە نێو ئەوانی دیکەش دا لەسەریان بەجێمان هێشت، واتە: ستایش و مەدح و سەنامان بۆ بڵاوکردنەوە بە نێو خەڵکدا.

٨)- ﴿ سَلَامٌ عَلَىٰ مُوسَىٰ وَهَارُونَ ﴾، خێرو خۆشیی و سەلامەتیی لەسەر مووساو هاروون، دەشکونجێ: ﴿ سَلَامٌ عَلَىٰ مُوسَىٰ وَهَارُونَ ﴾، (مَفْعُول بِه في محل النَّصب) بێ، بەرکار بێ لە شوێنی (نصب)دا بێ، واتە: سەلام کردمان لەسەر مووساو هاروون لە لایەن خواوە ﷻ لە نێو ئەوانی دیکەدا بۆ بەجێهێشتن.

٩)- ﴿ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ ﴾، ئێمە بەو شێوەیە پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە، واتە: وامەزانن کە ئەوە تەنیا بۆ مووساو بۆ هاروون (عَلَيْهِمَا الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) بووە، هەر کەسێکی دیکەش چاکەکار بێ وەك وان، هەر ئەوە پاداشتیەتی و، هەر کەسێك وەك وانیش بێ، وەك وان مامەڵەی لەگەڵدا دەکەین.

١٠)- ﴿ إِنَّهُمَا مِنْ عِبَادِنَا الْمُؤْمِنِينَ ﴾، بێگومان ئەو دووانە لە بەندە بڕوادارەکانمان بوون. ئنجا خوا ﷻ سەرنجمان ڕادەکێشێ کە ئەوانە بە هۆی ئیمانەوە بەندایەتییان بۆ خوا کردوەو، بە هۆی بەندایەتییەوەش بوونە چاکەکارو، لە ئەنجامی چاکەکارییدا، یاخود لە ئەنجامی ئەو سێ سیفەتەدا کە: هەم بەندەی خوا بوون، هەم بڕوادار بوون، هەم چاکەکار بوون، خوا ﷻ بەو شێوەیە مامەڵەی لەگەڵدا کردوون، کەواتە: هەر کەسیکی دیکەش دەیەوێ وەك مووساو هاروون، خوا ﷻ مامەڵەی لەگەڵدا بکات، با وەك ئەوان بکات، واتە: ئەمە یاسایەکی گشتیی خوایە بۆ مامەڵە کردنی لەگەڵ بەندەکانیدا، بێگومان خوا ﷻ هەرکەسە بەو شێوەیە کە شایستەیەتی مامەڵەی لەگەڵدا دەکات و، جۆری سیفەتەکانی مرۆڤ و جۆری حاڵەتی مرۆڤە، کە شێوەی مامەڵەی خوا ﷻ دیاریی دەکات، چاك بە، خوا چاك مامەڵەت لەگەڵدا دەکات و، خراپ بە، خوا وەك خراپێك مامەڵەت لەگەڵدا دەکات و سزات دەدات.

**مەسەلەی دووەم:**

**ئیلیاسیش لە نێردراوانی خوا بوو بۆ لای گەلەکەی، کە ئامۆژگاریی کردن پارێزکار بن و بەعل نەپەرستن لە جیاتی خوای بەدیهێنەرو، سەرەنجام سزای ئامادەکران بۆ دۆزەخیان لەسەر چەسپاو، ئیلیاسیش خوا سەلام و ستایشی خۆی بۆ بڵاو کردەوە، بە هۆی ئیمان و چاکەکارییەوە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّ إِلْيَاسَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ ﴿١٢٣﴾ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٢٤﴾ أَتَدْعُونَ بَعْلًا وَتَذَرُونَ أَحْسَنَ الْخَالِقِينَ ﴿١٢٥﴾ اللَّهَ رَبَّكُمْ وَرَبَّ آبَائِكُمُ الْأَوَّلِينَ ﴿١٢٦﴾ فَكَذَّبُوهُ فَإِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ ﴿١٢٧﴾ إِلَّا عِبَادَ اللَّهِ الْمُخْلَصِينَ ﴿١٢٨﴾ وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي الْآخِرِينَ ﴿١٢٩﴾ سَلَامٌ عَلَىٰ إِلْ يَاسِينَ ﴿١٣٠﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ ﴿١٣١﴾ إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُؤْمِنِينَ ﴿١٣٢﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە یازدە بڕگەدا:

**١)- ﴿ وَإِنَّ إِلْيَاسَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ ﴾، بە دڵنیایی ئیلیاسیش لە ڕەوانەکراوان بوو.**

**وشەی (إلیاس) هەروەك بە (إلیاس) خوێندراوەتەوە، هەروەها بە: (إِنِ الْيَاسَ) واتە: بە بێ دەرخستنی هەمزەکە، بە (همزة الوصل)یش خوێندراوەتەوە، هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ئیلیاس ئەو پێغەمبەرەیە کە لە پەیمانی کۆندا بە (ئیلیاء) ناوی هێنراوە لە پێغەمبەرانی بەنوو ئیسرائیل، کە دەگونجێ وابێ و، دەشگونجێ وا نەبێ، لێرەدا خوا ﷻ کە باسی ئیلیاس دەکات، بێگومان پێشێ خوا باسی سێ لە پێغەمبەرانی خاوەن بەرنامەی کرد: نووح، ئیبراهیم و مووسا (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، چونکە ئیسماعیل و ئیسحاق کوڕی ئیبراهیمن و، هاڕوونیش برای مووسا بووە، لە دوای ئەوەی کە خوا باسی سێ لە پێغەمبەرانی خاوەن بەرنامەی کرد، ئنجا باسی سێ لە پێغەمبەران دەکات، کە بەرنامەی سەربەخۆیان نەبووە: ئیلیاس و لووط و یونوس (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ).**

٢)- ﴿ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ أَلَا تَتَّقُونَ ﴾، یاد بکەوە! کاتێك ئیلیاس بە گەلەکەی خۆی گوت: ئایا پارێز ناکەن؟ (أَلا) هەمزەکەی بۆ پرسیار کردنی نکووڵیلێکەرانەیە، واتە: بۆچی پارێز ناکەن؟ ڕەخنەتان لێ دەگرم کە پارێز ناکەن، پارێز لە چی ناکەن؟ بەرکار (مفعول بە)ەکەی فڕتێندراوە واتە: پارێز ناکەن لە لێپرسینەوەی پەروەردگارتان، پارێز ناکەن لە سزای خوا، پارێز ناکەن لە شیرك و کوفرو گوناهو تاوان و لادان.

٣)- ﴿ أَتَدْعُونَ بَعْلًا ﴾، ئایا لە بەعل دەپاڕێنەوە؟

(بَعْل) (اسمُ صَنَمِ الكَنْعانِيِّنَ، وَهُوَ أَعْظَمُ أَصْنامِهِم، وَهُوَ رَمْزٌ عَلَى الشَّمْسِ رَمْزُ الذَّكَر، وفِي مقابلـه القَمَـرُ رَمْـزُ الأُنثـى، وَكانـت عِنـدَ الفينيقيـين تُسَـمَّى العَشْـتاروت)، هەندێـك لـە مێژوونووسـان دەڵێـن: بەعـل نـاوی بتـی هـەرە گـەورەی کەنعانییـەکان بـووە، کـە ڕەمـزو هێـما بـووە بـۆ خـۆر و خـۆر ڕەمـزی نێرینـە بـووەو، لـە بەرانبەریـدا مانـگ ڕەمـزی مێینـە بـووە، لـە لای فینیقییـەکان بـە بەعلیـان گوتـوە: عەشـتاڕووت.

٤)- ﴿ وَتَذَرُونَ أَحْسَنَ ٱلْخَٰلِقِينَ ﴾، وازیش لە باشترینی بەدیهێنەران دێنن (کە خوایە ﷻ).

٥)- ﴿ ٱللَّهَ رَبَّكُمْ وَرَبَّ ءَابَآئِكُمُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴾، خوا پەروەردگاری خۆتان و پەروەردگاری باب و باپیرانی یەکەمتان.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَتَذَرُونَ أَحْسَنَ ٱلْخَٰلِقِينَ ﴾، دوای: ﴿ أَحْسَنَ ٱلْخَٰلِقِينَ ﴾، دەفەرمـوێ: (أللـه)، کـە جێـدار (بدل)یەتـی یاخـود: ڕوونکردنەوەیـەتی (أَحْسَـنُ الخَالِقِين) کێیـە؟ خوایـە، (أللـهَ) خوێندراویشـەتەوە: (أللـهُ)، (أللـه رَبُّكُـمْ وَرَبُّ ءَابَائِكُـمُ الأَوَّلِين)، کـە ئەگـەر بفەرمـوێ: (أللـهَ) مانـای وایـە ئەمە (بَـدَل)ە بـۆ (أَحْسَنَ الخَالِقِين)، بـەڵام ئەگـەر (أللـهُ رَبُّكُـمْ وَرَبُّ ءَابَائِكُـمُ الأَوَّلِين) بـێ، ئـەم ڕسـتەیە پێـی دەگوتـرێ: ڕسـتەیەکی دەسـتپێکردن (جملـة إبتدائيـة).

(تَذَرُونَ) یانی: (تَدْعُونَ: تَتْرُكُونَ) واتە: واز دێنن، پشتگوێ دەخەن.

٦)- ﴿ فَكَذَّبُوهُ فَإِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ ﴾، بە درۆیان داناو بە دڵنیایی ئەوان لە ئامادەکراوانن، واتە: لە ئامادەکراوان دەبن لە ڕۆژی دواییدا بۆ سزا، پەلکێش دەکرێن بۆ سزا.

٧)- ﴿ إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴾، جگە لە بەندە هەڵبژێردراوەکانی خوا، خوێندراویشەتەوە: (الْمُخْلِصِين) واتە: ئەو بەندانەی خۆیان بۆ خوا ساغ کردبۆوە.

٨)- ﴿ وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي ٱلْآخِرِينَ ﴾، لە نێو ئەوانی دیکەش دا، لە نێو گەلانی دیکەش دا، لەسەریمان بەجێهێشت مەدح و ستایشی چاك، یاخود: ﴿ سَلَٰمٌ عَلَىٰٓ إِلْ يَاسِينَ ﴾ دەبێتە بەرکار (مفعول بە)ی (ترکنا).

٩)- ﴿ سَلَٰمٌ عَلَىٰٓ إِلْ يَاسِينَ ﴾، سەلام لەسەر ئیلیاسین، بێ، یاخود: سەلام لەسەر ئیلیاسینمان لەسەر بەجێهێشت، (إِلْ يَاسِين)یش خوێندراوەتەوە، کە هەر ئیلیاسە، بەڵام لێرەدا بە (إِلْ يَاسِين)، بەو ناوەش بانگکراوە، هەروەها خوێندراویشەتەوە: (آلِ يَاسِين) واتە: شوێنکەوتووانی یاسین، کە بڕوایان پێ هێناوە، وەك گوتراوە: (آلُ مُحَمَّدٍ كُلُّ تَقِيٍّ) ئالی موحەممەد هەر پارێزکارێکە.

١٠)- ﴿ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾، ئێمە بەو شێوەیە پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە.

١١)- ﴿ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، بێگومان ئەو لە بەندە بڕوادارەکانمان بوو، بە هۆی ئیمان و بڕوایەکەیەوە، ئەهلی عیبادەت بوو بۆ خوا، پاشان بە هۆی ئەوەشەوە چاکەکار بوو، سەرەنجام شایستەی ئەوە بوو خوا ﷻ بەو شێوەیە لە فریای بێ و، دوژمن و نەیارەکانی پەلکێشی دۆزەخ بکات، ئەویش خوا سەلامی لێ بکات و ناوو ناوبانگی چاکی بڵاوبکاتەوە.

**دوو وردەکاریی لەبارەی ئەم مەسەلەی دووەمەوە:**

**یەکەم: (محمد الطاهر بن عاشور) لە تەفسیرەکەی خۆی (التحریر والتنویر)[1]دا،** هەندێك قسەی هێناون دەربارەی ئیلیاس ﵇، هەڵبەتە زیاتر پشتی بە کتێبی خاوەن کتێبان و، بە هەندێك سەرچاوەی دیکە، بەستوە، پێم وایە تیشکێکی زیاتر دەخەنە سەر ژیان و بەسەرهاتی ئیلیاس ﵇:

لە تەفسیری ئەوەدا کە دەفەرموێ: ﴿فَكَذَّبُوهُ فَإِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ﴾، دەڵێ: (**فَكَذَّبُوهُ لَمْ يُطِيعُوهُ تَمَلُّقاً لِمُلُوكِهِمْ الَّذِينَ أَجَابُوا رَغْبَةَ نِسَائِهِم الْمُشْرِكَات لإقَامَةِ هَيَاكِلَ للأَصْنَامِ، فَإِنَّ إِزَابِيلَ ابْنَةَ مِلِكِ الصِّيدُونيِّينَ زَوْجَةُ أَخَابْ مَلِكِ إِسْرَائِيل، لَمَّا بَلَغَهَا مَا صَنَعَ إِلْيَاسُ بِسَدَنَةِ بَعْل ثَأْراً لِمَنْ قَتَلَتْهُ إِزَابِيل مِنْ صَالِحِيّ إِسْرَائِيلْ، أَرْسَلَتْ إِلى إِلْيَاس تَتَوَعَّدُهُ بِالْقَتْلِ، فَخَرَجَ إِلى مَوْضِعِ اسْمُهُ بِئْرُ سَبْعٍ، ثُمَّ سَاحَ فِي الأَرْضِ وَسَأَلَ اللَّهَ أَنْ يَقْبِضَهُ إِلَيْهِ، فَأَمَرَهُ بِأَنْ يَعْهَدَ إِلَى صَاحِبِهِ الْيَسَع بِالنُّبُوَّةِ مِنْ بَعْدِهِ، ثُمَّ قَبَضَهُ اللَّهُ إِلَيْهِ فَلَمْ يَعْرِفْ مَكَانَهُ أَحَدٌ.**

**وَفِي كِتَابِ (إِيلِيَاء) مِنْ كُتُبِ الْيَهُودِ: أَنَّ اللَّهَ رَفَعَهُ إِلى السَّمَاءِ فِي مَرْكَبَةٍ يَجُرُّهَا فَرَسَانِ، وَأَنَّ الْيَسَعَ شَاهَدَهُ صَاعِداً، وَلِذَالِكَ كَانَ بَعْضُ السَّلَفِ يَقُولُ: إِنَّ إِلْيَاسَ هُوَ إِدْرِيسَ الَّذِي قَالَ اللَّهُ فِيهِ:** ﴿وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ إِدْرِيسَ إِنَّهُ كَانَ صِدِّيقًا نَّبِيًّا ۝٥٦ وَرَفَعْنَاهُ مَكَانًا عَلِيًّا ۝٥٧﴾ **مريم).**

**واتە:** گەلەکەی (ئیلیاسیان) بە درۆ داناو فەرمانبەرییان نەکرد، وەك ماستاو کردن بۆ پادشاکانیان، کە ئەوانیش وەڵامگۆی ئارەزووی ئافرەتە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانیان بوون، کە چەند پەیکەرێك دابنێن بۆ بتەکانیان، چونکە ئیزابیل کچی پادشای صیدۆنییەکان، (صیدۆنییەکان گەلێك بوون لە فەڵەستین) ژنی ئەخاب، پادشای ئیسرائیل کاتێك هەواڵی ئەوەی پێگەیشت کە ئیلیاس چی

---

(١) ج ٢٣، ص ١٦٩.

لـە بتەوانەکانـی بەعـل کـردوە {(سَـدَنَة) کـۆی (سَـادِن)ە، واتـە: بتـەوان، ئەوانـەی سەرپەرشـتیی صەنـەم و بتێـك دەکـەن، ئیلیـاس دەبـێ سـزای بتەوانەکانـی بەعلـی دابـێ} وەك تۆڵەسـتاندنەوە لـە بـری ئەوانـەی کـە ئیزابیـل لـە پیاوچاکانـی ئیسـرائیل کوشـتوونی، ئـەو ئیزابیلـە، وەڵام دەنێـرێ بـۆ ئیلیـاس و هەڕەشـەی لـێ دەکات کـە دەیکـوژێ، ئەویـش دەچێتـە شـوێنێك بـە نـاوی (بئر سبع)، دوایی بـە زەویـدا دەڕوات و، لـە خـوا دەپارێتـەوە کـە بیباتـەوە لای خـۆی (واتـە: ڕووحـی بکێشـێ و کۆتایـی پـێ بێنـێ)، خـوا ﷻ فەرمانـی پـێ دەکات کـە هاوەڵەکـەی (الیسـع) ڕاسـپێرێ بـە پێغەمبەرایەتیـی، {کـە ئـەوە بـۆ خـۆی تەعبیرێکـی سـەیرە! چونکـە پێغەمبەرایەتیـی، مـرۆڤ ناتوانـێ کەسـی پـێ ڕاسـپێرێ و لـە خـواوە دەبەخـشرێ، بەهەرحـاڵ لـەو سـەرچاوەیەدا وا هاتـوە، ڕەنگـە مەبەسـت پێـی ئـەوە بـێ، وەك جێنشـین و جێگرێکی خـۆی بـێ} دوایـی خـوا ﷻ ئیلیـاس دەمرێنـێ و، هیـچ کەسـیش شـوێنەکەی نازانـێ.

(محمـد الطاهـر بـن عاشـور) دیاریـی نەکـردوە ئەمـەی لـە کوێـوە هێنـاوە! بـەڵام بـۆ ئـەوەی دوایـی دەڵـێ: (وفِي كِتَابِ (إِيلْيَاء)) کـە دیـارە ئەمـەی لـە کتێبـی (ئیلیـاء)ەوە هێنـاوە، کـە لـە کتێبەکانـی پەیمانـی کۆنـەو، لـە کتێبەکانـی جوولەکەکانـدا هاتـوە کـە خـوا ئیلیاسـی بـەرز کردۆتـەوە بـۆ ئاسـمان بـە سـواری مەرکەبەیـەك {کـە ئـەو کات وەك عارەبانەیـەك بـووە، دوو ئەسـپ ڕایانکێشـاوە} ئەلیەسـەع بینیویەتـی کـە بـەو شـێوەیە بـەرز کراوەتـەوە بـە سـواری ئـەو عارەبانەیـە کـە دوو ئەسـپ ڕایانکێشـاوە {وای هاتۆتـە بەرچـاو} بۆیـە هەندێـك لـە زانایانـی پێشـین گوتوویانـە: ئیلیـاس بریتیـە لـە ئیدریـس ﷺ کـە خـوا لـە بارەیـەوە دەفەرمـوێ: ﴿وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ إِدْرِيسَ إِنَّهُ كَانَ صِدِّيقًا نَّبِيًّا ﴿٥٦﴾ وَرَفَعْنَاهُ مَكَانًا عَلِيًّا ﴿٥٧﴾﴾مریـم، واتـە: یـادی ئیدریـس بکەوە کـە صیدیـق بـوو (واتـە: زۆر ڕاسـتبێژبوو، یـان: زۆربـە ڕاسـتدانەری پەیامـی خـوا بـوو)، پێغەمبەریـش بـوو {هـەواڵ پێـدراوو هەواڵپێـدەر بـوو} و بـۆ شـوێنێکی بڵێنـد بەرزمـان کـردەوە.

دووەم: کە دەفەرمویّ: ﴿ أَتَدْعُونَ بَعْلًا وَتَذَرُونَ أَحْسَنَ الْخَالِقِينَ ﴾، زانایان لەو بارەوە گوتوویانە: لە جیاتی ئەوەی بفەرمویّ: ﴿ أَتَدْعُونَ بَعْلًا وَتَذَرُونَ أَحْسَنَ الْخَالِقِينَ ﴾، دەشکونجا خوا بفەرمویّ: (أَتَدْعُونَ بَعْلاً وَتَدَعُونَ أَحْسَنَ الْخَالِقِين) کە ئەو کاتە (جِناس) دروست دەبوو، ئەویش یەکێکە لە توخمەکانی ڕەوانبێژیی، یانی: (تَدْعُونَ بَعْلاً) لەگەڵ (تَدَعُونَ أَحْسَنَ الْخَالِقِين)، پێکەوە (جِناس)ێکی بێژەییان لە بەیندا دروست دەبوو، بەڵام ئایا حیکمەتی چییە کە خوا ﷻ وشەی (تَدَعُونَ)ی بەکارنەهێناوەو (تَذَرُونَ)ی بەکارهێناوە، زۆر وردەکارییان باس کردوون، بەڵام پێم وایە دووانیان سەرەکیین:

أ- (تَذَرُونَ) یانی: (تَتْرُكُونَ الْمَتْرُوكَ وَتُعْرِضُونَ عَنْهُ) بە یەکجاریی وازی لیّ دێنن و پشتی تێدەکەن، بەڵام (تَدعون) یانی: (تَتْرُكُونَهُ مُؤَقَّتاً) بە شێوەیەکی کاتیی وازی لیّ دێنن، (دَعْهُ) یانی: ئێستا لێیگەڕێ، بەڵام خوا ﷻ کە ئەوانی دواندوە، لەسەر زمانی ئیلیاس ؏ مەبەست ئەوە نەبووە ئیلیاس بڵێ: ئێوە بە شێوەیەکی کاتیی وازتان لە خوا هێناوە، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ وَتَذَرُونَ أَحْسَنَ الْخَالِقِينَ ﴾، چونکە یەکجاریی وازیان لە باشترین بەدیهێنەر هێناوە کە بیپەرستن و، ڕوویان کردۆتە بەعل، بۆیە (تَذَرُونَ) بەکارهاتوە، چونکە یەکجاریی وازیان لە خوا هێناوە، نەك (تَدَعُونَ) کە یانی: بە شێوەیەکی کاتیی وازتان لێهێناوە.

ب- (جِناس) لەو جوانییانەیە کە دەبێ ئەو قسەیە لە حاڵێکدا کرابێ، حاڵی ڕەزامەندیی بێ، نەك حاڵی توورەبوون و غەزەبگرتن، واتە: (جِناس) کاتێك ڕەچاو دەکریّ، ئەو قسەیەی کە دەکریّ، لە حاڵەتی ڕەزامەندیی و خۆشیی و شادیی دا بێ، نەك حاڵەتی توورەبوون و سامناك، لێرەش کە دەفەرمویّ: ﴿ أَتَدْعُونَ بَعْلًا وَتَذَرُونَ أَحْسَنَ الْخَالِقِينَ ﴾، ئەمە لێرەدا حاڵەتی هەڕەشەو توورەبوونی خوایەو، حاڵەتی شکاندنی قەدەغەیەکی گەورەیە، کە بریتیە لە سنوورشکێنیی بەرەو مەیدانی خوا بەیەکگرتن و ڕووکردنە بەرەو شیرك، بۆیە ڕەچاو کردنی ئەو (جِناس)ە لێرەدا گونجاو نیە، ئەمە (سعد الله) یەکێك لە پەراوێز نووسەکانی تەفسیری (البیضاوي)یە، ئەوەی هێناوە، وەك خاوەنی (التحریر والتنویر)[1] لێی خواستۆتەوە.

---

(١) ج ٢٣، ص ١٦٨.

**مەسەلەی سێیەم:**

**لووطیش لە نێردراوانی خوا بوو بۆ لای خەڵکەکەی، بەڵام بە درۆیان داناو، خواش هەموویانی قڕەبڕ کرد، جگە لە نیزیکانی و خێزانەکەی، دەربازی کردن بێجگە لە ژنەکەی، شوێنەواری ئەو خەڵکەشی کردە مایەی دەرس و پەند، بۆ ڕێبوارانێك كە بەو دەڤەرەدا ڕەت دەبن:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّ لُوطًا لَّمِنَ الْمُرْسَلِينَ ﴿١٣٣﴾ إِذْ نَجَّيْنَاهُ وَأَهْلَهُ أَجْمَعِينَ ﴿١٣٤﴾ إِلَّا عَجُوزًا فِي الْغَابِرِينَ ﴿١٣٥﴾ ثُمَّ دَمَّرْنَا الْآخَرِينَ ﴿١٣٦﴾ وَإِنَّكُمْ لَتَمُرُّونَ عَلَيْهِم مُّصْبِحِينَ ﴿١٣٧﴾ وَبِاللَّيْلِ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٣٨﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ وَإِنَّ لُوطًا لَّمِنَ الْمُرْسَلِينَ ﴾، بە دڵنیایی لووطیش لە ڕەوانەکراوان بوو، لێرە (و)ەکە بۆ بادانەوەو گێڕانەوەی ئەم باس و خواسەیە، بۆ سەر باس و خواسەکانی پێشێ، (إِنَّ) بۆ جەختکردنەوەو داکۆکییکردنە، جەختکردنەوەکەش ڕووی لە کەسانێکە نکووڵییان لەوە کردبێ، کە لووط لە ڕەوانەکراوان و پێغەمبەرانی خوا بێ، واتە: بە دڵنیایی لووطیش لە ڕەوانەکراوان و نێردراوانی خوا بوو، خوا ﷻ لێرەدا زۆر بە کورتیی و پوختیی و، تەنیا شوێنی مەبەست دێنێ، کە بریتیە لە دەرباز کردنی لووط ﷺ و، لە بەین بردنی گەلە ڕەوشت نزمەکەی، بەڵام لە شوێنەکانی دیکەی قورئاندا، بەسەرهاتەکەی بەدرێژیی هاتوە.

٢)- ﴿ إِذْ نَجَّيْنَاهُ وَأَهْلَهُ أَجْمَعِينَ ﴾، یاد بکەوە! کاتێك خۆی و نیزیکانی و خێزانەکەیمان هەموویان دەرباز کرد، (أَهْلَهُ: أَهْلُ الْبَيْتِ مَنْ يَسْكُنُونَ الْبَيْتَ مَعَ الرَّجُل) (أَهْلَهُ) واتە: خاوو خێزانەکەی، چونکە (أَهْلُ الْبَيْت) ئەوانەن کە لەگەڵ پیاودا لە ماڵێکدان.

٣)- ﴿ إِلَّا عَجُوزًا فِي الْغَابِرِينَ ﴾ [هەموو خێزانەکەیمان دەرباز کرد] جگە لە پیرەژنێك لەوانەی کە مانەوە، یاخود: لەوانەی تێپەڕین و ڕابردن و بەسەر چوون، وشەی (عَجُوز)

مەبەست پێی ژنەکەی لووطە ، کە دیارە پیرەژنێك بووە، تەمەنی هەبووە، (فِي الْغَابِرِين) پێشتریش باسمان کرد، (غَابِر):

أ- هەم بە مانای (مَاضِي) دێ، تێپەڕیو، یانی: گوزەراو لە سزادا لەگەڵ فەوتاواندا تێپەڕی.

ب- هەم بە مانای (مَاكِث)یش دێ واتە: ماوە، کەسێك کە لەگەڵ فەوتاواندا مایەوە لە سزادا، چونکە لووط و کوڕو کچەکانی ڕۆیشتوون، بەڵام ئەو ئامادە نەبووە، خەڵکە ڕەوشت نزمەکەی بەجێ بێڵێ و، لەگەڵیاندا ماوەیەوەو لەگەڵیشیان دا فەوتاوە.

٤)- ﴿ ثُمَّ دَمَّرْنَا ٱلْـَٔاخَرِينَ ﴾، دوایی ئەوانی دیکەمان تارومار کردن، (تَدْمِير) زیاتر بۆ تێکدانی خانووبەرەو شتی ماددیی بەکاردەهێنرێ یانی: کاول کردن، تەخت کردن، لێرەش دا خوا ﷻ ئەوانەی چواندوە بە خانووبەرەیەك، کە تەخت دەبێ و کاول دەکرێ، دوایی ئەوانی دیکەمان هەموو یان لە بەین بردن.

٥)- ﴿ وَإِنَّكُمْ لَتَمُرُّونَ عَلَيْهِم مُّصْبِحِينَ وَبِٱلَّيْلِ ﴾، بە دڵنیایی ئێوەش دەمەو بەیانییان بە لایاندا ڕەت دەبن، هەروەها بەشەوێش. (الْمُصْبِحُ: الدَّاخِلُ فِي الصَّبَاحِ) (مُصْبِحِين) یانی: لە کاتێکدا ئێوە دەکەونە نێو بەرەبەیانەوە بە لایاندا ڕەت دەبن، شوێنەکەیان وایە، سەفەری ئێوە لای بەیانیان ئەوان دەگرێتەوە.

لێرەدا هەم بە (إِنَّ) جەختی کردۆتەوە، هەم بە (ل) (لام التأكيد) ئەوەش بۆ تۆخکردنەوەی ئەو مانایەیە کە تێیدا بەکارهاتوە، واتە: بە دڵنیایی ئێوە بە لایاندا ڕەت دەبن، بە لای شوێنەوارەکانیان دا، وەك لە سوورەتی (الحجر)دا دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّهَا لَبِسَبِيلٍ مُّقِيمٍ ﴿٧٦﴾ ﴾، واتە: بە دڵنیایی ئەو شوێنەوارە، لەسەر ڕێیەکی بەردەوامە، کە شەقامەڕێیە و خەڵکی پێدا ڕەت دەبێ، ئنجا وەك کاتی خۆی لە تەفسیری سوورەتی (الحجر)دا باسمان کرد، زۆربەی زانایان دەڵێن: مەبەست پێی دەریاچەی مردوویە، کە ئێستا دەکەوێتە نێوان ئوردن و فەڵەستینەوە.

﴿ وَإِنَّكُمْ لَتَمُرُّونَ عَلَيْهِم ﴾، بەدڵنیاییش ئێوە بە لایاندا ڕەت دەبن، (الْمُرُورُ: مُجَاوَزَةُ السَّائِرِ بِسَيْرِهِ شَيْئاً يَتْرُكُهُ، وَالْمُرَادُ مُرُورُهُم فِي السَّفَر)، (مُرُور): بریتیە لەوە کە

بابای ڕۆیشتوو لـە کاتـی ڕۆیشـتنەکەیدا، شـتێك بەجـێ بهێڵـێ، کـە لێـرەدا مەبەسـت بـەلادا ڕەتبوونـە لـە کاتـی سـەفەردا.

دوێندراوانـی کـە یەکەمجـار قورئانیـان بـۆ دابەزیـوە، ئـەوان یەکەمجـار مەبەسـتن، کـە خەڵکـی عـەرەب و خەڵـکی نیوەدوورگـەی عەرەبیـی بـوون، ئەگەرنـا ئێسـتاش هەر کەسـێکی دیکـە بـەو دەڤـەرەدا بـڕوات، بـە لایانـدا ڕەت دەبـێ بـە لای دەریاچـەی مـردوودا، عـەرەب بـێ، یـان غەیـری عـەرەب بـێ، لـە هـەر شـوێنێکی دنیـاوە هاتبـێ، بـەو دەڤـەرەدا بـڕوات، دەریاچـەی مـردوو کـە شـوێنەواری گەلـی لووطـە ﷺ، دەیبینـێ.

٦)- ﴿ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴾، ئایا نافامن؟ یانی: بیرناکەنەوەو هۆشتان ناخەنەکار، تاکو پەندوەربگرن؟

دیـارە هەمـزە (أ) کـە بـۆ پرسـیار لێکردنـی نکووڵییلێکەرانەیـە، واتـە: دەبووایـە بفامـن، بۆچـی نافامـن و عەقڵتـان بەکارناهێنـن؟ فامینەکـەش بـۆ ئەوەیـە پەندیـان لـێ وەربگـرن.

**مەسەلەی چوارەم و کۆتایی:**

**یونوسیش لە نێردراوانی خوا بوو، کاتێك لە گەلەکەی تووڕە بوو، سواری کەشتیی بوو، دوای تیروپشك کردن دۆڕاوو، فڕێدرایە دەریاوەو، نەهەنگ بە دەمیەوە گرت، بەڵام بە هۆی پەشیمانیی و خوا بەپاکگرتنیەوە، دەرباز بوو، فڕێدرایە شوێنێکی ڕووتەن، بڕکە کوولەکەیەکی لەسەر ڕواو، پاش چاکبوونەوەی، خوا بۆ لای سەد هەزار کەس، یان زیاتر ناردی و، بڕوایان پێ هێناو، بۆ ماوەیەکی کەم ژیاندن:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَإِنَّ يُونُسَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ ﴿١٣٩﴾ إِذْ أَبَقَ إِلَى الْفُلْكِ الْمَشْحُونِ ﴿١٤٠﴾ فَسَاهَمَ فَكَانَ مِنَ الْمُدْحَضِينَ ﴿١٤١﴾ فَالْتَقَمَهُ الْحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٌ ﴿١٤٢﴾ فَلَوْلَا أَنَّهُ كَانَ مِنَ الْمُسَبِّحِينَ ﴿١٤٣﴾ لَلَبِثَ فِي بَطْنِهِ إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٤٤﴾ فَنَبَذْنَاهُ بِالْعَرَاءِ وَهُوَ سَقِيمٌ ﴿١٤٥﴾ وَأَنْبَتْنَا عَلَيْهِ شَجَرَةً مِنْ يَقْطِينٍ ﴿١٤٦﴾ وَأَرْسَلْنَاهُ إِلَى مِائَةِ أَلْفٍ أَوْ يَزِيدُونَ ﴿١٤٧﴾ فَآمَنُوا فَمَتَّعْنَاهُمْ إِلَى حِينٍ ﴿١٤٨﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە بڕگەدا:**

**١)- ﴿وَإِنَّ يُونُسَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ﴾، بە دڵنیایی یونوسیش لە نێردراوان بوو، لە ڕەوانەکراوان بوو.**

لە کتێبەکاندا بە ناوی: (يُونُس بْن مَتَّى) هاتوە، بەڵام ناوەکەی بە عیبرانیی نووسراوە: (يُونَان بن أمتاي) کە گوایە خەڵکی فەلەستین بووەو، لە پێغەمبەرانی بەنوو ئیسرائیل بووە، نێردراوە بۆ لای خەڵکی نەینەوا (موصڵی ئێستا)، کە شارێکی مەزن بووە ئەو کاتە، لە سەردەمی ئاشوورییەکاندا، ئەویش لە سەرەتای سەدەی هەشتەمی پێش زایین دا بووە، بە پێی ڕای هەندێك لە مێژوونووسان.

**٢)- ﴿إِذْ أَبَقَ إِلَى الْفُلْكِ الْمَشْحُونِ﴾، یاد بکەوە! کاتێك ڕایکرد بۆ نێو کەشتییە پڕەکە، (إِذْ) لێرەدا (إبن عاشور) دەڵێ: (ظَرْفٌ مُتَعَلِّقٌ بِ (الْمُرْسَلِينَ) وَإِنَّهَا أُقِّتَتْ رَسَالَتُهُ بِالزَّمَنِ الَّذِي أَبَقَ**

فِيهِ إلى الفُلْكِ، لأنْ فِعْلَتُهُ تِلْكَ كَانت عِنْدَمَا أَمَرَهُ اللهُ بِالذَّهَابِ إلى نَيْنَوى لإبْلاغِ بَنِي إسْرَائِيلَ، وكانوا أكثر من مائة ألف، لأنَّ اللهَ غَضِبَ عَلَيْهِم لأنَّهُمْ انْحَرفُوا عَنْ شَرِيعَتِهِم)[1].

کـە دەفەرمـوێ: (إِذْ أَبَـقَ)، (إذ) بـۆ کاتـەو پەیوەسـتە بـە (الْمُرْسَلِينَ)ەوە: ﴿ وَإِنَّ يُونُسَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٣٩﴾ إِذْ ﴾، کەنگێ ڕەوانەکراو نێردرا؟ ﴿ إِذْ أَبَقَ إِلَى ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ ﴾، کاتێـك کـە ڕۆیشـت بـە تورەبوونـەوە، یـان بەهەڵاتـن و ڕاکردنـەوە بـەرەو کەشـتییە پڕەکـە، چـوو، ناردنـی یونـوس ﷺ و کرانـی بـە ڕەوانەکـراو بەسـتراوەتەوە، بـەو کاتـەوە کـە چۆتـە نێـو کەشـتییەکە، چونکـە سـواربوونی لـە کەشـتییەکەدا، کاتێـك بـوو کـە خـوا فەرمانـی پێکـرد بچـێ بـۆ لای خەڵکـی نەینـەوا، خەڵکـی نەینـەواش ئـەو کاتـە سـەد هـەزار (١٠٠,٠٠٠) کـەس زیاتـر لـە بەنـوو ئیسـڕائیلیی لـێ بـووە، [ئـەو کاتـە ئاشـوورییەکان لـە فەڵەسـتینەوە وەك دیـل هێناویانـن و لـەوێ نیشـتەجێیان کـردوون، لەوێـش و لـە زۆر شـوێنی دیکـەی عێـراق و لـە کوردسـتانیش] خـواش ﷻ یونوسـی نـاردوە بـۆ لایـان کـە پێیـان ڕابگەیەنـێ: خـوا لێیـان تـووڕە بـووە لەبـەر ئـەوەی لـە شـەریعەت و بەرنامەکـەی لایانـداوە.

ئـەوە ڕای (إبـن عاشـور)ە، بـەڵام ئایـا: ئـەو سـەد هـەزار (١٠٠,٠٠٠) کەسـە تەنیـا لـە بەنـوو ئیسـڕائیل بـوون، یاخـود: خەڵکـی دیکەشـیان لەگـەڵ بـووە، یاخـود: ئـەو خەڵکـە لـە بەنـوو ئیسـڕائیل هـەر نەبـوون؟! ئـەوە پێویسـتی بـە سـاغکردنەوەی مێژوویـی دەکات، گرنـگ ئەوەیـە، ئـەوەش ڕایەکـە لـە ڕایـەکان.

ئـەوەی پێویسـتە لێـرەدا باسـی بکەیـن: وشـەی (أَبَـقَ)، (مَصدرهُ إبـاق)، (إبـاق): (فِـرارُ العبـدِ مـن مَالِكـهِ) بریتیـە لـە ڕاکردنـی کۆیلـە لـە خاوەنەکـەی، بۆچـی خـوا ﷻ ئـەو وشـەیەی بـۆ بـەکار هێنـاوە؟ (أي: هَـرَبَ يُونُـسُ مِـنَ الْبَلَـدِ الَّـذِي كُلِّـفَ بِدَعْـوَةِ أَهْلِهِ إلى مَـكَانٍ آخَـر) لەبـەر ئـەوەی یونـوس ﷺ لـەو وڵاتـەی، لـەو شـارەی کـە فەرمانـی پێکـراوە خەڵکەکـەی ئـاگادار بکاتـەوەو بانگبـکات بـۆ لای خـوا، لـەوێ ڕایکـردوەو ئەوێـی بەجێهێشـتوە، چۆتـە شـوێنێکی دیکـە.

---

(١) التحرير والتنوير: ج ٢٣، ص ١٧٢.

خـواش ﷻ ئـەو هەڵوێسـتەی یونوسـی چوانـدوە بـە هەڵوێسـتی کۆیلەیەکـەوە، کـە لـە دەسـت خاوەنەکـەی ڕادەکات، بۆیـە دەفەرمـوێ: ﴿ إِذْ أَبَقَ إِلَى ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ ﴾، چونکـە (إبـاق) بـە مانـای ڕاکـردنی کۆیلـە دێ، ئنجـا بەجێهێشـتنەکەی یونـوس ﷺ بـۆ خەڵکـی نەینـەوا، دوایـی چـوونی بـۆ سـواربوونی کەشـتیی، کـە بـەو کەشـتییەش بـە دەریـادا بـڕوات، وادیـارە دەریـای سـپی نێوەڕاسـت بـووە، دوایـی بـڕوات بـۆ شـوێنێکی دیکـە، خـوا ﷻ ئـەو هەڵوێسـتەی ئـەوی چوانـدوە بـە هەڵوێسـتی کۆیلەیـەك کـە لـە دەسـت خاوەنەکـەی ڕادەکات، کـە بێگومـان شـتێکی هەڵـە دەکات، بـە نسـبەت ئـەو کاتـەوە کـە سیسـتمی کۆیلایەتیـی هەبـووە.

٣)- ﴿ فَسَاهَمَ فَكَانَ مِنَ ٱلْمُدْحَضِينَ ﴾، تیروپشکی کرد، بەڵام لە دۆڕاوان بوو، هەموویانی بە: (ف) هێناون: ﴿ فَسَاهَمَ فَكَانَ مِنَ ٱلْمُدْحَضِينَ ﴿١٤١﴾ فَٱلْتَقَمَهُ ٱلْحُوتُ ﴾، یانی: یەکسەر کە سواری کەشتییەکە بووە، زۆری پێ نەچووە، تیروپشکی کردوە لەگەڵ ئەوانی دیکەدا، کە دوایی باسی دەکەین، ئەو تیروپشك کردنە چۆن بووە؟ ﴿ فَكَانَ مِنَ ٱلْمُدْحَضِينَ ﴾، ئەویش لە دۆڕاوان بوو، (**الإِدْحَاضُ: جَعْلُ المَرْءِ دَاحِضاً: زَالِقاً غَيْرَ ثَابِتِ الرِّجلَيْنِ، وَهُوَ هُنا اسْتِعارَةٌ لِلخُسرانِ وَالمَغْلوبِيَّة**)، (إدحَاض) بریتیە لەوە کە ئینسان وا لێ بکەی بخلیسکێ و پێیەکانی چەسپاو نەبن، کە لێرەدا ئەوە خوازراوەتەوە بۆ دۆڕان و تێشکان (لە تیروپشك و قورعە کێشانەکەدا).

٤)- ﴿ فَٱلْتَقَمَهُ ٱلْحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٌ ﴾، [دوای ئەوەی کە تیروپشکەکە بە زیانی ئەو تەواو بوو و، دۆڕا لە تیروپشکدا] یەکسەر نەهەنگ بە دەمیەوە گرت، هەڵبەتە تەفسیرەکان هەر گوتوویانە: (**الإِلتِقَامُ: البَلْعُ**) (إلتقام) بریتیە لە قووتدان، بەڵام وانیەو ئەوە مانای (إلتقام)ە: (**الإِلْتِقَامُ: جَعْلُ الشَّيءِ لُقْمَةً وَأَخْذُهُ بِالفَمِ**)، (إلْتقام) واتە: کردنە پاروو و بە دەمەوە گرتن، وەك ئێمە کاتی خۆی لە تەفسیری سوورەتی (یونس)دا، کە بەسەرهاتی یونوسمان بە تەفصیلی باسکردوە، لەوێش باسمان کردوە کە: ﴿ فَٱلْتَقَمَهُ ٱلْحُوتُ ﴾، تەنها لێرەدا هاتەوە واتە: نەهەنگەکە یونوسی بە دەمەوە گرت، وەك لوقمەیەك، وەك پاروویەك، نەك قووتی بدات و بیخاتە نێو سك و هەناوی، هەڵبەتە ئەگەر قووتیشی

دابایەو خستباشیە نێو سك و هەناوی، هەرچەندە لە نێو سکی نەهەنگدا هەوای تێدانیە، ئۆکسجینی تێدانیە، بەڵام خوا هەر دەیتوانی بیهێڵێتەوە، خوایەك کە ئیبراهیمی لە نێو ئاگری سووردا هێشتەوە، دەشیتوانی یونوسیش ئەگەر نەهەنگەکە قووتیشی بداو، بیخاتە نێو هەناویشی، بیهێڵێتەوە بە زیندوویی، بەڵام (إلتقام) ئەوە دەگەیەنێ کە نەهەنگەکە یونوسی لە زاریدا هێشتۆتەوە، وەك پارووەیەك و دەبێ نەهەنگێکی گەورە بووبێ.

﴿ فَٱلۡتَقَمَهُ ٱلۡحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٞ ﴾، نەهەنگەکە بە دەمیەوە گرت، لە کاتێکدا ئەو گلەیی و هێنەرە سەرخۆ بوو، (مُلِيم: اسْمُ فَاعِلٍ مِن ألامَ إذَا فَعَلَ ما يَلُومُهُ النَّاسُ عَلَيْهِ)، (مُلِيم) واتە: گلەیی هێنەرە سەر خۆ، چونکە (لَوم) واتە: گلەیی (لائِم) واتە: گلەییکەر، بەڵام (مُلیم) واتە: کەسێك وابکات خەڵك ببێتە گلەیی لێکەر (لائـم)ی و ببێتە ڕەخنەلێگری، دەڵێ: (مُليم: اسمُ فاعلٍ مِنْ ألامَ)، (مُلیم) ناوی بکەر (اسم فاعل)ە لە (ألامَ)ەوە هاتوە، یانی: کەسێك شتێك بکات کە خەڵك لۆمەی بکات و ڕەخنەی لێ بگرێ، جا چ ڕەخنەی لێ بگرن بە کردەوە، یان ڕەخنەی لێ نەگرن.

کەواتە: یونوس عليه السلام شتێکی کردوە، کە خوا ئاوا سزای بدات و، لە زاری، یان لە سکی نەهەنگەکەدا حەپسی بکات.

بۆیەش دەڵێین: ﴿ فَٱلۡتَقَمَهُ ٱلۡحُوتُ ﴾، واتە: نەهەنگەکە بە زاریەوە گرت، نەك قووتی داو خستیە سکی، کە زۆربەی تەفسیرەکانی کە بینیومن، هەموویان هەر وایان لێکداوەتەوە، چونکە: (بَلْع): بریتیە لە قووتدان و چوونەخواری شتێك بە شتێکدا، وەك خوا لە سوورەتی (هود)دا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَرۡضُ ٱبۡلَعِي مَآءَكِ ﴿٤٤﴾ ﴾، ئەی زەوی! ئاوەکەی خۆت قووتبدە، ئاویش کە بە زەویدا دەچێتە خوار، تێیدا ون دەبێ، ئنجا ئەگەر وا بووایە، دەبووا یونوسیش لە سکی ماسییەکەدا ون بووبایە، بەڵام (إلتِقَام) ئەوەیە کە وەك لووقمەیەك بە دەمیەوە گرتبێ، بە هەر

حاڵ (إلتقام)و (بَلع) لێك جیان[١]، بۆیە تێبینییم لەسەر تەفسیر كردنی ئەو وشەیە لە لایەنی ڕوونكەرەوانی قورئانەوە هەیە.

وشەی (بَطن) یش (لَلَبِثَ فِي بَطۡنِهِۦٓ ..)، وەڵامەكەی ئەوەیەكە نەهەنگ و ماسیی زاروسكی پێكەوە پەیوەستن.

٥)- ﴿ فَلَوۡلَآ أَنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلۡمُسَبِّحِينَ ﴾، ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە كە لە بە پاكگران بوو، واتە: لە بە پاكگرانی خوا بوو، چۆن خوای بە پاكگرت؟ لە سوورەتی (الأنبياء)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَٰضِبٗا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقۡدِرَ عَلَيۡهِ فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٨٧ ﴾، بەپاكگرتنی بۆ خوا، ئەوە بوو: ﴿ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٨٧ ﴾، بێجگە لە تۆ هیچ پەرستراوێك نیە، پاكیی بۆ تۆ، من لە ستەمكاران بووم، شتێكی بێ جێم كرد، ئیجتیهادێكی هەڵەم كرد، چونكە گوناهی پێغەمبەران (عَلَيۡهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) هەر بریتی بووە بە هەڵەداچوون لە ئیجتیهادو كۆششكردندا، ئەگەرنا شتێك زانیبیان گوناهە، نەیانكردوە، خوا لەوە پاراستوونی، خوا دەفەرموێ: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە كە لە (خوا) بە پاكگران بوو.

٦)- ﴿ لَلَبِثَ فِي بَطۡنِهِۦٓ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ ﴾، لە سكی نەهەنگەكەدا دەمایەوە، تاكو ئەو ڕۆژەی تێیدا زیندوو دەكرێنەوە، ئەمە یان مەبەست ئەوەیە، كە سكی نەهەنگەكەی بۆ دەبوو بە گۆڕ، وەك حەقیقەت، یاخود وەك كنارە (كناية)یە، كە زۆر لەوێدا دەمایەوە، مەبەست ئەوەیە تاكو ئەو نەهەنگە دەفەوتا، ئەویش لەوێدا دەمایەوەو بۆی دەبوو بە گۆڕ، واتە: نەهەنگەكە لە دەریاكەدا دەفەوتاو، هەر لەوێدا دەبوو تاكو قیامەت، ئنجا خوای پەروەردگار لە ڕۆژی زیندووكرانەوەدا، هەر لەوێدا زیندووی دەكردەوە.

ئایا ئەو دەریایە لە كوێ بووە؟

---

(١) بڕوانە: لسان العرب لابن منظور، ج١٢ص٣٠٨، لفظ (لقم) كە وێڕای قووتدان و خواردنی خێرا، بەمانای شت خستنە ئێوزارو بەزارەوەگرتنیش، هێناویەتی.

وا پێدەچێ دەریای سپیی نێوەڕاست بووبێ و، یونوسیش لە نەینەواوە چووە بەرەو شام و، ڕەنگە خۆیشی خەڵکی فەلەستین بووبێ، ئەو کاتەش دەریای سپیی نێوەڕاست پێی گوتراوە: (بحر الروم)، بێگومان ڕووباری دیجلە نەبووە وەك هەندێك لە تەفسیرەکان دەڵێن، چونکە ڕووباری دیجلە بەلەمی تێدا دێ و دەچێ، بەڵام کەشتیی پڕ لەو دەریا گەورانەدا دێ و دەچێ.

ئەوەی گوتراش بەس ڕاو بۆچوونێکەو، بەڵگەیەکی یەکلاییکەرەوەی لەسەر نیە.

٧)- ﴿ فَنَبَذْنَٰهُ بِٱلْعَرَآءِ وَهُوَ سَقِيمٌ ﴾، دوایی ئێمە ئەومان فڕێدایە دەشتێکی ڕووتەن، لە حاڵێکدا کە نەخۆش بوو، (العراء: الأرضُ الجرداءُ الَّتي لَيْسَ فِيهَا نَبَاتٌ ولا شيءٌ) زەوییەکی ڕووتەن، بیابان و دەشت و سارایەك کە نە ڕووەکی لێ هەبێ، دارو درەخت، نە هیچ شتێکی لێ هەبێ، پەناو سێبەرێکی لێ نەبێ.

کە دەفەرموێ: لە حاڵێکدا کە نەخۆشیش بوو، نەخۆشییەکەی ئەوە بووە کە ماوەیەك لە دەمی ئەو ماسییەدا ماوەتەوە، ئەگەر هەر بە دەمیەوە گرتبێ، ئەگەر لە سکیشیدا بووبێ دیارە ماوەتەوەو، ئەوەش بۆتە هۆی نەخۆش بوونی، بە دڵنیایی زاری ئەو نەهەنگەش ڕژێنی تێدابوون و، ئەوەش کاریگەریی نەرێنیی لە سەری بووە.

ئایا چەند ماوەتەوە؟ هەندێك دەڵێن: چەند سەعاتێك، هەندێك دەڵێن: چەند ڕۆژێك، هەندێك دەڵێن: چەند هەفتەیەك، دیار نیە، گرنگ ئەوەیە ماوەیەك ماوەتەوەو، بۆتە هۆی نەخۆش کەوتنی.

٨)- ﴿ وَأَنۢبَتْنَا عَلَيْهِ شَجَرَةً مِّن يَقْطِينٍ ﴾، هەروەها لە سەریمان ڕواند ڕووەکێك لە جۆری کوولەکە (يَقْطِين).

(اليَقْطِين: الدُّبَّاءُ وَالقَرْعُ) بە کوردیی: کدووی پێ دەڵێن و کوولەکەشی پێ دەڵێن، وا پێدەچێ کوولەکە، جۆری گەورەی بێ و، کدووش هی گچکە، هەردوو جۆرەکانی کوولەکە، چ کدوو ئەوەی وردی دەکەن و لە شلەی دەکەن، چ کوولەکەی

سوور کوولەکە پەڵوو، کە وەك شتێکی شیرین دەخورێ، زانایان دەڵێن: لە هەر شوێنێك ئەو بڕکە کوولەکەی لێ بێ (کدوو یان کوولەکە)، مێش و مەگەز لێی نانیشێ، بە تەئکید کە دەفەرموێ: (وهو سَقيم) نەخۆش بووە، لە ڕووی جەستەییەوە نەخۆش بووەو، ڕەنگە برین و نەخۆشیی لە پێستی دا پەیدابووبێ و، مێش و مەگەز تێی دەورووکا، ئەگەر ئەو بڕکە کوولەکەیەی لەسەر نەڕوابایە، ئنجا ڕەنگە وێڕای ئەوەی سوودی بینیوە لەوەی کە بە گەڵایەکەی خۆی داپۆشێ و، مێش و مەگەزی لێ نەنیشێ، دوایی لە کوولەکەکەشی خواردبێ و، ئەویش بۆ بابایەکی برینداری نەخۆشی کە هیچ خۆراکێکی دەستنەکەوتوە، بۆی بۆتە خۆراك و بەزوویی تین و وزەی هاتۆتەوەبەر و بۆی قەرەبوو بۆتەوە.

٩)- ﴿ وَأَرْسَلْنَٰهُ إِلَىٰ مِا۟ئَةِ أَلْفٍ أَوْ يَزِيدُونَ ﴾، دوایی ناردمان بۆ لای سەد هەزار (١٠٠,٠٠٠) کەس، یاخود زیاتریش دەبوون،

بە پێی فەرمایشتی پێغەمبەریش ﷺ یونوس ﷺ بۆ لای خەڵکی نەینەوا نێردراوە، کە شارێك بووە لە شوێنی موصڵی ئێستا، کە دەفەرموێ: بۆ لای سەد هەزار یاخود زیاتریش، لەبەر ئەوەی مرۆڤ بە هاوکۆ (معدَل)یی ژمارەیان زیاد دەکات، ئنجا کە ژمارەیان زیاد دەکات، سەد هەزار کەس، ئەگەری زیاتر بوونی زیاترە، تاکو ئەگەری کەم بوونەوەی، مەگەر بەڵاو موصیبەتێکیان بۆبێ، بۆیە خوا ﷻ فەرموویەتی: سەد هەزار یاخود زیاتریش.

ئەو سەد هەزار کەسەش کە یونوسیان بۆ لا نێردراوە، ڕایەك دەڵێ: ئەو جوولەکانە بوون کە لە نەینەوا نیشتەجێ بوون، کاتی خۆی - کە نەینەوا پایتەختی دەوڵەتی ئاشووریی بووە - ئاشوورییەکان لە فەڵەستینەوە بە دیلیی بردبوویانن و لەوێ نیشتەجێیان کردبوون.

دەشگونجێ خەڵکی نەینەوا خەڵکێکی دیکە بووبن، نەك ئەو سەد هەزار جوولەکەیەی کە بە دیلیی برابوون بۆ ئەوێ، لەو بارەوە کە دەفەرموێ: بۆ

لای سـەد هـەزار کـەس یاخـود زیاتریـش ئـەم دەقـەی سوننەت هەیـە: [عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﷺ، أَنَّـهُ سَـأَلَ رَسُـولَ اللَّـهِ ﷺ عَـنْ قَـوْلِ اللَّـهِ تَعَـالَى: ﴿ وَأَرْسَلْنَٰهُ إِلَىٰ مِاْئَةِ أَلْفٍ أَوْ يَزِيدُونَ ﴾، قَـالَ: يَزِيـدُونَ عِشْرِيـنَ أَلْفًـا] (أخرجـه الترمـذي: ٣٢٢٩، وَقَـالَ: حَدِيـثٌ غَرِيـبٌ).

واتـە: ئوبـەی کـوڕی کەعـب ﷺ پرسـیاری کـردوە لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە بـارەی فەرمایشـتی خـوای بـەرزەوە کـە دەفەرمـوێ: ناردمـان بـۆ لای سـەد هـەزار کـەس یاخـود زیاتریـش، پێغەمبـەر ﷺ فەرمـووی: بیسـت هـەزار زیاتـر.

خـوا ﷻ هـەر بـە گشـتیی هێناویەتـی، ئـەم دەقـەش ئەگـەر سـەنەدەکەی ڕاسـت بـێ، بـە تەئکیـد پێغەمبـەری خـوا ﷺ هەرچـی بیفەرمـوێ، لـە خـواوە دەیفەرمـوێ و وایـە، ئەگـەر سەنەدەکەشـی ڕاسـت نەبـێ، گرنـگ ئەوەیـە سـەد هـەزار کـەس لـە شـوێنێك بـن - بۆیـە دەفەرمـوێ: (أو يَزِيـدُون) - چونکـە بـەرەو زیادیـی دەچـن، بـە مسـۆگەریی لـە سـەد هـەزار کـەس، ڕۆژانـە خەڵکیـان لـێ دەمـرێ و لێیـان لـە دایـك دەبـێ، بـەڵام بەهاوکۆیـی بـەرەو زیـاد بـوون دەچـن، مەبەسـتم ئەوەیـە هەندێـك دەڵێـن: خـوا ﷻ زانیویەتـی ئـەو کاتـە یونوسـیان بـۆ لا ڕەوانەکـراوە، ئایـا بـە وردیـی سـەد هـەزار کـەس بـوون؟ یـان سـەدو دە هـەزار کـەس بـوون؟ یـان سـەدو چەنـد هـەزار کـەس بـوون؟ بـەڵام خـوا ﷻ بۆیـە بـەو تەعبیـرە هێناویەتـی، سـەد هـەزار بـە پشـتەوە، چونکـە بـەردەوام لـەو سـەد هـەزارە خەڵـك دەمـرێ و هـی دیکـە لـە دایـك دەبـن، بۆیـە خـوا ﷻ بـە پێویسـتی نەزانیـوە، ئـەو کاتـە ژمـارە وردەکـە چەنـد بـووە، بـاسی بـکات و کەمتریـش وایـە قورئـان ئـەو جـۆرە وردەکارییانـە بـاس بـکات، بـەڵام گرنـگ ئەوەیـە بـە موعەددەلیـی سـەد هـەزار کـەس، زیاتـر لێیـان زیـاد دەبـێ، تاکـو لێیـان کـەم بێتـەوە.

١٠)- ﴿فَـَٔامَنُوا۟ فَمَتَّعْنَٰهُمْ إِلَىٰ حِينٍ﴾ ئیدی بڕوایان هێناو ئێمەش پێمان گوزەراندن و بەهرەمەندمان کردن تاکو کاتێکی کەم.

ئێمە دەربارەی حوکمی تیروپشك، کە بە عەرەبیی (قرعة)ی پێ دەڵێن، قسەیەك لە (القرطبي)یەوە دێنین: {قَالَ القرطبي: وَالحَقُّ عِنْدِي أَن تَجْرِيَ فِي كُلِّ مُشْكِلٍ، فَذَلِكَ أَبْيَنُ لَهَا وَأَقْوى لِفَصْلِ الْحُكْمِ فِيهَا، وَأَجْلى لِرَفْعِ الإِشْكالِ عَنْهَا}[1]

واتە: (القرطبي) دەڵێ: هەق لە لای من لە بارەی تیروپشکەوە، ئەوەیە کە ئەنجام بدرێ بۆ هەر کارێك کە گرفتی تێدابێ، یاخود تەم و مژی بەسەرەوە بێ، ئەوە بۆ ئەو کارە ڕوونترەو، بەهێزتریشە بۆ ئەوەی یەکلایی بکرێتەوەو، ڕوونترە بۆ ئەوەی ئیشکال و تەمومژێك کە تێیدایە، نەهێڵدرێ.

هەر (القرطبي) لە (القَرَافِي)یەوە کە کتێبێکی هەیە بە ناوی (الفروق) جا لە فەرقی ژمارە (٢٤٠)دا، دەیهێنێ:

دەڵێ: (مَتَى تَعَيَّنَتِ الْمَصْلَحَةُ أَوِ الْحَقُّ فِي جِهَةٍ، لا يَجُوزُ الإِقْتِرَاعُ، لإِنَّ فِي الْقُرْعَةِ ضِياعُ الْحَقِّ، وَمَتى تَسَاوَتِ الْحُقُوقُ أَوِ الْمَصَالِحُ، فَهَذا مَوْضِعُ الْقُرْعَةِ دَفْعاً لِلضَّغَائِنِ)، جوانی هێناوە کە تایا شوێنی تیروپشك کوێیە؟!

قەڕڕافیی دەڵێ: هەر کاتێك بەرژەوەندیی یاخود هەق لە لایەکەوە چەسپاو دیارییکرا، ئەوە تیروپشك تێدا کردنی دروست نیە، چونکە مادام بەرژەوەندییەکە دیار بێ، هەقەکە دیار بێ لە کوێیە، کە تیروپشکی تێدا کرا، هەق زایە دەبێ، بەڵام ئەگەر چەند مافێك وەك یەك بوون، یان بەرژەوەندییەکان یەکسان بوون و نەمانزانی کامیان هەڵبژێرین، لێرەدایە تیروپشك دەکرێ، بۆ ئەوەی ڕق و بوغز لەیەکدی هەڵنەگیرێ {کەس نەڵێ: هەقی من بە لای ئەوەی دیکەوە چووە، ئەو کاتە هەموویان یەکسان دەبن، هەر کەسێك دەرچوو، نابێ ئەوانی دیکە گلەیی بکەن}.

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج ١٥، ص ١٠١.

# دە (١٠) دەرس و پەندی گرنگ لە بەسەرهاتی یونوس دا عليه السلام

وەك زۆر جار باسمان كردوە: ئێمە لە تەفسیری سووڕەتی (یونس)دا، بەسەرهاتی یونوسمان هێناوە، بەڵام لەوێ ئەو دە دەرس و پەندانەی لێرە دەیانهێنین، لەوێ نەمانهێناون:

**١- پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) شتی بچووكیشیان بە گەورە لەسەر حیساب كراوە:**

وەك گوتراوە: (**حَسَنَاتُ الأَبْرَارِ سَيِّئَاتُ الْمُقَرَّبِين**) واتە: ئەوەی بۆ چاكان چاكە، بۆ زۆر لە خوا نیزیكان خراپە، ئەگەرنا یونوس عليه السلام كۆششێكی كردوە، ئیجتیهادێكی كردوە، كە دیارە نەیپێكاوە، بەڵام خوا ﷻ ئەوەی بە گوناهـ لەسەر حیساب كردوەو، [ئەگەر خەڵكێكی دیكە بووایە، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ئەگەر كۆششكەر كۆششی كرد، ئەگەر پێكای، دوو پاداشتی هەنەو، ئەگەر نەیپێكا، پاداشتێكی هەر هەیە]، بەڵام پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) ئەگەر لە ئیجتیهادو بۆچوونێكیش دا نەیانپێكابێ، بە هەڵە لەسەریان حیساب كراوە، لەبەر ئەوەی پایەیان زۆر بەرزە، بۆیە شتی گچكەی كەمیش، هەڵەیەكی بچووكیش، لەوان گەورە دیارە.

**٢- ڕێی دەربازبوون لە گرفتاریی، گەڕانەوەیە بۆ لای خوا:**

وەك لە بەسەرهاتی (یونس)دا هەیە لە سووڕەتی (الأنبياء)دا: ﴿ وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَٰضِبًا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقۡدِرَ عَلَيۡهِ فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٧﴾ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَنَجَّيۡنَٰهُ مِنَ ٱلۡغَمِّۚ وَكَذَٰلِكَ نُـۨجِي ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٨٨﴾ ﴾، واتە: یادی هاوەڵی، خاوەنی نەهەنگ بكەوە، كاتێك كە بە تووڕەیی

(واتە: بە تووڕەیی لە خەڵکەکەی) ڕۆیی پێیوابوو کە لێمان وەتەنگ نەهێناوە [کە هەر دەبێ لەوێ بێ] (أي: فَظَنَّ أَنْ لَنْ نُضَيِّقَ عَلَيْهِ) پێی وابوو کە لەسەرمان نەکردۆتە مەرج، کە دەبێ هەر بانگەوازی خەڵکی نەینەوا بکات، ﴿فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ ﴿٨٧﴾﴾الأنبياء، دوایی لە تاریکاییەکاندا، لە تاریکایی زاری نەهەنگەکەداو، تاریکایی شەوو، تاریکایی دەریادا، هاواری کرد، بانگی کرد: ﴿أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٧﴾﴾الأنبياء، کە جگە لە تۆ هیچ پەرستراوێك نیە، پاکیی بۆ تۆ، بە دڵنیایی من لە ستەمکاران بووم.

خواش دەفەرموێ: ﴿فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ ﴿٨٨﴾﴾الأنبياء، وەڵامـمان دایـەوە، ﴿وَنَجَّيۡنَٰهُ مِنَ ٱلۡغَمِّۚ وَكَذَٰلِكَ نُـۨجِي ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٨٨﴾﴾الأنبيـاء، لـەو خـەم و ناڕەحەتیـی و گرفتاریـیـەش دەربازمـان کـرد، ﴿وَكَذَٰلِكَ نُـۨجِي ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٨٨﴾﴾الأنبيـاء، هــەر بـەو شـێوەیەش بڕوادانێـك کـە لێـمان بپاڕێنـەوە، لـە خـەم و مەینەتیـی دەربازیـان دەکەیـن، کەواتـە: ڕێـی دەربازبـوون، گەڕانەوەیـە بـۆ لای خـواو، دان بـە هەڵـەی خۆداهێنانــە.

**٣- تاك و کۆمەڵ دەتوانن لە دوا کاتدا خۆیان بگۆڕن و واقیعیان بۆ بگۆڕدرێ:**

هەر لە سووڕەتی (یونس)دا هاتوە، خوا ﷻ باسی دەربازکرانی گەلی یونوس دەکات، دەفەرموێ: ﴿فَلَوۡلَا كَانَتۡ قَرۡيَةٌ ءَامَنَتۡ فَنَفَعَهَآ إِيمَٰنُهَآ إِلَّا قَوۡمَ يُونُسَ لَمَّآ ءَامَنُواْ كَشَفۡنَا عَنۡهُمۡ عَذَابَ ٱلۡخِزۡيِ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَمَتَّعۡنَٰهُمۡ إِلَىٰ حِينٖ ﴿٩٨﴾﴾یونس، واتە: دەبووایە شارێك بڕوا بێنێ و بڕواهێنانەکەی سوودی پێ بگەیەنێ، بەڵام ئەوە نەبوو، جگە لە گەلی یونوس کاتێك بڕوایان هێنا، ئێمە سزای شەرمەزاریی و سەرشۆڕییمان لەسەر لابردن لە ژیانی دنیاداو، بۆ ماوەیەکی دیارییکراو ژیاندمانن.

ئێمە بەسەرهاتی یونوسمان لە تەفسیری سووڕەتی (یونس)دا هەمووی لەبەر ڕۆشنایی ئەم ئایەتەو ئایەتەکانی دیکەشدا توێژیوەتەوە، کەواتە: ڕێی دەرباز بوون گەڕانەوەیە بۆلای خواو، تاك و کۆمەڵ دەتوانن لە دوا کاتدا، خۆیان بگۆڕن و، واقیعیشیان بۆ بگۆڕرێ.

**٤- گەڕانەوە بۆ لای خوا، وێڕای بەرەکەتی قیامەت، هی دنیاشی هەیە:**

خوا لە سووڕەتی (یونس)دا فەرموویەتی: ﴿فَـَٔامَنُوا۟ فَمَتَّعۡنَـٰهُمۡ إِلَىٰ حِينٍ﴾، بڕوایان هێنا، ئێمەش تاکو کاتێکی دیارییکراو ژیاندمانن، واتە: لە بەرەکەتی ئەو ئیمانە، دەرباز بوون، لەوەی خوا قڕەبڕیان بکات و کۆتاییان پێ بێنێ.

**٥- دەستەڵاتی خوا سنووری نیەو، مانەوەی یونوس ﷺ گرفتێك نیە چارەسەری زەحمەت بێ بۆ خوای مەزن:**

ئایا مانەوەی یونوس چەند سەعاتێك بووە، یان چەند ڕۆژێك بووە، یان چەند هەفتەیەك بووە؟ پێشتریش باسمان کرد کە خوا دەفەرموێ: ﴿فَٱلۡتَقَمَهُ ٱلۡحُوتُ﴾، ئەمە تیشکمان بۆ دەخاتەسەر ئەو مەسەلەیە کە نەهەنگەکە یونوسی هەر بە دەمەوە گرتوەو، هەر لە زاریدا بووەو، حەواڵەی نێو هەناوو ورگی نەکردوە، هەرچەندە ئەوەش بۆ خوای پەروەردگار هەر شتێکی ئاسانەو، هەموو شتێك بۆ خوا ئاسانە ﷻ، چونکە دەستەڵاتی خوا سنووری نیە.

**٦- بەهرەمەند بوون، وەك بەرچاو ڕوونیی بۆ تەفسیری قورئان، لە بەرهەمی خاوەن کتێبان باشە، بەڵام نەك تەسلیم بوونی قسەکانیان:**

وەك پێشتریش ئاماژەم پێداوە، لە (محمد الطاهر بن عاشور) وا دەبینرێ، کە هەرچی لەلای وانەوە هاتوە، وەك شتێکی سەلمێندراو وەربگیرێ و، قورئانی پێ تەفسیر بکرێ، ئەوە هەڵەیە، بە تایبەتی ئەو هەڵەیە لە بەسەرهاتی داوود ﷺ، هەروەها لە بەسەرهاتی سولەیمانیشدا، زەق بۆتەوە، کە دوایی لە تەفسیری سووڕەتی (ص)دا دەیگەینێ، پێشتریش بە بۆنەی دیکەوە لەو بارەوە ڕەخنەمان لە قسەکانی (ابن عاشور) گرتوە، کە یەکسەر قسەکانی پەیمانی کۆن دێنێ و، ئایەتەکانی قورئانیان پێ تەفسیر دەکات، کە بە تەئکید ئەوە هەڵەیە، چونکە ئەو قسانەی لە پەیمانی کۆندا هاتوون، چ بۆ داوود ﷺ، چ بۆ زۆر لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، لەگەڵ پایەی بەرزی پێغەمبەراندا ناگونجێن، بەڵکو لەگەڵ مسوڵمانێکی عادەتیشدا ناگونجێن، وەك دوایی لە تەفسیری سووڕەتی (ص)دا، لەو بارەوە زیاتر قسەی لێ دەکەین.

**٧- کردەوەی باشی پەنهان زۆر بەرەکەتدارە:**

أ- بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ أَنْ يَكُونَ لَهُ خَبْءٌ مِنْ عَمَلٍ صَالِحٍ فَلْيَفْعَلْ} (**أخرجه القضاعي: ٤٣٤، والخطيب في «التأريخ» ج١١، ص٢٦٣، عن الزبير بن عوام، وصححه الألباني في صحيح الجامع: ٦١٨**)، واتە: هەر کامێك لە ئێوە توانی کردەوەیەکی پەنهانی چاکی هەبێ، با بیکات.

یونوس ﷺیش لە تاریکایی زاری ماسییەکەداو، تاریکایی شەوگارو، تاریکایی دەریادا، سێ تاریکایی، لەوێدا هاواری کردووەو خوای بە پاکگرتووەو، یەکتایی خوای پەروەردگاری ڕاگەیاندووەو، دانی بە هەڵەی خۆیدا هێناوە، لە بەرەکەتی ئەوەدا، خوا دەفەرموێ: دەربازمان کرد، بۆیە دەبێ ئینسان هەوڵبدات کردەوەی باش و پەنهانی هەبێ، وێڕای ئەوەی کە دەبێ ئەرکە شەرعییە ڕواڵەتییەکان ئەنجام بدات، کردەوەی باشی پەنهانیش زۆر بەرەکەتدارە.

ب- لەو بارەوە ئەم فەرموودەیەش هەیە، کە ئێمە هەندێکی کە جێی مەبەستە، لێ دێنین: {بَيْنَمَا ثَلَاثَةُ نَفَرٍ يَتَمَشَّوْنَ أَخَذَهُمُ الْمَطَرُ، فَأَوَوْا إِلَى غَارٍ فِي جَبَلٍ، فَانْحَطَّتْ عَلَى فَمِ غَارِهِمْ صَخْرَةٌ مِنَ الْجَبَلِ، فَانْطَبَقَتْ عَلَيْهِمْ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ: انْظُرُوا أَعْمَالًا عَمِلْتُمُوهَا صَالِحَةً لِلَّهِ، فَادْعُوا اللَّهَ تَعَالَى بِهَا، لَعَلَّ اللَّهَ يَفْرُجُهَا عَنْكُمْ} (**أخرجه البخاري: ٢٣٣٣، ومسلم: ٢٧٤٣**).

کە بەسەرهاتەکە زۆر درێژە، بەڵام ئێمە لێرەدا کەمێکمان لێی هێناوە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: لە کاتێکدا سێ کەس، لە ڕیوایەتێکدا دەڵێ: لە گەلانی پێش ئێوە، دەڕۆیشتن باران تینی بۆ هێنان، ئەوانیش پەنایان بردە بەر ئەشکەوتێك لە شاخێك، گاشە بەردێکی گەورە هاتەخوارو زاری ئەشکەوتەکەی لێ گرتن، ئەشکەوتەکەیان لێ داخرا، لە نێو خۆیاندا بە یەکدییان گوت: بیر بکەنەوە چ کردەوەیەکی باشمان هەبێ، بۆ خوا کردبمان بە پەنهانیی، پێی لە خوا بپاڕێنەوە، ئەو کردەوەیەمان بۆ لای خوا، بکەینە ئامراز (وسيلة) بەڵکو خوا دەرووممان لێ بکاتەوە، ئیدی هەرکامێك لەو سێیانە کردەوەیەکی پەنهانی

خۆی باس دەكات و دەیكاتە وەسیلە بۆ ئەوەی پێی لە خوا بپاڕێتەوەو، خوای پەروەردگاریش دەرووی خێریان لێ دەكاتەوە.

**٨- پاڕانەوەی وەك هی یونوس بێگومان گیرایە:**

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویٚ: **{دَعْوَةُ ذِي النُّونِ إِذْ دَعَا وَهُوَ فِي بَطْنِ الحُوتِ: لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِينَ، فَإِنَّهُ لَمْ يَدْعُ بِهَا رَجُلٌ مُسْلِمٌ فِي شَيْءٍ قَطُّ، إِلَّا اسْتَجَابَ اللَّهُ لَهُ} (أخرجه أحمد: ١٤٦٢، والترمذي: ٣٥٠٥، والنسائي في الكبرى: ١٠٤٩٢، والحاكم: ١٨٦٢، وقال: صحيح الإسناد).**

دەفەرموێ: پاڕانەوەی (**ذي النون**)لە سكی ماسیی دا كە گوتی: {بێجگە لە تۆ هیچ پەرستراو نین، پاكیی بۆ تۆ، من لە ستەمكارانم} هیچ مسوڵمانێك لە هیچ شتێكدا هەرگیز پێی نەپاڕاوەتەوە، مەگەر وەڵامی دراوەتەوەو، خوا دەرووی لێ كردۆتەوە.

دەڵێم: منیش ئەوەم ئەزموون كردوە، كە هەروایە و بەبێ ئەزموونكردنیش دەبێ دڵنیاییمان لە بارەیەوە هەبێ.

**٩- بەندە هەرگیز نابێ بە هۆی هەڵەو كەم و كوڕییەكەوە نائومێد ببێ، بەڵكو دەبێ هەمیشە لە دەرگای خوا بوەستێ و، ئومێدەوار بێ:**

یونوس ﷺ بەڵێ هەڵەیەكی كردو خوای پەروەردگار سزایدا، بەڵام نائومێد نەبوو، بۆیە خوای پەروەردگار دەرووی خێری لێكردەوە.

**١٠- قسەیەكی جوانی قوشەیریی:**

(**القشيري**) قسەیەكی جوان دێنێ، ئایا لە چ سەرچاوەیەك وەریگرتوە؟ نازانم، بەڵام گرنگ ئەوەیە قسەكەی جوانە، وەك (**البحر المديد في تفسير القرآن المجيد**)[1] لێی خواستۆتەوە، دەڵێ: **{إِنَّ اللَّهَ أَوْحَى إِلَى يُونُسَ بَعْدَ نَجَاتِهِ: قُلْ لِفُلَانٍ الفَخَّارِ يَكْسِرُ**

---

(١) ج ٦، ص (١٩١، ١٩٢).

**مِنَ الجَرَّاتِ مَا عَمِلَهُ فِي هَذِهِ السَّنَةِ كُلِّهَا، فَقَالَ يُونُس: يَارَبِّ إِنَّهُ تَعَنَّى مُدَّةً فِي إِنجَازِ ذَالِكَ فَكَيْفَ آمُرُهُ أَنْ يَكْسِرَهَا كُلَّهَا؟ فَقَالَ لَهُ: يَا يُونُس يَرِقُّ قَلْبُكَ لِخَزَّافٍ يُتْلِفُ عَمَلَ سَنَةٍ، وَأَرَدْتَ أَنْ أُهْلِكَ مِئَةَ أَلْفٍ مِنْ عِبَادِي لَمْ تَخْلُقْهُمْ، وَلَوْ خَلَقْتَهُمْ لَرَحِمْتَهُمْ).**

وەك گوتم: قسەیەکی جوانە، بەڵام سەرچاوەکەی دیار نیە، هەڵبەتە ئەهلی تەصەووف جار جار کە شتێکیان گوتوە، ڕەنگە بە ئیلهام بۆیان هاتبێ.

دەڵێ: خوا ﷻ وەحیی کرد بۆ یونوس ﷺ دوای ئەوەی دەربازی کرد، گوتی: بە فلانکەسی گۆزەکار بڵێ: هەرچی گۆزەی ئەمساڵ کردوویەتی، با هەموان بشکێنێ، یونوس گوتی: ئەی پەروەردگارم! زۆر بەو گۆزانەوە ماندوو بووە، تاکو دروستیکردوون، چۆن پێی بڵێم هەموان بشکێنێ؟ خوا پێی فەرموو: ئەی یونوس! دڵت نەرم دەبێ بۆ گۆزەکارێك کە گۆزەکانی بشکێنێ، ئەوەی لە ماوەی ساڵێکدا کردوونی، بەڵام ویستت من سەد هەزار کەس لە بەندەکانم بفەوتێنم، کە تۆ خۆت دروستت نەکردوون، ئەگەر دروستت کردبانایە، بەزەییت پێیاندا دەهات.

واتە: خوا ﷻ بۆیە لە یونوس تووڕە بوو و گلەیی لێ کرد، کە تۆ چۆن ئەو سەد هەزار کەسە بەجێدێڵی، کە دوایی خوا سزایان بدات؟ بگەڕێوە بۆ نێویان و، بانگیانبکە بۆ لای خوا، بەڵکو خوا هەم لە دنیادا نەیانفەوتێنێ، هەم لە دوارۆژیشدا تووشی سزا نەبن، کە هەر بەو شێوەیەش دەرچوو.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی یارمەتییمان بدات بە ڕەوشتە بەرزەکانی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) خۆمان برازێنینەوەو، وریاش بین لە هەڵەی گەورەو گچکە، بە تەئکید هەڵەی گەورەو گچکە، هەمووی باجی خۆی هەیە، چ لە دنیاو چ لە دوارۆژدا.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان سی و چوار (٣٤) ئایەتی کۆتایی: (١٤٩ - ١٨٢) دەگرێتە خۆی، تەوەری سەرەکیی ئەو سی و چوار ئایەتەش بریتیە لە پووچەڵکردنەوەی چەند بیرۆکەیەکی هاوبەشدانەران، لە بارەی خوای بەرزو بێ وێنەو، پەیوەندیی هەر کام لە فریشتەکان و جندەکانەوە پێی.

دواتریش بە درۆخستنەوەی هاوبەشدانەرەکانە، کە بەر لەوەی قورئانیان بۆ دابەزێ، زۆر خۆیان هەڵدەکێشا، کە ئەگەر کتێبیان بۆ بێ، بەندەی ساغبووەوەی خوا دەبن، کەچی پێچەوانەی ئەوە دەرچوون.

دوایی خوای باڵادەست ﷻ باسی یاسای خۆی دەکات لە پشتگیریی کردن و سەرخستنی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، لەو میانەشدا هەڕەشە لە بێبڕوایان دەکات، هەڕەشەی سزای دنیاو ڕۆژی دوایی.

لە کۆتاییشدا خوا ﷻ پاکیی خۆی و، سەلامەتیی پێغەمبەران و، ستاییشکرانی خۆی ڕادەگەیەنێ.

﴿ فَٱسْتَفْتِهِمْ أَلِرَبِّكَ ٱلْبَنَاتُ وَلَهُمُ ٱلْبَنُونَ ﴿١٤٩﴾ أَمْ خَلَقْنَا ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ إِنَٰثًا وَهُمْ شَٰهِدُونَ ﴿١٥٠﴾ أَلَآ إِنَّهُم مِّنْ إِفْكِهِمْ لَيَقُولُونَ ﴿١٥١﴾ وَلَدَ ٱللَّهُ وَإِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿١٥٢﴾ أَصْطَفَى ٱلْبَنَاتِ عَلَى ٱلْبَنِينَ ﴿١٥٣﴾ مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿١٥٤﴾ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿١٥٥﴾ أَمْ لَكُمْ سُلْطَٰنٌ مُّبِينٌ ﴿١٥٦﴾ فَأْتُوا۟ بِكِتَٰبِكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٥٧﴾ وَجَعَلُوا۟ بَيْنَهُۥ وَبَيْنَ ٱلْجِنَّةِ نَسَبًا ۚ وَلَقَدْ عَلِمَتِ ٱلْجِنَّةُ إِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ ﴿١٥٨﴾ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٥٩﴾ إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿١٦٠﴾ فَإِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ ﴿١٦١﴾ مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ بِفَٰتِنِينَ ﴿١٦٢﴾ إِلَّا مَنْ هُوَ صَالِ ٱلْجَحِيمِ ﴿١٦٣﴾ وَمَا مِنَّآ إِلَّا لَهُۥ مَقَامٌ مَّعْلُومٌ ﴿١٦٤﴾ وَإِنَّا لَنَحْنُ ٱلصَّآفُّونَ ﴿١٦٥﴾

وَإِنَّا لَنَحْنُ ٱلْمُسَبِّحُونَ ﴿١٦٦﴾ وَإِن كَانُوا۟ لَيَقُولُونَ ﴿١٦٧﴾ لَوْ أَنَّ عِندَنَا ذِكْرًا مِّنَ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٦٨﴾ لَكُنَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿١٦٩﴾ فَكَفَرُوا۟ بِهِۦ ۖ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿١٧٠﴾ وَلَقَدْ سَبَقَتْ كَلِمَتُنَا لِعِبَادِنَا ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٧١﴾ إِنَّهُمْ لَهُمُ ٱلْمَنصُورُونَ ﴿١٧٢﴾ وَإِنَّ جُندَنَا لَهُمُ ٱلْغَـٰلِبُونَ ﴿١٧٣﴾ فَتَوَلَّ عَنْهُمْ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿١٧٤﴾ وَأَبْصِرْهُمْ فَسَوْفَ يُبْصِرُونَ ﴿١٧٥﴾ أَفَبِعَذَابِنَا يَسْتَعْجِلُونَ ﴿١٧٦﴾ فَإِذَا نَزَلَ بِسَاحَتِهِمْ فَسَآءَ صَبَاحُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴿١٧٧﴾ وَتَوَلَّ عَنْهُمْ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿١٧٨﴾ وَأَبْصِرْ فَسَوْفَ يُبْصِرُونَ ﴿١٧٩﴾ سُبْحَـٰنَ رَبِّكَ رَبِّ ٱلْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٨٠﴾ وَسَلَـٰمٌ عَلَى ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٨١﴾ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٨٢﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەكان

{ئنجا (ئەی موحەممەد!) لێیان بپرسە (لە هاوبەشدانەران) ئایا پەروەردگارت كچی هەن و ئەوان كوڕیان هەن! ﴿١٤٩﴾ یان ئایا ئەوان ئامادە بوون و دەیانبینی كە ئێمە فریشتەكانمان بە مێینە دروست دەكردن؟ ﴿١٥٠﴾ ئەها (ئاگادار بن!) ئەوان (وەك بەشێك) لە درۆی هەڵبەستراویان دەڵێن: ﴿١٥١﴾ خوا ڕۆڵەی بوون و بە دڵنیاییش ئەوان درۆزنن ﴿١٥٢﴾ ئایا (خوا) كچانی بەسەر كوڕاندا هەڵبژاردوون؟ ﴿١٥٣﴾ چیتانە چۆن بڕیار دەدەن؟ ﴿١٥٤﴾ ئایا بیرتان نایەتەوە (بیرناكەنەوە)؟ ﴿١٥٥﴾ یان ئایا بەڵگەیەكی ڕوونتان هەیە؟ ﴿١٥٦﴾ دەجا كتێبەكەتان بێنن (كە ئەو بەڵگەیەی تێدایە) ئەگەر ئێوە لە ڕاستانن ﴿١٥٧﴾ هەروەها (هاوبەشدانەرەكان) ڕەچەڵەكێكیان لە نێوان ئەو (خوا)و، لە نێوان جندانندا داناو، جندیش زانیویانە كە بێگومان ئەوان (مادام لەسەر كوفر بمرن) لە ئامادەكراوانن (بۆ دۆزەخ) ﴿١٥٨﴾ پاكیی بۆ خوا لەوەی ئەوان وەسفی دەكەن ﴿١٥٩﴾ جگە لە بەندە ساغكراوەكانی خوا (كە شتی وا ناڵێن شایستەی خوا نەبێ) ﴿١٦٠﴾ بێگومان ئێوەو ئەوەی دەیپەرستن (جگە لە خوا) ﴿١٦١﴾ ئێوە هیچ كەسی لێ گومڕا ناكەن و لە دژ تێكنادەن ﴿١٦٢﴾ مەگەر كەسێكی چووە كڵپە (ی ئاگرە)وە ﴿١٦٣﴾ (فریشتەكانیش گوتیان): هیچ كەسێك لە

ئێمە نیە، مەگەر پێگەیەكی زانـدراوی هەیە ﴿١٦٤﴾ هەروەها بەڕاستیی ئێمەیـن بـە ڕێكیـی ڕیـز بوویـن (بـۆ خواپەرستیی وەستاوین) ﴿١٦٥﴾ هەروەها بەڕاستیی ئێمەیـن خـوا بەپاكگـران ﴿١٦٦﴾ (پێشـتریش بێبڕوایـەكان) بـە جەختكردنـەوە دەیانگـوت: ﴿١٦٧﴾ ئەگـەر بیرخـەرەوە (و بەرنامە)یەكـمان لـە هـی پێشـنینان لـە لا بووایـە ﴿١٦٨﴾ بـە دڵنیایـی ئێمـە لـە بەنـدە سـاغكراوەكانی خـوا دەبوویـن ﴿١٦٩﴾ كەچـی (كاتێـك بیرخـەرەوەو پەیامی خوایـان بـۆ هـات) پێـی بێبـڕوا بـوون، ئنجا لەمـەودوا دەزانـن (چـۆن لەسـەر ئـەوە سـزا دەدرێـن) ﴿١٧٠﴾ بـە دڵنیایـی وشـە (بڕیار)یشـمان بـۆ بەنـدە نێردراوەكانمـان تێپەڕیـوەو ڕابـردوە ﴿١٧١﴾ كـە بێگومـان ئـەوان سـەرخراون (بەسـەر ناحەزانیانـدا) ﴿١٧٢﴾ هەروەهـا كـە هـەر سـەربازەكانمان زاڵـن (بەسـەر دوژمنانیانـدا) ﴿١٧٣﴾ ئنجـا (ئـەی موحەممـەد!) بـۆ ماوەیەكـی كـەم پشـتیان تێبكـە ﴿١٧٤﴾ سەرنجیشـیان بـدە (تەماشـای حـاڵ و باڵیـان بكـە)، لەمـەودوا دەبینیـن (چییـان بەسـەردێ!) ﴿١٧٥﴾ ئایـا پەلـە لـە (هاتنـی) جەزرەبـەی ئێمـە دەكـەن؟ ﴿١٧٦﴾ هـەركات (جەزرەبـەی ئێمـە) دابەزیـە حەوشـەو بـەروماڵیـان، بەرەبەیانـی ورياكـراوان خراپتریـن (بەرەبەیـان) ە ﴿١٧٧﴾ پشتیشـیان تێبكـە بـۆ ماوەیەكـی كـەم ﴿١٧٨﴾ سەرنجیشـیان بـدە، لەمـەودوا دەبینـن (چییـان بەسـەر دێ !) ﴿١٧٩﴾ پاكیـی بـۆ پـەروەردگار، خاوەنـی تێكـڕای عیززەت لـەوەی ئـەوان وەسـفی دەكـەن ﴿١٨٠﴾ سـەلامیش لەسـەر نێـردراوان ﴿١٨١﴾ ستایشـیش بـۆ خـوای پـەروەردگاری جیهانییـان ﴿١٨٢﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(ٱلْجِنَّةُ): (جَماعَـةُ الجِـنِّ: ﴿مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ۝٦﴾ الناس، وَالجِنَّـةُ: الجُنُـونُ)، وشـەی (جِنَّـة): بـە مانـای کۆمەڵـی جنـد دێ، وەك خـوا دەفەرمـوێ: ﴿مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ۝٦﴾ الناس، هەروەهـا (جِنَّـة) بە مانای شـێتیی دێ، وەك خـوا دەفەرموێ: ﴿مَا بِصَاحِبِكُم مِّن جِنَّةٍ ۝٤٦﴾ سبأ، شـێتیش بۆیـە پێـی دەگوتـرێ (مجنـون)، چونکـە عەقڵـی دادەپـۆشرێ، هـەروەك جیننیـش بۆیـە پێیـان دەگوتـرێ: (جِـنّ) چونکـە داپـۆشراون و نەبینراون، کۆرپەلـە (جنین)یـش لـە سـکی دایکیـدا ئەویـش داپـۆشراوە، هەموویـان ڕیشـەکەیان دەچێتـەوە سـەر پەنهانیـی و داپۆشراویـی.

(نَسَبًا): (النَّسَـبُ وَالنِّسْـبَةُ: إِشْـتِرَاكٌ مِـنْ جِهَـةِ أَحَـدِ الأَبَوَيْـنِ)، (نَسَـب وَنِسْـبَة): بریتیـە لـە هاوبەشـیی لـە لای یەکێـك لـە بـاب و دایکـەوە، واتـە: ئەوانـەی دەچنـەوە سـەر بابێـك، یاخـود دەچنـەوە سـەر دایکێـك، ئـەوە ئـەو چوونـەوە سـەرە، پێـی دەگوتـرێ: نیسـبەت و نەسـەب واتـە: ڕەچەڵـەك.

(بِفَٰتِنِينَ): (أَيِ: مُضِلِّـينَ) واتـە: ئێـوە کەسـی لـێ هەڵناگێڕنـەوە، کەسـی لـێ گومـڕا ناکـەن لـە خـوای بـەرزو مـەزن.

(صَالِ ٱلْجَحِيمِ): چـوە نێـو کڵپـە، واتـە: کەسـێك کـە دەچێتـە کڵپـەی دۆزەخـەوە، (الصُّـلِيُ: الإِيْقَـادُ بِالنَّـار، صَـلِيَ الْكَافِـرُ النَّـارَ: قَـاسَ حَرَّهَـا، وَصَـالِ النَّـار: داخِـل النَّـار)، وشـەی (صَـلِيَ) لـە ئەصڵـدا بـە مانـای داگیرسـاندنە، شـتێك بـە ئاگـر داگیرسـێنی، دەگوتـرێ: (صَـلِيَ الْكَافِـرُ النَّـارَ) واتـە: ئاگرەکـەی چێـژت، پێـی جەزرەبـە درا، (وَصَـالِ النَّـار: داخِـل النَّـار)، چـووە نێـو ئاگـر پێشـتر گوتمـان: وشـەی (صَـلِيَ) بریتـی نیـە لـە چوونـە نێـو ئاگرێکـی ئاسـایی، بەڵکـو بریتیـە لـەوە کـە لـە هـەر چـوار لاوە ئاگـر تیـن بـۆ ئـەو شـتە بێنـێ و، بیپیشـێنێ یاخـود بیبرژێنـێ.

(ٱلصَّآفُّونَ): واتـە: ڕیزبـووان، ڕیزبەسـتووان (الصَّـفُّ: أَنْ تَجْعَـلَ الـشَّيْءَ عَـلَى خَـطٍّ مُسـتوٍ، الصَّافُّـون: المُصطَفُّـين)، (صَـفَّ): ئەوەیـە کـە شـتێك لەسـەر هێڵێکـی ڕاسـت دابنێـی، یـان چەنـد شـتێك پێکـەوە ڕیزبکـەی، (صَافُّون)یـش واتـە: (مُصطَفُّـين) ڕیزبـووان، ڕیـز بەسـتووان.

(بِسَاحَتِهِمْ): واتـە: لـە مەیـدان و گۆڕەپانەکەیـان دا، (السَّـاحَةُ: المَـكَانُ الوَاسِـعُ وَمِنْـهُ سَاحَةُ الـدَّار)، (سَاحَة) شـوێنێکی فراوانـە، لـەوەوە بـە حەوشـەی دەوروبـەری خانـوو گوتـراوە: مەیـدان (سَـاحَةُ الـدَّار).

(حِينٍ): (الْحِـينُ: وَقـتُ بُلُـوغِ الـشَّيْءِ وَحُصُولِـهِ، الأَجَـلُ، الزَّمَـانُ المُطْلَـقُ، السَّـاعَةُ مِـنَ الوَقْـتِ)، (حِـيْن) بـە کاتـی پێگەیشـتنی شـتێك و پەیـدا بوونـی گوتـراوە، هەروەهـا بـە کاتێکـی دیاریکـراو گوتـراوە، بـە کات بـە ڕەهایـی گوتـراوە: (حِـين)، هەروەهـا بـە ماوەیەکـی کـەم لـە کاتیـش گوتـراوە: (حِـين).

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا ﷻ لـە کۆتایـی ئـەم سـوورەت موبارەکـەدا، جارێکـی دیکـە بـە پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ دەفەرمـوێ: پرسـیاریان لـێ بکـە، دوو جـاران وشـەی: ﴿ فَٱسۡتَفۡتِهِمۡ ﴾ لـەم سـوورەتەدا بەکارهاتـوە، جـاری یەکەمیـان فەرمـووی: ﴿ فَٱسۡتَفۡتِهِمۡ أَهُمۡ أَشَدُّ خَلۡقًا أَم مَّنۡ خَلَقۡنَآۚ إِنَّا خَلَقۡنَٰهُم مِّن طِينٖ لَّازِبِۭ ﴿١١﴾ ﴾، کـە پێشـتر تەفسـیرمان کـرد، لێـرەش دەفەرمـوێ: ﴿ فَٱسۡتَفۡتِهِمۡ ﴾، پرسـیاریان لـێ بکـە، داوای فەتوایـان لـێ بکـە، داوای زانیارییـان لـێ بکـە، ﴿ أَلِرَبِّكَ ٱلۡبَنَاتُ وَلَهُمُ ٱلۡبَنُونَ ﴾ ئایـا پـەروەردگارت کچانـی هـەن و، ئەوانیـش کوڕانیـان هـەن؟ مەبەسـتی خـوای پـەروەردگار ﷻ ئەوەیـە کـە چـۆن دەڵێـن: فریشـتەکان کچانـی خـوان، لـە حاڵێکـدا کـە بـۆ خۆیـان بـە لـە دایـك بوونـی کـچ، قەڵسـن! وەك خـوا ﷻ لـە سـوورەتی (الزخـرف) و سـوورەتی (النحـل)

یشدا، باسی هەڵوێستی ئەوان دەکات، کاتێك کە کچیان بووە، چەند نارەحەت بوون:

أ- ﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِٱلْأُنثَىٰ ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿٥٨﴾ يَتَوَٰرَىٰ مِنَ ٱلْقَوْمِ مِن سُوٓءِ مَا بُشِّرَ بِهِۦٓ ۚ أَيُمْسِكُهُۥ عَلَىٰ هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُۥ فِى ٱلتُّرَابِ ۗ أَلَا سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾النحل.

ب- هەروەها: ﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِمَا ضَرَبَ لِلرَّحْمَٰنِ مَثَلًا ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿١٧﴾ ﴾الزخرف، واتە: کاتێك کە یەکێکیان موژدەی پێ بدرێ، بەوەی کە بۆ (خوای) بە بەزەیی بە وێنەیان هێناوەتەوە [کە کچانن و ئەوان دەڵێن: فریشتەکان کچی خوان] ڕووی ڕەش و تەڵخ هەڵدەگەڕێ و، زۆر پەست و پیشخواردووەوە دەبێ ، دوایی دەفەرموێ: ﴿ أَوَمَن يُنَشَّؤُا۟ فِى ٱلْحِلْيَةِ وَهُوَ فِى ٱلْخِصَامِ غَيْرُ مُبِينٍ ﴿١٨﴾ ﴾الزخرف، ئایا موژدەم پێدراوە بە کچێك کە هەمیشە لە خشڵ و جوانییدا پێدەگات [نەك وەك پیاو سروشتی وابێ کەیفی بە شتی زبرو توند بێ، ئافرەت سروشتی وایە، کەیفی بە جوانیی و نەرم و ناسکیی دێ] لە کاتی وتووێژو مشتومڕیشدا باش ناتوانێ مەبەستی خۆی دەربخات [لەبەر ئەوەی عاتیفەیەکی زۆر بەهێزی هەیە].

لێرەدا خوا ﷻ بە پرسیارلێکردنی نکووڵییلێکەرانەوە دەفەرموێ: ﴿ أَلِرَبِّكَ ٱلْبَنَاتُ وَلَهُمُ ٱلْبَنُونَ ﴾، ئایا پەروەردگارت کچانی هەن و، ئەوانیش کوڕانیان هەن؟ کە دەفەرموێ: ئەوان کوڕانیان هەیە، بە تەنکید کچانیشیان بوون، بەڵام مەبەست ئەوەیە ئایا کچان بۆ خوا بڕیار دەدەن، کەچی بۆ خۆیان ئەگەر چاریان هەبێ، کوڕ نەبێ نایانبێ؟!

﴿ أَمْ خَلَقْنَا ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ إِنَٰثًا وَهُمْ شَٰهِدُونَ ﴾، یان ئایا ئەوان ئامادە بوون، ئاگادار بوون کە ئێمە فریشتەکانمان بە کچ خوڵقاندوون؟ ئەمە بەرپەرچدانەوەیەکی زۆر ڕوون و ڕاشکاوە، کە فریشتەکان مێینە نین، بەڵکو فریشتەکان هەر ڕەگەزیان نیە، نە نێرن و نە مێن، بە پێچەوانەی جندەوە، کە وەچەیان هەیەو زاووزێیان هەیە، ڕەگەزیان هەیە، (شیطان) هەیەو (شیطانة)

هەیە لە کافرەکانیان، هەروەك (جِنّي) هەیەو (جِنِّيّة) هەیە، لە زمانی عەرەبییدا ئەو وشانە هەن، بەڵام فریشتە (مَلَك) تاکە، بە (ملائکة) کۆدەکرێتەوە، ئیدی ناگوترێ: (مَلَك)و (مَلَکة)، ئایا ئێمە فریشتەکانمان بە مێینە خوڵقاندوون، ﴿ وَهُمْ شَٰهِدُونَ ﴾، لە حاڵێکدا کە ئەوان ئاگادار بوون و ئامادە بوون، یان: زانیارییان هەبوو، ئایا وابوو؟ بە تەئکید نەخێر.

﴿ أَلَآ إِنَّهُم مِّنْ إِفْكِهِمْ لَيَقُولُونَ ﴿١٥١﴾ وَلَدَ ٱللَّهُ ﴾ ئاگاداربن! ئەوان لە درۆی خۆیانەوە دەڵێن: خوا ڕۆڵەی بووە، ﴿ وَإِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿١٥٢﴾ ﴾، بە دڵنیایی ئەوان درۆ کارن، وەك لە سوورەتی (الأنعام)دا کە پێشتر تەفسیرمان کرد، باسمان کرد کە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان دەیانگوت: فریشتەکان کچانی خوان و شەیتانەکان کوڕانی خوان، خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ وَجَعَلُوا۟ لِلَّهِ شُرَكَآءَ ٱلْجِنَّ وَخَلَقَهُمْ ۖ وَخَرَقُوا۟ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَٰتٍۭ بِغَيْرِ عِلْمٍ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٠٠﴾ بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ صَٰحِبَةٌ ۖ وَخَلَقَ كُلَّ شَىْءٍ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿١٠١﴾ ﴾الأنعام، واتە: هاوبەشی جندیان بۆ خوا بڕیاردان، لە حاڵێکدا کە خوا جندی هێناونەدی و دروستیکردوون!!

ئەمە وا پێدەچی وەك کاتی خۆی لە تەفسیری سوورەتی (الأنعام) بەرگی پێنجی ئەم تەفسیرە کوردییەدا گوتوومانە: مەبەستی پێ مەجووسییەکان بێ کە بڕوایان بە دووانەتیی (ثنویة) بووە، ئەوان بڕوایان بە دووانەتیی هەیە، پەروەردگاری خێرو پەروەدگاری شەڕ، یەزدان و ئەهریمەن، لەوانەیە مەبەست ئەوە بێ، یاخود مەبەست ئەوە بێ کە هاوبەشدانەرەکان گوتوویانە: شەیتان (ئیبلیس) برای خوای پەروەردگارە!! ﴿ وَخَرَقُوا۟ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَٰتٍۭ بِغَيْرِ عِلْمٍ ﴿١٠٠﴾ ﴾الأنعام، بۆیان داتاشین (بۆ خوا) بۆیان هەڵبەستن: کوڕان و کچان بە بێ زانیاریی، دەیانگوت: شەیتانەکان کوڕانی خوان و فریشتەکانیش کچانی خوان، بەڵام بە بێ زانیاریی ئەو قسانەیان دەکرد، بۆیە خوا دەفەرمووێ: ﴿ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٠٠﴾ ﴾الأنعام، پاکەو بەرزە خوا لەوەی ئەوان وەسفی دەکەن، ئنجا خوا بەڵگە دێنێتەوە لەسەر پووچەڵیی ئەو بیرۆکانە:

﴿ بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾ الأنعام، بەدیهێنەرو پەیداکەری ئاسمانەکان و زەوییە، ﴿ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ صَٰحِبَةٌ وَخَلَقَ كُلَّ شَىْءٍ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴾ الأنعام، چۆن ڕۆڵەی پەیدا دەبن، ئەگەر هاوسەری نەبووبێ؟ ئەگەر خوا هاوسەری نەبێ، چۆن ڕۆڵەی پەیدا دەبێ؟ ﴿ وَخَلَقَ كُلَّ شَىْءٍ ﴾ الأنعام، هەموو شتێکی هێناوەتەدی، جگە لە خۆی هەمووی دروستکراوی خوایە ﴿ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴾ الأنعام، خواش بە هەموو شتێك زانایە.

لێرەش دەفەرموێ: ﴿ أَلَآ إِنَّهُم مِّنْ إِفْكِهِمْ لَيَقُولُونَ ۝ وَلَدَ ٱللَّهُ ﴾، ئاگاداربن! ئەوان لە درۆی خۆیانەوە (واتە: بناغەی قسەکەیان درۆیە) دەڵێن: خوا ڕۆڵەی بووە، ﴿ وَإِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴾، بە دڵنیایی ئەوان درۆکارن، لە سووڕەتی (الأنعام)دا خوا وردتر باسی کردوەو، ئەو بیرۆکەیەی پووچەڵکردۆتەوە، بەڵام لێرە بەوەندە واز دێنێ، کە چەند بەڵگەیەك دێنێتەوە:

﴿ أَصْطَفَى ٱلْبَنَاتِ عَلَى ٱلْبَنِينَ ﴾، ئایا کچانی بەسەر کوڕاندا هەڵبژاردوون؟ واتە: ئەگەر فریشتەکان کچانی خوا بن، بۆچی خوا ﷻ کوڕی نەبوون؟ ئێوە بۆ خۆتان کچتان پێ خراپن و، کوڕتان پێ چاکن، ئەدی چۆن ئەوەی بۆ خۆتان پێتان خراپە، بۆ خوای دادەنێن و، ئەوەی پێتان چاکە، بۆ خۆتانی دادەنێن؟!

﴿ مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴾، چیتانە، چۆن دادوەریی دەکەن، چۆن بڕیار دەدەن؟! ﴿ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴾، ئایا بیر ناکەنەوە، نایهێننەوە بیر خۆتان!! ﴿ أَمْ لَكُمْ سُلْطَٰنٌ مُّبِينٌ ﴾، یان ئایا بەڵگەیەکی ڕوون و ڕوونکەرەوەتان هەیە؟ لە مەسەلە گرنگەکاندا وردتر ئەم بەڵگانە ڕوون دەکەینەوە، واتە: لە ڕووی عەقڵیی و لۆژیکییەوە، ئەو قسەیە ڕێی تێناچێ، ئنجا ئایا بەڵگەیەکی نەقڵیتان هەیە؟ لە وەحییەوە بەڵگەیەکتان هەیە؟ بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکراتان هەیە؟

﴿ فَأْتُوا۟ بِكِتَٰبِكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾، نووسراوەکەتان بێنن، ئەگەر لە ڕاستانن، چونکە بەڵگەی نەقڵیی دەبێ لە نووسراوێك لە کتێبێك دا بێ، لە بەرنامەیەکدا بێ، کە

لە خـواوە دابەزیبـێ، هـەر نەقڵێـك نەسـەلمێندرا كـە سـەرچاوەكەی وەحیـی خوایـە، ئیعتیبـاری پـێ ناكـرێ و ئەفسـانەیە.

﴿ وَجَعَلُوا۟ بَيْنَهُۥ وَبَيْنَ ٱلْجِنَّةِ نَسَبًا ﴾، هەروەهـا لـە نێـوان ئـەو {كـە خوایـە ﷻ} و جنـدەكانـدا، ڕەچەڵەكێكیـان دانـا، وەك گوتـم: هەندێـك گوتوویانـە: ئیبلیـس بـرای خوایـە (پاكیـی بـۆ خـوا)، هەندێـك گوتوویانـە: خـوا لەگـەڵ گەورەكانـی جنـددا هاوسـەرگیریی كـردوەو فریشـتەكانی بـوون، وەك مێینـەو، شـەیتانەكانی بـوون و جنـدە نێرینەكانیشـی بـوون، وەك كـوڕان!! ئەوانـەش هەموویـان ئەفسـانەو قسـەی پڕوپووچـن.

﴿ وَلَقَدْ عَلِمَتِ ٱلْجِنَّةُ إِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ ﴾، بـەڵام جنـدەكان دەزانـن هەموویـان ئامـادە دەكرێـن، واتـە: ئەوانەیـان كـە بـەردەوام دەبـن لەسـەر كوفـرو لەسـەر كوفـر دەمـرن، دەزانـن ئامـادە دەكرێـن و پەلكێـش دەكرێـن بـۆ سـزا، ئنجـا ئەگـەر نەسـەب و ڕەچەڵەكێك لـە نێـوان خـواو جنـددا هەبووایـە، خـوا چـۆن سـزای دەدان؟ یـان ئـەوان چـۆن لـە خـوا عاصـیّ دەبـوون و بێبـڕوا دەبـوون؟!

﴿ سُبْحَـٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴾، پاكیـی بـۆ خـوا، خـوا پـاك و بێگـەردە لـەوەی كـە ئـەوان دەیڵێـن، ئـەوان وەسـفی دەكـەن بـۆ خـوا، ئـەو وەسـفانەی ئـەوان دەیڵێـن و ئـەو پێناسـانەی ئـەوان دەیڵێـن، بـۆ خـوا، ﴿ إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴾، جگـە لـە بەنـدە هەڵبـژاردەكانی خـوا، ئـەم هـەڵاواردن (إستثناء)ە، دوو ئەگـەری هـەن:

أ- دەگونجێ لە: ﴿ إِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ ﴾بێ، واتە: هەموویان ئامادە دەكرێن بۆ دۆزەخ، جگە لە بەندە ساغكراوەكانی خوا، لە جند و مرۆڤ، ئەوانە خوا ﷻ سزایان نادات، بەڵكو دەیانخاتە بەهەشتەوە.

ب- دەشگونجێ: ئەو هەڵاواردنە لە: ﴿ سُبْحَـٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴾ بێ، یانی: پاكیی بۆ خوا لەوەی ئەوان دەیڵێن، جگەلەوەی كە بەندە ساغكراوەكان دەیڵێن، كە ئەوان شتی وا ناڵێن شایستەی خوا نەبێ و، قسەی بێ ئەزاكەت بەرانبەر بە خوا ناكەن.

وشەی: (المُخْلَصِين) خوێندراویشەتەوە: (المُخْلِصِين)، (المُخْلَصِين) واتە: ساغکراوان، (المُخْلِصِين) واتە: خۆساغکەرەوان، خڵتەیان بە خۆیانەوە نەهێشتوە، یان خڵتەیان بە خواپەرستیی و فەرمانبەرییەکەیانەوە نەهێشتوە بۆ خوا.

﴿ فَإِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ ﴿١٦١﴾ مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ بِفَٰتِنِينَ ﴿١٦٢﴾ إِلَّا مَنْ هُوَ صَالِ ٱلْجَحِيمِ ﴾، خوا ﷻ ڕوو دەکاتە جند، یان ڕوو دەکاتە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان و دەفەرموێ: خۆتان و ئەوانەی دەیانپەرستن، یان: ئەو شتانەی دەیانپەرستن، ﴿ مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ بِفَٰتِنِينَ ﴾، ئێوە هەڵگێڕەرەوە و گومڕاکەری هیچ کەسێك نین لە دژی خوا، ناتوانن بەندەکانی خوا هەڵگێڕنەوەو لایانبدەن ﴿ إِلَّا مَنْ هُوَ صَالِ ٱلْجَحِيمِ ﴾، مەگەر کەسێك کە چووە نێو دۆزەخە، بۆ خۆی خۆی لە دۆزەخ دەهاوێ و، تێیدا دەپیشێ و دەبرژێ، واتە: مەگەر کەسێك بۆ خۆی خۆی ڕاپسکێنێ و بە ویستی خۆی خۆی وا لێبکات کە بچێتە دۆزەخەوە، ئەگەرنا ئێوە توانای ئەوەتان نیە لە خۆڕا خەڵکی پەلکێش بکەن، بەرەو زەلکاوی گومڕاییان بەرن و، لە خوا هەڵیانگێڕنەوە، خوا ئەو دەسەڵاتەی نەداونێ، بەڵکو ئەگەر جندن، ئەگەر مرۆڤن، خۆیان بە ویستی خۆیان دواتان دەکەون، ئەی شەیتانەکان! یان ئەی گومڕاکەرەکان! سەرەنجام خۆیان دەخەنە نێو دۆزەخەوە.

ئنجا خوا ﷻ لەسەر زاری فریشتەکان دەفەرموێ، (واتە: فریشتەکان گوتیان): ﴿ وَمَا مِنَّآ إِلَّا لَهُۥ مَقَامٌ مَّعْلُومٌ ﴾، هیچ کامێك لە ئێمە نیە، مەگەر پێگەیەکی زاندراوی هەیە، فریشتەکان هەرکامیان پێگەو جێگەو، ڕێگەو پلەی خۆی هەیە، ﴿ وَإِنَّا لَنَحْنُ ٱلصَّآفُّونَ ﴾، هەر ئێمە باش ڕیز بووان و، بۆ خواپەرستیی بە ڕێکیی وەستا وانین، ﴿ وَإِنَّا لَنَحْنُ ٱلْمُسَبِّحُونَ ﴾، بە دڵنیایی هەر ئێمەش بە پاکگرین بۆ خوا ﷻ، ئەمە باسی خۆکردنێکی فریشتەکانە، بەڵام فریشتەکان لەبەر ئەوەی، خاوەنی ئارەزوو و، ئەو سیفەتە خراپانە نین کە لە مرۆڤاندا هەن، بۆیە ئەم سیفەتانەیان بە خراپ بۆ تەفسیر ناکرێن، وەك هەندێك لە توێژەرەوان گوتوویانە: لێرەدا فریشتەکان بەجۆرێك لە خۆهەڵکێشان، خۆیان هەڵکێشاوە!! بەڵام ئێمە نابێ

قیاسی فریشتان لەسەر مرۆڤان بکەین، مرۆڤەکان ئەگەر قسەیەك بڵێن لە خۆپەسندیی، یان پەسندکردنی خۆ، ئەوە خۆ هەڵکێشانە، بەڵام فریشتەکان وەك مرۆڤەکان خاوەن تارەزووی نەفس و، شەیتان زەفەر پێبردن و خۆ بەزلگریی نین، کاتێك شتێك دەڵێن، بۆ ئەوەیە ئێمە بزانین ئەوان چۆنن؟ نەك خۆیان هەڵکێشن بەسەر مرۆڤاندا.

دوایی خوا ﷻ قسەیەکی کافرەکان، هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان کە پێشتر کردوویانە، پێش ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بێ و ئیسلام بێ، لێیان دەگێڕێتەوە، دەفەرمووێ: ﴿ وَإِن كَانُوا۟ لَيَقُولُونَ ﴾، بە دڵنیایی ئەوان دەیانگوت، ئەم (إن)ە (إن المُخَفَّفَة)یە لە (المُثَقَّلَة)، یانی: بە دڵنیایی ئەوان دەیانگوت، چونکە بە هۆی (ل)ەکەوە دەزانین، کە (إن)ی جەختکردنەوەیە نەك (إن)ی لابەرە (نافیة): ﴿ لَوْ أَنَّ عِندَنَا ذِكْرًا مِّنَ ٱلْأَوَّلِينَ ﴾، ئەگەر ئێمە یادخەرەوەیەك لەوەی پێشووانمان لەلا بووایە، بەرنامەیەك لەوەی بۆ گەلە پێشووەکان هاتوە، ئێمەش لە لامان بووایە، ﴿ لَكُنَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴾، دەبووینە بەندە ساغکراوەکانی خوا، یاخود (عِبَادَ اللهِ المُخْلِصِين) دەبووینە بەندە خۆساغکەرەوەکانی خوا، واتە: ئێمە کتێب و بەرنامەو وەحییەکمان لەبەر دەستدا نەبوو، دەنا زۆر زۆر چاك دەبووین، وەك لە سوورەتی (فاطر)یش دا دەفەرمووێ: ﴿ وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ لَئِن جَآءَهُمْ نَذِيرٌ لَّيَكُونُنَّ أَهْدَىٰ مِنْ إِحْدَى ٱلْأُمَمِ ﴿٤٢﴾ ﴾، واتە: زۆریش بە جەختکردنەوە، زۆر بە خۆ ئەزیەتدانەوە سوێندیان بە خوا خوارد، کە ئەگەر ئەوانە بیرخەرەوەو هۆشیارکەرەوەیەکیان بۆ بێ، لە هەر گەل و کۆمەڵگایەك کە ڕێی ڕاستی گرتوە، ڕێی ڕاستگرتووتر دەبن، واتە: پێش هەمووان دەکەونەوە لە ڕێی ڕاستگرتندا.

ئنجا دەفەرمووێ: ﴿ فَكَفَرُوا۟ بِهِۦ ﴾، کەچی پێی بێبڕوابوون بە: (فاء التعقیب) هاتوە، یەکسەر دوای ئەوەی ئەو هیدایەت و بەرنامەیان بۆ هات، کە دەیانگوت ئەگەر لەلامان بووایە، ئێمە باشترین کەس دەبووین و بەندەی خۆساغکەرەوەو ساغکراوەی خوا دەبووین، کەچی کە بۆیان هات، پێی بێبڕوا بوون، ﴿ فَسَوْفَ

يَعْلَمُونَ ﴾، لەمـەودوا دەزانـن، ئەمـە هەڕەشـەیە، واتـە: دەزانـن تووشـی چ چۆرێـك دێـن، دەزانـن تووشـی چ سـزاو جەزرەبەیـەك دێـن، لەسـەر ئـەوە كـە بێبـڕوا بـوون بـە بەرنامـەی خـوا، نـەك لەسـەر ئـەوەی كاتـی خـۆی ئـەو قسـەیان گوتـوە، ئەگـەر لەگـەڵ قسـەكەیان دا ڕاسـتیان كردبایـە، قسـەكەیان چ عەیبـی نەبـوو، زۆریـش بـاش بـوو، بـەڵام گرفتەكـە ئەوەیـە كـە بـە پێچەوانـەی قسـەكەیانەوە، ڕەفتاریـان كـرد.

﴿ وَلَقَدْ سَبَقَتْ كَلِمَتُنَا لِعِبَادِنَا ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾، بـە دڵنیایـی وشـە (بڕیـار)ی ئێمـە تێپەڕیـوە بـۆ بەنـدە نێردراوەكانمـان، وشـەی ئێمـە واتـە: بڕیـاری ئێمـە، حوكمـی ئێمـە تێپەڕیوە، كـە چییـە؟ ﴿ إِنَّهُمْ لَهُمُ ٱلْمَنصُورُونَ ﴾، بـە دڵنیایـی هـەر ئـەوان سـەركەوتوو و پشـتگیراو و یارمەتییـدراو دەبـن، لـە بەرانبـەر ناحەزانیانـدا.

﴿ وَإِنَّ جُندَنَا لَهُمُ ٱلْغَٰلِبُونَ ﴾، هەروەهـا بڕیـاری ئێمـە تێپەڕیـوە، بڕیـاری ئێمـە كـە لـە دوو توێـی وشـەكان، چ وشـە تەكوینییـەكان، چ وشـە تەشریعییەكانـدا بەرجەسـتە دەبـن، تێپەڕیـوە كـە هـەر سـەربازەكانی ئێمـە زاڵ دەبـن بەسـەر دوژمنانیانـدا، لـە كاتێكـدا كـە ڕووبـەڕووی یەكـدی دەبنـەوە.

﴿ فَتَوَلَّ عَنْهُمْ حَتَّىٰ حِينٍ ﴾، خـوا ﷻ ڕوو لـە پێغەمبـەری خاتەم ﷺ دەكات، دەفەرموێ: مـادام وایـە تـۆش بـۆ ماوەیەكـی كـەم پشـتیان تێبكـە، ئـەم (ف)ە، دەگونجـێ (فـاء الجزائیـة) بـێ، واتـە: كـە ئـەوان بـەو شـێوەیەن، تـۆش بـۆ ماوەیەكـی كـەم پشـتیان تێبكـە، یاخـود (فـاء الفصیحة)یـە، واتـە: جـا ئـەوان كـە هـەر لەسـەر سـەرەخەریی و، لەسـەر نەسـەلماندن و بێبڕوایـی خۆیـان بـەردەوام دەبـن، لـە حاڵێكیشـدا كـە لـە ڕابـردوودا ئاوایـان گوتـوە، كەچـی وەفـادار نەبـوون بـە قسـەكەی خۆیـان، مـادام ئـەوان وان، تـۆش پشـتیان تێبكـە بـۆ ماوەیەكـی كـەم.

﴿ وَأَبْصِرْهُمْ فَسَوْفَ يُبْصِرُونَ ﴾، تەماشاشـیان بكـە، لەمـەودوا بـە دڵنیایـی ئـەوان چـاك دەبینـن، واتـە: چـاك دەبینـن كـە چییـان بەسـەر دێ! ﴿ أَفَبِعَذَابِنَا يَسْتَعْجِلُونَ ﴾، ئایـا پەلە لـە هاتنـی سـزاو جەزرەبـەی ئێمـە دەكـەن؟ تاڵووكـەی لـێ دەكـەن زوو بۆیـان بـێ؟

﴿ فَإِذَا نَزَلَ بِسَاحَتِهِمْ ﴾، هەر کاتێك سزای ئێمە دابەزیە سەر بەرو حەوشەیان، دابەزیە سەر گۆڕەپانێك کە لێی کۆدەبنەوە، یاخود دابەزیە سەر دەوروبەری ماڵەکانیان، ﴿ فَسَآءَ صَبَاحُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴾، یانی: (فَسَاءَ الصَّباحُ صَباحُ المُنذَرِين) خراپترین بەیانی، بەرەبەیانی ئەوانەیە کە ترسێنراون و وریا کراونەوە، بەڵام هیچ گوێیان بە ترساندن و وریاکردنەوەکە نەداوە.

جارێکی دیکەش خوا ﷻ دووبارەی دەکاتەوە، دەفەرموێ: ﴿ وَتَوَلَّ عَنْهُمْ حَتَّىٰ حِينٍ ﴾، تۆ پشتیان تێبکەو ڕوویان لێ وەرگێڕە، تاکو ماوەیەکی کەم، ﴿ وَأَبْصِرْ فَسَوْفَ يُبْصِرُونَ ﴾، تەماشاش بکە، ئەوانیش دەبینن و تەماشا دەکەن، شتێکیان بەسەر دێ، کە دوایی بە چاوی سەر دەیبینن.

﴿ سُبْحَـٰنَ رَبِّكَ رَبِّ ٱلْعِزَّةِ ﴾، پاکیی بۆ پەروەردگارت، پەروەردگارت خاوەنی هەموو عیززەت، واتە: هەموو باڵادەستیی و دەسترۆیشتوویی، ﴿ عَمَّا يَصِفُونَ ﴾، لەوەی کە ئەوان دەیڵێن، پاکیی بۆ خوا لەوەی کە ئەوان دەیڵێن، بۆ پەروەردگارت، کە خاوەنی هەموو عیززەت و باڵادەستیی و، دەسترۆیشتوویە.

﴿ وَسَلَـٰمٌ عَلَى ٱلْمُرْسَلِينَ ﴾، سەلام و ئاشتیی، سەلامەتیی و بێمزەڕڕەتیی لەسەر ڕەوانەکراوان [لە دنیاو دواڕۆژدا].

﴿ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴾، ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانییان، هەرچی ستایشە، هەرچی مەدح و سەنایە، هەمووی شایستەی خوای پەروەردگاری جیهانییانە.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**پرسیارکردنی سەرزەنشتکەرانە لە هاوبەشدانەران، لە بارەی ئەو بیرۆکە بێبنەمایانەیانەوە کە دەڵێ: خوا کچی هەن، کە فریشتەکانن و، داوا لێکردنیان کە ئەگەر ڕاستن، با بەڵگە بێننەوە لەسەر ئەو داوایە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿فَٱسْتَفْتِهِمْ أَلِرَبِّكَ ٱلْبَنَاتُ وَلَهُمُ ٱلْبَنُونَ ﴿١٤٩﴾ أَمْ خَلَقْنَا ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ إِنَٰثًا وَهُمْ شَٰهِدُونَ ﴿١٥٠﴾ أَلَآ إِنَّهُم مِّنْ إِفْكِهِمْ لَيَقُولُونَ ﴿١٥١﴾ وَلَدَ ٱللَّهُ وَإِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿١٥٢﴾ أَصْطَفَى ٱلْبَنَاتِ عَلَى ٱلْبَنِينَ ﴿١٥٣﴾ مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿١٥٤﴾ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿١٥٥﴾ أَمْ لَكُمْ سُلْطَٰنٌ مُّبِينٌ ﴿١٥٦﴾ فَأْتُوا۟ بِكِتَٰبِكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٥٧﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە بڕگەدا:

**١)- ﴿فَٱسْتَفْتِهِمْ﴾، {خوا فەرمان بە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ دەکات:} پرسیاریان لێبکە، (فَاسْتَفْتِهِمْ: تَقْرِيعٌ لَهُمْ وَتَهَكُّمٌ بِهِمْ)، (فاستفتهم) لێرەدا: سەرزەنشتکردن و جۆرێك لە گاڵتە پێکردنیانە، ئەگەرنا ئەوان کەی ئەهلی فەتوان، کەی زانیارییان لە لایە تاکو پێغەمبەر ﷺ داوای زانیارییەکیان لێ بکات، کە خۆی نەیبێت و، ئەوان پێی بڵێن و هەواڵی پێبدەن؟! چونکە موفتی بە کەسێك دەڵێن، هەواڵ بدا بە (مستفتي)[1] یەك کە داوای زانیاری لێکردوە، ئەویش زانیاری پێ بدات و، هەواڵی پێبدات، بەڵام ئەمە جۆرێکە لە سەرزەنشتکردن و گاڵتە پێکردنیان.**

---

(١) مُسْتَفْتي: داوای فەتواکەر داوای ڕوونکردنەوەکەر.

**٢)-** ﴿أَلِرَبِّكَ ٱلْبَنَاتُ وَلَهُمُ ٱلْبَنُونَ﴾، ئایا پەروەردگارت کچانی هەن و ئەوانیش کورانیان هەن؟ هەڵبەتە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ چ لە نیوە دوورگەی عەرەبییدا، چ لە نێو فارس و ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، چ لە یۆنان و نێو ڕۆمانەکان، چ لە میزۆپۆتامیا {نێوان دوو ڕووبارەکان (دیجلەو فورات)} چ لە میسرو، چ لە ئەفریقیاو، چ لە هەموو شوێنەکان، چەند جۆرێك بوون، تەنیا یەك جۆر نەبوون، وەك لە تەفسیری سوورەتی (الأنعام)یشدا بە تەفصیڵ باسمان کردوە، بەڵام هەندێکیان یان زۆربەیان، ئەوە قەناعەتیان بووە کە فریشتەکان مێن و کچانی خواشن، بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿أَلِرَبِّكَ ٱلْبَنَاتُ وَلَهُمُ ٱلْبَنُونَ﴾، هەمزە (أ)ی (ألربك) هەمزەی پرسیارکردنی نکووڵییلێکەرانەیە، ئایا پەروەردگارت کچی هەن و، ئەوان کوڕیان هەن! ئاشکرایە ئەوانیش کچیشیان هەبوون، بەڵام مەبەست ئەوەیە کە ئەوان ڕازی نین کچیان بێ، کاتێك یەکێکیان کچی دەبێ، زۆر پەست و تووڕەو ناسەرسەنگ دەبێ، ئنجا شتێك کە خۆیان پێی ڕازی نین، چۆن پاڵی دەدەنە لای خوا؟!

ئنجا ئەوە کە گوتوویانە: فریشتەکان کچانی خوان، وەك لە سوورەتی (الأنعام)دا، خوای پەروەردگار ڕوونترو وردتر، ئەو مەسەلەیە باس دەکات، دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلُوا۟ لِلَّهِ شُرَكَآءَ ٱلْجِنَّ وَخَلَقَهُمْ ۝١٠٠﴾الأنعام، واتە: هاوبەشی جندیان بۆ خوا بڕیاردان، بگرە هەندێکیان دەیانگوت: ئیبلیس برای خوایە، ﴿وَخَرَقُوا۟ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَٰتٍۭ بِغَيْرِ عِلْمٍ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَصِفُونَ ۝١٠٠﴾الأنعام، (خَرْق) بریتییە لە دڕینی شتێك، یانی: ئەوانە شتێك چۆن دایدەدڕێ و دەیپچڕێ، ئاوا قسەیەکی درۆیان هێناو هەڵیانبەست، ﴿بَنِينَ وَبَنَٰتٍۭ بِغَيْرِ عِلْمٍ ۝١٠٠﴾الأنعام، کوڕانیان بۆ خوا بڕیاردان، کچانیشیان بۆ خوا بڕیاردان بەبێ زانیاریی، دەیانگوت: شەیتانەکان کوڕانی خوان، فریشتەکانیش کچانی خوان، کە ئەوە لە یەك حاڵدا سێ تاوانی تێدا بوون:

**١- تاوانی یەکەم:** جەستاندنی خوا (تَجْسِيمُ الله)، چونکە کاتێك دەگونجێ خوا کچی بێ، کە خوا جەستە بێ، بۆیە خوا ﷻ کە خۆی پێناسە دەکات لە سوورەتی (الإخلاص)

دا دەفەرمویٚ: ﴿ بسم الله الرحمن الرحيم: قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ﴿٢﴾ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ﴿٣﴾ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ ﴿٤﴾ ﴾، واتە: بە ناوی خوای بەزەیی بەخشندە، بڵێ: خوا تاکە، جێی نیازو بێ نیازە، کەسی لێ نەبووە و لە کەس نەبووە و، هیچ کەسێك هاوتای ئەو نیە.

ئنجا کە ڕۆڵە پاڵبدرێنە لای خوا، چ نێرینە بن، کە گوتوویانە: شەیتانەکان کوڕانی خوان، چ مێینە بن، کە گوتوویانە: فریشتەکان مێن و کچانی خوان، مانای وایە خوای پەروەردگاریان جەستاندوە.

٢- تاوانی دووەم: ئەوەیە کە فریشتەکانیان بە مێینە داناون، لە حاڵێکدا کە خوا زۆر بە ڕوون و ڕاشکاویی نەفیی ئەوە دەکات کە فریشتەکان مێ بن، هەر بۆیە یەکێك لە زانایانی هاوچەرخ (بە چاکی نازانم ناوی بێنم) هەندێك کتێبی نووسیون، تێیان دا باسی ئەوە دەکات کە: فریشتەکان مێینەن و، حۆرییەکان بریتین لە فریشتەکان! کە لە ڕاستییدا ئەو قسانە هیچ نین، چونکە خوا ﷻ زۆر بە ڕوونیی ئەوە بە درۆ دەخاتەوە، ئنجا بە کچ لە قەڵەمدانی فریشتان، مانای بە مێینە لە قەڵەمدانیانەو، ئەوەش گوناهێکی دیکەیە، لە حاڵێکدا کە فریشتەکان ڕەگەزیان نیە، فریشتەکان چەندن هەر ئەوەندن، چەند خوا بیانخوڵقێنێ، ئەوەندن، خۆیان زاووزێیان نیەو، کەم و زیاد ناکەن، وەك جند و مرۆڤ و وەك ئاژەڵ نین، وەك ژیانداران نین.

٣- تاوانی سێیەم: شتێك کە لە لای ئەوان پلەیەکی نزمتری هەیە، ئەویان بۆ خوا داناوە، کە بریتیە لە مێینە، وەك لە هەر کام لە سوورەتی (النحل)و (الزخرف)دا، خوا ﷻ ئەوەیان بە چاو دادەداتەوە و دەفەرمویٚ:

أ- ﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِمَا ضَرَبَ لِلرَّحْمَٰنِ مَثَلًا ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿١٧﴾ ﴾ الزخرف، واتە: ئەگەر یەکێکیان موژدەی ئەوەی پێ بدرێ، کە بە وێنەی هێناوەتەوە بۆ خوای بەبەزەیی (پاڵی داوەتە لای خوا)، ڕووی ڕەش هەڵدەگەڕێ و، زۆر پەست و تووڕە دەبێ.

ب- لە سووڕەتی (النحل)دا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِٱلْأُنثَىٰ ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿٥٨﴾ يَتَوَٰرَىٰ مِنَ ٱلْقَوْمِ مِن سُوٓءِ مَا بُشِّرَ بِهِۦٓ ۚ أَيُمْسِكُهُۥ عَلَىٰ هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُۥ فِى ٱلتُّرَابِ ۗ أَلَا سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾، واتە: ... خراپترین دادوەریی و حوکم کە دەیکەن، ئەوەیە کە ئەو کچانەی خۆیان پێیان ڕازی نین، بۆ خوایان دابنێن.

کەواتە: ئەم قسەیە لە یەك کاتدا سێ تاوانی تێدان: ١- جەستاندنی خوا، ٢- بە مێینە لە قەڵەمدانی فریشتەکان، ٣- شتێك پاڵدانە لای خوا کە خۆیان پێی ڕازی نین و نایانەوێ، جا خوا ﷻ بە درۆیان دەخاتەوە.

٣)- ﴿ أَمْ خَلَقْنَا ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ إِنَٰثًا وَهُمْ شَٰهِدُونَ ﴾، ئایا ئێمە فریشتەکانمان بە مێ خوڵقاندوون، کە ئەوان ئامادەبوون و ئاگایان لێبوو؟

﴿ وَهُمْ شَٰهِدُونَ ﴾، (شاهِد) دەگونجێ بە مانای (حاضِر) بێ واتە: ئامادە، دەشگونجێ بە مانای بینەر بێ، کەسێك کە شایەدیی دەدات، بۆیە پێی دەگوترێ: شاهید، لەبەر ئەوەی ئامادە دەبێ لەلای ئەو ڕووداوەو، دەشیبینێ.

﴿ وَهُمْ شَٰهِدُونَ ﴾ یانی: لە حاڵێکدا کە ئەوان ئامادە بوون، یانی: لە حاڵێکدا کە ئەوان بینەر بوون، کەواتە بە بێ بینین و بە بێ زانیاریی ورد کە بریتییە لە بینین، شتێکی وا نیسپات ناکرێ.

٤)- ﴿ أَلَآ إِنَّهُم مِّنْ إِفْكِهِمْ لَيَقُولُونَ وَلَدَ ٱللَّهُ ﴾، ئاگادار بن! ئەوان لە درۆی خۆیانەوە دەڵێن، خوا ڕۆڵەی بووە! وشەی (ألا) بۆ ئاگادار کردنەوە (تنبیه)یە، لە کوردییدا دەچێتە بەرانبەر (ئەها)، ئەها ئاگاداربە! ﴿ مِّنْ إِفْكِهِمْ ﴾، واتە: درۆیان زۆرە، بەڵام ئەوە یەکێك لە درۆیەکانیانە، ئەم (مِن)ە بۆ بەشێك (تبعیض)ە، واتە: بەشێك لە درۆیەکەیان، لە درۆ هەڵبەستنەکەیان ئەوەیە کە دەڵێن: خوا ڕۆڵەی بووە، واتە: فریشتەکان ڕۆڵەکانی خوان و بە مێینەشیان لە قەڵەم داون، (وَلَدَ) ڕۆڵەی بوون، بە کرداری ڕابردوو، هەروەك خوێندراویشەتەوە: (وَلَدُ الله) واتە: (الملائِكةُ وَلَدُ الله) واتە: فریشتەکان ڕۆڵەی خوان، بە هەردووك شێوە خوێندراوەتەوە.

٥)- ﴿ وَإِنَّهُمْ لَكَـٰذِبُونَ ﴾، بە دڵنیاییش ئەوان درۆزنن.

٦)- ﴿ أَصْطَفَى ٱلْبَنَاتِ عَلَى ٱلْبَنِينَ ﴾، ئایا (خوا) کچانی بەسەر کوڕاندا هەڵبژاردووە؟ ئەم پرسیار کردنە پرسیارلێکردنی نکووڵییلێکەرانەیە، واتە: یانی شتێکی عەجایب و سەیرە کە خوا، ئەگەر هەر ڕۆڵەشی بێ، بۆچی کوڕی نەبن و بۆ کچی بن! لە ڕاستییدا خوا لەوە بەرزترە کە کوڕو کچی بن، وەك خوا لە سوورەتی (الأنعام)دا دەفەرموێ: ﴿ بَدِيعُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ صَـٰحِبَةٌ وَخَلَقَ كُلَّ شَىْءٍ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿١٠١﴾ ﴾، واتە: بەدیهێنەرو پەیداکەری ئاسمانەکان و زەوییە {داهێنەریانە لە نوێ، کە پێشتر وێنەیان نەبووە} چۆن ڕۆڵەی دەبن لە حاڵێکدا کە هاوسەری نەبێ؟ {ئەگەر هاوسەری نەبێ، ڕۆڵە چۆن پەیدادەبێ؟} بەدیهێنەری هەموو شتێکەو، بە هەموو شتێکیش زانایە.

لێرەش دەفەرموێ: ﴿ أَصْطَفَى ٱلْبَنَاتِ عَلَى ٱلْبَنِينَ ﴾، ئایا کچانی بەسەر کوڕاندا هەڵبژاردووە؟ (أَصْطَفَى) خوێندراویشەتەوە: (إِصْطَفَى) یانی: هەڵیبژاردوە.

٧)- ﴿ مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴾، چیتانە چۆن بڕیار دەدەن، چۆن دادوەریی دەکەن! (مَا لَكُم) واتە: (أَيُّ شَيْءٍ حَصَلَ لَكُمْ؟) چ شتێکتان بۆ پەیدابووە، چیتان بەسەرهاتووە؟ پیتی (ما) لە: (مَا لَكُم)دا، (إستفهامٌ عَنْ ذَاتٍ، وَهِيَ مُبْتَدَأٌ وَلَكُمْ خَبَرٌ)، (ما) پرسیار کردنە لە خودی شتێك، لە زاتی شتێك، کە ئەوە دەبێتە نیهاد (مبتدأ)، و (لَكُم) دەبێتە گوزارە (خبر) و هەواڵدان، واتە: چ شتێك بۆ ئێوە پەیدابووە کە ئەو قسەیە دەکەن!

٨)- ﴿ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴾، ئایا بیر ناکەونەوە ! یان نایهێننەوە بیر خۆتان، نایەتەوە بیرتان! ئەمەش: (إستفهامٌ إِنْكَارِيٌّ عَنْ تَذَكُّرِهِم) پرسیار لێکردنی نکووڵییلێکەرانە لەوە کە نایەتەوە بیریان و بیر ناکەنەوە.

٩)- ﴿ أَمْ لَكُمْ سُلْطَـٰنٌ مُّبِينٌ ﴾، یان ئایا بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکراتان هەیە؟ ئەگەر لە ڕووی لۆژیکیی و عەقڵییەوە بێ، ئەوە شتێکی ناماقووڵ و نالۆژیکییە کە خوا کچان بەسەر کوڕاندا هەڵبژێرێ، لە ڕووی لۆژیکیی و عەقڵییەوە هیچ ڕێی تێناچێ، ئنجا ئایا

دەبێ بەڵگەیەکی نەقڵییتان بە دەستەوە بێ لە وەحییەوە؟ دێتە سەر باسی ئەوەو دەفەرموێ: ﴿ أَمۡ لَكُمۡ سُلۡطَٰنٞ مُّبِينٞ ﴾، لێرەدا (أَم) (إضرابُ انتِقَالِيٌّ إبطَالِيٌّ) چونکە وشەی (أَم) دەبێتە (بَل أَ)، (بَل أَلَكُمْ) یانی: دەبێتە مانای (بَل) و (همزةُ الإستفهام)یش، واتە: بەڵکو ئایا بەڵگەیەکی ڕوونتان بە دەستەوەیە؟ یان بەڵگەیەکی ڕوونکەرەوەتان بەدەستەوەیە، چونکە وشەی (مُبِين) لێرەدا هەردوو حاڵەتەکەی تێدا گونجاون، دەگونجێ (مُبِين) لە (أَبان)ی (لازِم)ەوە هاتبێ، وەك: (أَبانَ القَمَرُ) واتە: مانگەکە دەرکەوت، دەشگونجێ لە (أَبان)ی (مُتعَدِّي)ەوە هاتبێ، وەك: (أَبَانَ التِّلميذُ دَرسَهُ أو كِتابَهُ) قوتابییەکە کتێبەکەی یاخود دەرسەکەی ڕوون کردەوە، واتە: یان ئایا بەڵگەیەکی ڕوون، یان بەڵگەیەکی ڕوونکەرەوەیان هەیە؟ کە لێرەدا مەبەست پێی بەڵگەی (نَقْل)ە، بەڵگەی وەحییە.

١٠)- ﴿ فَأۡتُواْ بِكِتَٰبِكُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴾، کتێبەکەتان بێنن، نووسینەکەتان بێنن، یاخود کتێبێك کە بۆتان دابەزێندرابێ، بیهێنن، ئەگەر لە ڕاستانن. چونکە قسەی وا، یان دەبێ بە عەقڵ بسەلمێندرێ، یان دەبێ بە وەحیی (نَقْل)، ئنجا هەر وەحیی و نەقڵێك پاڵبدرێتە لای خوا، دەبێ لە کتێبێکدا هەبێ، لە خۆوە ناکرێ بڵێی: خوا وایفەرمووە، دەڵێن: لە کوێدا وایفەرمووە؟ لە چ کتێبێکدا؟ لە کام سوورەتدا؟ لە ئایەتی ژمارە چەندا؟ نەك وەك هەندێك کەس ڕستەیەکی عەرەبیی دەڵێ، دەڵێین: شتی وا نیە لە قورئاندا، دەڵێ: با با پێموابێ شتی وا هەیە! بەڵام قورئان ئایەتەکانی دیارن بۆ ئەهلی خۆی، هەروەها فەرمایشتەکانی پێغەمبەریش ﷺ پۆلێن کراون و دیار کراون، لەبەر ئەوە هەر قسەیەك پاڵبدرێتە لای خوا، لای دینی خوا، دەبێ سەرچاوەکەی دیار بێ، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ فَأۡتُواْ بِكِتَٰبِكُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴾، نووسینەکەتان، کتێبەکەتان بێنن ئەگەر لە ڕاستانن.

بە تەئکید لێرەدا: ﴿ فَأۡتُواْ بِكِتَٰبِكُمۡ ﴾، ئەمە: (أمرُ تَعجِيزٍ) یانی: فەرمان کردنە بەڵام بۆ دەستەپاچەیی دەرخستنی ئەوان و، دەستەوسان کردنی ئەوان.

کەواتە: لێرەدا خوا ﷻ سێ جۆرە بەڵگەی لەسەر کافرەکان هێناونەوەو لە سێ ڕێیانەوە دەمکوتی کردوون، کە ئەو قسانەی دەیڵێن لە بەرانبەر خوادا، گوایە کوڕی هەن، یان کچی هەن، یان فریشتەکان مێینەن، ئەو قسانە، درۆن:

١- کە دەفەرموێ: ﴿ أَمْ خَلَقْنَا ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ إِنَـٰثًا وَهُمْ شَـٰهِدُونَ ﴾، ئایا ئێمە فریشتەکانمان بە مێینە دروستکردوون و ئەوان ئامادە و ئاگادار بوون؟ بینەر بوون؟ ئایا بەڵگەیەکی ئەزموونیی، بەڵگەیەکی هەستییان بە دەستەوە هەیە (هی پێنج هەستەکان)، کە بە چاو بینیبیان؟ بە تەئکید نەخێر!.

٢- ئایا بەڵگەی عەقڵییان هەیە؟ کە دەفەرموێ: ﴿ أَصْطَفَى ٱلْبَنَاتِ عَلَى ٱلْبَنِينَ ﴿١٥٣﴾ مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿١٥٤﴾ ﴾، ئایا کچانی بەسەر کوڕاندا هەڵبژاردوون؟ چیتانە؟ واتە: عەقڵتان لە کوێیە؟ چیتان بەسەر هاتوە، عەقڵتان لەلا نەماوە! ﴿ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴾، ئایا بیر ناکەنەوە؟ کەواتە: بە بەڵگەی عەقڵییش دیارە، کە ئەو قسەیە قسەیەکی پووچە.

٣- دەمێنێتەوە بەڵگەی بیستەنیی (سَمعي) بەڵگەی وەحیی، ئەویش ئەوەیە کە دەفەرموێ: ﴿ أَمْ لَكُمْ سُلْطَـٰنٌ مُّبِينٌ ﴿١٥٦﴾ فَأْتُوا۟ بِكِتَـٰبِكُمْ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴾، یان بەڵگەیەکی ڕوونتان هەیە؟ واتە: بەڵگەیەك کە پاڵبدرێتە لای وەحیی خوا، دەجا کتێبەکەتان بێنن، ئەگەر لە ڕاستانن! کەواتە: بێگومان ئەوانە نە بەڵگەیەکی واقیعیی و ئەزموونییان بە دەستەوەیە، نە بەڵگەیەکی عەقڵیی، نە بەڵگەیەکی نەقڵیی، کەواتە قسەکەیان قسەیەکی پووچ و بێ بنەمایە.

**مەسەلەی دووەم:**

**ڕەخنەلێگرتنی هاوبەشدانەران، کە لە نێوان خواو جندا پەیوەندیی ڕەچەڵەکیان داناوەو، ڕاگەیاندنی پاکیی و بێ خەوشیی خواو ﷻ، جەختکردنەوەی ئەوە کە شەیتانەکان جگە لە کەسێکی خۆفڕێدەرە دۆزەخ، کەسی دیکەیان پێ لانادرێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلُوا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجِنَّةِ نَسَبًا وَلَقَدْ عَلِمَتِ الْجِنَّةُ إِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ (١٥٨) سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ (١٥٩) إِلَّا عِبَادَ اللَّهِ الْمُخْلَصِينَ (١٦٠) فَإِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ (١٦١) مَا أَنْتُمْ عَلَيْهِ بِفَاتِنِينَ (١٦٢) إِلَّا مَنْ هُوَ صَالِ الْجَحِيمِ (١٦٣) ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ وَجَعَلُوا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجِنَّةِ نَسَبًا ﴾، لە نێوان ئەوو جندەکاندا ڕەچەڵەکیان دانا، واتە: لە نێوان خوا ﷻو جندەکاندا، ڕەچەڵەکێکیان گێڕاو هەڵبەست، ئەمە چەند ئەگەرێکی هەن، مەبەستیان پێی چی بووە؟ دووانیان لە هەموویان بەهێزترن:

أ- هەندێکیان گوتوویانە: خوا لەگەڵ ئیبلیسدا بران، ئەو درۆیەیان کردوە.

ب- هەندێکیان گوتوویانە: فریشتەکان کچانی خوان، لە ئەنجامی ئەوەدا کە خوا لەگەڵ ئافرەتە دانستەکانی جندا هاوسەرگیریی کردوە، لە نێوان خواو مێینەکانی جندا، فریشتەکان بوون، بەڵکو هەندێکیان گوتوویانە: شەیتانەکانیش کوڕانی خوان، وەك چۆن فریشتەکانی کچانی خوان!!

٢)- ﴿ وَلَقَدْ عَلِمَتِ الْجِنَّةُ إِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ ﴾، جندەکان بۆیان دەرکەوت و زانیویانە کە بەدڵنیایی ئەوان ئامادەکراون. واتە: پەلکێش دەکرێن بۆ سزای دۆزەخ، ئنجا کە ئەوان پەلکێش بکرێن بۆ سزای دۆزەخ، نابێ هیچ پەیوەندییەکیان بە خواوە هەبێ، پەیوەندیی جگە لەوە کە دروستکراوی خوان، نابێ پەیوەندیی ڕەچەڵەکیان لەگەڵ

خوادا هەبێ، هەڵبەتە هەندێك لە زانایان لێرەدا، گوتوویانە: وشەی (الجِنَّة) مەبەست پێی فریشتەکانن، بەڵام ئەوە ڕایەکی پووچە، هەرچەندە زۆر لە تەفسیرەکانیش ئەو ڕایەیان هێناوە، بەڵام ڕێی تێناچێ، چونکە قسە لەسەر جندەو، فریشتە بە جیا ناویان هێندراوەو، جند بە جیا ناویان هێندراوە، ئنجا لە قورئاندا زاندراو (معهود) نیە کە خوا بۆ فریشتەکان (جِنّ)ی بەکارهێنابێ، بەڵکو هەر وشەی (ملائكة)ی بەکارهێناوە، بۆیە ئەو قسەیە هەرچەندە زۆر لە تەفسیرەکان هێناویانە، بەڵام بە بڕوای من قسەیەکی بۆش و بێ بنەمایەو نەدەبوو هەر هێنابایان.

٣)- ﴿ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴾، پاکیی بۆ خوا لەوەی کە ئەوان وەسفی دەکەن، ئەوان دەیڵێن، یانی: ئەوان خوای پێ وەسف دەکەن، خوای پێ پێناسە دەکەن، کە دەڵێن: ڕەچەڵەك هەیە لە نێوانی خواو جنددا.

٤)- ﴿ إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴾، جگە لە بەندە ساغکراوەکانی خوا، ئەم (إلاَّ)یە کە ئامرازی هەڵاواردن (أداة الإستثناء)ە، ئایا ئەو هەڵاواردنە دەگەڕێتەوە بۆ کوێ؟

ئەوە دوو ئەگەری هەن:

أ- یان ددگەڕێتەوە بۆ: ﴿ إِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ ﴾، هەموو جندەکان ئامادە دەکرێن، پەلکێش دەکرێن بۆ سزای دۆزەخ، جگە لە بەندە ساغکراوەکانی خوا (عِبادَ اللهِ الْمُخْلَصِين) یان بەندە خۆساغکەرەوەکانی خوا (عِبادَ اللهِ الْمُخْلِصِين) هەردووك خوێندنەوەکانی هاتوون.

ب- یاخود دەگەڕێتەوە بۆ: ﴿ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴾، واتە: پاکیی بۆ خوا لەوەی ئەوان وەسفی دەکەن، خوای پێ وەسف دەکەن، جگە لە بەندە ساغکراوەکانی خوا، ئەوەی ئەوان دەیڵێن، قسەیەکە شایستەی خوایە، ئەوان قسەی بێ ئەزاکەت و ناشایست بەرانبەر بە خوا ناکەن.

٥)- ﴿ فَإِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ بِفَٰتِنِينَ إِلَّا مَنْ هُوَ صَالِ ٱلْجَحِيمِ ﴾، بە دڵنیایی ئێوە خۆتان و ئەوانەش کە دەیانپەرستن، ئێوە لە دژی وی (لە دژی خوا) هەڵگێڕەوەی کەس نین، مەگەر کەسێك خۆتێفڕێدەری دۆزەخ بێ. {(ما) (موصولة) أي: إِنَّكُمْ وَالَّذِي تَعْبُدُونَهُ} ئێوە

خۆتان و ئەوەی کە دەیانپەرستن، واتە: خۆتان و پەرستراوەکانتان، ئەی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان! ئێوە لە دژی خوا هەڵگێڕەوەی کەس نین، لادەری کەس نین، مەگەر کەسێك کە خۆتێفرێدەری کڵپەی دۆزەخ بێ.

هەندێك لە توێژەرەوان تەعبیرەکەیان ئاوا هێناوە:

(أَنْتُمْ أَيُّهَا الْمُشْرِكُونَ وَمَعَكُمْ الشَّيَاطِينُ الَّتِي تَعْبُدُونَهَا! لا تُضِلُّونَ عَنِ اللهِ وَصِرَاطِهِ إلاَّ مَنْ هُوَ صَالِ الْجَحِيمِ، وَضُمِّنَ (بِفَاتِنِين) مَعنى (مُفْسِدِين) لِذا عُدِّيَ بِ(عَلى) أي: لا يَتْبِعُكُمْ أَحَدٌ فِي دِينِكُمْ، إلاَّ مَنْ عَرَّضَ نَفْسَهُ لِيكُونَ صَالِ الْجَحِيمِ) واتە: ئێوە ئەی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، لەگەڵیشتاندا شەیتانەکان کە دەیانپەرستن! هیچ کەس لە خواو ڕێی خوا لانادەن و لە خوا دووریناخەنەوە، مەگەر کەسێك کە خۆی فڕێدەداتە نێو کڵپەی دۆزەخەوە، وشەی (فَاتِنِين) مانای تێکدەران (مُفْسِدِين)ی خراوەتە نێو، بۆیە بە (عَلى) تەعەددای کردوە: ﴿مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ بِفَٰتِنِينَ﴾ [ئەگەرنا (فَاتِنِين) پێویستی بە (عَلى) نەبوو کە تەعەددای پێ بکات، ئنجا کاتێك (فعل)ێك تەعەددا دەکات بە پیتێك کە عادەت نیە تەعەددای پێ بکات، وێڕای مانایەکەی خۆی، مانایەکی دیکەشی دەخرێتە نێو، کە لە عەرەبییدا پێی دەگوترێ: (تضمین) خستنە نێو] کە ئەویش بریتیە لە تێکدەران، واتە: ئێوە گومراکەرو تێکدەر نین بۆ هیچ کەس لە دژی خوا، مەگەر کەسێك خۆی سازبکات بۆ نێو کڵپەی دۆزەخ.

﴿فَإِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ﴾، ئێوەو ئەوەی دەیپەرستن، مەرج نیە ئەوەی دەیپەرستن (وما تعبدون) تەنیا شەیتانەکان بن، بەڵکو یانی: پەرستراوەکانتان بە گشتیی، هەرچییەك و هەر کەسێك بن، خۆتان و پەرستراوەکانتان، لە دژی خوا هیچ کەس تێکنادەن و هەڵناگێڕنەوەو گومڕا ناکەن، مەگەر کەسێك بە ویستی ئازادانەی، خۆی بخاتە نێو دۆزەخەوە، چونکە (صالِ) ناوی بکەر (اسم فاعل)ە، یانی: چووە نێو کڵپە (دَاخِل الجحيم) خۆی بخاتە نێو کڵپەی دۆزەخەوە، واتە: مەگەر

کەسێك خۆی ئارەزوومەندی گومڕایی بێ، ئەگەرنا ئێوە خوا توانایەکی نەداونێ کەس گومڕا بکەن، کەس لە خشتە بەرن، مەگەر کەسێك خۆی ئامادەیی لە خشتەچوون و گومڕابوونی هەبێ.

**مەسەلەی سێیەم:**

**ڕاگەیاندنی فریشتەکان: کە هەرکامیان پێگەیەکی تایبەت و زانراوی هەیەو، بەردەوام بە ڕیز وەستاون بۆ بەندایەتیی خواو، هەردەم سەرگەرمی خوا بە پاککرتنن:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَمَا مِنَّآ إِلَّا لَهُۥ مَقَامٌ مَّعْلُومٌ ﴿١٦٤﴾ وَإِنَّا لَنَحْنُ ٱلصَّآفُّونَ ﴿١٦٥﴾ وَإِنَّا لَنَحْنُ ٱلْمُسَبِّحُونَ ﴿١٦٦﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ وَمَا مِنَّآ إِلَّا لَهُۥ مَقَامٌ مَّعْلُومٌ ﴾، هیچ کام لە ئێمەش نیە، مەگەر پێگەیەکی زاندراوی هەیە، (أي: مَا أَحَدٌ مِنَّا إلاَّ كَائِنٌ لَهُ مَقَامٌ مَعْلومٌ، وَالمَعْلومُ: المُعَيَّنُ المَضْبُوطُ) هیچ کام لە ئێمە نیە، مەگەر پێگەیەکی زاندراوی هەیە، زاندراو واتە: دیاریکراوو کۆنترۆڵکراو (کە دیارە چییەو چۆنە؟).

٢)- ﴿ وَإِنَّا لَنَحْنُ ٱلصَّآفُّونَ ﴾، هەروەها ئێمە {ئێمەی کۆمەڵی فریشتان} ڕیز بووین {ڕاوەستاوین بۆ بەندایەتیی خوا بە ڕیزو ڕێکیی}.

٣)- ﴿ وَإِنَّا لَنَحْنُ ٱلْمُسَبِّحُونَ ﴾، بە دڵنیاییش ئێمە (ئێمەی کۆمەڵی فریشتان) بە پاککرین، واتە: بە پاککرین بۆ خوا ﷻ لە هاوبەش و، لە ڕۆڵەو، لە ڕەچەڵەک هەبوون لە هەندێك لە دروستکراوەکانیدا.

هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ئەمانە قسەی فریشتەکانن و، هەندێك گوتوویانە: قسەی بڕوادارانن، کە بڕوادارانیش هەرکامێکیان بە هۆی ئیمانەکەیەوە، پێگەیەکی دیاریکراوی هەیە، بڕوادارانیش بە ڕیز دەوەستن بۆ نوێژو خوا بە پاکدەگرن، واتە: لە ڕووی ڕێزمانی عەرەبییەوە، دەگونجێ ئەو مانایەی هەبێ، بەڵام کە بە پێی ڕەوت (سیاق) سەرنجی بدەین، باس باسی فریشتان و، باسی جینن و چۆنیەتیی پەیوەندییان لەگەڵ خوای پەروەردگارداو، مامەڵەی خوا لەگەڵیانداو ...هتد، بە لێوردبوونەوەی تەعبیرەکانیش دەردەکەوێ کە ئەوە قسەی فریشتانە، نەك قسەی مرۆڤان بێ.

## کورتە باسێک لە بارەی
## ڕێک وەستانی فریشتانەوە لە خزمەت خواداو
## بەراوردێکی نێوان ئەوان و مرۆڤان

ئەم کورتە باسە لە دوو تەوەردا دێنین:

### یەکەم: تەوەری یەکەم چەند دەقێك:

١- پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {إِنِّي أَرَى مَا لا تَرَوْنَ، وَأَسْمَعُ مَا لا تَسْمَعُونَ، أَطَّتِ السَّمَاءُ، وَحُقَّ لَهَا أَنْ تَئِطَّ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، مَا فِيهَا أَرْبَعُ أَصَابِعَ إلا وَمَلَكٌ يُمَجِّدُ اللَّهَ، لَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ، لَضَحِكْتُمْ قَلِيلاً، وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيراً، وَمَا تَلَذَّذْتُمْ بِالنِّسَاءِ عَلَى الْفُرُشَاتِ، وَلَصَعَدْتُمْ إِلَى الصُّعُدَاتِ تَجْأَرُونَ : رَبَّنَا ، قَالَ أَبُو ذَرٍّ : يَا لَيْتَنِي كُنْتُ شَجَرَةً تُعْضَدُ} (أخرجه أحمد (١٧٣/٥ ، رقم ٢١٥٥٥) والترمذى (٥٥٦/٤ رقم ٢٣١٢) وقال : حسن غريب . وابن ماجه (١٤٠٢/٢ رقم ٤١٩٠) ، والحاكم (٥٥٤/٢ ، رقم ٣٨٨٣) وقال : صحيح الإسناد . وأبو الشيخ فى العظمة (٩٨٢/٣ ، رقم ٥٠٧).

واتە: ئەوەی دەیبینم ئێوە نایبینن و، ئەوەی دەیبیستم ئێوە نایبیستن، ئاسمان جیرەی لێ هات، حەقی خۆشیەتی جیرەی لێ بێ، سوێند بەو زاتەی نەفسی منی بە دەستە، هیچ شوێنێکی چوار پەنجەیی تێدانیە، مەگەر فریشتەیەك نیوچەوانی خۆی خستۆتە سەر زەوی و، خوا بە شکۆدار دەگرێ، ئەگەر ئەوەی من دەیزانم ئێوە بیزانن (زانیباتانایە)، کەم پێدەکەنین و زۆر دەگریان و، چێژتان لە ئافرەتان وەرنەدەگرت لەسەر جێیان {لەگەڵ ئافرەتاندا جووت نەدەبوون} و دەچوونە بەرزاییان، دەچوونە دەشت و کێوان و لە خوا دەپاڕانەوە، هاوارتان دەکرد: پەروەردگارمان! دوایی ئەبوو زەڕ {کە ڕاوی فەرموودەکەیە} گوتی: خۆزگە

دەخوازم کـە درەختێـك بوومایـە، لێکرابامـەوەو پچڕێنرابـام {نـەك مرۆڤێـك کـە سـزاو پاداشــت ڕووی تێــدەکات}.

واتـە: مـرۆڤ ئەگـەر بزانـێ چـی چاوەڕێـی دەکات، لەوانەیـە خۆزگە بـەوە بخوازێ کـە درەختێـك بووایـە، یـان دروسـتکراوێك بووایـە، کە سـزاو پاداشـت ڕووی تێنەکات.

**٢- {عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ، قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ فَقَالَ: «أَلاَ تَصُفُّونَ كَمَا تَصُفُّ الْمَلاَئِكَةُ عِنْدَ رَبِّهَا»، فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ وَكَيْفَ تَصُفُّ الْمَلاَئِكَةُ عِنْدَ رَبِّهَا؟ قَالَ: «يُتِمُّونَ الصُّفُوفَ الأُوَلَ وَيَتَرَاصُّونَ فِي الصَّفِّ»} (أخرجه عبد الرزاق: ٢٤٣٢، وابن أبي شيبة: : ٣٥٣٩، وأحمد: ٢١٠٠١، ومسلم: ٤٣٠، وأبو داود: ٦٦١، والنسائي: ٨١٦، وابن ماجه: ٩٩٢، وابن خزيمة: ١٥٤٤، وابن حبان: ٢١٥٤).**

واتـە: جابیـری کـوڕی سـەموڕە ﷺ، دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ هاتـە دەرێ بـۆ لامـان، فەرمـووی: ئایـا ڕیـز نابـن وەك چـۆن فریشـتەکان لـە خزمـەت پەروەردگاریـان دا ڕیـز دەبـن؟ گوتمـان: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! فریشـتەکان چـۆن ڕیـز دەبـن لـە خزمـەت پەروەردگاریـان دا؟ فەرمـووی: ڕیـزەکان تـەواو دەکـەن، پێشـێ ڕیـزی یـەك، ئنجـا دوو، سـێ.. لـە چەنـد ڕیزێـدا ڕێـك دەوەسـتن، پـاش و پێشـیان نیـە.

**٣- (القرطبي)یش لەوبارەوە ئەم نەقڵە دێنێ، دەڵێ: (وَكَانَ عُمَر يَقُولُ: إِذَا قَامَ للصَّلاةِ: أَقِيمُوا صُفُوفَكُمْ وَاسْتَوُوا، إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ بِكُم هَدْيَ الْمَلاَئِكَةِ عِنْدَ رَبِّهَا، وَيَقْرَأُ: ﴿ وَإِنَّا لَنَحْنُ ٱلصَّآفُّونَ ﴾، تَأَخَّرَ يَا فُلاَن، تَقَدَّمْ يَا فُلاَن! ثُمَّ يَتَقَدَّمُ فَيُكَبِّرُ).[1]**

واتـە: عومـەر (خـوا لێـی ڕازی بـێ) - دیـارە ئـەو کاتـە کـە خەلیفـەی مسـوڵمانان بـووە - کاتـێ بـۆ نوێـژێ هەڵدەسـتا، بـە خەڵکەکـەی دەگـوت: ڕیزەکانتـان ڕاسـت بکـەن و، خۆتـان ڕێکبکـەن، خـوا ﷻ دەیـەوێ وەك شـێوەی ئـاکاری فریشـتەکان بکـەن، کـە لـە خزمـەت پەروەردگاریانـدا دەوەسـتن، ئنجـا ئـەم ئایەتـەی دەخوێندەوە: ﴿ وَإِنَّا لَنَحْنُ ٱلصَّآفُّونَ ﴾ {فریشـتەکان دەڵێـن: ئێمـە بـە ڕیـز وەسـتاوین} دوایـی عومـەر

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج ١٥، ص ١١١.

دەیگوت: فڵانکەس تۆزێ بچۆ دوا، فڵانکەس تۆزێ وەرە پێش، ئنجا کە ڕیزەکانی ڕاست دەکردن، دەچووە پێش و (ألله أكبر)ی دەکردو نوێژەکەی دادەبەست.

**دووەم: تەوەری دووەم: چەند قسەیەکی زانایانی پسپۆڕی بواری تەزکیەو تەصەووف:**

با هەر لە بارەی ئەو سێ ئایەتە موبارەکەوەو، پێگەوپایەی فریشتان و بەراوردیان لەگەڵ مرۆڤان دا، چەند قسەیەکی پسپۆڕانی تەزکیەی نەفس بێنین، کە لە تەفسیری: (البحر المديد في تفسير القرآن المجيد)[1] نووسراوی: (الإمام العلامة أبي العباس أحمد بن محمد بن مهدي إبن عجيبة الحسني) یەوە دەیانهێنین، (إبن عجيبة) چەند قسەیەکی جوان دێنێ و، لە سۆنگەی ئەوەوە کە خۆشی یەکێکە لە زانایانێک کە لە بواری تەزکیەی نەفسیشدا پسپۆڕ بووە، بۆیە وێڕای ئەوەی تەفسیری ئایەتەکان بەو شێوەیە دێنێ کە زانایان گوتوویانە، هەندێک ماناو مەبەستیش کە لێیان وەردەگیرێ، ماناو مەبەستی مەعنەویی و ڕووحیی، ئەوەش دەخاتە نێو تەفسیرەکەی.

ئێمە شەش قسەی جۆراوجۆری لێوە دێنین:

١- قسەی (إبن عجيبة) خۆیەتی: کە دەڵێ: (**مَادَّةُ الآدَمِّي أكْمَلُ مِنْ مَادَّةُ المَلآئِكَةِ، فَإذَا اتَّصَلَ العَبْدُ بِشَيْخٍ كَامِلٍ وَاعْتَنَى بِتَصْفِيَةِ رُوحِهِ وَسِرِّه، طَوى نُورُهُ الْوُجُودَ بِأَسْرِهِ، وَلايَزَالُ يَتَرَقَّى فِي مَعَارِجِ أَسْرَارِ التَّوْحِيدِ وَالتَّفْرِيدِ، وَتَتَوَارَدُ عَلَيْهِ الكُشُوفَاتُ وَالعُلُومُ وَالأَسْرَارُ فِي هَذِهِ الدَّارِ الفَانِية، وَفِي تِلْكَ الدَّارِ الْبَاقِيَةِ أَبَداً سَرْمَداً بِخِلافِ الملائِكَةِ، فَإنَّ لِكُلِّ وَاحِدٍ مَقَاماً مَعْلُوماً لا يَتَعَدَّاهُ كَمَا أَخْبَرَهُ تَعَالى**).

واتە: ماددەی مرۆڤ تەواوترە لە ماددەی فریشتە، ئەگەر مرۆڤ پەیوەست بێ بە شێخێکی تێرو تەواوەوەو، سەرگەرمی پاککردنەوەی ڕووح و دیوی پەنهان

---

(١) ج ٦، ص ١٩٥- ١٩٦.

و نێـوەوەی خـۆی بـێ، ڕووناکیـی ئـەو مرۆڤـە هەمـوو بـوون دەپێچێتـەوەو، ئـەو مرۆڤـە وردە وردە بـە پەیـژەی نهێنییەکانـی خـوا بەیەکگرتـن و خـوا تاککردنـەوەدا سـەردەکەوێ، کەشـفەکان (شـت بـۆ دەرکەوتنـەکان)و زانیارییـەکان و نهێنییـەکان، هـەم لـەم مەنزڵـگای لـە بەینچـوون و زوو تێپـەڕی دنیـادا، هـەم لـەو مەنزڵـگای هەمیشـەماودا، بـە بەردەوامیـی بەسـەریدا دێـن، بـە پێچەوانـەی فریشـتەکانەوە، چونکـە ئـەوان هـەر کامێکیـان پێگەیەکـی دیاریکـراوی هەیـەو لێـی ناچێتـە دەر، هـەر لـەو پێگـەدا دەمێنێتـەوە کـە خـوا ﷻ هەواڵیـداوە.

دوایـی دەڵـێ: (وَسِرُّ ذَلِـكَ أَنَّ الآدَمِيَّـةَ فِيـهِ بَشَرِيَّـةٌ وَرُوحَانِيَّـةٌ، فَكُلَّـمَا جَاهَـدَ نَفْسَـهُ وَغَـابَ عَـنْ حِسِّ بَشَرِيَّتِـهِ، تَرَقَّـى فِي مَعَـارِجِ التَّوْحِيـدِ، وَالْمُجَاهَـدَةُ لا تَنْقَطِعُ عَنْـهُ فِي هَـذِهِ الـدَّارِ، لإِنَّهَـا دَارُ أَكْـدَارٍ فَـلا يَنْقَطِـعُ عَنْـهُ التَّرَقِّـي فِي الْمُشَـاهَدَةِ، وَمَـا فِي تِلْـكَ الـدَّارِ، فَالتَّرَقِّـي فِيهَـا مِـنْ بَـابِ الْكَـرَمِ، وَالْمَثُوبَـةِ عَـلَى مَـا هُنَـا، وَأَيْضـاً الْبَشَرِيَّـةُ لِلآدَمِـي بِمَنْزِلَـةِ الطِّـلاَءِ لِلمِـرْءَاةِ، وَالْمِـرْءَاةُ بِـلاَ طِـلاءٍ لا تُـرَى فِيهَـا صُـوَرُ الأَشْـيَاءِ، كَذَلِـكَ الْمَلاَئِكَـةُ لا بَشَرِيَّـةَ لَهُـمْ، فَـلاَ تَنْكَشِـفُ لَهُـمُ الْحَقَائِـقُ كَمَا تَنْكَشِـفُ لِلآدَمِـي، وَلَـوْ كُشِـفَ لَهُـمْ مـا كُشِـفَ لَـهُ، لَذَابُـوا، وَاللـهُ أَعْلَـمْ).

واتـە: نهێنیـی ئـەوەش [کـە مـرۆڤ لـە فریشـتە زیاتـر دەتوانـێ بـەرەو سـەرتر بچـێ]، ئەوەیـە کـە مـرۆڤ هـەم لایەنـی بەشـەریی هەیـە، هـەم لایەنـی ڕووحانیـی هەیـە [ڕەنگـە مەبەسـتی لـە بەشـەریی لایەنـی ماددیـی بـێ، هـەم لایەنـی ماددیـی هەیـە، هـەم لایەنـی مەعنەویـی و ڕووحیـی هەیـە] ئنجـا هەتـا زیاتـر لەگـەڵ خۆیـدا خەریـك بـێ و، زیاتـر بێئـاگا بـێ لـە لایەنـە ماددییەکـەی، بـە پەیـژەی خـوا بەیەکگرتنـدا سـەردەکەوێ، لەگـەڵ خـۆدا تێکۆشـانیش لـەم مەنزڵـگای دنیایـەدا تـەواو نابـێ، چونکـە شـوێنی لێڵیـی و ناڕەحەتییانـە، بۆیـە بـەرز بوونـەوە لـە دیتنـی خـوادا بـە چـاوی عەقـڵ و دڵ (مُشَـاهَدَة)ی لـێ نابـڕێ، بـەڵام لـەو مەنزڵگایـەدا (لـە ڕۆژی دواییـدا) بـەرز بوونـەوەی مـرۆڤ بـەرەو خـوا لـە ڕووی بەخشـش و پاداشـت دانەوەیەتـی، لـە بەرانبـەر ئـەوەدا کـە لێـرە (لـە دنیـا) بوویـەتی، لایەنـی ماددیـی و

بەشەرییش بۆ مرۆڤ وەك ئەو سواغ و تویخەیە[١] كە لە پشتی ئاوێنە دەدرێ [ئاوێنە شووشەیەكە دەبێ پشتەكەی شتێكی لێ بدرێ] چونكە ئاوێنە ئەگەر پشتەكەی ئەو سواغ و تۆیخەی نەبێ [ئەو پەردەیەی لێ نەدرێ] وێنەی شتەكانی تێدا نابینرێ، فریشتەكانیش چونكە لایەنی ماددییان نیە، بۆیە ئەو ڕاستییانەی بۆ مرۆڤ دەردەكەون، بۆ وان دەرناكەون و، ئەگەر ئەو ڕاستییانەیان بۆ دەركەوتبانایە، دەتوانەوە.

٢- قسەیەكی دیكە: (أبو طالب المكي) لە كتێبی (قوت القلوب)دا دەڵێ: (لَعُمْرِي إِنَّ سَائِرَ الْمَلَائِكَةِ لا يَتَنَقَّلُونَ فِي الْمَقَامَاتِ كَتَرَقِّي الْمُؤْمِنِينَ، إِنَّمَا لِكُلٍّ مَقَامٌ مَعْلُومٌ، لا يَنْتَقِلُ إِلَى غَيْرِهِ، إِلاَّ أَنَّهُمْ يُمَدُّونَ مِن ذَلِكَ بِمَدَدٍ لا نِهَايَةَ لَهُ إِلَى يَومِ الْقِيَامَةِ، بِأَكْثَرَ مِمَّا يُزَادُ جُمْلَةُ الْبَشَرِ).

واتە: بە دڵنیاییی فریشتەكان لە پێگەكاندا ناگوازنەوە، وەك چۆن مرۆڤەكان بەرزدەبنەوەو دەگوازنەوە، هەر كامێكیان پێگەیەكی دیاریكراوی هەیە، كە لێی ناگوازێتەوە بۆ یەكی دیكە، بەڵام لەو پێگەیەی خۆیاندا هاوكاریی (إمداد) دەكرێن [خوا ﷻ هاوكارییان دەكات لە ڕووی عیلم و مەعریفەتەوە] بەبێ سنوور تاكو ڕۆژی دوایی، بە زیاتر لەوەی كە هەموو مرۆڤەكان لەوەدا بۆیان زیاد دەكرێ.

دوایی مشتومڕی هەندێك لە زانایان دێنێ، لەوبارەوە، وەك لە نەقڵی سێیەم و چوارەم دا ئاماژە بە هەندێكی دەكەین.

٣- قسەو نەقڵی سێیەم: (قَالَ الْمُحَشِّي الفَاسِي: وَفِيهِ نَظَرٌ مَعَ تَلَقِّيهِمْ دُرُوبَ الْوَحِيِ الْجَامِعِ لِلْمَقَامَاتِ، فَكَيْفَ لايُمْكِنُهُم التَحَقُّقُ بِهَا عَلى اخْتِلافِهَا؟!).

واتە: (الفاسي) كە پەراوێزی كردوە لەسەر كتێبی (قوت القلوب)ی (أبو طالب المكي) دەڵێ: ئەو قسەیە سەرنج و هەڵوەستەیەك هەڵدەگرێ، لە حاڵێكدا كە

---

(١) تویخ: طلاء، تویخ: سواغێكی تەنكە لە شتێك دەدری.

فریشـتەکان وەحییـان بـۆ دێ و، ئـەو وەحییـە کۆکەرەوەیـە بـۆ هەمـوو پێگـەکان، چـۆن ناتوانـن ئـەو زانسـتانە بـە هەمـوو جۆرەکانیانـەوە لـە خۆیـان دا بهێننـەدی؟!

بـەڵام دیـارە (إبـن عجیبـة) دەڵـێ: (قُلْـتُ وَفِي نَظَـرِهِ نَظَـرٌ، إِذْ لاَيَلْـزَمُ مِـنْ تَلَقِّيهِـمْ لِلْوَحِـيِ، عَـلَى أَن يَتَرَقَّـوا بِـهِ، إِذْ لَيْـسَ التَّرَقِّـي هُـوَ مُجَـرَّدُ العِلْـمِ، إِنَّمَـا التَّرَقِّـي هُـوَ أَذْوَاقٌ وَوِجْـدَانٌ، وَبَعْـدَ حُصُـولِ العِلْـمِ).

واتـە: سـەرنج و هەڵوەسـتەکەی، سـەرنج و هەڵوەسـتەی پێویسـتە، چونکـە ئـەوە کـە فریشـتان وەحییـان بـۆ دێ و وەحیـی وەردەگـرن [بـە هەمـوو شـێوەکانیەوە] ئەمـە ئـەوە ناگەیەنـێ کـە پێـی بەرزببنـەوە، چونکـە بەرزبوونـەوە تەنیـا بـە هـۆی زانیارییـەوە نیـە، بەڵکـو پێبەرزبوونـەوە بەهـۆی چێژتـن و هەسـت پێکردنەکانەوەیـە، کـە لـە دوای پەیدابوونـی زانیاریـی بـۆ مـرۆڤ پەیدادەبـن.

(ئەویـش هـەر تەئکیـدی ئـەو قسـەیە دەکات، کـە مـرۆڤ زیاتـر لـە فریشـتە دەتوانــێ پێهەڵابچــێ و بەرزبێتــەوە).

٤- نەقڵی چوارەم: کە لە (البيضاوي)ەوە دەیهێنێ، دەڵێ: (وَنَصُّ الْبَيْضَاوِيُّ فِي قَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿قَالَ يَـٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئْهُم بِأَسْمَآئِهِمْ ﴿٣٣﴾﴾البقرة، أَنَّ عُلُومَ المَلاَئِكَةِ وَكَمَالاتِهِمْ، تَقْبَلُ الزِّيَادَةَ، وَالحُكَمَاءُ مَنَعُوا ذَلِكَ فِي الطَّبَقَاتُ العُلْيَا مِنْهُمْ، وَحَمَلُوا عَلَيْه، قَوْلَهُ تَعَالَى: ﴿وَمَا مِنَّآ إِلَّا لَهُۥ مَقَامٌ مَّعْلُومٌ﴾، قُلْتُ: تَرَقِّي الآدَمِيِّ هُوَ انْتِقَالٌ مِنْ مَقَامٍ إِلَى مَقَامٍ، حَتَّى يُكَاشَفَ بِأَسْرَارِ الذَّاتِ وَأَنْوَارِ الصِّفَاتِ، ثُمَّ لاَ يَزَالُ يَتَرَقَّى فِي الأَذْوَاقِ وَالْكُشُوفَاتِ، يَتَجَدَّدُ لَهُ فِي كُلِّ يَوْمٍ، وَسَاعَةٍ، حَلاوَةٌ وَكَشْفٌ لَمْ تَكُنْ عِنْدَهُ قَبْلُ، بِخِلافِ المَلاَئِكَةِ، فَإِنَّمَا يَتَرَقَّى كُلُّ وَاحِدٍ فِي كَشْفِ أَسْرَارِ مَقَامِهِ، يَجِدُ حَلاوَةَ ذَلِكَ المَقَامِ، لَمْ تَكُنْ ذَلِكَ قَبْلُ وَلا يَنْتَقِلُ مِنْهُ)، واتە: (بيضاوي) لە تەفسیری فەرمایشتی خوادا کە دەفەرموێ: ﴿قَالَ يَـٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئْهُم بِأَسْمَآئِهِمْ ﴿٣٣﴾﴾البقرة، (خوا) فەرمووی: ئەی ئادەم! هەواڵی ناوەکانیان پێ بدە، زانیاریی فریشتەکان و تەواوییەکانیان دەگونجێ زیاد ببن، هەرچەندە حەکیمەکان، لە چینە سەرەوەکانی فریشتان، ئەوەیان رێ لێگرتوە، [گوتوویانە: ئەوان زیاد ناکەن] فەرمایشتی خواش کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا مِنَّآ إِلَّا لَهُۥ مَقَامٌ

مَّعْلُومٌ ﴾، هیچ کامان نیە مەگەر پێگەیەکی زاندراوی هەیە، ئەوەیان بەوە تەفسیر کردوە، {(البیضاوي) دەڵێ:} بەرزبوونەوەی مرۆڤ بریتیە لە گواستنەوەی لە پێگەیەکەوە بۆ پێگەیەکی دیکە، تاکو نهێنییەکانی زاتی (خوا)و، ڕووناکییەکانی سیفەتەکانی (خوای) پێ دەرك دەکرێن، دوایی وردە وردە هەر بەرز دەبێتەوە، لە چێژتنەکان و لە کەشفەکان دا، لە هەر ڕۆژێك و هەر سەعاتێکدا شیرینایەتییەك و بۆ دەرکەوتنێك، کە پێشتر لەلای نەبووە، دێتە دەستی، بە پێچەوانەی فریشتەکانەوە، کە فریشتەکان هەر کامێکیان تەنیا لە بۆ دەرکەوتنی ئەو پێگەیەیە کە خۆی تێیدایە، لەوێدا هەڵدەکشێ و، تەنیا شیرینایەتیی ئەو پێگەیە کە پێشتر لەلای نەبووە، دەیچێژێ، بەڵام لەوێ ناگوازێتەوە بۆ پێگەکانی دیکە.

٥- نەقڵی پێنجەم: (قَالَ «القُشَيري»: الملائِكَةُ لا يَتَخَطَّوْنَ مَقَامَهُمْ وَلا يَتَعَدَّوْنَ حَدَّهُمْ، وَالأَولِيَاءُ مَقَامُهُمْ مَسْتُورٌ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ اللهِ، لا يَطَّلِعُ عَلَيْهِ أَحَدٌ، وَالأنْبِيَاءُ (عَلَيْهِمُ السَّلام) لَهُمْ مَقَامٌ مَنْشُورٌ مُؤَيَّدٌ بِالمُعْجِزَاتِ الظَّاهِرَةِ، لِإِنَّهُمْ لِلْخَلْقِ قُدْوَةٌ، فَأَمْرُهُمْ عَلى الشُّهْرَةِ، وَأَمْرُ الأَوْلِيَاءِ عَلى السَّتْرِ).

واتە: (القُشَيري) گوتوویەتی: فریشتەکان لە پێگەی خۆیان ناچنە سەرترو، لە سنووری خۆیان ناچنە دەر، بەڵام دۆستانی خوا، پێگەکەیان شێردراوەیە لە نێوان خۆیان و خواداو، هیچ کەس نایزانێ، پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) پێگەیەکی زانراویان هەیە کە بە موعجیزە ئاشکرایەکان، پشت ئەستوورە، چونکە ئەوان پێشەوای خەڵکن، بۆیە پێویستە دەربکەون و بناسرێن، بەڵام دۆستانی خوا زیاتر حاڵەتی پەنهانیی و شێردراوەییان هەیە.

٦- نەقڵی شەشەم: (قَالَ (الوَرْتَجَبي): البِدَايَاتُ فِي مَقَامِ الطَّاعَاتِ، وَالأَوْسَاطُ فِي المَقَامَاتِ، مِثْلُ التَّوَكُّلِ وَالرِّضَا وَالتَّسْلِيمِ، وَالمُحِبُّونَ فِي مَقَامَاتِ الحَالاَتِ وَالمَوَاجِيدِ، وَأَهْلِ المَعْرِفَةِ فِي مَقَامِ المَعَارِفِ يُنْقَلُونَ فِي المُشَاهَدَةِ مِنْ مَقَامٍ إلى مَقَام، وَلاَ يَبْقَى المَقَامُ لِلمُوَحِّدِين، فَإِنَّهُم مُسْتَغْرِقُونَ فِي بِحارِ الذَّاتِ وَالصِّفَاتِ، فَلَيْسَ لَهُم مَقَامٌ مَعْلُوم، لِإنَّ هُنَاكَ لَمْ يَكُنْ لَهُمُ الوُقُوف

حَيْثُ أَفْنَاهُمْ قَهْرُ الجَلالِ وَالجَمَالِ وَالعَظَمَةِ وَالكِبرِياء عَنْ كُلِّ مَاوَجَدُوا مِنَ الحَقِّ، فَيَبْقُون فِي الفَنَاءِ إِلى الأَبَد).

(الوَرْتَجبي) دەڵێ: سەرەتایەکان بریتین لە پێگەی فەرمانبەریی (ئەوانەی کە لە سەرەتاوە دەست پێدەکەن، ئەوان خەریکی تاعەتن و لەززەت زیاتر لەوە دەکەن) و، ئەوانەی کە لە نێوەڕاستن، لەززەت لەو پێگانەی کە دەیانچنەتێ دەکەن، وەك پشت بە خوا بەستن و، لە خوا ڕازیی بوون و، ملکەچ بوون بۆ خوا، خۆ بەدەستەوەدان بۆ خوا، بەڵام ئەوانەی کە خۆشویستانن بۆ خوا، ئەوانەش حاڵەتی حاڵ لێهاتن و بێئاگاییان بەسەردا دێ، لەبەر خۆشویستنی خواو، ئەهلی مەعریفەتیش لە پێگەی زانستەکاندان و، لە زانیارییەکەوە بۆ زانیارییەکی دیکە دەگوازرێنەوە، [ئەو دەیانکات بە پێنج جۆر: (المُبتدئين)، (المتوسطين)، (المحبين)، (العارفين)، (المُوَحِّدين)] بەڵام خوا تاککەرەوان (مُوَحِّدين)، هیچ پێگەیەکیان بۆ نامێنێتەوە، چونکە ئەوان لە دەریای زات و سیفەتەکان دا وا نغرۆ بوون، هیچ پێگەیەکی دیاریکراوو زاندراویان نیەو وەستانیان نیە، بەڵکو دەستەڵاتی شکۆو جوانیی و مەزنیی و گەورەیی خوا دایپۆشیون و، بەردەوام کەوتوونە حاڵەتی ئاگا لە خۆبڕان (فناء)ەوە.

ئەمانە چەند قسەیەك بوون لە بەر ڕۆشنایی ئەو ئایەتە موبارەکانەدا، بە چاکم زانی ئاماژەیەکیان پێ بکەم، بەڵام ئەو قسانە هەموویان وەك چۆن قسەی شەرعزانان ئیجتیهادو بۆچوونی ئەوانە، ئەو قسانەش ئیجتیهادو بۆچوونی ئەو زانایانەیە لە بواری خۆیانداو، ئەگەری پێکان و نەپێکانیان هەیەو، هەرکامیان زیاتر تەعبیری کردوە لە حاڵەتی ئیمانیی و ڕووحیی خۆی.

**مەسەلەی چوارەم:**

**لاف لێدانی بێبڕوایانی ڕۆژگاری پێغەمبەری خاتەم ﷺ، پێش هاتنی: کە ئەگەر ئەوان بیرخەرەوەو پەیامێکی خوایی وەك هی پێشووانیان بۆ بێ، بەندەی زۆر ساغی خوا دەبن، کەچی دوای هاتنی، پێی بێبڕوا بوون:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِن كَانُوا۟ لَيَقُولُونَ ﴿١٦٧﴾ لَوْ أَنَّ عِندَنَا ذِكْرًا مِّنَ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٦٨﴾ لَكُنَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿١٦٩﴾ فَكَفَرُوا۟ بِهِۦ ۖ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿١٧٠﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایاتانە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ وَإِن كَانُوا۟ لَيَقُولُونَ ﴿١٦٧﴾ لَوْ أَنَّ عِندَنَا ذِكْرًا مِّنَ ٱلْأَوَّلِينَ ﴾، ئەوان بە دڵنیایی دەیانگوت، پێشتر دەیانگوت، لە ڕابردوودا، واتە: بێبڕوایانی ڕۆژگاری پێغەمبەری ﷺ دەیانگوت، ئەگەر ئێمە یادخەرەوەیەك لەوەی كە بۆیەكەمەكان هاتوە، لەلامان بووایە. وەك گوتمان: (إِنْ) بۆ (مُخَفَّفَة)یە لە (مُثَقَّلَة) و بۆ جەختكردنەوەیە.

واتە: ئەگەر ئەوەی كە لە ڕابردوودا بۆ گەلانی دیكە هاتوە، لە وەحیی و پەیامی خوا، ئێمەش لەلامان بووایە.

٢)- ﴿ لَكُنَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴾، بەدڵنیایی ئێمە لە بەندە ساغكراوەكانی خوا دەبووین، یان: لە بەندە خۆساغكەرەوەكان (المُخْلِصين) - كەواش خوێنراوەتەوە - دەبووین بۆ خوا، واتە: ئەگەر كتێبێكمان بۆ دابەزیبایە لەوەی كە بۆ پێغەمبەرانی پێشوو (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ) دابەزیوە، ئێمە زۆر بەندەی ساغ و پاك و چاكی خوا دەبووین.

كە دەڵێن: ﴿ لَكُنَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴾، **(أي: لَكُنَّا عِبَادَ اللهِ دُونَ غَيْرِنَا، وَالمُخْلَصِين مُعَرَّفٌ بِلامِ الْجِنْسِ أي: لانفَرَدْنَا بالإِخْلاصِ، فَكَأَنَّ إِخْلاصَ غَيْرِهِم لا يُعْتَدُّ بِهِ)** ئەم ڕێژگە (**صیغة**)یە كورتهەڵێنان دەگەیەنی واتە: بەس ئێمە بەندەی چاك دەبووین بۆ خوا، نەك جگە لە خۆمان، (**المُخْلَصِين**)یش كە (**أل**)ی ناساندنی لەسەرە بۆ

تێکڕا (جِنس)یە، بەس ئێمە ساغكراوە دەبووین بۆ خوا، یانی: ساغكرانەوەی، یان: خۆساغكردنەوەی جگە لە لەوان هەر ئیعتیباری پێ نەدەكرا لەچاو هی ئێمە، ئەمە وەك ئەو ئایەتەی سووڕەتی (الأنعام)ە، كە دەفەرموێ: ﴿ أَوْ تَقُولُوا لَوْ أَنَّا أُنزِلَ عَلَيْنَا الْكِتَابُ لَكُنَّا أَهْدَىٰ مِنْهُمْ ﴾، واتە: نەوەك بڵێن: ئەگەر ئێمە كتێبمان بۆ لا دابەزیبایە، ڕێی ڕاستگرتووتر دەبووین لەوان، هەروەها وەك ئایەتەكەی سووڕەتی (فاطر)یشە كە دەفەرموێ: ﴿ وَأَقْسَمُوا بِاللَّهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ لَئِن جَاءَهُمْ نَذِيرٌ لَّيَكُونُنَّ أَهْدَىٰ مِنْ إِحْدَى الْأُمَمِ فَلَمَّا جَاءَهُمْ نَذِيرٌ مَّا زَادَهُمْ إِلَّا نُفُورًا ﴾، واتە: زۆر بە خەستیی سوێندیان بە خوا خوارد، [خۆیان ماندوو كرد لە سوێند خواردنەكەیاندا، بە جەختكردنەوە]، كە ئەگەر ورياكەرەوەیەكیان بۆ بێ، ئەوە چ كۆمەڵگایەك لە هەمووان هیدایەتدراوترو ڕێی ڕاستگرتووترە، وەپێش ئەویش دەكەونەوە، بەڵام كاتێ كە بۆیان هات، هەر سڵەمینەوەی تێدا زیاد كردن.

٣)- ﴿ فَكَفَرُوا بِهِ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴾، كەچی كاتێك بۆیان هات، پێی بێبڕوا بوون، بەڵام لەمەودوا دەزانن، كە دەفەرموێ: (**فَكَفَرُوا بِهِ**)، (بِهِ) واتە: بەو كتێبە، بەو زیكرە كە ئاوات و خۆزگەیان پێ دەخواست، ئەگەر بۆیان هاتبایە، دەبوونە بەندەی زۆر ساغ (**مُخْلَص**) و خۆساغكەرەوە (**مُخْلِص**) بۆ خوا! كەچی كە بۆیان هات، پێی بێبڕوا بوون، ﴿ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴾، لەمەودوا دەزانن، واتە: لەمەودوا دەزانن چ سزایەك دەدرێن لەسەر ئەو قسەیەی كردیان، بەڵام نەیانهێنایەدی.

**مەسەلەی پێنجەم:**

**بەڵێـن و بڕیـاری خـوا بـە پشـتگیریی کردنـی پێغەمبـەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ) و زاڵبوونـی سـەربازەکانی بەسـەر ناحەزانیانـدا، تێپەڕیـوەو ڕاگەیەندراوە:**

خــوا دەفەرمــوێ: ﴿ وَلَقَدْ سَبَقَتْ كَلِمَتُنَا لِعِبَادِنَا الْمُرْسَلِينَ (١٧١) إِنَّهُمْ لَهُمُ الْمَنصُورُونَ (١٧٢) وَإِنَّ جُندَنَا لَهُمُ الْغَالِبُونَ (١٧٣) ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ وَلَقَدْ سَبَقَتْ كَلِمَتُنَا لِعِبَادِنَا الْمُرْسَلِينَ ﴾، بە دڵنیایی وشە (و بڕیار)ی ئێمە تێپەڕیوە [بڕیاری ئێمە کە لە وشەکانماندا بەرجەستە بووە، جا چ وشەی (تشريعي) بێ کە وەحییە، چ وشەی (تكويني) بێ، کە تەعبیرە لە ویستی خوا] بۆ بەندە ڕەوانەکراوەکانمان، کە چییە؟

٢)- ﴿ إِنَّهُمْ لَهُمُ الْمَنصُورُونَ ﴾، بە دڵنیایی هەر ئەوان سەرکەوتوو و پشتگیریی لێکراو دەبن.

ئـەم ڕسـتەیە ڕوونکـەرەوەی ڕسـتەی پێشـوویە، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَقَدْ سَبَقَتْ كَلِمَتُنَا لِعِبَادِنَا الْمُرْسَلِينَ ﴾، ئایـا ئـەو وشـەیە کـە خـوا بـۆ بەنـدە ڕەوانەکراوەکانـی فەرموویەتـی و تێپەڕیـوە، ئـەو بڕیـارە چییـە؟ ئەوەیـە کـە هـەر ئـەوان سـەرکەوتوون و پشـتگیریی کراون.

٣)- ﴿ وَإِنَّ جُندَنَا لَهُمُ الْغَالِبُونَ ﴾، هەروەها تەنیا سەربازەکانی ئێمەش زاڵ دەبن (بەسەر ناحەزەکانیاندا)، ئەمە موژدەیەکی زۆر خۆشە بۆ پێغەمبەر ﷺ، بۆ شوێنکەوتووانی لە ڕابردوو و، ئێستاو، لە داهاتووش دا.

ئەمــەش وەك ڕاسـتییەك و یاسـایەکی گشـتیی خـوا، خـوا لـە چەنـد شـوێنێکدا هێناویەتـی، بـۆ وێنـە:

أ- لە سوورەتی (المجادلة)دا دەفەرموێ: ﴿ كَتَبَ ٱللَّهُ لَأَغْلِبَنَّ أَنَا۠ وَرُسُلِىٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴿٢١﴾ ﴾، واتە: خوا تۆماری کردووە کە خۆم و ڕەوانەکراوانم زاڵ دەبین، بێگومان خوا زاڵی باڵادەستە.

ب- لە سوورەتی (یونس)یشدا دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ نُنَجِّى رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ۚ كَذَٰلِكَ حَقًّا عَلَيْنَا نُنجِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠٣﴾ ﴾، واتە: دوایی پێغەمبەرانمان و ئەوانەی بڕوایان هێناوە، دەربازیان دەکەین، ئەوە هەقە لەسەرمان کە ئێمە بڕواداران قوتارکەین.

ج- لە سوورەتی (غافر)یش دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ ٱلْأَشْهَٰدُ ﴿٥١﴾ ﴾، واتە: بە دڵنیایی ئێمە پێغەمبەرانمان و ئەوانەی بڕوایان هێناوە لە ژیانی دنیاداو، لەو ڕۆژەدا کە شایەد ڕاست دەبنەوە (لە ڕۆژی دوایی دا) سەردەخەین.

د- هەروەها لە سوورەتی (الروم)یش دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ رُسُلًا إِلَىٰ قَوْمِهِمْ فَجَآءُوهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَٱنتَقَمْنَا مِنَ ٱلَّذِينَ أَجْرَمُوا۟ ۖ وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نَصْرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٧﴾ ﴾، واتە: بە دڵنیایی لە پێش تۆدا پێغەمبەرانمان ناردوون بۆ لای گەلەکانیان، بەڵگە ڕۆشن و ئاشکرایەکانیان بۆ هێنان، دوایی ئێمە تۆڵەمان ستاندەوە لەوانەی تاوانیان دەکردو، لەسەرمان پێویستە یارمەتیی بڕواداران بدەین و سەریان بخەین.

**پرسیارو وەڵامێك:**

**پرسیار:** کوژران و دەربەدەر بوونی ژمارەیەك لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)و، تێشکانی مسوڵمانان و بێهێزو پێزییان بە تایبەت لەم ڕۆژگارەدا، چۆن لەگەڵ ئەو بەڵێنانەی خوای پەروەردگاردا دەگونجێ؟

وەڵامەکەی لە سێ ڕاستییاندا دەخەینەڕوو:

١- مەگەر چۆن، ئەگەرنا لە هەموو ڕووبەڕوو بوونەوەکاندا، هەر پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) و شوێنکەوتووانیان سەرکەوتوون بەسەر بەرانبەرەکانیاندا، بنچینەی گشتیی وابووە، بەڵام هەموو بنچینەیەك هەڵاواردنیشی تێدایە.

٢- مەبەست لە سەرکەوتن و زاڵبوون، سەرکەوتن و زاڵبوونی بەڵگەیەو سەربەرزییەو دانەبەزینە لە مەبدەئەکان، لە پرنسیپەکان، کە ئەوەش هەمیشە بووە بۆ پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)و بۆ شوێنکەوتووانی ڕەسەنیشیان.

٣- مەبەست سەرەنجامی چاکی ڕۆژی دواییە، کە ئەوەش هەمیشە مسۆگەرە بۆ پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، بۆ شوێنکەوتوانیشیان لە بڕواداران.

**مەسەلەی شەشەم:**

**فەرمانکردنی خوا ﷻ بە پێغەمبەرەکەی موحەممەد ﷺ کە بۆ ماوەیەکی کەم ڕوو لە کافرەکان وەربگێڕێ و، بایەخیان پێ نەدات و، سەرنجی حاڵ و باڵیان بدات و، دڵنیا بێ، کە خۆشیان دەبینن و دەزانن چییان بەسەر دێ، پەلە کردنیشیان لە هاتنی سزای خوا، شتێکی بێ جێیە، چونکە کاتێك بەڵاو سزایان بۆ دادەبەزێ، ڕۆژیان زۆر خراپ دەبێ، بۆیە پشتتێکردن و چاوەڕێ کردن و، سەرنجدانیان بۆ ماوەیەکی کەم، پێویستە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَتَوَلَّ عَنْهُمْ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿١٧٤﴾ وَأَبْصِرْهُمْ فَسَوْفَ يُبْصِرُونَ ﴿١٧٥﴾ أَفَبِعَذَابِنَا يَسْتَعْجِلُونَ ﴿١٧٦﴾ فَإِذَا نَزَلَ بِسَاحَتِهِمْ فَسَاءَ صَبَاحُ الْمُنذَرِينَ ﴿١٧٧﴾ وَتَوَلَّ عَنْهُمْ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿١٧٨﴾ وَأَبْصِرْ فَسَوْفَ يُبْصِرُونَ ﴿١٧٩﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا

١)- ﴿ فَتَوَلَّ عَنْهُمْ حَتَّىٰ حِينٍ ﴾ [خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:] بۆ ماوەیەکی کەم پشتیان تێبکە، ڕوویان لێ وەرگێڕە.

بە تەئکید لێرەدا پشت تێکردن و ڕوو لێوەرگێڕان، مەبەست ئەوە نیە کە بانگیان نەکات و سەرقاڵ نەبێ بە ڕێ پێشاندانیانەوە، بەڵام واتە: ڕوو وەرگێڕە لە قسەو قاڵیان، لە هەڕەشەو گوڕەشەیان، لە ئازارو ناڕەحەتییەکانیان.

٢)- ﴿ وَأَبْصِرْهُمْ فَسَوْفَ يُبْصِرُونَ ﴾، هەروەها بیانبینەو ئەوانیش لە مەودوا دەبینن، چی دەبینن؟ بەرکار (**مفعول به**)ەکەی قرتێندراوە، لەبەر ئەوەی سیاق دەلالەتی لەسەر دەکات، واتە: دەبینن ئەو سزایەی کە لە دنیادا بە ملیان دادێ، یان لە دوارۆژدا یەخەیان دەگرێ، ڕوونکەرەوەیەکی قورئان گوتوویەتی: (**عُبِّرَ عَنْ تَرْتِيبِ نُزُولِ الْعِقَابِ بِهِمْ بِفِعْلِ الإِبْصَارِ، لِلدَّلالَةِ عَلَى أَنَّمَا تُوعَدُونَ بِهِ قَرِيبٌ لا مُحَالَةَ، لِأَنَّ تَحْدِيقَ الْبَصَرِ لا يَكُونُ إِلاَّ إِلَى شَيْءٍ أَشْرَفَ عَلَى الحُلُول**).

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَأَبۡصِرۡهُمۡ فَسَوۡفَ يُبۡصِرُونَ ﴾، بـە کـردەوەی تەماشـا کـردن و بینیـن، تەعبیـر کـراوە لـە دابەزینـی سـزای خـوا بۆیـان، واتـە: ئـەوەی کـە هەڕەشـەیان پێـی لـێ دەکـرێ زۆر نیزیکـە، چونکـە مـرۆڤ دەتوانـێ تەماشـای شـتێك بـکات کـە خەریك بـێ بـێ، واتـە: تەماشا بـکات خەریکـە سـزایەکەیان وەدەرکـەوێ!

٣)- ﴿ أَفَبِعَذَابِنَا يَسۡتَعۡجِلُونَ ﴾، ئایا پەلە لە هاتنی سزای ئێمە دەکەن، هەمزە (أ)ی (أَفَبِعَذَابِنَا) بۆ پرسیارکردنی نکوولّیلێکەرانەیە واتە: شتێکی نکوولّیلێکراوو سەیرە! ئایا پەلە دەکەن لە سزاو ئازارەکەی ئێمە بۆیان بێ؟

٤)- ﴿ فَإِذَا نَزَلَ بِسَاحَتِهِمۡ ﴾ [خوێنراویشەتەوە: (فَإِذَا نُزِلَ بِسَاحَتِهِمْ)] کاتێ دابەزیە سەر دەوروبەرو مەیدانەکەیان، یاخود: حەوشەی ماڵەکانیان.

٥)- ﴿ فَسَآءَ صَبَاحُ ٱلۡمُنذَرِينَ ﴾ ئەوکاتە بەرەبەیانی ترسێنراوان یەکجار خراپە. ئەم (ف)ە، ڕوونکەرەوەیە، (الفَاءُ فَصِيحَةٌ أَي: كَانُوا يَسْتَعْجِلُونَ بِالْعَذَابِ فَإِذَا نَزَلَ بِهِمْ فَبِأْسَ الوَقْتُ وَقْتُ نُزُولِهِ) واتە: پێشتر پەلەیان دەکرد لە هاتنی سزای خوا، بەڵام کاتێك سزای خوا بۆیان هات، خراپترین کات کاتێکە کە سزای خوا بۆیان دادەبەزێ، [کە بەرەبەیانە، لەبەر ئەوەی بە زۆریی دوژمن لە بەرەبەیاناندا پەلاماری یەکدییان داوە].

٦)- ﴿ وَتَوَلَّ عَنۡهُمۡ حَتَّىٰ حِينٖ ﴾، [جارێکی دیکەش خوا دەفەرموێ:] پشتیان تێبکە بۆ ماوەیەکی کەم.

٧)- ﴿ وَأَبۡصِرۡ فَسَوۡفَ يُبۡصِرُونَ ﴾، هەروەها ببینە، ئەوانیش دەبینن، واتە: سزایەك دەوریان دەدات، کە هەر دەبێ تەماشای بکەی و ئەوانیش هەر دەبێ تەماشای بکەن.

پێشـتر کـە خـوا فەرموویەتـی: ﴿ وَأَبۡصِرۡهُمۡ ﴾، لێـرە پێویسـتی نەکـردوە بـەرکار (مفعـول بە)ەکـەی بێنـێ، هـەر فەرموویەتـی: ﴿ وَأَبۡصِرۡ ﴾، چونکـە پێشـتر هاتـوە، واتە: ئـەوان ببینـەو ئەوانیـش دەبینـن، یـانی: ئـەوان ببینـە چییـان بەسـەردێ، ئەوانیـش دەبینـن چییـان بەسـەردێ!

هەندێك لە زانایان گوتوویانە:

أ- ئەوەی پێشێ بۆ دنیایە، ئەمەشیان بۆ ڕۆژی دواییە، واتە: لە ڕۆژی دواییدا دەبینن.

ب- یاخود: دەگونجێ ئەمەیان بۆ جەختکردنەوەی ئەوە بێ، کە لە ڕستەی پێشوودا هاتوە.

ج- دەشگونجێ ئەوەی پێشوو هەر لە دنیا بێ، ئەمەش هەر لە دنیادا بێ، بەڵام دوای ئەوەی کە هاتنی سزایەکە زۆر نیزیك بۆتەوەو، خەریکە وەدەرکەوێ.

لەوبارەوە با ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ بێنین: {عَنْ ابْنِ سِيرِينَ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ، يَقُولُ: صَبَّحَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ خَيْبَرَ بُكْرَةً، وَقَدْ خَرَجُوا بِالْمَسَاحِي، فَلَمَّا نَظَرُوا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالُوا: مُحَمَّدٌ وَالْخَمِيسُ، فَرَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدَيْهِ وَقَالَ: أَللَّهُ أَكْبَرُ خَرِبَتْ خَيْبَرُ، إِنَّا إِذَا نَزَلْنَا بِسَاحَةِ قَوْمٍ فَسَاءَ صَبَاحُ الْمُنْذَرِينَ} (أخرجه أحمد: ١٢٦٧٠، البخاري: ٤٢٠٠، ومسلم: ١٤٢٧)، واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بەرەبەیان هێرشی کردە سەر خەیبەر، کە ئەوان بە بێڵ و پاچانەوە بۆ کشتوکاڵ (ئەوان ئەهلی کشتوکاڵ بوون) چوونە دەر، کاتێك تەماشایان کرد گوتیان: موحەممەدو سوپا هات، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (أَللهُ أَكْبَر) خەیبەر وێران دەبێ، ئێمە کاتێك هاتینە نێو بەرو حەوشە، [یان گۆڕەپانی] خەڵکێکەوە، خراپترین بەرەبەیان بەرەبەیانی ئەوانەیە کە ئاگادارکراونەوەو ترسێنراون.

کە دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا نَزَلَ بِسَاحَتِهِمْ فَسَآءَ صَبَاحُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴾، ئەمە نواندن و وێچواندنی حاڵیانە بە حاڵی کەسێك کە دوژمن بەسەری دادەدات، سزایەکە وەك سووپایەکە وایە، هاتنەکەی، وەك ئەوە وایە، ئەو دوژمنە بێتە نێو بەرو حەوشەیانەوە، ئەو زیانەی پێیان دەگات، وەك ئەوە وایە کە ئەوان لە بەرانبەر ئەو سووپایەدا تێبشکێن، کاتی هاتنی سزای خواش، وەك ئەو بەرەبەیانەیە کە دوژمن هێرش دەکاتە سەر دوژمنەکەی و تێکی دەشکێنێ.

(الزمخشري) لە تەفسیری (الكشاف)دا ئەمەی هێناوە، کە باسمانکرد.

**مەسەلەی حەوتەم و کۆتایی:**

**ڕاگەیاندرانی پاکیەتیی خوای خاوەن عیززەت و، سەلام ناردن بۆ پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)و، ستایشکردنی خوای پەروەردگاری جیهانییان:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ سُبۡحَٰنَ رَبِّكَ رَبِّ ٱلۡعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٨٠﴾ وَسَلَٰمٌ عَلَى ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿١٨١﴾ وَٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٨٢﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ سُبۡحَٰنَ رَبِّكَ رَبِّ ٱلۡعِزَّةِ ﴾، پاکیی بۆ پەروەردگارت، خاوەنی هەموو باڵادەستیی، واتە: پاکیی بۆ خوا کە خاوەنی هەموو باڵادەستییەکە.

٢)- ﴿ عَمَّا يَصِفُونَ ﴾، لە هەر شتێك کە {هاوبەش بۆ خوادانەران و جگە لە وانیش} خوای پێ وەسف دەکەن و، شایستەی خوا نیە، واتە: لەوەی کە ئەوان دەیڵێن و خوای پێ وەسف دەکەن.

٣)- ﴿ وَسَلَٰمٌ عَلَى ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴾، سەلام و ئاشتیی و سەلامەتیی لەسەر ڕەوانەکراوان، (الطبري) دەڵێ: **(أَمَنَةٌ مِنَ اللهِ لِلْمُرْسَلِينَ الَّذِينَ أَرْسَلَهُمْ إِلى أُمَمِهِمُ الَّذِينَ ذَكَرَهُمْ فِي هَذِهِ السُّورَةِ وَغَيْرِهِمْ، مِنْ فَزَعِ يَومِ الْعَذَابِ الأَكْبَرِ وَغَيْرِ ذَلِكَ مِنْ مَكْرُوهٍ، أَنْ يَنَالَهُمْ مِنْ قِبَلِ اللهِ تَبَارَكَ وَتَعَالى)**[1]، واتە: دڵنیایی خوا بۆ پێغەمبەرانێك (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) کە ناردوونی بۆ گەلەکانیان، ئەوانەی کە لەم سوورەتەدا ناویان هاتوە، هەروەها جگە لە وانیش، لە ترس و ڕاچڵەکینی ڕۆژی سزای گەورەو، جگە لەوەش لە هەر ناپەسندیی و خراپەیەك کە بەسەریان بێ، لە لایەن خوای بەرزەوە (تَبَارَكَ وَتَعَالى).

٤)- ﴿ وَٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾، (الطبري) دەڵێ: **(وَالحَمْدُ للهِ رَبِّ الثَّقَلَيْنِ لِلْجِنِّ، وَالإِنْسِ، خَالِصاً دُونَ مَا سِواهُ، لِإنَّ كُلَّ نِعْمَةٍ لِعِبَادِهِ فَمِنْهُ، فَالحَمْدُ لَهُ خَالِصٌ لا شَرِيكَ لَهُ، كَمَا لا**

---

(١) بە ژمارە: ٢٩٧٣٩.

شَرِيكَ لَهُ فِي نِعَمِهِ عِنْدِهِمْ بَلْ كُلُّهَا مِنْ قِبَلِهِ وَمِنْ عِنْدِهِ)[1] واتە: ستاییش بۆ خوای هەردوو قورساییەکان: جینن و مرۆڤ، {کە سەرزەوییان قورسکردوە} بە ساغیی بێ ئەوەی کە بەشی جگە لەوی تێدا بێ، چونکە هەر نیعمەت و چاکەیەك کە هی بەندەکانە، هەمووی لە خواوەیە، بۆیە پێویستە ستایشیش تەنیا بۆ خوا بێ و هیچ هاوبەشی بۆ دانەنرێ، هەروەك چۆن هاوبەشی نین لە چاکەکانیدا، بەڵکو هەموو چاکەکان لە خواوەن، پێویستە ستایشکردنەکەش هەمووی بۆ خوا بێ.

---

(١) بە ژمارە: ٢٩٧٤٠.

## سێ کورتە سەرنج لەبارەی
## سێ ئایەتی کۆتایی (الصافات)ەوە

١- کە دەفەرمووێ: ﴿رَبِّ ٱلۡعِزَّةِ﴾، چۆن گوتراوە: (رَبِّ ٱلۡعِزَّةِ)، (عِزَّة) سیفەتی (ذات)ە، وەك (قُدْرَة)، ناگوترێ (رَبُّ الْقُدْرَة)؟ وەڵامەکەی ئەوەیە کە وشەی (عِزَّة) جاری وا هەیە سیفەتی خود (ذات) دەبێ و، جاری واشە سیفەتی کردار (فعل) دەبێ، وێنەی سیفەتی (ذات) وەك لە سووڕەتی (فاطر)دا دەفەرمووێ: ﴿فَلِلَّهِ ٱلۡعِزَّةُ جَمِيعًا ١٠﴾فاطر، جاری واش هەیە (عزة) سیفەتی کردار (فعل)ە، وەك: ﴿رَبِّ ٱلۡعِزَّةِ﴾، ئەمەش مانای وایە کە خوا پەروەردگارو خاوەنی هەموو ئەو عیززەتەیە، کە دروستکراوەکان پێی پشت ئەستوور دەبن لە بەینی خۆیاندا، ئەوە هەمووی لە بەدیهێندراوی خوایە ﷻ، بەڵام ئەوی دیکە سیفەتی خود (ذات)ی خۆیەتی و، ئەوی دیکەش: هەرچی عیززەتە کە مرۆڤەکان خۆی پێ بەهێز دەکەن، هەمووی دروستکراوی خوایە[1].

٢- ئەم دەقەی سوننەتیش دێنین: {عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِذَا سَلَّمْتُمْ عَلَيَّ فَسَلِّمُوا عَلَى الْمُرْسَلِينَ، فَإِنَّمَا أَنَا رَسُولٌ مِنَ الْمُرْسَلِينَ، قَالَ أَبُو الْعَوَّامِ ﷺ: كَانَ قَتَادَةُ يَذْكُرُ هَذَا الْحَدِيثَ إِذَا تَلَا هَذِهِ الْآيَةَ: سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ . وَسَلَامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ . وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ} (أخرجه أبو الشيخ في «طبقات الأصبهانيين» ج١، ص١٦٧، وأبو نعيم في «أخبار الأصبهان»، قال الألباني: وهذا إسناد حسن).

واتە: ئەنەس ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: کاتێك سەلامتان لە من کرد، سەلام لە پێغەمبەرانیش بکەن، چونکە من ڕەوانەکراوێکم لە ڕەوانەکراوان...

٣- ئەم سێ ئایەتە پوختەی سووڕەتەکەن، ئەو سێ ڕاستییەیان گرتوونە خۆیان، کە مایەی بەختەوەریی و سەرفرازیی مرۆڤن لە دنیاو دواڕۆژدا:

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج ١٥، ص ١١٣.

ڕاستیی یەکەم: ناسینی خوا (معرفة الله) بێگومان مایەی بەختەوەریی و، دەربازبوونی مرۆڤە لە هەر سەرگەدانیی و خوّلیّ و نبوون و خلیسکان و لادان و تاوانێك: ﴿سُبْحَٰنَ رَبِّكَ رَبِّ ٱلْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ﴾.

ڕاستیی دووەم: بەبێ هەبوونی پیاوانی کامڵ، کە ڕێنمایی و پەروەردەو فێرکردن، بەبێ ئەوان مەیسەر نابێ، هەروەها بە بێ ئەوان، ئەو ناسینی خواو پەرستنی خوایە کە شایستەیە، دەستەبەر نابێ، بۆیە: ﴿وَسَلَٰمٌ عَلَى ٱلْمُرْسَلِينَ﴾.

ڕاستیی سێیەم: سەرەنجامی باش ناسین و چاك پەرستنی خواش گەیشتنە بە ڕەزامەندیی خواو، بەخششەکەی، ئەوەش مایەی ستاییشکرانی خوایە: ﴿وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾.

ئێمەش دەڵێین: ﴿سُبْحَٰنَ رَبِّكَ رَبِّ ٱلْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ ١٨٠ وَسَلَٰمٌ عَلَى ٱلْمُرْسَلِينَ ١٨١ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ١٨٢﴾.

لێرەشدا کۆتاییمان بە تەفسیر کردنی سوورەتی (الصافات) هێنا.

# نێوەڕۆک


پێشەکی ئەم تەفسیرە بەگشتیی......................................................... ٥

بەرچاو ڕوونییەکی گرنگ ........................................................................ ١٠

لەبارەی ئەم تەفسیرەوە ........................................................................ ١٠

پێشەکی ئەم بەرگە................................................................................. ١٢

**تەفسیری سووڕەتی (فاطر)**

دەستپێك............................................................................................ ١٧

پێناسەی سووڕەتی (فاطر)و بابەتەکانی................................................... ١٧

یەکەم: ناوی ئەم سووڕەتە: ..................................................................... ١٧

دووەم: شوێنی دابەزینی: ........................................................................ ١٧

سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و هاتنە خواردا: ........................................ ١٨

چوارەم: ژمارەی ئایەتەکانی: ................................................................... ١٨

پێنجەم: نێوەڕۆکی:.................................................................................. ١٩

شەشەم: تایبەتمەندییەکانی: .................................................................... ١٩

حەوتەم: دابەشکردنی بۆ چەند دەرسێك: ................................................. ٢١

دەرسی یەکەم......................................................................................... ٢٣

پێناسەی ئەم دەرسە ............................................................................... ٢٥

مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان................................................................... ٢٦

شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان............................................................. ٢٧

مانای گشتیی ئایەتەکان.......................................................................... ٢٩

مەسەلە گرنگەکان ................................................................................. ٣٨

کورتە باسێك لە بارەی فریشتانەوە .......................................................... ٤٤

بڕگەی یەکەم: پێناسەی فریشتان: ........................................ ٤٤
بڕگەی دووەم : فریشتەکان یەکجار پاك و چاکن و زۆر زۆریشن: ........................................ ٤٥
بڕگەی سێیەم : سپاردنی سەرجەم کارەکانی دنیا و دواڕۆژ بە فریشتان: ........................................ ٤٦
بڕگەی چوارەم : ئەو فریشتانەی ناویان لە قورئان دا هاتووە: ........................................ ٥٠
بڕگەی پێنجەم : زۆریی ژمارەی فریشتان: ........................................ ٥١
چوار کورتە سەرنج لە بارەی ئەم ئایەتەوە ........................................ ٦١
دەرسی دووەم ........................................ ٦٣
پێناسەی ئەم دەرسە ........................................ ٦٥
مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان ........................................ ٦٦
شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان ........................................ ٦٧
مانای گشتیی ئایەتەکان ........................................ ٧٢
مەسەلە گرنگەکان ........................................ ٨٠
کورتە باسێك ........................................ ٨٧
چوار ڕوونکردنەوە لە بارەی ئەم ئایەتەوە ........................................ ٨٧
بـــــەراوردێك لە نێوان ئایەتی ژمارە (١٢)ی سووڕەتی (فاطر) و، ئایەتی ژمارە (١٤)ی سووڕەتی (النحل)دا ........................................ ١٠١
دەرسی سێیەم ........................................ ١١١
پێناسەی ئەم دەرسە ........................................ ١١٣
مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان ........................................ ١١٤
شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان ........................................ ١١٥
مانای گشتیی ئایەتەکان ........................................ ١١٦
مەسەلە گرنگەگان ........................................ ١٢٥
کورتە باسێك ........................................ ١٤٦
سێ سەرنجی گرنگ ........................................ ١٤٦

دەرسی چوارەم.......... ١٥٣
پێناسەی ئەم دەرسە.......... ١٥٥
مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان.......... ١٥٧
شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان.......... ١٥٨
مانای گشتیی ئایەتەکان.......... ١٦٠
مەسەلە گرنگەکان.......... ١٦٨
پێنج کورتە سەرنج لە بارەی ڕەنگەکانەوە.......... ١٧٣
پێنج کورتە سەرنج لە بارەی پۆلێنکردنی بەندە هەڵبژاردەکانی خواوە:.......... ١٨٦
دوو سەرنجی پێویست.......... ١٩٧
دەرسی پێنجەم.......... ١٩٩
پێناسەی ئەم دەرسە.......... ٢٠١
مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان.......... ٢٠٣
شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان.......... ٢٠٤
مانای گشتیی ئایەتەکان.......... ٢٠٦
مەسەلە گرنگەکان.......... ٢١٥
کورتە باسێك لەبارەی.......... ٢٢٣
داگیرکردنی ئاسمان (غزو الفضاء)ەوە.......... ٢٢٣
شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:.......... ٢٣٠
بەراوردێکی نێوان ئایەتی (٤٥)ی (فاطر)و ئایەتی (٦١)ی (النَّحل).......... ٢٤٢

## تەفسیری سووڕەتی (یـــس)

دەستپێك.......... ٢٤٩
پێناسەی سووڕەتی (یس) و بابەتەکانی.......... ٢٤٩
یەکەم: ناوی:.......... ٢٤٩
دووەم: شوێنی دابەزینی:.......... ٢٥٠

سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و هاتنە خواردا:.......................................... ٢٥٣
چوارەم: ژمارەی ئایەتەکان: ................................................................ ٢٥٣
پێنجەم: ناوەڕۆکی: ........................................................................ ٢٥٣
شەشەم: تایبەتمەندییەکانی: ................................................................ ٢٥٤
حەوتەم: دابەشکردنی ئەم سووڕەتە بۆ چەند دەرسێک:.............................. ٢٥٦
دەرسی یەکەم................................................................................ ٢٥٧
پێناسەی ئەم دەرسە ........................................................................ ٢٥٩
مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان ................................................................ ٢٦٠
شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان.......................................................... ٢٦١
مانای گشتیی ئایەتەکان ..................................................................... ٢٦٢
قسەیەك دەربارەی پیتە پچڕپچڕەکان ...................................................... ٢٦٣
مەسەلە گرنگەکان .......................................................................... ٢٧١
کورتە باسێك: پێنج سەرنجی گرنگ ....................................................... ٢٨٧
لەبارەی ئایەتەکانی سەرەتای (یس) ەوە.................................................... ٢٨٧
دەرسی دووەم................................................................................ ٢٩٥
پێناسەی ئەم دەرسە ......................................................................... ٢٩٧
مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان ................................................................ ٢٩٩
شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان.......................................................... ٣٠٠
مانای گشتیی ئایەتەکان ..................................................................... ٣٠٢
هەڵسەنگاندنی: بەسەرهاتی .................................................................. ٣٠٢
سێ نوێنەرەکەی عیسا و شارەکە ........................................................... ٣٠٢
ئێستاش تەفسیری گشتیی ئایەتەکان دەکەین : ............................................. ٣٠٦
مەسەلە گرنگەکان ........................................................................... ٣١٢
کورتەباسێك ................................................................................. ٣٢٢

هەڵوێستی جوامێرانەی ئەو پیاوە بڕوادارە لە پازدە بڕگەدا ............ ٣٢٢
دەرسی سێیەم ............ ٣٣٧
پێناسەی ئەم دەرسە ............ ٣٣٩
مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان ............ ٣٤٠
شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان ............ ٣٤٢
مانای گشتیی ئایەتەکان ............ ٣٤٥
مەسەلە گرنگەکان ............ ٣٥٣
دەرسی چوارەم ............ ٣٧٣
پێناسەی ئەم دەرسە ............ ٣٧٥
مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان ............ ٣٧٦
شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان ............ ٣٧٨
مانای گشتیی ئایەتەکان ............ ٣٨١
مەسەلە گرنگەکان ............ ٣٨٥
سێ ڕاستیی گرنگ ............ ٣٩٢
دەرسی پێنجەم ............ ٤٠٧
پێناسەی ئەم دەرسە ............ ٤٠٩
شەش بەڵگەی ڕوون و بەهێز: ............ ٤٠٩
مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان ............ ٤١١
شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان ............ ٤١٢
هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان ............ ٤١٤
مانای گشتیی ئایەتەکان ............ ٤١٦
مەسەلە گرنگەکان ............ ٤٢٢
کورتە باسێك لە بارەی شیعرنەبوونی قورئان و شاعیرنەبوونی موحەممەدەوە ............ ٤٢٥
کورتە باسێك: شەش بەڵگەی بەهێز، لەسەر زیندوو کرانەوەی مردووان ............ ٤٤٨

## تەفسیری سووڕەتی (الصافات)

دەستپێك..........٤٥٣
پێناسەی سووڕەتی (الصافات)و بابەتەکانی..........٤٥٣
١)- ناوی ئەم سووڕەتە:..........٤٥٣
٢)- شوێنی دابەزینی:..........٤٥٤
٣)- ڕیزبەندیی لە موصحەف و دابەزیندا:..........٤٥٤
٤)- ژمارەی ئایەتەکانی:..........٤٥٤
٥)- نێوەڕۆکی:..........٤٥٥
٦)- تایبەتمەندییەکانی ئەم سووڕەتە:..........٤٥٦
٧)- دابەش کردنی بۆ چەند دەرسێك:..........٤٥٧
**دەرسی یەکەم**..........٤٥٩
پێناسەی ئەم دەرسە..........٤٦١
مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان..........٤٦٢
شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان..........٤٦٣
مانای گشتیی ئایەتەکان..........٤٦٥
مەسەلە گرنگەکان..........٤٧٣
باسێك دەربارەی: گوێگرتنی شەیتانەکان لە فریشتان و تیربارانکرانیان..........٤٨٢
**دەرسی دووەم**..........٥٠٣
پێناسەی ئەم دەرسە..........٥٠٥
مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان..........٥٠٦
شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان..........٥٠٨
مانای گشتیی ئایەتەکان..........٥١٠
مەسەلە گرنگەکان..........٥١٨
کورتە باسێك: چەند نازو نیعمەتێکی بەهەشت..........٥٣٢

**دەرسی سێیەم**.................................................................. ٥٣٥
پێناسەی ئەم دەرسە ........................................................... ٥٣٧
مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان .................................................. ٥٣٨
شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان.............................................. ٥٣٩
مانای گشتیی ئایەتەکان ....................................................... ٥٤١
مەسەلە گرنگەکان .............................................................. ٥٤٧
چوار کورتە سەرنج.............................................................. ٥٥١
**دەرسی چوارەم** ................................................................ ٥٦٥
پێناسەی ئەم دەرسە ........................................................... ٥٦٧
مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان .................................................. ٥٦٩
شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان.............................................. ٥٧١
مانای گشتیی ئایەتەکان ....................................................... ٥٧٥
مەسەلە گرنگەکان .............................................................. ٥٨٦
کورتە باسێك لە بارەی ........................................................ ٦١٦
ئەو کوڕەوە کە ویستراوە سەرببڕدرێ............................................ ٦١٦
**دەرسی پێنجەم**................................................................ ٦٢٥
پێناسەی ئەم دەرسە ........................................................... ٦٢٧
مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان .................................................. ٦٢٨
شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان.............................................. ٦٣٠
مانای گشتیی ئایەتەکان ....................................................... ٦٣٢
مەسەلە گرنگەکان .............................................................. ٦٤٣
دوو وردەکاریی لەبارەی ئەم مەسەلەی دووەمەوە:............................. ٦٤٩
دە (١٠) دەرس و پەندی گرنگ لە بەسەرهاتی یونوس دا عليه السلام ........ ٦٦٤
**دەرسی شەشەم**................................................................ ٦٧١

پێناسەی ئەم دەرسە ......................................................................................... ٦٧٣
مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان ................................................................................. ٦٧٤
شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان........................................................................... ٦٧٦
مانای گشتیی ئایەتەکان .................................................................................... ٦٧٧
مەسەلە گرنگەکان ........................................................................................... ٦٨٦
کورتە باسێك لە بارەی ...................................................................................... ٦٩٨
ڕێك وەستانی فریشتانەوە لە خزمەت خواداو بەراوردێکی نێوان ئەوان و مرۆڤان .... ٦٩٨
یەکەم: تەوەری یەکەم چەند دەقێك: ............................................................... ٦٩٨
دووەم: تەوەری دووەم: چەند قسەیەکی زانایانی پسپۆڕی بواری تەزکیەو تەصەووف:...... ٧٠٠
سێ کورتە سەرنج لەبارەی سێ ئایەتی کۆتایی (الصافات)ەوە ............................. ٧١٦